پرۆژەی تیشک 70

تیشک

صلی الله علیه وسلم

# موحەممەد

## ناسراوترین کەسایەتیی مێژوو






### وەڵامێک بۆ کتێبی

### (ظهور الكورد في التاريخ)




حەسەن مەحموود حەمە کەریم

# موحەممەد
# ناسراوترین کەسایەتی مێژوو

نووسینی:
حەسەن مەحموود حەمە کەریم

١٤٣١ کۆچی
٢٠١٠ زایینی

**ناوی کتێب:** موحەممەد ناسراوترین کەسایەتی مێژوو

**نووسینی:** حەسەن مەحمود حەمەکەریم

**ژمارەی سپاردن:** ( ١٠٩٦) ساڵی (٢٠١٠)

**شوێنی چاپ:** رێ نوێ

**نۆرەی چاپ:** یەکەم

**ساڵی چاپ:** ٢٠١٠

**لە بڵاوکراوەکانی:** پرۆژەی (تیشك)، زنجیرە (٧٠)

**ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت:** www.tishkbooks.com

**ئیمەیلی پرۆژە:** info@tishkbooks.com
tishkbooks@yahoo.com

# بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

## پێشەکیی:

ئەوانەی رەخنە لە پێغەمبەری ﷺ ئیسلام دەگرن، مەبەستیان تەنها کەسێتی موحەممەد نییە، بەوەندەی مەبەستییان ئێمەی موسڵمانانە لە هەر گەل و هۆز و، لەهەر خاکێك بین لەسەر ئەم زەوییە، ئەوان مەبەستییان ناشیرینکردنی سیرەو تورەکردنی ئێمەیە.. ئیتر کوردە یان عەرەب و تورك و فارس و سەر بە هەر هۆزو نەتەوەیەکە و لە هەرکوێ یە.. دەبێ بەرگری لە خواو ئایین و پێغەمبەر و موسڵمانان بکەین، رازیی نەبین سووکایەتییان پێبکرێت، هەموومان بەرپرسیارین بە قەبارەی هێرشەکە و، قەبارەی ئەو قۆناغ و بازنە و توانایەی کە هەمانە و تیاییدا دەژین.

بەرپرسیارێتیشمان چەند هۆکارێکی هەیە، ئەو دابەزین و کەم هەستییەی کە ئەمرۆ میللەتەکانمانی تێکەوتووە، ئەو پێکەوە ژیانە لاوازە، ئەو پەیوەندیە دوورەی کە لەگەڵ ئیسلامداو گەلانی موسوڵماندا هەمانە، کە لە کارو کردەوەو بیرو هەست و ژیانماندا هیچی وامان پێوە دیار نییە، نەمانتوانیووە شتێکی وا گرنگ و بەرچاو پێشکەش بکەین، ئەو بۆشاییە فراوانەی کە جێمانهێشتووە لە بیری ئەوانەی کە لەبارەی ئیسلام و پێغەمبەرەکەیەوە گوێمان لێدەگرن، وای کردوە هەست بە رووداوە گرنگەکانی ژیانمان ناکەین.

کەواتە ئێمە دەبێ چۆن بەرگری لە پێغەمبەرمان بکەین..؟

ئایا هەر ئەوەندە بەس بێت کە بە پەرچەکردار هێرش بکەینەوە سەر ئەو کەس و لایەن و رۆژنامە ئەورووپی و دەزگایانەی کە زاتدەکەن بەرامبەر ئایینەکەمان بدوێن و بنووسن و، دەیانەوێ بەردەوامیی بدەن بەو ئازارو برینانەی جەستەمان کە لە سەرەتای ئیسلامەوە تا ئەمرۆ کاری بۆ دەکەن و ئازارمان دەدەن..؟

یان بچینە سەر شەقامەکان و، رێپێوان و راپەیمایی و نارەزایی دەرببڕین..؟

یان داوای راگرتنی پەیوەندیی ئابووریی و وەرزشی بکەین..؟

یان گێڕانەوەی سەفیرەکان.؟ یان ناردنی نوێنەر و وتووێژکردن بۆ ڕوونکردنەوەی وێنەی ئیسلام لە بیری ئەوانەی کە چاك نایناسن..؟

یان ئەوەیە خۆمان گێل بکەین لە بابەتەکەو، سەحابەکان دابڕین لەو سەروەری و ناوبانگیەی کە پێشکەش بە مرۆڤایەتیان کردووە ..؟

ڕەنگە ئەوان بیانەوێ بە سووکایەتیکردن بە پێغەمبەر ﷺ و ئیسلام، بازاڕ بۆ ڕۆژنامەکانیان پەیدا بکەن، وەك ڕۆژنامە دانیمارکی و ئەڵمانی و ئەوروپییەکان کە دەیانکرد، یان لەسەر حیسابی خۆتووڕەکردنی ئێمە ڕەواج بە بیرو بۆچوونی خۆیان بدەن، کە زۆرجار یەك هەڵوێست و ڕێکوپێك نەبووە، هەروەك ئەوەی کردمان بۆ سەلمان روشدی و وتەکانی پاپا و مەریوان و ئەمەی دکتۆر جەمال و شتی تریش کە لە ئایندەدا بەردەوام دەبێت، ئەوانە هەموو پارەی چەوری بۆ ڕۆژنامەکان پەیدا کرد، بەلاّم خۆمان هیچ سوودێکمان نەبینی و هیچمان ڕۆشن نەکردەوە و کەسمان تێنەگەیاند، کە ئەمەیان دەبێ ئامانجی سەرەکیی ئێمە بێت.

لەولاشەوە ئەوکارانەی ئەوان خزمەت بە ئێمە دەکات، وریاماندەکاتەوەو دەریدەخات کە ئێمە کەم و کورتی و نکولیمان بەرامبەر خۆمان و ئاینەکەمان هەیەو زۆر پابەند نین بە سونەت و خۆشەویستی پێغەمبەرمانەوە کە داوامان لێکراوە بەکردەوە وابین نەك بە دەم.

ناشیرینکردنی وێنەی ئیسلام و کەسایەتیی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ کارێکی نوێ نییە، وەستانیشی نییە، لەبەر ئەوە هەڵچوون و خۆپیشاندان و دژەکردار کاریگەریی ئەوتۆی نییەو جێی خۆی ناگرێ..

دەبێ پیاچوونەوە بە تێگەیشتنەکانمان و خۆناسین و خواناسینی خۆماندا بکەین، دەبێ دەری بخەین ئایا ڕاستە ئێمە پێغەمبەری خۆمان خۆشدەوێ و جێی تایبەتی هەیە لە دڵ و دەروون و زەینماندا..؟ چونکە خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ ئەرك و مافە، لەسەرمانە جێبەجێی بکەین، هەروەها دەبێ بەرامبەریش بناسین کە ئەو سووکایەتیی و ڕستە سەقەتە ناشارستانیانە دەدرکێنن، دەبێ ناخ و مەبەستیی ئەوان بزانین، هەتا وەلاّمی گونجاویان بۆ دیاریی بکەین و بە پێی خۆیان

مامەڵـــەیان لەگـــەڵ بکـــەین، ئێمـــە بەداخـــەوە نـــە خۆمـــان ناســـیووە و نـــە بەرامبـــەرەکانمان، ئایـا لـە بـاری وادا دەکـرێ وەڵامـەکانمان راسـت و دروسـت و کاریگەر و قەناعەت ئامێزبن..؟

ئـەو هێرشـە ناشـیرینە توندانـە، بەوەنـدەی کـە رق و قـین و حـەزی تۆڵـە و دژایـەتیی تیایـە، کـە هـەموو داب و نـەریتێکی ئـاینی و رەوشـتی و شارسـتانیی بەزانـدووە، ئەوەنـدە تێکەیشـتن و لەیـەکحاڵی بـوون و ئـازادی پێکـەوە ژیـانی دیموکراسیانەو چەسپاندنی مافی مرۆڤ و وتووێژی ئاینـەکان و شارسـتانیەکانی تیـا دیارنیە، کە بەناو رۆشنبیران و ئەوروپیـەکان پاگەنـدەی بـۆ دەکـەن، بـەڵام ئـەوان دەیخەنە ئەستۆی چەند وتەیەکی بریقەدار کە گوایە ئازادی رادەربرینە.

ئەم هێرشانە ئەوە دەردەخات کە بەرمبەرمان تەواو نائومێدو دەست بـەتاڵ و ئیفلاس کردووە، لـە رووی وریابونـەوەو هەڵسـانەوەی ئـایینی و رەوشـت بـەرزی و شارستانیەوە، ئەوانی ناچار کردوە کە وەك بەرامبەرکێیان پێناکرێت، بەجۆرێك لـە جۆرەکـان بێنـە دەنـگ و بجـوڵێن و شـتێك بکـەن، بـەڵام ئەوەتـە لـەباتی ئـەوەی شارستانیانە رەفتار بکەن، ئەو کارە لاوازە بازاڕیە دەکەن و، جنێوو سوکایەتی بـە ئاین و پێشەنگ و پیرۆزیەکانمان دەکەن .

ئێسـتە تۆپەکـە لـە بـەرپێی ئێمەدایـە، ئایـا وەك ئـەوان رەفتـار بکـەین و خـۆ بنوێنین، یان تواناى ئەوەمان هەیە چارەسەرێکی تر پێشکەش بکەین..

سەرەتا دەبێ قەناعەت بە خۆمان بکەین کە شتێکمان هەیـە، لـە هـی خـەڵکیی پاکتر و چاکتر و دروستترو لەبارترە، خۆمانی پێپەروەردە بکەین، پاشـان لـە کـارو رەفتـاری خۆمانـەوە نیشـانی بـدەین، ئێمـە ونبوویـەکمان هەیـە دەبـێ جـارێکیتر بیدۆزینەوە و پوختی بکەینەوە و تۆزی لەسەر بتـەکێنین و نیشـانی بـدەین، بـەڵام پێویسـت بـە ئامـادەکردن و پێشکەشـکردن و جێبـەجێکردنێکی ژیرانـە دەکـات، جارێکی تر ئەو ونبووە شاراوە لە نێو خۆماندا بەرهەم بهێنینەوە.

هەرچەند دەنگۆیەك هەیـە، بـە نـاوی کۆتـایی مێـژوو و شـتی تـرەوە، بـاس لـە خاوبوونەوە و داڕووخان و هیچ لە بارا نەبووی موسوڵمانان دەکات لـەم چـەرخەدا،

داوا دەکات فاتیحەیەك بخوێنین بۆ گیـانی پـاکی ئیسـلامی لەدەستچـوومان، چـەند جارە بوونەوەی ئەو قسەوتن و گاڵتەکردن بە پێغەمبەرمان لە رۆژنامەکانی سـویدو دانیمارك و وڵاتانی تـری ئـەوروپیی و لـە دونیـاو لـەلای خۆشمـان لـە کوردوسـتان، دەریدەخات کە دیارە وتووێژی شارستانیی و ئاییـنـەکان هـیچ کاریگـەریی نـەبووە، کە چەندین جار و بەردەوام لە بەریتانیا و ئەمریکا و ئەڵمانیا و قەتـەر و تورکیـا و ئەم ماوەیەش لـە جنێـف و شـوێنانی تـریش دەبەسـترێ و، سـیمینار و کـۆنگرەی گـەورە و بـێ سـوودی بـۆ دەبەسـتن و بڕیـارە ئـاییـنی و مـەدەنیی و فکـری و سیاسـیـەکان قسـەی تیادەکـەن و بـە نیـازبوون دەسـتبهێنن بـە سـەر برینـە مێژووییەکانی رابردودا.

لە راستییدا ئێمە وەك خاوەن عەقیدە و شارستانیی ئیسلامیی، کێشە و گرفتمان لەگەڵ هیچ بەرامبەرێکدا نییە و، ئایینەکەمان بە گەرمیی داوامان لێدەکات کـە رێـز لە ئاییـن و بیروباوەڕی خەڵکی تر بگرین و، دان بنێین بە ماف و داواکارییەکانیاندا، ئیسلام بانگی هەموو شارستانییەت و ئایینەکانی پێش خۆی دەکات، بۆ دانیشتن و وتووێژ و راگۆڕینەوە، کە پێکەوە بگونجێن و بژین و سـوود لـە یـەکتری وەربگـرن، هەوڵی پووکانەوەی یەکتری نەدەن، عەقیدەمان داوامان لێدەکات کە دان بنێین بـە مافی پێکەوە ژیان و رێزلێگرتن و سەربەستکردنی خەڵك، لە چۆنیەتی بیرکردنەوە و دیـنـداری خـۆی، هـیچ لایـەك هـیچ جـۆرە هێرشـێك و سـووکایەتییەك بەرامبـەر بیروراکـانی تـر نـەکات، لای خـوا تاوانبـارە هـەر کـەس کـە کـەمترین نکـوڵیی و دەستدرێژیی بەرامبەر ئـاییـن و پێغەمبـەران و پـەرستگا و پـیرۆزییـەکانی هەرکـەس بکات، یان زۆر لە کەسان و لایەنانی تر بکات کە ئاییـن و رای خۆیان بگۆڕن.

ئێمە دەبینین کە کەمینەی وەکو گاور و جولەکـە و دروز و قیـبتی و ئاشـووریی و کلدانیی و یەزیدیی و کاکەیی و زەردەشتیی، لە دڵی کۆمەڵگای ئیسـلامییدا دەژیـن و هەتا ئێستا ماون و نەتواونەتەوە، ئەمە نیشانەیە کە ئیسـلام لـە هـیچ قۆناغێکـدا پاڵەپەستۆی لەسەر ئەو کەمە نەتەوایەتی و ئیتنی و ئاییـنزاییانە دروست نەکردووە.

یەكێ لە پایە گرنگەكانی ئایینەكەمان بڕوابوونە بە پێغەمبەرانی ئایینەكانی تر، كاتی خۆی كە دەسەڵاتی ئیسلامی پایەدار بوو، لەسەر خاكەكەی جۆرەها ئـایین و بیروباوەڕی تر هەبوون، دڵئارام و ئازاد بوون، هەموو مافێكی خۆیان هەبووە، بەڵام هەمیشــە گرفــت لای ئەوانــەبوو كــە بڕوایــان بــە ئیســلام نــەبوو، چـاویان پێـی هەڵنەدەهات، دەیانویست وەك باوەڕ و شارستانیی نەیهێڵن و، لەسەر ئەرزی واقیع بیانسڕنەوە، هەموو شێوازێكی بەربەرەكانیشیان بۆ ئەو مەبەستە بـەكاردەبرد، ئـا لێرەوە لێدانی شارستانیی و ئایینـەكان ڕوویانـدەدا، هـەروەك مێـژوو شـایەتی ئـەو حاڵەیە كە ئەوروپییەكان هـەركات هێـزی خۆیـان بینـیبێ، لەبـەرگی خاچپەرستییدا چەندین جار بەرەو ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیی هێرشـیان هێنـاوە و بـەزەییان بـە كەسـدا نەهاتووەتەوە، ئەوان گاوری بە بڕوا نەبوون، بەڵام گاوریان دەكـردە داردەسـت بـۆ بزواندنی هەستی ئایینی و دروستكردنی ڕق و قینی زیاتر و، شەڕەكانیان پـێ گـەرم دەكرد، دەنا لە مێژوودا هیچ لە نێوان ئیسلام و گاوردا ڕووینەداوە، ئەوەتا دەبینین گاورانی ڕۆژهەڵات هەمیشە بەشێك بوون لە كۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتـی و، بەشدارییان لـە پێشكەوتن و شارستانییەت و پێكەوە ژیاندا بووە، خاوەن زانا و كەنیسـەی دیـاری خۆیان بوون.

ســووكایەتیكردن بــە پێغەمبــەر و پیرۆزییــەكانمان لەلایــەن ڕۆژنامــە ئــەوروپی و كەسەكانی لای خۆمان وەك دكتۆر جـەمال، ئـەوە ناشـیرینكردنی دكتـۆر جـەمال و نموونەكانیەتی پێش موسڵمانەكان، چونكە موحەممەد بەردەوام پێغەمبـەری زیـاتر لە دوو ملیـار كەسـە و، لـە بـیر و هۆشـی مرۆڤایەتییدایـە، لـە ئاسمـان و لـە زەوی گرنگی پێدراوە، بە ناسراوترین و مەزنترین دروستكراوی خوا دادەنرێ لـە مێـژوودا، بە ناودارترین شۆڕشـگێر مەزەنـدە كـراوە بـە بۆچـوونی ئەوروپییـەكان، كـە تـوانی فراوانترین بەشی گرۆهی مرۆڤایەتیی بۆ زیاتر لـە هـەزار و چوارسـەد سـاڵ بگـۆڕێ، بەردەوام پەیڕەوانی بەرەو قـەرەباڵغترو، بیرۆكەكـەی بـەرەو دامەزرانـدن دەچـێت، هـەر ئەوروپیـەكان خۆیـان نووسـیوویانە كـە موحەممـەد گـەورەترین چاكسـازیی كردووە لە مێژوودا.

دکتۆر جەمال و ئەو گروهە گاڵتەکەرە بە پێغەمبەر و پیرۆزییەکانی ئیسلام، کۆمەڵێکی کەم و بێنرخ و سووك و هیچ و بچووکن، ئەوان هەمیشە لە بنەماڵەو کەسانی روخاوو نزم و شازو خۆدەرخەر هەڵدەکەون، ئەو بیروڕا و هێرش و گاڵتەجاڕیانە، هەمیشە لە کەسانی لاوازو دەرون شێواو دەردەچن، کە کارەکانیان لە نزمیی خۆیان زیاتر ناترازێ، بەڵام نیشانەیەکە کە هەتا چەندە شەیتان و جولەکە زاڵ بووە بەسەر نووسین و بیرو راگەیاندنەکان و سیاسەتی وڵاتاندا و، خەڵکی لە دوورەوە دەهۆڵیان بۆدەکوتن و، بەجولەکە مەزهەبان دەڵێن گوێتان لێبێت کە لە کوردوستانەوە ئێمەش هەین، دەتوانین شتێك بڵێین کە ئێوە زاتتان نەکردوە بیدرکێنن و زەینتان بۆی نەچووە بیڵێن، بەراستی جولەکە بە تواناییە کە کەسەکان بەکاردەهێنن، وەك هەڵگیرسێنەری ئاگری شەڕ و شووم، لە نێوان خەڵکان و ئاینەکان و رۆژهەڵات و رۆژئاوادا، بەڵام بەداخەوە ئەو راستیە زۆربەی سیاسەتمەداران و رۆشنبیران، هەستی پێدەکەن و دەیزانن، بەڵام هۆ زۆر زۆرە و ناچارن بێدەنگبن، چونکە جولەکە زاڵە، دەستی لە لابردن و دانان و بەرزکردنەوە و نزمکردنەوەی سیاسەتمەدارانی جیهاندا هەیە، گۆڕانکاریی زۆر و رووداوی جۆراوجۆر لە مستی ئەوانەدا دەکرێ و، فیتنەو شەڕی وا هەڵدەگیرسێنن، کە نە کەری خۆیانی تیایە نە ووشتر.

بەڵام ئێستا لە کوردستان وەڵامدانەوەی ژیرانە سەری هەڵداوە، لە ئەوروپا دەزگای ئیسلامیی زۆر هەیە، لە کاردان بۆ تێگەیاندنی خەڵك لە جۆرەها چینی کۆمەڵگەی ئەوروپی، کە بێئاگان لە ئیسلام و مەزنیی موحەممەد و، پاك و بێگەردیی لەو بوختانانەی کە ئەوانە بڵاوی دەکەنەوە.

هەروەها لە کوردستانیش (پرۆژەی تیشك) کە چەند قەڵەمێکی کارامەیە، خۆبەخشانە و بەبێ لایەن، لە هەر بۆچوون و رایەکی تایبەتی، بۆ خوا و خەڵك، دوور لە رق و قین و توندڕەویی و پەلەکردن، دەستیانداوەتە بڵاوکردنەوەی زنجیرەیەك بڵاوکراوە، کە وەڵامی بە پێزو تەواوی ئەوانە دەداتەوە کە بەبێ پەردە و دوور لە هەر باوێکی ئایینی و رەوشتیی، سووکایەتیی بە پیرۆزییەکانی ئەم کوردە دەکەن، لە خاك و ئاوو هەوای ئەم کوردستانەدا دەژین، بەڵام دژی

کلتوور و کەلەپوور و داب و نەریت و ئایینی ئەو خەڵکە دەنووسن، کە بۆ هەزار و چوارسەد ساڵ زیاترە پابەندیەتی و بۆی ژیاوە..

ئێمە دەبێ نەشکێین و نەڕوخێین لە بەرامبەر ئەوانەی، کە بەبێ هۆ تانە لە پێغەمبەری مەزنمان دەدەن، چونکە ئەو لەو ڕۆژەوە کە قەولە سەقیلەکە و بارە قورسەکەی دراوە بەشاندا و وەحی بۆ هاتووە، کە هەتا ئەمڕۆکە هەزار و چوارسەد ساڵە، بەردەوام شەڕ و پەلامار و بوختان و وتەی ناشیرینیان بۆ هەڵبەستووە، لەلایەن ئەو کەسانەوەی کە هەرگیز چاکەیان بۆ خەڵکی نەویستووە، هەر لە نەفامە بێ بڕواکانی قوڕەیشەوە، هەتا نەزان و نەفامە بێ بڕواکانی ئەمڕۆ، ئەو زنجیرە خراپەیە، دژ بە پێغەمبەر و ئیسلام، کە هەزار و چوارسەد ساڵ دەبێت جولەکە بەڕێوەی دەبات و دەستگیرۆییان دەکات، خراپ دەنووسن ..، بەڵام موحەممەد هەر بە موحەممەدی و مەزنی ماوەتەوە، پلە و پایە و پەیڕەوانی و پیرۆزیی و شکۆمەندی هەر لە بەردەوامبووندایە، بەڵام ئەوانەی وەك دکتۆر جەمال، تا نەفامەکانی قوڕەیش، مێژوو لولی داون و لە جێیەکی بێنرخدا و لە سووچێکی ناتەواوی مێژوودا کزیان کردوە، چاکوایە پەیڕەوانی موحەممەد ئەمڕۆ خۆیان بە شایستەی هەڵگری پەیامەکەی و زیندووکردنەوەی سوننەتەکەی ئەو بزانن، لەو ئاستەدا خۆیان پەروەردە بکەن، کە لە توانایاندا هەبێت ئەو پەیامە هەڵگرن و سپاردەکەی بپارێزن و خۆیان بدۆزنەوە و نوێی بکەنەوە.

پێم سەیرە، هەندێ موسوڵمانی سادەو ساکار دێن و دەپرسن: ئەم کارەی پرۆژەی تیشك دەیکات، بۆ وەڵام دانەوەی بوختانچییان و سوکایەتی کەران بەرامبەر پێغەمبەر و ئیسلام، کارێکی خراپ و ورووژێنەرو خۆمانـدوکردن و بێسوودە، کەش و هەواکە ئاڵۆزتر و، زیاتر تێکی دەدات، ئەوان گومانیان وایە کە مەبەستی دوژمنان ئەوەیە، موسوڵمانان مەشغوڵ و خەریك بکەن و وایان لێبکەن، کەبەردەوام لە بەرگریکردندا بمێننەوەو نەیان پەرژێتە سەر کاری گەورەتر، ئەوە وتەیەکی خۆخەڵەتێن و خۆخەڵەفاندنە، بۆچوونێکی بیدعەو داهێنراوێکی نامۆیە لە ئیسلامداو، تازەبەتازە داهاتووە، دەنا هەرگیز نەبووە لە مێژووی ئیسلامدا

موسـولّمانان لـه هـيچ چـاخ و سـەردەم و، لـه هـيچ هـۆزو نەتـەوەو گەلێكدا، گـەر سوكايەتی به برگەيەكی ئايينەكەيان كرابێت نەك به پايەيەكی ئاينەكە، گـەورەترين كێشـەی لەسـەر دروسـت بـوەو شـەڕی گـەورەی لێقـەوماوە، هـەرگيز نـەبووە موسـولّمانان سەرشـۆڕ بكـەن لـه ئاسـتی سـوكايەتی بـه ئاينەكـەيان، بـەلّام لـەم سەردەمە جياوازە بێدەسەلّاتيەدا، وەك زۆر بيدعـەو شـتی داهێنـراوو نەشـاز پەيـدا بـوەو، پياويـان هەيـه بـه كەشـی و جبـەو ڕيشـەوە بـەرگری لێـدەكات و بـرەو بـه بيدعـەكان دەدات، خـەڵكی سـەيرو سـەمەرەش پەيـدابووە دەڵـێن خۆتـان خـەريك مەكەن بەو كەسە نەزانانەوە كەسوكايەتی بە ئايينەكەمان دەكەن، وازيـان لێبهێـنن هەتا ماندودەبن و خۆيان بۆ خۆيان وازدەهێنن، نازانم ئەمە لـه كوێـوە سەرچـاوەی گرتوەو پەيدا بوەو هاتوەتە گۆڕێ، ئـەم بۆچـوونە لـه ئيسـلامدا شـازەو قورئـان و فەرمودە پێچەوانەی ئەوە دەلّێن، من بروام وايە لە ئێستادا سەردەمی چەك و شەڕ بەسـەر چـووە، نزيكبونـەوەو وتووێـژو قەڵـەم و دانيشـتن و ڕونكردنـەوەو گومـان ڕەواندنەوە هێوركردنەوە، لە كەش و هـەوای سـازو هـێمن وگونجـاوو تێگەيشـتندا، كاری ئەفسوناوی وادەكات، بە دەيان شەڕو هەراو كێشەنانەوە ناكرێت و ناچەسپێ و كاريگـەری و گـۆڕانی بـەدوادا نايـەت، ئەمـە جگـە لـەوەی كـارێكی شارسـتانی و هاوچەرخانەيە، كارێكی ئايينيەو بنەماكانی بانگەوازی ئيسلامی لەسەر ئەم بناغەيە دامـەزراوە، پێغەمبـەرو سـەحابەكان هـەروايان كـردوەو لێيـان لانـەداوە، مەگـەر دوژمنان بەزۆر لايانپێدابن..!!

برادەرێكی ئيسلامی كە سيی سالّی ڕەبەقە لەناو بزاڤی موسولّماناندا كـار دەكـات، كتێبێكـی ئێمـەی (پـرۆژەی تيشـك) خوێندبويـەوە، تەلـەفۆنی بـۆ كـردم وتـی" حەزناكەم ئێوە ئاوا خۆتان سەغلّەت كردوە، ئەو هەموو توانايە بـه خـەرج دەدەن، وەلّامی دوژمنانی ئيسلام دەدەنەوە، وازيان لێبهێـنن بابـەڕقی خۆيانـەوە دابـرزن و بمرن، ناكرێ كابرايـەك لـه سوچـێكەوە ڕەخنەيـەك سـوكايەتيەك بەرامبـەر ئيسـلام دەكات، تۆ بيكەيتە هەلّاو وەلّام بدەنەوە"، وتم: برام ئەگەر ئەو لە سوچـێكەوە بـه دزيـەوە ڕەخنـەی گرتـوەو سـوكايەتی دەكـات، ئـەوە بـه هـەرحالّ، بـەلّام ئـەو

کردویەتیە کتێب و هەزاران نوسخەیان بۆ چاپ کردوەو، بە هەرزان بۆی دەفرۆشن، دەچێتە هەموو ماڵێك و کتێبخانەیەك، ناکرێ تۆ لێی بیدەنگ بیت و وەڵامێکت نەبێت، ئێمە کوا لێمان کردوەتە هەڵاو سەگە ڕاوێ، ئێمەش هەر بەشێوازی خۆی بە قەڵەم و کاغەز وتومانە ئەوەی تۆ نووسیوتە وانیەو بوختانە، ئەمەی ئێمە ڕاستیەکەیەتی، هەتا خەڵك هەڵەکەی ئەو نەکاتە ڕاست و بیڵێتەوە، با لەپاڵ ڕەخنەو کتێبەکەی ئەودا لە کتێبخانەکاندا وەڵامەکانی ئێمەش هەبێت، با خەڵکی بڵێ بۆ ئەم ڕەخنانە ئەم وەڵامانە هەیە، خەڵکی گلەیی نەکات بڵێ ئەوە دوو نووسەر نەبوو وەڵامێکی ئەم کابرایە بداتەوە، وەك پێش دامەزراندنی پرۆژەکەی ئێمە خەڵك گلەیی دەکردو وای دەوت، ئێستە ئێمە ئەو گومانانەمان ڕەواندوەتەوەو، ئەو بۆشاییەمان پر کردوەتەوەو، ئەو گلەییەمان لە کۆڵ تۆو خەڵکی تر کردوەتەوە، ئێمە حوججەمان لەسەر تۆو میللەتەکەمان لابردووە بۆ دونیاو بۆ قیامەت، ئێمە لە باتی هەمووتان ئەمکارەمان کردوە، ئێمە ئەمڕۆ پێویستمان بە پشتگیری ئێوە هەیە، دەبێ ئێوە لە گەڵمان بن .. پاشان برادەرەکەم وتی با ئەوەندە بەس بێت بە تەلەفۆن، ئەوی تری دادەنێین بۆ دانیشتنێك و قسەی زیاتری لەسەر دەکەین..

پاش مانگێك کابرا هات بۆ ماڵمان، کە تازە بە تازە لە قەندیل گەڕابویەوە، لە گەڵ کۆمەڵێك ڕۆژنامەنووسی دەڤەرەکەمان چووبوونە قەندیل، بۆ هاوکاری و پاڵپشتی چەکدارەکانی پەکەکە، دژی تورکیاو دژی هەڵوێستی حکومەتی هەرێم، کە نواندبوویان بەرامبەر پەکەکە، بەخێرهاتنەوەم لێکرد، پێم وت: من ئەو هەڵوێستەم پێ خراپ نیە، کە پاڵپشتیتان لە هێزێکی عیلمانی کردوە کە ڕەخنەی لە ئیسلام و کاری سیاسی ئیسلامی هەیە، بەڵام دەمەوێ نیو ئەوەندەش هەڵوێستت بۆ ئاینەکەت و ئەو سوکایەتیە کە بە بنەماکان و پیرۆزیەکانی ئاینەکەمان دەکرێ هەتبێت، سەعاتێك من وتم و ئەو نەیبیست، هیچ لە یەك حاڵی نەبوین.. وتم ڕەنگە تۆ یەکەم ئیسلامیەك بوبیت ڕێی هەزار بە هەزاری قەندیلت گرتوەتەبەر، بەشاخ و چەم و دۆڵدا هەڵزنیویت، نەترساوین فرۆکەی تورك هێرش بێنێتە سەرتان، تۆ وەك

هەستێکی نەتەوەیی تووله ڕێیەکانی قەندیلت بەزاندو گەشتیتە ئەوان و، پێت وتن خەم مەخۆن، ئێوە تەنها نین، هەموومان لە گەڵتانایین. ! پێم وت من دەمەوێ کەمتر لەوە هەستیشت بەرامبەر ئاینەکەت هەبێ، کەمتر لەو ڕێ هەزار بەهەزارانەی بۆ ئەوانت بڕی، بۆ ئاینەکەشت بیبڕە، ئەوەی تۆ بۆ یەکەکە کردت، ئێمە دەمانەوێ کەمتر لەوە بۆ ئاینەکەمان بکەین، پاشان کە گەڕابونەوە کۆمەڵێك لەو ڕۆژنامەنووسانە لە لایەن حکومەتی هەرێمەوە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك دەست بەسەر کرابوون، یەکیان ئەم برادەرەبوو، خۆ ئەم برادەرە ڕۆژنامەنووس نیە، یەك دێڕی ڕۆژنامەوانی نیە، بەلآم هەر دوای ئەو قەرەباڵغیە کەوتبوو، کە پێشتر کاری بۆ کرابوو، حەزی کردبوو سەری ئەمیش لە ناو ئەو سەرانەدابێت و، لەو هەڵوێستە مەردانە دوانەکەوێت ..!! زۆرن ئەو کەسانەی کە ئەو جۆرە بیرکردنەوانەیان هەیەو، هەریەکە هۆیەك و بیانویەکی لای خۆیەوە دەستنیشان کردووە، بەلآم زۆر زیاترن ئەو کەسە بەهەست و ئاین و نیشتیمان پەروەرانەی کە بە گیان و بە دڵ و، ئەوەی لە دەستیان بێت لە پشتگیری و تەلەفۆن و نامەو سامان دەیبەخشن و دەستخۆشیمان لێدەکەن، ناڕازین لەوانەی سوکایەتی بە ئایینی نەتەوەکەیانەوە دەکەن، هەڵوێست و هەواڵپرسین و سەردانی ئەوانە گەرمترمان دەکات، ئێمە نەهاتوین سەنگەر لە کەس بگرین، هەر تەنها بەهێندەی ڕەخنەکانی ناحەزان وەڵامی پڕاو پڕو پڕ بەسەرچاوە دەدەینەوە، بۆ ئەوەی گەلەکەمان چەواشە نەکرێو بە هەڵەدا نەبرێ، با ناحەزانیش نەزانن جادە تەختەو شامی شەریفەو دونیا کش و ماتەو چی دەڵێن بابیلێن وەلآمیان نیە..!!

ئەم کتێبە ساڵی ( ٢٠٠٥ لەلایەن (دکتۆر جەمال رەشید ئەحمەد) بە سێ بەرگ لە هەولێر لە چاپخانەی پەروەردە و لە دەزگای (ئاراس) کە ژمارە (٣٦٦)ی زنجیرەکەی پێدراوە بڵاوکراوەتەوە.

بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە (٩٧٥) لاپەڕەیە، باسی دەرکەوتنی کورد دەکات هەر لەسەرەتای مێژووەوە، پاشان باسی جێگەی کورد و شێوەی ژیان و قۆناغەکانی گەشەکردن و، باسی گەلەکانی کۆنی کورد وەك سۆباریی و گوتیی و لۆلۆیی و کاشیی و حوریی و میدیی و نائیریی دەکات.

لە بەرگی دووەمدا کە (٩٤٤) لاپەڕەیە، باس لە ڕەگی مێژوویی وشەی کورد و زمان و قۆناغەکانی ئایین و هۆشی ئایین و ئەفسانە و یەزیدیی و کاکەیی و شەبەك و عەلەوی و سۆفی دەکات.

لە بەرگی سێیەمدا کە (٧٧٠) لاپەڕەیە، باس لە کۆنترین گەلەکانی کوردستان و سروشتی کۆمەڵگای کوردیی و باری ژیانی و پێکهاتنی کۆمەڵایەتیی و خێزان لە سەردەمەکاندا و کاریگەریی ئایین و ڕۆشنبیریی گەلەکانی دراوسێی کوردستان لەسەر کورد، پاشان لە بەشی چوارەمی بەرگی سێیەمدا باس لە عەرەب و هۆزە عەرەبەکان و ئیسلام و کاریگەرییان لەسەر کورد دەکات، کە ئەم بەشە جێگەی مەبەستی ئێمەیە و دەمانەوێ هەندێك لەسەری بووەستین.

لەم کتێبەدا دکتۆر جەمال لاپەڕەی زۆر لە مێژووی کورد هەڵدەداتەوە، هەر لە سەرەتای بوون و بزاوت و جموجوڵیەوە هەتا هاتنی ئیسلام، لەم ماوە دوور و درێژەدا تاوتوێی زۆر باس و خواس دەکات و قسە زۆر دەکات، لەم باسانەدا دکتۆر زیاتر پشت بە بیروڕای خۆی دەبەستێ هەتا سەرچاوە، سەرچاوەکانیش بۆ پشت ئەستوورکردنی رای خۆی دەهێنێتەوە ئەگەر پێویستی کرد! ، لەبەر ئەوە من پێموایە کە ئەم کتێبە ناتوانێ بچێتە ئاستی کتێبە ئەکادیمییە زانستییە بێلایەنەکانەوە، بەڵێ ئەم بە جۆرەها شێواز توێژینەوە و شیکاریی دەکات، بەلام تەنها بەپێی بۆچوون و رای تایبەتی خۆی، نەك بگەرێ بەدەلیلەوە راستییەکان بدۆزێتەوەو، لەگەڵ سەرچاوەکاندا لێکیان بدات و شتێك دەربهێنێ، پێشتر

نووسەرێك كتێبێكی لەسەر باسەكانی مێژووی كۆنی كوردی پێش زاینی نووسیووە، هەڵە و ناڕاستیی زۆری لە بیروڕای دكتۆر جەمال خستووەتە روو، كە بە نەزانیی و بۆچوونی نادروست بە رای خۆی بۆ مێژووی زۆر كۆنی دارشتووە، منیش لەلای خۆمەوە پێم باشە لەسەر پارچە بەشێكی بەرگی سێیەمی كتێبی (ظهور الكورد) بووەستم كە هەڵە و دەستێوەردان و بوختان، لەگەڵ جۆرێك لە رق و قین و دژایەتی پێوەدیارە، نووسەر بەكەیفی خۆی چۆنی حەزكردووە و پێی باش بووە بنووسیێ، ئاوای تاشیوەو دارشتووە، بێئەوەی سەرچاوەكان بهێنێ، شێواندنی تێداكردووە.

دەمەوێ قسە لەسەر هەندێ خاڵی بەشی چوارەم لە بەرگی سێیەم بكەم بە ناوی (العادات القبلية العربية الاسلامية و تأثيرها على الحياة الروحية والمادية للأمة الكوردية) كە دەكاتە لاپەرە (٣٥١ – ٤٩٤)، لێرەدا تەنها لەسەر (١٠) خاڵێك دەوەستم، دەنا دەتوانی بەوەندەی بەرگی سێیەم لەسەر ئەو بەشە كەمە بوەستی، تەنها دە خاڵ لەو بەشە گەورە باس دەكەم وەك نموونە بۆ هەموو كتێبەكە.

ئەو لەم بەشەدا باس لە ئیسلام و كاریگەریی لەسەر كورد دەكات، رەخنە لەوە دەگرێت كە ئیسلام كاریگەریی خراپی لەسەر ئایین و رەوشت و داب و نەرێت و باری كۆمەڵایەتی كورد جێهێشتووە، بەڵام كە باسی كاریگەریی ئایینەكانی تر و گەلەكانی تر دەكات لەسەر كورد، بێوەستان، زۆر سادە و راگوزەری لەسەری نووسیوون، هیچ تێبینیەكی نیە، بەڵام كە دێتە سەر ئەم بەشە و كاریگەریی ئیسلام باس دەكات، زۆر جیاوازتر لەوانی تر، دڵ پڕ بە قین، رقی چەندساڵ كۆنی مۆڵخواردو، خەفەقان و دوژمنكاری فراوانی پێوە دیارە بەرامبەر ئیسلام و پێغەمبەرەكەی، كە هەموو كەس رادەچڵەكێنێ و هەستی پێدەكات، ئەو هەتا دوا ترۆپكی توورەیی و دژایەتیی ناو دڵ و مێشكی بەرامبەر پێغەمبەر هەڵدەرێژێ، كە ساڵانێكی زۆرە ئێمە دكتۆر دەناسین، ئاشنای نوسینەكانین، هەستمان نەكردوە ئەمەی لە ناخدا حەشاردابێت، بەڵام مەخابن ئەو بە تەواوی شووڵی لێهەڵدەكێشێ،

له سكه لادەدات، وەك كەسێك كە لە پرێكدا لە ژوورێكدا زەینی لە دەست بدات، بەریبێتە دەرگا و پەنجەرە، هەرچی ناشیرین و نەگونجاوە بە بەرامبەرو دەوروبەری بڕێژێ، بەڕاستی من كە ئەم كتێبەم خوێندەوە، حەپەسام، وتم داخۆ چی وای لەم شارەزایە كردووە لە پرێكدا ئەم دۆخە نالەبارەی بەسەردا دێت..؟

دكتۆر جەمال لەم بەشەدا جیاواز لەو سێ هەزار لاپەڕەی تره دەنووسێ، زۆر سەیر و سەمەرەیە، لە باسی جولەكە و گاور و ئاشوور و بابل و بتپەرست و خۆرپەست و دارپەرست و تاریكی پەرستدا، هێمنانە و سادەو لەسەرخۆ هەنگاو دەنێ و مامەڵە دەكات، چی ئارەزوەو پێی باشە و خۆشە بە قەڵەمیدا دێت، بە هەناسەی سارد و لەسەرخۆو بێكێشە دەنووسێ، بەڵام كە دەگاتە سەر ئیسلام و موحەممەد پێغەمبەری سەروەری مرۆڤایەتی ﷺ، هەر نالێی ئەو پیاوەی پێشووە، وەكو شەیتان دەستی لێوەشاندبێ، پەتایەكی خراپ دەیگرێ، تای لێدێ، كەف دەچەرێنێ، جل و بەرگی ناخی فڕێدەدا، دەداتە شاخ و چەم و دۆڵەكانی دەرون، خۆی لە قورولیتەی هەوەس دەنێ، هەش دەكات بەسەری خۆیدا، كار لە دەماخ و زەینی دەكات، پەستانی خوێنی فشار دێنێ، شیزۆفرینی وڕێنە دەیگرێ، هەرچی ناشیرین و نەشیاوە و كەس نەیتوانیوە بە محەمەد، ناودارترین و ناسراوترین كەسایەتی مێژوو، بڵێ، هەر لە نەفامەكانی قورەیشەوە، هەتا بێبڕواكان و ناهەق پەرستان و ڕۆژهەڵاتناسانی كۆن و ئەم سەردەمە، ئەوانە تێدەپەڕێنێ، دەڵێ "موحەممەدی كوڕی عەبدوڵڵا ناوی (قـثم) كوڕی (عەبدوللات) بووە"، "پێنج ساڵ دوای مردنی باوكی لە دایك بووە"، "كوڕی باوكی خۆی نییە" و "پەلاماری كچی خەڵكی داوە"، "بەبێ مارەكردن ژنی گواستوەتەوە" دڵی چووە لە ژنی هاوڕێكانی"،و زۆر شتی ناشیرینی تر، كە مەگەر هەر ئەو بتوانێ و غیرەت بكات و بوێرێت بیڵێ، خوا لە وەسفی محەمەددا فەرموویەتی: (بە ڕاستی تۆ خاوەن ڕەوشتێكی بەرزو مەزنی)، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (من خوا ئەدەبی داداوم بە ئەدەبێكی جوان)، بەڵام بەناو دكتۆرێكی بە ناو موسڵمانی ئەمڕۆی كۆمەڵگەی كوردی، ئاوای بەرامبەر دەڵێ! ، نازانم ئەم هەموو بوختان هەڵبەستن و

شێواندنانەی مێژوو لە پای چی؟!، ئایا ئەم موحەممەدە جگە چاکە چی بۆ کورد هێناوە، لە بتپەرسی رزگاری کرد بۆ خواپەرستیی، لە دەست فارس و ڕۆم رزگاری کرد، کردیە حاکمی ولاتی خۆی، کە هەزار و سەد ساڵ بوو لێی زەوتکرابوو، زەینی براکوژی و خۆخۆری تیا مراند، وەکو هەموو میللەتانی تر فێری داب و نەریتی جوان و خۆشەویستی و رەفتار شیرینی و ژیانی شارستانیانەو حوێندەواری کرد، کە لەوەوپێش فارس و ڕۆم بە زۆری قامچی و باج و پیتاك كۆڵیان كوتابوو، نەیاندەهێشت بیر لە خوای و لە خۆی بکاتەوە، کرابووە خۆراکی شەڕی هەزار ساڵەی نێوان خۆیان.

خۆ دکتۆر جەمال لە من باشتر ئەمانە دەزانێ، بەڵام هەروەکو پەیمانێکی دابێ، شتێکی بۆمۆرکرابێ، ئەم رستە خراپانە بۆ ئایین و پێغەمبەری کورد (موحەممەد ﷺ) ریزدەکات، ئەم وتانە نە لە رستەی لێکۆڵەرێك دەچێت، نە لەگەڵ ئەدەب و باوی گشتییدا پێکدێتەوە، نە هیچ یاسایەکیش دەیگرێتەوەو بەوە رازیە بوختانی وا بۆ پێغەمبەری میللەتێك بکرێت کە ٩٠٪ ی خەڵکەکەی خۆشیان دەوێ و پەیرەوی لێدەکەن، نە لەگەڵ ئازادی ڕادەربڕین و ڕێزگرتنی بەرامبەرو ڕاستی مێژووییشدا یەکدەگرێتەوە.

دەبێ ئەم باسەی دکتۆر جەمال چ نرخێکی زانستیی هەبێت.؟ یان چ راستیەك لە وتنیدا هەیە.؟ کام سەرچاوە پشتی دەگرێت.؟ کە چواردە سەدە زیاترە موسڵمانانی جیهان لەسەری دەژین و پێی پەروەردە دەبن و، دەیان هەزار سەرچاوە باسی دەکات، کەسێك وتەیەکی وای بەرامبەر پێغەمبەر نەوت.

رەنگە دکتۆر جەمال بەم رستە لاوازە بێ سەروبن و بێ سەرچاوانە، بیەوێ کورد لە ئایینەکەی بتۆرێنێ، ئەوە بیرکردنەوەیەکی پووچە، ئەو سەردەمە گوزەرا کە خەڵکی نەخوێندەوار، دوای قسەی کەسێك بکەون کە نەیناسن و هیچ بیرۆکەیەکی گونجاوی لە مەخزدا نەبێت، خزمەتێکی بە گەل و خاك نەکردبێ، دکتۆر جەمال نە چاکسازو خێرخوازو پێشەوایە، نە فەیلەسوفێکی دانشمەند، کە داهێنان و راستە ڕێیەکی بۆ گەلەکەی دۆزیبێتەوە، ئەو هەیە و نییە خاوەن قەڵەمێکە، بە قەدەر

نووسینەکانی هەڵەی مێژوویی لە مێژووی کوردا کردووە، تەنانەت هەڵەیەکی کردووە کە هیچ کەس پێش خۆی بە دوژمنەکانی ئایین و کوردیشەوە نەیانکردووە، ئیتر دەبێ ئەم رستانە جگە لەوەی خاوەنەکەی قێزەون و ناشیرین بکات، راستگۆیی لە دەست بدات، مەکۆی هەڵەکانی مۆل بکات، خۆی لە قورپێنێ چ نرخێك دەچێتە سەر پێشینەی..؟ ئەو ئەگەر لەسەر قۆناغێکی وونی مێژوو بە کەیفی خۆی شتی بنووسیبایە، رەنگە لە بێئاگایی خەڵك شتێکی دروست بکردایە، وەك لە باسەکانی مێژووی کۆنی کوردا بە کەیفی خۆی شتی وتووە، ئەوە بە هەرحاڵ، بەڵام لە نەگبەتیی ئەو، باسی لە قۆناغێك کردووە، کە دەوڵەمەندترین قۆناغە لە رووی زۆری سەرچاوە و نووسینی بڕواپێکراو و بەڵگەنامەی دروستەوە.

ئەمڕۆ خەڵك قسە لەسەر بەرزترین دەسەڵات دەکەن لە کوردستاندا، هەڵە لە باڵاترین لێپرسراو ناخۆنەوە، لە رۆژنامەکاندا پەردەی لەسەر هەڵدەماڵن، نەخوازەڵڵا کەسێك درۆ بە دەم مێژوویەکی روونەوە بکات، بوختان بۆ پێغەمبەری یەك ملیار مرۆڤ دروست بکات، وابزانێ خەڵکی لێدەتۆرێنێ، چەندان کەسی لەو جۆرە هاتن و شتی خراپی زۆریان وت، نە خۆیان و نە بیرۆکەکەیان، هیچ جێیەکی نەگرت، هەر لەسەردەمی نووسەرەکەدا مەبەستی دەرخراو بەدرۆ خرایەوە، دوای مردنیشی تەنها زبڵدانی مێژوو جێیان بۆ کردەوە، پاشانیش کەوتە بەر نەفرینی خەڵك.

ئەم دکتۆرە ئەکادیمییە خۆی چەند جار باس لە نووسینی جددیی و ئەکادیمیی دەکات، باس و خواسی خەڵکی بە دڵ نییە، بەڵام خۆی لە هەموو کەس خراپتر تێدەکەوێ، هیچ شێوازێکی زانستی بەنووسینەکەیەوە دیار نییە، تەنها خەیاڵاتی ناو مێشکی، تێکەڵ بە رق و قین و بوغزی ناو دڵی دەکات، بێ پەردە و دوور لە هەموو ئەدەب و سەرچاوەیەك، بە کەیفی خۆی، وەك بزانێ لەم دونیایەدا کەس نەماوە جگە خۆی، چی بڵێت دروستە و ڕەوایە چەسپاوە و وەرگیراوە، ئەو وادەزانێ شامی شەریفە، وەکو بۆ خۆی دەستتێوەردان لە مێژووی کوردا دەکات، لە ژوورێکی داخراودا خەیاڵ بۆ مێژووی سیی هەزار ساڵ لەمەو بەری کورد لێدەدا و

دەینووسێ و بۆ خەڵکی دەکاتە واقیع، وا دەزانێ ئەمەشی بۆ دەچێتە سەر، بەڵام وەك لەودا چەند بابەت و کتێبی لەسەر نووسراو، درزین و هەڵەو گزیەکانی ئاشکرا کرا، ئێمەش لێرەدا بوختان و دەستێوەردانەکانی دەخەینە ڕوو..!!

ئەمانە دەستەیەکی هەڵاتووبوون، لە هەستیارترین دۆخە نالەبارەکانی کورددا، هەڵهاتن بۆ تاراوگە، پەناگایەکی دوور لە کێشەو دوور لە نەتەوەکەیان دۆزیەوەو سەریان کز کرد، ئەوان لاوازترین هەڵوێستیان نواند، کە بینیان دوژمن دەمی ئاژەنیوەتە لاکی میللەت، ترسان و هەڵاتن و بۆیان تەقاند، وایان زانی ئیتر میللەت مردو فەوتا، لە ئەوروپاوە لاشەی شەهیدەکانیان دەژمارد، بە تویی ڕۆب و بیجامەوە کیمیاوی و ئەنفال و قات و قڕی و ڕەوی ملیۆنی کوردییان وەك فلیم لە کەناڵەکانەوە دەبینی و سواڵیان پێوە دەکرد، لەوێ بە کاری پڕوپوچەوە خۆیان دەخلەفاند، وەك ئەوروپیەك دەژیان و دەخەوتن و بیریان دەکردەوە، دوای هەژماردنی چەندین کاریسەی یەك لە دوای یەك، دوای ڕاپەڕینی قۆناغی پڕ مەترسی قڕکردنی کورد، دوای قوربانیەکی زۆر، ئەم بەلاش خۆرو بە لاشە کوردو بە عەقڵ ڕۆژئاوا پەرستە خلەفاوانە، گەڕانەوە سەر سفرەی حازر، ئەوان کە زانییان کەش و دۆخ ڕەخساوەو لەبارەو، دونیا هێورو کش و مات بوەتەوە، ئەوان کە بیستیان تەقەو ڕەقەو نرکەیەك لە ئارادانەماوە، ناخۆشی لە ڕووی خەڵك بڕاوە، قڕان و وشکە ساڵی بەسەر چووە، کاتی بەروبوم و دەغڵودان و حاصلات چنینەوەیە، هاتنەوە، خەرمان بەرەکەت، خۆیان گەیاندە تەقنەی فەقێ و هەریسەکە، بەشی خەڵکی ڕەنج فەوتاویان خوارد، بەرهەمی خەڵکە داماوەکەیان لوشدا، لەوەی کە کورد بە واوەیلاو زەحمەت بەدەستی هێنابوو، حیزب بە ستەم بانگی کردنەوە، بەسەر کوڕە شەهیدو بنەماڵەی شەهیدو ماڵ کاولدا بازی پێدان، لەبەشی ئەوان شاباشی کردن، جێ و ڕێ و پلەو پایەی مۆڵی دانێ، دەستی دایە بنباڵیان و بەرزی کردنەوە، هەموو شتی پێبەخشین، مۆڵەتی داون ئەو ڕەفتارەی لە ڕۆژئاوا فێری بوون، لە دووتویی ئەدەب و مێژوونووسین و، لە ژێر پەردەی ئازادیدا سوکایەتی بە پیرۆزیەکانی گەلەکەیان بکەن.

دانشگا هەرچۆن سەیری کاری ئەم پیاوانە دەکات، ئێمە ناچارین، بۆ بەرگری لە ئیسلام و پێغەمبەرەکەمان وەڵامی ئەو هێرشانە بدەینەوە، لە پێوانەی ئەم نووسینە دەستچێنە گاڵتەبازارییەی دکتۆرەوە، زانیارییەکانی تریشی بخەینە ژێر پرسیارو لێکدانەوە، هەتا چیتر دکتۆر و جۆرەکانی نەتوانن بە کەیفی خۆیان بڵێن و بنووسن و، ورێنەو بوختان و درۆ بۆ خەڵکی بکەنە تێزو زانست و کڕین و فرۆشی پێوە بکەن.

من لەم باسەدا تەنها دە خاڵ دەهێنم و شیدەکەمەوەو هەڵی دەسەنگێنم، بزانین چەندە ڕاستی لەوتەکانی دکتۆردا هەیە، ئەمە دەکەمە نمونەی ئەم مەلۆ تاوانەی کە دکتۆر بەرامبەر محەممەد هەڵبژاردەی خوا ئەنجامی داوە:

## ١- عەبدوڵلا، یان عەبدوللات

سەیرە، زۆر سەیرە بۆچوونەکانی دکتۆر جەمال، وەك لە باسی ناوی موحەممەددا ﷺ هەڵەو نەپێکرانی کردووە، لە باسی باوکی موحەممەد پێغەمبەریشدا هەڵەیەکی زۆر گەورەی کردووە و دەڵێ: "باوکی موحەممەد ناوی عەبدوڵلا نییە، ناوی عەبدوللاتە"، لە چەندین جێگەدا بە عەبدوللات ناوی دەبات، کە وتن و نەوتنی هیچ سوودێکی نییە، جگە خۆنواندن و دژایەتیکردنی ئاین و دەرخستنی رق و قینی دڵ بەرامبەر بە ئیسلام و پێغەمبەرەکەی، دەنا ئەمە داهێنانێکی زانستیی نوێ نییە، کە بەبێ سەرچاوە و لە خۆیەوە ناوی عەبدوڵلا دەکات بە عەبدوللات، ئەم مەبەستێتی بڵێ بنەچەی پێغەمبەر ﷺ پاك نییە، وەك هەموو سەرچاوە و زانایانی بنەچەو ڕەچەڵەك و ئەنساب باسیان کردوەو دەڵێن: "موحەممەد هەتا ئیبراهیم پاك و بێگەرد و ناودار و ئەشراف بوون و بنەچەی بە پاکیی رۆیشتووە"، بەڵام دکتۆر جەمال نایەت گفتوگۆی بنەچەی پێغەمبەر ﷺ بکات و بە سەرچاوە قسە بکات، نەزانانە دەڵێت باوکی پێغەمبەر ناوی عەبدوڵلا نییە، چونکە عەبدوڵلا واتە بەندەی خوا، بەڵام عەبدوللات واتە بەندەی لات، کە بتێکی گەورەی عەرەب بووە لە مەککە، زۆر سەیرە دکتۆر جەمال لە هەر جێگەیەکدا کە بە سەرچاوە قسە دەکات، ناوەکە موحەممەدەو باوکیشی

عەبدوڵلایە، بۆ نموونە لەو لاپەڕەیەدا چەند جارێك ساختەچییانە دەڵێ محەممەد ناوی قثمە و باوکی ناوی عەبدوللات، بەلاّم دواتر هەر لەو لاپەڕەیەدا دەڵێ: دکتۆر مەقریزی لە کتێبی (المجهول في حياة الرسول)دا دەڵێ وتارەکەی ئەبو تالیب بۆ داواکردنی خەدیجە بۆ موحەممەد بەم جۆرەیە (الحمد لله الذي جعلنا من ذرية ابراهيم و زرع اسماعيل.. وجعلنا الحكام على الناس، ثم ان ابن اخي محمد ابن عبدالله لا يوزن به رجل ولا رجح به)[1] ئێمە نازانین ئەم بۆچوون و نووسینە درۆیینەو ساختەکارانەیە ناوبنێی چی...؟

ئەو رستانەی دکتۆر جەمال کە لەباتی وشەی عەبدوڵلا وشەی عەبدوللاتی تیا بەکار بردوە ئەمانەن:

لە لاپەڕە (٣٩٨)دا دەڵێ: "یەکی نەگرت بیروڕای خەڵکی ئەو هۆزانە لە ژێر ئایینزایەکی دیاریکراودا هەتا ئایینی ئیسلام هات و دەرکەوت کە قثم کوڕی عەبدوللات (موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا) مژدەی پێدا"، ئەنجا ژمارەیەکی لەسەر عەبدوللات داناوە و لە پەراوێزدا دەڵێ: "عەبدوللات برای عەبدولعزا کوڕی عەبدولموتەلیبە، ناوی هەردووکیان لە ناوی دوو بتەکەوە هاتووە، (لات و عوزا)، هەردووکیان لە پاڵ هوبەل و مەنات و ئەساف و نائلەدا بوون، لە بە ناوبانگترین بتەکانی ناو کەعبەن"[2]، بەم پەراوێزەدا دیارە کە دکتۆر جەمال مەبەستی لە ووروژاندنی ناوی عەبدوللات ئەوەیە، کە بڵێ بنەچەی پێغەمبەر موحەممەد پاك نەبووە و بتپەرست بوون و ناچنەوە سەر ئیبراهیم پێغەمبەر، بەلاّم ئەمە رایەکی خۆکوژییە و سەرکێشانە بە بەردا، بڕوایەکی نەزۆك و لەرزۆك و کاڵ و کرچە و کەس ناهێنێتە بڕواکردن، کەسیش بۆی ناڵێتەوە، تەنانەت خۆیشی لە ناخدا بڕوای بەم وتانە نیە، بۆ کارێك ئەمەی کردوە، ئەوەندە وتەکانی نەشیاو و نامۆن، تەنانەت خۆیشی ئەگەر لە پاڵ قثم دا لە دوو بازنەدا ناوی (موحەممەد) نەهێنێ و،

---

[1] ظهور الكرد، ج٣، ص٣٩١.

[2] ظهور الكرد، ج٣، ص٣٩١.

له پاڵ عەبدوللاتدا له دوو بازنەدا ناوی (عەبدوڵلا) نەهێنیّ و له پاڵ ناوی قثم کوڕی عەبدوللاتدا رستەی (موحەممەد کوڕی عەبدوڵلا) نەهێنیّ، خۆی دەزانیّ کە کەس نازانیّ باسی کێ دەکات.

له لاپەڕه (٣٩٩)دا دەڵێت: "دەرکەوتنی ئیسلام و رۆڵی قثم کوڕی عەبدوللات (موحەممەد کوڕی عەبدوڵلا) له پێشخستنی پەیوەندییه کۆمەڵایەتییەکان".

دکتۆر جەمال له لاپەڕه (٤٠٢)دا دەڵیّ: "لە ناو قورەیشییەکاندا وا بڵاوه کە موحەممەد دوای مردنی عەبدوللات له دایك بوو".

لە لاپەڕه (٤٠١)دا دەڵیّ: "وەك ئاشکرایه کە قثم کوڕی ئامینەی کچی وەهەبه...، بەڵام باوکی عەبدوللات (کە لە سەردەمی ئیسلامدا بە عەبدوڵلای کوڕی عەبدولموتەلیب ناسراوه) کە له بەڵگەنامه مێژووییەکاندا هیچی لەبارەوه نازانین، عەبدوڵلا نازناوێکە کە دواتر له ناو موسڵمانانا بڵاوبوویەوه بۆ ئەو ناوه رەمزیانەی کە له سەردەمی نەفامییدا بڵاوبوو، وەك عەبدولعزا و عەبدوللات و عەبدولشەمس کە هەموو موسڵمانێك دەبێتە عەبدوڵلا واتە بەندەی خوا".

١- عەبدوڵلا ناو زۆر هەبووه پێش ئیسلام، زۆر کەس ناویان عەبدوڵلا بووه، وانیه کە ئەمه ناوی دوای ئیسلام بووبێت، دواتر ناویان دەبەین.

٢- عەبدوڵلا چیرۆکی ژیانی بەشی خۆی هەیە، وردەکاری زۆر لە ژیانی ئەو پیاوەدا بووه، کە پاشتر باسی دەکەین.

بەناوبانگترین بتی ناو هۆزە عەرەبەکان لات و عوززا و مەنات بووه، وەك قورئان دەفەرمووێت: (أَفَرَأَيْتُمُ اللَّاتَ وَالْعُزَّى * وَمَنَاةَ الثَّالِثَةَ الْأُخْرَى * أَلَكُمُ الذَّكَرُ وَلَهُ الْأُنثَى *تِلْكَ إِذاً قِسْمَةٌ ضِيزَى)(النجم :١٩-٢٢).

لات بەردێکی دانیشتووه لە تائیف، خانوویەکی بەسەرەوه کراوه و گەڕەکێکی هەیه و هەرەمێکیان بۆ تاشیووه، عەرەب بۆی دەهاتن و قوربانیان بۆ سەردەبری، زێوانەکانی له بەنی موغیس بوون له سەقیف، کێبەرکێی کەعبەیان پێدەکرد لە مەککە، بەڵام عوززا درەختێکە لە دۆڵی نەخلە لە رۆژهەڵاتی مەککە، مەنات

بەردێکی رەشە و پەرستگایەکی بۆ کراوە لە قەدید لە نێوان ڕێگەی مەککە و یەسریبدا، گوایە خوای مردنە[1].

تەها حسێن لە (علی هامش السیرة)دا هەرچەند بە مەبەستێکی دوژمنکارانە نوسیوویەتی وەك لەبەشی دووەمدا باسم کردوە، بەلاَم باسێکی جوانی خەمەکانی عەبدولموتەلیبی لە شێوازێکی ئەدەبییدا دارشتووە.

ئایینەکانی مەککە لەو کاتەدا جۆراوجۆر بوون، وەکو قورئانیش بە وردی باسیان دەکات، بتپەرستەکان (الله)یان دەپەرست، گەر بتوتایە کێ خواتانە و خوای زەوی و ئاسمانەکانە و هەموو شتی بە دەستە؟ دەیان وت (الله)[2]، بەلاَم ئەوان شەریك و هاوڕێ و کچ و کوڕ و ژنیان بۆ خودا دادەنا، دەیانگوت: ئەم بتانە لە خوا نێزیکمان دەکەنەوە و بە خوامان دەگەیەنن، ئێمە خراپین رووی لای خوامان نییە، ئەم بتانە شەریکی خوان و واسیتەن، پەیوەندی و داوای ئێمە بە خوا دەگەیەنن، بەلاَم ئەوان بەندەی جبت و تاغوت بوون، بڕوایان بە جنۆکەو هەندێ کائیناتی غەیبی هەبوو، کە گوایە دەسەلاَتیان هەیەو دەتوانن کاریگەریان لەسەر ژیان هەبێت، شێوەیان لە دار و بەرد بۆ تاشیبوون، وەك (هوبەل) (ئەساف، نائلە، نەهیك، قزح) (عوززا و لات و مەنات) (شیعراو خۆرو بەعل) (وەد و سواع و یەغوس و یەعوق و نەسرا) (زوشوعرا و زوخەلسە و فلسی) و زۆری تر، کە هەموو لە شێوەی مرۆڤ و باڵندە و گیاندار و دارو درەخت و شتی سەیر و سەمەرەدا هەبوون[3]، داوایان لێدەکردن و قوربانییان پێدەبەخشین و شەڕیان لەسەر دەکردن.

(عەبدولموتەلیب کوڕێکی هەبوو ناوی عەبدوڵلا بوو، بچووکترین کوڕی بوو، ژنەکەی ناوی ئامینە بوو، عەبدولا مرد، دایك و کوڕەکەی بە هەتیوی جێهێشت،

---

[1] ابن الكلبي، الأصنام، ج١٣-١٥، الكعبة، ص٣٧..

[2] بڕوانە سورەتی (المؤمنون: ٨٤-٨٩)، (العنكبوت: ٦١-٦٣)، (لوقمان: ٢٥)، (الزمر: ٣٨)، (الزخروف: ٨٧) زۆری تر.

[3] محاضرات في تأريخ العرب، ج١، ص (١٦٩-٢٠٥)، د. صالح احمد العلي.

ناکۆکی هەیە لەسەر مێژووی مردنی عەبدولا، مەسعودی کورتی کردووەتەوە و دەڵێ: (وەك تەبەری دەگێڕێتەوە دوای دوو مانگ لە لە دایك بوونی محەممەد مرد، هەندێ دەڵێن پێش لە دایك بوونی مرد، ئەوە راست نییە، چونکە کۆی گشتیی لەسەر ئەوەن کە دوای لە دایکبوون مردووە، هەندێك دەڵێن دوای ساڵێك لە لە دایکبوونی [1]، ئیبن کەلبی و سوکەریی دەڵێن کە تەمەنی پێغەمبەر ٢٨ مانگ بوو عەبدولا مرد [2].

ئەبوفیدا دەڵێ: " عەبدوڵلا ٢٥ ساڵ پێش فیل لە دایك بوو، باوکی خۆشیدەویست، چونکە جوانترینیان و پاکترینیان بوو، ناردی بۆ کاسبی، کە بە یەسریبدا تێپەڕی لەوێ مرد، ئەو کاتە پێغەمبەر دوو مانگ بوو، یان دەڵێن ئامینە سکپڕ بوو، عەبدوڵلا لای بنەماڵەی حاریس کوری ئیبراهیمی کوری سوراقەی عەدەوی ئەسپەردە کرا، کە خاڵوانی عەبدولموتەلیب بوو [3].

کورەکانی عەبدولموتەلیب جگە ناوی خۆیان، وەك باوی ئەو سەردەمە، نازناویشیان هەبووە، عەبدولموتەلیب دە کوڕی هەبووە، عەبدولمەناف ئەبو تالیب بووە، مقەدەم نازناوی عەبدولکەعبەیە، دەڵێن بە عەبدوڵلاشیان وتووە عەبدوددار واتە عەبدولکەعبە، واتە خزمەتکاری ماڵ، یان کەعبە، یان دەڵێن پێیان وتووە عەبدی قوصەی، قوصەی باپیرە گەورەی بووە، وشەی عەبد لەوانەدا بە مانای بەندە و پەرستش نەهاتووە، بەڵکو بە مانای زێوان و خزمەتکاری کەعبە و ماڵی خواو خزمەتکاری خەڵك هاتووە [4] وەك ئەمڕۆ چۆن دەڵێن خادیم الحەرەمەین.

قوصەی کوڕی کیلاب چوار کوڕی هەبوو بە ناوی (عەبدولمەناف، عەبدوددار، عەبدولعوززا، عەبدولقوصەی) هاشم کوڕێکی هەبوو ناوی عەبدولموتەلیب بوو،

---

[1] مروج الذهب، ج٢، ص٢٨٠.

[2] رواية ابن كلبي في ابن سعد، ج١ قسم ١، ص٦٢.

[3] تأريخ ابي الفداء، الملك المؤيد عمادالدين ابي الفداء، توفي ٧٣٢ك، ج١، ص١٦٨، بيروت ١٩٩٧.

[4] اليعقربي ج١، ص٢٣٠.

شفاءی دایکیان ناوی سەلمای کچی عەمروی بەنی نەجار بوو، کە هاشم چوو بۆ شام، عەبدولموتەلیبی کوڕە بچووکی لەگەڵ خۆی برد بۆ لای بەنی نەجاری کەسوکاری، کە هاشم مرد ئەمان لە مەدینە جێگیربوون و مانەوە.

عەبدولموتەلیبی کوڕی عەبدولمەناف کاری مەککەی گرتەدەست، دوای هاشمی برای، ڕۆیشت موتەلیبی برازاشی لە مەدینە هێنایەوە و لای خۆی گەورەی کرد، ئەویش ناونرا عەبدولموتەلیب، (ئەم دوو عەبدولموتەلیبە دوو کەسی جیاوازن) کە کاروانی یەمەن ئامادەبوون موتەلیب بە عەبدولموتەلیبی وت کوڕی برام هەڵسە لە جێی باوکتدا دانیشە، لە جێی موتەلیب دانیشت، موتەلیب لەو سەفەرەدا مرد، عەبدولموتەلیب بووە بەڕێوەبەری مەککە، خاوەن شەرەف و نانبدە و شیر و هەنگوینی دەبەخشی و ناوی دەرچوو، بووە گەورەی قورەیش، بیری زەمزەمی لێدا وەك لە خەودا پێیان وتبوو، ئەو کاتە هەر (حارس)ی هەبوو کوڕی بوو، کەعبەی پاککردەوە و ئاوەدان و جوانی کرد، کە قورەیش زانییان سەروەری و شانازی بۆ خۆی بردو ناوی بلاّو بویەوە، داوای هاوپەیمانییان کرد تا خۆیان بەهێز بکەن بەرامبەر بنەماڵەی عەبدولمەناف و عەبدوددار و بەنی سەهم، بەلاّم هەندێك بنەماڵە رازی نەبوون، عەبدولموتەلیب بیرێکیشی لە تائیف لێدا، کە ئەبرەهە هات و خەڵکی مەککە چوونە دەرەوە، بۆ سبەینێ عەبدولموتەلیب عەبدوڵلای کوڕی نارد بۆ هەواڵ زانین، عەبدوڵلا بە سواری ئەسپێکەوە هاتەوە و هەواڵی لەناوچوونی سوپاکەی ئەبرەهەی هێنا[1].

دکتۆر جەمال دەڵێ: "پێش ئیسلام کەس نەبووە ناوی عەبدوڵلا بێت و ئەو ناوە باو نەبووە"، بەلاّم ئێمە بۆ ناڕاستی ئەو قسەیە ناوی کۆمەڵێك شاعیری سەردەمی نەفامی دەهێنین کە خۆیان، یان باوو باپیریان موسڵمان نەبوون و ناویان عەبدوڵلا بووە، پاشان لە کرۆکی قورەیش و کەسوکاری پێغەمبەر ژمارەیەك عەبدوڵلا ناو دەهێنین کە موسڵمان نەبوون:

---

[1] الیعقوبي، ج١، ص٣٠٥.

عەبدوڵڵای کوڕی وائیلی جەریر کوڕی عەبدولمەسیح کوڕی عەبدوڵڵا، حاتەمی تائی کە ناوی حاتەم کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی سەعد کوڕی ئەمروئولقەیس بوو، ئومەییەی کوڕی ئەبی سەڵت شاعیر و سەرۆکی سەقیف کە ناوی عەبدوڵڵا کوڕی ئەبی رەبیعەی سەقەفی بوو کە بڕوای بە بتپەرستی نەبوو و داوای یەکتاپەرستیی دەکرد[1]، عروەی کوڕی ئەبی زەیدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ناشب شاعیری جاهیلی بوو، ئیبن زوبعری شاعیری جاهیلی کە ناوی عەبدوڵڵا کوڕی قەیسی کوڕی عەدی بوو، عەبدوڵڵا کوڕی عامری کوڕی کەندی شاعیر[2]، ئەمانە هەموو شاعیری جاهیلیی بوون.

پێغەمبەر لە پەیمانی فزول (حلف الفضول) دا تەمەنی بیست ساڵ بوو بەشداربوو، لە ماڵی عەبدوڵڵای کوڕی جەدعان بەشداری هاوپەیمانییەکەی کرد، دەفەرموێ :"ئەو هاوپەیمانییە دڵی خۆش کردم، ئەگەر ئەمڕۆش داوای هاوپەیمانییەکی لەوەی ماڵی عەبدوڵڵام لێ بکەن دەیکەم"[3].

لە ڕێکەوتنی بەردەڕەشەکە، کە پێغەمبەر دەرکەوت وتیان (قد رضينا بحكم محمد بن عبدالله)[4]، ئەبو تالیب لە کاتی داواکردنی خەدیجە بۆ محەممەد وتی: (ثم ان ابن اخي محمد بن عبدالله)[5]. ئەم دوو ناوی محەممەدو عەبدوڵایە باسی ڕوداوی پێش ئیسلامە.. !

ناوی عەبدوڵڵا لە سەردەمی نەفامیدا، واتە پێش ئیسلام، لە بنەچەی پێغەمبەردا زۆر بوون، لەوانە:

ئەبو عوبەیدە عامری کوڕی عەبدوڵڵای جەڕاح، تەنها ئەبو عوبەیدە ئیسلام بوو، نەعیم کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەسید کوڕی عەبدعەوف، تەنها نەعیم ئیسلام بوو،

---

[1] الاعلام ٢ للزركلي.

[2] اليعقوبي، ل٣١٥-٣٢٤.

[3] اليعقوبي، ل ٣٣٨.

[4] اليعقوبي، ل٣٤٠.

[5] هەمان سەرچاوە، ل٣٤١.

سەعید کوڕی زەید عـەمروی کـوڕی نـەوفیل کـوڕی عەبـدولعوززای کـوڕی عەبـدوڵڵا عودەی، تەنها سەعید ئیسلام بوو، تەڵحـەی کـوڕی عوبەیـدوڵڵای کـوڕی عوسمـانی تەمیمی، کە تەنها تەڵحە موسڵمان بوو، درهەم عەبدولمەناف کوڕی ئەسەدی کـوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عـەمری مـەخزومی، تـەنها درهـەم موسـڵمان بـوو، ئـەبو سـەلەمە (عەبدوڵڵا) کوڕی عەبدولئەسەدی کوڕی هیلالی کوڕی عەبدوڵڵا، تەنها ئەبو سـەلەمە موسڵمان بوو.

لەناو ڕەچەڵك و باوانی پێغەمبەردا ئەم عەبدوڵڵایانـە هـەبووە کـە هەیانـە چـوار پێـنج پشـت لـە سـەردەمی سـەرەتای ئیسلامیشـەوە دووربـوون، جگـە لـە دەیـان عەبدوڵڵای تر کـە نـاکرێ ناویـان بهێـنین، چـونکە لـە سـەردەمی نەفامییـدا خەڵکـە بتپەرستەکە بڕوای تەواویان بە خوا (الله) هەبووە کە خۆیـان و ئـەرز و ئاسمانیـانی دروسـت کـردووە، دەسـتی هەیـە لـە کـار و کاسـبی و ژیـان و مردنیانـدا، بـەڵام بتەکانیان بە نەفامی خۆیان بۆ ئەوە دروست کردبوو کە لە خوایان نێزیك بکەنـەوە (لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى)[1].

پێغەمبەر ناوی هەندێ کەسی گۆڕی بۆ عەبدوڵڵا، وەك:

عەبـدوڵڵای کـوڕی ئـەبی ڕەبیعـە، نـاوی بحـیر بـوو نـاوی گـۆڕی بـۆ عەبـدوڵڵا، عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی عەوف بەجلی، نـاوی عەبدوششـەمس بـوو کردیـە عەبـدوڵڵا، عەبدوڵڵای کوڕی بەدری جەهەنی مەدەنی، ناوی عەبدولعوززا بوو[2].

عەبـدوڵڵای کـوڕی حـەکیم زەبـی، نـاوی عەبـدولحارس بـوو کردیـە عەبـدوڵڵا[3].

عەبدوڵڵای کوڕی حارسی کوڕی جوزئی زەبیدی، ناوی عاصی بوو کردیـە عەبـدوڵڵا.

عەبدوڵڵای کوڕی حارسی کوڕی عەبدولموتـەلیب، نـاوی عەبدشـەمس بـوو، ئـامۆزاو

---

[1] التأريخ الاسلامي، محمود شاكر، ج١-٢، ص٦٥، المكتب الاسلامي بيروت ١٩٩١.

[2] اسد الغابة، ٢٨٣٠. الأستيعاب، ج٢، ص ٢٥٨.

[3] الأصابة، ٤٦٣٣.

کوڕی مامی پێغەمبەر بوو، کردیە عەبدوڵلا[1]. عەبدوڵلای کوڕی شەهابی زوهەری ئەکبەر، ناوی عەبدولجان بوو، پێغەمبەر ناوی نا عەبدوڵلا[2]. کە صەفوان کوڕی قودامە کۆچی کرد بۆ لای پێغەمبەر، بەخۆی و دوو کوڕەکەیەوە: عەبدولعوززا و عەبدونوهەم، ناوی دوو کوڕەکەی گۆڕی بە عەبدوڕڕەحمان و عەبدوڵلا[3]. عەبدوڵلای کوڕی عوسمانی ئەبوبەکری سدیق، ناوی عەبدولکەعبە بوو، پێغەمبەر ناوی نا عەبدوڵلا[4]. جگە لەمانە پێغەمبەر (٥١) کەسی ناونا عەبدوڵلا، وە (٢٢) کەسی ناونا عەبدوڕڕەحمان، جگە لەوەی هەندێکی ناونا عەبدولقەدوم و عەبدولجەبار و عەبدولمەلیك و ناوی تر. عەبدوڵلای کوڕی عەمری ئەلهانی ناوی عەبدولعوززا بوو، کردیە عەبدوڵلا[5]. عەبدوڵلای کوڕی قرشی ئەزدی سەمالی، ناوی شەیتان بوو، کردیە عەبدوڵلا[6]. عەبدوڵلای کوڕی هەیسەم تەمیمی ناوی عەبدوللات بوو، پێغەمبەر ناوی نا عەبدوڵلا[7]. عەبدوڵلای کوڕی ئەبی سەبرەی جەعفی ناوی عەبدولعوززا بوو، پێغەمبەر ناوی نا عەبدوڵلا[8]. پێغەمبەر لە بنەماڵەکانیشدا بەنی عەبدولعوززای ناونا بەنو عەبدوڵلای کوڕی غەتفان[9]، ڕۆژی هەینی بوو هاتنە لای فەرمووی: ئێوە کێن؟ وتیان: بەنو عەبدولمەناف، فەرمووی: ئێوە بەنو عەبدوڵلان[10]. کوڕەکەی ئەبوبەکری صدیق ناوی عەبدولکەعبە، یان عەبدولعوززا

---

[1] اسد الغابة، ٢٨٧٦/٣/١٠١. تهذيب التهذيب، ج٥، ص١٨٠.

[2] اسد الغابة، ٣٠١١.

[3] اسد الغابة، ٢٥١٨.

[4] اسد الغابة، ٣٠٤٦.

[5] اسد الغابة، ٣٠٨٨.

[6] اسد الغابة، ٤٩٠٣.

[7] اسد الغابة، ٣٢٣٢. الأصابة، ٢٤٤.

[8] الطبراني في المعجم الكبير، ٦٥٥٩.

[9] اسد الغابة، ١٢٠٠.

[10] اسد الغابة، ٨٢٢.

بــوو، پێغەمبــەر نــاوی نــا عەبــدوڕڕەحمان[1]. عەبــدوڕڕەحمانی ئــەزدیش نــاوی عەبدولعوززا بوو، گۆڕی بۆ عەبدوڕڕەحمان[2]. ئــەبو هــورەیرە دەڵــێ: لــە نەفامییــدا ناوم عەبدوششەمس بوو، پێغەمبەر گۆڕی بە عەبدوڕڕەحمانی کــوڕی ســەخر ئــەبو هورەیرە، روقیەی کچی پێغەمبەر، خێزانــی عوسمــان کــوڕی عــەفان منــداڵێکی بــوو پێغەمبەر ناوی نا عەبدوڵڵا، شــەش ســاڵ ژیــا[3]. عــەرەب کونیــە بــەکار دەهێــنن بــە باوکی، یان دایکی فلان دەستپێدەکات[4]. ئەوانە بەرێزو حورمــەت دەزانــن، لای زۆر گــەلی تــریش ئــەوە هەیــە، فارســیش شــۆرەتیان هەیــە بــەڵام ئــەوان شــۆرەت هــی بنەماڵەیە بۆ هەموویان، نەك بۆ دانە دانە وەك ئــەوەی عــەرەب هەیــەتی، کــوردیش هەندێکی هەیە .

عەبدوڵڵا باوکی محەممەد دەنگوباسی لە مێژوودا هەیە، بەڵام بــاس و خــواس و گەورەیی و ناوداریی موحــەممەدی کوڕی هەموو چیرۆك و بەسەرهاتی باوك و باپیرو کەسوکاری شاردۆتەوە، زۆر نووسەر دەڵێ عەبدوڵڵا پێش لە دایك بونی محەممــەدی پێغەمبەر وەفاتی کرد، هەندێکیش رایان وایە کە دوای لە دایك بوونی موحەممــەدی کوڕی کەم ژیا، سەردەمی مەزنیی کوڕەکەی نەبینی تا بزانین بڕوا دەهێنێ و پشتی دەگرێ، یان نا.. ئەو بەشداریی رووداوە ئیسلامییەکان نەبوو، هەر، بۆیە باســکردن و ناوبردنی زیادەیە، کێ باوکی ئەفلاتون و ئەرستۆ و سوقرات دەناســێ، بــەڵام بــە هۆی موحەممەدەوە ناوی بــاوك و دایــك و بــاپیرو مــام و کــەس وکــاری ناوبانگیــان دەرکــرد، لــە لەبیرچــون رزگــار بــوون، هــەتا دووری دوو هــەزارو پێــنج ســەد ســاڵ رەچەڵەك و بنەچەی پێغەمبــەر دەرکــەوت و لــە فــەوتان پــارێزران، زیــاتر لــە بیســت پشــتی موحەممــەد ئاشــکراو روونــە. وتمــان عەبدولموتــەلیب و حارســی کــوڕی،

---

[1] المستدرك، ج٣، ص ٤٧٣.

[2] الأصابة، ٥١٥٩.

[3] الطبراني في مجمع الكبير، ٣٥.

[4] المستدرك، ج٣، ص٥٠٧.

زەمزەمیان هەڵکەند، زەحمەتی زۆریان تووش بوو، قورەیش داوای بەشیان کرد، ئەوەش لە لاوازیی عەبدولموتەلیب بوو، چونکە کوڕی کەم بوو، وای بە باش زانی ژن بهێنێ هەتا خوا کوڕی بداتێ و پشتی بەهێز ببێت، عەبدولموتەلیب لەسەر خۆی نەزر کرد، کە ئەگەر خوا (دە) کوڕی بداتێ و بگەنە ئەوەی خەڵك سڵی لێبکەنەوە، لای کەعبەدا یەکێکیان دەکاتە قوربانیی بۆ خوا، سالان تێپەڕی، هیواو ئاواتی هاتەدی، خوا (دە) کوڕی پێبەخشی، کاتی نەزرەکە هات، بانگی کوڕەکانی کرد، چیرۆکەکەی بۆ گێڕانەوە، ئەوانیش گوێڕایەڵیی و ملکەچیی خۆیان بۆ نواند، بەلام دەبێ قوربانییەکە بەر کامیان بکەوێ..؟ کوڕەکان وتیان چی بکەین..؟ عەبدولموتەلیب وتی: با هەریەکە لەئێوە پەرداخێك هەلگرێ و ناوی خۆی لێ بنووسێ و بۆم بهێنن... ئەوانیش وایان کرد، ئەنجا بردنی بۆ لای هوبەل لە ناو کەعبەدا، هوبەل لەسەر بیرێك بوو لە ناو کەعبەدا، ئەو بیرە ئەو شتانەی تیا کۆدەکرایەوە کە بە دیاریی دەدرانە کەعبە، لای هوبەل حەوت پەرداخ هەبوو، هەر یەکەیان نووسینێکی لەسەر بوو، کە پەرداخیان لێدا لەسەر عەبدوڵڵا دەرچوو، جادوگەر و عەرافێك وتی: چەند دیە و قەرز لای ئێوە دەدەن، وتیان: دە حوشتر، وتی: بڕۆنەوە بیکەن، دە دە بۆی زیاد بکەن و پەرداخەکە لێبدەنەوە هەتا خوا رازی دەبێت، ئەگەر لەسەر حوشترەکانیش دەرچوو بیکەنە قۆچی بەیتولا کەعبە، ئەوە خوا رازیە و کوڕەکەتان رزگاریی دەبێت، چەند جار کردی هەر لەسەر حوشترەکان دەکەوت، دە دە دەیکردنە نەزر و سەری دەبڕین، هەتا بووە سەد حوشتر، بەو شێوە خوا ژیانی بۆ عەبدوڵڵا نووسی هەتا ببێتە باوکی موحەممەدی مەزن و دوا پێغەمبەر، ئەوە یەکەم جارە عەرەبێك ئەوەندە حوشتری بەو زۆریە بۆ سەر ببڕن[1].

بەو جۆرە دڵی عەبدولموتەلیب دامەزرا، سەد حوشتری بۆ کوڕە خۆشەویستەکەی دا، عەبدوڵڵا خۆشەویسترین کوڕی عەبدولموتەلیب بوو،

---

[1] الكعبة، ص ١٠١.

هەرچەندە بچووکترینیش نەبوو، هەندێك دەڵێن بچووکترین کوڕی بووە، هەیە دەڵێ حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب بچووکتر بووە لە عەبدوڵڵا، عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب لە حەمزە بچووکتر بووە، چونکە عەباس وتوویەتی کە پێغەمبەر لە دایك بوو من سێ ساڵ بووم.

## ٢ـ لەدایکبونی محەممەد پێغەمبەر ﷺ

دەبێ کێبێت لەو کەسە نەفرەتلێکراوتر بێت، کە بوختان بۆ پێغەمبەری جوان ڕەفتارو خۆش گوفتارو ڕەوشت بەرز دروست بکات، وتەی دکتۆر جەمال لەم خاڵەدا زۆر ڕوونە، ئەوەی ئەو لێرەدا بەرامبەر پێغەمبەرمان وتویەتی هەتا ئیستە هیچ دەلۆیەك نەیتوانیووە بیڵێت، ئەو دەڵێ و هەڵە دەکات کە دەڵێ: "لە ناو قورەیشدا وا بڵاوبوو کە موحەممەد دوای چوار ساڵ دوای مردنی باوکی لە دایکبووە"، ئەمە بوختانی دکتۆر خۆیەتی، گەورە درۆیەکی بێسەرچاوەی ناو ناخ و دەرونی بۆگەنە، هیچ نەفامێکی قورەیشی خەیاڵی وای بە زەیندا نەهاتووەو هەرگیز وا بڵاونەبووە، نەفامەکانی سەردەمی جەهالەت هێندەی ئەم دکتۆری ئاخر زەمانە نەفام و کەم ڕوو دەلۆ نەبوون، کە بەم وتانە عەرشی خوا بێننە تورەو خەشم و لەرزە، کامەو لە کام سەرچاوەدا ئەبوجەهل و ئەبولەهەب هێندەی ئەم دکتۆرە نەفرەتیە دەرون نزمە خەڵەفاوە شتی وا بە محەممەد دەڵێن، ئەوان باوك و دایکی محەممەدیان ناسیووە، خۆیان ئاگادارو بەشداری مارەکردن و گواستنەوەی ئامینە بوون بۆ عەبدولا، ئاگاداری بەڕێکردنی ئەو کاروانە بوون کە عەبدولای تیا چوو بۆ شام و لە ڕێگە وەفاتی کرد، بەشداری تەعزیەی بوون، ئاگاداری مژدەی لە دایکبونی محەممەد بوون لە مەککە، ئەبوجەهل کۆیلەیەکی کەنیزەکی خۆی بەو هۆیەوە ئازادکرد، یەعنی دکتۆر بەو هەموو دڵە پیسەیەوە ئاگادار بووە، بەڵام ئەبوجەهل و ئەبولەهەب . ئاگادار نەبوون هەتا بیدەنەوە بە ڕوی محەممەددا لە کاتی بانگەوازەکەیدا، کە هیچ نەما بە محەممەد و خواو سەحابەکانی نەڵێن ..؟ بەڵام درۆی بێبنەمایان نەدەکرد، بەڕاستی ئەمە تاوانێکی گەورەیە، هەمیشە ئومێدم وایە

خوای گەورە بەرگری لە پێغەمبەری خۆی دەکات و تۆڵەیەکی بەئازار لەم پارچە چڵکنە دەکاتەوە، چونکە ئەم تاوان و درۆو بوختانە قورسانە، بە چەلەحانەو وەڵامدانەوەی قەڵەم و کاغەز نارەوێتەوە، دەبێ هەر خوای گەورە بەهێزو قودرەتی خۆی هەقی پێغەمبەر بسەنێ و پەنجەی قەڵەمی بە خۆرە داڕزێنێ ..!!

دکتۆر جەمال دەڵێ باوکی راستەقینەی موحەممەد عەبدوڵڵا نییە، ئەو وەکو لە ئامینەی کچی وەهەبە، بەڵام لە عەبدوڵڵا نییە، دوای پێنج ساڵ دوای مردنی عەبدوڵڵا، موحەممەد لە دایك بووە..!!.

لە لاپەرە (٤٠٢)دا دەڵێ: (لە ناو قورەیشییەکاندا بڵاوبوو کە موحەممەد لە دایك بوو دوای مردنی عەبدوڵلای باوکی بە چوار ساڵ، ئێمە نازانین چۆن عەبدولموتەلیب رازی بوو کە کورەزاکەی لە دایك ببێ لە عەبدوڵلای کوری دوای مردنی بە چوار ساڵ..؟ هەر لەسەر ئەو رستەیە بوو کە پیاوانی (کندە) دەیان وت کە موحەممەد لەوانە و ئێمە لە موحەممەدین، بەڵام پێغەمبەر دەیگوت: کە عەباس و ئەبو سوفیانی کوری حەرب ئەوەیان دەوت هەتا ئەمین و پارێزراوبن کاتێك دێنە شاری مەدینە، ئێمە (لا ننتفي من آباءنا) لانادەین لە باپیرانی خۆمان، ئێمە لە بەنو نەزیری کوری کەنانەین).

دکتۆری ئاخر شەڕ دەڵێ لەناو قورەیشدا بڵاوبوو. پیاوانی کندە وتویانە محەممەد لە ئێمەیەو ئێمە لەوین، وتویانە خزممانە، تا پارێزراو بن و ڕێزیان لێبگیرێ، ئەوەتە پێغەمبەر خۆی وەڵام دەداتەوە دەفەرموێ بۆیە وایان وتوە تا پارێزراو بن کاتێك دێنە مەدینە، عەباس و ئەبوسوفیان خزمی نزیکی پێغەمبەر بوون، ئەبو سوفیان کە هاتە مەدینە بێباوەڕ بوو ترسا توشی لێدان ببێت، وتی من خزمی محەممەدم و یەك پشتین هەتا کەس لێی نەدات، کندەش دەیانویست خۆیان پیرۆز بکەن بەخۆنزیککردنەوە لە محەممەد پێغەمبەر.!

لە لاپەرە (٤٠٥-٤٠٦)دا دەڵێ: (جێی وتنە لێرەدا کە موحەممەد لە دایکبووە دوای حەمزەی مامی و کوری خاڵۆژنی دوای چەند ساڵێك لەگەڵ ئەوەی کە باوکیان لە یەك رۆژدا ژنیان هێناوە، وەکو پێمان گەیشتووە لە باسی (حەمزە) لە کتێبی

(الاصابة فی تمیز الصحابة)ی (ابن حجر العسقلاني) كه "حەمزە لە دایكبووە پێش پێغەمبەر بە دوو ساڵ، یان بە چوار ساڵ" لە كاتێكدا (موحەممەد كوڕی عومەر) دەڵێ: "كە حەمزە مردووە ڕۆژی ئوحد لە مانگی شەوالدا لە ساڵی سێهەمی كۆچیدا تەمەنی ٥٩ ساڵ بووە، ئەو لە پێغەمبەر بە تەمەنتر بوو بە چوار ساڵ، كە وەحشی كوڕی حەرب كوشتی و سنگی هەڵدڕی، هەروەها مردنی موحەممەد لە ساڵی (١١) ی كۆچیدا بوو، لە تەمەنی ٦٣ ساڵیدا، واتە دوای هەشت ساڵ لە مردنی حەمزە، موحەممەدی كوڕی قەیس ئەو ماوەی دیاری كردووە (لە موحەممەدی كوڕی عومەرەوە كە ئەبو مەعشەر بۆی گێڕابوویەوە) ڕۆژی دوو شەممە كە دوو شەو تێپەڕیبوو لە مانگی ڕەبیعی یەكەم ساڵی یانزەی كۆچی، لەسەر ئەو بنچینەیەیە دەتوانین بڵێین دەبێ ئامینەی كچی وەهەب سكپڕ بووبێت بە موحەممەدی كوڕی لە ڕۆژانی وەفاتی عەبدوڵڵای كوڕی عەبدولموتەلیبدا، بەڵام نابێ ئەو منداڵە دوای چوار ساڵ لە دایك بووبێ ئەگەر عەبدوڵڵا باوكی ڕاستەقینەی موحەممەد بێت، كەواتە ئێمە دەكەوینە بەرامبەر كێشەیەكی ئاڵۆزەوە كە پەیوەندی بە پابەندبوونی بایۆلۆجی موحەممەدەوە هەیە، كەواتە دەبێ كێ باوكی ڕاستەقینەی موحەممەد و ئەو برایانەی بێت كە لە سكی دایكیدا لە موحەممەد نارەحەتتر بوون بۆ دایكی..؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە پێویست بە بوێری و ڕاستی مێژوویی زیاتر هەیە..)

ئەم باسانە پێویستی بە ئازایەتی و بوێری زیاتر نییە، دكتۆر جەمال زۆڵانە و لەشەیتان ساختەچیانەتر و فێڵاویانەتر دەیەوێ گومان دروست بكات و كێشە بۆ خوێنەر بنێتەوە، دكتۆر خۆی بوێرو ئازاو دەلۆو لە خوا نەترسە، ترس و باكی نییەو دەوێرێ خراپترین تۆمەت بۆ خواو پێغەمبەر دروست بكات، ئەو گوایە لێكۆڵەرە، دەبێ چاری گرفتەكانی نووسین و ڕاستكردنەوەی هەڵەكانی مێژوو بكات، لێكۆڵینەوە بكات بۆ دۆزینەوەی ڕاستیەكانی مێژوو، نەك وەك مێش بەدوی خاڵە هەڵەو گوماناوی و، كاری تێكدەران و لارە بیرو لارە ڕێی دوژمنانەوە بێت، لەباتی توێژینەوەو چاكردن و ڕاستی دۆزینەوە، لەباتی یارمەتی خوێنەر، شتەكان

بخراپێنیّ و تێکبشکێنیّ و سەر لە خوێنەر بشێوێنیّ، بەناوی چاکردنەوە خراپتری دەکات، ئەوە (١٤٠٠) ساڵ زیاترە ژیاننامەی محەممەد بەسەدان شێواز لەبەردەستدایە، کەس دەروونی هێندە ئالۆزو دارزاوو نەخۆش نەبووە گومانی وا بکات، بیخاتە دڵی خەڵکی و بڵیّ لەوانەیە موحەممەد کوری باوکی خۆی نەبێت، ئەو کوڕی عەبدوڵا نەبێت، دەبیّ بوێری و ئازایەتی لەوە شەرەنگێزتر چی بێت، بە ئاشکراو لەسەر لاپەرەو بەناو خەڵکێکدا کە ئەوەد لە سەدی زیاتری موسڵمانە، پاکیی و بێگەردیی رەوشتی پێغەمبەر (موحەممەد) لایان بووەتە یەقین و بروایان پێی هەیە، بەلام دکتۆر درەنگ فریاکەوت، داوی خۆی فرێ بداتە ناو گۆماوی لێڵ، پێش ئەو دەیان کەس زۆریان کرد، غەیری چیلکە و چەوێڵ دەستکەوتی تریان نەبوو، بە نائومێدی مردن و بەناچاری هێنرانە مزگەوت و، رووی گۆڕستانیان پێگرتنەبەر، کەوتنە بەر نەفرینی مەردوم و لە بیرچوونەوە. وەکو خۆی دەڵیّ عەبدولموتەلیب چۆن رازی بوو منداڵێك دوای چوار ساڵ لە مردنی عەبدوڵڵای کوری لە دایکببیّ؟ منیش دەڵێم ئەگەر حەملەکە لە ماوەی دیارییکراوی خۆی بترازایە و لای بدایە، عەبدولموتەلیب سەرۆك خێڵی قورەیش و ناوداری ناوچەکە کاتێك مژدەیان پێدا، بە پەلەپروزە نەدەهاتە ماڵی ئامینەو کۆرپە یەکرۆژەکە لە ئامێز بگریّ و ماچی بکات و بیبات بۆ دەوری کەعبەی ئیبراهیم و ئیسماعیل و دوعای بۆ بکات.

دیارە باپیری و دایەنەکانی و مام و پورو ئامۆزاو خزم و کەسوکارەکانی، شەوو رۆژو کات و ساتیان هەژماردەکرد، هەتا تاقانەکەی عەبدوڵڵای کوڕ و عەبدوڵڵای برا و عەبدوڵڵای برازا و ئامۆزا و جوانەمەرگیان ببینن، خۆ محەممەد وەك بێباوك بوو، بێکەس نەبووە..؟ عەبدولموتەلیبی باپیری سەرۆکی هۆزی قورەیش بوە، کاروباری کەعبە و زێوانی و نان بدەیی و ئاوبدەیی، پێشوازی و جیّ و ریّ دروستکردن بۆ حاجیان و، پاراستنی هێمنی و ئاسایشی ناو مەککەو رێگەوبانی کاروانان لە ئەستۆی ئەم و مامەکانی محەممەددا بووە، بە گێڕانەوەکاندا دیارە کە هەموو خزمان چاوەڕوانی ئەو لە دایکبوونە بوون، تەنانەت ئەوەش دیارە کاتێك کە ژان

ئامینە دەگریّ و لە دایکبوونە چاوەڕوانکراوەکە نیّزیك دەبیّتەوە، زۆر لە ژنانی بنەماڵەی عەبدولموتەلیب و کوڕەکانی لەویّ ئامادە دەبن، واتە لە بنەماڵەی عەبدولمەناف و نۆفل (هاشم و موتەلیب و عەبدوششەمس) کە سیّ بران ئاگادار دەبن و منداڵەکانی عەبدولموتەلیب و حارس و ئومەییە و رەبیعە چاودیّریی دەکەن، چونکە هەر کە موحەممەد لە دایك دەبیّ و دەزانن کوڕە، کوڕ لای عەرەب مژدە و ئومیّد بەخش بووە، شیفای دایکی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفی کوڕی حارس لە بنەماڵەی زوهرەش ئامادەبوو، شیریدا بە موحەممەد، واتە ژنانی بنەماڵەی باوکی موحەممەد کە عەبدولمەنافە و، ژنانی بنەماڵەی باوکی ئامینە کە زوهرەیە، کە باپیری هەردوو بنەماڵەکە کیلابی کوڕی موڕڕەی کوڕی کەعبی کوڕی لوئەی کوڕی غالبی کوڕی فەهرە کە باپیرە گەورەی هەموو هۆزەکانی قوڕەیشە، وەك لە درەختی نەسەب و بنەماڵەی پیّغەمبەردا دیارە ئامادەبوون، ئەمە شتیّکی سەیر نیە، ڕەنگە خوای گەورە خۆی بەهۆی مەلائیکەی مژدە بەخشەوە جاڕی بە ناو خزمانی بنەماڵەکانی عەبدولمەناف (باوکی محەممەد) و زوهرە (دایکی محەممەد) دا هەڵدابیّت: هەموو کۆو ئامادەبن، بڕۆن لە دەوری ماڵی ئامینە کۆببنەوە، وا منداڵیّك لەدایك دەبیّت مستەفایە، فەخری عالەمە، دەبیّتە خاتەمی پیّغەمبەران.. محەممەد وەکو باوکی ئامادە نەبوو، بەلاّم هەموو گەورەکانی هەردوو بنەماڵە ئامادەی شاباش و مژدەدان و لەدایکبوون بوون.

مامانی ئامینە، شیفای دایکی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف بوو، لە بنەماڵەی ئامینە بوو، یەکەم کەس بوو لە ئامادەبوان شیری دایە، (سوەیبە) جاریەی ئەبی لەهەبی مامی پیّغەمبەر بوو، بەرکەخان واتە (ئوم ئەیمەن) دایکی عەبدوڵلاّ، واتە نەنکی پیّغەمبەر، ئەویش لەویّ ئامادەبوو لە باوەشی گرت.

کە عەبدوڵلاّ چوو بۆ شام بۆ بازرگانی، ئامینە تەنها مایەوە، عەبدولموتەلیب بەردەوام سەردانی دەکرد، بە هالەی ژنی وت بەردەوام سەردانی ئامینە بکات هەتا

تـەنها نـەبێت[1]. کـە عەبـدوڵڵا لـەڕێی بازرگانییەکـە مـرد، کاریگـەریی زۆری لەسـەر عەبدولموتەلیب و بنەماڵەکەیان بەجێهێشت، بەتایبەتی ئامینە کـە سـکی دوومـانگ بوو، ئامینە خۆی یەکلاکردەوە و چاوەڕوان بوو، خۆی دەپاراسـت هـەتا سـکەکەی بەسەلامەت لێببێتـەوە، چاوەڕوانی چـاوهەڵێنانی کۆرپەکـەی بـوو، هەرچـەند سـۆزی مێردەکەی کـەم دیبـوو، بـەڵام لوتـف و خۆشەویسـتی عەبدولموتـەلیب زۆر هیـوای دایەوە[2].

"ئامینە ناردی بۆ لای باپیری و مـژدەی کوڕەزاکـەی پێدا، ئـەویش لـە خۆشییان تەواف کەعبەی کردو، بەرەو ماڵی ئامینە کەوتە ڕێ، ئامینە وتی: ئەوەتـە کوڕێکـت بۆ بووە.. هەندێ هەواڵی لە دایکبوونەکەی گێڕایـەوە، عەبدولموتـەلیب کۆرپەکـەی هەڵگرت و بردی بۆ کەعبە و دوعای بۆ کرد، سوپاسی خوای کرد بۆ ئەم دیارییـە و پاشان هێنایەوە بۆ لای دایکی"[3].

"منداڵەکە سێ ڕۆژ نەخۆش کەوت، پاشان چاکبوویەوە، ئەبولەهەبی مـامی کـە دوژمنترین کەسی پێغەمبەر بوو، کاتێ سوەیبەی جاریەی مژدەی لە دایکبوونەکەی بۆ هێنا، لە خۆشیدا سوەیبەی ئازادکرد، سوەیبە چەند ڕۆژێك شیری دایە لە شیری مەسروحی کوڕی"[4].

هەر بەوەندەی کە دوو مێژوونووس ناجۆرن لە سـاڵی لـە دایکبوونەکەیـدا، ئـیتر دکتۆر جەمال ئەو بوختـان و تاوانـە گـەورە دەرهـەق پێغەمبـەرمان دەکـات، ئێمـە ناچـارین ڕای هـەموو مێـژوونووس و سەرچـاوە سـەرەکیەکان نـەك لاوەکیـەکان بهێنینەوە لەسەر لـەدایکبوون و وەفـاتی، لەسـەر ڕۆژ و مـانگ و سـاڵ و کـاتی لـە دایکبوونەکەیدا، مێژوونووسـانی ئیسـلامیی زۆر ڕاسـتگۆبوون، هەرچـیان بیسـتووە

---

[1] الكعبة، ص١٠٣.

[2] هەمان سەرچاوە، ل ١٠٥.

[3] ابن هشام، ج٢، ص١٦٠، . الكعبة، ص ١٠٥.

[4] الكعبة، ص١٠٦.

هێناویانە و بۆ ئێمەیان گواستووەتەوە، هەتا ئێمە بە دوای راستیی رۆژو مانگ و ساڵەکەدا بگەڕێین، نەك وەك دەروون نەخۆشێك کە گومان لە دکتۆرو دەرمانەکان و چارەسەرەکە بکەین! ، ئەوان بە پاکی هێناویانە، دکتۆر جەمال بەپیسی لێکیداوەتەوە، ئەو ئەگەر بە راست لێکۆڵەری زانست پەروەری دڵپاکە، با لێکۆڵینەوەی بکردایە، رستێکی بخستایەتە سەر خەروارەکە، بەڵام وەك عەرەب دەڵێ: "گۆزە هەر ئەوە دەردەدا کە تیایەتی". مێژوونووسان ناکۆکن لە ساڵی لە دایکبوونی پێغەمبەر، زۆربەیان دەڵێن ساڵی فیل (٥٧٠-٥٧١ز) لە دایك بووە، ئیبن عەباس دەڵێ: ساڵی فیل لە دایك بووە، خەڵکی تر دەڵێن پێش ساڵی فیل بە (١٥) ساڵ لە دایکبووە، یان هەندێك دەڵێن دوای ساڵی فیل بە چەند رۆژێك، یان چەند مانگێك لە دایکبووە، تەنانەت هەندێك دەڵێن (٣٠) ساڵ دوای فیل، بەرای هەندێکی تر (٧٠) ساڵ دوای فیل لە دایکبووە، هەروەها مێژوونووسان ناجۆرن لە مانگەکەشدا کە پێغەمبەرمان تیایدا لە دایکبووە، لەگەڵ ئەوەی کە زۆربەیان دەڵێن لە مانگی رەبیعولئەوەلدا لە دایکبووە، هەندێ دەڵێن لە موحەڕڕەم، یان سەفەر، یان لە رەمەزان لە دایك بووە.

هەروەها لە رۆژەکەشدا مێژوونووسان جیاوازن، هەندێك دەڵێن دوو شەو لە رەبیعولئەوەل تێپەڕی کردبوو، یان هەشت شەو، یان نۆ شەو، بەڵام زۆربەی ڕاکان لەسەر ئەوەن کە لە ١٢ی رەبیعولئەوەلدا لە دایك بووە [١].

نەك هەر ئەمە، تەنانەت خەڵکیی جیاوازن لە کاتی لەدایك بوونەکەشیدا، ئایا لە شەودا بوو، یان لە رۆژدا، هەروەها قسەی جۆراوجۆر هەیە لە شوێنی لەدایك بوونەکەشیدا، لە کام ماڵ و کام جێگادا بوو؟ [٢].

ئیبن هیشام دەڵێ: "لە رۆژی دووشەممە (١٢) شەو گوزەرا لە مانگی رەبیعولئەوەل لە ساڵی فیل"، زوبەیر دەڵێ: "لە رەمەزاندا بوو"، ئەو وتەیە زۆر

---

[١] الكعبة، ص١٠٦.

[٢] حياة محمد: هيكل، ص٧.

ڕێکتره لەگەڵ ئەوەی کە دەڵێن لە ئەیامی تەشریقدا حامیلە بوو، دەڵێن کە فیلەکان هاتنە مەککە لە مانگی موحەڕڕەم، موحەممەد دوای فیل بە (٥٠) ڕۆژ لە دایکبوو، مەسعودیش ڕۆژەکە دیاریی دەکات کە (٥٠) ڕۆژ دوای هاتنی فیل بوو، چونکە ئەوان کە هاتنە مەککە ڕۆژی دووشەممە بوو، سیانزە شەوی لە مانگی موحەڕڕەم مابوو، لە ساڵی ٨٨٢ لە دوای سەردەمی زیلقەرنەین، واتە هاتنی ئەسکەندەری مەقدۆنی بۆ ناوچەکە کە ساڵی ٣٣٢پ.ز بوو، چونکە هاتنی ئەبرەهە بۆ مەککە (١٣) شەو لە موحەڕڕەم تێپەڕیبوو، لە ساڵی چل لە پاشایەتیی کیسرا ئەنوشیروان، لە دایکبوونی پێغەمبەر هەشت شەو تێپەڕیبوو لە مانگی ڕەبیعولئەوەل لەو ساڵەدا لە مەککە وەکو (کوسان دی بارسغال) دەڵێ: "لە دایکبوونەکە لە ڕۆژی (٥٥) دا بوو، دوای شکانی ئەبرەهە لە ڕووداوی فیلدا".

مەحمود فەلەکی میسری لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر کاتی بوونەکە کردووە دەڵێ: لە بەیانی ڕۆژی (٩)ی ڕەبیعولئەوەل ساڵی ٥٧١ز بووە"، پاشان دەڵێ: "سەیریش نییە ئەگەر کۆکراوەیەك بکەین لە نێوان مانگی عەرەبی و ساڵی زایینیدا، چونکە ساڵی کۆچی دوای ئەو دەستی پێکردووە، مانگی عەرەبی ناسراوە، ئەوەش چەسپاوە هەر ئەوەیە کە دایکی محەممەد (ئامینە)، لە بەهاردا حامیلە بووە و لە پایزدا منداڵەکەی بووە"، لێکۆڵینەوە نوێیەکان دەڵێن: "هەمیشە پایز منداڵی بە توانا و زیرەك دەخاتەوە"[1].

ئەحمەد شەوقی کورد کە عەرەب ناوی ناوە ئەمیری شاعیران، بۆ لە دایکبوونی پێغەمبەر دەڵێ:

ولد الهدى فالكائنات ضياء     وفم الزمان تبسمٌ و ثناء

يوم يتيه على الزمان صباحه     مساء بمحمد و ضاء[2]

---

[1] ثورة الأسلام، ص٢٨١، لطفي جمعة، مكتبة النهضة المصرية بالقاهرة. الكعبة، ص١٠٨.

[2] السيرة، الصلابي، ص٤٧.

ئەبوفیدا دەڵێ: "باوکی ناوی عەبدوڵڵا بوو کە ٢٥ ساڵ پێش فیل لە دایکبوو، باوکی خۆشیدەویست، چونکە جوانترینیان و پاکترینیان بوو، ناردی بۆ کاسبی، کە بە یەسریبدا تێپەڕی لەوێ مرد، ئەو کاتە پێغەمبەر دوو مانگ بوو، یان دەڵێن ئامینە سکپڕ بوو، عەبدوڵڵا لای بنەماڵەی حاریس کوڕی ئیبراهیمی کوڕی سوراقەی عەدەوی ئەسپەردە کرا، کە خاڵوانی عەبدولموتەلیب بوو، دایکیشی ئامینەی کچی وەهەبی کوڕی عەبدولمەناف کوڕی زوهرە کوڕی کیلاب قورەیشییە، عەبدولموتەلیب داوای لە وەهەب کرد کە ئامینەی بداتێ بۆ کوڕەکەی، ئەو کاتە وەهەب گەورەی بەنی زوهرە بوو، ئەویش دایە و لە نێوانیاندا پێغەمبەر لە دایکبوو، لە رۆژی دووشەممە (١٠)ی رەبیعولئەوەلی ساڵی فیل[1].

شکستی ئەبرەهە دەروازەی خێر بوو بۆ قورەیش و خەڵکی مەککە و عەرەب، ئەو روداوە ئەوەندە مەزن بوو، رۆژەکەیان کردە سەرەتای مێژووی ئەو سەردەمە، رووداوەکانیان پێ دیاریی دەکرد، لەو ماوە کەمەدا کۆمەڵێك روداوی گەورە رویدا، کە خەڵکی پێشبینی روداوی گەورەتری لێدەکرد، زەمزەم و خەوبینینەکان و کەعبە و حاجیەکان و شکستی روون و ئاشکرای ئەبرەهە بەدەستی خوا و کاری مژدەدەرەکان، خەڵك دەیانزانی دەبێت چاوەڕوانی شتێکی گەورە بکەن.

هەندێك دەڵێن عەبدولا بچووکترین کوڕی عەبدولموتەلیب بووە، هەیە دەڵێ حەمزە بچووکتر بووە لە عەبدوڵڵا، عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب لە حەمزە بچووکتر بووە، چونکە عەباس وتوویەتی کە پێغەمبەر لە دایك بوو من سێ ساڵ بووم.. ئیبن هیشام روداوێکی سەنەد لاواز دەهێنێ، زۆر لە مێژوونووسانیش بەچەند جۆری جیاواز لەوەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: "عەبدولموتەلیب دەستی عەبدوڵڵای گرت و دەڕۆیشت، لای کەعبەدا دایان بە لای ژنێکی بەنی ئەسەدی کوڕی عەبدولعوززا کوڕی قوسەی کوڕی کیلاب دا، کە خوشکی وەرەقەی کوڕی نەوفل بوو، ناوی ئوم قیتال کچی نەوفل کچی ئەسەد بوو، ئافرەتەکە سەیری ناوچاوی عەبدوڵڵای کرد،

---

[1] تأريخ ابي الفداء، الملك المؤيد عمادالدين ابي الفداء، توفي ٧٣٢ك، ج١، ص١٦٨، بيروت ١٩٩٧.

وتی: عەبدوڵڵا بۆ کوێ دەچیت؟ وتی: لەگەڵ باوکمدام، وتی: ئەوەندە حوشترت دەدەمێ کە پێی رزگار بوویت، گەر ئێستە مارەم بکەیت، وتی: من لەگەڵ باوکمدام ناتوانم جێی بهێڵم، عەبدولموتەلیب عەبدوڵڵای کوڕی برد بۆ لای وەهەب کوڕی عەبدولمەناف کوڕی زوهرە کوڕی کیلاب کە ئەو کاتە گەورەی هۆزی بەنی زوهرە بوو، داوای ئامینەی (کچی) (برازای) کرد بۆ عەبدولا و لێی مارە کرد و گواستیەوە، رۆژێکی تر عەبدوڵڵا دای بە لای ئوم قتالدا کە ئەو رۆژە داوای دەستی عەبدوڵڵای کرد بیهێنێ، عەبدوڵڵا وتی: ئەوە چییە ئەمڕۆ لام لێناکەیتەوەو داوام ناکەیت..؟ ئوم قیتال وتی: ئەو نورەت لێبووەتەوە کە ئەو رۆژە پێتەوە بوو، ئەمڕۆ کارم پێت نییە، دەڵێن ئەو ژنە خوشکی وەرەقە بووە، گاور و خوێندەوار بووە، دەیزانی لەو گەلەدا پێغەمبەرێك لە نەوەی ئیسماعیل دەردەکەوێت، سەرچاوەکان دەڵێن زۆر ئافرەت خۆی پێشکەش بە عەبدوڵڵا کردووە، وەك تەبەری دەڵێ: "جوانترین کوڕانی قورەیش بووە"، رەنگە جوانیەکە هی ئەو نورو رۆشناییەی پێغەمبەر بوبێت لە نێوچەوانیدا.

عەبدوڵڵا دوای ژنهێنانی، بەگوێرەی باوی ئەو رۆژە دەبوو سێ شەو لەماڵی خەزورییدا بێت، کاتێك گواستیانەوە بۆ ماڵەکانی عەبدولموتەلیب، زۆر لای نەمایەوە، عەبدوڵڵا لەگەڵ کاروانێکی بازرگانییدا بەرەو شام کەوتەڕێ بۆ دابینکردنی ژیانی ماڵ و حاڵی، ئامینەی خێزانی بە دووگیانی بەجێهێشت، خورما زۆربەی باری ئەو کاروانە بوو، ئامینە پێش شوکردنی لای وەهەبی مامی بوو، پاشان هاتە لای عەبدوڵڵا، بەڵام کە لەگەڵ کارواندا چووە سەفەری شام، بە تەنها و دڵتەنگ مایەوە، بەردەوام عەبدولموتەلیب سەردانی دەکرد، داوای لە هالەی خێزانی کرد بچێتە لای ئامینە و نەهێڵێ تەنها بێت.

دوای چەند مانگ کاتی گەڕانەوەی کاروان هات، قورەیش ئامادەی پێشوازیی بوون، بە خێری زۆرەوە گەڕانەوە، ئامینە چاوەڕوانی مێردی دەکرد، گەنجانی قورەیش چوونە دەرەوەی شار، براکانی عەبدوڵڵا دەرچوون، بەڵام هەموو بە رووخۆشی و دیاریی و کەلوپەلەوە گەڕانەوە، جگە لە براکانی عەبدوڵڵا، ماتی و

خەفەتیان پێوە دیار بوو، عەبدولموتەلیب پرسی چی ڕوویداوە؟ وتیان: عەبدوڵڵا نەخۆش کەوتووە و لە یەسریب لە ماڵی خاڵوانی لە بەنی نەجاڕ ماوەتەوە، ئەو هەواڵە کاری لە عەبدولموتەلیب کرد، بەتایبەت بۆ ئامینەی دووگیان، حارسی کوڕە گەورەی نارد بە دەم هەواڵەکەوە، چەند ڕۆژ لە دوودڵییدا چاوەڕێی هەواڵی نەخۆشەکەیان کرد، بەڵام حارس گەڕایەوە، هەواڵی مردنی عەبدوڵڵای پێبوو، لەوێ زانیبووی کە عەبدوڵڵا دوای مانگێك لە گەڕانەوەی کاروانەکە بۆ مەککە مردبوو، بەو جۆرە عەبدوڵڵا لە گوڵی گەنجیدا، کە تازە لاوێتی لێ دیاری دابوو مرد، هیچی وای لە خۆشیەکانی هاوسەرێتی نەچەشت، جگە ئەو دوو مانگەی بووك و زاوایی کە لەگەڵ ئامینەدا بوو، عەبدوڵڵا لە گەڕەکی بەنی عودەی لە یەسریب ئەسپەردە کرا، کە هێشتا موحەممەد لە سکی دایکیدا زۆری ماوە بێتە دونیاوە، ئەو ڕووداوە کاریگەری زۆری لە دەروونی عەبدولموتەلیب و دڵی ئامینەدا جێهێشت، منداڵەکەی سکی ئامینە ئامادەیە کە بە تەعزێباری لە دایکببێ بۆ باوکی کە کەسیان کەسیان نەدیبوو!

ئامینە ماوەی سکەکەی بە گریان و فرمێسکەوە تەواو کرد، هیچ دڵی خۆش نەدەکرد جگە بینینی لە دایکبووە چاوەڕوانکراوەکەی، لەگەڵ ئەوەی کە ئامینە سۆز و خۆشەویستیی و هەستی شیرینی مێردی نەبینی، لە لایەکی ترەوە عەبدولموتەلیبی خەزور، چاودێر و خزمەتگوزارو دڵسۆزێکی چاك بوو، بە هەموو پیری و بێهێزی و لاوازیی چاوەکانیەوە، وەك گوڵ ئاگاداری ئامینە بوو.

لە دایکبوونی پێغەمبەر لە مەککە لە ماڵی عەقیلی کوڕی ئەبی تالیبی کوڕە مامی بوو، کە ماڵەکە بە میرات بۆ کوڕانی عەقیل مابوویەوە، مامانەکەشی شیفا بوو، ئوم ئەیمەن کردیە باوەش و یەکەم کەس بوو بەخێوی کرد، ئامینەی دایکی چەند ڕۆژێك شیری دایە، پاشان سوەیبەی جاریەی ئەبی لەهەبی مامی شیری دایە، کە دوای پێغەمبەرایەتی دوژمنترین دوژمنی پێغەمبەر بوو[1].

---

[1] الكعبة، ص ١٠٤-١٠٥.

ئامینه مژدەی بۆ عەبدولموتەلیب نارد کە کوڕەزایەکی بۆ بووە، کە هەواڵەکەی بـۆ چوو، تەواف کەعبەی کرد و بە پەلە خـۆی گەیانـدە لای ئامینـە، ئامینـە پێـی وت: کوڕێکتان بۆ بووە، وەرە سەیریکە، ئامینه هەندێ باسی بۆ کرد لـە بـارەی ئـەوەی لێی دیـوە لـە کـاتی حـەمل و شـتی تـر لـە بـارەی منداڵەکـە و ناونانیـەوە، دەڵێن عەبدولموتەلیب هەڵیگرت و بردی بۆ لای کەعبە، دوعای بـۆ کـرد، سوپاسـی خـوای کـرد لەسـەر ئـەم بەخشـینە، ئـەوجا گێڕایـەوە بـۆ لای دایکـی، منداڵەکـە سـێ ڕۆژ نەخۆش کەوت، پاشان چاك بوویەوە، ئەبولەهەب سوەیبەی جاریـەی ئـازادکرد کـە مژدەی لە دایکبوونی موحەممەدی بۆ هێنا، سوەیبە چەند ڕۆژێکـی کـەم لـە شـیری مەسروحی کوڕی دایە، سوەیبە لێزان بوو لە شـیردان و منـداڵ گۆشـکردندا، چـەند منداڵی تریشی شیر دابوو، وەك ئەبو سوفیانی کوڕی حارسی کوڕی عەبدولموتەلیب و ئـەبو سـالمە، کـوڕی عەبدولئەسـەدی کـوڕی ئـامۆژنی پێغەمبـەر، ئەوانـە بـرای پێغەمبەرن لە شیرەوە، هەواڵمان نیە کـە ئەوانـە موسـڵمان بـووبن، چ سـوەیبە، چ مەسروحی کـوڕی، بـەڵام پێغەمبـەر لـە مەدینـەوە سـەردانی دەکـردن، کـە فـەتحی مەککەیان کرد، هەواڵی پرسین و زانی کە خۆی و کوڕەکەی مردوون.

مێژوونووسان و ڕەچـەڵەك ناسـان (نەسـاب) ڕەچـەڵەکی پێغەمبـەر موحەممـەد دەبەنەوە سەر ئیسماعیل و ئیبراهیم و پاشان نوح و ئادەم، بـەڵام پێغەمبـەر ڕازی نەبوو کـە ڕەچـەڵەکی لـە (موعیـد) زیـاتر بترازێنن، واتـە: (موحەممـەد، عەبـدوڵڵا، عەبدولموتەلیب، هاشم، مەناف، قوسەی، کیلاب، مـوڕڕە، کـەعب، لوئـەی، غالیـب، فەهر، مالیك، نەزر، کەنانە، خوزیمە، مودریکە، ئیلیاس، موزیر، نزار، موعید)[1].

مێژوونووسـان یـەك نـین لـە دیـاریکردنی سـاڵی لـە دایکبـوونی موحەممـەددا، هەروەکو مێژوونووس هەیە گومانی لە مانگەکەدا هەیـە کـە تیایـدا لـە دایك بـووە، زۆریش هەن قسە لەسەر ڕۆژی مانگەکەش دەکەن کە تیایدا لە دایك بـووە، زۆریـش

[1] الكعبة، ص ١٠٦.

هەیە ناجۆرن لە کاتی لە دایك بوونەکەدا، ئایا شەو بووە، یان رۆژ، هەروەك ناجۆرن لە جێی لە دایکبوونەکە لە شاری مەککەدا[1] .

ئیبن هیشام دەڵێ: لە دایکبوونی لە رەمەزاندا بوو، ئەم قسەیە دەگونجێ لەگەڵ ئەوەی کە دەڵێ دایکی لە ئەیامی تەشریقدا سکپڕ بوو، واتە لە رۆژی ١٤-١٥-١٦ی مانگدا، هەروەها دەڵێن فیل لە مانگی موحەڕڕەمدا هاتە مەککەوە، پێغەمبەر دوای فیل بە پەنجا رۆژ لە دایك بوو[2]، (کۆسان دی بارسفال) دەڵێ: لە دایکبوونی پێغەمبەر لە رۆژی پەنجا و پێنجەمین بوو دوای شکستی ئەبرەهەی ئەشرەم لە رووداوی فیلدا[3]، حەسانی کوڕی سابت، شاعیری پێغەمبەر، باس لە یادگارییەکانی رۆژی لە دایکبوونی پێغەمبەر دەکات[4]، (لارفبنح من توجستنا) دەڵێ: "ئەو شەوەی کە لە دایك بوو ئاگری زەردەشت کوژایەوە کە هەزاران ساڵ بوو نەکوژابوویەوە، هەموو بتەکانی سەر زەوی کەوتن و مەلائیکە شەیتانەکانی لەسەر ئەستێرەکانی تر کە تیا نیشتەجێ بوویوون، بە ئیبلیسی سەرکردەیانەوە دەریانکردن و ناچاریانکردن کە بچن لەژێر دەریاکانەوە نیشتەجێ ببن[5] .

مێژوونووسان یەك نین لە دیارییکردنی ساڵی لە دایکبوونی موحەممەددا، زۆربەیان دەڵێن ساڵی فیل (٥٧٠) زاینی لە دایك بووە، ئیبن عەباس دەڵێ: " ساڵی فیل لە دایك بووە"، هەیە دەڵێ (١٥) ساڵ پێش فیل لە دایك بووە، نووسەری تریش دەڵێن دوای فیل بە چەند رۆژ، یان چەند مانگ، یان بە چەند ساڵ، هەیە دەڵێ سیی ساڵ، یان حەفتا ساڵ دوای ساڵی فیل لە دایك بووە، هەروەکو مێژوونووس هەیە گومانی لە مانگەکەدا هەیە کە تیایدا لە دایك بووە، لەگەڵ ئەوەی

---

[1] حیاة محمد، هیکل، ص٧.

[2] الطبقات الکبری، ابن سعد. و تأریخ الطبري.

[3] الکعبة، ص١٠٧.

[4] ابن هشام، ج٢، ص١٥٩.

[5] الکعبة، ص ١٠٩. ٨٢، (لارفبنح من توجستنا)، (حیاة محمد) ص (٣٢)

که زۆربەیان لەسەر ئەوەن لە مانگی رەبیعی یەکەمدا لە دایك بووە، هەیە دەڵێ لە موحەڕڕەم، یان سەفەر، یان رەجەب، هەیشە دەیبەنەوە بۆ مانگی رەمەزان.

زۆریش هەن قسە لەسەر رۆژی مانگەکەش دەکەن کە تیایدا لە دایك بووە، دەڵێن کاتێك کە دوو شەو لە مانگی رەبیعی یەکەم تێپەڕیبوو لە دایك بوو، یان دەڵێن هەشت شەو، یان نۆ شەو، بەڵام زۆریەی لەسەر ئەوەن کە پێغەمبەر لە دوانزەی رەبیعی یەکەمدا لە دایك بووە.

زۆریش هەیە ناجۆرن لەکاتی لەدایك بوونەکەدا، ئایا شەو بووە، یان رۆژ.؟ هەروەك ناجۆرن لە جێی لە دایکبوونەکە لە شاری مەککەدا[1].

مەسعودییش دەڵێ: ئەوەی راست بێ ئەوەیە کە دوای هاتنی فیل بۆ مەککە بە پەنجا رۆژ لەدایکبوو، هاتنی فیل بۆ مەککە رۆژی دووشەممە بوو کە سیانزە شەوی مابوو لە مانگی موحەڕڕەم لە ٨٨٢ ساڵ لە سەردەمی زیلقەرنەیین، هاتنی ئەبرەهە بۆ مەککە ١٧ تێپەڕیبوو لە مانگی موحەڕڕەم.

(مەحمود فەلەکی میسری) لێکۆڵینەوەی لە مێژووی لە دایکبوونی پێغەمبەردا کردووە و دەڵێ: ئەو لە بەیانی رۆژی نۆهەمی رەبیعولئەوەلی ساڵی ٥٧١ زایینیی لە دایك بووە، غەریبیش نییە ئەگەر کۆکردنەوەیەك بکەین لە نێوان هەردوو مانگی کۆچی و زایینییدا، چونکە مێژووی کۆچیی دوای مێژووی زایینیی هاتووە، بەڵام ئەوەی کە ساغ بۆتەوە و دیارە ئەوەیە کە دایکی پێغەمبەر لە بەهاردا سکپڕ بووە و لە پایزدا منداڵەکەی بووە، توێژینەوە نوێکان ئەوە دەردەخەن کە لە وەرزی پایزدا بە زۆری منداڵی ناوازە و بێوێنە و بەتوانا و زیرەك لە دایك دەبێ.

قەیسی مەخزومی دەڵێ: "پێغەمبەرو من لە ساڵی فیلدا لە دایك بووین، هەردووکمان دوو کوڕ بووین".

حەسانی کوڕی سابت، شاعیری پێغەمبەر، باس لە یادگارییەکانی رۆژی لە دایکبوونی پێغەمبەر دەکات و دەڵێ: بە خوا من منداڵێکی پێگەیشتوو بووم،

---

[1] حیاة محمد، هیکل، ص٧.

حەوت، یان هەشت ساڵ دەبووم، لە بیرمە و تێدەگەیشتم کە ئەو جولەکەیە بە هەموو دەنگی لەسەر گردێك لە یەسریب هاواری دەکردو دەیوت: ئەی کۆمەڵی یەهود.. هەتا لە دەوری کۆبوونەوە، وتیان ماڵ کاول ئەوە چیتە..؟ وتی: ئەمشەو ئەستێرەی ئەحمەد دەرکەوت کە پێی لە دایك دەبێ[1] .

رەنگە کەسێکی وەك دکتۆر جەمال، درۆیەك، یان بوختان و تانەیەکی لەسەر ناوو رەچەڵەکی پێغەمبەر کردبێت، عەباس ئەو قسەیە دەبیستێ و دێت بۆ پێغەمبەری دەگێرێتەوە، وەك تورموزی لە موتەلیبی کوری ئەبی وداعەوە دەیگێرێتەوەو دەڵێ: عەباس هات بۆ لای پێغەمبەر وەك شتێکی بیستبێ، پێغەمبەریش هەڵدەستێ و دەچێتە سەر مینبەر و دەفەرمووێ: من کێم..؟ دەڵێن: تۆ پێغەمبەری خوایت سەلامت لێبێت، فەرمووی: من موحەممەدی کوری عەبدوللای کوری عەبدولموتەلیب، خوای گەورە خەڵکانێکی دروستکرد، منی خستە ناو چاکترینیان، ئەنجا کردنیە دوو کۆمەڵ، منی خستە نو کۆمەڵە چاکەکەیانەوە، ئەنجا کردنیە چەندین هۆز، منی خستە ناو چاکترین هۆزیانەوە، ئەنجا هۆزەکەی کردە چەندین بنەماڵە، منی خستە ناو چاکترین بنەماڵەیانەوە و چاکترین کەسیانەوە[2] . لە عائیشەوە دەگێرنەوە کە جولەکەیەك کە لە مەدینە نیشتەجێ بوو، کە ئەو شەوە هات پێغەمبەری تیا لە دایك بوو، لە کۆرێکی قورەیشیەکاندا وتی: ئەی قورەیشیەکان ئایا ئەمشەو کەستان لێ لە دایك بووە؟ وتیان: وەڵاهی نازانین، وتی: ئەڵاهو ئەکبەر، ئەگەر هەڵەتان کردبێ ئەوە قەیدی نییە، سەیرکەن ئەوەی پێتان دەڵێم لەبەری بکەن، ئەمشەو دوا پێغەمبەری ئەم گەلە لە دایك بوو، لەنێو شانیدا چەند تاڵە موویەکی پچڕ پچڕ هەیە، (كأنهُن عَرفُ فرسٍ) دوو شەو شیر ناخوات، چونکە جنۆکەیەکی عفریت دەچێتە پەنجەیەوە، خەڵکەکە لە کۆڕەکەدا

---

[1] ابن هشام، ج٢، ص١٥٩.

[2] المقاصد النبوية في الأسما ء والتسمية، ميسون احمد راجم، ط١ ٢٠٠٧، المشرق للكتب، دمشق، ص ٦٦. سنن ترمذي، ٣٦٢٨.

ڕاچڵەکین، سەریان سوڕما لە قسە و باسەکانی، کە گەڕانەوە ماڵەوە هەواڵیان بە ماڵەوەیان دا، وتیان: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولموتەلیب کوڕێك بووە ناویان ناوە موحەممەد، دوایی خەڵکەکە گەیشتن بە یەك وتیان: قسەکانی ئەو جولەکەتان بیست؟ ئەی هەواڵی لە دایکبوونی ئەو کوڕەتان بیست؟ ڕۆیشتن هەتا جولەکەکە هاتەوە، هەواڵەکەیان پێدا، وتی: وەرن لەگەڵم هەتا بیبینم، لەگەڵی چوون و بە ئامینەیان وت: منداڵەکەتمان بۆ بێنە، ئەویش هێنای، پشتیان هەڵدایەوە مۆرەکەیان بینی، جولەکەکە لە هۆش خۆی چوو، کە هۆشی هاتەوە وتیان: ماڵ کاول ئەوە چی بوو؟ وتی وەڵاهی پێغەمبەر لە جولەکەکان چوو، ئەی قوڕەیشییەکان دڵتان بەم کوڕە خۆشبێت هەواڵی ئەمە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دەگرێ[1]، حاکم دەڵێ: ئەمە فەرموودەیەکە سەنەدی ڕاستە[2]، ئیبن عەباس دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ناوم لە قورئاندا موحەممەدە، لە ئینجیلدا ئەحمەدە، لە تەوراتدا ئەحیەدە، بۆیە ناونرام ئەحیەد، چونکە دەبمە پارێزەری گەلەکەم لە ئاگری جەهەنەم[3].

لە فەزڵی کوڕی عەبدوڕەحمانی هاشمیەوە دەڵێ: پێغەمبەر لە شەڕدا هاواری دەکرد دەیوت: بەفەخر و شانازیەوە: من کوڕی عەواتیکەکانم[4]. ئیبن کەسیر دەڵێ: وتەکەی پێغەمبەر ﷺ کە دەڵێ: من کوڕی عەواتیکەکانم لە بەنو سەلیم، بەم جۆرەیە: عەواتیك کۆی عاتیکەیە، عەواتیکەکان سێ ژن بوون لە دایکەکانی پێغەمبەرن، یەکەمیان: عاتیکەی کچی هیلالی کوڕی فالح کوڕی زکوان کە دایکی عەبدولمەناف کوڕی قوسەیە، دووەمیان: عاتیکە کچی موڕڕە کوڕی هیلال کوڕی فالیح کوڕی زکوان کە دایکی هاشمی کوڕی عەبدولمەنافە، سێیەمیان: عاتیکەی

---

[1] المستدرك على الصحيحين، ج٢، ص٦٠٢.

[2] الأمام حافظ ابي عبدالله الحاكم النيسابوري، مكتب المطبوعات الإعلامية حلب ـ بيروت.

[3] تهذيب الاسما ء واللغات، ج١، ص٢٢، الامام النبوي، دار الكتب العلمية، بيروت.

[4] اسد الغابة، ٤٢٣٢. مجمع الزوائد ١٣٨٣٦.

کچی ئەوقەسی کوڕی موڕڕە کوڕی هیلال کە دایکی وەهب باوکی ئامینەی دایکی پێغەمبەرە. یەکەم عاتیکەیان ئامۆژنی دووەمە و دووەمیش ئامۆژنی سێیەمە، بەنو سەلیم شانازییان دەکرد بەو لە دایك بوونە [1].

ئیبن ئیسحاق دەڵێ: کە منداڵەکەی لێ بوویەوە، هەواڵی نارد بۆ لای عەبدولموتەلیبی باپیری کە کوڕێکیان بووە، عەبدولموتەلیب هات سەیریکرد، ئامینە ئەوەی بینیبووی لە کاتی دووگیانییدا بۆی گێڕایەوە کە چی بکات و ناوی چی بنێ [2].

بەیهەقی دەڵێ: کە ڕۆژی حەوتەمی هات، قۆچی بۆ سەربڕی و گەورەکانی قوڕەیشی بانگکرد، دوای نانخواردن وتیان بە عەبدولموتەلیب: ئەم کوڕەت کە ئێمەت بۆ بانگ کردووە ناوی دەنێی چی..؟ وتی: ناوی دەنێم موحەممەد، وتیان: ئەی بۆ بە ناوی کەسوکارییەوە ناوت نەناوە..؟ وتی: دەمەوێ سوپاسگوزاری خوا بێت لە ئاسمان و لای خەڵك لە زەوی..)

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر فەرمووی: "من موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولموتەلیب کوڕی هاشم... کوڕی عەدنان، هەرکات خەڵکەکە بووبن بە دوو بەشەوە، خوا منی خستووەتە ناو بەشە چاکەکەیان، من لە نێوان باوك و دایکمدا دەرچووم، هیچم بەرنەکەوتووە لە سەردەمی نەفامیی، من لە ئەنجامی نیکاحدا لە دایك بووم، لە خوێنڕێژ و خراپەکار دەرنەچووم، هەر لە ئادەمەوە هەتا کۆتایی هات بە باوك و دایکم، من چاکترین ڕەگەزتانم، لە چاکترین باوکانتانم" [3]. باپیرانی محەممەد کەسانی بەڕێزو مەزن بوون، ئەوان دەسەلاتدارو وەك پاشا سەیر دەکران، خەڵك حیسابی بۆ کردون و

---

[1] اسد الغابة، ٤٢٣٢.

[2] السيرة النبوية، ابن هشام، ج١، ص ١٥٧-١٥٩. البداية والنهاية، ابن كثير، ج١-٢، ص٦٦٦.

[3] فيض القدير، (٢٦٨٢) فيض القدير شرح الجامع الصغير من أحاديث البشير للسيوط، للعلامة عبدالرؤف المناوي، المكتبة الجارية الكبرى.

پەنای بۆ بردون، پێغەمبەرایەتی ئـاین و موڵك و سیاسـەتی گشـتیە، مەلەکەیەکە خـوا دەیبەخشـێ، هـەتا رەوشـتی بـەرز و پایـەداری زۆرتـر بێـت، خـەڵکی زیـاتر ئاگـاداری خۆیـان و قسـە و کرداریـان دەبـن، خێراتـر گوێڕایـەڵی دەکـەن، ئەگـەر پاشایەك خراپە و لاری هەبێ، کەمتر گوێی بۆ دەگیرێ و ملکەچی بۆدەکرێ، لەبـەر ئەوە پێغەمبەر لە چاکترین لق و رەچەڵەك و چاکترین ناوچە پەیدابووە، بـە نیکـاح لە دایك بووە، واتـە لـە ژن و مێردێك کـە بـە فـەرمیی و داواکـردن و بـە بەرچـاوی خەڵکەوە ئاهەنگ و قەرەباڵغیی بۆ کراوە و داواکراوە و داویانـەتێ، ئامینـەی کچـی وەهەب کچی عەبدولمەناف کوڕی زوهرەی کوڕی کـیلاب، درا بـە عەبـدوڵڵای کـوڕی عەبدولموتەلیبی کوڕی هاشمی کـوڕی عەبدولمـەناف کـوڕی قوسـەی کـوڕی کـیلاب کوڕی مورڕە، واتە لق و بنەماڵەی باوك و دایکی لە کیلاب کوڕی مورڕەدا دەچنەوە سەر یەك و یەك باپیرە گەورەیان هەبووە، پێغەمبەر دەفـەرموێ: "مـن چـاکترین و پاکترین رەچـەڵەکم هەیـە"، واتـە رەچـەڵەك پشـتا و پشـت هـاتووەو خزمایەتیـەکی چـاکمان بـووە، لـە چـاکترین بـاوك کەوتوومەتـەوە، وەکـو (بەیهـەقی) لـە (دلائـل النبوة)دا وتوویەتی: هەواڵ بە پێغەمبەر درا کە هەندێ لە پیـاوانی کنـدە وتبوویـان پێغەمبەر لە ئێمەیە، دەڵێ: عەباس و ئەبوسوفیان ئەوەیان وتبوو[1].

بـە پێغەمبـەر گەیشـت کـە پیـاوانێکی کنـدەیی دەڵـێن: موحەممـەد لەوانـە، پێغەمبەر فەرمووی: ئەوە عەباس و ئەبوسوفیان ئەو قسـانە دەکـەن، ئەگـەر هـاتن بۆ لاتان پێیان بڵێن لەو بارەیەوە دڵنیامان بکەن، چـونکە ئێمـە خۆمـان بـێ بـەری ناکەین لە باو و باپیرانمان، ئێمە لە کوڕانی نەزری کوڕی کەنانەین، پاشان وتارێکی بۆ خەڵك دا و وتی: من موحەممەدم... هەتا دوایی..

---

[1] (شرح الزرقاني علي مواهب، ج٣، ص١٣٣. المقاصد النبوية في الأسماء والتسمية، ص ٦٩.

## ٣- محەممەد ﷺ

دكتۆر جەمال لە دەیان جێگەدا دەڵێ محەممەد لەسەرەتادا ناوی قثم بووە، پاشتر لە مەدینە كردیان بە محەممەد، هەتا لە گەڵ ناوی ئەحمەدی سورەی الصف دا بگەنجێت، وەك لە لاپەڕە ٤١١ دا لە پەراوێزی ژمارە ٦ دا دەڵێ: "بۆیە ناویان نا موحەممەد هەتا لەگەڵ وشەی ئەحمەد بگونجێ، كە لە سورەتی الصف ئایەتی ٦ دا هاتووە، (ومبشرا برسول یاتی من بعدی اسمه احمد)، دەنا ئەو ناوی قثم بووە"، لە لاپەڕە (٣٩٩)دا دەڵێت: "دەركەوتنی ئیسلام و ڕۆڵی قثم كوڕی عەبدوللات (موحەممەد كوڕی عەبدوڵڵا)". لە لاپەڕە (٤٠١)دا دەڵێ: "وەك ئاشكرایە كە قثم كوڕی ئامینەی كچی وەهەبە...،"

بەڵام لە هیچ جێیەكدا پێغەمبەر بەو ناوە نەهاتووە، بەڵكو لە سەدان سەرچاوەی بڕوا پێكراوی كۆندا هەیە، كە موحەممەد هەر لە لە دایكبوونیەوە هەتا ناونانی و منداڵیی و، شوانیی و چوونی بۆ شام و حیلفی فضول و ناكۆكیی قوڕەیش لەسەر دانانی بەردە ڕەشەكە و وتاری ژنهێنان و مارەكردنی خەدیجە لە لایەن ئەبوتالیبەوە، هەتا وەحی و پێغەمبەرایەتی و كێشەكانی لەگەڵ قوڕەیش و نووسینی صحیفەكەی سەر دەرگای كەعبە و كۆچكردنی و ژیانی لە مەدینە، هەتا وتاری حەجی ماڵئاوایی، واتە هەر لە ناونانییەوە هەتا وەفاتی، لە هیچ جێیەك، چ پێش پێغەمبەرایەتی و چ دوای پێغەمبەرایەتیی بەناوی قثم نەهاتووە، بەتایبەت كە ئیسلام دێت، خوای گەورە لە چەند ئایەت لە قورئاندا بە ئاشكرا ناوی دەبات، وەك ئایەتی (وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَآمَنُوا بِمَا نُزِّلَ عَلَى مُحَمَّدٍ وَهُوَ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ) (محمد : ٢ ) . (وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ) (آل عمران : ١٤٤ ). (مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ) (الأحزاب : ٤٠ ). (مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاء عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاء بَيْنَهُمْ) (الفتح : ٢٩ ). (وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّراً بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ فَلَمَّا

جَاءهُم بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا هَذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ) (الصف : ٦ ) واته له (٤٥٠) سالّ زیاتر پـێش قورئانەوە لـە ئینجیلـدا نـاوی هـاتووە، قەشـەکانی گـاور لـە کلّێسـاکانیاندا ناویـان بردووه و باسیان کردووه، توێژینەوه و گـەڕان و بـاس و خواسـیان لەسـەر کـات و شـوێنی سـەرهەلّدانی کـردووه، بـه حـەزەر و خۆپـارێزی و وردیـی چـاوەڕوانیان کردووه، چونکه له تەورات و ئینجیلدا نـاوو شـوێن و کـات و شـێوەی پێغەمبـەرو، باری کۆمەلاّیەتیی و ئەو کەش و هەوایەی تیاپەروەردە و گەورە دەبێـت و دەبێتـە پێغەمبـەر، تەنانـەت بەرەنگاربوونـەوەکان و شـێوازی دژایەیەتیشـی باسـکراوە، هەروەها خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کـە کافرەکـان موحەممـەد دەناسـن وەك چۆن کوڕی خۆیان دەناسن، تەنانەت گاور و جولەکەی وا هەبووه وتوویەتی گومانم له منداڵەکەم هەیە، رەنگە لە من نەبێ، بـەلاّم گومـانم نییـە کـە محمـد پێغەمبـەرە مژدە پێدراوو چاوەڕوانکراوەکەیه، دەیانگوت ئەگەر سەریهەلّدا دەیناسینەوە، قسه هەیه کە جولەکەو گاوری مەککەو مەدینە دوای ئینجیل، لەشامەوە کۆچیان کـردوه بۆ حیجاز، چونکە بەپێی نامـە ئاسمانیەکـەیان، ئـەوەیان بـۆ دەرکـەوتووە کـە دوا پێغەمبەر لەحیجاز سەر هەلّدەدات، ئەوانیش لەشـامەوە کۆچـیان کـرد بـۆ حیجـاز، بەلّکو ئەو پێغەمبەرە لەنەوەو خێلّی ئەوان بێت، تەنانەت زانا زەردەشـتییەکان کـە لەناوچەی کوردو (مادە)وە هاتبوون بۆ لای عیسا، کە دیبوویان وتبوویـان ئەمـەش پێغەمبەرە، بەلاّم ئەمە پێغەمبەرە گـەورە نـاودارە چـاوەڕوانکراوەکە نییـە کـە لـە ئاڤێستادا مژدەی پێدراوەو هەموو جیهان رزگـار دەکـات، رێزیـان لـە عیسـا گـرت، دیارییـان پێبەخشـی و گەڕانـەوە، دوای عیسـا کـوردە زەردەشـتییەکان بـەردەوام سەردانی کلّێساکانی شام و باشووری عێراقیان دەکـرد، لەگـەلّ قەشـەکان وتوێـژی سەرهەلّدانو نزیکبوونـەوەی پێغەمبـەری چـاوەڕوانکراویان دەکـرد، کـە سـەریهەلّدا هەندێ لەزاناو خەلّکی گاورو جوو بڕوایان پێهێنا، لە کوردستانیشەوە نوێنەریان له شارەزوورەوە بە ناوی (جابان الکردی) (گاوانی کوردی) لە هـۆزی گـاوانی ناوچـەی گاوانرۆ( جاوانرۆـ جـوانرۆ) ی باشـوری کوردوسـتان کـە زەردەشـتی بـوون، وە لـە

شاری نصێبین لە ناوچەی جەزیرە و بۆتانەوە (جزیرەی ئیبن عومەر) لە باکوری نەینەوا لە باکوری کوردوستان بەناوی بازرگانەکانی هۆزی باجن سەردانی پێغەمبەریان کرد[1].

دوای قورئان و نامە ئاسمانییەکانی پێشوو با بزانین سەرچاوەکان لە بارەی ئاهەنگی لە دایکبوون و ناونانی پێغەمبەرەوە چی دەڵێن:

"لەرۆژی حەوتی لە دایکبوونی پێغەمبەردا عەبدولموتەلیبی باپیری قۆچی بۆ سەربڕی، گەورەکانی قورەیشی بانگکرد، کاتێك کە نانیان خوارد وتیان: ئەی عەبدولموتەلیب دەبینی ئەم کورەت لەبەر ئەو ئێمەت دەعوەت کردووە، ناوی چیت لێناوە.؟ وتی ناوم ناوە موحەممەد.. وتیان: ئەی بۆچی حەزت لەناوی کەسوکارت نییە و بەناوی ئەوانەوە ناوت نەناوە..؟ وتی: دەمەوێ خوای گەورە لەئاسمانەوە سوپاسگوزاری بکات، خەڵکەکەش لەسەر زەوی". هەروەها بەیهەقیی لە ئیبن عەباسەوە دەگێڕێتەوە: کە محەممەد لە دایکبوو خەتەنەکراو و رووخۆش بوو، باپیری سەری سوڕما، جێی چاکی لای خۆی بۆ دانا، وتی: جێیەك و ناوێکی بەرزی دەبێت[2]. لەجێیەکدا دەڵێت: رۆژهەلات و رۆژئاوام تەی کرد پیاوێکم نەدی لە موحەممەد باشتربێت[3]. مەحمود شاکر دەڵێ: باپیری ناوی نا (موحەممەد)[4].

ئەو کاتەی کە ئەبوتالیب وتاری داواکردن و مارەکردنی خەدیجە بۆ موحەممەدی خوێندەوە، مەجلیسی داواکردنەکە پێشی پێغەمبەرایەتی بووە بەپانزە ساڵ[5]،

---

[1] کابانی کوردی، حسن محمود حمە کەریم، لا ١٠، چاپی سێهەم، سلیمانی، ١٩٩٨.
[2] تأريخ أبي الفدا ء ـ الملك المؤيد عمادالدين بن أيوب أبي الفدا ء ـ ج١، ص ١٦٨.
[3] هەمان سەرچاوە أبي الفداء، ص١٧٠.
[4] التأريخ الأسلامي ج١، ص٣٧.
[5] هەمان سەرچاوە، ل٣٤١.

ئەبوتالیب مامی پێغەمبەر ﷺ وتی: (. ثم ان أبن أخي محمد بن عبدالله لا يوزن بـه رجل شرفاً و نبلاً و فضلاً..) [1].

لە رێکەوتنی کێشەی دانانی بەردەڕەشەکەدا کە سەرۆك هۆزەکان ناکۆك بوون، کە پێغەمبەر دەرکەوت وتیان (قد رضـينا بحکـم محمـد بـن عبـدالله) [2]. ئەمانـە هـەواڵی پێش پێغەمبەرایەتی بووە، ئەوکاتە پێغەمبەر ناوی محەممەد بووە نـەك شـتی تـر، هەر بەو ناوەش ناسراوەو بانگکراوە.

لەعەرەبدا بلاَونەبووە یا باونـەبووەو ناسـراو نـەبوو کەسـێك نـاو بنـرێ موحەممـەد پێش پێغەمبەر ﷺ، لە رۆژی حەوتەمدا کە محەممەد لە دایکبـوو، عەبدولموتـەلیب داوای لە قەسابەکە کـرد قـۆچ سـەرببڕن، دەعـوەتی پیـاوە گـەورەکانی قورەیشـی کرد، هەموو ئامادەبوون، نانیان خوارد، کە زانیـان منداڵەکـە نـاودەنێ موحەممـەد، پرسـیاریان کـرد: چـۆن مـەیلت چـووە سـەر ئـەو نـاوە..؟ وتـی: دەمـەوێ سوپاسگوزاربێ لە ئاسمان لای خوا و لە زەوی لای خەڵك [3].

قەیسی کوڕی مەخزومە قسەی دەکرد، لە بـارەی لـە دایکبـوونی پێغەمبـەرەوە وتی: من و محەممەد پێغەمبـەر ﷺ ساڵی فیـل لـە دایکبـووین، هـەردوکمان منـداڵ بـووین، هـەروەها حەسـانی کـوڕی سـابیت شـاعیرەکەی پێغەمبـەر ﷺ بـاس لـە یادگارییەکانی خۆی لە بارەی رۆژی لە دایکبـوونی پێغەمبـەرەوە دەکات و دەڵـێ: "وەڵاهی من منداڵێك بووم پێگەیشتبووم حەوت ساڵ، یان هەشت سـاڵ بـوم، چـاك لە بیرمە، گوێم لە جولەکەیەك بوو بە هەموو هێزی هاواری دەکرد لەسەر بەرزاییـەك لە یەسریب: ئەی کۆمەڵی جولەکە، هەموو لە دەوری کۆبوونەوە و وتیـان: ماڵکـاول ئەوە چیت بەسەر هاتووە..؟ وتی: ئەمشەو ئەستێرەی ئەحمەد دەرکەوت، کە پێی

---

[1] التأريخ الأسلامي ج١، ص٤٨).

[2] اليعقوبي، ل٣٤٠.

[3] الكعبة، لا١٩٠

له دایك دەبیٚ"[1]. وشەی موحەممەد پێش لە دایكبوونی موحەممەد هەر هەبووە، كە ئەوانیش باوكیان ئاگایان لە سەرهەڵدانی ئەو پێغەمبەرە بووە، كورەكانیان بە شێوەیەك لەو ناوە ناوناوە، هەتا، بەڵكو ئەو شانازیە بۆ ئەوان بێت، بەتایبەت كە هەموو دەنگ و باسەكان باسیان لە نزیكیی سەردەمەكە و شوێنەكە و شێوە و رەوشتی ئەو پێغەمبەرە دەكرد و خەڵكی بە عەرەب و جولەكە و گاور و حەنەفیەكان و بتپەرستەكانەوە بە وردیی چاوەڕوانی ئەو پێغەمبەرە بوون.

لای عەرەب باو نەبوو كەسێك ناوبنێن موحەممەد پێش موحەممەد، جگە سێ كەس، كە باوكیان تەماعیان وابوو بەڵكو ئەو پێغەمبەرە چاوەڕوانكراوە كوڕی ئەوان بێت، كە دەوترا لە حیجازدا سەرهەڵدەدات سەردەمەكەشی نزیكە، ئەوانیش موحەممەدی كوڕی سوفیانی كوڕی مەجاشع باپیری فەرەزدەقی شاعیر، موحەممەدی كوڕی ئەصیحەی كوڕی جەلاح كوڕی حەریش، موحەممەدی كوڕی حەمرانی كوڕی رەبیعە، باوكی ئەو سیانە دەچوونە لای گاورەكان كە زانیارییان لە نامە ئاسمانییەكانی پێشوو هەبوو، زانا گاورەكانیش هەواڵی سەرهەڵدانی پێغەمبەرو ناوەكەشیان دەدا، دایكە سكپڕەكان نەزریان دەكرد گەر سكەكەیان كوڕ بێت ناوی بنێن موحەممەد، كە كوڕ دەبوو وایان دەكرد[2]. هەندێك لە سەحابەكان دەڵێن: یەكەم كەس كە ناونرا موحەممەد: موحەممەدی كوڕی ئەصیحە بوو[3]، عەبدولمەلیكی كوڕی ئەبی سەدیەی مەنقری دەگێڕێتەوە لە باپیری باوكیەوە كە ناوی خەلیفە بووە و موسڵمان بووە، دەڵێ: پرسیم لە موحەممەدی كوڕی عودەی كوڕی رەبیعە: چۆن باوكت ناوی نایت موحەممەد..؟ پێكەنی و وتی: بۆیان گێڕامەوە كە باوكم وتوویەتی: من و سوفیانی كوڕی مەجاشعی دارم و یەزید كوڕی رەبیعە و ئوسامەی كوڕی مالیك كوڕی عەنبەر، دەچووین بۆ لای ئیبن

---

[1] سيرة ابن هشام، ج٢، ص١٥٩.

[2] الكعبة. ل١٠٨

[3] اسد الغابة، ٤٦٩٣.

جوفنه، كه نزيكبووينه‌وه لاماندايه لای چه‌ند دره‌ختێك، یه‌كێك له دێر و په‌رستگای گاوره‌كانه‌وه هات بۆ لامان، وتی: ئه‌رێ من جۆره قسه‌یه‌كتان لێ ده‌بیستم له زمانی ئه‌م ولاته ناچێت، وتمان: راسته ئێمه كۆمه‌لێكین له موزیر، وتی: كام موزیره..؟ وتمان: له خیندیف، وتی: به‌م نزیكانه پێغه‌مبه‌رێك سه‌رهه‌لده‌دات له ناوتان، هه‌ولبده‌ن به‌شی خۆتانی لێوه‌ربگرن، وتمان: ناوی چییه..؟ وتی: ناوی موحه‌ممه‌ده، وتی: چووینه لای ئیبن جوفنه و كاره‌كه‌مان ته‌واوكرد، پاشان گه‌راینه‌وه و هه‌ریه‌كه‌مان كورێكمان بوو، ناومان نا موحه‌ممه‌د[1] .

عه‌بدوللا باوكی محه‌ممه‌د مرد، خه‌فه‌ت و كاریگه‌ریی له دلی عه‌بدولموته‌لیب و ئامینه‌دا جێهێشت، ئامینه كه‌م بینیبووی، ئاواتی بوو له‌و كاروانه بگه‌رێته‌وه‌و درێژه به ژیان بده‌ن، عه‌بدولموته‌لیبیش سوور بوو له‌سه‌ر ژیانی عه‌بدولای كوری، ئه‌ی ئه‌و نه‌بوو كه (١٠٠) حوشتر فدیه‌ی دا كه تا ئه‌وكاته عه‌ره‌ب ئه‌وه‌نده‌ی فدیه نه‌دابوو بۆ رزگاركردنی كوره‌كه‌ی، به‌لام مردن هه‌موو ئاواتێكی بری و له عه‌بدوللا پێنج سه‌ر حوشتر و برێ مه‌ر و جارییه‌یه‌ك به ناوی ئوم ئه‌یمه‌نی جێهێشت، ئامینه واده‌ی دوگیانییه‌كه‌ی وه‌ك هه‌موو ژنێكی تر ته‌واوكرد، كه سكه‌كه‌ی دانا، هه‌وال و مژده‌یان گه‌یانده عه‌بدولموته‌لیب كه لای كه‌عبه‌دا دانیشتبوو، عه‌بدولموته‌لیب خۆشحال بوو، دلی سووتا بۆ وه‌بیرهاتنه‌وه‌ی عه‌بدوللای كوری، خێرا خۆی گه‌یانده لای ئامینه و منداله‌كه‌ی خسته باوه‌شی و هێنای بۆ كه‌عبه و ناوی نا موحه‌ممه‌د[2]، ئه‌و ناوه لای عه‌ره‌ب باو نه‌بوو، به‌لام ناسراو بوو، پاشان باپیره گه‌وره‌ی گێرایه‌وه بۆ لای دایكی[3]. ئه‌سعه‌دی ئه‌بوكه‌ربی حه‌میدی كه ئیبن قوته‌یبه باسی ده‌كات، پێش ئه‌وه‌ی سه‌رهه‌لبدات به حه‌وت سال بڕوای به ئه‌حمه‌دی پێغه‌مبه‌ری چاوه‌روانكراو هێنابوو، ده‌لێ:

---

[1] اسد الغابة، ٤٧٤٨.

[2] حياة محمد. ل١٠٨

[3] هه‌مان سه‌رچاوه، ١٠٨.

شهدت على احمد انه رسول من الله باري النسم

فلو مد عمري الى عصره لكنت وزيراً له وابن عم

والزم طاعته كل من على الأرض من عرب و عجم[1]

رەنگە کەسێکی وەك دکتۆر جەمال، درۆو بوختان و تانەیەکی لەسەر ناوو رەچەڵەکی پێغەمبەر کردبێت، ئیمامی عەباس ئەو قسەیە دەبیستێ و بۆ پێغەمبەری دەگێڕێتەوە، وەك تورموزی لە موتەلیبی کوڕی ئەبی وداعەوە دەیگێڕێتەوەو دەڵێ: عەباس هات بۆ لای پێغەمبەر وەك شتێکی بیستبێ، پێغەمبەریش هەڵدەستێ و دەچێتە سەر مینبەر و دەفەرمووێ: من کێم..؟ دەڵێن: تۆ پێغەمبەری خوایت سەلامت لێبێت، فەرمووی: من موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبدولموتەلیب، خوای گەورە خەڵکانێکی دروستکرد، منی خستە ناو چاکترینیان، ئەنجا کردنیە دوو کۆمەڵ، منی خستە ناو کۆمەڵە چاکەکەیانەوە، ئەنجا کردنیە چەندین هۆز، منی خستە ناو چاکترین هۆزیانەوە، ئەنجا هۆزەکەی کردە چەندین بنەماڵە، منی خستە ناو چاکترین بنەماڵەیانەوە و چاکترین کەسیانەوە[2].

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر فەرمووی: "من موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبدولموتەلیب کوڕی هاشم... کوڕی عەدنان، هەرکات خەڵکەکە بووبن بە دوو بەشەوە، خوا منی خستووەتە ناو بەشە چاکەکەیان، من لە نێوان باوك و دایکمدا دەرچووم، هیچم بەرنەکەوتووە لە سەردەمی نەفامیی، من لە ئەنجامی نیکاحدا لە دایك بووم، لە خوێنڕێژ و خراپەکار دەرنەچووم، هەر لە ئادەمەوە هەتا کۆتایی هات بە باوك و دایکم، من چاکترین رەگەزتانم، لە چاکترین باوکانتانم"[3].

---

[2] المقاصد النبوية في الأسماء والتسمية، ميسون احمد راجم، ص ٦٦. سنن ترمذي، ٣٦٢٨.

[3] فيض القدير، (٢٦٨٢) فيض القدير شرح الجامع الصغير من أحاديث البشير للسيوطي.

عەبدلموتـەلیب نـاوی شـەیبەیە، خـواردنی دەبـرد بۆبالّـداری (تـەیرە ئـەبابیل) لـە کێوەکان، ئارەق خواردنـەوەی لەسـەر خـۆی حـەرام کردبـوو، (ئـیبن هیشـام نـاوی عەمرە، بۆیە ناونرا ئیبن هیشـام، واتـە هەشـیم لـەتکردن، چـونکە نـانی لـەت لـەت دەکرد و دەیکـردە تریـت بـۆ حاجیـەکان، یـان بـۆ خـەڵك لـە کـاتی قـات و قریـدا، ناوچاوی زۆر رۆشـن و نـورانی بـوو، قەیسـەری رۆم داوای کردبـوو کـە کچـی خـۆی بداتێ بەوەی کە لـە تەوراتـدا بیسـتبووی کەسـێك لـەو نـاوەدا دەبێتـە پێغەمبـەر و بەوی دەزانی، یان لە نەوەی ئەوە، حەزیدەکرد ئەو تۆوە بگوازێتەوە بۆ کچی ئـەو، (ئیبن عەبدولمەناف) ناوی موغیرە بوو، (قوصەی) کەسایەتی ناودار بوو، هەرکەس کچی مارەبکردایە، لە ماڵی ئەودا دەکرا، (کـیلاب) حـەزی لـە راو و شـکار و تـانجی بوو بۆ راو، ناوی (حکیم) بوو، (ئـیبن مـوررە) قورەیشـی کـۆدەکردەوە قسـەی بـۆ دەکـردن و مـژدەی سـەرهەڵدانی پێغەمبـەری پێـدەدان و دەیـوت لـە رەچـەڵەك و کورانی من دەبێت، (ئیبن لوئەی) (ئیبن فیهر) ناوی قورەیش بوو، قورەیش بۆ ئـەم دەگەرێتەوە و بە ناوی ئەمەوە ناونراوە، کەس لـەو بـەرزتر نـەبوو لـەو ناوچـەیەدا، (ئیبن مالیك) (ئیبن نەزر) ناوی قەیس بوو، لەبەر ئەوە ناونرا نەزر، چونکە ناوچاوی نورانیی بوو، جوان بوو، (ئیبن کەنانە) خەڵك سەردانیان دەکـرد بـۆ پرسـیار لەبـەر زانایی و رێزی، (ئیبن خوزەیمە) (ئـیبن مودریکـە) نـاوی (عـەمر)ە، (ئـیبن ئلیـاس) یەکەم کەس بوو قوربانی بۆ کەعبە کرد، دەڵـێن لـە پشـتیەوە دەنگـی پێغەمبـەری بیست بۆ حەجکردن، (ئیبن موزر) ناوی (عەمر)ە یەکێ لە قسەکانی: "ئەوەی شـەڕ بچێنێ دەیدوورێتەوە، چاکترین چاکە ئەوەیانە بە پەلە بکرێت" خـاوەنی فیراسـە و دووربینیی و لیاقەت بووە، (ئیبن نزار) دەڵێن، بۆیە ناونرا نەزار، چونکە کە لە دایك بوو باوکی نوری پێغەمبەرایەتی لە نێو چـەوانیدا دەدی، دڵـی پێـی خـۆش بـووە و خواردنی دەدایە و دەیگوت: ئەوە نورە، نازناوی ئەبو یادی کوڕی مسـعەدی کـوڕی عەدنانە، هەتا ئێرە بنەچەی پێغەمبەر راست و روون و ئاشـکرایە، هـەموو زانایـانی نەسەب لەسەری یەکن، بەڵام دوای ئەوە تا دەگاتە سـەر ئیسـماعیل روون نییـەو، پێغەمبەر فەرمویەتی هیچ مەڵێن دوای ئەوە.

باپیرانی محەممەد کەسانی بەرێزو مەزن بوون، ئەوان دەسەلاتدارو وەك پاشا سەیر دەکران و خەلك حیسابی بۆ کردون و پەنای بۆ بردون، پێغەمبەرایەتی ئایین و مولك و سیاسەتی گشتیە، مەلەکەیەکە خوا دەیبەخشێ، هەتا رەوشتی بەرز و پایەداری زۆرتر بێت، خەلکی زیاتر ئاگاداری خۆیان و قسە و کرداریان دەبن، خێراتر گوێرایەلی دەکەن، ئەگەر پاشایەك خراپە و لاری هەبێ، کەمتر گوێی بۆ دەگیرێ و ملکەچی بۆدەکرێ، لەبەر ئەوە پێغەمبەر لە چاکترین لق و رەچەلەك و چاکترین ناوچە پەیدابووە، بە نیکاح لە دایك بووە، واتە لە ژن و مێردێك کە بە فەرمیی و داواکردن و بە بەرچاوی خەلکەوە ئاهەنگ و قەرەبالغیی بۆ کراوە و داواکراوە و داویانەتێ، ئامینەی کچی وەهەب کچی عەبدولمەناف کوری زوهرەی کوری کیلاب، درا بە عەبدوللای کوری عەبدولموتەلیبی کوری هاشمی کوری عەبدولمەناف کوری قوسەی کوری کیلاب کوری موررە، واتە لق و بنەمالەی باوك و دایکی لە کیلاب کوری موررەدا دەچنەوە سەر یەك و یەك باپیرە گەورەیان هەبووە، پێغەمبەر دەفەرموێ: "من چاکترین و پاکترین رەچەلەکم هەیە"، واتە رەچەلەك پشتا و پشت هاتوەو خزمایەتیەکی چاکمان بووە، لە چاکترین باوك کەوتوومەتەوە، وەکو (بەیهەقی) لە (دلائل النبوة)دا وتوویەتی: هەوال بە پێغەمبەر درا کە هەندێ لە پیاوانی کندە وتبوویان پێغەمبەر لە ئێمەیە، دەلێ: عەباس و ئەبوسوفیان ئەوەیان وتبوو[1].

بە پێغەمبەر گەیشت کە پیاوانێکی کندەیی دەلێن: موحەممەد لەوانە، پێغەمبەر فەرمووی: ئەوە عەباس و ئەبوسوفیان ئەو قسانە دەکەن، ئەگەر هاتن بۆ لاتان پێیان بلێن لەو بارەیەوە دلنیامان بکەن، چونکە ئێمە خۆمان بێ بەری ناکەین لە باو و باپیرانمان، ئێمە لە کورانی نەزری کوری کەنانەین، پاشان وتارێکی بۆ خەلکداو وتی: من موحەممەدم، ئەم وتەیە لای دکتۆر جەمال تێکدراوەو شێوێنراوەو مانایەکی زۆر گوماناوی و پیسی لێدەر هێناوە.

---

[1] (شرح الزرقاني على مواهب، ج٣، ص١٣٣.. المقاصد النبوية في الأسما ء والتسمية، ص ٦٩.

دەگێڕنەوە کە حەواریەکان بە حەزرەتی عیسایان وت: ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا دوای ئێمەش میللەت و پێغەمبەرێکی تر دێت؟ فەرمووی: بەڵێ، میللەتی ئەحمەد، دانا و زانا و پاك و لە خواترسن، لە تێگەیشتن و فیقه و تێگەیشتنی ئاییندا وەك پێغەمبەرن، بە رسق و رۆزیەکی کەمەوە لە خوا رازین، خوای گەورەش بە کەمێك کردەوەی چاکەوە لەوان رازیە[1].

پێغەمبەر دەفەرموێ: پێنج ناوم هەیە: (من موحەممەدم، من ئەحمەدم، من ماحیم واتە: پاککەرەوەم واتە خوا بە موحەممەد زەوی پاك دەکاتەوە لە بێباوەڕیی (مەبەست نیوەدورگەیە))، من حاشرم، واتە لەبەردەمی مندا خوا حەشری هەموو خەڵك دەکات، یان دوای حەشری من حەشر دەکرێن، یەکەم کەس پێغەمبەر حەشر دەکرێ، دەفەرمووێ: من یەکەم کەسم کە زەوی بۆم شەق دەبێ و دێمە دەرەوە، (أنا أول من تنشق عنه الأرض)، من عاقبم، واتە من دوا پێغەمبەرم، لەهەندێ گێڕانەوەدا (خاتەم)یش هاتووە بەناوی پێغەمبەر، بەڵام (خاتەم و عاقب) هەر یەك مانایان هەیە، لەگێڕانەوەکەی نافیعی کوڕی جوبەیر کە ئەبو سەعد هێناویەتی، ئەو چووەتە لای عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان، وتوویەتی: ناوەکانی پێغەمبەرم بۆ بژمێرە؟ وتوویەتی: ئەوپێنجەی وتووەو بۆی زیادکردووە (وأنا العاقب)، بەڵام (عاقب و خاتەم) یەکێکە دەفەرموێ: (أنا الحاشر بعثت مع الساعة)[2].

لە فەرموودەی حوزەیفەدا هاتووە: (أحمد، موحەممەد، حاشر، موقەفی، نبی رەحمە)[3]، (أنا أول من تنشق عنه الأرض)[4]، ئەو پێنج ناوە کەس ناوی وای نەبووە، بەڵام بۆ ناوی موحەممەد لە کاتی نزیکبوونەوەی لە دایکبوونی، کە خەڵك لە کەهان و ئەحبارە گاورەکان و جولەکەی دەبیست: نزیکە لەم سەردەمەدا پێغەمبەرێك سەرهەڵبدات ناوی موحەممەد دەبێت، حەزیان دەکرد کە لەوان بێت،

---

[1] البحر المحيط، ج٨، ص٢٥٩.. المقاصد النبوية في...، ص ٦٩.

[2] دلائل النبوة، البيهقي، ج١، ص١٠٥.

[3] أخرجه احمد في مسنده، ٢٣٤٤٥.

[4] أخرجه البخاري، ٢٤١٢

هەر، بۆیە هەندێ کەس منداڵەکانیان ناو دەنا بەو ناوەوە کە ئەوانیش شەش کەس بوون، لەوانەیە لە کتێبە کۆنە ئاسمانیەکاندا ناوی موحەممەد هاتبێ.

سوهەیلی دەڵێ: ئەوانە سیان بوون (موحەممەد کوڕی سوفیان کوڕی مجاشع، موحەممەد کوڕی ئەصیحە کوڕی جەلاح، موحەممەد کوڕی حومران کوڕی رەبیعە)[1].

لە صەحیحی موسلیمدا لە ئەبوموسای ئەشعەریەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا چەند ناوێکی خۆی پێ ناساندین و دەفەرمووێ: (من موحەممەد و ئەحمەد و موقەفی و حاشر و پێغەمبەری تەوبە و پێغەمبەری رەحمەتم).

ئیبن کەسیر دەڵێ: (ئەو ـ محەممەدـ گەورەی کوڕانی ئادەمە و شانازیانە لە دونیا و قیامەتدا، ئەبو قاسم و ئەبو ئیبراهیم و موحەممەد و ئەحمەد و ماحییە)[2].

لە ئوم سەعد کچی سەعدی کوڕی رەبیعەوە دەگێڕنەوە کە دەڵێ: گوێم لە زەیدی کوڕی سابیت بوو دەیوت: ئەحبارە زانا جولەکەکانی بەنی قورەیزە و بەنی نەزیر باسی رەوشتەکانی پێغەمبەریان دەکرد، کە ئەستێرە سوورەکە دەرکەوت هەواڵیاندا کە ئەوە ئەستێرەی پێغەمبەرە، پێغەمبەر دوای ئەو نییە، ناوی ئەحمەدە، کۆچ دەکات بۆ یەسریب، بەلام کە پێغەمبەر کۆچی کرد بۆ مەدینە، دژی وەستان و ئیرەییان پێبرد و بە بێبڕوایان دانا[3].

ئیمامی موسلیم دەڵێ: سەوبان مەولای پێغەمبەر دەڵێ: من لای پێغەمبەر وەستابووم، یەکێك لە زانا و ئەحبارەکانی جولەکە هات، وتی: سەلامت لێبێ ئەی موحەممەد!، منیش پالێکم پێوەنا خەریکبوو بیکوژم، وتی: بۆ پالم پێوە دەنێی..؟ وتم: بۆچی نالێی پێغەمبەری خوا..؟ جولەکەکە وتی: من بەو ناوەوە

---

[1] الروض الأنف، سوهيلي، ج١، ص ١٨٢

[2] البداية والنهاية، ج١-٢.

[3] المقاصد النبوية في...، ص ٧٥.

بـانگی دەکـەم کـە کەسـوکاری ناویـان نـاوە، پێغەمبـەر فـەرمووی: مـن نـاوم موحەممەدە کە کەسوکارم ناویان ناوم[1].

ئەبو تالیبی مامی لە شیعرێکیدا دەیگوت:

وشَقّ له من اسمه ليُجِلّهُ فَذو العرش محمود و هذا محمد

ئیبن رافیع دەگێڕێتەوە کە لە پێغەمبەری بیستووە فەرموویەتی: ئەگەر یـەکێکتان ناونا موحەممەد، نە لێی بدەن و نە شتی لێ بگرنەوە[2].

زۆر کـەس کـە لـە دایـك دەبـوون پێغەمبـەر نـاوی دەنـان موحەممـەد، وەك موحەممـەدی کـوڕی ئەنـەس[3]، موحەممـەدی کـوڕی سـابیت کـوڕی قـەیس[4]، موحەممەدی کوڕی جەدی کوڕی قەیس[5]، موحەممەدی کوڕی خەلیفـە کـوڕی عـامر نـاوی عەبدولمـەنات بـوو، پێغەمبـەر نـاوی نـا موحەممـەد[6]، موحەممـەدی کـوڕی زەمرەی کوڕی ئەسوەد[7]، موحەممەدی کوڕی تەلحە[8]، موحەممەدی کوڕی عەباسی کوڕی نەزلە[9]، موحەممەدی کـوڕی عـەمارەی کـوڕی حـەزمی ئەنسـاری[10] ئـامۆزای موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزمە، کە پێغەمبەر رازیبوو لەسـەر ناونـانی بـە موحەممەد[11]، موحەممەدی کوڕی مخلدی کوڕی سەحیم ئەنساری[1].

---

[1] صحيح مسلم، ٣٦٥. تحقيق فؤاد عبدالباقي، دار احيا ء التراث العربي، بيروت.

[2] اخرجه البزاز في مسنده، ٣٨٨٣. مجمع الزوائد (٨٤٨) البيهقي.

[3] أخرجه الطبراني في المعجم الكبير، ج١٩، ص٥٤٧.

[4] أخرجه الحاكم، ج٢، ص٢١٠ وصححهُ.

[5] اسد الغابة، ٤٧٠٧. الإصابة، ٧٧٦٤.

[6] الأصابة، ٧٧٧٢.

[7] الأصابة، ٧٧٨٢.

[8] أخرجه الطبراني في المعجم الكبير، ج٢٥، ص ٤٥٩.

[9] الأصابة، ٧٧٨٥.

[10] الأصابة، ٨٣١١.

[11] اسد الغابة، ٤٧٥١.

دەگێڕنەوە لە موحەممەدی مەولای پێغەمبەر دەڵێ: موحەممەدێك ناوی (ماناهیە) بوو، مەجوسی بوو، بازرگان بوو ناوی پێغەمبەری بیستبوو کە سەریهەڵدابوو، لە مەرۆوە هاتبوو بازرگانی دەکرد، کۆچی کردبوو بۆ بینینی پێغەمبەر لە مەدینە و لەسەر دەستیدا موسڵمان بوو، پێغەمبەریش ناوی نا موحەممەد، چوویەوە بۆ مەرۆ بە موسڵمانی[2]، رەنگە بپرسین چۆن بازرگانێکی مەرۆ هات بۆ لای پێغەمبەر کە بیبینێ و موسوڵمان ببێت و ببێتە مەولای پێغەمبەر، حافز ئیبن حەجەر دەڵێ: لە مەرۆ مەولای پێغەمبەر بووە[3]، موحەممەدی کوڕی نوبەیت، کوڕی جابیر[4]، موحەممەدی کوڕی هیلال موعەلی[5]، موحەممەدی کوڕی یەفریدی هەرەوی ناوی (یەفودان) بوو پێغەمبەر ناوی نا موحەممەد[6]، موحەممەدی کوڕی ئەبی بەکری سدیق، موحەممەدی کوڕی حاتەب، موحەممەدی کوڕی خەتاب[7].

لە عەبدوررەحمانی کوڕی ئەبی لەیلاوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: عومەری کوڕی خەتاب سەیری ئیبن عەبدولحەمیدی کرد کە ناوی موحەممەد بوو پیاوێك قسەی پێدەوت، دەیوت: خوا ئاوات لێبکات ئەی موحەممەد، عومەر بانگی کرد وتی: تا زیندوویت نابێ ناوت موحەممەد بێت و ناوی گۆڕی بۆ عەبدوررەحمان، ئەنجا ناردی بۆ لای گەورەکەیان هەتا ناوەکەیان بۆ گۆڕی، بەڵام وتی: خوات لە بیر بێت ئەی ئەمیری بڕواداران بە خوا پێغەمبەر ناوی ناوم موحەممەد، عومەر فەرمووی: هەڵسن بڕۆن، ئیتر هیچ ناتوانین بکەین بەرامبەر کەسێك پێغەمبەر ناوی نابێت[8]،

---

[1] الأصابة، ٧٨٠٧.

[2] اسد الغابة، ٤٧٢٣. الأصابة، ٧٨١٣.

[3] المقاصد النبوية، ص٨٢.

[4] اسد الغابة، ٤٧٦٣.

[5] اسد الغابة، ٤٧٦٦.

[6] الأصابة، ٧٧١٨.

[7] اسد الغابة، ٤٧١٥.

[8] أخرجه أحمد في مسنده، (١٧٨٩٦) رواه الطبراني وأحمد، ورجاله رجال الصحيح.

مەبەستی لەوەبوو نابێ کەسێك ناوی موحەممەد بێت کارێك بکات خەڵك جنێوی پێبدات، چونکە ناوی خەڵك بە موحەممەد، دەبێ شەرەف و شانازی بێت بەسەر هەڵگرانی ناوەکەوە و، خۆی بپارێزێ لە کاری هیچ و ناڕەوا هەتا خەڵك خراپ باسی ناوی موحەممەد نەکەن، لە جێیەکی تردا هاتووە کە عومەر فەرموویەتی: (ناوی دەنێن موحەممەد و دوایی نەفرینی لێدەکەن).

ئیبن هیشام دەڵێ: ئامینەی کچی وەهەب گێڕاویەتیەوە، کە کاتێك دووگیان بووە، هاتوون بۆ لای پێیان وتووە کە تۆ دووگیانی بە گەورەی ئەم نەتەوەیە، کە لەدایك بوو بڵێ: پەنا دەگرم بە خوای تاك لە شەڕی هەموو حەسوودێك، ئەنجا ناوی بنێ موحەممەد[1].

## ٤- قثم کوڕی عەبدوللات، یان موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا

دکتۆر جەمال لە بەشی چوارەمی بەرگی سێیەمی کتێبی (ظهور الكرد)دا دەڵێ: "موحەممەد کوڕی عەبدوڵڵا) لە بنەڕەتدا ناوی (قثم کوڕی عەبدوللات) بووە، ئەم وتەیە لە چەند شوێندا چەند بارە دەکاتەوە، وەك:

* لە لاپەڕە (٣٩١) بەرگی سێیەمدا دەڵێ: "ئەبو تالیب ڕەزامەند بوو لەسەر شووکردنی خەدیجە لە کوڕی براکەی قثم (موحەممەد)".

* لە لاپەڕە (٣٩٨)دا دەڵێ: "یەکینەرگت بیروڕای خەڵکی ئەو هۆزانە لە ژێر ئاینزایەکی دیاریکراودا هەتا ئاینی ئیسلام دەرکەوت کە (قثم کوڕی عەبدوللات) (موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا) مژدەی پێدا".

* لە لاپەڕە (٣٩٩)دا دەڵێ: "دەرکەوتنی ئیسلام و ڕۆڵی قثم کوڕی عەبدوللات (موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا) لە پێشخستنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان".

* لە لاپەڕە (٤٢٠)دا دەڵێ: "ئەو کارە شۆڕشگێڕانەیەی کە قثم (موحەممەد) پێی هەڵسا".

---

[1] المقاصد النبوية... ص ٧٧.

* لـه لاپـەڕە (٤٢١-٤٢٢)دا دەڵـێ: "خەدیجـەی کچـی خوەیلیـد کچـی مـامی قەسیس وەرەقەی کوڕی نەوفل وەرگێڕی تەورات کە شوویکرد بە قثم (موحەممەد) کە تەمەنی بیست و پێنج ساڵ بوو، بە ویستی خۆی کە خەدیجە لەو گـەورەتر بـوو بە پانزە ساڵ و رەنگە لەبەر ئەوە قثم ژنی تری نەهێنا تا خەدیجە مابوو...".

* لە لاپەڕە (٤٠١)دا دەڵێ: "وەك ئاشكرایە كە قثم كوڕی ئامینەی..".

بەو جۆرە دەبینی دکتۆر جەمال لەو بەشەی کتێبەکەیدا زیاد لە دە جار وشـەی قثم لـە جیـاتی نـاوی پـیرۆزی موحەممـەد دەهـێنێ و دەیـەوێ بـە خـەڵك بڵـێ کـە سەرەتا موحەممەد ناوی قثم بووە نەك موحەممەد.

وە دەڵێ: "وەرەقەی کوڕی نەوفل کتێبی دەخوێنـدەوەو تـەنها کـەس بـوە کـە ئینجیلی هـەبوە و وەریگێڕاوەتـە سـەر عـەرەبی و ئەسـقوفی مەککـەو دەوروبـەری بوە، وە بەهێزترین کەس بوە کە یارمەتی محەممەدی داوە لە بانگەوازەکەیدا و لـە داڕێژانەوەی عەقیدەی محمددا هـەر لـەو کاتـەوەی کـە لاوێکبـووە (نـەوفل) یەکـەم کەس بوە هەواڵی پێداوە کە دەبێتە پێغەمبەر وە (نەوفل) خۆیشی پێغەمبەر بوە"

نازانم دکتۆری لێکۆڵـەر نـاوی (قـثم)ی چـۆن دۆزیـەوەو لـە کـوێی هێنـا.؟!، ئـەم ناوەی لە سەرچاوە ئیسلامیەکانەوە چنگ نەکەوتووە دەنا جارێك ناوی دەبرد، ئەو لە باسێکی ڕۆژهەلاتناسێك دەستی کەوتووە کـە ئـەویش لـە ڕۆژنامەیـەکی ئـەڵمانی سەرەتای سـەدەی نـۆزدەی چـنگ کـەوتووە، هەرچـەند نـەیتوانیوە هـەمووی مانـا بکات، لێی تێکچـووە لـە هێنانـەوەی ئایەتەکـەی سـورەی الصـف و لـە پەیوەنـدی نێوان ناوی محمد و قثم دا، کابرای ڕۆژهەلاتناس مەبەستی بـوە بڵـێ پێشـتر محمـد ناوی قثم بوە، بەلام کە ئایـەتی ٦ی سورەی الصـف هاتـە خـوارو فـەرمووی: ئـەو پێغەمبەرەی دوای عیسا دێت ناوی ئەحمەدە، خێرا قثم ناوی خۆی گۆڕی بە محمـد هەتا لە گەڵ وشەی ئەحمەدی ئایەتەکە بگـونجێ، یـان موسـوڵمانەکان لـە مەدینـە ناوەکـەیان گـۆڕی بـە محەممـەدو وازیـان لـە نـاوە کۆنەکـەی هێنـا، یـان نووسـەرە ئیسلامیەکان دوای وەفاتی پێغەمبەر ئەو ناوەیان لە کتێبە ئیسلامیەکاندا بۆ کـردە

محەممەد، هەتا لە گەڵ ئەو ئایەتەی ئینجیل بگونجیّ و وازیان لە ناوە کۆنەکەی (قثم) هێنا.

دکتۆر جەمال لەم بەشەدا چەندجار وشەی (قثم) دەهێنیّ، چونکە خۆی دەزانیّ کە قثم وشەیەکی شازو نەبیستراوە، هەر بۆیە بەردەوام لەپاڵیدا ناوی (موحەممەد) لە بازنەیەکدا دەهێنیّ، هەتا لای خوێنەر روونبیّ کە گوایە قثم ناوی موحەممەدە، ئەمە ئەوپەڕی داماویە بۆ لێکۆڵەرێکی ناودار کە ئەم خاڵە لاوازەی خۆی دەدات بەدەستەوە، دەڵیّ ئەی کوردینە، ئەی خەڵکینە، من دەزانم کە ئێوە کەسێك ناناسن بەناوی قثم، بەتایبەت کە من نیازمە بڵێم مەبەستم لەوناوە محەمەدە، هەرچەند دەزانم کەس بڕوا ناکات، بەلاّم ئەوە کارێکی خۆمەو ئیشم پێیەتی.

بەلاّم ئەوە کارێکی پوچەو کەس ناجوڵێنیّ !

أ ـ بۆ ناوی قثم زۆر مونجید و فەهرەست و فەرهەنگ گەڕام، وشەی قثم ئەم مانایانەی هەیە:

* قثم ـ قثماً الشئ، واتە شتێکی رەشکرد، یان لَطَخَهُ بالجَعر وهو نجو الأسد، واتە بە شیاکە و پیسایی شێر رەشی کرد و داپۆشی.

*قَثِم ـ و قُثُمَ ـ تلطخ بالجعر. أُنى الضعان سميت بذلك لتلطخها بَجعرها: واتە کەمتیار خۆی هەڵدەکێشیّ لە پیسایی خۆی.

* قَثَمَ قثماً المال: واتە ماڵی زۆری کۆکردەوە: أتخذه کثیراً و احترفه وـ الشئ: أستأصلهُ (لە بن دەریهێنا).

*القاثم ـ المعط: بەخشەر، القُثُم: الاسخياء، القَثُم: المعطاء والقَثُومَ: الجموع للخير أو للشرّ.

* قَثَمَ: ابطأ فيه : کەمتەرخەمیی کرد.

* قَثُمَ: أغبر: تەپوتۆزاوی کرد. إقتَثَمَ الرجل: ذَلَّلهُ: سوکی کرد[1] .

* قثم أسود: رەش بوو، رەشداگەڕا، قثم: تەپوتۆز، خۆڵە پەتانیّ ـ تاریکی لێڵ[1] .

---

[1] المنجد في اللغة ـ ط٢٦، ص٦٠٩.

* القثم : الكامل : واتە تەواو، نان بدە، دەست بلاو، پڕ لە خێر[2] .

ب ـ ئیبن عودەی فەرموودەیەکی لاوازی هێناوە کە لە صەحیحەکاندا بە لاوازو دروستکراو ناو براوەو سەنەدەکەی ناچێتەوە سەر پێغەمبەر بەم جۆرە: ئیبن عودەی لێیانەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر فەرمویەتی من لای خوا دە ناوم هەیە، (من محەممەدم، من ئەحمەدم، من ماحیم، کە خوا بە من کوفری لە ناو بردوە، من عاقیبم، کە دوای من پێغەمبەری تر نایەت، من حاشیرم، کە مرۆڤەکان هەموو لای من لە بەردەمی مندا حەشر دەکرێن، من پێغەمبەری ڕەحمەتم، من پێغەمبەری تەوبەم، من پێغەمبەری مەلحەمەم، من مەقفیم، پێغەمبەرەکان لەبەردەمی مندا دەوەسێنرێن، من قثمم، واتە تەواو[3] .

سەنەدی ئەم فەرمودەیە ئەبو بەحتەریە، بەحتەری وەهبی کوڕی وەهبە کە تاوانبارە بەوەی شتی بێبناغەو بێسەنەدی زۆر لە باسەکانیدا هەیە[4] .

گەر تێبینی بکەیت لە دەقی ئەم فەرمودەیەدا دەڵێ (لێیانەوە دەگێڕێتەوە)، ئەمە چەند نهێنی تیایە، یەکەم: کێ دەیگێڕێتەوە.؟، دووم: لە چ کەسێکەوە دەیگێڕێتەوە.؟، لەبەر ئەوەی سەنەدەکەی دیار نیەو ناچێتەوە سەر پێغەمبەر، ئەمانە فەرمودەکە لاواز دەکات، سێهەم: ئەبوبەحتەری بە ناوبانگە بە کۆکردنەوەی فەرمودەی لاوازو بێبناغە، هەر بۆیە زانایان سیقە نادەنە ئەبوبەحتەری و باوەڕیان پێی نیە، هەرکات شتێکی لێباسبکەن، لە کۆتاییدا دەنوسن یان دەڵێن (ئەو تاوانبارە) واتە تاوانبارە بەوەی سەنەدی نەهێناوە بۆ باسەکانی.

---

[1] فەرهەنگی شیرین ـ فاضل نظام الدین ، لا ٥٦٩ کوردی عەرەبی، چاپی چوارەم، سلێمانی، ٢٠٠٤.

[2] سبل الهدى والرشاد فی سیرة خیر العباد. تالیف الامام محمد بن یوسف الشامی. ج١، ص٤٠٤

٣ هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

[4] بۆ ئەم باسە سەیری الکامل فی التاریخ، ج٧ ص٦٤ و الدلائل، ابو نعیم، ج١ص١٢. سبل الهدى والرشاد فی سیرة خیر العباد. تالیف الامام محمد بن یوسف الشامی. ج١، ص٤٠٤.

له گێڕانەوەیەکی تردا هاتوە: ئیبن ئیسحاقی حەربی دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر فەرمویەتی: مەلائیکەیەك هاتە لام وتی: (انت قثم و خلقك قيم ونفسك مطمئنة)[1] واتە تۆ دەستبلاّوو نانبدەیت، یان تۆ خێری زۆرت تیا کۆبوەتەوە، ڕەوشت و خووت تەواوو ڕێك و پارێزراوە، دەرون و ناخت دامەزراوەو هێمن و ئارامە.

فەرمودەی ڕاست و دروست لە سەر ناوەکانی پێغەمبەر زۆرو زەبەندەیە، چەند کتێب گەڕام کە لە ناو ناوە صەحیحەکاندا وشەی قثم بدۆزمەوە نەبوو. ! کەواتە ئەم ناوە ناچێتە ناو ناوەکانی پێغەمبەر، ئەو فەرمودانە لاوازو بێبناعەن، لە (صحاح الستە)دا نیە، موسلیم و بوخاری و ئیمام ئەحمەدو ئەوانی تر نەیانگێڕاوەتەوە، لەو بەشەدایە کە کاری پیناکرێ و لاوازن و بیخاوەنن.. ! !

ج= لە کتێبەکانی (أسد الغابة) و (الأستيعاب) و (الذهبي)دا گەڕام بۆ ناوی قثم هەتا بزانم لە ناو سەحابەکاندا کەسێك هەبووە بەو ناوە، لە ئەنجامدا یەك کەسم بینی کە ناوی قثم کوڕی عەبدولموتەلیب کوڕی هاشم، کە کوڕی مامی پێغەمبەر بووەو برای فەزڵ و عەبدوڵلاو عەبدوڕڕەحمان و کەسیرە بووە، ئەویش یەکێکە لە سەحابەکان، لە سەردەمی موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیاندا لە سەمەرقەند مردوە[2].

لە جەنگی حونەیندا کەس لەگەڵ پێغەمبەر نەمایەوە جگە عەباس و دوو کوڕەکەی عەبدوڵلا و قثم[3].

ئەوانەی پێغەمبەریان شۆرد دوای وەفاتی، لە خزمە نزیکەکانی بوون، عەلی و عەباس و دوو کوڕەکەی فەزڵ و قثم[4].

---

1 (سبل الهدى والرشاد فى سيرة خير العباد. تاليف الامام محمد بن يوسف الصالحى الشامى. متوفى ٩٤٢، ج١، ص ٤٩٧، ط٢، ٢٠٠٧ دار الكتب العلمية .بيروت.

2 (وفيات ٦٤٩٩/٣٠٤ ) (سير اعلام النبلا - الأمام ابي عبدالله محمد بن احمد الذهبي - توفي سنة ٧٤٨ك، ج٢ ص ٥١١٤ و ص٧٣٧، دار المعرفة، بيروت، ط١ ٢٠٠٧).

3 حول اعادة التأريخ الأسلامي، د.عمادالدين خليل، ص٤٩، دار الثقافة

4 حياة محمد - محمد حسنين هيكل - ص٥١١، ط١٣، مكتبة النهضة العربية - القاهرة - ١٩٦٨.

ئیبن ئیسحاق دەڵێ: ئەوانەی پێغەمبەریان شۆردو ئەسپەردەیان کرد عەلی و فەزڵ و عەباس و قثم کوڕی عەباس بوو[1].

ئەوانەی لە پێغەمبەر دەچوون لە شێوە و هەڵسوکەوتدا ئەمانە بوون: جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب ئامۆزای پێغەمبەر، - پێغەمبەر دەیفەرموو: جەعفەر وەك من وایە لە رەوشت و شێوەدا. هەروەها حەسەنی کوڕی عەلی لە پێغەمبەر دەچوو، فاتیمە دەیفەرموو: حەسەن وەك باوکمە، لە باوکم دەچێت و لە عەلی ناچێت، ئەبوبەکری صدیق لە رێگەکانی مەدینە دەیبینی دەیوت: حەسەن لە پێغەمبەر دەچێ و شێوەی لە عەلی ناچێت، قثم کوڕی عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب کە ئامۆزای پێغەمبەر بوو لە شێوەدا زۆر لە پێغەمبەر چووە، ئەبو سوفیان کوڕی حارسی کوڕی عەبدولموتەلیب کە ئامۆزای پێغەمبەر بووە، ئەسهەدی کوڕی عروە، هاشمی کوڕی عەبدولموتەلیب کوڕی عەبدولمەناف، مسلمی کوڕی ئەبی لەهەبی ئامۆزای[2] وە سائیب کوڕی عەبد یەزید کە لە بەدردا ئەسیرکرا ئیمامی شافعی کوڕی محمد کوڕی ئیدریس کوڕی عەباس کوڕی عوسمان کوڕی شافیع کوڕی سائیبە[3]. ئەوانەی شۆردیان عەلی و عەباس و فەزڵ و قثم کوڕی عەباس بوون[4]. ئەوەی سەرپەرشتی شۆردنەکەی دەکرد عەلی و عەباس و فەزڵ و قثم کوڕەکانی عەباس بوون[5].

---

[1] السيرة النبوية - ابن هشام - ج٤، ص٣٢١، مطبعة المصطفى، مصر ١٩٥٥.

[2] تأريخ اليعقوبي - احمد يعقوب بن جعفر بن وهب المعروف باليعقوبي - تحقيق عبدالايد مهنا - ج١، ص٤٤٨ - مؤسسة الاعلمي للمطبوعات - بيروت ١٩٩٣.

٣(تاريخ ابن خلدون، عبدالرحمن ابن خلدون، ج٢ ص٣٩٣ دار الفكر، ٢٠٠٢م، بيروت)

[4] تأريخ ابن الوردي - زين الدين عمر بن مظفر الشهيد بابن الوردي، ج١، ص١٣٠ - دار المكتبة العلمية - بيروت - ١٩٩٦.

[5] تأريخ ابي الفدا ء - الملك المؤيد عمادالدين ابي الفدا ء شاهنشاه بن ايوب - ج١، ص٢١٥ بيروت، دار الكتب العلمية ط١، ١٩٩٧.

زەهەبی دەڵێ: قثم برای فەزڵ و عەبدوڵڵا و عوبەیدوڵڵا و کەسیر بوو، دایکیان ئوم فەزڵ حەباب کچی حارسی هیلالیە کە دووەم ئافرەتە موسڵمان بووە لە مەککە دوای خەدیجە، وەك کەلبی دەڵێ قثم هاوڕێیەتی پێغەمبەری کردووە، سواری گوێدرێژەکەی کردووە لە پشتەوەو، برای حسەین کوڕی عەلییە لە شیرەوە، لە پێغەمبەر دەچوو، عەلی کە بووە خەلیفە، قثمی کردە والی مەککە و پاشتر مەدینە، هەتا مردنی عەلی مایەوە، منداڵی لە دوا جێنەما، لە غەزای خۆراسان بەشداربوو، کە سەعیدی کوڕی عوسمانی کوڕی عەفان والی بوو، لە سەردەمی موعاویەدا لەگەڵ سەعیدی کوڕی عوسمان چوون بۆ سەمەرقەند، لەوێ شەهید بوو، گۆڕەکەی هەر لە سەمەرقەندە [1] .

ئیبن حەجەر دەڵێ: لە پێغەمبەر دەچوو، دوا کەسی دوای پێغەمبەر بوو، ئوم فەزڵ بە پێغەمبەری وت: لە خەودا دیم وەکو لە ماڵی مندا یەکێك لە پشت و ڕەگی تۆ و پارچەیەك لە تۆ هەبێت، فەرمووی خێر دەبێت و خێرت بینیووە، فاتیمە منداڵێکی دەبێت تۆ لە شیری قثمی کوڕت بەشی دەدەیت [2] ، پاشان حەسەن لە دایك بوو.. ئەم فەرموودە ئەوە دەردەخات کە حەسەن لە قثم بچووکتر بوو، عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر کوڕی ئەبو تالیب وتی: گەر من و قثم کوڕی عەباس و عوبەیدوڵڵای کوڕی عەباست بدیایە کە یاریمان دەکرد پێغەمبەر بە سواری وڵاخەکەی هات بەلاماندا و فەرمووی ئەوەم بۆ بەرزبکەنەوە، منی خستە بەردەمی، پاشان بە قثمی وت ئەوەشم بۆ بەرزبکەنەوە، خستیە پشتی، بەڵام عوبەیدوڵڵا کە خۆشەویستتر بوو لای عەباس، شەرمی نەکرد لە مامەی کە قثمی هەڵگرت و وازی لەو هێنا [3] . ئیبن ئەسیر دەڵێ: "بە قثمیان وت چۆن عەلی بووە وارسی پێغەمبەر

---

[1] سیر اعلام النبلا ء ـ الامام شمس الدين محمد الـذهبي تـوف ٧٤٨ ه ـ ١٣٧٤ز، طبـع بأشـراف ابـن محمود شاكر ـ دار احيا ء التراث العربي ـ بيروت ٢٠٠٦، ط١، ص٣٢٩، ج٣، تسلسل٣٠٤).

[2] اخرجه ابن ماجه . اخرجه الامام احمد مسنده ج١، ص٢٠٦.

[3] الأصابة في تميز الصحابة ـ ابن حجر العسقلاني، ج٣، ص١٦٠٨، دار المعرفة ـ بيروت ٢٠٠٤.

پێش ئێوه؟ وتی: چونکه ئەو پێش ئێمه پەیوەندیی به پێغەمبەرەوه کردووه و لـه ئێمه توندتر پێوەی نووسابوو"[1]. یان وتی: ئەوه چییه عـەلی لای پێغەمبـەر جێـی دیاری هەیه که عەباس نیەتی..؟ قثم ئەو وەڵامەی دایەوه.

هەواڵیان دایه عەبدوڵلای کوڕی عەباس که قثمـی بـرای شـەهید بـووه، گەڕایـەوەو دوو ركات نوێژی کردو نارەحەت بوو، ئـارامی گـرت و ئایـەتی (وَاسْتَعِينُواْ بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلاَّ عَلَى الْخَاشِعِينَ)ی خوێندەوه[2].

بەم جۆره دکتۆر دەیەوێ بڵێ پێغەمبەر موحەممەد ناوی قـثم بـووه، ئایـا ئـەم بۆچـوونەی دکتـۆر جـەمال دوای لێکۆڵینـەوەی جـددی بـووه کـه خـۆی هەمیشـه بانگەشەی بۆ دەکات و، بـەناوکرۆکی سەرچـاوه ئیسـلامییه کۆنەکانـدا ڕۆچـووه و ئەوەی بـۆ دەرکـەوتووه..؟، یـان ئـەم وەك هەمیشـه و بـه بـەردەوامی نووسـراوی ڕۆژهەڵاتناسانی هێناوەو بەناوی خۆیەوەو هەندێ جار بەهەڵـه بـه زمـانی کـوردی و عەرەبی دایڕشتوەتەوه هەتا لای کوردی ساده دەربیخات، لێکۆڵـەر و توێـژەر هـەر خۆیەتی، کەس نییه شان له شانی بدات، بەڵام دوای گەڕانێکی زۆر بـۆم دەرکـەوت که دکتۆر جەمال ئەم زانیاریه هەڵانەی له ڕۆژهەڵاتناسانەوه وەرگرتـووه، بـه نـاوی خۆیەوه دایڕشتوەو به هیچ کلۆجێ ناوی سەرچاوەکەشی نەهێناوه، ئەو هیچ خـۆی ماندوو نەکردووه، هەرچی لەسەر ئیسلام و پێغەمبەرو قورئانەوه به خراپ وتـراوه، له نووسراوه ئامادەکراوه ئەڵمانی و ئەورووپیەکان وەریگێڕاون و له کتێبەکانیـدا بـه ناوی مێژووی کوردەوه به جۆرەها قسه لەسەرکردن بڵاویکردوونەتەوه.

لەمەوه بۆمان دەردەکەوێت که له ناو هەموو سەحابەکاندا یەك کەس ناوی قثم بوه ئەویش ئامۆزای پێغەمبەر بـوه، زۆر لـه پێغەمبـەر چـووه لـه شـێوەو لاشـەدا، زۆری ڕۆژهەڵاتناسان که کاری لێکۆڵەر یان مژدەدەریی گاوربیان له ئەسـتۆدا بـوه، لـه کوردسـتان و وڵاتـانی عـەرەبی و ئێـران و تورکیـا کاریـان کـردووه، بـه نـاوی

---

[1] (اخرجه الحاكم في المستدرك ج٤، ص١٢٥)

[2] اسد الغابة في فرقة الصحابة ـ ابن اثير ج٣، ص٤٧٧، دار المعرفة بيروت ٢٠٠٧.

توێژینەوە و لێکۆڵینەوە لەسەر مێژووی کۆمەڵگاکانی ئیسلامی ناوچەکە دەیان نووسی، بە چاوی رەخنە و سوکایەتی بە کۆمەڵگەو ئایینیان دەستیان پێدەکرد و کۆتاییان پێدەهێنا، هەرچەند لە ناو رۆژهەڵاتناسانیشدا کەسانی بە تواناو راستگۆ هەبوون، هەرچی دەدی لە باش و خراپ، زانستیانەو دوور لە هەر هەستێکی ئایین و رەگەزپەرستیی کاری خۆی دەکرد، بەڵام ژمارەیەکی زۆریش هەبوون تەنها کاریان رەخنەگرتن و سووکایەتی بە ئیسلام و پێغەمبەرەکەی بووە، وەك(ڤیل) و (جولد زهر) و (نولدکی)، بۆ ئەوەی بڵاوی بکەنەوە کە قورئان دانراوو دەستکاری کراوو چێنراوی دەستی موحەممەد خۆیەتی، دەڵێن: "هەندێ بەڵگەنامەی مێژوویی (واتە قورئان) دوای وەفاتی پێغەمبەر دەستکاریکراوە و گونجێنراوە لەگەڵ باس و خواسەکانی تردا". یان دەڵێن وەرەقەی کوڕی نەوفل پێغەمبەر بووە، ئەو یارمەتی پێغەمبەری داوە لە داڕشتنی قورئانداو عەقیدەی بۆ داڕشت و فێری یەکتاپەرستی کرد، وەك باسمکرد دکتۆر جەمال ئەم هەواڵانەی لەوانەوە هێناوە، یەکێك لەوانە ناوی موحەممەدە، کە بە درۆ دەڵێن ناوی (قُثم)، یان (قـتم)، یان (قُثامە) بووەو پاشان گۆڕییان و کردیان بە موحەممەد، هەتا لەگەڵ ئایەتی (وَمُبَشِّراً بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ) دا بگونجێت، کە نیشانەیە بۆ ئەو ئایەتەی ئینجیل کە باس لە پێغەمبەری دوای عیسا دەکات، ئەو رۆژهەڵاتناسانە ئەم باسانەیان لە گۆڤاری (رۆژهەڵاتناسە ئەڵمانییەکان)دا بە چەند لێکۆڵینەوەیەك بڵاوکردەوە[1].

ئەم وتانە دیارە لە هەواو بۆشەوە هاتووە، هیچ بەڵگە و سەنەدێکی مێژوویی نییە، بەڵکو ئەوان لە لایەکی ترەوە دەڵێن ئەم ئایەتە دوای وەفاتی پێغەمبەر بۆ قورئان زیادکراوە، هەتا دەلیلی پێغەمبەرایەتییەکەی موحەممەد بچەسپێ و، لەگەڵ نامە ئاسمانییەکانی پێش خۆیدا بگونجێ و یەکبگرێتەوە، کە پێش قورئان دابەزیون و پیرۆزی بکەن، لەولاشەوە دەیانەوێت بڵێن کە قورئان دەستکاری کراوە، وەك چۆن هەر خۆیان دەڵێن ئینجیل و تەوراتیش دەستکاری کراوە،

---

[1] (حياة محمد ـ ص٢٧)

مەبەستیان لەم وتانە: یەکەم: گومان دروستکردنە بۆ موسڵمانان، دووەم: هەندێکیان دەیانەوێ کۆنی و سەرەکی و پیرۆزیی بۆ تەورات و ئینجیل دروستبکەن و لە قورئان دایبڕن، کەمێك لە رۆژهەڵاتناسان ئەو رایە خراپانەیان هەیە، دەنا زۆر هەیە رایان وایە کە قورئانیش تەواوکەری تەورات و ئینجیلەو، هەر ئەو قورئانەیە کە بۆ موحەممەد هاتووە بێ کەم و زیاد، ئەو وتانە کاریگەریی چاکی لەسەر ئەورووپییەکان و رۆژهەڵاتناسانی تر و لێکۆڵەرەوە ئەورووپییەکان دروستکرد، لەو گۆڤارە ئەڵمانیەدا گومان و زانیاری هەڵەی زۆرتر هەیە کە دکتۆر نەیتوانیوە یان نەیزانیوە یان لێیتێنەگەیشتووە بیهێنێ، کە نیشانەیە بۆ دەرخستنی لاوازی زەین و توانای زانستی دکتۆر جەمال، ئەم زانیاریانەم لە وەرگێرانێکی عەرەبی هێناوە کە دکتۆر رێی لێنەکەوتووە بیهێنێ و ترش و خوێی زیاتری بکات و خۆی پێوە هەڵبکێشێ، هەندێکی تر لەو ئەورووپیانە لەو گۆڤارە ئەڵمانیەدا دەیانگوت گوایە موحەممەد صەرع و فێ و پەرکەمی لەگەڵدا بووە و، کەف چەراندووە و لە دەمی هاتووەتە دەر.

ئەگەر موحەممەد ناوی قثم بوایە هەڵبەت یەك مێژوونووسی ئیسلامیی سەردەمی ئەبوبەکر و عومەر و ئەمەوی دەیاننووسی، ئەگەر پەرکەم و کەف چەرانی لەگەڵ بوایە هەڵبەت یەکێك لەوانە بە ناتەواو و شێت باسیان دەکرد، بەڵام دەیان هەزار سەرچاوەی کۆن و نوێی ئیسلامیی و نائیسلامی باس لە پێغەمبەری و دانایی و زانایی و بەرزی زەین و هەست و سۆزو رەوشتی موحەممەد دەکەن، سەدان هەزار فەرموودەی جوانیان لێ گێڕاوەتەوە، سەدان هەزار کەس خۆیان لەسەر سەنەدو حیکمەت و وتە و بڕوا و قسەکانی ئەو قوربانی کردووە، سەدان ملیۆن خۆیان پێپەروەردە کردوە، چەندین شارستانی لەسەر ئەوە دروست بووە، هیچ سەرچاوەیەك نییە پشتی ئەوان بگرێ. ئەم وتانە لەوەوە دەهێنن کە صەحابەکان دەگێڕنەوە دەڵێن کە موحەممەد وەحی بۆ دەهات باری قورس دەبوو، رەنگی سورهەڵدەگەڕا و، جاری وا هەبوو لە کاتی سەرماشدا عارەقی دەردەدا، ئەوە هی قورسی دابەزینی وەحی بوو، (قولاً ثَقیلاً) وەك خوا دەفەرمووێ، پێغەمبەر خۆی لە

چەندین فەرمووده‌دا باس لـە وەحـی و جوبرەئیـل و قورسـیی وەحـی و ئـەو بـارە سەنگینە کردووە، ڕۆژهەڵاتناسەکان ئەوە بە هـەڵ دەگـرن و دەیشـێوێنن و دەڵـێن ئەوە پەرکەم و صەرعە، هەمیشە ڕۆژهەڵاتناسان و دوژمنانی وەك دکتۆر جەمال لە دوی ئەم وتانە دەگەڕێن، تێکی دەدەن و گومان دروستدەکەن، بەڵام وتەی مرۆڤێك کە پەرکەم و صەرعی بەسەر بێت، ورێنەو وتەی پچڕ پچڕو بێمانای لێدەردەچـێ و، زۆریشـی لـەبیر دەچـێتەوە، بـەڵام پێغەمبـەری خـوا هـەموو وتـەکانی فـەرموودە و حیکمەت و پڕ مانا و مەبەست بوون، هیچی لە بیر نەدەچوو، هەموو وتەکانی خۆی و وەحیەکانیش کە قورئانە، بێ کەم و زیـاد مـاون، بوونەتـە بەرنامـە و پرۆگـرام و ڕێڕەوی ژیانی ملیۆنەها موسڵمان، ڕەزامەندی هەزاران زاناو پسپۆری لەسـەرە، لـە مانا و بەرزی و بەلاغە و حیکمەتیشدا لە سەروو وتەی هـەموو کەسێکی ترەوەیـە، هەتا زانست بەرەو پێش بڕوات، تـەواوی و پـڕ مانـایی و زانسـت و بەلاغـەتی زیـاتر ڕوون و ئاشکرا دەبێت.

ئەوان هەر لە خۆوە دەڵێن موحەممەد پێشتر ناوی قـثم بـووە، بـەڵکو ئـەوان هـەر مەبەستیان گومان دروستکردنە بۆ موسڵمانان و هیچی تر، بۆ ئەوان بە هـەر حـاڵ، بـەڵام دکتـۆر جـەمالێکی بـە نـاو دکتـۆر و توێـژەر و شـارەزا لـە وردەکارییـەکانی مێـژوودا، لەولاشـەوە موسـڵمانە و قسـە بـۆ کۆمەڵگـەی ئیسـلامی دەکـات، چـۆن وتەیـەکی وا بـێ سەرچـاوە لـە دەمـی ڕۆژهەڵاتناسـانەوە دەگوازێتـەوە و دەیفرۆشێتەوە بە کۆمەڵگەی موسڵمانی کوردیی، بێئەوەی هیچ سـوود و قازانجێـك لـەو زانیـاری گواسـتنەوەدا هـەبێ، جگـە گومـان دروسـتکردن و بوختـانکردن و دەستێوەردانی مێژوو، گومان دەبەم کە دکتـۆر جـەمال ویسـتوویەتی وا دابـنێ کـە شان لە شانی ڕۆژهەڵاتناسان دەدات، بەمەرجێ ئەم لـە زۆر ڕووەوە لـەوان وردتـرە لە دەرهێنـانی ماناکـانی مێـژوودا، ئەگـەر کـاری خـۆی وا تێکـەڵ نەکردایە، لـەوان بەتواناتربوو، ئەگەر ڕەخنەی لە کاری نەشیاوی ئەوانیش دەرحەق بە مێژووی کورد بگرتایە، دیارە دکتۆر جەمال زانیویەتی کاتێك دەگاتە ئاستی ئەوان و دەبێتە جێی ڕەزامەندیی باباکان و وەك ئەوانی لێدێ، کە وەك ئـەوان بکـات و بڵـێ، هـەر، بۆیـە

دەیـەوێت وابکـات، هەنـدێ جـار دەیـەوێ لـەوان زیـاتر بڵـێ و ڕۆبچـێت و ئـەوان تێپەڕێنێت، لە گومان دروسـتکردن و سـوکایەتیکردن و بوختـان و درۆنانەوەشـدا، ئیتر با باسەکانیشی لە هەندێ ڕووەوە زانستییانە نەبێت، لەوانەیە بـیروڕای دکتـۆر جەمال خۆیشی وابێت، ئیسلام و موحەممەد بە بەڵا و موصیبەت بەسـەر کـوردەوە بزانێ و بیەوێ و بگەڕێ، هەرچی چڵك و چەوێڵی خەڵکانی تـرە، هەرچـی گومـان و بوختـان و خراپــە و دەسـتێوەردانە بەرامبــەر ئیسـلام و محەممــەد، کۆیبکاتــەوە، موسڵمانان و مێژووی ئیسلامیی پـێ ناشیرین بکـات، بـە کـوردی بفرۆشـێتەوە هـەتا کورد دەستبەرداری ئاینەکەیان ببن، بـەڵام ئـەوە هـەوڵێکی بـێ هـودە و نەزۆکـە، پێش ئەوان چەندانی تر وتیان و چوونە سوچێکی خراپی مێژوو، دوای ئەمیش ئـەو کارە هـەر بـەردەوام دەبـێ، هـەتا ژیـان لەسـەر زەویدابێت و، هێـزی خـوا و خێـر لەبەرەیەکدابن و، شەیتان و شەڕیش لە بەرەی بەرامبەردا.

دیارە دکتۆر جەمال لەم هەوڵ و بۆچوونەیدا ویستوویەتی شتێك بڵـێ لای کـورد نامۆبێ، بە کوردی کەس نەیوتبێ، هەر، بۆیە دێت و دەڵێ: "موحەممەد نـاوی قـثم بووە و موحەممەد بە زۆڵی لە دایك بووە و بـاوکی نـاوی عەبـدوڵڵا نـەبووە و نـاوی عەبدوللات بووە"، شتی تری لەو جۆرە، ئەم قسانە هیچ کەس تـا ئێسـتا بـۆ کـورد نەیوتووە، بـەڵکو لای عـەرەب و فـارس و تـورکیش نەبیسـتراوە وترابێـت، چـونکە نووسەرانی عەرەب و تورك و فارس دەزانن کە کەس بڕوا ناکات درۆو هەڵـەی وا زل لـە ژیـانی پێغەمبـەر موحەممـەدی سـەروەرماندا هـەبێت، دکتـۆر جـەمال لـەو هەڵبژاردنەیدا شکستی خوارد، وردنەبوو لە هەڵبژاردنەکەیداو نـەیپێکا، بـە سـەریدا شکایەوە، نەیتوانی بگاتە ئەوپەڕی ئاواتەکانی، نەیتوانی مەبەستەکانی بێنێتە دی، داوەکـەی هیچـی بـۆ نـەگرت، پـێم سـەیرە، ئەمانـە هـەرگیز نـاتوانن بگەنـە ئاسـت نووسەرانی خەڵك، کەسێکی وەك (موحەممـەد حسـنین هیکـل) کـە مێـژوونووس و بیریار و لێکۆڵەرێکی ناوداری نەتەوەی عەرەبـە، بـەرگری لـە ئـازادیی رادەربـڕین و مافی مرۆڤ و دیموکراسی دەکات، ئـەو بەراسـتی دڵسـۆزی گەلەکەیـەتی، ئـەو نایـەت لاسایی ڕۆژهەڵاتناسان بکاتەوە و قسە بە دینی گەلەکـەی بڵـێ، ئـەو دەزانـێ تـازە

ئاین بووەتە بەشێکی هەرە گرنگ و سەرەکی بیرورای نەتەوەی عەرەب و لەو روانگەوە دەجولێن و بیردەکەنەوە، دەزانێ بنەمای رەوشتی گەلی عەرەبی لەسەر ئیسلام دامەزراوە کە هەستێکی پرزانست و ئازادەو دەرون دادەمەزرێنێ و بروا بە خۆ دروستدەکات، هانی دەدات مل کەچی داوای داگیرکەران نەبێت، لەبەر ئەوە بۆ بەرگری لە ئایینی نەتەوەکەی دێت کاری رۆژهەلاتناسان هەڵدەسەنگێنێ، زۆر خراپ بە رووی ئەوانەدا دەچێتەوە و تاوانباریان دەکات کە قسە بە پێغەمبەر و قورئان و ئیسلام و نەتەوەکەی دەڵێن، زۆر دڵسۆزانە و راستگۆیانە بەرگرییان لێدەکات، ئەم نموونە بەرگرییە لە لێکۆڵەرە عەبەرەکان و فارسەکان و تورکەکاندا زۆرەو بە زەقی دیارە، بەلام بە داخەوە وەك لە سیاسەتمەدارانی کورددا کەسی جددیی و دڵسۆز و راستگۆ بەرامبەر بە خاك و گەل و نیشتمان نابینریێ، هەموو لە رازیکردنی خواستی دوژمنانی کورددان، ئامادەن هەموو کاتێك سازش بۆ دوژمن بکەن، ئەگەر لەسەر وەلانانی بەرژەوەندی گەلەکەشیان بێت، هەروەها لە ناو توێژەران و لێکۆڵەران و نووسەرە بەرزەکانی جیهاندا ئەمە نابینریێ، کە نوسەرە بەرزەکانی کورد بیری لێدەکەنەوەو بۆی دەچن، ئەمانەی لای خۆمان ئامادەن هەتا سەر ئێسقان دژایەتی ئایینی گەلەکەیان بکەن، هەموو گومانێکی خەڵکی بۆ کورد بگوازنەوە، ئیتر چەندە زەرەر لە ئاین و بنەماو رەوشتی گەلەکەیان بدەن بەلایانەوە هیچە. ! لەم دواییەدا هەندێ توێژەرو بیریارو ئەدیبی کورد، وەك کەمال مەزهەرو بەختیار عەلی و مەریوان و رێبین و فەرهاد شاکەلی و خەڵکیتر دەرکەوتن، بابەتەکان وەك خۆی باس دەکەن و هەڵدەسەنگێنن، راستگۆیی بە نوسینەکانیانەوە دیارە.

بەلام کەسێکی وەك دکتۆر جەمال بێ گوێدانە هەستی ئایینی گەلەکەی، وەسف و سەنای خەڵکی دەکات، بەرامبەر ئاین و پێغەمبەری نەتەوەکەی خراپ دەوەستێتەوە، سووکایەتییان پێدەکات، رستە خراپەکانی رۆژهەلاتناسان و خەڵکی تر دەگوازێتەوە، کە رەنگە هەندێك لەئەوان لە کاتی توێژینەوەدا بە دوای راستی و حەقیقەتدا گەرابن و سەریان بەو باس و خواسانەدا تەقیبێت، ئەویش

لەبەر کەمی سەرچاوە، یان رەنگە وەرگێرە نەشارەزاکان خراپیان وەرگێرابێ، یان بە هەڵە حاڵی بوبن، بەلام مەخابن لێکۆڵەرێکی بەتوانای وەك دکتۆر جەمال دەچێت کتومت وەك کەسێکی نابینا و نەشارەزا و بێ هەست و سۆز، ئەوان چییان وتووە، بێ گوێدانە هەست و سۆزی ئایینیی نەتەوەکەی دەیانگوازێتەوە، ناوی سەرچاوەکە نالێ، هەتا هەندێ گومان لەسەر خۆی برەوێنێتەوە، بەڵکو بە ناوی خۆیەوە دەینووسێ، لە بۆشاییەکدا یاری پێدەکات و کاراکانی فرێی دەدات، کە رەنگە مینۆرسکی ئەم جۆرە کەسانەی لە کورددا دیبێ، هەربۆیە بە ئاشکرا دەڵێ "بڕوای کورد جێی سیقە و بڕوا نییە".

## م- نازناوی پێغەمبەر ﷺ ئەباقاسم بووە

پێم سەیرە نوسەرێکی تر بەناوی رەشید رەزا زنجیرەیەك ژیاننامەی لەسەر پێغەمبەرو چوار خەلیفەکە نوسیووە، ئەویش تێبینی زۆری لەسەرە، لە هەڵەیەکیدا کە لەو فەرمودە لاوازەی وەرگرتووە دەڵێ: (...بەلام عەبدوڵڵا ئەو باوکی پێغەمبەری خوایە کە کونیە و نازناوەکەی (باوکی قثم)، یان (باوکی موحەممەد)، یان (باوکی ئەحمەد)ە کە عەبدوڵڵا بچووکترین منداڵەکانی عەبدولموتەلیبە)[1].

نازانم ئەم نوسەرە، ئەم بۆچونە هەڵە بێ بیرکردنەوەیەی چۆن بۆ هات و، چۆن ئەم نازناوانەی بۆ عەبدوڵڵا زیادکرد.؟ چونکە عەبدوڵڵا پێش لە دایکبوونی کورەکەی مردووە، خەڵك چوزانێ ئەو کوڕی دەبێ، یان کچ.؟ رەنگە عەبدوڵا هەر نەیشیزانیبێت کە ئامینە دوو گیانە، ئەو مردبوو کە موحەممەد لە دایك بوو، باپیری ناوی نا موحەممەد، عەبدوڵڵا چوزانێ کوڕی دەبێت و دەبێتە پێغەمبەرو لە تەوراتدا ناوی ئەحمەدەو پاشتر ناو دەنرێ محەممەد.؟ یان خەڵکی مەککە چوزانن ژنەکەی عەبدوڵا دوگیانەو سبەی کوڕی دەبێ و دەبێتە پێغەمبەرو پاش پەنجا ساڵی تر ئایەتی بۆ دێت و دەڵێ کە لە تەوراتدا ناوی ئەحمەد بووە.؟ هەتا خەڵکی نازناوی باوکی ئەحمەد بدەنە پاڵ عەبدولا.! ئەم رستانە سەد ساڵێکە بۆ ژیانی محمد

---

[1] محمد ـ محمد رضا ـ دار الكتاب الحديث ـ ص١٢، القاهرة ٢٠٠٤.

زیادکراوه، چونکه هەتا عەبدوڵڵا لە ژیاندا بووە کوڕی نەبووە ناوی قثم، یان موحەممەد، یان ئەحمەد بوو‌بێ، ئیتر کەی و کێ و چۆن و لە کوێدا بە عەبدوڵڵا دەوترا باوکی قثم و باوکی موحەممەد، یان باوکی ئەحمەد.؟ دوای ئەوە دکتۆری ناپەسەند، خاوەنی ئەو دێرو سەرچاوەیە، هیچ پەراوێزێك و سەرچاوەیەکی نەهێناوە ئەو زانیارییەی پێ پشتڕاست بکاتەوە، رەنگە بە عەباس وترابێ باوکی قثم، چونکە ئەو کوڕی بووە لە ژیانیدا بە ناوی قثم.

مەسعودی دەڵێ: کونیە و نازناوی پێغەمبەر (ئەبو قاسم) بووە و بەوە بانگکراوە، ئەمە دوای ئەوەی کە کوڕی بووە ناوی قاسم بووە، ناوەکانی پێغەمبەر بریتی بوون لە (موحەممەد) (ئەحمەد) ، (ماحی) واتە پاککەرەوە و سڕەرەوە، خوا بە هۆی موحەممەدەوە گوناهەکان دەسڕێتەوە و مرۆڤ لە گوناه پاکدەکاتەوە، (عاقب) واتە دواهەمین پێغەمبەر، (حاشر) واتە خوای گەورە بە ئامادەبوونی ئەو حەشری مەردوم دەکات.

پێغەمبەر یەك نازناوی هەیە کە (ئەبوقاسم)ە، قاسم کوڕی پێغەمبەرە، بەوەوە نازناوی هەڵگرتووە، ئەو یەکەم منداڵی سەردەمی ئیسلام بوو لە مەککە مرد، کە مرد حەوت رۆژ بوو، هەندێك دەڵێن دوو ساڵ بوو، بەڵام جوبرەئیل پێغەمبەری بە ئەبو ئیبراهیم ناو بردووە، ئەوەبوو پێغەمبەر بە عومەری فەرموو: جوبرەئیل هات بۆ لام هەواڵی دامێ کە ماریە دوگیانە و کوڕێکی پێیە لە من، لە هەموو کەس زیاتر شێوەی لە من دەچێ، داوای لێکردووم ناوی بنێم ئیبراهیم و بە ئەبو ئیبراهیم نازناوی دامێ، ئەگەر ئەوە نەبوایە کە من حەزنەکەم ئەو نازناوەم بگۆڕم کە پێی ناسراوم واتە (ئەبوقاسم)، ئەوا نازناوی خۆم دەکرد بە ئەبی ئیبراهیم، وەك جوبرەئیل ناوی ناوم[1] .

---

[1] أخرجه الطبراني من المعجم الكبير، ١٤٥. ومجمع الزوائد للهيثمي،ج ٩، ص١٦٢.

عەرەب ئەو کونیە و نازناوو شۆرەتەیان هەبوو لەگەڵ نـاوی خۆیانـدا، زۆرجـار شۆرەت زاڵ بووە بەسەر ناوی تایبەتیدا، وەکو ئـەبی تالیـب و ئـەبی لەهـەب و زۆر ناوی تر، کە ئەوەندەی ئێمە شۆرەتیان دەزانین ناوی تەواویان نازانین.

پێغەمبەر بە ئەبا قاسم شۆرەتی وەرگرتووە، کـە بـە نـاوی قـاسمی کوڕیـەوە کـە کوڕە گەورەی بوو، مێژوونووسان ناجۆرن لـەوەی ئایـا پـێش پێغەمبەرایـەتی مـرد، یان دوای ئەوە، بەڵام ئیبراهیم لە مەدینە لە دایك بوو لە ماریەی قیبتی.

جابر دەڵـێ: پیاوێـك لـە ئێمـە کـوڕێکی بـوو نـاوی نـا قاسـم، پێمـان وت: نازنـاوو شۆرەتت ناکەین بە ئەباقاسم، ئەوەش بۆ تۆ ڕێز نییە، پیاوەکەش هەواڵەکەی دایە پێغەمبەر، ئەویش فەرمووی: کوڕەکەت ناوبنێ عەبدوڕڕەحمان[1]، لـە جێیـەکی تـردا دەڵێن: پێت ناڵێین ئەبا قاسم هەتا دڵت پێـی خـۆش بێـت[2]، پێغەمبـەریش نـاوێکی خۆشـترو پیرۆزتـری پێـووت هـەتا دڵـی پێـی خۆشـتر بێـت و بیگـۆڕێ کـە ئـەویش عەبدوڕڕەحمان بوو.

لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر لە بەقیع بـوو پیاوێـك پیـاوێکی بـە ئـەبا قاسم بانگکرد، پێغەمبەر لای کردەوە، کابرا وتی: ئەی پێغەمبـەری خـوا مەبەسـتم تۆ نەبوو، بەڵکو مەبەستم فڵان کەس بوو، پێغەمبەر فەرمووی: (بە ناوی منەوە ناو بنێن، بەڵام بە نازناوو شۆرەتی منەوە ناو مەنێن)[3]، ئیمـامی نـەوەوی دەفـەرموێ: ئەو شۆرەتی (ئەبا قاسم)ە، هەتا پێغەمبەر لە ژیاندا بوو نەبێ باشە، بەڵام بۆ دوای پێغەمبەر ئاساییەو هیچ تاوانی تیا نییە[4]، ئەمە کێشـەیەکی زۆری لای مەزهەبـەکان و زانایانی فەرموودەو شەریعە دروستکردووە.

## ٦- محەممەد پێغەمبەرﷺ برای نەبووە

دکتۆر جەمال وەك کارەکانی خۆی، بـە دوای گومـان و دروسـتکردنی دوودڵیـدا گەڕاوەو بەشی خۆی پەیداکردووەو دەڵێ: (لەسەر قسەی ئیبن ئیسحاق، هـەروەکو

---

[1] أخرجه البخاري ٦١٨٦. ومسلم ٢١٣٣.

[2] فتح الباري، ج١٠، ص ٥٧١.

[3] مسند الأمام أحمد، ١٢٢١٨.

[4] المقاصد..، ص٨٦.

بورهانەدین حەڵەبی لە کتێبی (السیرة الحلبیة) دا دەڵێ: (موحەممەد نەگەیشتبووە دووساڵان هەتا منداڵێکی تووڕە و ڕکاوی و ڕکگری لێدەرکەوت، حەلیمە ئەم باسەی لەگەڵ ئامینەی کچی وەهەب، دایکی موحەممەددا کرد، ئامینە بە حەلیمەی وت: دەترسی شەیتان دەستی تێخستبێ..؟ وتی: بەڵێ، ئامینە وتی : نەخێر، بە خوا شەیتان ناتوانێ کاری لێ بکات، بە خوا هیچ سکێکم نەبووە هەرگیز هێندەی دووگیانییم بە موحەممەدەوە سوک و ئاسان بێت) پاشان دکتۆر جەمال لەسەر گومان دروستکردنەکانی بەردەوام دەبێت و دەڵێ: (لەم قسەیەی ئامینە ئەوە وەدەردەکەوێت کە موحەممەد برای هەبووە، کە سەرچاوە ئیسلامییەکان هیچیان لەو بارەیەوە نەوتوە، لەوانەیە پێشی پێغەمبەرایەتی ئەو برایانەی مردبن، یان ڕازی نەبوون بڕوا بە موحەممەد بهێنن) [1]، من دەپرسم ئاخۆ دکتۆر جەمال مەبەستی لەم باسە گوماناویانە چییە؟ بڕواناکەم ئامینە هەرگیز وتبێتی لە سکەکانی ترم سوکترو ئاسانتر بووە، چونکە ئەو هەر یەك منداڵی بووە، کە موحەممەد بووە لە سکی دایکیدا بووە کە باوکی مردووە، گەر منداڵی تری هەبوایە نەدەشارایەوە، چونکە ئەمڕۆ بە هۆی موحەممەدەوە مێژوو باس و خواسی عەبدولموتەلیب و کوڕەکانی و کوڕەزاکانی و باپیرانی عەبدولموتەلیب و بنەماڵەکانیانی پاراستووە، ئامینە کچ بووە کە شووی بە عەبدولڵا کردوە، خۆ بێوەژن نەبووە تا لە پیاوێکی تر منداڵی تری هەبوو بێت، چونکە ئیستە ئێمە لە دەیان سەرچاوەدا هەمانە کە خەدیجە پێش ئەوەی شوو بکات بە پێغەمبەر دوو شووی تری کردووە، ناوی پیاوە پێشوەکانیم بە منداڵەکانیەوە لە بەشی دووەمدا نووسیووە، ئەوە هیچ عەیبەی تیا نیە، گەر ئامینەش پێش عەبدولڵا شووی تری بکردایە، لەبەشی دووەمدا دەمهێنا، چونکە من لەوێ ژیانی عەبدولڵام بەوردی نووسیوەو، زۆر گەڕاوم بە شوێن سەرچاوەدا، تەنانەت کە سەرچاوەیەك لە عێراق نەبووەو پێویستم بووە بۆ ئەمکارە، ناچاربووم ڕامسپاردوە لە بەیروت بۆیان

---

[1] ظهور الکرد فی التاریخ .د.جمال رشید احمد لا٤٠٠-٤٠١.

هێناوم، پاشان عەبدولا هەر دوو مانگ لەگەڵ ئامینە بووە ئیتر مردوە، تەنانەت تاقە کوڕەکەیشی محەممەدی نەدیوە.!! گەر موحەممەد لەو سەردەمەدا نەبوایە، ئێستە ئێمە هیچمان لەبارەی ئەوانەوە نەدەزانی، ئێمە ئەمڕۆ باسی وردو درشت و نهێنی کوڕو کچ و خێزانی موحەممەدمان لە بەردەستدایە، ئەی ئەگەر موحەممەد برایەکی تری هەبوایە، چۆن دەشارایەوە؟ ئەوە هەموو گومان دروستکردنەو مێشك تێکدانی مسوڵمانانە، بەڵام هیچ کەسێك گوێ بۆ ئەو خەوو خەیاڵات و جادوگەریە شل ناکات، کە دکتۆری زەمانە لە باتی زێوان و جادوگەرو داپیرەی بەر ئاگردان بۆمانی دەگێڕێتەوە، خوای گەورە دواتر باسی دەکەم موسای لە منداڵیەوە پاراست و بە خێوی کرد، کە تەمەنی هەفتەیەك بوو، بەخێوی کرد هەتا بوو بە پێغەمبەر، بۆ مووسا دەفەرموێ تۆم دروستکرد بۆ خۆم، لەبەرچاوی خۆمدا گەورەم کردی، یەعنی بۆ کاریکی خۆم کە پاشتر ڕاتدەسپێرم، هەروەها موحەممەدی پەروەردە کرد، چوار ساڵی یەکەم لە ماڵی حەلیمە لە دێ و دوور لە دایك و باپیرو مامەکانی، چونکە زانست دەریخستوە کە منداڵ لە چوار ساڵی یەکەمدا چی فێربێت و چی وەربگرێت، دوایی هەتا مردن هەر ئەوە دەداتەوە، بەلام بە گوێرەی عەقڵ و تێگەیشتن و سەردەمی تێگەیشتنی خۆی ئەوانە ڕێکدەخات، خوای گەورە نەیهێشت موحەممەد باوکی هەبێ و برای هەبێ خوشکی هەبێ، نەوەك عەتفی بۆیان بجوڵێ و گوێیان لێبگرێ و شتیان لێوە فێرببێ، کە بووە هەشت ساڵان دایکیشی مرد، ئیتر نە دایك و باوك و خوشك و برای نەبوو، هەتا لە خوێن و گۆشتی خۆی کاریگەریی کەسی بەسەرەوە نەبێ و، لە ڕەحمی خۆی کەسێك نەبێت ئەمری بەسەردا بکات، ئەویش ناچار بێت جێبەجێی بکات، تەنانەت کوڕو کچەکانیشی یان هەر زوو مردن، یان کچەکانی کە شویانکرد منداڵیان بۆ نەمایەوە، هەر بۆ نموونە بزانە ئیسلام چەندی زەرەرکرد کە فاتمەی کچی پێغەمبەر حوسەینی بوو، ئێستە شیعە لەوە دروست بوون و، کۆمەڵگەی ئیسلامییان کردوە بە دوو کەرتی دژ بەیەك و، شەوو ڕۆژ جنێوو ناوناتۆرە لە سەحابەکان دەنێن، خۆ حوسەین کوڕی محەممەد نیە.! کچەزای محەممەدە،

حیكمەتی خوا زۆر گەورەیە، ئەی ئەگەر كورێكی هەبوایە.؟ ئێستە چەند دەستەو تاقم و چین لە ئیسلامدا دروست دەبوو، كە دەبوو خەڵك خزمەتی كورو كورەزاو زازاكانیان تا قیامەت بكردنایە.! ئەوەندە جۆری تری وەك شیعە دروستدەبوون، كۆمەڵگەی ئیسلامی تەواو لەت و پەت دەبوو لە كەڵك دەكەوت، سەیدو شێخ، چەند سەدەیەك و ماوەیەكی زۆر، بەدرۆ خۆیان كردبووە كچەزای پێغەمبەرو، خەڵكی نەزان خزمەتیان دەكردن و، پارەو سامان و شاباش و تەقنەی زۆریان بە تاڵان و دزی و ڕاو ڕوت خوارد، زۆر گەورە بوو كە محەممەد كەسی بۆ نەمایەوە، باپیرو مامە لەو دوورن، بەڵێ پاراستیان و بەخێویان كردو بەخێویانكرد، بەڵام هیچی بە باوەشی دایك و گۆشكردنی باوك و لەلەیی خوشك و برا نابێت، خوا كەسی بۆ موحەممەد نەهێشت، چونكە ئەو ئامادە دەكات ببێتە پێغەمبەری دوو سێ هەزار ساڵ و نزیكەی سەد ملیار كەسێك، لەبەر ئەوە هەموو ئامێرو هەستەكانی موحەممەد، تەنهاو بە تەنها ڕوویان لە ڕەحم و سۆزو لوتف و كەرەمی خوابوو، هەر لە منداڵیەوە خۆی پەروەردەو بەخێوی كرد، وەك خۆی دەفەرموێت، (ادبنی ربی فاحسن تادیبی)، لە هەموو شتێكی ناو ناخ دەرەوەی پاراستی، پوخت و پاك مایەوە، وەك چۆن لە دایك بوو، پاك و بێگەرد بوو هەتا بووە پێغەمبەر، كردیە ئاوێنەیەكی ڕوون، ئەوسا كردیە جێی ئەمانەتی خۆی و هاوڕێی جوبرەئیل و مەلائیكەو وەحی بۆ دابەزاندو پەیام و ئایەتی خۆی بۆ نارد، لەبەر ئەوانە، گومانەكانی دكتۆر جەمال هیچ نییە، چروكە، كاریگەریی نییە، جا ئەگەر موحەممەد سەد كوری هەبوایە، دوو سەد براشی هەبوایە، چ كاریگەرییەكیان لەسەر موحەممەد دەبوو، ئایا ئەبووبەكرو عومەر، ملیۆنەها كورو باوك و برای بۆ ئەو نەهێناوە؟! نوح بۆ كورەكەی فەرمووی خوایە ئەهلەكەم، خوا فەرمووی (انە لیس من اهلك)، كورو براو باوكی بێبڕوا ئەهلی پێغەمبەران نین، بینیتان كور و ژنەكانی نوح و لوت و چەند پێغەمبەری تر، دژی خواو دژی مێردە پێغەمبەرەكەیان بوون، لە بەرەی دژی مێردەكانیاندا كاریاندەكرد، سەحابەكانی پێغەمبەر لە هاوڕێكانی مووسا و هەموو پێغەمبەرانی تر چاكتر بوون، سەحابەكانی پێغەمبەر بە

موحەممەدیان وت ئێمە وەك هاورێكانی مووسا نـاڵێین بـڕۆ خـۆت و خـوا بجـەنگن، ئێمە لێـرەوە سـەیرتان دەكـەین، وتیـان بـەڵكو ئێمـە لـە گـەڵتاین دەجـەنگین، كـە پێغەمبەر مابوو چەندیان كرد، دوای محەممەد سەد ئەوەندەیان كرد، ئـەو هـەزاران سەحابەیە چیان بۆ نەكرد، لـە (٢٥) سـاڵدا دوو ئیمپراتۆریـەتی رۆم و فارسـیان بـۆ رووخاندو، نوری ئیمان و ئیسلامیان لە باتی ئەو گەیاندە ئەمپەڕو ئەوپەڕی جیهان، گەر برای هەبوایەو باوكی بمایە چیان بۆدەكرد، بەڵكو باوك و براو مامی بـۆ چـیە.؟ لەبەر ئەوە حیكمەتی خوا زۆر گەورە بوو لەوەدا كـە موحـەممـەد نـە شـیری دایكـی خۆی خوارد، نە لە باوەشی دایك و باوكیدا گۆشكرا، دوای ماوەیەك لە دایك بـوون، نێررا بۆ لادێ و لای حەلیمەی پاك و پوخت پەروەردە كرا، ئـەو بـەردەوام لـە گـەڵ بەرغەل و مەڕی پاك و بێگوناح بوو، لە باوەشی چەم و دۆڵی سـەوزو بیابـانی روون و ژێـر ئاسمـانی شـین بـوو، دەروونـی بـە هـاش و هوشـی بتخانـەكان و، كـاروانی بازرگانی و، منداڵانی شاری مەككە پڕ نـەبوو، كـە هەمیشـە باسـیان لـە ئەفسـانەی بتـەكان و جادووگـەری زێوانـەكان دەكـرد، هـیچ حیكمـەتێك ناگاتـە ئـەو بـەرزی و داناییەی كە نەخشەی ژیانی موحەممەدی ئاوا دارێژا، ئایـا دایـك و بـاوك بـە ڕەحـم ترن لە خوای پـەروەردگار..؟ لـە فەرموودەیەكدا هـاتووە: هەرچـی ڕەحـم و سـۆز لەسەر زەوی و لای مرۆڤ و ئاژەڵ هەیە، یەك دڵۆپەیە لـە دەریـای بێپـەیی ڕەحـم و سۆزی خودا، بە ڕاستی ئەم قسانەی دكتۆر جـەمال سـەیرەو زۆر ئازارمـان دەدات، تاكـە كەسـێكە كـە ئـەو هـەموو سـووكایەتیە بێوێنانـەی بەرامبـەر پێغەمبـەری خۆشەویست و سەروەرمان كردبێت، ئەگەر من و سەد هەزار كەسی تر، سەد هەزار بەرگ لەسەر ئەم لاپەڕە ڕەشانەی ناو دڵی دكتۆر بنووسین، بە ڕای من هـیچ نییـە، نارەوێتـەوە، ناگاتـە ئاسـتی ئـەو تـاوان و سـوكایەتیەی كـە ئـەم دكتـۆرە بـە پێغەمبـەرمانی كـردوە، مـن هـەر ئەوەنـدە دەڵـێم، داوا لـە خـودای پـەروەردگاری جیهانیـان دەكـەم، خـۆی بـۆ خـۆی تۆڵـەی ئـەو سـووكایەتیی و تاوانـە گەورانـەی لێبكاتەوە، كە بەرامبەر بەو كەسایەتیە بەسوودە مەزنە مێژووییە كردوویـەتی، مـن نازانم، پێغەمبەرمان، جگە لە ڕووناكیی و خۆشەویستیی و ڕزگـاریی و خواناسـین و

خۆناسین، چی تری بۆ هێناوین.؟ کەی شایستەی ئەو تۆمەت و بوختان و گومان بۆ دروستکردنەیە، کە بەرامبەر ژیانی پاك و بێگەردی ئەو بکرێت، بە ڕاستی، من بێدەسەلاتیی خۆم دەردەبڕم، دەستەوستان و بێ توانام، ناتوانم وەڵامەکانم بگەیەنمە ئاست ئەو مەڵۆی تاوان و بوختانانەی کە بەرامبەر سەروەرو پێغەمبەرمان کراوە، جێی داخە، دکتۆر جەمال خۆی بە خوێندەوارو خاوەن بڕوانامەو لێکۆڵیار دەزانێ، بە بۆچوونی خۆی توێژینەوە دەکات، بەڵام توێژینەوە زانستییەکەی ئەوەیە، جنێوو ناو ناتۆرەو بوختان و دەستتێوەردان بکات، مرۆڤی زانست پەروەر، کەی پشت بە زانستی هەڵەو شازو نەشیاو دەبەستێ، مرۆڤی واقعیی، واقعبینانە شتەکان دەهێنێ و مناقەشەیان دەکات، پاشان ئەم قسانە چ خزمەتێك بە مێژووی کورد دەکات.؟ ئەوەی سەیرە دکتۆر نیو سەدەیەکە دەنووسێ و هەرگیز خۆی لەم باسانە نەداوە، ئەمە دەبێت، چ کەڵەکەبوو مۆڵخواردوویەکە لە ناخی ئەودا، کە لە پڕێك بە خۆی و دەوروبەری خۆیدا دەتەقێتەوە.؟ ئەوە پرسیارێکە ئایندە وەڵامی دەداتەوە.؟

## ٧- پاکیی ڕەچەڵەکی پێغەمبەرﷺ لە نێوان ئیسماعیل و عەبدولموتەلیبدا!

دکتۆر جەمال دەیەوێ گومان بۆ نەسەبی پێغەمبەر دروست بکات، لە لایەکەوە وەك باسمان کرد دەڵێ: "ئەو باوکی دیار نییە و پێنج ساڵ دوای مردنی باوکی، لە دایك بووە"، پاشان دەڵێ: "نازانم چۆن عەبدولموتەلیب ڕازی بووە، کوڕی عەبدوڵلای کوڕی دوای پێنج ساڵ لەمردنی باوکی لەدایك ببێت"، پاشان دەڵێ: "موحەممەد برای تریشی بووە لە ئامینە"، بێئەوەی ناویان بهێنێ و سەرچاوە باس بکات، پاشان دەڵێ: "کیندەییەکان وتوویانە موحەممەد لە ئێمەیە"، بۆ ئەم وتانەی سەرچاوە ناهێنێ، یان سەرچاوە دەهێنێ بێ ناوبردنی بەرگ و ساڵ و لاپەڕە، هەر دەڵێ فلان وای وتووە، ئەگەر کەسێك مەبەستی ڕوونکردنەوەی ڕاستییەکان بێت، بیەوێ بەدواداچوون بۆ بابەتێکی مێژوویی بکات و شیکارانە بۆی بچێت و شیبکاتەوە، چۆن لەخۆوە دوژمنانە بەرق و قین و

تاوانبـارکردن کاردەکـات؟!، لەمێـژوودا زۆر کـەس لـەبێبڕواو زەنـدیق و دەهـری دەرکـەوتون و وتویانـە، لەگـەڵ گومڕاییـان و دوژمنایـەتیان بەرامبـەر ئیسـلام و پێغەمبەرەکەی، بەڵام هیچیان نەکەوتوونەتـە گۆمـاوی وا پـیس و پۆخـڵ و پـڕ لـە خڵتـەو بوختـان و درۆ وەك دکتـۆر تێیکـەوتوە، زۆر کـەس بەرامبـەر ئیسـلام و پێغەمبەر وەستاون لە نووسەرو دانەرو ڕۆژهەڵاتناسـان، بـەڕق و قـین بەرامبـەر بـە ئیسلام نووسیویانە، بەڵام کەسیان زیادەڕەوی وای نەکردووە، وەك ئـەم نووسـەرە کردوویەتی[1].

من لێرەدا ناچارم باس لەنەسەب و ڕەچەڵەکی پێغەمبەر بکەم، بەوەی کە زانایـان و دانایانی نەسەب پێی گەیشتوون و پێغەمبەریش ﷺ خۆی بە ڕاستی زانیوە!

موسلیم دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر فەرموویەتی: "خوا کەنانـەی پاککردووەتـەوە لە منداڵەکانی ئیسماعیل، قورەیشی پاك هەڵبژاردووە لە کەنانە، لە قورەیش بـەنی هاشمی پاککردووەتەوە، منیشی بە پـاکیی هەڵبـژارد لـە بـەنی هاشـم"[2]. بوخـاری دەفەرمووێ: "نەسەبی پێغەمبەر بەمجۆرەیە: موحەممـەد کـوڕی عەبـدوڵڵا، کـوڕی عەبدولموتـەلیب، کـوڕی هاشـم، کـوڕی عەبدولمـەناف، قوسـەی، کـیلاب، مـوڕڕە، کەعب، لوئەی، غالب، فەهر، مالیك، نەضر، کەنانـە، خوزەیمـە، مودریك، ئیلیـاس، کوڕی موضر، کوڕی نزار، کوڕی مەعەد، کوڕی عـەدنان[3]. بەغـەوی و ئـیبن قیـەم و ئیبن سەعد دەڵێن: پێغەمبـەر فەرموویـەتی: هەڵەیـە هەرچـی لـە نێـوان عـەدنان و ئیسماعیلدا بووترێ.

هەتا ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێت، نەسەب و بنەچە شەرەفە، جێی تایبەتیی هەیە لە دەروون و ناخی خەڵکیدا، ئەوەی بنەچەی بەرز بێت، ناتوانرێ هـەروا لـە خـۆڕایی بە دوو وشەی درۆ لەکەدار بکرێ! ئیتر پێغەمبەر بێت، یان هەر کەس، بە تایبـەت محەممـەد، چونکە موحەممـەد بـۆ پێغەمبـەری ئامـادەکرا، خـوا خـۆی شـەرەف و

---

[1] الحوار، عدد ٤٧، تموز ٢٠٠٦.

[2] كتاب الفضائل، باب فضل نسب النبي، ج٤، ص١٧٨٢، رقم الحديث ٢٢٧٦.

[3] البخاري، كتاب مناقب الانصار، باب مبعث النبي، ج٤، ص٢٨٨.

نەسەب و بنەماڵەی بەرزی بۆ ئامادەکردوە، هەتا یاریدەدەر بێت بۆ وەلأمدانەوەو لالێکردنەوەی خەڵك بە لایدا و کۆبوونەوە لە دەوری [1]، نەك پێغەمبەر موحەممەد، هەموو پێغەمبەران خاوەن بنەماڵە و کەسایەتی و نەسەبی پاك بوون، گەر وانەبوایە:

یەکەم: گەورەکانی مەککە موحەممەدیان بە ئاسانی لەناو دەبرد.

دووەم: بۆیان دەلوا تانە لە ڕەچەڵەکی وون و نادیاری بدەن.

سێیەم: مەزنانی قورەیش و مەککە دوای کەسی ڕەچەڵەك نزم ناکەون، کە لە خۆیان لە خوارتربێت.

چوارەم: ڕەچەڵەك ئەو کاتە زۆر گرنگ بوو حیسابی وردی بۆ دەکرا، بەراستی ماددە و مەعدەنی پێغەمبەرمان پاك و پوختە، ئەو لە بنەچەی ئیسماعیلی زەبیح و ئیبراهیمی خەلیلە، وەلامی خوایە بۆ دوعاکەی ئیبراهیم و مژدەکەی عیسای برای، هەروەك خۆی دەفەرمووێت: (من بانگەوازەکەی باوکم ئیبراهیم و مژدەکەی عیسام) [2].

پاکی مەعدەنی مرۆڤ و ڕەچەڵەکی، خاوەنەکەی بەرزتر دەکاتەوە، ناهێڵێ خۆی بەشتی نزم و بچووکەوە خەریك بکات، گرنگی دەدات بە چاکە و کاری بڵند، هەمیشە بانگخوازان و پێغەمبەران سووربوون لەسەر ڕەوشتی بەرز و چاکەخوازیی، هەروەکو سووربوون لەسەر ڕاگرتنی بەرزیی ڕەچەڵەکیان، لای خەڵکیش بەڕێز و بەرزو شایستە تەماشا دەکران و چاکیان بۆ دەڵێن و بروایان پێدەکەن [3]. لە پێغەمبەریان پرسی سەرەتای کاری تۆ لە کوێوە دەستی پێکرد؟ فەرمووی: "دوعا

---

[1] دراسة تحليلية لشخصية الرسول محمد، يوسف بن عبدالبرّ، ص٩٦، مصر، ١٩٩٤.

[2] اخرجه الحاكم ،ج٢، ص٦٠٠، صححهُ الحاكم والذهبي. السيرة النبوية، د. الصلابي، ص٤٤-٤٥.

[3] السيرة النبوية، احمد ابو فارس، دراسة تحليلية، ص ١٠٢، دار الفرقان، عمان ١٩٩٧.

و بانگی باوکم ئیبراهیم و مژدەی عیسا، دایکم لە خەویدا بینی کە نورێك لەو دەرچووە و کۆشکەکانی شامی رووناك کردووەتەوە [1].

مەبەست لەدوعا و بانگەوازی ئیبراهیم ئایەتی: (رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنتَ العَزِيزُ الحَكِيمُ) ه (البقرة : ١٢٩) وە مەبەست لە مژدەی عیسا ئایەتی: (وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّراً بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ) (الصف : ٦ )، خەوی دایکی و دەرچوونی نوور وەکو ئیبن رەجەب دەڵێ: "دەرچوونی ئەو نورە لە خەودا و لە کاتی منداڵبووندا، نیشانەی ئەو نورەیە کە رێی خەڵکی زەوی پێ رووناك دەبێتەوە و تاریکی بتپەرستیی پێ رادەماڵێ، وەك ئایەتەکەش دەفەرمووێ: (قَدْ جَاءكُم مِّنَ اللّهِ نُورٌ وَكِتَابٌ مُّبِينٌ * يَهْدِي بِهِ اللّهُ مَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَهُ سُبُلَ السَّلاَمِ وَيُخْرِجُهُم مِّنِ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِهِ وَيَهْدِيهِمْ إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ) (المائدة :١٥-١٦).

لە سەرچاوە مێژوییەکاندا جێگیر بووە کە نیوەدوورگەی عەرەب لە ٣ هەزار ساڵ پێش زاینەوە ناوچەیەکی قەرەباڵغ و پڕدارستان و گیانەوەری دڕندە بووە، شاخەکانی نێوان عەرەفات و کەعبە تا ساڵانی ١٦٠٠ پ.ز بە درەخت داپۆشرابوو، ئێستەش جێگەی دۆڵ و روبارەکانی دیارە و ئاشکرایە، بەڵام ئەمڕۆ دێهاتەکانی کاول و وێران، رووبارەکان وشك، خەڵکەکەی ناچاربوون بونەتە کۆچەری بەدوای پەیداکردنی ئاوولەوەڕ بۆ ژیانی خۆیان و گیاندارەکانیان [2]، نیوە دورگە روباری گەورەی هەبووە، شاری یەسریب لەسەر رووباری حومس بوو، کە دەڕژایە دەریای سوور، سێ روباری تر کە دەشتەکانی پاراو دەکرد لە نێوان نەجد و ئەحسادا دەڕۆی، رووباری دەواسر گەورەترینیان بوو، لە رۆژهەڵاتی یەمەنەوە هەڵدەقوڵاو بەرەو ژوور بە دەشتی روبعی خالیدا دەچوو، دەگەیشت بە رووباری رممە نزیك

---

[1] رواه الامام احمد، ج٥، ص٤٦٢، صحيح الاسناد وقال الحاكم صحيح الاسناد، ج٢، ص٦٠٠.

[2] د. جواد علي . تاريخ العرب قبل الاسلام، ص٦٤

لێوارەکانی بەسرەو دەرژایە کەنداوی عەرەب، لەو قۆناغە جیولوجیەدا نیوە دورگە باراناوی زۆر بوو، دۆڵی شەریفە دەریاچەیەکی گەورە بوو[1]، لە باشوری شاری ڕیازەوە پێنج دەریاچە هەبوون، ئاوی بیرەکان دەیانبەستن بەیەکەوە، ڕووبەری هەریەکە ٤هەزار مەتری چوارگۆشە بووە، ئەو ئاسەوارە دێرینانەی کە خەڵکی ئەو ناوچانە جێیان هێشتوە، نیشانەی شارستانیەکی مێژوویی بەربڵاوە لە نیوەدورگەدا، کاتێکیش ئەو خەڵکە شارەزایە ناچار بوون کۆچ بکەن بەرەو ژوورو بۆ عێراق و شام و میسر، بنەمای ئەو شارستانیەیان پێبوو، ئەو زەینە ڕونەیان لە گەڵ خۆیان برد، ئاسەوارەکانی لێواری کەنداوی عەرەب و بەحرەین و قەتیف، نیشانەیە بۆ شارستانیو پێشکەوتن و قەرەباڵغی ئەو ناوچانە لە هەزار ساڵ پێش زاینەوەو لە چەرخی جەلیدی و برۆنزی لە ٣٠٠٠ ـ٢٥٠٠ هەزار ساڵ پێش زاینەوە[2].

عەرەبی عاریبە بریتی بوون لە (عاد، سەمود، تسم، دیس، عەمالیق، عەبیل ئەمیم، ڕەهت، جاسم، قەحتان) لەسەرەتای هەزارەی دووەم پێش زایندا هەندێ هۆزی باکوری دۆڵی دوو ڕووبار و هەرێمی گوتی کۆچیان کرد بۆ باشووری عێراق، ئەوان لە ترسی زەمین لەرزە یان بورکان هەڵهاتن و لە ناوچەی بابل نیشتەجێ بوون، ئیبراهیم ئەو کاتە منداڵی یەکێك لەو خێزانانە بوو[3]، لە ناو ئەو هۆزە بتپەرستانەدا لە شاری فدان ئارام (حەڕان)، کەسێك بە ناوی ئازەر (تارح) منداڵێکی بوو بە ناوی ئیبراهیم، ئازەریش لەو بتپەرستانە بوو[4]، ئەوکاتە لە شاری پڕ شارستانی بابل خەڵکی بڕوایان بە پەرستنی پەیکەرو ئەستێرەی گەڕۆك بوو، دیاریان دەدایەو دەیان پەرست و ئاهەنگیان بۆ دەگێڕاو قوربانیان بۆ سەردەبڕین، ئازەر کاهنێکی بەڕێزو ناسراوو زانایەکی ئەستێرەناس بوو، ئاگاداری جوڵەی ئەستێرەکان بوو، پاشای بابل بەرزی کردەوەو کردیە ڕاوێژکاری خۆی، گوێی بۆ دەگرت، پاشان

---

[1] الدکتور رفیق التمیمی، مجلة المصنف، العدد تموز ١٩٤٤، ص١٢٥

[2] تاریخ الجنس العربی، د. محمد دروزة، ج١ ،ص٢٥ ، بیروت

[3] د. احمد سوسة. العرب والیهود فی التاریخ، ص١٥٤

[4] قصص القران، المرحوم محمد جاد المولی، ص٣١

بووه یەکێك لە گەورەکانی بابل، ئیبراهیم بەهێز بوو بڕوای بەو دەستکردانە نەبوو، شەوێك ڕقی لێیان هەستاو هەموویانی شکاند، ئەوانیش ئاگریان بۆ کردەوەو خستیانە ناوی، بەلاّم بەسەلامەت لێی دەرچوو، ئەو موعجیزەیە خەلّکەکەی ترسان و لە حەیبەتان لە ناوچەکە هەلّهاتن، دوای ئەوە ئیبراهیم وتووێژی لە گەلّ نەمرود کردو ترساندی، دواتر ئیبراهیم لەگەلّ سارەی خێزانی و لوت و هەرچی بڕوایان پێی هەبوو، بەرەو ژوور چون بۆ شاری حەڕان، پاشان لە سەردەمی هەکسۆسەکاندا خۆی و سارەی خێزانی و لوتی برازای و کۆمەلّێك لە هەوادارانی چون بۆ میسر، لە میسر زۆر کەس خۆشحالّ بوون بەو ڕۆشتنەو پێشوازیان لێکرد، دیارە ئەوانە هەوادار و کەسایەتی هۆزە ئاسیاویە حەنەفی و یەکتاپەرستەکان بوون، زۆریش پێی قالّس و نارەحەتبوون، هەولّیانداوە زیانی پێبگەیەنن و دەری بکەن، بەلاّم پاشای هەکسۆسەکان ئیبراهیمی پاراست و بەڕێزەوە بەڕێی کردوە، بڕێك مەڕو حوشترو خواردنی داوەتێ و گیرفانیشی پڕ لە پارە کردوە، جگە لەوە کەنیزەکێکی بە ناوی هاجەر بەدیاری بەخشیە سارە، ئیبراهیم ناچاربووە گەشتەکەی کۆتا پێبهێنێ و گەڕایەوە بۆ ناوچەی کەنعان، لوتیش وەك پێغەمبەرو بانگخواز چوو بۆ شاری سدوم، هۆی ئەو گەشتەی ئیبراهیم لە مێژوودا ڕون نیە.؟ مەبەستی لە سەفەری میسر بە خۆی و ئەو قەرەبالّغیەوە چی بووە.؟ هەروەها ڕون نیە بۆچی ئەوانە نارازی بوون بە ڕۆشتنی ئیبراهیم بۆ میسر.؟ ئەوانە کێبون کە پێشوازیان لێکردوە.؟ دیارە ئەو کەسایەتیەکی ناوچەیی ئەو کاتە و ناسراو بووە، هەر بۆیە فرعەونی میسر ڕێزی لێگرتوەو دیاریی پێبەخشیووە، بەلاّم ئەگەر ئەو هیچی نەکردبێ لەو گەشتەدا، هەر ئەوەی قازانج کردوە کە هاجەری دەستکەوتوە، کە دواتر بوەتە دایکی ئیسماعیل و مەککەی پێ ئاوەدان کردوەتەوە، ڕەنگە خوا هەر بۆ ئەوەیشی ناردبێ، پاشتر محەممەدیش لەو تۆوە موبارەکە لە دایکبووە، دەبێ هاجەر بەباوەڕو بەڕێز بوبێت، لە بنەمالّەیەکی شەریف و پاك و پوخت بوبێ، هەر بۆیە بوەتە شایانی ئیبراهیم و، ئەمینی هەلّگری تۆوی پاك، سارە دەیزانی ئیبراهیم حەزی لە مندالّە، داوایکرد هاجەر بخوازێ، پاشتر کوڕێکی لێی بوو، بەلاّم غیرە هەربووە، لە دەرونی هەموو کەسدا هەیە، سارە خاتوون، هاجەرو دیاریەکەی خۆی

پێقبولّ نەکرا، داوای کرد لێی دوور بخەنەوە، ئیبراهیم دڵی سارەی هێنایەوە، ئەو دڵهێنانەوە لە ڕوکەشدا بۆ سارەیە، دەنا لە ناخ و نهێنیدا مەیلی خوایە، کە دەبێ هاجەرو ئیسماعیل بچنە مەککەو کەعبە دروست بکرێت و، ناوچەکە ئامادەبکرێ و ئاوەدان بکرێتەوە، بۆ میوانێکی زۆر مەزن، کە دوا مۆرەو سەروەری پێغەمبەرانە، ئیبراهیم پیر بووە، بەلاّم دوعاکانی هاتوەتەدی و بە ئاوات گەیشتووە، ئیتر کاتی کۆچ و مردنە، دەبێت بنەیەکی تری پێغەمبەرایەتی بخاتەوە، وەك بابل و فاران و کەنعان و فەلەستین و میسری ئاوەدان کردەوەو، تۆوی یەکتاپەرستی تیا بلاّوکردنەوە، دیارە شوێنی تر ماوە کە ئاوەدانی بکاتەوەو، پێی بگەیەنێ بۆ سێ هەزار ساڵی ترو دوای مردنی خۆی، شوێنێکی قات و قڕ و وشك و چۆلّ و بێجولّەو خشپە، دەبێت بچێتە ئەو چۆلّەوانیەو دوعایەکیش لەوێ جێ بهێلّێ، دوعایەکی درێژماوە، کە مەفعول و هێزی بۆ سێهەزار ساڵی تر بڕ بکات، ئەوسا چەکەرە بکات و سەوز ببێت، دوعایەك کە مۆری دوعاکانەو بۆ سەرهەلّدانی دوا پێغەمبەرانە، بۆ ماوەیەکی زۆر دوور، بە جۆرێك ئاوەدانی بکاتەوە، کە هەموو دەقەو ساتێك یەك ملیۆن کەسی بە بڕوا، بە دەوری بەردێکی ڕەش و ڕەق و بێسوددا، لەو جێ تەنهایەدا بخولێنەوە، شوێنێکی وشك و برنگ و بێجولّەو بێمرۆڤ ئاوەدان بکاتەوەو، شوێن و شارستانی قەرەباڵغی وەك سۆمەرو بابل و سەبە ء و فرعەونی و ئاشوور، کپ بکاتەوەو قپ و قڕی بکات و چرای بکوژێنێتەوە، دەنا ڕەنگە بەعەقلّ سارەی ژیر حەزی کردبێت ئیبراهیم و هاجەرو ئیسماعیل لە دەوری بن و، ئیبراهیم نەخاتە ئەو دلّە ڕاوکێیەوە، بەلاّم لەو ناخۆشیە خۆشی دروست دەبێ، لە ئیسماعیلی منداڵ، دوا پێغەمبەر دەکەوێتەوە، دۆڵی قپ وقڕو تاریك و چۆڵی مەککە، دەبێت بە شوێنی قەرەبالغ و چراخان و چڕ، بەردەوام ملیۆنێك غەریبە دڵ و دەرونیان بە پیت و بەرەکەتی ئیمان ئاوەدان دەکەنەوە، ئیبراهیم، ئیسماعیلی بردە دۆڵی فاران و بەککە، هاجەری گوێ ڕایەڵ، هەر نەیپرسی بۆ کوێ و بۆچی دورمان دەخەیتەوە، تەنانەت لە ڕێگەش کە بیابانی دەدری، چەند شەوو ڕۆژی بەنێو لمی گەرم و وشکدا بڕی، هەر نەیپرسی، بۆ کوێ دەچین.؟ هەتا داینان، دوای چەند شەوو ڕۆژ کە گوزەرا،خەریك بوو جێیان بهێڵێ، ئەوجا وتی، ئیمە لەم شوێنە چۆلّ و بێکەسە

چیبکەین.؟ ئەمە هەر دوور خستنەوەیە، بۆ ئەوەی لەبەرچاوتان ون ببین.؟ یان بە داوای خوایە.؟ ئیبراهیم وتی: بە داوای خوایە، هاجەر وتی دەی خوا پەکمان ناخات، وازمان لێناهێنێ، ئیبراهیم گەڕایەوە بۆ لای سارە، کانی و ئاوی زەمزەمیش بۆ هاجەر تەقی، پاشتر لە سارەش ئیسحاق بوو، ئیبراهیم ئیسماعیلی سەرپشککرد خۆی ژن بهێنێ، کێ هەڵدەبژێرێ ئارەزویەتی، بەلام بۆ ئیسحاق، وانەبوو، ناردیەوە بۆ شاری (حەڕان) لە کوردوستان، هەتا ڕەفعەی کچی ناحوری مامی خۆی بهێنێ، وتی نابێت ئێوە کچ لە کەنعان بهێنن ( المعارف، ابن قتیبة) دوو کوڕی لەو ژنە بوو بەناوی عیسۆو یەعقوب، کە یەعقوب گەورە بوو، لە گەڵ عیسۆ ناکۆکیان کەوتە نێوان، یعقوب پەنای بردە بەر باوکی، ئەو کاتە ئیسحاق پیر بوو بوو، ترسا ئەو بمرێ و عیسۆ خراپەیەك بەرامبەر یەعقوب بکات، داوای لە یەعقوب کرد بگەڕێتەوە بۆ حەڕان (فدان ئارام)، ماڵی خاڵی لەوێیە، (لابان کوری بتوئیل) برای دایکیەتی، داوای کرد کچەکەی مارە بکات و دوور بکەوێتەوە لە عیسۆی برای، لەتەوراتدا[1] هاتووە ئیسحاق یەعقوبی کوڕی بانگکرد دوعای بۆ کرد و پێی وت: کوڕم ژن لە کەنعانیەکان و خەڵکی فەلەستین مەهێنە، بڕۆرەوە بۆ فدان ئارام بۆ ماڵی (بتوئیل) باوکی دایکت، بۆ ماڵی لابانی خاڵت لە کچەکانی خاڵت[2]، کچێك بۆ خۆت هەڵبژێرە، یەعقوب گەڕایەوە بۆ فدان بۆ کوردوستان، وەسیەتەکەی باوکی بە لابانی خاڵی گەیاند، خاڵی دوو کچی هەبوو، (لیئەو ڕاحیل)، خاڵی وتی: دەبێ حەوت ساڵ مەڕەکانم بۆ بەخێو بکەیت، سەرەتا لیئەی دایە، پاشان کە بە دڵی بوو، حەوت ساڵی تر شوانی پێ کردو کچی دوەم ڕاحیلیشی دایە، لابان هەردوو کچەکەی خۆی خۆش دەویست، هەر بۆیە دوو خزمەتکاری بەخشیە هەردوو کچەکەی، (زولفە) بۆ لیئەو (بلهە) بۆ ڕاحیل، ژنەکانیش لەبەر ئەوەی مێردی خۆیان زۆر خۆش دەویست، هەردوو جاریەکەیان بەخشیە یەعقوبی مێردیان، هەر وەك چۆن سارە هاجەری بەخشیە ئیبراهیمی میردی، ئەوانیش ئەو جۆرە بەخشینەیان

---

[1] التوراة، سفر التكوين، ص٢٨

[2] سفر التكوين: ٣١، ٣٢

کرد، لەو چوار ژنە (١٢) کوڕ بوو[1]، ئەو دوانزە کوڕەش بەم جۆرە بوو: لە لیئە: (ڕائوبین و شەمعون و یەهوزا و لاوی و یساکر و زبولون) بوو، لە ڕاحیل : (یوسف و بنیامین) بوو، لە زولفە (جادو ئەشیر) بوو، لە بلهە (دان و نفتالی) بوو، ئەمانە هیچیان لە خاکی فەلەستین گۆش نەکران و گەورە نەبون، پەیوەندیان بە ناوچەی کەنعانەوە نەبوو، هیچیان لەبارەی ئەو ناوچەوە نەدەزانی، تەنانەت نەشیان دەزانی کەنعان لە کوێیە[2]، ئەم کوڕانە لە خاکی ئارام لە حەڕان مانەوە، یەعقوب وتی: خوایە گیان، خوای ئیبراهیمی باوکی باوکم، ئەو خوایەی پێی وتم بگەڕێرەوە، بم پارێزە لە عیسوی برام، لە برگەی (سفر التكوين: ٣١) دەڵێ: یەعقوب هەڵسا منداڵ و ژنەکانی لەسەر حوشتر هەڵگرت، هەموو وڵاخەکانی پێش خست، هەموو ئەوانەی بروایان پێی هەبوو دوای کەوتن و لە فدان ئارام دەرچوون، ئەوانەی هەموو گواستەوە بۆ لای ئیسحاقی باوکی لە خاکی کەنعان، ڕاحیلی ژنی یەعقوب، بتەکانی باوکی، ئەو بتەی کە لە ئاران فدان دەپەرسترا، بە نهێنی شاردیەوەو لەگەڵ خۆی هێنای، یەعقوب بەبێپرسی لابانی خاڵی، ماڵ و منداڵی پێش خست و ڕۆی، لەشاخی جلعاد نیشتەجێ بوو، بەڵام لابان بە یەعقوب گەیشتەوە، کەلوپەلەکەی یەعقوب گەڕا، بتەکەی نەدۆزیەوە، ڕاحیل لە کورتانی حوشترەکاندا شاریویەوە، یەعقوب بە خاڵی وت: بیست ساڵ بەخۆم و منالەکانمەوە خزمەتی خۆت و ماڵاتەکەم کردیت، ئەگەر دەستی خواو ڕێزو حورمەتی ئیبراهیمی باپیرم لەگەڵ نەبوایە، بەدەستی خاڵی جێم دەهێشتی، بۆ سبەی بەیانی لابان کچەکانی ماچکردو دوعای بۆ کردن و گەڕایەوە شوێنی خۆی.

مێژوو، دروستکردنی کەعبەی پەیوەست کردووە بە چیرۆکی ئیبراهیم و ئیسماعیلەوە، کاتێك لە فەلەستینەوە بە داوای خوا گەیشتنە خاك و کێوی فاران و مەککە و بەککە و ناوچەی حیجاز، هاجەرو ئیسماعیل لەوێ لەو بیابانە بە تەنها جێیهێشتن، خوا زەمزەمی لەو بیابانە قرو وشك و قەحتە بۆ هەڵقوڵاندن، هۆزی

---

[1] البداية والنهاية، ابن كثير ج١ ص١٩٦

[2] قراءة حول مصير النبي موسى. المحامي بديع السيوفي .ص٩ ـ ٢١،ط١ ،٢٠٠٥ ، دمشق

جورهـوم بـه کاروانێـك کـه لـه یه‌مه‌نـه‌وه بـه‌ره‌و ژوور ده‌چـوون، بـه ناوچـه‌که‌دا تێده‌په‌ڕین، به‌هۆی بینینی باڵنده‌وه له‌و ناوه، هه‌ستیانکرد لـه‌و نزیکانـه ئـاو هه‌یـه که پێشتر نه‌یان دیبوو، ئاوه‌که‌یان دی لایاندا، داوایان له هاجه‌ر کرد گـه‌ر ڕێگـه‌یان بدات له‌و نزیکه نیشته‌جیّ ببن، ئیسماعیل له نـاو ئـه‌وان گـه‌وره بـوو زمـان و داب و نه‌ریتی ئـه‌وان (عـه‌ره‌بی) فێـر بـوو، کچێکی لـه‌و هـۆزه هێنـا دوای ئـه‌وه‌ی دایکـی مردبوو، ئیبراهیم له فه‌له‌ستینه‌وه گه‌ڕایه‌وه حیجاز، که ژنه‌کـه‌ی ئیسـماعیلی بـینی به دڵی نـه‌بوو، له‌گـه‌ڵ ئاسـتی پاشـه‌ڕۆژو مـه‌زنیی کوڕه‌که‌یـدا نـه‌بوو، ئیـبراهیم بـه چاوی پێغه‌مبه‌رانه ده‌بیینی نوورێك له کوڕه‌که‌یدا هه‌یه، خۆیشی دوعای کردبوو لـه نه‌وه‌کانیدا پێغه‌مبه‌ران هه‌ڵبکه‌ون، له‌به‌رئه‌وه خۆی ژنی بۆ کوڕه‌کـانی هه‌ڵده‌بـژارد، داوای کرد ئه‌وه ته‌ڵاق بـدات، کچێکی تـری لـه هـۆزی جورهـوم هێنـا، جـارێکی تـر ئیبراهیم سه‌ردانی ئیسماعیلی کرده‌وه، به داوای خوا که‌عبـه‌یان دروسـتکرد، ئه‌مـه له سنوری ٣٨٠٠ ساڵ له‌مه‌وبه‌ر بوو[1].

پاشـان دوعـای کـرد کـه خـوا بیکاتـه مـاڵی خـۆی و لـه هـه‌موو چـه‌م و دۆڵ و ده‌شتێکی سه‌ر زه‌وییه‌وه خه‌ڵکی بۆ بهێنێ، ئیـبراهیم گه‌ڕایـه‌وه بـۆ شـام، پاشـان عه‌ره‌به‌کان ئه‌و ماڵه‌یان ده‌په‌رست به‌وه‌ی که ماڵی خوایـه و ئیـبراهیم و ئیسـماعیل دروستیان کـردووه، سـنووری پێغه‌مبه‌رایـه‌تی ئیسـماعیل نـه‌وه‌د سـاڵ ته‌مـه‌نی لـه ناوچه‌ی فاران و حیجاز و جزیره و یه‌مـه‌ن دابـوو، ئـه‌نجا پیرۆزیـی که‌عبـه، شـاری مه‌ککه‌شی پیرۆزکرد، بووه شارێکی گه‌وره و بازرگانیی دوای ئیسـماعیل، که‌عبـه و خاکی مه‌ککه لای عه‌ره‌ب بووه خاکی حه‌رام که نـابیّ شـه‌ڕ و هـه‌را و خراپـه‌ی تیـا ڕوبدات، به‌و جۆره له رووی ئابووریی و کۆمه‌ڵایـه‌تیی و ڕۆشـنبیرییه‌وه پێشـکه‌وت، بـووه ڕێـی بازرگـانیی شـام بـۆ یه‌مـه‌ن و عومـان، بازرگـانیی میسـر بـۆ یه‌مـه‌ن و لێواره‌کانی هیند، وه‌کو (ئیبن که‌لبی) لـه (کتـاب الاصـنام)دا و ته‌بـه‌ری لـه بـه‌رگی یه‌که‌می مێژووه‌که‌یدا باسی ده‌کات.

---

[1] التاريخ الاسلامي، محمود شاكر ،المكتب الاسلامي، الطبعة السابعة، بيروت ١٩٩١، ج١، ٢، ص٨٥

بانگەوازی ئیبراهیم و پاشتر ئیسماعیل و کوڕەکانی تری، کرانەوەیەکی نوێ بوو لە مێژووی عەقیدەو بیروباوەڕدا، ئایینی ئیبراهیمی کارێکی نوێ و یەکەم دەستپێك نەبوو، بەڵکو بەرگێکی سەیری لە سەرداریێتی و زەعامەت بە یەکتاپەرستی بەخشی و بەرزی کردەوە بەسەر هەموو بت و پاشاو ئەستێرە پەستیەکاندا، سەرکردایەتی ئیبراهیم هەموو سنوورو بیروباوەڕێکی تێپەڕاند، تەنها گەشتەکەی لە کوردستان بۆ عێراق و شام و فەلەستین و میسر و دواتر نیوەدورگەی عەرەب، گرێدانی هەموو ناوچەکە و بیروباوەڕیان بووە بەیەکەوە، لە ژێر سایەی یەك خواو یەك پێغەمبەرو ئاییندا، چونکە پێش ئیبراهیم، نوح، کە مەزنترین و بە تەمەنترین پێغەمبەر بوو، زۆرترین هەوڵ و ماندوبوون و تەمەنی بەخشیە باوەڕەکەی، بەڵام لەگەڵ گەلەکەی سواو بۆی ئیصلاح نەکران، ناچار دوعای لێکردن، خۆی و چەند دانە هاوڕێیەکی بڕواداری دەرباز بوون، ئەوانی تر هەموو خنکان، هەرچەند ئیبراهیمیش لە دەست زۆردارانی گەلەکەی وەك نوح هەڵهات، بەڵام بەرهەمی درەختی پێغەمبەرایەتی ئەم، ئەوەندە خاوەن لق وپۆو دامەزراوە بوو، دەیان پێغەمبەر لە شەجەرەکەیدا سەوز بوون، زنجیرەکەی دریژ بوەوەو گەیاندیە دوا پێغەمبەرایەتی کە محەممەدە[1]، ئەگەر نوحیان لە خاکێکی ترەوە ڕاوناو لە کوردوستان گیرسایەوە، بەڵام ئیبراهیم لە کوردوستان بەدەر نراو لە خاکی شام گیرسایەوە، هەر بەوەشەوە نەوەستا، ئەو تووەی کە دای بە کۆڵی هاجەری میسری، کە لە پاشماوەکانی شازنی فرعەون نیفەرتیتی (تادۆهیپا) ی یەکتاپەرستی (هۆری) میتانی بوو، دوای شکستی شۆرشی یەکتاپەرستی (ئەخناتون) ئامون حوتبی چوارەم پاشای میسر، کە تادۆهیپای خێزانی لە کوردوستانەوە بۆی هێنابوو، خۆی و کچەکانی کرانە کۆیلە و لە کۆشکی فیرعەونەکاندا خزمەتیان دەکرد، چەند نەوەیەك لەو تووە پیرۆزە بەربلاو بوو، لە

---

[1] النبي ابراهيم في الثقافة العربية الاسلامية، الدكتور تهامي ابراهيم، دار المدى للثقافة والنشر، سنة ٢٠٠١، دمشق، ١٥١ـ ١٥٥

یەکێك لەنـەوەی تادۆهیپـا، کچـێك بـوو کـە بـوە شـاژنی میسـر بـەناوی ئاسـیە کـە موسای گۆش کردوو ئامـادەی کـرد بـۆ پێغەمبـەرایـەتی، پاشـان یـەکێك لـە نـەوەی ئەوان، لەلایەن فیرعەونـەوە بەخشـرایە ئیـبراهیم، هـەتا خزمـەتی سـارەی خێزانـی بکـات، بـەلاَم کێـدەیزانی پاشـتر دەبێتـە هـەلگری تـۆوی پێغەمبەرایـەتیو دەگاتـە حیجازو فاران، لەوێ سەوز دەبێ و درێژە بە تۆوی پێغەمبەرایەتیو یەکتاپەرستی دەدرێ بـۆ شـانزە سـەدە دوای خۆیـان..!! ئـاخری ڕێگـە ئـەوە بـوو کـە ئـاینی ئیبراهیمی مەزن، ئەو بیروڕا پتەوە بەهێزەی کە ئیـبراهیم هێنـای و دایمەزرانـد، بـە کاری کەسێکی شەیتان پەرست، کەوتە بازاڕی بتپەرستی، وای لە خەلکی کرد، کـە جارێکی دی فەزلّی بت و دار و بەرد، بدەنـەوە بەسـەر هێـزی بـێ سـنووری خـواو، قوربانیـان لـە بـاتی خـوا بـۆ بتـەکان سـەردەبڕی، ئـیتر چـەرخی بتپەرسـتی دەستپێکردەوە، خەلکی بۆ ماوەی سێ سەدە لە باتی خوا، کەوتنە پەرستشـی و بـە پـیرۆز سـەیرکردنی دارو بـەرد و هـەواو تـاریکی و خـۆر و مـانگ و ئەسـتێرە، جۆرەها وێنەی سەیریان لە دارو بـەرد، لـە شـێوەی زەلام و بالّنـدە و گیانـداران و شتی سەیرو سەمەرەدا دروستدەکرد، دەیان وت: ئەمانە نیشانەی هێزی سروشـتن، بەدەوریاندا دەهـاتن و تـەوافیان دەکـردن، قۆچـیان بـۆ سـەردەبڕین، کاسـبییان لا دەکردن و دەیانپەرسـتن، هـەموو داوایـەکیان لێـدەکردن، لـەو کاتـەدا کـە خوزاعـە سەرپەرشتی مەککەی دەکرد، عەمرو کوڕی لەحی ئایینی ئیبراهیمی گـۆڕی و خـۆی کردە ئەمیری کەعبە، بەو جـۆرە هـەر مالّێـك و هـەر گـەڕەکێك و هـەر هۆزێـك بـتی تایبەتی خۆی هەبوو.

## کەعبە دوای ئیسماعیل

ژنی دووەمی ئیسماعیل کچی سەرۆکی هۆزی جورهوم بوو، خـوای گـەورە لـەو ئافرەتە دوانزە کوڕی بەخشیە ئیسماعیل، ئیسـماعیل لـە تەمـەنی (١٣٧) سـالّیدا وەفاتی کرد، وەکو مەسعودیی دەلّێ، ئیسماعیل و ئیبراهیم دوو کەسی پیرۆز بوون لای هۆزی جورهوم و خەلکی ناوچەکە، هەرکات ئیـبراهیم دەهاتـە حیجـاز، سـەرۆك هۆزو بنەمالّەکان دەهاتنە خزمەتی و ڕێزی زۆریان بۆ دادەنا، بە مردنـی ئیسـماعیل

سەرپەرشتیاری کەعبەو زەمزەم کەوتە دەست کوڕەکانی، دوای ئەوان سەرۆك هۆزەکانی جورهوم سەرپەرشتییان کرد، چونکە خاڵوانی کوڕەکانی ئیسماعیل بوون، ئەوکاتە بنەماڵەی ئیسماعیل زۆر بوون، تەواو تێکەڵی هۆزی جورهوم بووبوون، پاشان سەرۆك هۆزی جورهوم باج و پیتاکی خستە سەر زیارەتکەرانی کەعبە، بەردەوام لە ڕێزگرتن و تازەکردنەوە و فراوانکردنی کەعبەدا بوون، لە هەموو لایەکی دونیای ئەو کاتەوە حاجی دەهاتن بۆ زیارەتی کەعبە، پاشان جورهوم لایاندا، خراپەیان دەکرد، ماڵ و سامانی کەعبەیان دەبرد، حاجیانیان زەحمەت دەدا، هەتا خوا مێرووله و شتی تری بۆ ناردن، ئافات رووی تێکردن، زۆریان لەناوچوون، وەك مەسعودیی باسی دەکات، پاشان کوڕەکانی ئیسماعیل یەکیانگرت، خۆیان رێکخست، هۆزی جورهومیان لە مەککە وەدەرنا، لەکاتی شکستیدا لافاو دای لە هۆزی جورهوم، سەرو ماڵیان تیاچوو [1]، پاشان سەرپەرشتی کەعبەو ناوچەکە کەوتەوە دەست کوڕەکانی ئیسماعیل، کەوتە دەستی ئیادی کوڕی نزاری کوڕی موعید، بەڵام جەنگی توندو درێژماوە لە نێوان موزیر و ئیاددا روویدا، بە سەرکەوتنی موزیر کۆتایی هات، ئیاد ناچاربوون لە مەککەوە کۆچ بکەن بەرەو عێراق [2].

پێشتر حیجاز وڵاتی عەمالیقەکان بوو، لەنەوەی عملیق کوڕی لاواز، دەوڵەت و دەسەڵاتیان بووە، جورهومیش لەوچینە بوون، کوڕی یەقتن کوڕی شالخ کوڕی ئەرفخشد بوون، وڵاتیان یەمەن بوو، لەگەڵ حەزرەموتی برایان بوون، ماوەیەك قات و قڕی دای لە یەمەن، بە دوای ئاوو لەوەڕدا هەڵهاتن بۆ توهامە، لە ڕێیان ئیسماعیل و دایکیان دۆزیەوە، لە نزیك زەمزەم هەڵیان داو دامەزران، ئیسماعیل لە ناو جورهوم دا زمانی گرت و گەورە بوو، کچێکی لێمارە کردن، بە داوای باوکی تەلاقیداو کچی براکەی هێنا، وە ژنی سێهەمیشی هەر لەو هۆزە هێنا، کە تەمەنی

---

[1] الازرقي، اخبار مكة، ص ٥٦.

[2] مروج الذهب، ج٢، ص ٥٥.

ئیسماعیل بووە ٣٠ ساڵ، ئیبراهیم هات و کەعبەیان دروستکرد، ئیبراهیم گەڕایەوەو مرد، خوا ئیسماعیلی بە پێغەمبەر نارد بۆ سەر جورهوم و عەمالیقەو یەمەن، هەندێ بڕوای هێناو هەندێ کافر بوون، پاشان ئیسماعیل مرد، هەر لەو ژورەی هاجەری دایکی تیا ئەسپەردە کرابوو، ئەمیش نێژرا، تەمەنی ١٣٧ساڵ بوو، کاری ئایینی دایە دەست (قەبزار)ی کوڕی، بەلام تەورات دەڵێ: ١٢ کوڕی بووە، دەسەلاتی دایە دەست (نابت)ی کوڕی، دوای ئەو بۆ (حەرس) کوڕی (فزاز)، پاشان دەستەلات دابەش بوو لە نێوان کوڕانی ئیسماعیل و خاڵوانی لە جورهوم، پاشان گەورەکانی جورهوم لایانداو دەستیاندایە ستەم، هۆزی سەبەء هاتن ویستیان لە مەککە هەڵبدەن، جورهوم نەیهێشت، منداڵەکانی عەدنان هەموو کۆچەری بوون، جگە قوڕەیش کە لە شاری مەککەو دەوروبەری نیشتەجێ بوون، تەبەری دەڵێ کە خەڵکی حەزەر شوعەیبی پێغەمبەریان کوشت، خوا وەحی نارد بۆ دوو پێغەمبەری جولەکە (ئیرمیاو ئەبرخیا) کە داوا لە بەختنەصر (نەبی خدنەصر ١١٥٧ پ.ز) پاشای بابل بکەن، کە ئەگەر پەلاماری عەرەب بدات خوا سەری دەخات، تۆڵە لە عەرەبی بیابان بکاتەوە، موعیدی کوڕی عەدنان هەڵبگرن ببەن بۆ خاکی خۆیان و لە لەناوچوون بیپارێزن، هەتا توشی خراپە نەبێت، چونکە لە پشتی ئەو پێغەمبەرێکی بەرێز دەردەچێ کە دوا پێغەمبەرە [1]، ئەوکاتە موعید دوانزە ساڵان بووە، هێرش کرا، موعید لەسەر بوراق هەڵگیرا، بردیان بۆ شاری حەڕان، شارێك لە خاکی کوردوستان، ئەو شارەی ئیبراهیم لە نزیك ئەوەوە لە دایك بوو، نوح پێغەمبەریش بە کەشتیەکەیەوە لەو نزیکە لەنگەری گرت، موعید فێری خوێندن و نووسین و کتێبی ئایینی ئەوان بوو، کە بەختنەصر چوە سەر عەرەب، عەدنان پێشی گرت، بەختنەسر هەموویانی کوشت، دەستکەوت و سەبایەکانی هێنا بۆ بابل، لە ناوچەی ئەنبار داینان، دوای ئەوە عەدنان مرد، ولاتی عەرەب بەکاولی مایەوە، چەند قۆناغی بەسەردا هات، بەختنەسر تیا چوو، موعید لە گەڵ پێغەمبەرەکاندا

---

[1] تاریخ ابن خلدون، عبدالرحمن ابن خلدون، ٧٣٢ ـ ٨٠٨ك ج٢ ص٣٥٨،دار الفكر، ٢٠٠٢م، بيروت

گەڕانەوە بۆ مەککەو حەجیان کرد، موعید گەڕا بەدوای دوو براکەی و ئامۆزاکانی لە نەوەی عەدنان، بیستی کە پەیوەندیانکردوە بە هۆزە یەمەنیەکانەوەو ژنیان لەوان هێناوە، بە لەدایکبوونی جورهوم گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان و، گەڕان بە دوای پاشماوەکانی ئەو نەوەیەی کە لە منداڵەکانی حەرسی کوڕی مزاری جورهومی جێمابوون، پێیان وتن کە جورهوم کوڕی جلهە ماوە، معانەی کچی لە موعید مارەکرد، نزاری کوڕی موعید لەدایك بوو[1]، هەرێمی نەجد شوێنی نیشتەجێی بنەماڵەی عەدنان بوو، هەموویان کۆچەری و گەڕۆك بوون، جگە قورەیش، کە لە ناو شاری مەککە نیشتەجێبوون، هەرێمی نەجد بەرزاییەکە لە نیوەدورگە، یەك مانگ ڕێ دەبێت، لە سەروی یەمەن و توهامەوە، تا حیجازو خواروی شام و عێراق و کوفە درێژ بوەتەوە، لەو نێوانەدا کۆچەرییان دەکرد، بەردەوام دەیاندا بەلای مەککەدا، وەك چۆن هاجەر هاتوچۆی بوو لە چەند مەترێکدا بۆ ئاو، هەتا زەمزەمی دەست کەوت، ئەمانیش لە چەند صەد کیلۆمەترێکدا لە گەرمیان و کوێستاندا بوون، بە دوای لەوەڕو ئاودا دەگەڕان، هەتا لای زەمزەمی هاجەر نیشتەجێبوون[2].

## خوزاعەو سەرهەڵدانی بتپەرستی

ئیادو نزار کوڕی موعیدن، دوای باوکی، ئیاد جێنشین بوو، نزاری دەرکرد، کە کاتی مردنی ئیاد هات، کاروباری دابەش کرد بەسەر منداڵەکانیدا، ڕەبیعەو موزیر و ئەنمار، موزیر سەرۆکایەتی مەککەی گرتە دەست، قورەیش نەوەی نەزر کوڕی کەنانەی کوڕی مالیك کوڕی نەزرە، بە نەزر وتراوە قورەیش، کە مەبەست بازرگانی یان بچوککراوەی حوتی قرشی دەریاییە[3]، شەڕ قەوما بەنوحارسەی خوزاعە زاڵ بوون، ئەوکاتە عەمرو کوڕی لحی سەرۆکیان بوو، جورهوم دەیانزانی لحی ئایینی ئیسماعیلی گۆڕی بۆ بتپەرستی، دەڵێن خوزاعە و کینانە پێکەوە دایان لە

---

[1] تاريخ ابن خلدون، عبدالرحمن ابن خلدون، ٧٣٢ ـ ٨٠٨ك ج٢ ص٣٥٧دار الفكر، ٢٠٠٢م، بيروت

[2] تاريخ ابن خلدون، ج٢ ص٣٥٨

[3] تاريخ ابن خلدون، ج٢ ص٣٩٠

جورهوم، جورهوم ناچار کرا هەڵبێن بۆ یەمەن، دوای ئەوەی بەردە ڕەشەکەو پارەو سامان و دیاری کەعبەیان لە ئاوی زەمزەمدا شاردەوە، هەندێ تر دەڵێن ئیاد کوڕی نزار جورهومی دەرکرد، پاشان شەڕ لە نێوان موزیرو ئیاد قەوما، ئیادیان دەرکرد و ئەوان بوون بەردە ڕەشەکەیان شاردەوە، ژنێك لە خوزاعە شاردنەوەی بەردە ڕەشەکەی بینی، بە مەرج نیشانیدان، لە دەستی خوزاعە مایەوە تا ئەبووغەبشان فرۆشتی بە قوصەی.

که ئیاد و موزیر، دوو کوڕی نزار شەڕەکەیان بوو، ئیاد کە زانی نزیکە شکست بهێنێ، بەردە رەشەکەی کەعبەیان برد، لە جێیەکدا لە ژێر خۆڵدا شاردیانەوە، ژنێکی خوزاعیی ئاگاداری ئەوەبوو، ئاگاداری هۆزەکەی خۆی کرد، خوزاعیەکان بە موزیریان وت کە ئەوان ئاگاداری بەردە رەشەکەن، ئەگەر ڕازیبن کە ئێمە سەرپەرشتی کەعبەبین، جێی بەردە ڕەشەکەتان پێدەڵێین، موزیر رازی بوون، سەرپەرشتیی کەعبە لەورۆژەوە درا بەخوزاعە[1]، ئیتر لێرەوە بتپەرستی هاتە کەعبە، عەمری کوڕی خوزاعە یەکەم کەس بوو کە بتێکی لە شام هێنا و لە کەعبە داینا، ئەم پیاوە بەرهەمی خوزاعە و جورهومە، ئەمیرێکی خوزاعە کچە میرێکی جورهومی هێنا، عەمری کوڕی خوزاعەی لێ بوو، ئەویش بۆ نەخۆشییەك دەچێتە شام، بتێك لەوێ دەهێنێ بە ناوی (هوبەل) لە پاڵ کەعبەدا دایدەنێ، پێشتر زۆر هەوڵی دابوو ببێتە ئەمیری ناوچەکە، بەڵام نەیتوانیبوو، هەتا لە ڕێی بتی هوبەلەوە ئەوەی دەستکەوت، بووە ئەمیری مەککە، دەسەڵاتی فراوان بوو، هەتا ئەو کاتە و لە سەردەمی نەفامییدا کەس ئەوەندە دەسەڵاتی نەبووە، جگە لە قوسەی کوڕی کیلاب و عەبدولموتەلیب، ئیتر لەوێوە زۆر لە هۆزەکانی عەرەب چوونە ژێر رکێفی، پێشتر ئاینی ئەو خەڵکە هەر ئەوەبوو کە ئیبراهیم و ئیسماعیل هێنابوویان، خەڵکی خاوبوونەوە و پشتیان تێکرد، عەمری کوڕی لەحی خوزاعی توانی داهێنراوێك لە خواپەرستییدا بکات، بیروڕایەکی نوێ بهێنێ، لەجێی ئاینی کۆن

---

[1] الكعبة، ص ٢٩.

دابینێ و ئاسانكاریی زۆریان بۆ بكات، بە تێپەڕبوونی ساڵ كارەكەی لای خەڵك ئاسایی كردەوە، ئیتر لەورێیەوە عەمر بووە حاكمی سیاسی ناوچەكە، لە ئایینی پاكی حەنەفی ئیبراهیمی لایدا، بتی زۆری هێنا كە (هوبەل) گەورەكەیان بوو، زۆر لە عەرەبە حەنەفیەكان نارەزایی و دەنگیان دژی ئەو داهێنراوە بەرزكردەوە، بەتایبەت هۆزی جورهوم دژی سەرۆكەكەیان وەستان، بەلام عەمرو بە هۆی دەسەلات و سیاسەت و سەربازو باری ئابوورییەوە ئەو دەنگانەی كپ كرد، هۆزی خوزاعە هەتا پێنج سەدە بەكاری بتپەرستییەوە خەریك بوون[1].

## قوصەی كۆكەرەوەی قوڕەیش

پاشان قوڕەیش بەش بەش بوون، هەندێكیان لە ناو مەككەدا نیشتەجێبوون، هەندێ هۆزی تریان لە دەرەوەی مەككە دەژیان، گەورەیان قوصەی كوڕی كیلاب بوو، كە لە ناویان شەرەف و نزیكی و ماڵ و سامان و كوڕی هەبوو، كلاب، قوصەی كوڕی لە یەمەن لای دایكی، فاتیمەی كچی سەعدی ئەسەدی جێهێشت، ڕەبیعە كوڕی حەرام كوڕی عوزرە كە هاتە مەككە، فاتیمەی ئەسەدی بێوە ژن بوو، مارەی كرد، ئەو كاتە قوسەی منداڵ بوو، قوصەی لە گەڵ خۆی هێنا بۆ مەككە، زوهرەی كوڕی كیلابی جێهێشت چونكە ئەو گەورەتر بوو، كە قوصەی گەورە بوو، ڕەچەڵەكی خۆی ناسی گەڕایەوە لای هۆزەكەی، ئەو كاتە كاروباری كەعبە لە دەست خوزاعەدابوو، ئەو كاتە سەرۆكایەتی خوزاعەو مەككە لە دەستی حەلیل كوڕی حەبەشی كوڕی سەلول كوڕی كەعب كوڕی عەمرودا بوو، ئەم كابرا حەبێ (حوبەیبە) ی كچی خۆی دایە قوصەی، لەم ژنە عەبدودارو عەبدولمەناف و عەبدولعوزاو عەبدولقوصەی لێ بوو، كە منداڵەكان بلاوبونەوە سامانی زۆر بوو، ناوی بلاوبوو، حەلیل مرد، قوصەی وتی هەر خۆم لە پێشترم بۆ سەرپەرشتی

[1] أبو الأنبياء، العقاد، ص٢٤١.

کەعبەو مەککەو خوزاعە و بەنی بەکر، قورەیش لێی کۆبونەوە، قوصەی وتی حەلیل وەسیەتی بۆ کردوم جێی بگرمەوە، بانگی هۆزە قورەیشیەکانی کرد لە دەوری کۆببنەوە، پاشان نامەی نارد بۆ ڕەزاحی برای، کە لە ڕەبیعەی باوکیەوە برای بوو، کە بە هەموو هێزو خزمانیەوە بێت بۆ مەککە بۆ سەرخستنی قوصەی، ئەو ماوەیە خوزاعە کاروباری کەعبەی بەڕێوە دەبرد، هەتا هۆزی قورەیش دەرکەوت و توانی خۆی کۆکاتەوە و ریزەکانی یەکبخات، قورەیش کوڕی نەزر کوڕی کەنانە بوون، قوصەی کوڕی کیلاب لای حەرەمدا کۆیکردنەوە، لەوێوە ناوی قورەیش هاتە ئاراوە، مێژوونووسان و زانایانی نەسەب و وەچە و پشتاوپشت، لەسەر ئەوە کۆکن کە قوصەی کوڕی کیلاب چوارەمین پشتی پێغەمبەرەو لە کوڕانی کەنانەیە، کە بنەچەی دەگەڕێتەوە بۆ عەدنان و لە کۆتاییدا دەگاتەوە سەر ئیسماعیل، فەرموودەی پێغەمبەر دەستنیشانی ئەوە دەکات دەفەرمووێ: "خوا کەنانەی لە ئیسماعیل هەڵبژارد، قورەیشی لە کەنانە هەڵبژارد، بەنی هاشمی لە قورەیش هەڵبژارد، منی لە بەنی هاشم هەڵبژارد، من چاکترین هەڵبژاردەکانم".

قوصەی کەسێکی وریاو بە تەماع بوو، ساڵی ١٧٠ پێش کۆچی، ٤٣٨ زاینی، حەبیەی کچی حەلیلی کوڕی حەبیشەی سەرۆك هۆزی خوزاعەی مارەکرد، سەرۆکاری کاروباری کەعبە و مەککەی دەکرد، قوصەی وا کاری دەکرد وەك یەکەم پیاوی مەککە، قوصەی لە خەودا بینی کە کاروباری کەعبە و مەککە لە خوزاعە و بەنی بەکر دەسەنێ، چونکە قورەیش لقی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمە، کەسایەتییەکانی قورەیش و بەنی کەنانەی بانگ کرد، داوای لێکردن کۆببنەوەو هەوڵ بدەن کەنانە و بەنی بەکر لە مەککە دەربکەن، هەموو ڕازیبون و لەسەر ئەوە بەیعەتیان پێدا، نامەی نووسی بۆ براکەی لە دایکەوە کە ناوی (رزاح کوڕی رەبیعە کوڕی حەرام)ە یارمەتیان بدەن لەو کارەدا، ئەویش لەگەڵ بنەماڵەو هۆزەکەی هاتنە مەککە، شەڕێکی قورس روویدا، کۆتاییەکەی ڕێکەوتن و ناوبژیوانی بوو،

مـاقولآن كۆبوونـەوە، دواى تـاوتوێى گرفتەكـە، بـەو بڕيارەگەيشـتن كـە قوصـەى كاروبارى كەعبە و مەككە بگرێتە دەسـت و لـە خوزاعـەيان سـەندەوە، بـەو جـۆرە قوصـەى يەكـەم منـاڵى كـەعب كـوڕى لوئـەى بـوو كـە بـووە پاشـا و گەلەكـەى ملكەچييان بۆ كرد، كاروبارى حەج و سيقايە (ئاودان بە حاجيان)و رفادە (خواردن ئامادەكردن و نانبدەيى)و نەدوە (سەرۆكايەتى كاروبارى دارنـەدوەو ڕاگۆڕينـەوە)و ليواو قيادە ( ئالآ هەڵگرو سەرۆكايەتى ناوچەكە)، كەوتە دەسـت قوصـەى، هـەموو شەرەفى مەككەى بردەوە، ئەويش كاروبارەكـەى بەسـەر چـوار بـەش لـە هۆزەكـەى دابەشكرد، تەبەريى لە بەرگى دووەمدا ئاواى دەگێڕێتەوە:

پـێش قوصـەى كـەس نەيـدەوێرا لـە دەوروبـەرى كەعبـە مـاڵ دروسـت بكـات و نيشـتەجێ بـبێ، بەتايبـەت لـە سـەردەمى خوزاعـە و جورهومـدا، بـەڵام كـە كـار يەكلابوويـەوە بـۆ قوصـەى، داواى لـە قـوڕەيش كـرد كـە لـە مەككـە خانوەكانيـان دروست بكەن، يەكەم كەس قوصەى بوو ساڵى ٤٤٠ى زاينى خـانووى (دارنـەدوە)ى دروسـتكرد، بـۆ كۆبوونـەوەو وتووێـژو بڕيـاردان، هـێمنى و ئاسـايش بـاڵى بەسـەر هەرێمەكەدا كێشاو بارودۆخى خەڵك ئارام و باش بوو، پەيوەنديى هۆزەكـان تونـدو تۆڵ بوو، كاروبارى حەج و بازرگانى برەوى سەند، مەككە بەتەواوى ناوى دەركـرد، شوێنى تايبەت بۆ بتەكان رێكخرا، لە هەموو لاوە خەڵك سەردانى كەعبـەو بتـەكانى دەكرد، كە ژمارەيان لە سێ سەد دانە زياتر بوو، كە لەسەر شێوەى مـرۆڤ و باڵـدار و گيانلەبەران و رووەك و شتى سەير دروستيان كردبوون، دەسـتە خـەڵك دانـرا بـۆ خزمـەتكردن و ئـاوگێڕان و خـۆراك ئامـادەكردن و شـوێنى خـەوو حەوانـەوەى حاجيەكان، ئەوانەى دەهاتنە حەجى كەعبە و سەردانى بتەكان، دەبوو رسـومات و باج و پيتـاك بـدەن، بەمـەش پارەيـەكى بـێ سـەرو بـەرو بێشـومار لاى زێوانـەكان كۆدەبوويـەوە، ئەمـە جگـە لـەوەى حاجيـەكان و زيارەتكـەران، كـەل و پـەل و پێويستى و خواردنيان دەكڕى و كرێى مانەوەيان دەدا، خەڵكى مەككەش بەرامبـەر ئەو دەستكەوت و بازرگانييە، پاراستن و هێمنى و ئاسايشيان بۆ خـەڵك دەسـتەبەر دەكرد، بتەكانى وەد و سەواع و يەغوس و يەعوق و نەسـر، ئەمانـە هـەر يەكـە بـە

هۆزێکەوە تایبەت و پەیوەست بوون، بتی تری گشتی خەڵکەکەش هەبوو کە زۆریەی هۆزەکان تیایاندا بەشداربوون، وەك لات و عوزا و مەنات، بەڵام بتەکانی قورەیش وەکو لات و هوبەل و ئەساف و نائلە کە هەر یەکەیان لە گۆشەیەکی کەعبەدا دانرابوو، هەندێ لە عەرەبەکان بڕوایان لاواز بوو کە ئەو بتە دارو بەردە بتوانن هیچ کاریگەرییەکیان هەبێت، بەڵام ئەوانیش نەیاندەتوانی گۆڕان و کودەتایەکی سنوردار دروستبکەن، چەندین سەدە گوزەراو ئەو بتانە هەر لە ناوو دەری کەعبەدا پایەدارو بەناوبانگ بوون، پەرستشێکی سەیرو نائاسایی دەکران، بەتایبەت لای عەرەبە دەشتەکیەکان، ئەوکارە، نەوە بۆ نەوە هات و چوو و گوازرایەوە، بێئەوەی بیری لێبکرێتەوە کە ئەمانە چی دەکەن و خەریکی چین و کڕنوش بۆ کێدەبەن، وایاندەزانی ئەوانە دەیانگەیەنن بە خوا، گومانیان وابوو کە دوعاو پەرستشی خۆیان راستەوخۆ ناگاتە خوا، دەیانگوت ئێمە تاوانبارین ڕوی لای خوامان نیە، دەبێ نێوان و واسیتەیەك هەبێ، کە ئەوانیش ئەم بتانەن، بیرۆکەی شەفاعەت بەشێکی سەرەکی ناخ و دەروونیانی داگیرکردبوو، کە گوایە ئەو بتانە دەتوانن شتێکیان لای خوای گەورە بۆ بکەن، هەر بۆیە هاوەڵیان بۆ خوا بڕیار دەدا، جگە لەمانە خەڵکێك هەبوو شارەزاو خاوەن عەقڵ و بیرو هۆش، دانیان بە خوای تاك و گەورەدا دەنا، کە خوایەکی تەواوو بە توانایەو زاڵە بەسەر زەوی و ئاسمان و ژیان و مردندا، پێغەمبەران دەنێرێ.

خەڵکە سادەکەش هەمان بڕوای بە خوا هەبوو، بەڵام وایان چووبووە خەیاڵ و دڵەوە، کە ئەوان لەوە لاوازترن بتوانن راستەوخۆ دوعا بکەن و بەندایەتیی خوا بکەن، هەر، بۆیە بە دەستی خۆیان بتانێکیان تاشیبوو، کردبوویانە نێوان و واسیتە و شەریکی خوا، هەتا لە خوایان نێزیك بکەنەوە و داواکانیان بگەیەنن. سوهەیلی دەڵێ: حەلیل کلیلی کەعبەی دایە حەبێی کچی کە ژنی قوصەی بوو، قوصەی بەو کلیلە کەعبەی دەکردەوەو دایدەخست بۆ خەڵك، قوصەی ئازاو بوێرو ژیرو بەسەلیقەو بەئاوەز بوو، خزمەکانی لەدەوری خۆی کۆکردەوەو کاری کەعبەی

لێ دابەش کردن[1]، کە ئالاو لیوای سوپاو قیادەو سەدانەو حجابەی بەیت و دارنەدوەو بەرگی کەعبە و رفادەو سیقایە بوو، دەرگای دارنەدوە لەسەر کەعبە بوو، پاشان کاری خزمەتکردنی حاجی و ئامادەکردنی خواردن و ئاوی خستە ئەستۆی خۆیان، وتی ئەوانە میوانی خوان و زیارەتکەرانی ماڵەکەی ئەون، لەسەر قورەیش فەرزە کە خەراجێك لە ماڵی دەربکات، هەتا هەموویان شەرەفی بەشداریان هەبێت لە خزمەتدا، حجابەو سیقایەو ڕەفادە و نەدوە و لیواو قیادە هی خۆی بوو، کە پیر بوو، سێ کوڕی هەبوو، (عەبدمەناف، عەبدوددار، عەبدوعوزا). عەبدوددار گەورەیان بوو، بەڵام کەسێکی لاواز و کەم خزمەت و دەرەتان و کەم دەسەڵات بوو، بەڵام عەبدولمەناف خاوەن دەسەڵات بوو، کەسایەتیەکی ناسراوو خاوەن شەرەف بوو، عەبدولمەناف و کوڕەکانی (عەبدوشەمس وموتەلیب و هاشم و نەوفل) بەدەسەڵاتترو شەریفتر بوون لە سەردەمی باوکیدا، بەڵام قوصەی کارەکانی دا بە عەبدولدار، پاشتر هەقی بۆ عەبدولمەنافیش کردەوە، ریفادە و سیقایەی دایە، ئالاو لیواو قیادەو حجابەو نەدوە لە دەستی کوڕانی عەبدوددار دا مایەوە، بەنوهاشم و بەنوعەبدولشەمس دەسەڵاتیان بەشکرد، ئەوانی تر هاوپەیمان بوون، بنەماڵەی موتەلیب هاوپەیمانی هاشم بوون، بنەماڵەی نەوفل هاوپەیمانی عەبدوشەمس بوون[2]، کاری ڕەفادە واتە خۆراك ئامادەکردن و بەخشین بۆ حاجییەکان، قوصەی کوڕی کیلاب دایهێنا، پاشان کوڕەکانی لەسەر ڕێ و ڕەچەی ئەو ڕۆیشتن، پاشان بووە سوننەتێکی پشتاوپشت، ڕەفادە پارەیەك بوو قورەیش هەموو وەرزێك لەپارە و سامان دەری دەکرد و دەیدایە قوصەی کوڕی کیلاب، ئەویش خواردنی پێ ئامادە دەکرد بۆ حاجییەکان، بەوانەی دەدا کە پارەیان نەبوو دەستکورت بوون، قوصەی ئەو پارەیەی فەرز کردبوو لەسەر قورەیش، کە کاتی دەهات دەیگوت: ئەی گرۆهی قورەیش ئێوە دراوسێی خوان و خاوەنی ماڵی خواو

---

[1] تاريخ ابن خلدون، ج٢ ص٤٠٠

[2] تاريخ ابن خلدون، ج٢ ص٣٩٢

حەرەمن، حاجیەکانیش میوانی خوان و هاتوونەتە ماڵەکەی، ئەوان لە پێشترن بۆ میوانداریی و ڕێزلێگرتن، خواردن و خواردنەوەیان لە ڕۆژانی حەجدا بۆ ئامادە بکەن، هەتا دەڕۆن، ئەوانیش بە گوێیان دەکرد، هەموو ساڵێك لە پارەی خۆیان شتێکیان دەردەکرد، دەکرا بە خۆراك[1].

قوصەی خاوەنی حجابە و سیقایە و ڕەفادە و دارنەدوە و لیواو بوو، قوڕەیش بە داوای قوصەی لە دەوری کەعبە خانوویان کرد، لە نێوان هەموو دوو خانوویەکدا کۆڵانێك هەبوو بۆ تەوافکەر.

قوصەی سێ کوڕی هەبوو، عەبدوددار، عەبدولمەناف، عەبدولعوززا، عەبدوددار گەورەکەیان بوو، بەڵام عەبدولمەناف بەناوبانگترینیان بوو، ڕێزی قوڕەیشی بۆ خۆی کێشکردبوو، قوصەی ویستی هەندێ لەو کەسایەتیەی کە عەبدوددار ونی کردبوو بۆی بسەنێتەوە، هەندێ پلە و پایەی بۆ دانا هەتا بچێتەوە ئاستی براکەی، قوصەی بە عەبدوددای وت: غەمت نەبێت دەتگەیەنمەوە بە هۆزەکەت، هەرچەند ئەوان کەسی تریان لا بەڕێزترە، کەس ناچێتە کەعبە هەتا تۆ دەرگاکەی بۆ نەکەیتەوە، قوڕەیش ناچێتە هیچ شەڕێکەوە هەتا ئاڵاکەی بەدەست تۆوە نەبێت، لە مەککە کەس ئاو ناخواتەوە هەتا لە ئاوخواردنەکەی تۆ نەخۆنەوە، خواردن ناخۆن جگە لە خۆراکی تۆ، قوڕەیش هیچ بڕیارێك نادات دەبێ لە ماڵی تۆدا بێت.

دوای مردنی قوصەی، عەبدوددار ئەو پلە و پایە گرنگانەی بەدەستەوە بوو، پاش خۆیشی بە دەست کوڕەکانیەوە بوو، بەڵام هەر زوو کوڕانی عەبدولمەناف کێبەرکێیان لەگەڵ کردن، کوڕەکانی عەبدولمەناف ناویان عەبدوششەمس و هاشم و موتەلیب و نەوفل بوو، وا خۆیان دەبینی کە لە کوڕانی عەبدوددار بەتواناترن، ئەم شانە خڕێیە بووە دابەشکردنی قوڕەیش، خەریك بوو ببێتە شەڕ، بەڵام هەردوولا ملیاندا بۆ ئاشتی، هەردوولا ڕازی بوون کە کوڕانی عەبدولمەناف سیقایە و

---

[1] الكعبة، ص ١١٥.

ڕەفادەیـان بەدەسـت بێـت، حجابـە و لـوا و سـەرۆکایەتی دارنـەدوە بـۆ کـوڕانی عەبدوددار بێت.

هاشمی کوڕی عەبدولمەناف سیقایە و ڕەفادەی بەدەست بوو، واتـە ئامـادەکردنی ئاوو خۆراك بۆ حاجیەکان لەکاتی حەجدا، وا ڕوویدا کە ساڵێکی قڕو وشـکە سـاڵیی بەسەر مەککەدا هـات، قـوڕەیش تەنگـەتاو بـوون، هاشـم دەسـتەو ئـەژنۆ دانـەما و نەزانیێ چی بکات، کاروانی پێکهێنا و ڕوویکـردە فەلەسـتین، بەشـێکی زۆر دۆشـاوو ئـاردی کـڕی و گەڕایـەوە مەککـە، نـانێکی زۆری دروسـتکرد و قوربانیـەکی زۆری سەربڕی و نانەکەی بۆ لەت لەت دەکردن بـە تریـت، وردی دەکـرد کـە پێـی دەڵێن (بهشم الخبز)، لەوەوە ناویان نا هاشم، لە جێگـەی ناوەکـەی خـۆی (عـەمرو)، بـەو کارە ناوبانگی لە نیوەدورگەدا دەرکرد.

کە قوصـەی مـرد، عەبدولمـەناف نـاکۆك بـوو لەسـەر ئـەو دەسـەڵاتانە، قـوڕەیش دوانزە هۆزبوون، بونە دووبەرەی ناکۆك، بەنوئەسەدو بەنوتـەمیم و بەنوحـەرس لـە گەڵ عەبدولمەناف بـوون، بەنوسـەهم و بەنوجـەمح و بەنوعـەدی و بەنومـەخزوم لـە گەڵ بەنی عەبدولدار بوون، بەنو عامرو بەنو محارب بیلایەن بوون، هـەموو پـەیمانی هاوپەیمانیان بۆ شەڕ مۆرکرد، ئیشوکار تێکچوو، پاشان داوایانکرد نێزیـك ببنـەوەو وتووێژێك بکەن، داوایانکرد دوو دوو هۆزە ناکۆکەکان کـە لیکنێـزیکترن ڕێکبکـەون، ئـەوە بـوو، سـقایەو ڕەفـادە درا بـە عەبدولمـەناف، حجابـەو لیـوا بـۆ عەبدولـدار، ناکۆکیەکە لەسەر دەسەڵات و شەرەف و خزمەت بوو، پاشان هاشم سـەر پـەرشتی بنەماڵەی عەبدولمەنافی کردو خزمەتی زۆری کرد، خواردن و ئاوی حاجیانی ئامادە دەکرد، کاری جوان و ڕێزی زۆری، خەڵکی سەرسام کردبوو، عەبدوشەمس خـەریکی بازرگانی شام بوو، هـەتا هـاتنی ئیسـلام بنەماڵـەی هاشـم سەرپەرشـتیاری مەککـە بوون، هاشم تریتی بۆ دەکردن، نانی دەوشیە گۆشتاوی گەرم بۆ حاجیـەکان، دوای ئەوەی لەسەر مقەڵی و تەنورو ئاگردان گەرم دەکرا، تریت لای عـەرەب خـواردنێکی خۆش و بەلەزەت بوو، وەك پێغەمبەر دەفەرموێ: فەزڵی عائیشـە بەسـەر ژنـەکانی تردا وەك فەزڵی تریتە بەسەر خواردنەکانی تردا.

## عەبدولموتەلیب دامەزرێنەری دەوڵەتی مەککە

هاشم لە غەزە لە شام مرد، عەبدولموتەلیبی لە دوا بەجێما کە لە یەسریب بوو منداڵ بوو، هاشم چوو بووە یەسریب لەوێ لە بەنی عودەی ژنی هێنابوو، کە پێشتر ژنی ئوحەیحەبوو گەورەی ئەوس، کوڕێکی لەو هەبوو بەناوی عەمرو کوڕی ئوحەیحەی، پاشان هاشم لەو ژنە عەبدولموتەلیبی بوو، کە پاشتر ناونرا شەیبە، هاشم لای ئەو جێی هێشت، تا گەورە بوو، موتەلیب لە یەمەن مرد، دوای ئەو عەبدولموتەلیب کاری گرتە دەست، رفادەو سیقایەی حاجی دەکرد، بوە وەفد بۆ لای پاشایانی یەمەن و ئەبرەهەی حەبەشە، وەفدێکی دەکەسی قورەیش بە سەرۆکایەتی عەبدولموتەلیب چون بۆ پیرۆزبایی بوون بەپاشای سەیفی کوڕی زییەزن[1].

هەمیشە لە نێوان حیجاز و یەمەندا کێبەرکێ و دژایەتی هەبوو لەسەر سەرکردایەتی و بازرگانیی، وەکو یەمەن خاوەن زەوی و ئاوی دەوڵەمەند بوو، چەندین دەوڵەت و شارستانی لێبەرهەم هات، هەروەها مەککەش بە هۆی رێگە بازرگانییەکەیەوە و هاتنی ئەو هەزاران حاجی و کڕین و فرۆشیەوە لە دەوری کەعبە، جار جار بالانصی هێزی بەلای خۆیدا کێش دەکرد، ئەمە خەڵکی یەمەنی ترساندبوو، هەر، بۆیە چەندین جار بیریان لە کاولکردنی کەعبە و مەککە دەکردەوە، هۆزی (توببەع) لە یەمەن بەرەو مەککە دەرچوون بە مەبەستی کاولکردنی کەعبە، بەڵام کە گەیشتن و ئەو پیرۆزییەیان بینی، بەرگ و پۆشاکیان بۆ کەعبە کرد و قوربانییان بۆ سەربڕی[2].

کوڕەکانی عەبدوددار و عەبدولمەناف و کوڕەکانی قوصەی ناکۆکییان هەبوو لەسەر دەسەڵاتی مەککە، کە دواتر بووە هۆی پارچەبوونی قورەیش، پاشان

---

[1] تاريخ ابن خلدون، عبدالرحمن ابن خلدون، ٧٣٢ ـ ٨٠٨ك ج٢ ص٧٤.

[2] الكعبة، ص ٤٠-٤١.

ڕێکەوتن کە عەبدولمەناف سیقایە و ڕیفادە بکات، حیجابەو لیواو دارنەدوە لای بەنی عەبدوددار بێت.

هاشمی کوڕی عەبدولمەناف چاك کاری ڕفادە و سیقایەی حاجیەکان و کەعبەی دەکرد، سالآنە هەندێ پارەی لە قوڕەیشیەکان دەسەند بۆ پەیداکردنی خۆراك و ئاو بۆ حاجیەکان، ئەو یەکەم کەس بوو کە کاروانی زستان و هاوینی دروستکرد، پاشان موتەلیب دوای هاشمی برای سیقایە و ڕیفادەی حاجیەکانی جێبەجێکرد، کە پیر بوو هەردووکی دایە عەبدولموتەلیبی برای.

لە سەردەمی عەبدولموتەلیبدا ناکۆکیی و جیابوونەوەیەك لە نێوان هەردوو بنەماڵەی بەنیهاشم و بەنی ئومەییەدا ڕوویدا، کە دواتریش لە سەردەمی ئەمەویەکاندا هەر ئاسەواری مابوو، حەربی کوڕی ئومەییە ئیرەیی توندی بە عەبدولموتەلیبی کوڕی هاشم دەبرد، ئەو دوژمنایەتیە بووە هۆی دوکەرتبوونی قوڕەیش، ناچاربوون پەنا بەرنە بەر ناوبژیوان وەك دابێکی عەرەبی کۆن، هەموو ڕازی بوون کە نەفیلی عەبدولعوززا ناوبژیوانی بکات، ئەویش بڕیاری دابوو بۆ عەبدولموتەلیب باپیری پێغەمبەر کە کاروباری خۆی بکات، لۆمە و سەرزەنشتی حەربی کوڕی ئومەییەی کردو وتی ئەی ئەبا عەمر ئایا هەلدەچی بە ڕووی کەسێکدا کە لە تۆ بەرزترو مەزنترە لە هەیبەت و کەسایەتیداو، لە تۆ پیاوترە، کەمتر لە تۆ لۆمەی لەسەرە و منالی لە تۆ زۆرترەو.. چەند وتەیەکی تر، وەکو ئیمامی تەبەری لە مێژووەکەیدا باسی دەکات[1].

حکومەتی مەککە پشتاوپشت بوو، قوڕەیش یەك سەرکردەی هەبوو کە هەموو لایەك ملکەچی بوون، ئەم حکومەتەی قوڕەیش لە عەرەبستاندا نموونەی نەبووە، هەر هۆزە سەرۆکێکی هەبوو کە هۆزەکەی بە گوێیان دەکرد، هەموویشی ملکەچی دەسەلآتی مەککە بوون، یاساو دامەزراوەی هەبوو، ئارامیی کەعبەو ناوچەکەی دەپاراست، پێویستی بە کەسێك هەبوو کاروباریان بەڕێوە بەرێت.

---

[1] تاريخ الطبري، ج٢، ص١٤.

لە سەردەمی عەبدولموتەلیبدا مەککە شێوەی دەوڵەتی وەرگرتبوو، توانای پەیوەندیکردن و، بەستنی ڕێکەوتنی سیاسیی و ئابوریی لەگەڵ دراوسێکاندا هەبوو، کە دەچووە چوارچێوەی داننان بە دەوڵەتی قورەیشدا، کە یەکەیەکی سیاسیی و خاوەن کیان و سیاسەت و ئابووریی سەربەخۆی خۆیەتی، ئەمە دەسەلاتی باپیرانی محەممەدە کە دکتۆر جەمال دەیەوێ تانەی لێبدات.

هاشم لەگەڵ ئیمپراتۆری ڕۆمانی و ئەمیری غەساسینەدا هاوپەیمانی لەسەر ڕێزگرتنی دراوسێیەتی و چاکە مۆرکردووە، ئیمپراتۆر ڕازی بوو ڕێگە بدرێت بە بازرگانەکانی قورەیش کە هاتوچۆ بە خاکی ئیمپراتۆردا بکەن، عەبدوششەمس هاوپەیمانییەکی بازرگانیی لەگەڵ نەجاشی حەبەشەدا مۆرکرد، نۆفل و موتەلیب هاوپەیمانییەکی سیاسیان لەگەڵ دەوڵەتی فارسداو، هاوپەیمانییەکی بازرگانیی لەگەڵ دەوڵەتی حەمیریدا لە یەمەن مۆرکردبوو[1]، ئەم پۆستە بەرزانە ناودارەکانی قورەیش وەریاندەگرت، کەش وباریان بۆ خەڵکی دەسازاند بۆسەردانی مەککەو حەجکردن، یارمەتی ستەملێکراویان دەداو دادپەروەرییان بلاودەکردەوە، هەروەك شوێن و ئاوو خۆراك و ئاسایشیان بۆ میوانەکان و حاجیەکان دەستەبەر دەکرد، سیقایە و ڕەفادە لەبەرزترین پۆستەکان بوو، ڕەفادە واتە ئامادەکردنی خواردەمەنی بۆ حاجیەکان، قورەیشیەکان هەموو پێکەوە یاریدەیان دەدا بۆ ئەو ئامادەکردنە، عەبدولموتەلیب سیقایە و ڕەفادەی بەدەست بوو، چونکە لە بەنی عەبدولمەنافە، بەلام کوڕانی مامەکانی واتە بەنوعەبدوددار حجابە و لیواو دارنەدوەیان بەدەست بوو وەك باسکرا، هەرچەند لەرووی فەرمییەوە بنەماڵەی عەبدوددار دارنەدوەیان دەبرد بەڕێوە، بەلام هەر عەبدولموتەلیب رابەری ڕۆحیی و سەرۆکی قورەیش بووە، دارنەدوە بۆ بەڕێوەبردن و تاوتوێکردنی باس و گرفتەکان و شوێنی بڕیاردان بوو، دەکەوتە باشووری ڕۆژئاوای کەعبەوە، ساڵی ٤٤٠ی زاینی قوصەی دروستی کردبوو، گرنگترین کۆبوونەوەی عەبدولموتەلیب، ئەو

---

[1] الطبری، ج٢، ص١٢و، الكعبة، ص٤٣-٤٤.

کۆبوونەوەیە بوو کە ساڵی ٥٧٠ ی زایینی لە دارنەدوە بە سەرکردەکانی قورەیش کردی، بۆ قسەکردن لەسەر هێرشی ئەبرەهە بە سوپای حەبەشەوە بۆ گرتنی مەککە و رووخانی کەعبە، هەرکەس ستەمێکی لێبکرایە و پەنای ببردایەتە دارنەدوە، دەیانپاراست، هەموو گرفتێکیان چارەسەر دەکرد، هەر لەوێشدا قورەیشیەکان بڕیاریاندا لە شەوی کۆچکردنی پێغەمبەردا بۆ یەسریب بیکوژن.

بەو جۆرە قورەیش لەناوچەکەدا وەك دەسەلات و حکومەت دانسی پیانرابوو، شکستی ئەبرەهەیش لە مەککەدا ئەوەندەی تر ناوی مەککە و مەزنیی و پیرۆزیی بەرزکردەوە، هەستیان دەکرد دەستی خوا لە پاراستنی ئەو ناوچەیەدا هەیە، سەرچاوە ئیسلامیەکان بە زۆری وایانگەیاندووە کە سەردەمی نەفامیی، واتە هیچ بیرۆکەو عەقڵیەت و سیاسەت و داب و نەریتێکی جوانیان نەزانیوە، هۆزەکان درندانە دوور لەیەك ژیاون، بەڵام لە ڕاستیدا وا نەبووە، بەڵکو یاسا و بڕیارو گەورەو داب و نەریتیی جوانیان بووە، هەموو پێوەی پابەندبوون، ئەوان لە بنچەرستیدا نەفام بوون، هەندێ ڕەوشتی نزمیان بووە، هەوڵێکی گەرم هەبووە بۆ لەیەك نێزیککردن و لەیەکگەیشتنیان، نەسەب پاریزیی و خزمایەتی بوو بووە هاوپەیمانیەکی پتەو بۆیان.

قورەیش بەراستی دەوڵەتێکی کۆمارییان دروستکردبوو، مەککە پایتەخت بوو، خاوەن پیرۆزیی و ڕێز و پارێزراو بوو، جاحز باسی زۆر ڕەوشتی هۆزی قورەیش دەکات کە لەهۆزەکانی تر بانتر و پلەبەرزتر بووە، وەك سەخاوەت و دەستبلاوی و نانبدەیی و، تێگەیشتووترو خاوەن بیروهۆشێکی کراوەو سیاسیی و بە تەدبیرترو ڕەوشت جوانتر و خاوەن مێژوو بوون.

قورەیش هۆزێکی بازرگانی بوون، بۆ پاراستنی کاروانەکان و بازرگانیەکەیان، هەوڵیان دەدا شاری مەککە ئارام و هێمن و، ڕێگای کاروان و حاجیان و بازرگانی پارێزراوو سەلامەت بن، مەککە لەناوەڕاستی ڕێگەی شام و یەمەندا بوو، ئاوی زەمزەم کاروانەکانی ناچار دەکرد لابدەن بحەوێنەوەو ئاو هەڵگرن، قورەیش ڕێزی کاروانچیانیان دەگرت و دەیانپاراستن، قورەیش دوو سەردان و کاروانی هەبوو، لە زستاندا بۆ یەمەن و لە هاویندا بۆ شام، لەو ڕێو بانەدا چەتە لە مەککەیەکانی

نەدەدا، ئەمین و ئەمان بوون، چونکە بەلایانەوە خەڵکی مەککە پیرۆز بوون، بەلآم چەتە خەلکی تریان دەفڕاند و ڕوتیاندەکردنەوەو تالآنیان دەکردن، تەنانەت مەککە ئەمین و ئەمان بوو، حەرامبوو تیایدا شەڕ و کوشتار و راوڕووتکردن هەبێت.

هاشم کوڕی عەبدولمەناف کاروانی زستانەو هاوینەی داهێنا، عەبدولموتەلیبی کوڕیشی گرنگی پێداو فراوانی کرد، خەڵکەکەی پێدەوڵەمەند بوو، چاوو گوێیان بە رووی جیهاندا کرایەوە، ئەو بازرگانیی و سیاسەت و رێککەوتنانە، کە هاشم لەگەڵ فارس و رۆم و نەجاشی و غەساسنە و حەمیریەکانی یەمەن کردی، قوڕەیشیەکانی وەك بازرگان و ناوکۆیی و باربەری کاروان و بازرگانیی ناساند، بەو جۆرە شارستانیی قوڕەیش پەرەی سەندو مەککە ناوی بەرزبوو، هاشم لەگەڵ کەلوپەل و ولآخی خۆی، کەلوپەل و ولآخی قوڕەیشیەکانی تری دەخستە کاروانەکەیەوە و، لە قازانجەکاندا بەشی هەموو لای دەدا، کاروانی گەورەیان دەنارد بۆ شام و یەمەن و، باری بازرگانەکانی تریشیان دەگواستەوە، هاشمیان ناونابوو داگیرکاری بازرگانیی شام، واتە دەستی گرتبوو بە سەر بازرگانیی ناوچەکەدا، کوڕەکانیشی هەمان شێوازیان دەکردو برەویان پێدەدا، کارەکەیان دابەش کردبوو، هاشم بۆ شام، عەبدوششەمس بۆ حەبەشە، موتەلیب بۆ یەمەن، نۆفل بۆ فارس، جموجوڵی بازرگانیی ئەم چوارەی دەوڵەمەند کرد، کاروانیان دەگەیشتە عێراق و حەزرەمەوت و عوممان و بەحرەین و شام و میسرو یەمەن، سەرەتا یەمەنیەکان زاڵ بوون بەسەر بازرگانیەکانی ناوچەکەدا، بەلآم رووخانی بەنداوی مەئرەب و داڕووخانی شارستانیەکەیان، ئیتر لەسەدەی شەشی میلادیەوە قوڕەیشیەکان زاڵبوون بەسەر ئەورێگا بازرگانیانەی لەشامەوە دەچوو بۆ زەریای هیندی، یەکێکیان دەچوو بۆ حەزرەمەوت و عوممان و بەحرەین، ئەوی تریان دەچوو بۆلێوارەکانی دەریای سوور.

لەسەردەمی عەبدولموتەلیبدا حەبەشیەکان سەرکەوتن بەسەر یەمەنداو دەوڵەتی حەمیرییان رووخاند، قوڕەیشیەکان سوودیان لەرووخانی حەمیریەکان وەرگرت، لە رووی بازرگانیەوە جێی ئەوانیان گرتەوە، قوڕەیشیەکان لە سەردەمی

عەبدولموتەلیبدا کەلوپەلی یەمەن و حەبەشەیان دەکری و دەیانگواستەوە بۆ بازارەکانی فارس، چونکە بازرگانیی فارسی بە دەست عەرەبەکانی ئەمارەتی حیرەوە بوو، شەڕی توندو خوێناوی فارس و ڕۆم یارمەتی زۆری قورەیشیەکانی دا بۆ ئەو ناوچانە.

(ئۆلیدی) مێژوونووس لە کتێبی (الجزيرة العربية قبل محمد) دەڵێ: "ڕۆمەکان خان و بنکەی بازرگانییان لە مەککەدا هەبوو، دوو کاریان دەکرد، کاری بازرگانی ئاسایی، کاری سیخوڕیی بەسەر عەرەبەکانەوە، هەروەك لە مەککە خانوو و بنکەی بازرگانیی هەبوو، کە کاروباری بازرگانیی وڵاتەکەیان ڕێکدەخست، حوشتر، کەشتی بیابان بەیارمەتی خاوەنەکانیان، دەریای بێ پەیی بیابانی گەرمیان پەیدەکرد، هەمووجۆرە بازرگانیەکیان دەکرد، هەموو پارەکەیان خستبووە کڕینی وشترو مەڕو قوماش و ئاسن و جلوبەرگ و بۆن و بۆیەو ئاڵتون و خوری و حەریرو شتی تر".

بەو جۆرە مەککە لە ڕووی ئاینیی و بازرگانیەوە پێشکەوت، ناوی چووە ریزی شارەکانی یەمەن و میسر و شام و عێراق، کەسی بازرگان دەبێت ئاگاداری کاروباری سیاسی و بازرگانیی ناوچەکە بێت، هەر بۆیە ئاگاداربوون بەسەر پەیوەندیی و سیاسەت و ئابووریی دراوسێکانیان، مەککە کەسایەتی بە توانا و خاوەن ئەزموونی هەڵخست لە ڕووی بازرگانیی و سیاسەت، شارەزابوون لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان، خەڵکی مەککە فێری جۆرەها کێشانە و پێوان و شایەن و ترازوو بوو بوون، جۆرەها عوملە و عقود و قەباڵە و و پول و سکەی وڵاتانیان دەناسی و کاریان پێدەکرد، قورەیشیەکان لە بەندەری جدە، کە چل میل لە مەککەوە دوورە، بازرگانییان دەکرد، چەندین بەلەم و کەشتییان هەبوو، قورەیشیەکان زانیاریان لە سەر جۆرەها شارستانیی و دەوڵەتداری دوورو نزیك هەبوو، توانای وەرگرتنی بنەماو مامەڵە و وەرگرتن و دانەوەیان هەبوو، سوودی زۆریان لە شارستانی فارس و ڕۆم و میسر و حەبەشە و یەمەن بینی، شارستانی هیندو چینیان لە ڕێی کەلوپەل و بازرگانەکانی ئەوانەوە دەناسی، تێکەڵیان دەکردن و زانیاریان دەگۆڕیەوە، زۆر وشەی مامەڵە و فەرهەنگی بازرگانی و

سیاسی و ئایینی و کۆمەلأیەتی ئەو زمانانەیان وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی، رۆشنبیریی و زانیارییان زیادی کرد، زۆر لە عەرەب و خەڵکی مەککە خوێندن و نووسین و حیساب و کیتاب و ژمارەیان دەزانی، ئەمانە هەموو بنەما و یاریدەدەرێکی بەهێزبوون بۆ کاروباری دەوڵەتی ئیسلامی ئایندە.. سەردەمی عەبدولموتەلیب (باپیری پێغەمبەر) پێشکەوتووترین و ئارامترین سەردەم بووە، کە تا ئەوکاتە نیوەدورگە بە خۆیەوە نەیدیبوو، لە سەردەمی ئەمدا هیچ جەنگێکی نێوان هۆزەکان روونەدا، ئەگەر ناکۆکییەك روویبدایە، پەنایان دەبردە بەر ناوبژیوان و رێککەوتنی ئاشتیانە.

دارالنـدوە وەکو پەرلەمان و دەزگاو بارێکی دیموکراتی و دەرکەوتەیەکی رۆشنبیری وابوو، لە کارە گرنگ و کێشە گەورەکاندا دەچوونەوە دارالندوە و باسەکانیان تاوتوێ دەکردو بریاریان لەسەر دەدا، ئەوان لە زانستی رەچەڵەکدا زۆر شارەزا بوون، هەموو کەس پارێزگاری لە رەچەڵەك و پاکیی و خاوێنی خوێنی دەکرد، شارەزای ئەسپ سواری و چەك و هونەری جەنگ بوون.

ئەو شاعیرانەی کە لە سەردەمی بە ناو نەفامیدا هەبوون، لە ئیسلامدا نموونەیان هەڵنەکەوت، هۆکەی ئەوەبوو کە قورئان لێوان لێوبوو لە حیکمەت و بەلاغەت و هەموو سنورەکانی تێپەڕاند، خەڵك لە ئاستی ئەودا زمانی بەسترا، حیکمەت و پەندی پێشینان و قسەی نەستەقیان عەقڵ نایبڕێت، لە شیعرو بەلاغەتدا دوا پلەیان بڕیبوو، ئەوەندە دووربین بوون، لە دانایی و بەڵەدبون و رێدۆزینەوەو پێشبینی و هەواڵدانی ئایندەو پاشەڕۆژدا بێ وێنەبوون، ئەم مەزنیی مەککە و، بەرز و پیرۆزیی کەعبەیە، کە لە هەموو لاوە عەرەبەکان دەهاتنە زیارەتی و داهاتی بێشوماریان بۆ دەهێنا، بووە هۆی ئیرەیی پێبردنی دەرو دراوسێ و چاوچنۆکان، بەناوبانگترینیان هێرشەکەی ئەبرەهە بوو.

مێژوونووسی ئەڵمانی (فلوهوزن) باس لە پێشکەوتنی خەڵکی مەککە و حیجاز دەکات و دەڵێ: "قورەیش و خەڵکی مەککە، لە هەموو روویەکەوە لە خەڵکی ناوچەکە پێشکەوتووترو بەرزتربوون، لە رووی رۆشنبیریی و پەیوەندیی چاك

لەگەڵ دراوسێکان و بازرگانیـەوە، لەهـەموو هۆزەکـانی تـری عـەرەبی نیوەدورگـە شـارەزاتر بـوون، خوێنـدەوارەکانی پـێش ئیسـلام زۆربـەی هـەرە زۆریـان خـەڵکی مەککە بوون".

قورەیش بووە رەمزو نیشانەی ئاشتی و هێمنی بنەماڵە لە مەککەدا، حەزکردن لە خۆشیی و شادیی و سەفەرو سوارچاکیی و راوو شکارو سەخاوەت و خزمـەت و خزمایەتی، کاری هەمیشەیی بنەماڵەکانی قورەیش بوو، هـەموویان پشـت و پـەنای یەکبوون، هەر لە بنەماڵەی پێغەمبەردا، پێغەمبەر و عەبدوڵلای بـاوکی و مامـەکانی هەموو سەردانی شامیان کـردووە، عەبدولموتـەلیب جگـە لـە چـەند جـار سـەفەری شام، بۆ پیرۆزبایی دەسەڵاتی پاشای یەمەن زی یەزن، سەردانی یەمەنی کـرد، خـۆ رەنگە ئەوە چەندەهەمین سەفەری بوو بێـت، بـەڵام ئێمـە هـەر ئەوانـە دەزانـین کـە پەیوەندی بە رووداوو هەواڵ و کێشە و گرفتێکەوە هەیە، بێگومان هەموو کاروانێـك بۆ یەمەن و شام و عێراق و میسر و حەبەشـە، دەیـان کـەس لـە خـەڵکی مەککـەی تیابووە، کاروان و قاترو قافلە بەردەوام رۆژو مانگ و بەدرێژایی ساڵ، لە زسـتان و هاویندا راوەستانی نـەبوو، لـە نـاو مەککـەدا جالیـاتی جولەکـە و گـاور و سـوری و میسـری و حەبەشـی و رۆمـی و فارسـی هـەبوون، زۆریـان خـەریکی پیشەسـازی و وەستایی و کاری هونەری بوون، هەندێکیش لە ترسی چەوسانەوەی دەسەڵاتدارانی ناوچـەکە هـەڵاتبون و لـە مەککـە خۆیـان مەڵاسـدابوو گیرسـابونەوە، لـە مەککـەدا خانووی بەرز و چاك و جوان هەبووە.

فلـهاوزن دەڵـێ: حەبەشـی زۆر لـە مەککـەدا هـەبوون، هاوپـەیمانی سیاسـیان لەگـەڵ قورەیشـدا هـەبووە، بـەڵام (لامـانس)ی رۆژهـەڵاتناس لای وایـە کـە ئـەو حەبەشیانەی ناو مەککە زنوج و کۆیلە بـوون و کاریـان پێدەکردن، رەنگـە نیـوەی ئەو قسانە راستبێت، چونکە دەبێ حەبەشیەکان لەگەڵ ئەو شـارە دراوسـێ مەزنـە پیرۆزە بازرگانییە، پەیوەندیی بازرگانیی و سیاسیی و بنکەی بازرگانیـان بووبێـت. هـەروەك عەبدولحەمیـد عیبـادی لـە (صـور مـن التـأريخ الاسـلامي)دا دەڵـێ: ئـەو حەبەشیانە هەنـدێکیان عـەرەب بـوون، ئەوانـەش کۆیلـە بـوون حەبەشـی نـەبوون،

قوڕەیشـییەکان وەك کرێکـار و خزمـەتکار و سـەربازی جـەنگیی کـەڵکیان لـێ وەردەگرتن[1].

سـەردەمی عەبدولموتـەلیب، مەککـە لـەو پـەڕی شارسـتانی و پێشـکەوتن و بازرگانی و پارەدارییدابوو، مێژوونووسان باسی مەزنیی کەسایەتی عەبدولموتـەلیب دەکەن، هەروەك چۆن هاوچەرخەکانی دانیان بە زەعامەت و سـەرکردایەتیی ئـەودا نابوو، توانی ئاشتیی ناو شاری مەککە بپارێزێ، هەموو هۆزەکان لە پـاڵ یەکدا بـە هـێمنی دەژیـان، گەشـەی بـە بازرگـانیی و ئـابووریی و خۆشـگوزەرانی و بەرزکردنەوەی ئاستی خەڵك دا، پیشەسازیی و زانستیی و ڕۆشنبیریی خـەڵکیی لـە پەرەسـەندندا بـوو، پەیوەنـدیی دبلۆماسـیی لەگـەڵ هـۆزو میرنشـین و دەوڵەتـە دراوسـێکاندا بـەهێزکرد، مەککـە، دوای رووخـانی دەوڵـەتی حـەمیری لـە باشـووری یەمەن، دوای لاوازبوونی حیرە لە عێراق، دوای گـەرمبوونی شـەڕی نێـوان فـارس و ڕۆم، بووە مەڵبـەندێکی بازرگانیی و ئایینی، بەردەوام حـاجی و کـاروانی بازرگـانیی بەڕێوەبوون، ڕێ و بانیان قەرەباڵغ کردبوو، هەتا دەهات پلە و پایـەی ناوچـەکەش بە هۆی ئـەوەوە لـە بـەرزی و شـکۆمەندی و ناوداریـیدا بـوو، بەتایبـەتی کـە بـیری زەمزەمی لێدا و ئەبرەهە شکا، بەردەوام خواردنی حاجیەکانی دابین دەکرد، ئـاوی تەواوی ئامادە دەکرد، بەشـداریی دارالنـدوەی دەکـرد، پـارەی لـە خـەڵکی مەککـە کۆدەکردەوە بۆ ئامادەکرنی خواردن و ئاو بۆ حاجیەکان و کڕینی بەرگی حەریر بۆ کەعبە، دادپـەروەربوو، هۆزەکـانی ڕێکخسـتبوو، هەنـدێ لـە مێژوونووسـان لـەوەدا هەڵـەن کـە دەڵـێن ئەوکاتـە چـەرخی بـەرەڵڵایی و شـڵەژان و سەرلێشـیوان بـووە، هیچیان لـە بـارەی ژیـان و گـوزەران و دەرو دراوسـێوە نـەزانیوە، کۆڕی شـیعرو حیکمەت و بەلاغەتیان نەبووە، ئاگاداری هـێمنی و ئاسایشـی ژیـان نـەبوون، بـەڵام قوڕەیشێك، ئـەو هـەموو کـاروان و سـەردان و بازرگـانیی و حـاجی و هاتوچۆیەیان بوویێ، کە بە دەوری مەککەدا بابلی و ئاشووری و ئارامی و کەنعانی و فیرعەونی و

---

[1] الكعبة، ص ٦١.

موعینی و سەبەئی و، پاشتریش فـارس و رۆم و یەمـەن و بـەحرەین و حەبەشـە و میسـر هـەبووە، بێگومـان خـاوەن ژیـری و بیرکردنـەوەو هونـەرو شارسـتانیی و رۆشنبیریی و شارەزابوون، خەڵکی مەککە پول و پارەیـان کۆنـەدەکردەوە، بـەڵکو دەیانخسـتە جۆرەهـا بازرگـانیی و شـەراکەت و پـرۆژەوە، جـاری وا بـووە قافڵـەی مەککە خۆی داوە لە هەزار و پێنجسەد حوشتر و سێ سەد پیاویان لەگەڵدا بووە [1].

مێژوونووس (فلهاوزن) دەڵێ: ئەم پێشکەوتنەی خەڵکی مەککـە پەیوەنـدیی بـە کەعبە و بازرگانیی و شوێنی جوگرافیەوە نییە، بەڵکو پەیوەندیی بە خەڵکەکەیەوە هەبوو، کە جۆرەها رەنگ و شـێوە لـە شارسـتانیان بینیـوە، شـارەزای خوێنـدن و نووسین بوون، مەکیەکان لە هەموو هۆزە کۆچـەرییە دەشـتەکیەکان پێشـکەوتووتر بوون، تەنانەت لە خـەڵکی یەسـریبیش پێشـکەوتووتر بـوون، کـە هـەر لـە قۆنـاغی کشتوکاڵدا بوون، خەڵکی مەککـە شـارەزای جۆرەهـا خزمـەتی نـاو شـار بـوون، لـە پاکوخاوێنی و رێکخستنی رێ و بان و ناوشار و موڵکیەتی عەقاری، لەسـەر شـاخە بەرزەکان ئاگری گەورەیان دەکردەوە، بۆ رێنیشاندانی کاروانە رێ لێتێکچووەکان، چوار مـانگی حـەج، شـەڕو هـەرا تیایانـدا حـەرام بـووە، پـێش حـەج، رێ و بـان و شەقامەکان خۆشدەکرا، کاڵاو کەلوپەلی پێویست لەسەر جادەکـان ئامـادە دەکـرا، خەڵکیی سوودیان لەو حەرامی شـەڕو هێمنیـە وەردەگـرت، دەهـاتن بـۆ کاسـبی و کڕینی پێویستی، بازاڕی عوکازی ناو شاری مەککە لە مێژوودا بەناوبانگە، دەبوویـە شانۆی ئەدەب و شیعر، هۆزەکـان شـاعیرو ئەدیبـەکانیان بـۆ دەهێنـاو، کێبڕکـێ و شـەڕە شـیعرو وتارخوێنـدن و، دەرخسـتنی ئەوپـەڕی هێـزی زمـان و بەلاغـەتیان نیشاندەدا، کەسێ دیاریی دەکرا هەتا سەرپەرشتی ئـەو کۆڕانـە بکـات و، نـاکۆکیی نێوان شاعیران نەبێتە هۆی شەڕو هـەرای هۆزەکـان، زۆر لـە شـیعرەکان وەسـف و هەجوو ناوناتۆرە بوو لە یەکتر، کە خەڵك لـە کـڕینی پێویسـتی و سـەردان و کـۆڕی

---

[1] الادارة العربية، س.م.ق. حسيني، وەرطێڕ بۆ عەرەبي د. ابراهيم احمد العدوي، سلسلة الف كتاب، القاهرة.

شـاعیرەکان دەبوونـەوە، کـاتی حـەج دەهـات، دەسـتدەکرایە مەناسـیکی حـەج و دەگەڕانەوە بۆ ناوچەکانیان، هـەر گـەڕەکێك چـاڵێکی هـەبوو بـۆ زبـڵ و خاشـاك و پاشەڕۆی ولاخەکانیان.

یـەکێکی تـر لـەو شـتانەی کـە ناوبـانگی عەبدولموتـەلیبی زڕانـد، دووبـارە هەڵکەندنەوەی بیری زەمزەم بوو، کە هەتا ئەمڕۆ ماوە، بەو کارە نـاوی بـە هـەموو نیوەدورگەدا بڵاوبوویەوە، مەککە هەمیشە لە بەردەم هەڕەشەی بـێ ئاویـدا بـووە، هەنـدێکجار وشـکە سـاڵیی لێـی داوە، ئەوکاتـەی ئیـبراهیم، هاجـەر و ئیسـماعیلی هێنایـە فـاران، ئـەوەی پێیـان بـوو لـە خـواردن و ئـاو تـەواو بـوو، هاجـەر هـاواری لێهەڵسا، بۆ ئاو دەگەڕا، هـەتا لـە ژێـر پێیـدا بـیری زەمـزەم تـەقی، پاشـان هـۆزی جورهوم لەسەر ئەو ئاوە هەڵیانداو قەرەباڵغ بوو، ڕۆژگار ڕۆشت، پاشماوەی لاقاوی ئەو دۆڵە ئاسەواری کانیاوی زەمزەمی نەهێشت[1].

مێژوونووسان دەڵێن" یەکێك لـە گـەورەکانی مەککـە بـە نـاوی مـەزازی کـوڕی عەمری جورهومی کە پێش عەبدولموتەلیب بە سێ سەد ساڵ ژیابوو، بوویە شـەڕی لەگەڵ دوژمنەکەیدا، دوای شکستهێنانی، ویستی نـەهێڵێ سـوود لـە ئـاوی زەمـزەم وەربگرن، هەندێك لە ئاڵتون و مجەوهەرات و شـتە بـە نرخـەکانی لـە نـاو بیرەکـەدا شاردەوە و پاشـان پڕیکـردەوە و شـوێنەکەی لـە دوژمـن شـاردەوە، پاشـان لافـاو تەواو ئاسەوارەکەی نەهێشت، خۆی هەڵهات بۆ یەمەن، خـەڵکی مەککـە ناچـاربوون لە دەرەوەی شاری مەککە ئاو پەیدا بکەن، هەر هۆزە بـۆ خـۆی بـیری تایبـەتی بـۆ خۆی لێدا، ئاوی حاجیەکانیان لەوانە کۆدەکردەوە[2].

کە عەبدولموتەلیب بووە خاوەنی سیقایە و ئاودان بە حاجیەکان، ناچار بوو لـە دەرەوەی مەککە ئاو بهێنێت بۆ ناو مەککە و حاجیەکانی پێ تێر ئـاو بکـات، ئەمـە زەحمەت و مەینەتیی زۆری تووش دەکرد، بەتایبەت کە هیچ کـوڕێکی نـەبوو جگـە

[1] معجم البلدان، یاقوت الحموي، ج١٠، ص ١٤٩.

[2] الكعبة، ل ٦٨.

(حارس)، پاش ئەوە ساڵێکی قات و قڕ روویکردە مەککە و ناوچەکە، باران نەباری و بیرەکان وشکبوون، پاشان هەزاران حاجی لە مەوسیمی حەجدا روویان کردە مەککە، عەبدولموتەلیب ناچار بوو بیر لە ئاو بکاتەوە.

حەج تەواوبوو، قورەیشیەکان گەڕانەوە شوێنەکانی خۆیان، لە یەکێك لە شەوەکاندا گەورەکان لە ماڵی عەبدولموتەلیب کۆبووبوونەوە، قسە و باسیان دەکرد، قسە بردنیە سەر زەحمەتی عەبدولموتەلیب لە پەیداکردنی ئاودا، سوپاسی خوایان کرد کە عەبدولموتەلیب سومعەی قورەیشی پاراست لەناو عەرەبەکاندا، لەوێوە بیریان هاتەوە بە لای بیری زەمزەمدا، هیوایان دەخواست ئەگەر شوێنەکەیان بدۆزیایەتەوە، ئومەییەی کوری عەبدوشەمس کە شارەزای رووداوەکانی رابردوو بوو، چیرۆکەکەی مەزازی کوڕی عەمری جورهوم و، ونکردنی ئاسەواری زەمزەمی گێڕایەوە.

عەبدولموتەلیب هیوای خواست جێگەکەی بزانیایەو ئاوەکەی دەربهێنایەو گرفتی ئاویان نەمایە، هەندێ مێژوونووسی کۆن باس لە خەوێکی عەبدولموتەلیب دەکەن، ئیبن هیشام لە ئیبن ئیسحاقەوە دەگێڕێتەوە کە لە خەودا بە عەبدولموتەلیبیان وتووە زەمزەم هەڵکەنە و جێگەکەشیان بۆ دیاریی کردووە[1]. تەها حسەین لە کتێبی (علی هامش السیرة)دا ئەو خەوەی لە شێوازێکی ئەدەبی بەرزدا دارشتووە، سێ جار عەبدولموتەلیب لە خەودا ئاگادارکراوە، ئەو هەر بە شتی تر تێگەیشتووە، ناچار خەوەکە بۆ حەبیبەی سەمرای ژنی دەگێڕێتەوە، ئەویش دەڵێ: هێوربەو برۆ خەریکبەو هەژاران رازی و تێر بکە، [2]. عەبدولموتەلیب هەڵدەسێ و بە گوێرەی خەوەکە دەگەرێت بۆ بیری زەمزەم، ئەو کاتە کەسی لەگەڵ نابێ، جگە لە حارس کورە تاقانەکەی، ئەو کارە بە تەنها ناکرێ، لابردنی ئەو هەموو چەو و لم و، پاککردنەوەی ئەو دۆڵە، خەڵکی زۆری دەوێت، بەلام ئەو،

---

[1] سیرة ابن هشام، ج١، ص١٤٣.

[2] الكعبة، ص ٧٢.

ئـەوكارەی بـە تـەنها كـرد، كـاری وا خـەڵكی زۆری دەوێـت، ئـەو پـیرە، كـوڕە تاقانەكەشی ئەو توانایەی نییە، كاری بیر گشتییە و بۆ هەمووانە، خەڵك تەنگەتاوە و پێویستیانە، ئەو سـەرۆكی قورەیشـە، دەتـوانێ دەیـان كـوڕی ئـازا كۆكاتـەوە و كاریان پێبكات، بەڵام عەبدولموتەلیب ویستی ئەو بەرزیی و مەزنیـە هـەر بـۆ خـۆی بێت، خـۆی و تاقـە كوڕەكـەی كەلوپـەلیان هـەڵگرت، لـەو جێگەیـەی كـە دیارییـان كردبوو لمەكەیان لابرد، دۆزیانەوە، بەردەوام بوون لە هەڵكەندن، هەتا گەیشـتن بـە دوو پارچە ئاسكی لە ئاڵتون دروسـتكراو، پاشـان گەیشـتن بـە شمشـێر و قـەڵغانی بەنرخ، كە هی مزازی جورهومی بوو، پێش ئـەوەی هـەڵبێت بـۆ یەمـەن، لـەو لمـەدا شاردبویەوە، چەوو لمی لافاو دای پۆشیبوو، قورەیشیەكان كە ئـەوەیان دی داوای بەشیان كـرد، ئـەویش وتـی: نـەخێر، بـەڵام ڕازیـم ئەگـەر لـە نێـوان مـن و ئێـوە و كەعبەدا، دەرچون لەسەر نیوەی بكەین. وتیان: زۆر باشت ووت، كـە دەرچـوونیان بـۆ كـرد، دوو ئاسـكە ئاڵتونەكـە بـۆ كەعبـە دەرچـوو، شمشـێر و قەڵغانەكـەش بـۆ عەبدولموتەلیب دەرچـوو، قـورەیش هیچیان بـۆ دەرنەچـوو، ئـیبن هیشـام دەڵـێ: قـورەیش وتیـان ئەمـە بـیری ئیسـماعیلی باپیرەمانـە و بەشـی ئێمەشـی پێوەیـە، عەبدولموتەلیب وتـی: ئەمـە تـەنها هـی خۆمـە و هیچـی ئێـوەی پێـوە نییـە، بـەڵام ناوبژیوانێك دابنێن هەتا نـاوكۆیی و ناوبـژیوانییمان بكـات، هەرچـی وت مـن ڕازیـم، قورەیشیەكان وتیان زۆرباشە، داوایـانكرد هـەزیم كـاهنی بـەنی سـەعد بێـت، وتـی: ڕازییم، ئـەو كاهینـە لـە خـوار شامەوە بـوو، عەبدولموتـەلیب سـواری وڵاخ بـوو، كەسێكی خزمی لەگەڵ بوو، لە هۆزەكانی تریش خەڵكی تر سواربوون و بەرەو شام ڕۆیشتن، لە ڕێگە ئاویان لێـبڕا، خـەریكبوو لـە تینـوان تیابچـن، بـەڵام لـە ژێـر پێـی عەبدولموتەلیبـدا كانیـەك تـەقی و بەشـی هەموویانیـدا، ئـەوانیش وتیـان بـا بگەڕێینەوە، ئیتر لە زەمزەمدا دوژمنایەتیت ناكەین، ئەوەی ئەم ئاوەی دایتێ هـەر ئەویش زەمزەمی دایتێ[1]، زەمزەم بووە خێرو بێر بۆ خەڵك و حاجیان و كشـتوكاڵ

---

[1] الكعبة، ص ٧٦.

و سەوزی زەوی، شمشێر و قەڵغان و دوو ئاسکەکە بووە دیاری رازاوەی بەیتی حەرام، بەڵام دز ئەوانەیان برد، ئەوانەی جێی تەماعی دونیایە رۆیشت، بەڵام زەمزەم مایەوە و تا ئەمڕۆ بەردەوامە. ساسان پاشای فارس ئەو دوو ئاسکە ئاڵتونە و شمشێرەی کردبوە دیاری بۆ کەعبە [1].

(مرجولیوس) لە کتێبی (تأریخ محمد)دا سەری سوڕماوە لەو هەوڵە گەورەیەی عەبدولموتەلیب، کە خۆی ماندووکردووە هەتا ئاو دەست بخات بۆ حاجیەکان، ئەو گومانی وا بردووە کە عەبدولموتەلیب سەرەتا ئەو کارە گرانەی بۆیە کردووە هەتا ئاو دەست بخات و بیفرۆشێت بە پول و پارەی زۆر، بەڵام لە راستیدا ئەو پێودانگەی مرجولیوس بە حسابی ئەوروپایی بووە، کە هیچ هەست و سۆز و برایەتی و لەخۆبوردن و سەخاوەتێك نازانن، تەنها ژیانی دونیا دەناسن، نرخی کەرەم و بەخشینیان لا نییە، لە ئەوروپا کەس ناتوانێت قومێك ئاو بخواتەوە هەتا بەرامبەرەکەی نەدات، بەڵام عەبدولموتەلیب ئەو بیرەی دۆزیەوە، ئاڵتونی تیا دۆزیەوە، ئاوو ئاڵتونی بەخشیە کەعبەو رێی خوا، خورماو هەنگوین و دۆشاوی دەکردە ئاوی زەمزەم، ئەو خۆشاوەی لە رۆژانی حەجدا دەبەخشیە حاجیان لە رێی خواداو سەربەرزی هۆزەکەی و خزمەت بە کۆمەڵگای مەککە، ئەمەیە باپیرانی محەممەد. ! !

ئاوی زەمزەم زۆر بوو، عەبدولموتەلیب وەقفی بەیت و کەعبەی کرد، لە هەموو بیرەکانی تر ئاوەکەی زۆرترو جوانترو پوختترو خۆشتر بوو، نێزیك بە کەعبە بوو، بیری ئیسماعیل بوو، لەبەر ئەوە، بوو بە ئاوێکی پیرۆزو بەنرخ بۆ هەموان، بنەماڵەی عەبدولمەناف شانازیان دەکرد بەسەر قوڕەیشدا کە بوونەتە خاوەنی کەعبە و زەمزەم و سیقایە (ئاوبەخشین) و رفادە (خۆراك بەخشین)، عەبدولموتەلیب لەگەڵ ئەو گەورەیی و فەزڵ و ناوەیدا، هەستی بە لاوازیی و دڵشکاویی دەکرد، کاتێك کە قوڕەیش بەرەنگاری بوونەوە، کە وتیان شەریکین لەو

---

[1] تاریخ ابن خلدون، عبدالرحمن ابن خلدون، ٧٣٢ ـ ٨٠٨ك ج٢ ص٤٠٣.

ئاڵتونە و ئاوەی دەستت کەوتووە، چونکە خۆی بە تەنها و بێ کوڕ و پشت دەزانی، هەر، بۆیە مەیلی زۆرکردنی وەچە تیایدا نوێبوویەوە، چونکە کوڕە تاقانەکەی بە تەنها زۆر ماندوو بوو لە دۆزینەوەی زەمزەمدا، هەر، بۆیە بەو تەمەنەوە روویکردە عومەری کوڕی مەخزومی و داوای فاتیمەی کچی لێکرد، هەتا خوای گەورە منداڵی پێببەخشێت.

بەو جۆرە بنەماڵەی عەبدولموتەلیب گەورە بوو، کوڕێکی زۆری بوو (حارس و زوبەیر و حیجل و زرار و موقەویم و ئەبولەهەب و عەباس و هەمزە و ئەبوتالیب و عەبدوڵڵا) لە کچیش (سەفیە و بیرِەو عاتیکە و ئوم حەکیم و ئەصیحە و ئەرویە)ی بوو، ئاواتی دەخواست خوا دە کوڕی بداتێ، وتی ئەگەر خوا دە کوڕم پێببەخشێت یەکێکیان لە پاڵ کەعبەدا دەکەمە قوربانیی بۆ خوا[1].

لە سەردەمی عەبدولموتەلیبدا رووداوێکی تری گرنگ روویدا کە قورئانیش پشتڕاستی کردووەتەوە، ئەبرەهەی حەبەشی هێرشی هێنا ویستی لە یەمەنەوە مەککە داگیر بکات و کەعبە بروخێنێت، ئەمە یەکەمجار بوو هێزی زۆری دەرەوە هێرش بکاتە سەر حیجاز، پێشتر فارس و رۆم لە باکوورەوە هەوڵیاندا، بەڵام لەبەر دووری و گەرمیی بیابان وازیان لێهێنا، رۆم داوای لە حەبەشیەکان کرد ئەو کارە لە یەمەن و باشوورەوە بکەن، هەرگیز هێزی دەرەوە نەهاتووەتە حیجاز بۆ داگیرکردن، چونکە وڵاتێکی بێ خێرو بێسوود بووە، گەرمیەکی لە رادە بەدەرو بیابانێکی وشکە، مەگەر هەر ئەو عەرەبانەی ناوچەکە بتوانن گوزەرانی تێدابکەن، ئەویش بە کولەمەرگیی، ئەو کولەمەرگیی و بێ خێرییە وایکردووە پارێزراوبن لە هێزی دەرەوە، ئەوە وایکردووە عەرەب ژیانی لێ تێکنەچێ و داب و نەریت و رەوشتی زۆر نەشێوێ هەتا هاتنی ئیسلام.

---

[1] الكعبة، ص ٧٨.

## عەبدولموتەلیب و هێرشی ئەبرەهە

کاری خوا وەها بووە کە ئەو ناوچە پارێزراو بێت، دەرونی خەڵك نەئاڵۆسکێ تا هاتنی ئیسلام، بەڵام رۆم و فارس تەماعیان لە یەمەن دەکرد، چونکە دەوڵەتی حەمیری تیابوو، خێرو بێرو کشتوکاڵ و بازرگانیی زۆر بوو، جولەکە لە یەمەندا بڵاوبوو، لە سەردەمی حەمیریدا (زونەواس)ی پاشایان بووە، جولەکە، گاورەکانی دەچەوساندوە، تا واز لە ئاینەکەیان بهێنن، لە ساڵی٣٤٠ز حەبەشیەکان یەمەنیان داگیر کردو گاوریان بڵاو کردەوە، بەڵام ساڵی ٣٧٨ز حەمیریە یەمەنیەکان، حەبەشیەکانیان دەرکرد، ئەمە دژایەتیەکی توندی وروژان دژی گاوری، گاورەکان جولەکەکانی نەجرانیان ئەشکەنجە دەداو جاسوسیان بۆ حەبەشە دەکرد، کە پاشا زینەواس ساڵی ٥١٥- ٥٢٥ز دەسەڵاتی گرتە دەست، هەوڵیدا گاوری لە یەمەن و نەجراندا لە رەگ دەربهێنێ، بۆ ئەو کارە خۆی کردە جولەکە، تەنانەت ژمارەیەکی زۆر لەوانەی کە وازیان لە گاوری نەدەهێنا، چاڵێکی پڕ لە ئاگری بۆ هەڵکەندن و سوتاندنی و چیرۆکی ئەصحاب الاخدودی دروست کرد، ئنجیلەکانی کۆکردەوەو ئاگری تێبەردان، گاورێکی نەجران ئینجیلێکی سوتاوی برد بۆ لای قەیسەری رۆم هەرقل [1]، هانی بیزەنتی دا فریایان بکەوێ، هەرقل نامەو ئنجیل و کابرای نارد بۆ لای نەجاشی پاشای حەبەشە.

روودای (ئەسحابی ئوخدود) کە لە قورئاندا باسی هاتوە، بەسەر ئەو گاورانەدا هات و سوتێنران، ئیمپراتۆری رۆم خۆی بە پارێزەری گاور دەزانی ئەوەی قبوڵ نەکرد، نامەی بۆ نەجاشی پاشای حەبەشە نارد هەتا یەمەن بگرێ و تۆڵە لە زونەواس و جولەکە و دەوڵەتی حەمیری بکاتەوە، ئەویش حەفتا هەزار چەکداری نارد بە سەرکردایەتی (ئەربات)، حەبەشە بەهێزبوو، بەهۆی کەشتیە بەهێزەکانی زاڵ بوو بەسەر دەریای سوردا، ساڵی ٥٢٣ زاینی دەوڵەتی حەمیری لەناوبرد [2]،

---

[1] تاريخ العرب قبل الاسلام، د.جواد علي، ج١ ص٣٨١، المجمع العلمي العراقي.

[2] حياة محمد، محمد حسنين هيكل، ص ٣٦.

بـەڵام ئـەرباتی زۆر خـراپ بـوو، خـەریكی كۆكردنـەوەی سـەروەت و سـامان بـوو، حەبەشـییەكان لـە دەوری سـەركردەیەكی تـر كۆبوونـەوە بـە نـاوی ئەبرەهـە و ئەرباتیان لەناوبرد، ئەبرەهـە خـۆی بـووە حـاكمی یەمـەن، سـەرەتا حەبەشـە وەك رزگاركەر هاتنە یەمەن، بەڵام زۆر زوو بوونە داگیركەرو لە ٥٢٥-٥٧٥ زاینی حوكمی یەمـەنیان كـرد، هـەموو خێـر و بێـری ئـەو وڵاتـەیان بـرد، حەبەشـیەكان بـە سەركردایەتی ئەبرەهـەی ئەشـرەم لـەدەریای سـوور پـەڕینـەوە، زینـەواس سـوپای حومەیری كۆكردەوە، بەڵام شكستیان خـوارد، یەمـەن كەوتـە دەسـتی حەبەشـە [1]، ئەویش سوپای حـەفتا هـەزاری نـاردە سـەر یەمـەن و دەوڵـەتی حـەمیری ڕوخانـد، قەڵاو وڵاتی كاول كرد [2]، زینەواسـی پاشـای یەمـەن خـۆی فڕێدایە دەریـاو وتـی لـە دەریادا خنكان لە ئەسیری باشترە [3]، حومەیر سەر شۆڕ بوون، قـەڵاكانیان تێكچوو صەنعا گیرا زینەواس هـەڵهات، سـێ لەسـەر یـەكی دەسـكەوت نێـررا بـۆ نەجاشـی، پاشان زییـەزن كـوڕی مالیك كـوڕی زەیـدی پاشـای یەمـەن، كـە دوای لەناوچـونی زینەواس بـوە پاشـای یەمـەن، خـۆی كـۆكردەوە، بـەڵام شـكاو هـەڵهات، ئەبرەهـە هـەموو یەمـەنی گـرت و خراپـی بـە حومەیریـەكان كـرد، نـاردی ڕەیحانـەی كچـی عەلقەمەی كوڕی مالیك كوڕی زەید كوڕی كەهلانیان بۆ هێنا، ڕەیحانەیان لـە ئـەبی موڕڕە كوڕی زی یەزنی مێردی سەندەوە، كـوڕێكی لـە ئـەبی مـوڕە هـەبوو بـەناوی مەعیـد، ڕەیحانـە لـە ئەبرەهـە كـوڕو كچـێكی بـوو، كوڕەكـەی ناونـا مەسـروق و كچەكەش بەناوی سەباسە، ئەبرەهە كەنیسەیەكی ڕازاوەی دروستكرد، نامەی نـارد بـۆ نەجاشـی و داوای لـە قەیسـەری ڕۆم كـرد، وەسـتاو ڕوخـامی بـۆ بنێـرن، وتـی دانانیشم هەتا كەعبـە تێك نـەدەم [4]، لـە دەریـاوە خـوا تـەیرە ئـەبابیلی بـۆ نـاردن

---

[1] تاريخ ابن خلدون، عبدالرحمن ابن خلدون، ٧٣٢ ـ ٨٠٨ك ج٢ ص٦٩.

[2] مفصل العرب واليهود قبل الاسلام، الكتـور احمـد سوسـة، ضـاتى ڤێنجـەم ص ٢٨٥، دار الحريـة، بغداد ١٩٨١

[3] العرب قبل الاسلام، د. احمد صالح العلى، ج١ ص١٧، بغداد ،١٩٦٧

[4] تاريخ ابن خلدون، عبدالرحمن ابن خلدون، ٧٣٢ ـ ٨٠٨ك ج٢ ص٧١.

دایرزاندن، خوا تۆفانی بۆ ناردن، هەموو لاشە بۆگەن و رزیوەکان و ئاسەواریانی لە سەر خاکی پاکی حیجاز رامالّی، پارچەپەکیان لەو ناوە نەمایەوە، دوای ئەبرەهە یکسومی کوری هاتە جیّی، چوە شەری یەمەنیەکان، شکاو کوژرا، مەسروقی کوری لە ژنە یەمەنیەکە چوە جیّی، کەسیکی توندو خراپ بوو، زی یەزن سەرکردەی حەمیریەکان پەنای بردە بەر ئەنوشیروان پاشای ساسانی و حەبەشیەکانیان دەرکرد[1]، مەسروق لەشەری ساسانیەکاندا کوژرا، لە ماوەی ۷۲ سالّدا چوار پاشا (ئەریات و ئەبرەهەو یکسوم و مەسروق) حوکمی یەمەنیان کرد[2].

ئەبرەهە شاری سەنعای کردە پایتەخت و گەورەترین کاتدرائی کەنیسەی مەسیحی بە ناوی قلیس تیا دروستکرد، بە یۆنانی قلیس واتە کەنیسە، کە لە جیهاندا وێنەی کەم بوو، بەنیازبوون یەمەن بکەنە دەولّەتێکی گاوریی مەزن، لەوێوە دەست بەسەر نیوەدورگەشدا بگرن، کێبرکیّ لەگەلّ بتپەرستانیی مەککەدا بکەن، کە بووبوویە ئایینێکی پتەوو هەزاران بتیان بۆ پەرستن دروستکردبوو، دەبیبست کە حەجاجی زۆر رووی تێدەکەن و سامانێکی زۆریان لێ دەستدەکەوێت، قلیس رازێنرایەوە و بە ئالّتون جوانکرا، بینای گەورەی بە بەردەکانی کۆشکی بەلّقیس و بەردی بەنرخی تر بۆ کرا، ئەبرەهە نامەیەکی بۆ نەجاشی نارد کە دەیەویّ رووی حاجیە عەرەبەکان وەربگێریّ لە مەککەوە بۆ کەنیسەی قلیس و بازرگانی مەککە بگوازێتەوە بۆ سەنعا، عەرەبێك چووبووە ناو قلیس و پیسایی تێکردبوو سووکایەتی بە کەنیسەکە کردبوو، کە ئەبرەهە ئەوەی بیست، سوێندی خوارد کە دەبیّ کەعبە تێکبداو، بە زۆری شمشێر رووی خەلّکی عەرەب بکاتە کەنیسەی قلیس بۆ حەجکردن، عەرەب بکاتە گاور، بازرگانیی مەککە بگوازێتەوە بۆ سەنعا، تۆلّە لەوانە بسێنیّ کە سووکایەتیان بە کەنیسەکەی کردبوو پیساییان تیّ فرێدابوو، لە لایەکی ترەوە کە ئەبرەهە ئەریاتی سەرکردەی

---

[1] مفصل العرب واليهود قبل الاسلام، الكتور احمد سوسة، ص ٢٨٥

[2] تاريخ ابن خلدون، عبدالرحمن ابن خلدون، ٧٣٢ ـ ٨٠٨ك ج٢ ص٧٢.

کوشت و وڵاتی یەمەنی بۆ خۆی پچڕی، نەجاشی بەوە تووڕە بوو، وەڵامی بۆ نارد کە تۆڵەی لێدەکاتەوە، سوێندی خواردبوو کە دێمە یەمەن بۆ ئەو کارە و سەری ئەبرەهە لێدەکەمەوە، ئەبرەهە ترسا نەجاشی سوێندەکەی بێنێتە دی، هەر، بۆیە نامەیەکی بۆ نارد و داوای لێبوردنی کرد، ڕونی کردبویەوە کە بۆچی وای کردبوو، قژی خۆی بڕی و توورەکەیەك خۆڵی یەمەنی بۆ نارد، وتبوی قاچ بخەرە سەر ئەو خۆڵە و ئەوەش قژی سەرم بیبڕە، هەتا سوێندەکەت نەکەوێ، نەجاشی عەفووی کرد، ئەبرەهە بە سوپایەکەوە کە فیل لە پێشەوەی بوو ڕوویکردە مەککە، لە ڕێگە گرفتی زۆری تووشهات، هۆزی زونەفەری یەمەنی ڕێیان لێگرت و شەڕی قورس روویدا، کە گەیشتنە خاکی توهامەی یەمەن، هۆزی بەنوخسعەم توند بەرەنگاری بوونەوە، بەڵام کە گەیشتە شاری تائیف، شاری جوان و سەوز و کشتوکاڵ، لەگەڵی ئاشتییان کرد، ئەبو روغالیان لەگەڵ نارد کە ڕێیان نیشان بدات، هۆزی سەقیف لە تائیف دژایەتی و بەرامبەرکێی لەگەڵ قورەیشی مەککە دەکرد، لەسەر بازرگانیی و کاروانچێتیی، وەك لە مەککە کەعبە هەبوو، سەقیفیش لە تائیف ماڵێکیان بۆ بتی لات کردبوو، سەرسوڕمان نییە ئەگەر حەزیاندەکرد ئەبرەهە لەو کارەدا سەرکەوێ و شانازیی قورەیش کاول بکات، کە ئەبرەهە نێزیك بوویەوە، دەستەیەکی نارد هەموو سامان و وڵاخ و کەلوپەلی قورەیشیان گرت، کە لە ناویاندا دوو سەد حوشتری عەبدولموتەلیبی تێدابوو، قورەیش و کەنانە و هەزیل و خەڵکی تریش ئامادەبوون بەرەنگاری ئەبرەهە ببنەوە، بەڵام کە زانیان توانای بەرەنگارییان نییە، ئەبرەهە کەسێکی بە ناوی (حەناتەی حیری) وەك نوێنەری خۆی نارد بۆ مەککە، هەتا بە سەرۆکی مەککە بڵێ: ئێمە نەهاتووین بۆ شەڕی ئێوە، بەڵکو هاتووین بۆ کاولکردنی ئەو ماڵە، ئەگەر بەرەنگاری نەکەن ئێمە حەزمان لە خوێنی ئێوە نییە، عەبدولموتەلیب وتی: وەڵڵاهی ئێمەش شەڕمان ناوێ و توانامان نییە، ئەمە ماڵی خوا و ماڵی ئیبراهیمی خەلیلە، حەتانە داوای لە عەبدولموتەلیب کرد لەگەڵی بێت بۆ لای ئەبرەهە.

عەبدولموتەلیب لەگەڵ هەندێ لە کوڕەکانی ڕۆشتن بۆ لای ئەبرەهە، وەرگێڕ پرسیاری لە عەبدولموتەلیب کرد چیت دەوێت؟ وەڵامی دایەوە: داوای من لە پاشا ئەوەیە کە دوو سەد حوشترەکەم بداتەوە کە گرتوونی، ئەبرەهە سەری سوڕما لەو داوایە و وتی: پێی بڵێ کە سەرەتا بینیم لام گەورەبوو، بەڵام کە قسەی کرد لام وانەما، تۆ داوای دوو سەد حوشترەکەت دەکەیت و واز لە ماڵی ئایینەکەت و باوو باپیرانت دەهێنیت و هیچ نالێی لە بارەیەوە..؟ ئەو وتی: من خاوەنی ئەو حوشترانەم، بەڵام ئەو ماڵە خاوەنی خۆی هەیە دەیپارێزێت، ئەبرەهە وتی: کەس ناتوانێ دەستم بگرێ، عەبدولموتەلیب وتی: ئەوە تۆ و ئەوە ئەو[1].

عەبدولموتەلیب وتی: سێیەکی داهاتی ناوچەی توهامەت دەدەمێ بگەڕێرەوە، ئەبرەهە رازی نەبوو، هەتا ئەوەی بۆی هاتووە نەیکات، عەبدولموتەلیب بە تووڕەییەوە گەڕایەوە، داوای لە خەڵکی مەککە کرد شار چۆڵ بکەن و پەنا بەرنە بەر لوتکەی شاخەکان و قوڵایی دۆڵەکان، حوشترەکانی کە لە ئەبرەهەی سەندەوە، سەری بڕی و کردیە دیاری بۆ کەعبە و لەبەر دەرگای کەعبەدا وەستا و وتی: ئەی خوایە داوا لە کەسی تر ناکەم، ماڵەکەتیان لێ بپارێزە، دوژمنی کەعبە دوژمنی تۆیە، نەهێڵی لادێکەت کاول بکەن، وەك مەسعودی دەڵێ، وتی:

يا رب لا أرجو لهم سواكا    يا رب فامنع منهم حماكا

ان عدو البيت من عاداكا    فامنعهم يخرجوا قراكا(٧٢)

سوپای ئەبرەهە هێرشی برد، بەڵام فیلەکان، بەتایبەت گەورەکەیان بەرەو کەعبە نەدەجولان، هەنگاویان نەدەناو چۆکی دادەدا، سوپاکە لەو گیری و سەرسوڕمانیەدابوون، هێرشی باڵندە لە ئاسمانەوە بەردبارانی سوپای ئەبرەهەیانکرد، وەك نەخۆشی وەباو ئاوڵە لێیدابن، بەر هەرکەس دەکەوت لاشەی دادەرزا و هەموویان تیاچوون.

---

[1] سيرة ابن هشام، ج٢، ص٥٠.

٧٢(مروج الذهب، ج٢، ص١٢٨)

جموجوڵی عەبدولموتەلیب لەو ڕووداوەدا وەك سەركردەیەكی بەبڕواو دامەزراو وابوو، قسەی دڵی لەگەڵ سەركردەی هێرشبەران كرد، گەلەكەی خۆی بە باشی پاراست، ئەوەندەی تر لە نرخی ئەو كەسایەتی مەزنە بەرزبوویەوە.

(براون)ی مێژوونووس دەڵێ: "ساڵی فیل دادەنرێ بە دەلاقەی سەردەم و چەرخێكی نوێ لە مێژووی عەرەبدا"، هەیكەل دەڵێ: "ئەو ڕووداوە بێوێنە و گرنگە جێگە و ناوی مەككەی بەرزكردەوە و لە ڕووی ئایینیەوە، لە ڕووی بازرگانیشەوە برەوی زیاتری وەرگرت، خەڵكەكەشی هاندا كە زیاتر ڕێز لە كەعبە و شارەكەیان بگرن و بیپارێزن لە خراپە، خەڵكی شار و ناوچەكە هەتا ماوەیەكی زۆر، شەوو ڕۆژ باس و خواسیان هەر ئەو ڕووداوە و مەزنیی عەبدولموتەلیب و كەعبە و پیرۆزیی شارەكەیان بوو، ئەمە لە لایەك، لە لایەكی ترەوە نرخی قورەیش لای عەرەب گەورە و بەڕێز بوو، دەیان وت: خوا لە باتی قورەیش شەڕی كرد و هات بە دەنگیانەوە و دوژمنەكەی لەناوبردن، چەندەها شیعرو بەیت و باڵۆرەیان بەو ڕووداوە و عەبدولموتەلیب و كەعبە و دەستی خوادا وت، پێش ئەوەی ئایەتە نورینەكانی قورئان دابەزێت، بە ڕاستی خوای گەورە بە جوانترین شێوە بەرگری لە ماڵی خۆی كرد و خەڵكەكەشی پاراست، یەك سورەتی تەواوی بۆ بەرز ڕاگرتنی یادی ئەو ڕوداوە ناردوە، خوای گەورە خۆی داوای لە ئیبراهیم و ئیسماعیل كردبوو كەعبە دروست بكەن، هەتا وشەی یەكتاپەرستیی بەردەوام بێت، كە دواتر موحەممەد جارێكی تر گێڕایەوەو نوێی كردەوە، خوا كەعبەی پاراست هەتا ببێتە ڕووگەی موسڵمانان دوای چل ساڵی تر"، ئەمە باس و خواسی باپیرانی محەممەدە، ڕۆژهەڵاتناسان چەندە بەرزو مەزن باس لەو پیاوانەو كارەكانیان دەكەن، بەلام دكتۆر جەمال چەند نزم باس لە سەروەری پێغەمبەران و بنەماڵەی مەزن و كەس و كاری دەكات، لە گەرمەی ناو ئەم هێرش و ڕوداوانەدا، تەمەنی محەممەد چوار ساڵانەو لە ماڵی حەلیمەی سەعدیەی دایانێتی لە لادێیەكی نزیك مەككە، داخۆ محەممەد چۆن پێشوازی لەم ڕوداوو هەرایە كردبێت.؟ چۆنی گێڕابێتەوە بۆ منالانی

هاو کوف و هاوتەمەنی.؟ داخۆ ئامینەو عەبدولموتەلیب چییان کردبێ بۆ محەممەد لەم ڕوداوەدا.؟

لەناوبردنی ئەبرەهە نەگبەتیەك بوو بۆ حەبەشیەکان، زۆری نەبرد یەمەنیشیان لێ پاککرایەوە، ئەویش ئەو هەڵسانەوە نەتەوەییە بوو دژی حەبەشیەکان کە (سەیفی زی یەزنی حەمیری) کردی و یەمەنی لە دەست داگیرکاری حەبەشە رزگارکرد، ئەو رزگاربوونە بە یارمەتی فارسەکان بوو، کە ساڵی (٥٧٥) زاینی بە سەرۆکایەتی (وهرز)ی فارس، (مەسروقی کوڕی ئەبرەهە)یان دەرکرد، عەبدولموتەلیب دڵخۆش بوو بە رزگاربوونی یەمەن و ناوچەکە لە دەست حەبەشە، بەتایبەت کە کاروبار کەوتە دەست کەسایەتییەکی چاکی خەڵکی یەمەن کە (سەیفی کوڕی زی یەزەن)ە، هەر، بۆیە بە سەرۆکایەتی دەستەیەك لە گەورەکانی قورەیش گەیشتە یەمەن، کە ئومەیەی کوڕی عەبدوشەمس و خوەیلیدی کوڕی ئەسەدی لەگەڵ بوو، لەوێ بە ئامادەبوونی سەیفی کوڕی زی یەزەن وتارێکی درێژی دا، سەیف دڵی خۆش بوو، پێی وت: سڵاو لە کوڕی خوشکمان، چونکە سەلمای دایکی عەبدولموتەلیب لە خەزرەجیەکانی سەبەئی یەمەن بوو، سەیفیش لە هۆزی حەمیری خەڵکی یەمەن بوو.

ئەزرەقی دەڵێ: "لە مەککەدا حەبەشیی زۆر هەبوون کاریان دەکرد، یان سەربازییان دەکرد و کۆیلە و خزمەتکار بوون"[1]، کە ئیسلام هات زۆر حەبەشیی موسڵمان بوون، وەك بیلال و عامری کوڕی فەهیرە و وەحشی بکوژی حەمزە و سوئاب هەڵگری ئاڵای قورەیش.

شکانی ئەبرەهە دەروازەی خێر بوو بۆ قورەیش و خەڵکی مەککە و عەرەب، ئەو ڕوداوە ئەوەندە مەزن بوو، ڕۆژەکەیان کردە سەرەتای مێژوو، ڕووداوەکانیان پێ دیاریی دەکرد، لەو ماوە کەمەدا کۆمەڵێك ڕوداوی گەورە ڕویدا، کە خەڵکی پێشبینی ڕوداوی گەورەتری لێدەکرد، زەمزەم و خەوبینینەکان و کەعبە و

[1] أخبار مكة، الأزرقي، ص٩٧.

حاجیەکان و شکستی روون و ئاشکرای ئەبرەهە بە دەستی خوا و مژدەدەرەکان، خەڵك دەیانزانی چاوەڕوانی شتێکی گەورەی لێدەکرێ.

سەیفی کوڕی زی یەزن زۆر ڕێزی عەبدولموتەلیبی گرت، پاشان کە دوو بە دوو بوون، زی یەزن مژدەی نزیکبوونەوە و سەرهەڵدانی پێغەمبەری نوێی پێداو، زۆر لە سیفەت و خووڕەوشتەکانی بۆ باسکرد، عەبدولموتەلیب هەستی بەو وەسف و سەنا و نیشانانە کرد و دەنگی ئەڵلاهو ئەکبەری لێبەرز بویەوە و وێنەی قسەکانی زی یەزدینی بە راست بینی کڕنووشی برد بۆ خوا، سەیف پێی وت: ئایا هەستت بە شتێك کرد لە هەواڵەکانمدا کە پێمدایت..؟ عەبدولموتەلیب وتی بەڵێ، کوڕەکەم منداڵێکی بووە هەر لەسەر ئەو وەسف و سەنا و نیشانانەی کە تۆ باستکرد ئەی پاشا، سەیف وتی: کەواتە چاك بیپارێزە لە جولەکە و هۆزەکەت، لە هۆزەکەت چاکتر بیپارێزە هەتا لە جولەکە، خوا خۆی کاری خۆی تەواو دەکات و بانگی خۆی دەگەیەنێ[1] عوبدولموتەلیب ویستی زەمزەم هەڵکەنێت بە هۆی ئەوەی کە چەندجار بەخەو بینیبوی[2]، قورەیش ڕێیان لێگرت، چونکە تەنها بوو کوڕی نەبوو، نەزری کرد ئەگەر دە کوڕی هەبێت بتوانن پشتیان پێ ببەستێ، یەکیان دەکاتە قوربانی بۆ خوا لە لای کەعبەدا، کە بونە دە کوڕ پەرداخی بۆ لێدان لای بتی هوبەل دا، لە ناو کەعبەدا و لای ئەو بیرەدا کە دیاریەکانی کەعبەی تیدەکەن، پەرداخەکە لەسەر عەبدولاّ دەرچوو، عەبدولموتەلیب لە سەر وەعدەکەی وەستاو سەری سوڕما، بڕیاریدا بیکاتە قوربانی، بەڵام خزمان ڕازی نەبوون نەیانهێشت، کەسێك بە ناوی عەبدولای کوڕی مەخزوم وتی با پرسی جادووگەرەکەی مەدینە بکەین، کە چون ئەو وتی بیبەستن بە دە حوشترەوە، هەموو کات دە دەی بۆ زیاد بکەن و بیکەنە قوربانی.

[1] اليعقوبي، ج١، ص٢٣٣.

[2] تاريخ ابن خلدون، عبدالرحمن ابن خلدون، ٧٣٢ ـ ٨٠٨ك ج٢ ص٤٠٢

پێغەمبەر لە دایك بوو لە پێش ٥٧٠ ی زاینی سالّی فیل، نزیك بەو ساڵە عەبدولموتەلیب شتی زۆری بەسەر هات، عەبدوڵلای کوڕی مرد، بەلاّم خوا بە موحەممەد پاداشتی دایەوە و بۆی پڕکردەوە.

مێژوونووسان جۆراوجۆرن لەسەر هەڵوێستی عەبدولموتەلیب، کە بۆچی پاراستنی خۆی و ماڵ و شار و خەڵکی پێ باشتربوو لە بەرامبەرکێ و شەرکردن لەگەڵ ئەبرەهە، هەندێك دەڵێن: "دەبوو بەرەنگاری ئەو سوپایە بوایەتەوە و هەندێکیش ئەو هەڵوێستە بە حەکیمانەتر دەزانن"، بەلاّم هەموو خاوەن ئەزموون و زەینێك دەزانێ کە عەبدولموتەلیب و چەند هۆزی تریش نەیاندەتوانی بەرەنگاری سوپای ئەبرەهەی خاوەن ژمارە و چەك و فیل ببنەوە و هەموو تیادەچوون، ئەوان بەمەنیان گرت و شارستانیەتی حەمیریان رووخاند کە دەوڵەت بوون و خاوەن سوپا بوون، خۆ قورەیش سوپای رێكوپێکی نییە، خاوەن چەك و جبەخانە و پارمەتی و تەموین نین، هەر، بۆیە چاکترین هەڵوێستی وەرگرت، خۆی و خەڵکی شار و سەر و ماڵی پاراست، داوای لە خوا کرد کە کاری خۆی بکات و ماڵەکەی خۆی بپارێزێ، خوای گەورەش دوعاکەی گیراکرد، شار و خەڵك و کەعبەی پاراست، قورەیش تەنها بازرگانیی دەزانی، حەز و ئارەزوویان لەگەڵ شەڕ نەبوو، وەك عەبدولموتەلیب بە نێردراوی ئەبرەهەی وت: "شەڕمان ناوێ و هێزی ئەوەمان نییە"، عەبدولموتەلیب مەککەی کردبووە شاری کراوە و هەموو کەس بێ بازگە بە کاروانەوە بۆ بازرگانیی و حەج دەچوونە ناوی، هەروەك شارە بازرگانییەکانی ئەمڕۆ، هەندێ شار لە جەنگی جیهانیی دووەمدا وایان دەکرد لەبەر شوێنی شارستانیی و بازرگانییان کراوەیان کردن، هەتا ئەوەی تیایەتی لە کەلەپوور و ئاسەوار و داب و نەرێت پارێزراوبێت، ئەبرەهەش وتی: "من نەهاتووم بۆ شەڕی ئێوە و خوێن رشتنتان، تەنها کاری من کاولکردنی کەعبەیە"، ئەبرەهە یەکەم کەس بوو دەستپێشخەریی کرد لە رێکەوتن و قسەکردن، عەبدولموتەلیبیش لەسەر داوای ئەبرەهە کشایەوە، دووری خەڵکەکە شارەکەشی پاراست لە هێرش، لەناوچوونی ئەبرەهە و سوپاکەی لە دووری شاری مەککەوە بوو، نەك لە ناوو

قەراغ شار، کە عەبدولموتەلیب زانی چەك چارە نییە، دوو ڕێگەی گرتەبەر، یەکەم: بە خەڵکەکەی وت لە شار دەرچن و لە کێو و دۆڵەکان پەنا بگرن، دووەم: ویستی بە پارە و سامان و ئاڵتوون ئەبرەهە بخەڵەتێنێ، سێ یەکی پارە و سامانی توهامەی دایە ئەگەر بگەڕێتەوە، بەڵام ئەبرەهە رازی نەبوو[1]. پێشتر ئەبرەهە لە ڕێگە عەرەبەکانی شکاندبوو، سەرکردەکەیانی دیل کردبوو، دیارە عەبدولموتەلیب خاوەن ئەزمون و دووربین و حەکیم بوە، بەڕاستی دڵسۆزی خەڵکەکەو شارەکەبوە، هەموو توانای بەختکردوە بۆ سەلامەتییان و ڕزگارکردنیان لەو بەلاّ توشهاتوە .

قوڕەیش حکومەتێکی بچووك، یان میرنشینێك بوو، پایتەختەکەی مەککە بوو، وەك دەوڵەتی شار، ژیانیان لەسەر بازرگانیی بوو، سیاسەتی ئاشیخوازانەی هەبوو لەگەڵ هۆزو وڵاتە دراوسێکانیدا.

پێش ئیسلام حەج سێ مانگ بوو، زولقەعدە زولحیجە موحەڕڕەم، هەندێکی تر دەڵێن: حەج، شەوال و زولقیعدە و زولحیجە بوو، بۆیە سێ مانگ بوو هەتا خەڵکی لە دوورەوە بتوانن بگەنە ئەوێ، ماوە زۆر بێت لە رۆژی گەشتنداو فریا بکەون حەجی خۆیان بکەن، حەج هەر بۆ قوڕەیش و خەڵکی حیجاز نەبوو، بەڵکو لە یەمەن و نەجد و شام و عێراقیشەوە دەهاتن، هەبوو حەنەفی و یەکتاپەرست بوو، یان سابئە و جولەکە و گاور و هیندی و فارس و خەڵکی تریش دەهاتن، هەبوو بۆ حەج دەهات، هەبوو بۆ حەج و بازرگانیی، هەیشبوو بۆ گەیاندنی ئاین و خۆپیشاندان و شانازیی و وتاردان و شیعر خوێندنەوە دەهات، یان گرفتێکی هەبوو بۆی چار نەدەکرا لەو بارو زروفە هێمنەدا نەبێت، ئەوکاتەش حەج سەفا و مەڕوە و موزدەلیفە و مەناسیکەکانی تری هەبووە.

لە سەردەمی نەفامییدا یاسای (حومس) هەبوو، واتە: ناوچەی کەعبەو حەرەم پارێزراوە و خاوەنداریتی بەدەست قوڕەیشەوەیە، هەموو ئەرکێکی ئاسایش و

---

[1] الکعبة، ص٩٥. الطبري، ج٢، ص١١١.

ئارامیی و ئاوو خواردن ئامادەکردن و خزمەتکردن لە دەستی ئەماندا دەبێ و کەسی تر بۆی نییە سنوور شکێنی بکات، هەموو خەڵکی تر میوانە، مەبەست لە حومس کوڕی ولات یان کوڕی حەرەم و هاونیشتمانی و جێنشین کە پەیوەستە بە کەعبە و مەقامەوە.

لە یاسا نێودەوڵەتیە نوێکانیشدا مافی هاونیشتمانیی بە خوێنە، واتە ئەوەی لەو خاکە لە دایك بووبێ، بیرۆکەی حومس بڕیاردانە لەسەر هەقی هاونیشتمانی کە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ناوچەیە، هەرکەس ئەوەی هەبێ هەموو ئیمتیازێکی بۆ هەیە، ئەوە بیرۆکەیەکی راستە، رێز دەداتە خەڵکی حەرەم، ئەوانیش هێمنیی و ئاسایش و ئارامیی زیارەتکەران دەپارێزن، ناهێڵن کەس ئازاریان بدات و تالانیان بکات، مافی پەنابەرێتی لە مافی حومسەوەیە، واتە هەتا لای ئەوانن پارێزراون و لەزیمەی ئەواندان.

کەعبە هەر لای هۆزی قورەیش پیرۆز نییە، بەڵکو لای هەموو هۆزە عەرەبیەکان پیرۆز بووە، لە هەموو یادو ئاهەنگ و جەژنەکانیاندا رەنگی داوەتەوە، شاعیرو وتارخوێنان زۆر باسیان کردووە، ئەمە وای کرد شاری مەککە هەمیشە قەرەباڵغ و ئاوەدان بێت و بووە شارێکی گەورە، بەتایبەت دوای رووخانی دەوڵەی حەمیری لە یەمەن، پیرۆزیی کەعبە و پێشکەوتنە بازرگانیەکەی و شوێنی جوگرافیەکەی، ئەمە جگە لە بەرزیی خەڵکی مەککە لە رووی کرانەوە و شارەزایی و خوێندەواریی، چونکە بەرزبونەوەی ئاستی خەڵکی مەککە لە رووی رۆشنبیرییەوە، کاریگەر بوو بەو پەیوەندییە چاکەی لەگەڵ دەوڵەت و گەلانی ناوچەکەدا هەیانبوو، قورەیش هەوڵیدا کە ئاشتی بەرقەرار بکات لە مەککەدا و لە هەموو ولاتی حیجازدا، هەتا حاجیەکان و بازرگانەکان هانبدات بە هێمنیی و ئاسایش بێنە مەککە، قورەیش خۆی دووردەگرت لە جەنگی هۆزەکان، سەرکەوتوو بوو، دەسەڵاتی هەبوو بەسەر هەموو هۆزە عەرەبیەکاندا، پەیوەندیی سیاسیی و بازرگانیی لەگەڵ ولاتە دراوسێکانیشدا هەبوو، جۆرەها شارستانیی و رۆشنبیری لێوەگرتن هەبوو، کاریگەر بوو بە یاسا سیاسیی و کۆمەڵایەتیەکانیان.

قورەیش گرنگیی دەدا بە کاروباری مەککە، ئاسانکاریی دەکرد بۆ کاتی حەج، خزمەتگوزاریی شارەوانیی و ئامادەکردنی ئاوو خۆراك و ڕێکخستنی ڕێگاویان و پاك و تەمیزی و پاراستنی شار لە لافاو و ڕۆشنکردنەوەی شەقامەکان و کردنەوەی ئاگر لەسەر کێوە بەرزەکان بۆ ڕێنیشاندانی خەڵك و کاروانی حاجی و بازرگانی.

لەو سێ مانگە حەرامەدا دەبوو شەڕ و قڕەقڕ و ناکۆکیی ڕوونەدات، عەرەبەکان خۆیان دەبەست و کەلوپەل و شتومەکیان بە کۆڵ و بار دەهێنا بۆ مەککە، لە دەوری بیرەکان هەڵیاندەداو ساغیان دەکردەوە، کڕین و فرۆشییان پێوە دەکرد، خۆیان دەناساند و ماوەیەك ڕایان دەبوارد، پاشان دەچوونەوە بازاڕی عوکاز بۆ سەیرکردنی کۆڕی شیعرو وتارو حیکمەت و بینینی شاعیران و ناسراوان و حەکیمان و گەورانی ناوچەکان کە هەر ناویان بیستبوون و نەیاندیبوون، عوکاز بازاڕێکی گەورە بوو، لایەکی بۆ شاعیران و هونەرمەندان و کۆڕ و کۆبوونەوەو ڕاگۆڕینەوە تەرخانکرابوو، لایەکی تری بۆ کڕین و فرۆشتن و ئاڵوگۆڕی بازرگانی بوو، کە لە هەموو لاوە بۆی دەهات، کە لەوە دەبوونەوە، ڕوویان دەکردە کێوی عەرەفە و دەهاتنەوە مەککە بۆ جێبەجێکردنی کاروباری حەج، پاشان دەگەڕانەوە بۆ وڵاتەکانیان.

حەج کاریگەریی هەبوو لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتیی لە نیوەدوورگەی عەرەبدا، هۆزەکان تێکەڵ دەبوون و بە ئاشتیی دەژیان و دوژمنایەتیان لەبیردەچوویەوە و خۆیان دەناساند و یەکیان دەناسی و کڕین و فرۆش و ژن و ژنخوازیان دەکرد و گرفتەکانیان چارەدەکرد.

هەرکەس لە گەورەکانی قورەیش کاری خۆیان دەزانی بەرامبەر کەعبە و حاجیەکان، هاوکاریی یەکتریان دەکرد بەرامبەر حاجیەکان.

لەناو قورەیشدا پانزە پلە و پایە هەبوو، لە نێوان گەورەکاندا دابەشیان کردبوو، هەتا کێشە لە نێوانیاندا پەیدا نەبێت و یەکێتی بپارێزن و، هێمنیی و ئارامیی بەرقەرار بێ و حاجییەکان و بازرگانەکان هانبدەن ساڵانە سەردانی مەککە بکەن، بەرزترین ئەو پلانە سدانە و سیقایە و ڕوفادە بوون، سدانە زیوان بوو،

حجابــه خــاوەنی کەعبــە و کلیــل بەدەســت بــوو، ئــەو دەرگاکــەی دەکاتــەوە و دایدەخات، پلە و پایەی زێوانیی بەرزترین دەسەڵاتە، پلەی دووەم سیقایەیە، ئـەم کەسە دەبێ ئاو ئامادە بکات بۆ حاجیەکان، ئەمە کارێکی زۆر قورسـە، چـونکە لـە مەککە ئاو کەمە، ئەوەی ئەم پلـەی بـە دەسـت بێـت، دەبێـت پتـەوو خـۆگر بێـت، توانایەکی نەپساوی هـەبێت، حـەوز دروسـت بکـات، لـە پـاڵ کەعبـەدا دایبنێ، لـە بیرەکانــەوە ئــاوی بــۆ بگوازێتــەوە، سـیقایە بـە دەسـت بـەنی هــاشمی کــوڕی عەبدولمەناف بوو، پلەی سێیەم رەفادە، واتە خۆراك ئامادەکردن بـۆ حاجییـەکان، قوڕەیش پارەیان لە کەسایەتییەکان کۆدەکردەوە لە کاتی حەجدا، هـەتا خـاوەنی رەفادە خواردن ئامادە بکات بۆ حاجییە هەژارەکان، بەوەی کـە میـوانی کەعبـەن، یەکەم کەس کـە کـاری رەفـادەی کـرد، قوسـەی کـوڕی کـیلاب بـوو، پاشـان هاتـە دەست بەنی نەوفل، دوای ئەوان بۆ بەنی هاشم.

لە پلە بەرزەکانی کە پەیوەندیی بە کەعبە و حەجەوە هەیە، پلەی (العمارة)یە، مەبەست ئەوەیە کـە کـەس لـە نـاو مزگـەوتی حەرامـدا قسـە و غەیبـەت و جنێـو و دەنگ بەرزکردنەوە نەکات، قوڕەیش یارمەتیی حاجی دەدا، یاریدەی ستەملێکراوی دەدا، هـەوڵی دەدا دادپـەروەریی بچەسـپێنێ، هـەر بـۆ ئـەو مەبەسـتە (پـەیمانی فـزول)ی دروسـتکرد، بڕیاریانـدا و پـەیمانیان مـۆرکرد کـە نـەهێڵن لـە مەککـەدا ستەملێکراوێك لە خەڵکی مەککە، یان خەڵکی تر لەوانەی دێنە نـاوی هـەبێ، ئەگـەر هەبوو پشتی بگرن، دەچوونە سەر ستەمکار و مافەکەیان بۆ دەسەندەوە[1].

کاری رەفـادە واتـە خـۆراك ئامـادەکردن و بەخشـین بـۆ حاجییـەکان، قوسـەی کوڕی کیلاب دایهێنا، پاشان کوڕەکانی لەسەر رێ و رەچەی ئـەو رۆیشـتن، پاشـان بووە سوننەتێکی پشتاوپشت، رەفادە پارەیـەك بـوو قـوڕەیش هـەموو وەرزێـك لـە پارە و سامان دەری دەکرد و دەیدایە قوسەی کوڕی کیلاب، ئەویش خـواردنی پـێ ئامادە دەکرد بۆ حاجییەکان، بەوانەی دەدا کە پارەیان نەبوو دەسـتکورت بـوون،

---

[1] العقد الفريد، ج١، ص٣٨. سيرة ابن هشام، ج١، ص١٤١.

قوسەی ئەو پارەیەی فەرز کردبوو لەسەر قورەیش، کە کاتی دەهات دەیگوت: ئەی گرۆهی قورەیش ئێوە دراوسێی خوان و خاوەنی ماڵی خوان و خاوەنی حەرەمن، حاجیەکانیش میوانی خوان و هاتوونەتە ماڵەکەی، ئەوان لە پێشترن بۆ میوانداریی و ڕێزلێگرتن، خواردن و خواردنەوەیان لە ڕۆژانی حەجدا بۆ ئامادە بکەن، هەتا دەڕۆن، ئەوانیش بە گوێیان دەکرد، هەموو ساڵێك لە پارەی خۆیان شتێکیان دەردەکرد، دەکرا بە خۆراك[1].

موتەلیب دوای هاشمی برای سیقایە و ڕەفادەی بەجێدەهێنا، مامەی کێبەڕکێی لەگەڵ دەکرد، ئەویش پەنای بۆ خاڵوانی لە بەنی نەجار لە یەسریب برد، توانی سەرکەوێ لە گێڕانەوەی پلە و پایەی باوکی، وەك ئیبن هیشام دەڵێ: "پاشان عەبدولموتەلیبی کوڕی هاشم سیقایە و ڕەفادەی لە موتەلیبی مامی وەرگرت و کارەکانی باوك و باپیرانی دەکرد، بە جۆرێك کە ئەوەندە شەرەف و ڕێزی لای هۆزەکەی بەرزبوویەوە کە هیچ کەس لە باب و باپیرانی نەیگەیشتبوونێ، گەلەکەی زۆریان خۆش دەویست".

عەبدولموتەلیب هەردوو پلەی سیقایە و ڕەفادەی لەدەستدابوو، زەحمەتی زۆری بوو بۆ پەیداکردن و ئامادەکردنی ئاوی پێویست بۆ حاجیان، ئەوانەی کە لە وەرزێکی تایبەتدا دەهاتنە مەککە بەتایبەت کە مەککە لە چاخێکی بێ ئاوی و کەمبارانیدا دەگوزەرا کە خەریك بوو بیرەکان وشکیان دەکرد.

عەبدولموتەلیب جگە لە ئاوەکە، هەندێ کەلوپەلی بەنرخی گرانبەهای دەستکەوت کە هی مزازی جورهومی بوو، کە لەبیری زەمزەمدا شاردبوویەوە و بیرەکەی بەسەردا کاولکردبوو، خۆی هەڵهاتبوو هەتا نەکەوێتە دەست خەڵك، قورەیش داوایانکرد بەشدارییان بکات لەو کەلوپەلەدا، هەتا چوونە لای شارەزایەك ناوبژیی کردن.

ئەو کەلوپەلە دوو ئێسکی ئاڵتون و شمشێر و قەڵغانی تیابوو، خاوەن پەرداخەکە کە پەرداخی لێداو وتی: "دوو ئاسکەکە بۆ کەعبە و شمشێرو

---

[1] الكعبة، ص ١١٥.

قەڵغانەکانیش بۆ عەبدولموتەلیبە، عەبدولموتەلیب شمشێرەکەی دا لە دەرگای کەعبە و دوو ئاسکەکەشی هەر دا لە دەرگای کەعبە، بەڵام بریقەداریی و جوانی دوو ئاسکەکە وایکرد دەستی دزی بگاتێ و لە تاریکی شەودا لەگەڵ هەموو شتە بەنرخەکاندا بردیان".

عەبدولموتەلیب ئاوی زەمزەمی بە ئاسانی و بێ زەحمەت و ماندوبوون دەگواستەوە بۆ حەوزەکانی کەعبەوە، ئاوەکەی شیرین دەکرد بە خورما و دۆشاو، دەیکردە شەربەت و خۆشاو، عەباسی کوڕی باخی ترێی هەبوو لە تائیف لە نزیکی مەککە، باوکی چەندی پێویست بوایە لە مێوژ بۆی دەهێنا [1].

عەرەبەکان کە دەهاتنە حەج، قۆچ و قوربانیان دەکردو حەیوانیان لە بەردەم بتەکاندا سەردەبڕی، یان بۆ سوپاسگوزاری خوا وەك هەدیە، یان بۆ قوربانی بۆ خواو کەعبە. ئەوە دابێکی کۆن بووە و هەموو میللەتان بوویانە، بەڵام لە کەعبە و حەجدا دەڵێن پەیوەستە بە هەدیە و قوربانییەکەی ئیبراهیمەوە کە ویستی ئیسماعیل سەرببڕێت.

هەروەها پێش ئیسلام عەرەب عومرە، عەرەفە، موزدەلیفە و مینایان هەبوو، قوربانیان دەکرد و بتیان دەپەرست.

دکتۆر جەمال وادەزانێ ئەو عەرەبانە پێش ئیسلام هیچ بیروڕاو زەین سەلیقەیەکیان نەبوە، هەموو وەحش و درندەو نەخوێندەوار بون، ئەو نازانێ خەڵکی حیجاز شاعیرو بیریارو حەکیمی مەزنیان تیا هەڵکەوتبوو، زۆریان ئەو بت و داروبەردانەیان لا سووك و بێنرخ بوو بوو، بیریان جوڵابوو کە دەبێ ئەو دۆخە نالەبارە بگۆڕێت، هەستیان دەکرد کە سەرهەڵدانی پێغەمبەرو فریادرەس نزیکە، عەرەبەکان ئەو بتانەیان بە تەواوی بە خوا نەدەزانی، خوێناوی قوربانیەکانیان پێدا دەسوو بۆگەنی دەکرد، دەیانزانی ئەمانە ئەوە نین، بەڵام هەر داب و خوویان پێوە گرتبوو، کەسێك نەبوو بە توندیی رایان چڵەکێنێ، ئیمانی تەواویان پێیان

---

[1] الكعبة، ص١١٨.

نەبوو، بەڵکو لە کەمترین تورەبووندا خواکانی خۆیان دەشکاند و فرێیان دەدایە دەرەوە، بانگیان دەکردن وەك بزانن ئەمانە ئەوە نین، گاڵتەیان پێدەکردن، بەتایبەتی پێش ئیسلام بە نیو سەدەیەك بتەکانیان لا سووك و سەلیم بوو بوو، لە بارێکی دوو دڵیی دەروونیدا بوو، هەستیان بەرامبەر بتەکان کز بوو بوو، لە داب و نەرێت و یاسای ئایینی خۆیان رازی نەبوون، دەست کۆتا و لاوازبوون لەوەی کە بیرۆکەیەکی باشتر بهێنن، لەگەڵ بیرو بۆچوون و داواکارییاندا بگونجێ، عەرەبەکان لە ناکۆکییەك و ناجۆریەکی بیروڕادا بتپەرستییان دەکرد، دەیان گومان و ڕاو بۆچوونیان هەبوو لە بتپەرستیەکەیاندا، بێئەوەی بگەنە رایەکی باش، یان دروستکردنی بیروڕایەکی راست و دروست.

پێش هاتنی ئیسلام هەندێك لە ناسراوانی عەرەب و کەسایەتی جیاواز ناڕازیبوونی خۆیان بەرامبەر بتەکان دەردەبڕی، هیوایان دەخواست بۆ ئایینێك لەمانەی خۆیان باشتر بێت، ئیبن هیشام دەگێڕێتەوە و دەڵێ: رۆژێك ناودارانی قورەیش لە جەژنێکیاندا لای یەکێك لە بتەکانیاندا کۆبونەوەو قوربانیان بۆ دەکردو بە پیرۆزیان رادەگرت، چواریان بە چپە قسەیان دەکرد و دەیانگوت با هەریەکە بڕیارێك بدەین و لە یەکتری بشارینەوە، هەندێکیان بەوی تریان دەگوت: وەڵڵاهی گەلەکەمان لەسەر هیچ بیرو رایەکی دروست نییە، ئایینی ئیبراهیمیان تێکدا بۆ بەردێکی رەق و تەق کە نە دەبیستێ و نەدەبینێ، نە زەرەری هەیە نە قازانج، بچن ئایینێکی تر بۆ خۆتان بدۆزنەوە، وەڵڵاهی ئێوە لەسەر هیچ نین، بڕۆن بە وڵاتاندا بگەڕێن هەتا ئاینێکی حەنەفی پاکی ئیبراهیمی دەدۆزنەوە.

دەڵێن: ئەنەسی کوڕی قەیس هاواری کردووە و وتوویەتی: کوڕە بۆ خاتری خوا واز لەم بتە رەق و تەقانە بهێنن، یان هەبووە وەك وەلیدی کوڕی موغیرە و عوسمانی کوڕی مەزعون داوایان کردووە واز لە ئارەق خواردنەوە بهێنن.

مەسعودی دەڵێ: عەرەب لە نەفامییدا جۆراوجۆر بوون، هەبوو یەکتاپەرست بووە، باوەڕی بە مردن و زیندووبوونەوە و هەق و حیساب بووە، هەبووە وەك بوحەیرای راهیب و قەیسی کوڕی ساعیدەی ئەیادی و خەڵکی تر، خەڵکیان

بانگکردووه بۆ لای خوا و بەڵگەکانی بوونی خوا، هەبوو خوای دەپەرست و دەبوت ئەم بتانە نزیکمان دەکەنەوە لێی، هەبوو بڕوای بە خوا هەبوو، بڕوای بە پێغەمبەران نەبوو، بڕوای بە زیندووبوونەوە نەبوو، دەیانگوت ژیان هەر ئەم دونیایەیە، دەژین و دەمرین و تەواو، هەبوو رووی کردبووە گاور و جولەکە، هەبوو مەلائیکەی دەپەرست و دەیانگوت کچی خوان.

ئیبن قوتەیبە لە (المعارف)دا لە لاپەڕە (٢٧)دا دەڵێ: زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نەفیل کوڕی مامی عومەر کوڕی خەتاب لە بتەکان رازی نەبوو، داوای ئاینی نوێی دەکرد، گاورەکانی شام کوشتیان، پێغەمبەر فەرمووی: ئەو زیندوو دەکرێتەوە ئەو یەك میللەتە، ئومەیەی کوڕی ئەبی سەلت کتێبەکانی خوێندبوویەوە و وازی لە بتپەرستی هێنابوو، هەوڵی سەرهەڵدانی پێغەمبەری نوێی دەدا. هەروەها ئیبن قوتەیبە دەڵێ: ئەسعەدی کوڕی ئەبو کەربی حەمیدی بڕوای بە پێغەمبەر هێنابوو پێش حەوت ساڵ لە هاتنی پێغەمبەر، دەفەرمووێ قەیسی کوڕی ساعیدەی ئەیادی - کە حەکیمی عەرەب بوو - دیم لە بازاڕی عوکازدا وتاری دەدا لەسەر حوشترێکی سوور بوو، قەیسی کوڕی سەمیرەی کوڕی ئەبی ئەنەس لە بەنی نەجار خۆیکردە خواپەرست و مەسوحی لەبەرکرد و وازی لە بتەکان هێنا و چووە ماڵەوە و کردیە مزگەوت و دەیگوت: خوای ئیبراهیم دەپەرستم، کە پێغەمبەر هاتە مەدینە موسڵمانێکی چاکی لێدەرچوو.

ئیبن قوتەیبە دەڵێ: خالیدی کوڕی سەنان کوڕی غەیس لە بەنی عەبەس کەسێکی خواپەرست بوو، لە پێغەمبەرەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی: (ئەو پێغەمبەر بوو، گەلەکەی - هۆزەکەی - پشتگوێیان خست)، ئیبن قوتەیبە دەڵێ: کچەکەی هات بۆ لای پێغەمبەر گوێی لێبوو دەیخوێندەوە (قُل هوَ اللّهُ أحَد) وتی باوکیشم ئەوەی دەوت.

(جوزیف هل) مێژوونووسی ئەڵمانی لە (الحضارة العربية ، جوزيف هل، ص١٩)دا دەڵێ: لە وڵاتی عەرەبدا کەسانێك، بەتایبەت لە مەککەدا هەبوون نارەحەت بوون بە دەست ئەو ئایینە بتپەرستیەی کە هەبوو، دەبوونە گاور و جولەکە، یان جۆرە پەرستشێکی تریان دەکرد کە نوێ، یان لەپێشتر بوایە.

(ویتلف نیلسن) دەڵێ: بتپەرستیی پێش ئیسلام خوای کاتی تێکچوون و داڕووخان بوو، پێش ئیسلام پەیدابوو، پێش ئیسلام بزاوتێکی چاکسازی ئایینی هەبوو، داوا گەڕانەوەی دەکرد بۆ ئایینی پاکی ئیبراهیم و پاککردنەوەی کەعبە لە بت و چاککردنی بارودۆخی عەرەب، قوتابخانەیەکی نوێ پەیدابوو کە بیروڕایەکی نوێی هەبوو، داوای گەڕانەوەی دەکرد بۆ حەنەفیە، لە ناو عەرەبدا کەسانی رۆشنگەری هەبوو داوایان دەکرد بۆ چاککردنی باری خراپی ئایین و وازهێنان لە بت و، گەڕانەوە بۆ ئایینی یەکتاپەرست و ئایینی ئیبراهیم و، وازهێنان لە داب و نەریتی نەفامیی، بیروڕایان وابوو زیندووبوونەوە و حیساب و کیتاب هەیە، پاداشتی چاکە و خراپە وەردەگیرێ، قورئانیش لە سورەتی (آل عمران) ئایەتی (٦٧)و (١٧٧)دا باسی کردووە، کەعبی کوڕی لوئەی یەکێك لە باپیرانی پێغەمبەر، لەو حەنەفیانە بوو، قورەیشییەکانی کۆدەکردەوە و داوای لێدەکردن بیر لە دروستکردنی ئاسمان و زەوی و شەو و رۆژ و مردن و زیندووبوونەوە بکەنەوە، مژدەی سەرهەڵدانی پێغەمبەرێکی دەدا.

حەنەفی ئەوانە بوون کە پارێزگارییان لە ئایینی ئیبراهیم دەکرد، شەریك و هاوەڵیان بۆ خوا پەیدا نەدەکرد، نەدەبوونە گاور و جولەکە، لە بتپەرستی دووردەکەوتنەوە، قورەیش هەموویان پێش سەردەمی عەمری کوڕی لەحی خەزاعی باوەڕیان بە خواپەرستیی ئیبراهیم هەبوو، وەرەقەی کوڕی نەوفل شارەزابوو لە ئایینە ئاسمانیەکان و بڕوای بە خوا هەبوو، بتی نەدەپەرست، بەڵام ئەوەبوو حەنەفیەکان وەك بتپەرستەکان کۆمەڵ و یەك نەبوون، بەڵام لەسەر ئایینی ئیبراهیم بوون و هەبوون، بۆیە خوا باسیان دەکات، ئەو حەنەفیانە لە هەموو جێیەك و لە هەموو سەردەمێکدا هەبوون، کە مەبەستیان دوورکەوتنەوە بوو لە بت و هەندێ داب و نەریتی خراپ، بەڵام توانایان نەبوو زاڵ ببن بەسەر کۆمەڵگایەکی بتپەرستی نەفامی نەخوێندەواردا، هیچ هێزێکیان نەبوو.

بەڵام پێغەمبەر کە هات، پێش ئیسلام بڕوای وابوو کە دەبێ و کاتی ئەوە هاتووە هەڵسن بە بزووتنەوەیەکی چاکسازیی ئایینی، چونکە دەیبینی مرۆڤایەتی

خەساربووە و ڕۆچووە لە بتپەرسییدا، بۆ چارەیەك دەگەڕا، هەر بۆیە زوو زوو پەنای دەگرت، شەوو ڕۆژی بە بیرکردنەوەوە بەسەر دەبرد، نوێژی دەکرد و حەنەفیەکانی تریش هەر پەنایان دەگرت و لە بیرکردنەوەدا بوون، پێغەمبەر پێش ئیسلام لە حەنەفیەکان بوو، پاکترین و دامەزراوترینی حەنەفییەکان بوو، هەر، بۆیە لە چلساڵیدا جوبرەئیل هات و مژدەی پێغەمبەرایەتی پێدا.

هەرچەند کاری حەنەفیەکان سەرکەوتوو نەبوو، بەڵام دەلاقەیەکی چاکی کردەوە بۆ بیرکردنەوە و زیندووکردنەوەی ناخ و وریابونەوەی زەمیرو هەستکردن بە بەرپرسیارێتی، کە هاورێ بوو لەگەڵ دەرکەوتنی عەقیدەی یەکتاپەرستییدا، وریابوونەوەی ناخ هەندێ هەستی شاعیرانەی مرۆڤایەتی بوو لە سەدەی شەشەمی زاینییدا لە هۆنراوەکانیاندا دەریان بڕیوە[1].

پێغەمبەر لە تەمەنی سی و پێنج ساڵیدا (هەندێك دەڵێن ٢٥) ساڵیدا بوو بەشداریی دروستکردنەوەی کەعبەی کرد، ساڵانێك بوو قوڕەیش بیری دەکردەوە لە کەعبە، سەقف و سەربانی نەمابوو، دیواری نزم بوو، بە ئاسانی دز کاری خۆی دەکرد، هەندێ شتی بەنرخیان دزیبوو، بەرزکردنەوە نۆ باڵ بوو، واتە حەوت مەتر بوو، دەرگاکەی لە سەر زەوی بوو، زیارەتکەران هەر لەوێوە کەلوپەل و پارە و بۆن و ئاڵتونیان تێدەخست وەك نەزر، مەککە چەند جار لافاو لێیدا و دیوارەکانی شەقکرد، قوڕەیش ناچاربوو چاکی بکاتەوە، هەل بۆ قوڕەیش ڕەخسا ئەو کارە بکات، لە سەر دەریای سوور لە جدە کەشتیەکی بازرگانێکی ڕۆم هەبوو، کە پاشای ڕۆم لە میسرەوە ناردبووی بۆ حەبەشە، دانیشتوانی کەشییەکە وەستا و کرێکار بوون، دەچوون بۆ حەبەشە هەتا کەنیسە دروستبکەن، وەفدێکی قوڕەیش بە سەرۆکایەی وەلیدی کوڕی موغیرە چوون بۆ جدە هەتا ئەو کەشتیە بکڕن، لە مەککە کەسێکی دارتاشی گاور هەبوو ناوی (یاقوم) بوو، خانووی کەعبەی لە

---

[1] الكعبة، ص ١٢٤-١٢٧.

تەختـەی ئـەو کەشـتییە بـۆ دروسـتکرا[1]، ئـەنجا کەلوپـەل و پێویسـتی تریـان بـۆ ئامـادەکردن، بــە ترســەوە دەسـتیانکرد بــە رووخـانی دیـوارە کۆنــەکانی و پاککردنەوەی جێگەکەی و ناوەکـەی، سـەرەتا کـەس نەیدەوێرا بیڕوخـێنێ، بـەڵام وەلیدی کوڕی موغیرە پاچی هەڵگرت و وتـی: خوایەگیان ئێمـە خێرمـان دەوێ بـۆ ماڵەکەت، ئەنجا دەستیکرد بە رووخانـدنی، خەڵکەکـە شـەو و ڕۆژێك چـاوەڕوانیان کرد وەلید شتێکی لێبێت، کە زانیان دونیا کش و ماتە، وتیان وا دیارە خـوا ڕازیـە، بۆ ڕۆژی دوایی هەموو دەستیان پێکرد و بناغەکەیان گەیانـدە سـەر بناغەکـەی کـە ئیـبراهیم دایناـبوو، کـە بـەردی سـەوز بـوو، هـەر لەسـەر ئـەو بناغەیـە دەسـتیان پێکردەوە، تەواویان کرد و بە دارەکان سەقف و نەخشیان بۆ کرد.

جارێکیتر بینای کەعبەیان دروستکردەوە، خانووەکەی نزم بوو، دەرگاکـەی لـە ئاستی زەوییدا بوو، لە سەردەمی ئیبراهیمەوە هەروابوو، وتیان: خانووەکە وا بـەرز بکەینەوە کە خەڵك بە پلیکانە بۆی سەر بکـەوێ، ئەوسـا دزو دەغـەڵ و پیـاوخراپ ناتوانێـت زەرەر بـدات و دەبینــرێ، گـەورەکانی قـوڕەیش کۆبوونــەوە و بــەردی چـاکیان لـە گـرانیتی شـین نـەقارێ کـرد کـە لـە شـاخەکانی نزیکـەوە هێنابوویـان، بناغـەیان هەڵسـانەوە هـەتا گەیشـتە ئاسـتی شـوێن بـەردە رەشـەکە، ئـەو کاتـە چینەکان بەوەندەی باڵای مرۆڤێك بەرز بووبوویەوە، ویستیان بەردەکـە بخەنـە لای راستیەوە، بەڵام گـەورەکان نـاکۆك بـوون کـە کـێ شـەرەفی دانانـەوەی بەردەکـەی بەربکـەوێت، لـە یـەك سـووربوونەوە و خـەریکبوو شـەڕ بقـەومێ، بەرامبـەر یـەك وەسـتان و سـێ چـوار شـەو کارەکـەیان وەسـتاند، پاشـان دانیشـتنیان کـرد و قسەوباسیان گۆڕییەوە، هەریەکە رایەکی وت، ئەبو ئومەیە کوڕی موغیرە، پیرتـرین پیاوی قوڕەیش هەڵسا و وتی: ئەی قوڕەیش ئـەو کەسـەی کـە یەکـەم کـەس دێتـە مزگەوت ئەوە بکەنە ناوبژیوانی خۆتان و رایەکـەی وەربگـرن، وتیـان: باشـە، پـاش ماوەیەك چاوەڕوانی دەبینن ئەوا موحەممەد هاتە ژووری مزگەوت، پێشتر یاریدەی

---

[1] مسعودي، مروج الذهب، بەرگی۲، ل ۲۷۸. سيرة ابن هشام، ج۱، ص ۲۰۵.

دابوون لە هێنانی بەردەکاندا، دەیانناسی کە ئەمین و خاوەن کەسێتیی خۆیەتی، وتیان: رازین بە بریاری، موحەممەد فەرمووی پارچە قوماشێکم بۆ بهێنن، پارچەکەی راخست و بە دەسی خۆی بەردەکەی خستە سەر قوماشەکەو وتی: هەر هۆزێك با سووچێکی قوماشەکە هەلگری، بەرزیانکردەوە هەتا گەیاندیانە ئاستی شوێنەکەی، موحەممەد سەرکەوت و بە دەست خۆی خستیە شوێنەکەی، قورەیش خانووەکەیان هەتا بەرزی (١٨) باڵ بەرزکردە، دەرگاکەیان بەرزکردەوە هەتا بزانن و ببینن کێ سەردەکەوێ، لە ناوەوەش کۆڵەکەیان بۆ دانا، لە سووچێکەوە پەیژەیەکیان بۆ کرد کە پیا سەرکەون بۆ سەربانەکەی، هوبەلیان لەناودا دانا و کەلوپەلە بەنرخەکانیشیان تیا دانایەوە[١].

یەکێ لە قورەیشیەکان وتی: سەیرم لە هۆزێك دێت خاوەن شەرەف و سەرۆك و گەورە و پیر، پەنا دەبەنە بەر بە تەمەن بچووکیان و کەم دەرامەتیان، دەیکەنە سەرۆك و دادوەر، بەلام بە لات و عوززا لە هەمووتان لە پێشترە و بەختی لە هەمووتان زۆرترەو، دوای ئەم رۆژە ئەمە دەنگ و باسێکی گرنگی دەبێت[٢]. قورەیش ئەو وێنە و بتانەی گێرایەوە بۆ ناو کەعبە، وێنەی ئیبراهیم و ئیسماعیل و منداڵەکانی، دەڵێن قوسەی شەست وێنە بووە.

خەڵك ناکۆکن و یەکرانین لە تەمەنی پێغەمبەر لە کاتی دروستکردنەوەی کەعبە، دەڵێن: ٢٥ ساڵ بوو، ئیبن ئیسحاق دەڵێ: (٣٥) ساڵ بوو، بەلام هەرچۆن بێت، نابێ کەسانی نەخۆشی وەك دکتۆر جەمال ئەمە بکاتە گرفت و قسەو باسی هەڵەو دەردی ناودڵی بۆ دروستبکات، ئەوە کێشە نیە، گرنگ ئەوەیە ئەو لە تەمەنێکدا بووە خەڵك خۆشیان ویستووەو بە بۆچوون و رای رازیی بوون.

لەگەڵ بوونی بت و خەڵکی بتپەرستی زۆر لە کەعبە و مەککەدا، موحەممەد و خەڵکی تریش دەیانزانی ئەمە ماڵی خوایە، نەك ماڵی بت، زۆربوون دەیانویست کە دەبێ کەعبەی ئیبراهیمی یەکتا پەرست پاك بکرێتەوە لە بت و بتپەرستیی و ئەو

---

[١] الكعبة، ص ١٣٠-١٣١.

[٢] مروج الذهب، ج٢، ص ٢٧٩.

رەوشتە نزمەی خەڵك مامەڵەی پێدەكات، بەڵام هێزو توانایان نەبوو بەرەنگاری ئەو داب و نەریتە كۆنە ببنەوە، كە سەدان ساڵە رەگی بە قوڵایی ناخ و بیروباوەڕ و باری ئایینی و كۆمەڵایەتیی عەرەبدا چەقیوە، تەنها بە هەڵوەشاندنەوەی كۆمەڵگەی عەرەبیی لە بناغەوە چارە دەكرێت، ئەوەش دژوارە، بەبێ هێز و بیرۆكەیەكی بەتواناو پاڵپشتێكی خوایی ناكرێت، كەسایەتییەكی بە ئارام و دامەزراوو حەكیمی وەكو موحەممەدی دەوێ، هەڵگری ئەو پەیامەبێ و پاڵپشتێكی بەهێزی ئاسمانی لەگەڵدابێت، بە بیرۆكەیەكی هەمەلایەنەی پەروەردەیی نەرم ونیان، بەبێ شپرزكردن و برسكان و خەڵك تۆقاندن، لە ناخیانەوە دەستپێبكات و لە رەوشتیاندا دەربیخات، كۆمەڵێك پرسیار لەسەر عەقیدە و عەقڵ و داب و نەریتە كۆنەكانیان بوروژێنێ و بیانخاتە ژێر پرسیارەوە، كە سەرسام و دوو دڵ بن و خۆیان وەڵامی خۆیان بدەنەوە.

محەممەد ئەوەی دەستپێكردو رایچڵەكاندن، وای تەكاندن كە هەر خۆیان بە دەستی خۆیان بتەكانیان شكاند، گۆزەی شەراب و مەیەكانیان تەقاند، قێزیان لە كاری زیندەبەچاڵ و ژنهێنانی نابەجێ و سووخواردن و ستەمكردن دەهاتەوە، لە قەبارەی بیست ساڵدا هەموو نیوەدوورگە پاكبوویەوەو، گەیاندیانە ئەو پەڕی سنوری فارس و ڕۆم، پێغەمبەر هەر لە سەردەمی خۆیدا، نەك مەككە و مەدینە و حیجاز، بەڵكو یەمەن و حەزرەمەت و عومان و بەحرەین و نەجد و یەمامە و سنوری شام و عێراقی پاككردەوە، كە رووبەرەكەی ملیۆن و چارەكێك دەبوو لە میلی چوارگۆشە، ئەم بیرە نوێیە لە كەمترین ماوەدا كۆمەڵگەی عەرەبی هۆزەكیی لە بناغەوە هەڵتەكاندو هەڵوەشاندەوە و سەرلەنوێ دروستیكردەوە، داب و نەریتێك كە سەدەها ساڵ بوو دامەزرابوو كاریان بۆ دەكرد، دەیان هۆزی وەك قورەیش و رەبیعە و موزرو ئیاد و خەزاعەی لە ژێر ئاڵاكەیدا یەكخست و كۆكردەوە. قورەیش لە سەرەتاوە بەربەرەكانیان كرد و دەیانگوت: ئەگەر دوای بكەوین دەبێ بتەكانمان فرێ بدەین و نرخ و پیرۆزییان نەمێنێ، ئەو ڕێز و دەستكەوت و دەسەڵاتەی هەمانە دەڕوات و سادە دەبینەوە، وەك بیلال و سوهەیب و عەمارمان لێدێت.

موحەممەد مرۆڤە پێش ئەوەی پێغەمبەر بێت، بەڵام دابەزینی قورئـان و وەحـی بـۆ سـەری، پلـە و پایـەی پێغەمبەرایـەتی هێنـدەی تـر مرۆڤیایـەتی ئـەوی بەرزکردووەتـەوە کـە کردیوویـەتی بـە سـەروەری مرۆڤایـەتی، بـەڵکو سـەروەری پێغەمبەران و هاوەڵی مەلائیکە، خوا بە محەممـەد دەفـەرمووێ بڵـێ : (مـن مـرۆڤم وەك ئێوە وەحیم بۆ هاتووە) واتە تەکلیفکراوم و ئەرکێکی گەورەم لەسەر دانراوە.

موحەممەد ناوێکە، هەرگیز مـرۆڤ لـەوە شـیرینتری بـە دەمـدا نـەهاتووە، ئـەوە ناوێکە هەرگیز خەڵکەکان لەوە پوختتریان بە زەیندا نەهاتوە، ئەگەر دەتەوێ تامی ئـەو لەزەتـە بچـەژی، جـارێ، دوو جـار، دە جـار، بیلێـرەوە، دەبینی هـەموو جـار شـیرینتر و بەلـەزەتترو گەشـاوەتر دەنـوێنێ، ناوەکـە چـەند شـیرین بـوە، خـاوەن ناوەکـە سـەد هێنـدە شـیرین و بـەرزو مـەزن و نـاوازەو بێوێنـە بـوە، صـەحابەکان دەفەرموون کە وتەی دەبێـژا، وەك گەوهـەر لـە دەمـی شـیرینی بەربێتـەوە وابـوو، صەحابەیەك تر دەفەرموێ شەکر لە زاری موبـارەکی دەبـاری، بەتاییـەت صـەحابە دەهاتن بۆ سەیری نەك بۆ وتەی، بەڵام کە وتەی دەفەرموو، ئەوانـەی دەوروبـەری، دڵ و زەیـن و مێشـکیان بـۆ دەکـردەوەو وەریـان دەگـرت و لەبـەریان دەکـردو لـە خانەکانی دەماخیـان دەچەسـپی و کاریـان پێـدەکردو دەیـان گەیانـد، هـەر، بۆیـە سلاواتدان دانراوە بۆ ئەو کەسانەی کە ناوی موحەممەد دەبیسـتن و دەڵـێن، ئـەوە نییـە خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: سـەلاواتی لەسـەر بـدەن، خـۆی دەفـەرمووێ: هەرکەس یەك سلاواتم لەسەر بدات، خـوا دە سـلاواتی لەسـەر دەدات، زۆر سـەیرە، تۆی مرۆڤ یەك سەلاوات لەسەر موحەممەد بدە، خوا دە سەلاوات لەسەر تۆی مـرۆڤ دەدات، یەك لە تۆ، دە لـە خـوا، خـوا دەفـەرمووێ: خەڵکینـە مـن سـلاوات لەسـەر پێغەمبەر دەدەم، دە ئێـوەش سلاواتی لەسـەر بـدەن، ئامینـە دەفـەرموێ: پـێش منـداڵ بـوونم لـە خـەودا پێیـان وتم، تـۆ کورێکـت دەبـێ نـاوی بـنێ موحەممـەد، عەبدولموتەلیبی باپیریشی کـە پێیـان وت: ئـەم نـاوە چییە..؟ وتـی: دەمـەوێ لـە ئاسمان لای خوا و لە زەوی لە لای خەڵك سوپاسکراو بێت.

رەچەڵەکی پێغەمبەر پاکە و لە هێڵە پاکەکەوە هاتووە و خوا پاراستوویەتی، لەگەڵ ئەو خراپە و پۆخڵەکارییەی کە لە کۆمەڵگەی مەککەدا لە پێش ئیسلامدا هەبووە، بەڵام خوای گەورە پێغەمبەری لە گومان و تێکدان لە رەچەڵەك و رەفتاری موحەممەددا پاراست، هیچ گومانێك لە رەوشت و رەچەڵەکیدا نەبووە، باپیرانی موحەممەد نموونەیەکی پاکی شەرەف و پاکیزەیی بوون، بەردەوام لە یەکەم نوتفەوە پشت بە پشت و رەحم بە رەحم بە پاکیی لە گواستنەوەدا بوە، پێغەمبەر بە پێغەمبەر، ئافرەت بە ئافرەت، لە ئافرەتە پاکیزەکانەوە گوازراوەتەوە، واتە هەمیشە کۆڵ و باری مرۆڤە پاکەکان بوە، ئەم پاك داویەتیەوە بەو پاك، دەست بە دەست، کۆڵ بە کۆڵ، لە ئادەمەوە بۆ عەبدوڵا، لە دایە حەواوە بۆ دایە ئامینە، هەتا لە نێوان عەبدوڵلا و ئامینەدا بە پاکی چاوی هەڵێنا، بۆ سەردەمێك و دونیایەکی سەیر و تێکچوو لە دایك بوو، داخۆ ئەو گەشتە چەندی خایاندبێت..؟ لە ئادەمەوە بۆ عەبدولا چەند هەزار ساڵ دەکات.؟ هەموو پێغەمبەرەکانی دیوە، لە گەڵ هەموویاندا بوە کە لە ئاسمان هاتنە سەر زەوی، لەگەڵیاندا بوە کە لەدایك بون و گەورە بون و بونە پێغەمبەر، لە گەڵیان بوو کە لەبەهەشت دەرکران و لە شارەکانیان ڕاوەدونانایان کردن، لە گەڵ هەمویان ئازاری بانگەوازو وەلام دانەوی توندی گەلەکەیانی دی، لە گەڵ هەمویان بوو کە وەحیان بۆ دەهات و خوا دەیدواندن، وتەی هەموو زمانەکانی پێغەمبەرانی بیستوە، شێوازی هەموو بانگەوازکردنێکی دیوە، هێرشی هەموویانی دیوە کە بۆ حەق پەلاماریان بردوە، شکستی هەموویانی دیوە کەلەبەرخوا ڕاویان ناون و بە شمشێرو لەبەر خوا لەت و پەتکراون و کراون بە دوو کەرتەوە، شکست و سەرکەوتنی هەمویانی دیوە، خەفەت و ئاخ و ئۆف و، بزەو پێکەنینی هەمویانی دیوە، لە هەمویان وانەی وەرگرتوە، وانەی هەمویانی بە نەتەوەکەی وتوەتەوە، شەریعەتی هەمویانی زانیوەو پوختەی شەریعەت و دینداری هەمویانی بە گەلەکەی وتوەتەوە.

کاتێ هەرقل لە ئەبو سوفیانی پرسی کە ئەو کاتە بتپەرست بوو، وتی: رەچەڵەکی چۆنە..؟ وتی: خاوەن نەسەب و رەچەڵەکە. ئەو ئەبو قاسم

موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی عەبدولموتەلیب (شەیبە)، کوڕی هاشم (عەمر)، کوڕی عەبدولمەناف (موغیرە) کوڕی قوسەی (زەید)ە[1].

ئیبن عەباس لە تەفسیری ئایەتی (لَّا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْراً إِلَّا الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى) (الشوری : ٢٣ ) دەڵێ: واتە کەس لە خێڵەکانی قورەیش نییە، پێغەمبەر لە ڕەچەڵەك و پشتەوە پێیانەوە پەیوەست دەبێتەوە. ئیبن کەسیر دەڵێ: ئەوەی ئیبن عەباس ڕاستە، بەڵکو زیاد لەوەش هەموو هۆزە عەرەبە عەدنانیەکان، لە باوکەوە، یان لە دایکەوە، لە موحەممەددا کۆتاییان دێت، یان دەگەنەوە بە عەدنان هەروەکو هەندێ سیرەی پێغەمبەریش باسیکردووە[2].

سەیر ئەوەیە، حیکمەت ئەوەیە، خوای گەورە کوڕی بۆ محەممەد نەهێشت، کە دوای خۆی جێی بگرێتەوە، لە باتی باوکی پشتاو پشت ئاینەکە ببەن، ڕەنگە مەبەست ئەوەبێت، کە لە ئادەمەوە هات، لە محەممەددا کۆتایی بێت، ویستی وەکو ڕەچەڵەکی مرۆڤ کۆتایی پێبهێنێت، ئەو تۆوە پاکە کۆتایی هات، دوای خۆی کەس لە محەممەد نیە لە ڕەچەڵەکدا، تۆوی محەممەد گۆڕرا بە ئاینەکەی، گەر دەتەوێ لە ڕەچەڵەکی محەممەد بیت، ئاینەکەی هەڵگرەو بە گوێی بکە ئەوە لەویت، لە عەلی و فاتمەو حسێن لە پێشتری.

پێغەمبەر بە هەتیوی لە دایك بوو، باوکی مرد، ئەو دوای مردنی باوکی بە ماوەیەکی کەم لە دایك بوو، زۆری نەبرد شەش ساڵان بوو دایکیشی مرد، باپیری گرتیە لای خۆی، هەشت ساڵان بوو ئەویش مرد، ئەنجا چووە لای ئەبوتالیبی مامی، ئەویش هەتا مرد پشتی گرت، لەمەوە دەردەکەوێت پێغەمبەر برای نییە لە باوك و دایکی خۆی، بەڵام برای شیری هەیە، وەك حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیبی مامی، ئەبو سەلمەی کوڕی عەبدولئەسەد، کە سوەیبەی جاریەی ئەبی لەهەب

---

[1] تعريف عام بشخصية الرسول، ص ٢٦، محمد رشاد منصور شمس، دمشق، المشرف للكتاب.

[2] البداية والنهاية، ج١، ص١٨٨.

شیری داونەتیێ، ئەبو سوفیانی کوڕی حارسی کوڕی عەبدولموتەلیب، عەبدوڵڵاو ئاسیە و جودامە (شەیما) کە حەلیمەی سەعدیە شیری داونیێ[1].

پێغەمبەر وەك لە بیر و زەین و دەروونداا تەواو پوخت و بێ نکوڵیی بووە، لە لاشەدا تەواو پێکەوتەو جوان بوە، هەروەها لە شێوە و رەوشتیشدا تەواو بێ عەیب بووە، داوای لێبوردن دەکەین کە ناتوانین جۆرێك لە وێنەی ئەوتان، یان شێوەیەك لە وێنەی بە نزیککردنەوەش پێشکەش بکەین، وێنەی ئەو نموونە و هاوشێوەی لە دونیادا نەبووە و نابێت، وێنەیەك کە لە دەستمان چووە بیکێشین و، دڵ و دەروونمان وەك بەناوبردنی ناوەکەی دڵخۆش و بە تام دەبین، بە شێوەو وێنەشیدا دڵ گەشاوە بووینایە، وەك هاوڕێکانی لە دەوری دادەنیشتن و بە سەیرکردنی ناوچاوی نوورین و شێوەی شیرینی و گەوهەرینی بەهرەمەند دەبوون، وەك دەگێڕنەوە دەڵێن: کە پێغەمبەر ﷺ قسەی دەکرد وەك شەکر لە زاری موبارەکی بباریێ، یان وەکو نور لە دەمی بباریێ ئاوا دەدوا، وتەی شیرین و شێوەی نورینی کە خوا بەتایبەت کێشاویەتی و بە دیاریی بە دوا ئوممەتی بەخشیوە، بە راست هەموو مانایەکی جوان لەودا هەبووە، تەواوترین کردار و گوفتار و شێوە و رەوشتی بووە، هەموو تەواویەك لەودا بووە، کۆی جوانیەکان لەودا بووە، جوانترین و گەرمترین درود و سەلامی خوای لەسەربێت.

جوانیی ئەو بێ وێنە بووە، هەروەها هاوڕێکانی پێغەمبەریش تەواو جوان بوون، بەڵام نەك وەك موحەممەد، پێغەمبەران هەمیشە مەبەستی خوا بوون، خوا کاری پێ جێبەجێ کردوون، ئەرکی قورسی بۆ راستکردنەوە و پێشەوایەتی کۆمەڵگە پێسپاردون، لەبەر ئەوە لە خوورەوشت و شێوە و وێنەدا تەواو بێ عەیب و نکوڵیی بوون، لاشەیەکی ساغ و تەواو، دەروون و زەین و هەستێکی پاك و جوان و بێگەردی هەڵگرتووە، هەتا جێی توانای هەڵگرتنی کاری گەورە و ئەرکی قورسی خوای ببێت، پێغەمبەری ئێمە لە هەموویان لە جوانیی و وێنەو شێوەدا، لە زەین و

---

[1] تعريف عام بشخصية الرسول، ص ٢٨.

دەروون و هەستدا، تەواو بووە، لە هەموویان دەروونی پاکتر بووە، شێوەی جوانتر بووە، بە شێوەیەك كە هاورێكانی هاوسەردەمەكەی داوای لێ بوردن دەكەن لە وەسف و سەنای، وەك دەڵێن شەرمیان كردووە و لە رووداماون تێر سەیری ناوچاوی موبارەكی و، شێوەی پیرۆزی بكەن، لەبەر هەیبەت و مەزنیی كەسایەتی ئەو، وەك پیتۆڵ و زیرەكی عەرەب، عەمری كوڕی عاص دەڵێ: هیچ شتێك لە لام خۆشەویستترو، لەبەرچاوم درەوشاوەتر نەبوە لە پێغەمبەر، نەمدەتوانی چاوم تێر بكەن لە بینینی لەبەر جوانیی و درەوشاوەیی، ئەگەر پرسیارم لێ بكەن بۆتان باسبكەم، ناتوانم، چونكە نەمتوانی چاومی لێ تێر بكەم[1]، بەلام ئەوەی جێی تێبینیە تێكەڵی و هاتوچۆكردن و هاورێیەتی و وتوێژی سەحابەكان لەگەڵ پێغەمبەردا درێژ و چڕ و پڕە، پێغەمبەر تێكەڵیكردن، وەك هەر تاكێكیان خۆی جیانەدەكردەوە، هەموو رۆژێك پێنج جار بۆ نوێژكردن دەچووە ناویان، لەگەڵ ئەوانەدا، تێڕوانین لە پێغەمبەر شتێكی سانایی نەبوو، ئەو ئولفەت و تێكەڵییە، نەیدەتوانی زاڵ بێت و ئەو سنوور و عادەتە بشكێنێ، ئەوە یەكێكە لە سەحابەكان كە لە كاتی نوێژدا لە ریزی پێشەوە دەبێت، دەیەوێت جێیەك هەڵبژێرێ لە لای راست، كاتێك كە پێغەمبەر سەلام دەداتەوە چاوی بكەوێ بەڕوو و ناوچاوانی، یان كاتێك كە سەلام دەداتەوە و روویان تێدەكات.

كاتێك پێغەمبەر نەخۆش بوو، لە ماڵەوە بوو، ئەبوبەكر ئیمامەتی بۆ دەكردن، پێغەمبەر پەردەكەی لاداو سەیری ریزی نوێژخوێنانی دەكرد، خەریك بوو خەڵكەكە لە پشتی ئەبوبەكرەوە ئاگایان لە نوێژەكە نەمێنێ و تێبكەون، كە رووی شیرینی پێغەمبەریان بینی[2].

ئیمامی عەلی - رەزای خوای لێبێت - لە وەسف و سەنای پێغەمبەردا دەفەرمووێ: نە باڵای بەرز و نە كورت بوو، باڵ و رانی ئەستوور و چڕ بوو، سەری

---

[1] رواه مسلم (١٧٣) شرح صحيح مسلم إلنووي، (فتح الباري، ج٥، ص١٠).

[2] تعريف عام بشخصية الرسول، ص ٤١.

گەورە بوو، مەچەك و ئەژنۆی گەورە بوو، مووی سنگی تا ناوکی درێژ بوو، لە ڕۆشتندا سنگی بۆ پێشەوە بوو، وەك بڵێی بە لێژاییدا سەر دەکەوێت، نە لەوە و پێش و نە لە دوای ئەو وێنەی وام نەدیبوو[1].

پێش ئەوەی خوا ناوی بنێ بە پێغەمبەر، خەڵك لەبەر دەستپاکی و ڕاستگۆیی و وێنەی نەجابەت و ڕێزی ناویان نابوو ئەمین، هەندێ شتی دەزانی، پێشبینی دەکردو هەواڵی پێ دەدا، خەڵك دەیانزانی ئەم کوڕە جیاوازە و جۆرێ ترە، ئەمەی لە منداڵی و گەنجێتی و لاوێتیدا تیادیار بوو، دەزانرا کە قەدەر شتێکی نهێنی لەم کەسەدا شاردووەتەوە، کە لای حەلیمە بوو سنگ لەتکردنێکی لێ ڕوویدا، بە پەلە گێڕایانەوە بۆ لای دایکی و ترسان، شەوێك لەگەڵ هاوڕێکانی چوو بۆ سەیری شایی و هەڵپەڕکێ، کە گەشتنە جێگەکە، ئەم خەوی لێکەوت، خۆری سبەینێ خەبەری کردەوە ئاسەواری شاییەکە نەمابوو، هەڵسوکەتی لە ماڵی عەبدولموتەلیب و ئەبو تالیب و خەدیجە و لای هاوڕێکانی، شتی نهێنی زۆری پاشەڕۆژی ئەم کەسەی دەدرکاند، هەموو خەڵکی مەککە دەیانزانی ئەم منداڵە گەنجە لاوە، پیاوە، کەسایەتیەکی جیاوازە، وەك خەڵکی تر نییە، کە یەکەم شەو جوبرەئیل هاتە لای ترساو گەڕایەوە ماڵەوە، وایزانی شتێکی لێ قەوماوە، بەڵام خەدیجەی خێزانی هێوری کردەوە و وتی: نەخێر، وەڵاهی خوا هەرگیز تۆ سەر شۆڕ ناکات، تۆ زەحمەت دەبینی، هەژاران تێردەکەی، ڕێزی میوان دەگری، سەردانی کەسوکارت دەکەی، ئەمە شایەتی کەسێکە زۆر لە محەممەج نێزیکە، شارەزایی هەموو هەست و نەستیەتی و چاکی دەناسێ، ئەم ناسینە لای هەموو خەڵکی مەککە هەبوو، بووبوویە جێی هەڵگری ئەمانەتەکان، ئەمینی ئەمانەتی خەڵکی بوو، ناونرابوو (صادق الأمین)، ڕێزی وتە و پاکی و زیرەکییان دەگرت، وەك لە کاتی دانانی بەردە ڕەشەکەدا ئەشرافی مەککە ڕێزیان بۆ دانا، ئەم شتانە و زۆری تر لەم جۆرانە، لە دایکبوونی دووەمی بۆ هێنا، یەکەم لە دایك بوون وەك هەر مرۆڤێك دێتە ژیان،

---

[1] الشمائل المحمدية، للترمذي، رقم ٥.

له دایك بوونی دووه‌م، په‌یوه‌ندیکردن به‌ ئاسمانه‌وه‌ و دابه‌زینی وه‌حی و پله‌ و پایه‌ی پێغه‌مبه‌رایه‌تییه‌، ئه‌و چووه‌ ئه‌شکه‌وتێکی تاریك و دوور له‌ خه‌ڵك، به‌ڵام بووه‌ هاورێی مه‌لائیکه‌ و گه‌یاندنی سه‌لام و سوپاس و نامه‌ی خوا، ئه‌شکه‌وتێکی ره‌ق و ته‌ق و تاریکی لێ بووه‌ چراخانی نوور، ده‌رگای سه‌ره‌تای ژیان و، مێژووی نوێی مرۆڤایه‌تی و، راچه‌نینی دڵه‌کان و ده‌روونه‌کانی لێکرایه‌وه‌، کلیلی دڵه‌کان و عه‌قڵه‌کانی درایه‌ ده‌ست، شه‌وێکی سه‌یر، تاریك، تاقه‌ شه‌وێك، ده‌رگای به‌ره‌که‌تێکی گه‌وره‌ و گۆڕینی رێڕه‌وی مێژووی لێکرایه‌وه‌، که‌ خۆیشی به‌ بیریدا نه‌هاتبوو، به‌ڵام خۆی بۆ ئاماده‌کردبوو.

مه‌حمود شاکر ده‌ڵێ: له‌ ١٢/ره‌بیعی یه‌که‌م واته‌ ٢٠/نیسان/٥٧١ زاینیدا ساڵی یه‌که‌می فیل، مامانه‌که‌ی شه‌فای دایکی عه‌بدورره‌حمانی کوڕی عه‌وف بوو، یه‌که‌م که‌س که‌ شیری دایه‌ ناوی سوه‌یبه‌ جاریه‌ی ئه‌بی له‌هه‌بی مامی بوو، به‌رکه‌خان (ئوم ئه‌یمه‌ن) دایکی عه‌بدوڵڵای باوکی، واته‌ نه‌نکی له‌ باوه‌شی کرد، له‌ دایك بوو باوکی نه‌دی، ئه‌مه‌ جۆری یه‌که‌می هه‌تیویه‌، واته‌ به‌ ته‌عزیه‌بارییه‌وه‌ له‌ دایك بوو، گه‌وره‌ی مرۆڤایه‌تی ئاوا له‌ دایك بوو، پاشان نێردرا بۆ لادێ تا پاك و سافیی زمان فێربێت، چوار ساڵ لای حه‌لیمه‌ بوو، لای دایکی خۆی نه‌بوو، دایکی بردی بۆ یه‌سریب بۆ لای که‌سوکاری و سه‌ردانی گۆڕی باوکی، له‌ گه‌ڕانه‌وه‌دا بۆ مه‌ککه‌ دایکی مرد، وادیاره‌ خوا ده‌یه‌وێ خۆی په‌روه‌رده‌ی بکات، به‌و شێوه‌ی که‌ خۆی ده‌یه‌وێ، که‌سێك له‌و ته‌مه‌نه‌دا باوك و دایکی بمرێ ده‌بوو توند ته‌بیعه‌ت و گرژ ده‌رچوایه‌، به‌ڵام زۆر به‌ سۆز و به‌ لوتف و ناسك بوو، وێنه‌ی نه‌بوو، پاشان عه‌بدولموته‌لیب گرتیه‌ لای خۆی، به‌رکه‌خان که‌ منداڵێکی که‌مێك گه‌وره‌تری هه‌بوو له‌ موحه‌ممه‌د، ئه‌و به‌خێوی کرد، به‌رکه‌ له‌ عه‌بدوڵڵای باوکی جێمابوو، بووه‌ دایکی موحه‌ممه‌د، ئه‌و ماوه‌ له‌ ماڵی باپیری مایه‌وه‌ که‌ گه‌وره‌ی قوره‌یش بوو، ده‌چووه‌ مه‌جلیسی باپیری و باپیری شێخێکی گه‌وره‌ بوو، هه‌موو داوایه‌کی موحه‌ممه‌دی جێبه‌جێ ده‌کرد، زۆر لێی ورد ده‌بوویه‌وه‌ و له‌سه‌ر جێی خۆی له‌ نانخواردن و کۆبوونه‌وه‌دا دایده‌نا، ورد گوێی له‌وتوێژ و به‌سه‌رهاته‌کان ده‌گرت، که‌

عەبدولموتەلیب مرد، ئەبو تالیبی مامی بە وەسیەتی باپیری گرتیە لای خۆی، هەرچەند منداڵی زۆر بوو، تاقانەی عەبدوڵڵای برای بوو[1].

عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولموتەلیب لە دایك بوو پێش فیل بە (٢٥) ساڵ، باوکی زۆری خۆشدەویست[2]، چونکە جوانترین کوڕی بوو، پاکترینیان بوو، موحەممەد دوو مانگ بوو باوکی مرد، یان دەڵێن ئامینە سکپڕ بوو[3].

(حەمزە مامی پێغەمبەر بوو، برای بوو لە شیردا، سوەیبە شیری دایە کە مەولای ئەبی لەهەب بوو، وەکو لە صەحیحەکەدا جێگیر بووە، خزمی دایکیشی بووە، چونکە دایکی حەمزە ناوی هالە کچی ئەهیب کوڕی عەبدولمەناف کوڕی زوهرە کچی مامی ئامینەی کچی وەهەب کوڕی عەبدولمەناف دایکی پێغەمبەر بووە، لە دایك بووە پێش پێغەمبەر بە دوو ساڵ، یان دەڵێن چوار ساڵ، لە ساڵی دووەمی پێغەمبەریدا موسوڵمان بوو، یارمەتی سەرکەوتنی پێغەمبەریدا)[4].

لە دایکبوونی موحەممەد ساڵی فیل بوو، نێوان ئەو و فیل پەنجا شەو بوو، هەندێك دەڵێن رۆژی دوو شەممە، دوو شەو تێپەڕیبوو لە مانگی رەبیعی یەکەم، یان دەڵێن شەوی سێشەممە هەشت شەو رۆشتبوو لە مانگی رەبیعی یەکەم، یەکێ دەڵێ: رۆژی هەینی لە کاتی سپێدەی بەرەبەیاندا، یان دوانزە شەو تێپەڕیبوو لە مانگی رەمەزان، وەك دەڵێن: بە حیسابی (قران العقرب) لە دایك بووە، نووسەرانی کۆن زۆریان وتووە لە کاتەکانی قیران و میزان و پلەکانی زوهرە و مشتەری و عەقرەب و زوحەل و زۆری تر، بەتایبەت لە (مفاتح العلوم)ی خوارزمی و باسەکانی پزیشکیی و حیسابیی و ئەندازیاریی و فەلەکیی.

---

[1] التأريخ الأسلامي، محمود شاكر، ج١ ص ٤٨.

[2] (تأريخ ابن الوردي، زين الدين عمر بن مظفر الشهيد بابن الوردي، توفي ٧٤٩د، ج١،ص٩٣ دار الكتب العلمية) .

[3] تأريخ ابن الوردي، زين الدين عمر بن مظفر الشهيد بابن الوردي، توفي ٧٤٩د، ج١،ص١٣١ دار الكتب العلمية.

[4] الأصابة في تميز الصحابة، ج١، ص٤٠١، تسلسل ١٨٢٢ و تسلسل:١٨٢٣.

موحەممەدی ئەبو عەبدوڵڵای خوارزمی، زانیاری لە یۆنانی و نووسەرەکانی وەك ئەقلیدس و نیقوماخس وەرگرتووە، وەك لە ئەعلامی شەشی زەرکلیدا بە درێژی باسی کردووە [1].

عەبدوڵڵا دوای دەساڵ یان زیاتر دوای هەڵکەندنی ناوی زەمزەم ئامینەی گواستەوە، لە نێوان پەرداخ هەڵدانەکە بۆ عەبدولاو ژنهێنانەکەیدا یەك ساڵ بووە [2].

تەبەری دەڵێ: دوای دوو مانگ لە لەدایکبوونی پێغەمبەر عەبدوڵڵا مرد، هەندێك دەڵێن دوای ساڵێك، تەمەنی عەبدوڵڵا ٢٥ ساڵ بوو [3].

لە چوار پێنج ساڵیدا محەممەد گەڕایەوە لای دایکی، لە شەش ساڵیدا ئامینەی دایکی مرد کە تەمەنی ئامینە سیی ساڵ بوو، عەبدولموتەلیب دە کوڕ و چوار کچی هەبوو، عەبدوڵڵا باوکی پێغەمبەرە، ئەبوتالیب کە عەبدولمەنافە، زوبەیر کە ئەبوتاهیرە، عەبدولکەعبە کە مقەدمە، دایکیان فاتمەی کچی عەمر کوڕی عائیز کوڕی عەمران کوڕی مەخزوم، پێی دەڵێن ئوم حەکیم بەیزا، عاتیکە و بەیرە و ئەروی و ئومیمەش، کچەکانی عەبدولموتەلیبن، حارس کوڕە گەورەی بوو، کونیەی ناوی باوکی بوو.

قثم و حارس دایکیان ناوی سەفیەی کچی جوندوب کوڕی حوجەیر کوڕی زەباب کوڕی سەوئە کوڕی عامر کوڕی سەعسەعیە.

حەمزە کە بە ئەبو یەعلی شێری خوا و شێری پێغەمبەر ناودارە، دایکی ناوی هالە کچی وەهەب کوڕی عەبدولمەناف کوڕی زوهرەیە کە بە ئوم صەفیە کچی عەبدولموتەلیب ناودارە.

عەباس و زرار، دایکیان ناوی نوتەیلە کچی جەناب کوڕی کولەیب کوڕی نەمر کوڕی قاستە.

---

[1] اليعقوبي، تأريخ اليعقوبي، احمد بن ابي يعقوب بن جعفر بن وهب، تحقيق عبدالأمير مهنا، ج١، ص٣٢٧، مؤسسة الأعلمي للمطبوعات، بيروت، ١٩٩٣.

[2] اليعقوبي، ص ٣٣٠.

[3] اليعقوبي، ص ٣٣١.

ئەبولەهەب کە ناودار بوو بە عەبدولعوززا، دایکی نـاوی لوبنییـە، کچـی هاجـەر، کوڕی عەبدولمەناف کوڕی زاتری خەزاعیە.

غەیداق کـە نـاوی تـەواوی (جـەحل)ە، لەبـەر ئـەوە نـاونراوە غەیداق، چـونکە سەخیترین و نانبدەترین پیاوی قورەیش بوو، دایکی ناوی مەمنەعـە، کچـی عـەمر، کوڕی مالیك، کوڕی نەوفلی خوزاعیە، ئەوانە هەموویان مامی پێغەمبەر بـوون، هـەر یەکەیان ناودار و خاوەن باس و خواسی خۆیەتی، لە کاتی حەجدا بەردەوام ئەمانە نـان و ئـاو بـدەبوون و خزمـەتی حاجیـان و میوانـانی مـاڵی خوایـان کـردووە، لای خەڵك، رەچەڵەك پاك و رەوشت جـوان و پـیرۆز بـوون، وتوویانـە و دەڵێـی بـورجی زیون زەوی دەپارێزن بۆ دراوسـێ و میـوان، پاشـان وتوویانـە: ئەگـەر خـوا بیـەوێ دەوڵەتێك بپارێزێ، لەم جۆرە پیاوانەی بۆ سەوز دەکات، یـان هەڵـدەخات، ئەمانـە چێنراوی خوان، نەك خەڵك، لە پاڵ کەعبـەدا فـەرش رادەخـرا بـۆ عەبدولموتـەلیب، کەس لەو سەرفەرشانە نێزیك نەدەکەوتەوە، جگە لە پێغەمبـەر، ئـەو منـداڵێك بـوو خۆی لە باپیریەوە دەئالاند، خەڵکی دەیانویست دووری بخەنـەوە، عەبدولموتـەلیب دەیوت: وازی لێبێنن، ئەم کوڕەم خاوەن جێگە و شانازی دەبێت.

کەسـەیفی کـوڕی زی یـەزدین، پاشـای بـەنی حـەمیر لـە یەمـەن، کـە پاڵـەوانی ئەفسانە میللییەکانە سەرکەوت لە یەمـەن و دەسـەلاتی وەرگـرت، عەبدولموتـەلیب لەگەڵ کۆمەڵێك ئەشراف گەلەکـەی چـوون بـۆ یەمـەن بـۆ پیرۆزبـایی پۆسـتی نـوێی سەیف، دوای بەخێرهاتن و رێزی زۆر، ماوەیەك لەگەڵ عەبدولموتەلیب دوو بـە دوو دانیشتن ، قسە و باسی ناوچەکەیان کرد، سەیف مژدەی دا بە عەبدولموتـەلیب کـە پێغەمبەرێکی نوێ بەم نزیکانە و لەم ناوچەیەدا پەیدا دەبێت و هەموو سیفەتەکانی بۆ باسکرد، کە عەبدولموتەلیب ئەو نیشانانە و وەسفانەی بیست هاواریکرد و وتـی: ئەلاهو ئەکبەر و کڕنووشی برد و راستی قسەکان و هەواڵەکانی سەیفی لەلا سەلماو زانی، سەیف وتـی: دەڵێی هەستت بە هەواڵەکەی من کرد کە باسمکرد؟ وتی: بەڵێ، کوڕێکم منداڵێکیان بووە، هەروەك ئەو سیفەتانەی کە تۆ باستکرد، سەیف وتـی: لە جولەکە و گەلەکەت بیپارێزە، گەلەکەت خراپتری پێدەکەن هەتا جولەکـە، خـوایش کاری خۆی هەر تەواو دەکات، بانگەوازەکەی دەپارێزێت.

عەبدولموتەلیب لە خاوەن کتێبە ئاسمانیەکانەوە ئەوەندەیان لە بارەی پێغەمبەری چاوەڕوانکراوەوە بیستبوو، دڵی خۆش بوو کە هەمووی لە محەممەددا دەبینی، عەبدولموتەلیب وتی: وەڵاهی وەك ئەمڕۆ قورەیش لەسەر ئاوی زەمزەم و زێوانی کەعبە کێبەرکێم لەگەڵ دەکەن، سبەینێش هەر دژایەتیی و کێبەرکێم لەگەڵ دەکەن، لەسەر ئەو شەرەف و سەربەرزیە بەرزە و وەسف و سەنا بڵندەی محەممەد کە هەتا ئاخر زەمان دەخایەنێ[1].

وشکەساڵییەکی قڕ رووی کردە قورەیش، هەموو ترسان و تۆقان، هاتن بۆ لای عەبدولموتەلیب و وتیان: چەند ساڵی تر وشکەساڵییمان بەسەردا هاتووە و دوعات بۆ کردووین، داوا بکە خوا بارانمان بۆ ببارێنێ، عەبدولموتەلیب دەستی موحەممەدی گرت، کە هێشتا منداڵ بوو، تازە پێی گرتبوو، بردیە لای کەعبە و دەستی بەرزکردەوە و وتی: خوایە لابەری زەحمەتەکان، تۆ زانای فێرنەکراوی، لێپرسراوی و بەخیل نیت، ئەوانە لە ژن و پیاوان، بەندەکانتن، پەنایان هێناوەتە لای ماڵەکەت، داوا دەکەن بۆچی ساڵەکەیان وا بێ ئاوە و کشتوکاڵیان فەوتاوە، خوایە گوێیان لێ بگرە و بارانێکی بە رەحمەت و پاراویان بۆ ببارێنە... نەگەڕانەوە هەتا خوا بۆی باراندن[2]، خەڵکی موحەممەدیان ناونابوو (شیبەی حەمد).

کاتێك عەبدولموتەلیب مرد، وەسیەتی کرد کە زوبەیر، بەڕێوەبەری شاری مەککە و سەرپەرشتیاری کەعبە بێت، هەروەها وەسیەتی کرد بۆ ئەبوتالیب کە بە جوانیی ئاگاداری موحەممەد و زەمزەم بێت و پێی وت: ئەوا خستمە دەستی ئێوە ئەوەی کە شەرەفی مەزنیتانە و گەردنی عەرەبی پێ بەرز دەبێت[3].

کە عەبدولموتەلیب مرد، موحەممەد هەشت ساڵان بوو، عەبدولموتەلیب (١٢٠) ساڵ بوو، دوای ئەو هەر یەکە لە بنەماڵەکانی قورەیش داوای سەرۆکایەتیان

---

[1] اليعقوبي ل ٢٣٣.
[2] اليعقوبي ل ٢٣٤.
[3] اليعقوبي ل ٢٣٥.

دەکرد، پێغەمبەر دەفەرمووێ: "خوا باپیرمی وەك یەك میللەت هەڵخستبوو، لە شێوەی پێغەمبەران و بەرگی پاشایان بوو"، ئەبوتالیبیش خاوەن گەورە و شەرەف و جێ بوو، گوێیان بۆ دەگرت، عەلی دەڵێ: باوکم بێ پارە بوو، لەوەوپێش پارەدار بوو، لەگەڵ خۆی موحەممەدی برد بۆ بوسرا لە خاکی شام، موحەممەد نۆ ساڵان بوو، وتی: بەخوا لای کەس جێت ناهێڵم، پاشان فاتیمەی کچی ئەسەد کوڕی هاشم کە ژنی ئەبوتالیب بوو، بە خێوی دەکرد و لەگەڵ منداڵەکانی خۆیدا بوو، لە پێغەمبەر دەگێڕنەوە کە کاتێ فاتیمە مرد موسڵمانێکی بەڕێز بوو، پێغەمبەر فەرمووی: (ئەمڕۆ دایکم مرد)، بە کراسەکەی خۆی کفنی کرد، دابەزیە ناو گۆڕەکەی و لە ناویا راکشا، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا زۆر خۆت نارەحەت کرد بۆ فاتیمە، فەرمووی: ئەو دایکم بوو، منداڵەکانی برسی دەکرد هەتا من تێربیم، گوێی بەوان نەدەدا و منی دەرازاندەوە، ئەو دایکم بوو[1].

کە چووە بیست ساڵان هەموو نیشانەیەکی مەزنیی تیابوو، خاوەنی کتێبە ئاسمانییەکان باسیان دەکرد و شتیان لەبارەوە دەوت و وەسف و سەنایان دەکرد، باسی نزیکیی دەرکەوتنی پێغەمبەریان دەکرد، ڕۆژێك بە ئەبوتالیبی وت: مامە لە خەودا دیم پیاوێك هات بۆ لام دوو پیاوی تری لەگەڵ بوو، وتیان: ئەوە ئەوە، کە پێگەیشت ئاگات لێبێت، پیاوەکە قسەکەی نەدەکرد، ئەبوتالیب ئەو خەوەی گێڕایەوە بۆ هەندێ خەڵکی شارەزا و زانای مەککە، کە سەیری پێغەمبەریان کرد وتیان: ئەوە ڕۆحە پاکەکەیە (واتە جوبرەئیل)، ئەمە بە خوا پێغەمبەرە پاکەکەیە، ئەبوو تالیب پێی وتن: ئەم باسەی برازاکەم بشارنەوە، با گەلەکەم پێی نەزانن غیرەی لێدەکەن، بەخوا ئەوەم بە عەلی وت، کە وتی: عەبدولموتەلیبی باوکم (ئەبو تالیب وتی) هەواڵی ئەوەی پێدام کە ئەمە پێغەمبەرە نێردراوەکەیە، پێی وتم: ئەوە بشارەوە هەتا دوژمنی پێ نەخەڵەتێ و بۆی دروست نەبن و زەرەری لێبدەن[2].

---

[1] الیعقوبي.ل ٣٣٦.

[2] الیعقوبي ل ٣٣٦.

که ناکۆکی و ناجۆریی لەسەر دانانی بەردە ڕەشەکە دروستبوو، ئەو کاتە موحەممەد (٢٥) ساڵ بوو، لەبەر دەستپاکیی و ڕەوشت جوانیی، قورەیش ناویان نابوو (ئەمین)، وتیان: یەکەم کەس کێبوو هاتە کەعبە رازی دەبین بە دادوەریی ئەو، لە پڕ موحەممەد دەرکەوت، هەموو وتیان: "رازین بە حوکمی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا"، ئەویش بە دەستی خۆی بەردەکەی لە جێی خۆی لەسەر چینێکی دیوارەکە دانا، ئەو سەرۆك چوار هۆزە بریتی بوون لە (عوتبەی کوڕی رەبیعە، ئەبو زمعە کوڕی ئەسوەد، ئەبو حوزەیفە کوڕی موغیرە، قەیسی کوڕی عەدی سەهمی، یان عاسی کوڕی وائیل)[1].

کاتی دانانی بەردەکە، موحەممەد (٢٥) ساڵ بوو، خەدیجەی (٣٠) ساڵی داواکرد و ئەبوتالیب لە وتاری داواکردنی خەدیجەدا وتی: (... برازاکەم موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا..)[2]، لە خەدیجە پێش ئیسلام قاسم و روقیە و زەینەب و ئوم کەلسومی بوو، دوای ئیسلامیش عەبدوڵلای بوو، کە (تەیب و تاهیر)یشیان پێدەوت، پاشان فاتیمەشی بوو[3]. عەبدولموتەلیب چەند کوڕێکی هەبوو، بچووکترینیان عەبدوڵلا بوو کە ئامینەی مارەکرد[4].

ناجۆریی هەیە لە مێژووی مردنی عەبدوڵلادا، مەسعودیی دەڵێ تەبەری دەڵێ: دوای دوو مانگ لە لە دایکبوونی موحەممەد، باوکی مرد، هەندێ تر دەڵێن: مرد پێش ئەوەی موحەممەد لە دایك ببێ، ئەوە راست نییە، چونکە کۆی راکان لەسەر ئەوەن کە مردووە دوای لە دایکبوون، هەندێکی تر دەڵێن: دوای ساڵێك لە لەدایکبوون[5]. ئیبن کەلبی و سوکەری دەڵێن: عەبدوڵلا مرد تەمەنی موحەممەد (٢٨) مانگ بوو[6].

---

[1] اليعقوبي ل ٣٤٠.

[2] اليعقوبي ل ٣٤١.

[3] اليعقوبي ل ٣٤٠.

[4] محاضرات في تأريخ العرب، الدكتور صالح احمد العلي، ط٢، ج١، مطبعة المعارف، بغداد، ١٩٥٩.

[5] مروج الذهب، ج٢، ص٢٨٠.

[6] رواية الكلبي في ابن سعد، ج١، قسم١، ص٦٢. الطبري، ج٢، ص ١٣٠. المجر، ص ٩.

قورئـان دەستنیشـانی سـاڵی لـە دایکبـوون و بـوون بـە پێغەمبـەر و مردنـی محەممـەدی نـەکردووە، چـونکە ئەوانـە گـرنگ نییـە، مێژوونووسـان حـەز دەکـەن وردەکاریی لە ژیانیدا بکەن، هەر، بۆیە دوای ماندووبوون کەوتوونەتە ئـەو ناکۆکیـە بێ سوودەوە لەسەر سـاڵ و مـانگ و رۆژ و تەنانـەت جـێ و رێ و ژوور و مـاڵی لـە دایکبوونەکەشـیدا، بـەڵام ئـەوە براوەتـەوە کـە سـاڵی ٦٣٢ز مـردووە، هەرچـەند گێڕەرەوەکان لەوەشدا هەر ناکۆکن، تەبەری سـێ گێڕانـەوەی جیـاواز دەهـێنێ لـە ئیبن عەباس و حەماد و ئیبن موسەیب و عروەی کـوڕی زوبـەیر کـە تیایـدا دەڵێن: پێغەمبـەر موحەممـەد مـرد تەمـەنی (٦٣) سـاڵ بـوو، گێڕانـەوەی دووەم لـە ئـیبن عەباسەوە کە لە حەسەنی بەسریەوە دەڵێن: تەمـەنی (٦٥) سـاڵ بـوو، لـە عـروەی کوڕی زوبەیرەوە دەڵێ: تەمەنی شەست ساڵ بوو[١] .

## ٨- موسا کوڕی عمران

دکتۆر جەمال بەرامبەر مووسا پێغەمبەریش هەڵەیەکی گەورە دەکـات و دەڵـێ: "ئـەو عەقیـدەی یەکتاپەرسـتیی لـە فیرعەونـەکان وەرگرتـووە" وەك لەلاپـەرە (٣٦٥)دا دەڵێ: "عەقیدەی جولەکە نوێبوویەوە، بە دەست موسای (منداڵ) کە لـە کۆشـکی فیرعەونـەکانی بنەماڵـەی هـەژدەدا، لـە نێـوان سـەدەی ١٥ــ ١٤پ ز دا پەروەردەبوو، (موسا) لەوان (لە فیرعەونەکان) بنـەماکانی بڕوابـوون بـە یـەکخوایی فێربوو، کتێبەکانی جولەکە باس لەو منداڵە دەکـەن، کـە چـۆن پاشـتر نـاکۆك بـوو لەگەڵ کاهینە میسرییەکان و، هەڵهات بۆ وولاتی مەدیەن لـە ناوچـەی سـینا، لـەوێ کچی کـاهینی مەدیـەنی مـارەکرد کـە نـاوی رۆیـل بـوو، لەوانەیـە موسـا عەقیـدەی ئەخناتونی وەرگرتبێ، کە بـڕوای وابـوو ئـاتۆن (خـۆر)، خـوای بـەرزو دروسـتکەری مرۆڤەکانەو، جێی خۆیەتـی بپەرسترێ، دواتریش گەلەکەی بڕوایـان پێهێنـا"[٢] ، گـەر لەم برگەیە ورد بیتەوە، بۆت دەردەکەوێ دکتۆر جەمال خۆیشـی گومانی هەیە لـەو

---

[١] الطبري، ج٣، ص١٠٦.

[٢] ظهور الکرد فی التاریخ ص٣٦٦.

قسـەیەو دەڵـێ (لەوانەیـە موسـا عەقیـدەی لـەوان وەرگرتبـێ). ! لێکۆڵینـەوە بـە (لەوانەیـە) کـاری لەسـەر نـاکرێ و ناسـەلمێ، هـەرگیز پێغەمبـەرێك نـەهاتووە بـۆ ناوچەیەك، کە لەو ناوچەیەدا خواپەرستیی و یەکتاپەرستییەکی پوخت هـەبووبێت، خوا لە قورئان و تەورات و ئینجیلدا بـاس لـەوە دەکـات کـە فیرعەونەکـەی مووسـا کافر بوەو خۆی بە خـوا زانیـوە، ئـەو کتێبـە ئاسمانیانـە بـاس لـەوە دەکـەن، لـەو کاتەوە کە مووسا منداڵی شیرەخۆرە بوە، تا مردنـی مووسـا، فیرعەونـەکان دژ بـە خواو دژ بە مووسا بوون، قورئان باس لەوەش دەکات کە فیرعەونەگەی سـەردەمی مووسا بە کافری مرد، خوا لە تەورات و ئینجیل و قورئاندا بـاس دەکـات، فیرعـەون پێش نوقووم بونی لە دەریاکەدا ویستویەتی باوەڕ بە خـوا بهێنـێ، بـەڵام خـوا لێی وەر نەگرتووە. ! ( قال امنت بـرب موسـى وهـارون .. الان وقـد عصـيت وكنـت مـن الكافرين)، خوا لە قورئاندا باس لە فیرعەونە ستەمکارەکان دەکات، کە خۆیـان بـە خوای بـەرز دەزانـی و، بتپەرسـت و مانگپەرسـت بـوون، ئـەوە نیـە قورئـان باسـی دەکات: ( وقال فرعون یاایها الملا ما علمت لکم من الـه غـيري. القصـص ٣٨) واتـە فیرعەون وتویەتی خەڵکینە من نانازانم کە لـەمن بـەولاوە خوایـەکی تـر هـەبووبێت، (قال لان اتخذت الها غيري لاجعلنك من المسجونين، ٢٩ الشعراء) واتـە فیرعـەون بـە مووسا دەڵێت ئەگەر لە من بەولاوە خوایەکی تـر بپەرسـتی بەنـدت دەکـەم، دوایـی یەکێك لە فیرعەونەکان (ئامون حوتبەکان) واز لە مانگ پەرستیی دەهێنێ بـە هـۆی کچە کوردە میتانییەکەوە (هۆری) بە ناوی تادۆهیپا (نیڤەرتیتی)و، شۆڕشی مـەزنی ئەخناتون بەرپادەکات دژی بتپەرسـتیی و، داوای یـەکتا پەرسـتیی دەکـات، بـەڵام زۆر زوو خۆی و کودەتاکـەی و دواکـەوتووەکانی لـە ناودەبـەن و، مانگپەرسـتیی و بتپەرسـتیی سـەرهەڵدەداتەوە، لـەو کـەش و هـەواو سـتەمکارییەدا، خـوا مووسـا دەنێـرێ بـۆ وەسـتاندنی فیرعـەون لـەو هەڵچـونەی، داوای یەکتاپەرسـتیی و رزگاربوونی بەنی ئیسرائیل دەکات، پاشان هەڵدێت بۆ شـاری مەدیـەن لـە ناوچـەی سـینا، لای شـوعەیب پێغەمبـەر دەبێتـە شـوان و کچێکی مـارە دەکـات و پاشـان دەگەڕێتەوە میسر، گەلەکەی لە ستەمی فیرعەون رزگار دەکـات و، دەیانهێنێتـەوە بۆ فەلەستین.

بەنو ئیسرائیل کێن وا مووسا داوا لە فیرعەون دەکات ئەو گەلەی بداتێ و وازیان لێبهێنێ..؟ لە تەوراتدا هاتوە کە ئیبراهیم لە شاری حەڕانی کوردوستانەوە کۆچی کرد بۆ ناوچەی کەنعان لە فەلەستین، ئیبراهیم کوڕێکی هەبوو بەناوی ئیسحاق، ئیسحاق کوڕێکی هەبوو بەناوی یەعقوب، ڕۆژێك ئیسحاق یەعقوبی کوڕی بانگکردو پێی وت: کوڕم ژن لە کەنعانیەکان و خەڵکی فەلەستین مەهێنە، بڕۆرەوە بۆ فدان ئارام (شاری حەڕان لە کوردوستان) بۆ ماڵی (بتوئیل) باوکی دایکت، بۆ ماڵی لابانی خاڵت لە کچەکانی خاڵت، کچێك بۆ خۆت هەڵبژێرە ( سفر التكوين: ٣١، ٣٢)، یەعقوب گەڕایەوە بۆ فدان، وەسیەتەکەی باوکی بە لابانی خاڵی گەیاند، خاڵی دوو کچی هەبوو، (لیئەو ڕاحیل)، خاڵی وتی: دەبێ حەوت ساڵ مەڕەکانم بۆ بەخێو بکەیت، سەرەتا لیئەی دایە، پاشان حەوت ساڵی تر شوانی پێ کردو کچی دوەم ڕاحیلیشی دایە، لابان کچەکانی خۆش دەویست، دوو خزمەتکاری بەخشیە کچەکانی، (زولفە) بۆ لیئەو (بلهە) بۆ ڕاحیل، ژنەکانیش لەبەر ئەوەی مێردی خۆیان زۆر خۆش دەویست، هەردوو جاریەکەیان بەخشیە یەعقوبی مێردیان، هەر وەك چۆن سارە هاجەری بە خشیە ئیبراهیمی مێردی، ئەوانیش ئەو جۆرە بەخشینەیان کرد، لەو چوار ژنە (١٢) کوڕ بوو[١]. ئەو دوانزە کوڕەش بەم جۆرە بوو: لە لیئە: (ڕائوبین و شەمعون و یەهوزا و لاوی و یساکر و زبولون) بوو، لە ڕاحیل : (یوسف و بنیامین) بوو، لە زولفە (جادو ئەشیر) بوو، لە بلهە (دان و نفتالی) بوو، ئەمانە هیچیان لە خاکی فەلەستین گۆش نەکران و گەورە نەبون[٢]، لە خاکی ئارام لە حەڕان مانەوە، یەعقوب منداڵ و ژنەکانی لەسەر حوشتر هەڵگرت، ولأخەکانی پیش خست، ئەوانەی بروایان پێی هەبوو دوای کەوتن و لە فدان ئارام دەرچوون، گواستنیەوە بۆ لای ئیسحاقی باوکی لە خاکی کەنعان، ڕاحیلی ژنی یەعقوب.

---

[١] البداية والنهاية، ابن كثير ج١ ص١٩٦

[٢] قراءة حول مصير النبي موسى. المحامي بديع السيوفي .ص٩ ـ ٢١ ،ط١،٢٠٠٥، دمشق

خۆشەویستترین کوری یەعقوب یوسف بوو، کە زۆر دەیپاراست و چاوی لەسەری بوو، ئەمە بوە جێی بەخیلی و ئیرەیی پێ بردنی براکانی، ویستیان لە بەر چاوی باوکی ونی بکەن، هەتا گوێ بەوانیش بدات و سەیری ئەوانیش بکات، بە فیلّ بردیانە دەشت، خستیانە ناو بیر، کاروان هات دەری هێناو بردیانە میسر، فرۆشرا بە سەرۆکی پاسەوانانی میسر، بەخێوی کرت و گەورەی کرد، بەلاّم ژنەکەی دلّی لێ گۆری، بە تۆمەتی خراپ کە بۆیان دروستکردبوو، خرایە بەندیخانە، دوای مانەوەی ماوەیەکی زۆر، لە لیکدانەوەی خەوێکدا پاشای ولاّت بانگی کرد، کردیە دەسەلاّتدار، پاشان کە ئاشکرا بوو یوسف کێیە، بانگی یەعقوبی باوکی و براکانی کرد لە کەنعانەوە گواستنیەوە بۆ میسر، ئەوانیش لە ترسی برسیەتی هاتن، لە دەشتی بەپیتی جاسان نیشتەجێ کران، لە سەردەمی (فوتی فارغ) فرعەونی میسر لەسەدەی١٧ ـ ١٦ پ.ز هۆزی یەعقوب (بەنی ئیسرائل) لە دەشتێکی بەپیتدا نیشتەجێ کران، یوسف لەمیسر رۆلّێکی گەورەی بینی لە خۆش گوزەرانی خەلّك و، هێمنی و ئاسایش و، وریاکردنەوەی ئاینی و چەسپاندنی یەکتاپەرستی و دورکەوتنەوە لە مانگ و بتپەرستی، هۆزی بەنی ئیسرائیل دەسەلاّتی بەرزیان وەرگرت و دەولّەمەند بوون، زۆر زوو زۆردەبوون و قەرەبالّغ دەبوون، ئەمە بووە هۆی تێبینی و تۆقان و ترس لای کاهن و دەسەلاّتداران، پاش مردنی یوسف خەلّکی وردە وردە گەرانەوە سەر بتپەرستی، پاشتر کە هەکسۆسەکان هاتنە میسر بەنی ئیسرائیل کەنار خران، بەلاّم هەر خاوەن دەسەلاّت و خاکی بە پیت و دەولّەمەند بوون، خۆیان بە کاسبی و ژیانی خۆش و ئالّتون سازیەوە خەریك دەکرد، دەستیان گرتبوو بەسەر بازرگانی ولاّتدا، میسریەکان ترسان ئەم هەموو غەریبەیە دەست بگرن بەسەر دەسەلاّت و بازرگانی و کشتوکالّ و گاوداری ولاّتدا، خۆشگوزەران و ئیسراحەت و سەلامەت و دلّخۆش بوون، لە زۆربونێکی سەیردابوون، دوای مردنی یوسف، فیرعەونەکان و خەلّك رازی نەبون کە بەنی ئیسرائیل کار نەکەن و خۆش بژین، گەر وا بروات زۆر دەبن و زالّ دەبن، خەلّکی میسر وتیان دەبێ ئەوانیش سوخرەکاری بیانگرێتەوەو کار بکەن لە

پێناوی ئاوەدانی وڵاتدا، ئەوان هەر دەخۆن و دەخەون و کاسبی بۆخۆیان دەکەن، ئەوە لە ئایندەدا زەرەر لە بنەمای نەتەوایەتی دەدات، دەوڵەت زۆری لێکردن، لە چەند ڕووەوە دەستکەوت و دەسەڵاتیان لە دەستدا[1]، دوای یوسف خەڵکی زۆری تری ئاسیاو کەنعان هاتنە میسر بۆ ژیان و کارکردن، یان ئەسیری جەنگبوون کە فیرعەونەکان لە پەلامارەکانیاندا بۆ ڕۆژهەڵات دەیان هێنان، ئەوانە لە پەرستگاکان کاریان دەکرد، بینایان بۆ پاشاکان دروست دەکردو خزمەتکاریان پێدەکردن، گەڕان بۆ ڕێگەیەك دەستی ئەوانە بگرن، لەو کاتانەشدا فیرعەون خەوێکی دیبوو کە یەکێك لەم غەریبانە ئەو دەکوژێ و دەستدەگرێت بەسەر میسردا، فرعەون بۆ خەوەکەی، پرس و ڕای بە حاکم و کاهن و خەڵکی شارەزاکرد، هاهنەکانی ئامون و جادوگەرو ساحیرەکان و دەسەڵاتداران ئەوەیان بە هەل زانی، پێشنیاری ئەوەیان بۆ کرد کە کوڕەکانیان سەربڕن و کچەکانیان بهێڵنەوە و مارەیان بکەن، هەتا لە ناو میسریەکاندا دەتاوێنەوە، (سنقتل ابناءهم ونستحی نساءهم، ١٢٧ الشعراء) (ان فرعون علا فی الارض وجعل اهلها شیعا یستضعف طائفة منهم یذبح ابناءهم ویستحی نساءهم انه کان من المفسدین، ٤ القصص) هەندێکی تر وتیان پشتگوێیان بخەن و زۆربونیان بوەستێنن[2]، سفر التکوین دەڵێ منداڵەکانی یەعقوب لەسەرداوای فرعەون لە ناوچەی جاسان نیشتەجێ بون، کە لە چاکترین زەوی و خاکی میسرە، ئەوان و پاشماوەی هەکسۆسەکان و ئەسیرە حەبەشیەکان و کۆیلەکان، ئەمانە تێکەڵ بوون بە کۆمەڵگەی میسری، بەڵام هەر داب و نەریتی خۆیان پاراستبوو، هەر بە ڕوکەش تێکەڵ بووبوون، چونکە دابی کەمینە هەمیشە هەروابووە، خۆگونجاندن و خزمەتێکی سەرزارەکی ڕوکەشی پێشکەش دەکات، بەڵام هەوڵی پاراستنی داب و نەریتی خۆی دەدات و ناهێڵێ بتاوێتەوە، کە میرەکانی شاری تیبە هەکسۆسەکانیان دەرکرد، ئەنجا ڕویان کردە بەنی ئیسرائیل، ساڵی ١٣٥٠پ.ز

---

[1] موکب الشمس، د.احمد بدوی. ج٢ ص٨٨٧

[2] قراءة حول مصیر النبی موسی. المحامی بدیع السیوفی .ص٢٠،ط١,٢٠٠٥، دمشق

فرعەون بڕیاریدا کوڕە لەدایك بوەکانیان بکوژن، کە موسا لە دایك بوو سێ مانگ شاردییانەوە، پاشان لەسەر خواو بەداوای خوا خستیانە ناو سندوقێك و دایان بە دەم ئاوی نیلەوە، پاسەوانەکانی فیرعەون دۆزیانەوە، شیری چەند کەسیان دایە نەیگرت، هەتا مریەمی خوشکی کە دوای سندوقەکە کەوتبوو، وتی من ژنێك دەناسم، چوو دایکی بانگ کرد، ڕۆژانە دەهات بۆ کۆشك، کوڕەکەی تێر ماچ و تێر شیر دەکرد هەتا گەورە بوو[1].

موسا کوڕی عمران کوڕی یصهر کوڕی قاهت کوڕی لاوی کوڕی یەعقوب کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم[2]، واتە دوای ٤٢٥ ساڵ لە لەدایکبونی ئیبراهیم و، دوای ٢٥٠ ساڵ لە مردنی ئیبراهیم لە دایك بووە[3]، دەڵێن کوڕی پیاوێکی برِوادار بووە لە هۆزی شوعەیب[4]، فیرعەونی موسا ناوی رعمسیسی دووەم بوو، پاشای سێهەمی بنەماڵەی نۆزدەهەمی میسر بوو[5]، موسا سێهەم منداڵی باوکی بوو، مریەم و هارون و موسا، هەتا ئیستە نازانرێ باوك و دایکی موسا بە تەواوی کێن و لە چ بنەماڵەیەکن، لە ماڵی فیرعەوندا موسا پەروەردە بوو، ئەحمەد سوسە دەڵێ باپیرانی موسا لە بەنو ئیسرائیلن[6]، کە موسا بووە چل ساڵ زۆر شتی بۆ روون بویەوە، نهێنیەکانی کەهنوتی بۆ دەرکەوت، خەڵك وای زانی کە موسا کوڕی کچی فرعەونە، گەر لەسەر پلەو پایەی خۆی بمایەتەوە، ڕەنگە ببوایەتە گەورەترین دەسەڵاتدار و، سەری لە فرعەونی میسرەوە دەرچوایە، بەڵام خوا پلەی بەرزتری

[1] قصص القران، محمد جاد المولى، ص١١٢) (د: احمد سوسة، ص١١٢.

[2] ابن اثیر، الكامل فی التاریخ، ج١ ص١٦٩ بیروت، ١٩٦٣

[3] العقیدة الاسلامیتو اسسها، عبدالرحمن حسن حنبكة المیدانی، ص٤٥٤، دمشق، دار القلم، ط٥، ١٩٨٨

[4] تفسیرالقران العظیم، عماد الدین ابن كثیر، ج٦ ص٣٣٢ بیروت، ١٩٨٦

[5] انبیاء فی القران تركوا اثارا، د. هدى حسن الطویل، دارالمعرفة، ص١٩٥ـ ١٩٦،ط١، بیروت، ٢٠٠٦

[6] احمد سوسة، ص٢٧٠

بۆ دانابوو، که ئەویش نوێنەرایەتی خوایە بۆ خەڵك، خوا کردیـە سـەرداری گـەلێکی چەوسـاوەو ڕزگارکـەری میللـەتێکی ستەملێکراو، بـوە دامەزرێنـەری سیستـەمێکی ئاینی که پاشتر ناسراوە بە (موسایيەکان)، موسا سـەرداری گـەلێکی چەوساوەی پێباشترە، هەتا فیرعەونی و فەرماندەی سـوپایەکی ستـەم کـار، پێغەمبەرایـەتی و نوێنـەری گەیانـدنی ئـاینی خـوای پێباشـترە، هـەتا کـەهونتی و سـەرۆکی بتخانـە گەورەی کاهنەکانی ئامون و بتپەرستی و خەڵك خەڵەتاندن، موسا هەر لەلاوێتیـەوە دەچووە دەشت و بیابان، بیری لە یەکتاپەرستی دەکردەوە، چەند جار لـە منـداڵی و لاوێتیدا مناقەشەی فیرعەون و ساحیرو کەهنوتەکانی میسـری کـردوە، (ولمـا بلـغ اشدە واستوا اتینـاه حکمـا وعلمـا،القصـص، ١٤) مێژوونوسـان دەڵـێن موسـا بـوە کـاهینی پەرسـتگاو سـەرکردەی سـوپاو هێرشـی کـردە سـەر حەبەشـە بـۆ بلاوکردنەوەی ئاینی ئەخناتون، تـەورات دەڵـێ لـەو جەنگەیـدا سـەرکەوت و کچـی پاشای حەبەشەی مارەکرد بە ناوی کوشیە، بـەلام نـاوی بنەچـەی کوشـی نابـات، دوای ئەویش کچی (شیرون) شوعەیبی پێغەمبەری مەدیەنی هێنـا، موسـا ناوەکـەی میسریە، وەك ویل دیورانت و ئەحمەد سوسـە و دکتـور حسـێن و فیلـون و فرویـد و ماسینوس باسی دەکەن، بەلام ئەوانە هەر قسەن، قەواڵەو بەڵگەنامەیەکی مێژوویی نیە کە موسا لە سەردەمی ئەخناتوندا ژیابێت، یان سەرداری سوپای ئەو بوبێـت و، فتوحاتی ناوچە بێبڕواکانی وەك حەبەشەی کردبێت و، لە پەرستگاکانی ئـەودا زانـا بوبێت و، خەریکی بانگەوازو مژدەدەری ئاینەکەی ئەو بوبێـت، گوایـە پـاش گرتنـی حەبەشە کچی پاشای حەبەشەی خواستبێ، نیشانەیەك نیە کە موسا میسـری بێـت یان کاهنی میسری بوو بێت، لەلای مێژوونووسان تێکچونێك هەیە لە نێـوان یوسـف و موسادا لە میسرو، پەیوەندیان بە فیرعەونەکانەوە، بـەڵێ سـەردەمی هـەردوکیان لێك نێزیکن، مووسا لە ماڵی فیرعەوندا گەورە بوو پـەروەردە بوو، بەلام ئەگـەر ئـەو میسری بوایە، کاتی لەدایکبونی نەدەترسان و، نـەیان دەشـارەوەو، دایـك و بـاوکی خۆی گەورەیان دەکرد، نەك لە ترسان فڕێی بدەنە ناو نیل و قەدەری خوا ڕزگاری بکات، کوشتنی منداڵ تەنها بۆ بەنی ئیسرائیل و کۆیلـەو چـینی کریکـارو ئیشـکەرو

غەریبەکان بوو، بەرەچەڵەك میسریەکانی نەدەگرتەوە، هەیە دەڵێ ئەخناتون یەکەم کەس بوە بانگی خەڵکی کردوە بۆ یەکتاپەرستی، ئەوەش وانیە، چونکە لەوەتی زەوی هەیە و مرۆڤی لەسەرە خواپەرستی هەربووە، لەزەویدا هەق و خواپەرستی ئەسڵە، بتپەرستی و ناهەقی شتێکی داهێنراوە، کە ئادەم دابەزی خواپەرست بوو، پاشتر نوح هەزار ساڵ بانگی خواپەرستی لێداوە، ئیبراهیم ساڵی ١٩٧٥پ.ز، ژیاوە بانگی یەکتا پەرستی کردووە، بەلاّم ئەخناتون نێوان ساڵانی ١٣٧٥پ.ز ئەو کارەی کردوە، واتە ٦٠٠ ساڵ نێوانیان دوای ئیبراهیم، بدیع السیوف دەڵێ ڕەنگە هەکسۆسەکان یەکتا پەرستیان هێنابێت بۆ میسر، بەلاّم لە حەقیقەتدا ئیبراهیم یەکەم کەس بووە، کە بەو باوەڕەوە لە شاری حەڕانی کوردوستانەوە هاتە کەنعان، پاشتر چووە میسرو، دواتر بنەی لە مەککە دانا، تۆوی یەکتاپەرستی لەڕۆژهەلاّتی ناوەڕاستدا پەخشکردوە، دواتر نیڤەرتیتی کچە کوردی هۆری میتانی، کە لەشاری حەڕان شازادەی پاشا توشترا بوو، شوی کرد بە ئەخناتون و، بە ٣٦٠ کچە شۆخی میتانیەوە گواستیانەوە بۆ میسر، ئەوانە یەکتا پەرست بون و، کاریگەری گەورەیان لەسەر ئەخناتون و میرەکانی تری میسر هەبوو[1]، دواتر یوسف لە حەڕانەوە چووە کەنعان و لەوێوە چوەتە میسر و، دووبارە باوەڕی یەکتاپەرستی لە میسردا ژیاندەوە، دواتر یەکێك لە کچەزاکانی نیڤەرتیتی کە ناوی ئاسیە بوو، دوای لە ناوچونی ئەخناتون، شویکرد بە فرعەونێك، ئەو بوو موسای گۆش کردو، یەکتاپەرستی تیاچاندو پەروەردەی کردو دابی جوانی فێرکرد، (وقالت امرءة فرعون قرت عین لی ولك لا تقتلوه، ٩ القصص) ئاسیە دژی بێبڕوایی و ملهوڕی فیرعەونی مێردی بوو، خوا دەفەرموێ کە ئاسیە دوعای دەکرد کە لە فیرعەون و کردەوەکانی دووری خاتەوە ( نجنی من فرعون وعملە)، دوایی موسا بەو باوەڕەوە گەورە بوو، بووە ڕزگارکەری یەکتا

[1] طۆظاری رامان، ذمارة ٣٩، ئةيلول سالى ١٩٩٩، لا ٢٠٩، دةولـةتى ميتانى ١٥٩٥ـ ١١٦٢ث.ز، كاريطةرى ئاينى كورد لةسةر شۆرشى ئةخناتون، حةسةن مةحمود حةمة كةريم

پەرستەکانی پاشماوەی ئەخناتون و یوسف و هەکسۆس و کۆیلەکانی میسر، لە بەردەم فیرعەوندا راپەڕی، کە بتی ئامونی دەپەرست و، خۆی بە خوا دەزانی، تەورات و ئینجیل و قورئان بە درێژی چیرۆکەکەیان گێراوەتەوە، مێژوونووسانی ئەوروپی و میسری لەم خاڵەدا هەڵەی زۆریانکردوە، ئەحمەد سوسەو تەها باقرو عەباس مەحمود عەقادو زۆریتر، چونکە سوودیان لە قورئان وەرنەگرتووە بۆ ئەو ڕوداوانە، هەر بەزەین و بۆچوونی خۆیان نووسیویانە، لە زۆر خاڵدا لێتێکچوون و پاش و پێش خستنی سەردەمەکەو ڕوداوەکانیان کردوە، جیاوازی هەیە لە نێوان حوکمی ئەخناتون و هەکسۆسەکاندا، ئەو کاتە عەرەب بتپەرست بوون، بتی زۆریان پەرستووە، هەکسۆس یەك خوایان بوە بەناوی سوتح، ئەخناتون یەك خوای بوە بەناوی ئاتون، ئەخناتون ناوی ئامونحوتب یان ئەمنۆفس بووە، نارەحەت بووە بە بتە زۆرەکانی سەردەمی باوکی، کە باوکی بۆی چار نەکرا،دژی ئامونی خوای طیبة بوو، سەردەمی ئەخناتون خەڵك پێشکەوتوو تر بوون لە تێگەیشتنی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئاینی، بیرۆکەی یەکتا پەرستیان لا گەڵاڵە بووبوو، دەیان زانی خوای تەنها خوای هەموو شتەکانە، دەیانزانی ئەم تەنە گڕاوییە سورە ڕوناکە، کە بە ڕێکی و ورد دێت و دەڕوا، بەسوودە، دەستکردی خوای هەموو شتەکانە، ناوی جۆراو جۆریان لێنابوو، بتیان بۆ کردبوو لە شێوەی سەری داڵ و لاشەکەی مرۆڤ، بە خوای مەزن و حوکم ناویان دەبرد، خوای خۆر بە کۆنترین خودای دروستکراو دادەنرێ، دەیانگوت دوو بەلەمی هەیە بەلەمی ڕۆژ، کە پێی دەپەڕێتەوە بۆ شەوو، بەلەمی شەو کە پێی دەگاتەوە بە ڕۆژ، ئەخناتون بڕوای بەیەك خوا هەبوو ناوی ئاتون بوو، ناوی خۆی کردە ئەخناتون، پایتەختی نوێی دروستکرد بەناوی تەلعەمارنەو وازی لە طیبة هێنا، هەوڵی دا بتەکانی تر بشکێنێ، مەدیەنەکانیش یەك خوایان هەبوو، کە لە ئەخناتون کۆنتربوون، ئیبراهیمیش لەوان کۆنترە، موسا لەو کەش و هەوایەدا پەروەردەبوو، سەرکردەیەکی میسری بوو لە کۆمەڵی ئەخناتون

بـوو ئـەو ئاینـەی وەرگـرت[1]، فرۆیـد دەڵـێ بـەڵام دوای مردنـی ئـەخناتون موسـا گەڕایەوە بۆ سنووری سینا، بانگەوازی بۆ ئەو بیرۆکەیە کرد، وەك فرۆید لە (موسی والتوحید) دا باسی دەکات. مێژوو نوس فوئاد شبل دەڵێ: ئەخناتون یەکەم کـەس بـووە توحیـدی داهێنـاو، دژی پیـاوە ئایینیـە خراپـەکان جـەنگا، پاشـان ئاینـە ئاسمانیەکان لـەوەوە دەرکـەوتن، (دور المصـر فـی تکـوین الحضـارة، فـؤاد شـبل، ج٢ص٥٩) ((قراءة حول مصیر النبی موسی. المحامی بدیع السیوفی .ص٤٤) بـەڵام ئەمە ڕایەکە هەر لە بنەچەوە هەڵەیە، چونکە ئەگەر ئایین ئاسمانی بێـت، چۆن لـە بیروڕاو ئایینی زەمینیەوە سەرچاوە دەگرێ و دروست دەبێت.؟ ئایین هەر خواییەو لە ئاسمانەوە سەرچاوە دەگرێت، ئەوان دەڵێن کە موسـا لـە حەبەشـە بـوو، سـاڵی ١٣٥٢ پ.ز ئـەخناتون مـرد، رعمسیسـی یەکـەم کودەتـای سـپی کـرد بەسـەر ئەخناتوندا، گەمارۆی حتشبەتی کچی ئەخناتونیدا، کـە دوای مردنـی بـاوکی چـوە سـەر دەسـەڵات، ئـەو پیـاوە ئایینیانـەی ئـەخناتون دەریکردبـون، یارمـەتی رعمسیسیانداو، بەتوندی حوکمی وڵاتیان دەکردو، دژی بەنی ئیسـرائیل و ئاسـیایی و ئەفـەریقیی و کۆیلـەکان دەجـەنگان، هەنـدێك دەڵـێن بـەنی ئیسـرائیل ویسـتیان کودەتا بکەن دژی رعمسیسی یەکـەم، ئـەویش لێـدان و چەوسـاندنیەوە ( د.احمـد شـلبی، مقارنـة الادیـان، ج٤) بـەنی ئسـرائیل ڕاهـاتبوون لەگـەڵ ژیـانی خـۆش لەسەردەمی یوسفدا، هەکسۆسەکان زۆریان ڕێزدەگرتن، بەڵام پاشـتر فرعـەونی تـر هاتن، وتیان دەبێت ئەمانە کار بکەن، زەوی بکێڵن و جوتیاری و کرێکاری و شوانی بکەن و خەریکی ئـاوەدانی وڵات بـن، وەك خـەڵکانی تـر ملکەچـی یاسـاو سـوغرەو کاری بە کۆمەڵ و هەرەوەزی بن، نەك هـەر خـەریکی خـۆش گـوزەرانی و ئـاڵتون و زێـرو زیـو کۆکردنـەوەو بازرگـانی و جەڵەبـداری مـەڕوماڵات بـن، بـەنی ئیسـرائیل ئەوەیان پێقبـوڵ نـەبوو، چـوون بەگژ فیرعەونـداو، سـووربوون لەسـەر ئـەوەی لـە سەردەمی یوسفەوە چۆنیان هێناوە هەروا بکەن و دەسکەوتەکانیان بپارێزن، کـارو

[1] قراءة حول مصیر ص٤٣

کاسبی ئاسان و، زاڵبـون بەسـەر بـازاڕو، خـوڕین و ئاغایـەتی، لـە لایـەکی تـرەوە، چـونکە بـەنی ئیسـرائیل خـۆش گـوزەران و بـە هەڵپـەو خـۆش خـۆرو خـۆش ژیـان ئیسراحەت بوون، زۆر زوو زیادیان دەکرد، ئەمـە دوو دڵـی لای فیرعـەون و کـاهن و سەرکردەو لێپرسراوان دروستکردبوو، گرفتەکە لەوەوە دەسـتی پێکـرد، میسـریەك بە شەڕ لە بەنی ئیسرائیلیەکی دا، ئەویش بانگی کردە موسا یاریدەی بدات، موسـا بە زللەیەك میسـریەکەی کوشـت، ڕۆژێکـی تـر ئـەو بـەنی ئیسـرائیلیە شـەڕی کـردو هاواری کردە موسا یارمەتی بدات، موسـا یارمـەتی نـەدا، کـابرای بـەنی ئیسـرائیلی شکاتی لە موسا کردو هەواڵەکە گەیشتە فیرعـەون، فیرعـەون ئـەوەی بـە هـەلزانی، ویستی لەوەوە موسا تاوانبار بکات بیگرن و بیکوژن و تۆڵـەش لـە بـەنی ئیسـرائیل بکەنەوە، کەسـێك هـەواڵی کۆبونەوەکـەی فیرعـەون و بڕیارەکـەی بـۆ موسـا هێنـا، مووسا ناچار بوو خۆی دەربـاز بکـات و هـەڵبێت بـۆ مەدییـەن، لـە مـاڵی (شـیرۆن) شوعەیب پێغەمبەر جێی بـوەوە، لـە گـەڵ شـوعەیب ڕێکـەوتن، ئەگـەر شـوانی بـۆ بکات صفورەی کچی دەداتێ، تەورات دەڵێ کچێکی (حەبەشـە، ئەسـیوبی) هێنـا، بەلاَم قورئان دەفەرموێ کچێکی مەدیـەنی هێنـا، دوای ئـەوەی بـوە چـل سـاڵ، بـە داوای خوا بە ژن و ماڵ و منداڵ و مەڕو مالاَتیەوە، بەرەو میسر کەوتە ڕێ، لە ڕێگە چەند جار وەحی بۆ هات، ئاگادار کـرا کـە هەنـدێ مـوعجیزەوی پێـدراوە، لـە گـەڵ هارونی برا گەورەیدا بچن، لە گەڵ فیرعەون و دەسەلاَتدارانی میسر قسە بکـەن، بـۆ ڕزگار کردنی بەنی ئیسرائیل لە ستەمی فیرعەون، کە گەشتنە جاسـان، هـارونی لـە گەڵ خۆی برد، بەلامەوە سەیرە، ڕوداوەکان وردەکاری زۆری دەوێت، موسا داوا لە فیرعەون دەکـات کـە تـەنها بـەنو ئیسـرائیل بەربـدات، بـا بـەرێی خۆیانـەوە بـڕۆن، (فارسل معی بنی اسرائیل. الاعراف ١٠٥) لە خوا بترسەو زەحمەتیان مەدە، بـەلاَم فیرعـەون، لەلایەکـەوە ئـەو گەلـەی نـاوێ و سـزایان دەدات، لەولاشـەوە کـە موسـا داوادەکات ئەو گەلەم بدەرەوە و بەریان بدە با لە کۆڵـت بکەمـەوە و بیـان بـەم بـۆ شـام، فیرعـەون بـەریان نـادات. ! ! دیـارە ئەمـە نهێنیـەکی تێـدا هەیـە، فیرعـەون دەترسـێ ئەگـەر بـەنو ئیسـرائیل بەربـدات و بچـنە شـام، ڕەنگـە لـەو سـنورانەدا

خەرخەشەو گێرە شیوێنی دروست بکەن و، هانی گەلانی ئەو ناوە بدەن بە یارمەتی ئەوان پەلاماری میسر بدەن، بە پێی تەورات و ڕوداوەکان، هەر دوانزە منداڵەکەی یەعقوب (ئیسرائیل)، هەموویان لە فدان ئارام، لە ناوچەی حەڕان، لە هەرێمی بۆتان و جزیرە لە کوردوستان لە دایك بوون، باوکیان لەوێ بیست ساڵ مایەوە، ئەمە ئەوە دەردەخات کە ئەو کوڕانە، لەدایك بوون و پێگەیشتن و گەورەبونییان لە دەرەوەی فەلەستین بوە، پاشان چوونە میسرو لەوێ نیشتەجێ بوون[1]، موسا ڕێی زۆری گرتە بەر کە فیرعەون واز لە گەلەکەی بهێنێ، چەند جار لە گەڵ فیرعەون وتووێژی توندو سوك و هەڕەشەیان لە یەکتری کرد، بێسوود بوو، جگە هەڵهاتن و دوور کەوتنەوە لە میسر هیچ چارێکی تریان نەما، هەتا لە دەست ستەم و زۆرداری فیرعەون ڕزگار ببن، (اأهب الی فرعون انه طغـی) زۆربەی زانایانی ئاسەوار لەسەر ئەوە یەکن، کە دەرچونی موسا لەسەرەتای سەدەی ١٣پ.ز بووە، هەندێکیش ڕایان وایە ساڵی ١٢٩٠پ.ز بووە، ئەو ڕۆژەی ڕەعمسیسی دووەم هاتە سەر تەخت، کە موسا گەڕایەوە وڵات، نامەیەکی بۆ فیرعەون نارد کە گەلی بەنی ئیسرائیل بەربدات و لە گەڵیدا بینێرێ، فیرعەون وەڵامی نەدایەوە، دەیویست هەر کاری سوغرەو خزمەتکاریان پێبکات، دەترسا ئەگەر بەریان بدات پەیوەندی بکەن بە دوژمنەکانی میسرەوە لە شام و، ڕێی بازرگانی نێوان میسرو شام بگرن و، لە کاروانە بازرگانیەکان بدەن، موسا بڕیاریدا دەربچێ، هەندێك دەڵێن فیرعەون مۆڵەتی دان موساو کۆمەڵەکەی بڕۆن، ژنانی بەنی ئیسرائیل وەڵامیان دایەوە، پێی وتن ئەگەر دەرچوون، بەدەستی خاڵی مەڕۆن، بەڵکو داوا لە دەرو دراوسێ بکەن، ئەوەی لایان بوو لە کەل و پەل و ئاڵتون و زیوو پارە و جلو بەرگ، بیان دەنێ، یان بیبەن، بەنو ئیسرائیل بەوەی کە بە نهێنی لە میسریەکانیان بردبوو، میسریەکانیان تالأن کردبوو، سەروەت وسامانیان بردبوون، ئەوان خزمەتکار بوون لە ماڵی گەورەکانیان، ڕەنگە بە نهێنی پێیان وترابێت، ئەوەی دەستیان دەگات لە کەل و

[1] قراءة حول مصير النبي موسى. المحامي بديع السيوفي، ص٥٠ـ ٥١

پەلی بەنرخ بیبەن و هەڵبێن، ئەمانە وتەی تەورات و ئینجیلە، هەندێ سەرچاوە دەڵێن، موسا ساڵی ١٣٥٠پ.ز بەسەر کەوتویی لە گرتنی ولاتی حەبەشە گەڕایەوە، ئەم دەنگ و باسە دونیای گرتەوە، عەموریەکان کە لە دەڵتای نیل گەمارۆ درابوون لەبەر ئەوەی کە لەسەر ئاینی یەکتا پەرستی ئەخناتون بوون، وە گەلی بەنو ئیسرائیل کە لە ژێر ستەم و زۆری فیرعەوندا دارزابوون، دایانە پاڵ سوپای موسا، سوپای موسا پێك هاتبوو لە سوپای حەبەشە و، پاشماوەی عەموریەکان و، پاشماوەی بەنی ئیسرائیل و هەندێ کۆیلەو سەربازی ئەسیری شام، کە فیرعەونەکان لە هێرشەکانیاندا گرتبونیان، کە ڕعمسیس نەیتوانی بە هێزی سوپا بەرنگاری موسا بوەستێتەوە، ناچار بوو لە گەڵی دانیشتن بکات، ڕعمسیس و حاکمانی دە هەرێمەکەی میسر کە هەموویان جادووگەر بوون، لە گەڵ موسا دانیشتنیان کرد، بەلام سوودی نەبوو، جگە لەوەی موساو کۆمەڵەکەی ناچاربوون بۆ خۆسازکردنەوە بکشێنەوە بۆ دەریای سوور، ویستیان دووبارە میسر بگرنەوە، بەلام موسا حەپەساو سەرسام ڕاماو غافڵگیرکرا، بینی فیرعەون بە سوپاکەیەوە لێی نیزیك بوەتەوە[1]، موسا گەڕایەوە لێواری ڕۆژهەلاتی دەریای سوور، پاشان ڕۆیشت هەتا گەیشتە شاخی تور، لەوێ نامەی خوای بۆ هات، کە دەڵێ خوایەکەو دروستکەری ئاسمان و زەویە..، موسا بەکۆمەڵەکەی وت: ئەمە نیشانەیە کە خوا سەرمان دەخات، ئەحمەد سوسە دەڵێ موسا سەرکردەیەکی میسری بوو، لەسەر ئاینی تەوحیدی ئەخناتون بوو، لە سەری بوو هێرش بۆ سەر ناوچەی کەنعان بکات، سوپاکەی لە کۆمەلێ سەربازی میسری و دەستەیەك لە پاشماوەی هەکسۆس پێك هاتبوو، کە بڕوایان بە ئەخناتون هەبوو، ناچاربوون لە ستەمی دەسەلاتی نوێ و پاڵەپەستۆی کۆمەڵگەی بتپەرستی هەڵبێن[2]، فرۆید دەڵێ موسا سەرکردەی میسری بوو، لەسوپای میسردا بوو، لە نێو کەش و هەوای بنەماڵەی

---

[1] قراءة حول مصير النبي موسى. المحامي بديع السيوف، ص ٥٦

[2] احمد سوسة. ص٥٠٥

فرعەوندا پەروەردە بوو، کە ئەخناتون مرد، ئیتر ئەو بوە مژدەدەری بیروڕای تەوحید، موسا گیری خواردوە بە دەست نووسەرە عەرەبە قەومیەکان کە دژی جولەکە دەنووسن، وەك ئەحمەد سوسەو تاها باقرو زۆری تر، کە دەڵێن بەنی ئیسرائیلی نەبوە، عەرەبی میسری بوە، کەنعانی گرتووە بۆ عەرەب، فرۆید دەڵێ موسا پێغەمبەر نەبووە، مژدەدەری ئاینی ئەخناتون بوە، سامی و عەرەبی نەبووە، پەیوەندی بە بنەماڵەی ئیبراهیم و لاویوە نەبووە، دەڵێ موسا وشەیەکی میسریە، ئەحمس و تحومس و رعمسیس و موسا، یەك جۆرن، موسوڵمانانیش دەڵێن موسا پێغەمبەری خوایەو، لە بەنی ئیسرائیلە، قورئان سورەتی زۆری پڕکردوە لە باس و خواسی موساو بەنی ئیسرائیل، بووە بە پێغەمبەرو ئامۆژگاری فیرعەونی کردوە، ئەوان قبوڵیان نەبووە، ناچار بە گەلەکەیەوە هەڵهاتووە، ول دیورانت دەڵێ، هەتا ئیستە جولەکە نەیانتوانیوە ئەو بۆشاییە زەمەنیە بدۆزنەوە کە لە نێوان سەردەمی ئیبراهیم و سەردەمی موسادا ونە، ئاسەوارەکان ئەوە دەردەخەن کە موسا بە ڕەگەزنامە و زمان و لە دایکبوون میسریە، لەسەر ئاینی ئەخناتون بووە، مەوسوعەی لیڤەرپولی بەریتانی دەڵێ، بەعسەیەك کە دانیشگای بەریتانی لە سەرەتای سەدەی ١٩وە ناردی بۆ بابل و عیراق و تەلعەمارنەو سامیرە، بە سەرۆکایەتی دکتۆر مریستون، دەریانخست کە موسا ئەمیرە حتشبسوب ڕزگاری کرد ساڵی ١٤٠١ پ.ز، لە کۆشکی ئەوان پەروەردە بوو، ناونرا موسا، واتە ئامونموسا، هەتا ناوەکەی بخوا بەوەی پێوەی لچکاوە، (قراءة حول مصير النبي موسى. المحامي بديع السيوف، ص٦٨ )کە بوە گەنجێك ئامونحوتب باسی خوای ئاتونی کردو، خۆی ناونابوو ئەخناتون، هەر ناوێك ناوی ئامونی پێوەبوو لایان برد، ئەویش بوە موسا، پاشان بەچەند کارێکی گرنگ نێررا بۆ بەرزاییەکانی نیل و ولاتی حەبەشە، بۆ بلاوکردنەوەی ئاینی نوێ، بەسەرکەوتوویی گەڕایەوە، کە گەڕایەوە دەبینێ ئەخناتون لە ناوچوەو گەلی بەنی ئیسرائیل دەچەوسێنرێتەوەو خراپیان پێدەکرێت، ئەویش ماوەیەك بەرگری لە گەلەکەی کرد، بەلام فیرعەون کۆبونەوەیەکی کرد بۆ نانەوەی داوێك بۆ موسا، موسا

هەواڵەکـەی بیسـت، پاشـان لـە میسـر هـەڵهات، بـۆ ڕزگـاربوون لەسـتەم وزۆرداری فرعەون، وەك مێژوونوسی جولەکە بوسفیوس باسی دەکات، سیجموند فروید زانای دەرونی کە جولەکەیە لە کتێبی (الموسی والتوحید) کە ساڵی ١٩٣٨ بلاّوی کردەوە دەڵێ: موسا میسریەو ئیسرائیلی نیە، ئەم وتەیە جولەکـەی تـوڕە کـرد، هـارون لـە سینا مرد، پاشان موسا لە ١٢٠ساڵیدا مرد، هەندێ دەڵێن کاهینەکان کوشتیان و لە سینا نێژررا.

چیرۆکی مووسا بە ڕاست و ڕەوانیی لە زۆر سورەتی قورئاندا بـە دوورو درێـژیی باس کـراوە، بەتایبـەت لـە سـورەتی (ئـەعراف و قەصـەص و تـەها)دا، منـیش لـە ژمارە (٣٩| ئەیلول، ساڵ ١٩٩٩)ی گۆڤاری (رامان)دا بابەتێکی دوورو درێژم لەسەر هۆکاری شۆڕشی ئەخناتون باسـکردووە، پێویسـت ناکـات لێـرە هـیچ بڵـێین، جگـە ئەوەندەی دکتۆر جەمال هاتووە بە لاوازیی سودی لە تـەورات و ئینجیلـە تێکـدراوو دەسـتـێوەرەکان و هەنـدێ سەرچـاوەی تـر وەرگرتـووەو، دەسـتکاری ئەوانیشیکردووە، بـە هـیچ جۆرێـك لای بـە لای قورئانـدا نەکردوەتـەوە، مەگـەر بـۆ ناشیرینکردنی، کاتێك دێتە سەر باسی هـەر پێغەمبـەرێك لـە ڕاسـت و ڕەوانیەکـەی دەیترازێنێـت، جگـە لارو لـەوێرو چـەوت و چـەپەڵ و تێکـدان و لـە ڕاسـتیی دورکەوتنەوە، هیچی تر ناڵێت، بە ڕاستیی جێـی تێڕامـان و لێوردبوونـەوە لـە بـیرو دەروونی دکتۆر جەمال هەیە، جێی خۆیەتی بزانرێ ئەم کەسە چۆن گەورە بـووە و گەشـەیکردووە و ئـەم وتانـەی، ڕەنگدانـەوەی چ قۆنـاخێکی ژیـانیی ئـەوە، ئـەمرۆ دەیهێنێتەوە.

ئەگەر ئەو دیراسەی عەقیدە دەکات، هەقە بڵێ عەقیدەی ئـەخناتون قۆنـاغێکی نوێترو گەشەسەندوترە لە عەقیدەی فیرعەونەکانی پێش خۆی، وە عەقیدەی موسا لە عەقیدەی ئەخناتون پێگەیوترو پێشکەوتووترو لە بارترە، ئەو لێکۆڵینـەوە لـەوە بکات باشترە، بۆچی ئەخناتون کە خۆی پاشاو فیرعەون بوو، خـاوەن دەسـەلاّت و سـوپا بـوو، لـە بنەماڵـەی فیرعەونـەکان بـوو، تێـك شـکاو سـەرکەوتوو نـەبوو..؟ لەسەردەمی خۆیدا بیرۆکەکەی پوکێنرایەوە..؟ بـەلاّم موسـایەکی منـداڵی دۆزراوەو

بێکەس، گەلەکەی کرابوونە کۆیلەو دەچەوسێنرانەوە، موسا سەرکەوت و بۆ هەزار ساڵ بیرۆکە یەکتاپەرستییەکەی لە گەشەدا بوو، پاشان چەند پێغەمبەری تر دوای ئەو هاتن بۆ بەردەوامکردنی باوەڕەکەی موسا، بەڵام بەداخەوە کارەکانی ئەم دکتۆرە زۆر جێی گومانو لێوردبوونەوەیە، تێبینی زۆر هەڵدەگرێت، دکتۆر دەڵێ: (موحەممەد دینەکەی عیساو موسای هێناوەو بەناوی خۆیەوە دایڕشتۆتەوە) دەڵێ: (گاورەکان و وەرەقەو بوحەیراکانی ناوچەی مەککە محەممەدیان فێری ئەو دینە کرد، محەممەد بە ناوی خۆیەوە بڵاوی کردەوە) دەڵێ: (موسایش لە عەقیدەی ئەخناتون سودی وەرگرتووە) بەڵام بیست و چوار هەزار پێغەمبەر سەلامی خوایان لێ بێت کە هاتوون، هەریەکە جگە لە خواناساندن و بانگەواز بۆ یەکتاپەرستیی، هەریەکەیان بۆ راستکردنەوەی دەرکەوتەیەکی خراپی رۆژگارو کۆمەڵگەیەك هاتوون، ئاینی لە ئادەمەوە تا موحەممەد درودی خوایان لەسەر بێت، بە پێی رۆژگارو پێشکەوتن و گەشەکردنی مرۆڤ دابەزیوە و قۆناغبەندی سەردەمی تیا ڕەچاو کراوە، واتە نوح و ئیبراهیم بۆ قۆناغێکی پێشکەوتووتر هاتوون لە سەردەمی ئادەم و شیس، ئایینی موحەممەد پێشکەوتووترو فراوانترو ئاسانکارترە لە ئایینی موساو عیسا، خوای گەورە بە گویرەی سەردەم ئاسانکاریی لە ئاینەکاندا کردوە، جگە لە جێگرو سابتەکان کە جێی قسەو باس نییە، لە بابەتی مامەڵەو زەواج و کێشەو تۆڵەو ئاشتی و شەڕو شتەکانی تردا جیاوازییان هەیە، واتە: خوای گەورە بە گوێرەی سەردەم و زەین و پێشکەوتنی مرۆڤەکان، ئایینەکەشی ساکارتر دارشتوە، لەگەڵ کەش و هەوای سەردەمدا گونجاندوویەتی.

پاشان دکتۆر جەمال برگەیەك دەهێنێ و دەڵێ: "موسا بە هێزی شمشێر زەویەکانی بەردەمی داگیرکرد، کە ولاتی کەنعان بوو، ئەوەبوو شارو دێی سوتاندن، کە چووە ناو فەلەستین هەر لەوێش مردو یەشوعی لە جێی خۆی جێهێشت"[1] ، دکتۆر جەمال باسی دوژمنەکانی موساو گەلەکەی ناکات کە کێ

[1] ظهور الکرد ل٣٦٦.

بوون، هەروەها بە سادەیی باسەکان دەهێنیّ، لەو هەمووە چاکەیە کە ئەو پیاوە ئایینیانە کردوویانە، چەند رستەیەکی خراپیان بە عەقڵی خۆی بۆ دەچنیّ، ئەوەندەی لە توانایدا بوە هەوڵیداوە خواو پێغەمبەران ناشیرین بکات، دکتۆر جەمال خۆی بە کەسێکی نیشتمانپەروەرو شۆڕشگێڕ نیشان دەدات، زۆر شانازی بەوەوە دەکات کەڕەسمێکی لەگەڵ مەلا مستەفای رەحمەتیی دا هەیەو هەموو جار نیشانی دەداوەتەوە .

ئەی بۆ ئەم کەسە شۆڕشگێڕە ـ ئەگەروایە ـ بۆ نایەت بەرگری لە شۆڕشی موسا بکات دژی:

١ـ فیرعەونێك کە گەلی جولەکەی لە فەلەستین بردووە بۆ میسر، کردوونی بە خزمەتکاری کۆشکەکان و ماڵانی میسر و فیرعەون زادەکان و، جادەکانی پایتەختیان پیّ پاك دەکاتەوە و بە کولەمەرگیی دەیانژێنیّ و سزایان دەدات، موسا هاتووە بۆ ڕزگارکردنی ئەم گەلە لەژێر دەستیی چنگی فیرعەون کە هەموو مێژوو شایەتی ستەم و زۆرو خوێنڕێژیانە.

٢ـ موسا دوای ئەوەی گەلەکەی لە چنگ دوژمنی یەکەم، فیرعەون، رزگارکردو بە ڕووباری نیل و بیابانی سینادا بردنی بەرەو فەلەستین، دەبینیّ گەلێکی زۆردار شارو دێهاتەکانی داگیرکردون و رێگە نادەن بە موساو گەلەکەی بچنە ناو وڵات و شار و خاك و ئاوی خۆیان، لەبەر ئەوەی کە هەکسۆسەکان هێزێکی ئازاو کەڵەگەت بوون، جولەکەکان لێیان ترسابوون، هەرچەندە موسا داوای لە گەلەکەی کرد کە با بچین بەگژیانداو وڵاتتان لەو داگیر کارانە رزگار بکەن، بەڵام جولەکەکان نەچوون لەگەڵیدا، وەك قورئان دەیگێڕێتەوە: بە موسایان وت: تۆو خواکەت بچن شەڕبکەن، ئێمەش لێرەوە سەیرتان دەکەین، بەڵام دکتۆر جەمال چووە لە تەورات و کتێبەکانی تر زانیاری وەرگرتووە، ئەو زانیاریەکانی بە هەڵە دابەزاندووە، یان لێی تێکچووە.

مێژوونووسان دەرچوونی موسایان بۆ خاکی کەنعان (فەلەستین لە نزیکەی ساڵی١٢٩٠پ ز،دا داناوە، ئەوکاتە کە فیرعەونی میسر (رەعمسیمی دووەم) لەسەر

تـەختی میسـر بـوو سـاڵی ١٣٠٠ـ ١٢٣٣پ ز، هەنـدێك دەڵـێن موسـاو كۆمەڵەكـەی، شەش حەوت هەزار كەس بوون، تەورات دەڵێ: شەش سەد هەزار زیاتر بـوون، ئـەو فیرعەونە لە هەوڵی داگیركردنی باشووری وڵاتی شامدا بـوو، هەنـدێكی لێـداگیركرد، وەك فرۆیدو مابەر وای بۆدەچن، موساو دوو كۆمەڵەكەی وەك تەورات بـاس دەكـات لە شاری (رەعمسیس) لـە خـاكی (جاسـان) چـوونە شـاری (سـكوت) و (ئیسـام) و گەیشتنە دەریا، فیرعەون و سوپاكەی بە دوایانەوە بوون، ئـەوان بـە موعجیزەیـەك پەڕینـەوەو سـوپای فیرعـەون بـە پاشـاو هەموویانـەوە تیاچـوون، كۆمـەڵی مووسـا چوونە خاكی (سینا) و دۆڵی (قیران) و، گەیشتنە (وەش) و شاری (رفیدیم)، لەوێدا جەنگی موساو عەمالیقەكانی خەڵكی ئەو وڵاتـە روویـدا، پاشـان لـەوێوە چـوون بـۆ كێوی سینا، موسا لەوێـدا وەحـی بـۆ هـات، پاشـان موسـا گەیشـتە ژن و منـداڵ و كەسوكاری و خێزانی و خەڵكی شاری مەدیـەن، كـە هـاتبوون بـۆ یارمـەتی موسـا، ساڵێك لەو دەشتو شاخە مانەوە، پاشان بە داوای خوا روویانكردە ناوچـەی وادش لە باكوری سیناو كەنداوی عەقەبە، چەند گوندو شاریان بڕی، هەتا گەیشتنە خاكی ئەدوم، موسـا چـەند چـاودێرێكی نـارد هـەتا سـەیری خـاكی كـەنعان بكـەن، بـزانن خەڵكەكەی لاوازن یان بەهێزن، زۆرن یان كەمن، كـە هاتنـەوە وتیـان: خـاكێكی بـە پیت و خاوەن شیرو هەنگوین و ترێ و هەنار و هـەنجیر، هەندێك شتیان بـە نموونـە هێنا، وتیان بـەڵام لـەوێ خـەڵكێكی باڵابـەرزی كەتـەی زل و ئـازاو زۆری لێیـە، كـە لەبەر چاوی ئێمە وەك كوللە زۆر بوون، ئەم قسانە كاری لـە بـەنی ئیسـرائیل كـردو ترسـان، هەنـدێكیان چـوونە سەرشـاخەكەو چـاودێرییان كـرد، بـەڵام كـەنعان و عەمالیقەكان هاتن بۆیان و لێیاندان و شكاندنیان، قورئانیش هەنـدێ لـەم هەواڵانـە پشتڕاست دەكاتەوە، تەورات و قورئان بـاس لـەوە دەكـەن، كـە ترسـنۆكیی بـەنی ئیسرائیل وایكرد موسا بڕیار بدات چل ساڵ لە سینادا بمێنێتـەوە، هـەتا ئـەو نـەوە ترسـنۆكە لـە نـاو دەچـن، یـان لەسـەر سـەرماو گـەرماو برسـێتی ڕادێـن، ڕاهێنـانی خۆگریی دەكەن بۆ بەرامبەركێی ئەو عەمالیقە زەبەلاح و ئازایانە، بەم جـۆرە هـەتا نەوەی نوێ و ئازاو بەغیرەت هاتەكایـەوەو، كۆنـە ترسـنۆكەكان تیاچـوون، هـارون

لەویٚ مرد، دوای چل ساڵ لە دەرچوونیان لە میسر، ئەو ماوەیە موساییەکان سەلامەت بوون، چونکە ناوچەکەیان لەژێر دەستی کاشیەکانی عێراقدا بوو، ئارامییەکانیش نەگەیشتبوونە ئەو هێزەی بتوانن دژی موساییەکان بجەنگن، لەبەر ئەوە موساییەکان چل ساڵ لە لێوار چیاو شاری قادش مانەوە، شەڕێکی درێژیش لە نێوان (فرعەون رعمسیس و حیسیەکان) دا لەسەر خاکی کەنعان هەبوو، (مواتالیس) پاشای حیسیەکان بوو، خەریکبوو حیسیەکان سەردەکەوتن، بەڵام یارمەتی بۆ رعمسیس هات و شەڕ وەستا، رێکەوتن مۆرکرا لە نێوان رعمسیس و پاشا حیسی (حاتوشیلی سێیەم )، ساڵی ١٢٦٩ پ.ز هاوپەیمانی مۆرکرا دژی دوژمنی هاوبەشی دەرەوەو شۆڕشی ناوخۆ، ئەم رێکەوتنە وایکرد موسا بووەستیٚ لە هێرشکردن بۆ ناوەوەی فەلەستین، دوای چل ساڵ موسا وازی لە رۆژئاوا هێنا، بە داوای خوا لە رۆژهەڵاتی فەلەستینەوە هێرشیکردو، لەو پێنج دەوڵەتۆکە بچووکەی لەو ناوچەدا هەبوو، توانی سیانیان بگریٚ و سوپاکەی پیٚ بەهێز بکات و سنوری فراوان بکات، (لورد مونتغمری) پێیوایە کە چل ساڵەکەی موسا لە سینادا بۆ ئەوە بووە، چونکە بەنوئیسرائیل شوان و لادیٚ و خزمەتگوزار بوون شەڕکەر نەبوون، ئەم هێزە ناتوانیٚ بەرەنگاری هێزی بەهێزی ناوچەکە ببێتەوە، هەتا نەوەیەکی نوێی ئازاو بە توانا رانەهێنیٚ بۆ شەڕ، ئەوەش بە مانگ و دوومانگ ناکریٚ، هەر بۆیە چل ساڵی خایاند، ئەوسا خاکی فراوانی کەنعان، بەهێرشی بەهێزو خێراو پشتشکێن دەگیریٚ، هەر بۆیە بە چل ساڵ نەوەیەکی نوێی پتەوی راهێناو نەخشەی دووەمی بیرۆکەکەی دەستپێکرد، نەخشەی یەکەم رزگارکردنی گەلەکەی بوو لە فیرعەون، نەخشەی دووەم رزگارکردنی خاکەکەیان بوو لەدەست داگیرکەران، خوای گەورە لە قورئاندا باسی خراپەی زۆری بەنی ئیسرائیل دەکات بەرامبەر خواو پێغەمبەران و خەڵك، تەنانەت دەفەرمووێت: (وَيَقْتُلُونَ الأنبِيَاء بِغَيْرِ حَقٍّ)، ئایەتی زۆری تر هەیە، کە چەندین پێغەمبەری تری خۆیان کوشتووەو بە مشار دایان هێناون، تەورات هی موسایەو قسەی خوایە، کە موسا مرد، ئیتر تەورات دەوەستیٚ و وەحی نامێنیٚ، بەڵام جولەکەکان دەستێوەردانی زۆریانکردوە،

زۆربەی هەرە زۆری تەوراتیان شێواندوە، تەنانەت باسی وەحی دوای مردنی موساش دەکەن و دەڵێن موسا خیانەتی کرد، خوا بەدەستی ئێمە کوشتی، تاوانی خیانەتیش دەدەنە پاڵ هارون، ئەم ئایەتە دەستکردانە مێژوونووسانیشی هێناوەتە قسە، هەر یەکە بە جۆرێك باسی تاوانە هەڵبەستراوەکەی موساو هارون و، جۆرێك باسی کوشتنەکەی دەکەن، هیچ پێغەمبەرێك نەبووە کە خوا هەڵیبژاردبێ ئاین بگەیەنێ، دوایی خیانەت بکات، ئەوە بوختانی جولەکەیە بەرامبەر پێغەمبەرەکانیان، گەر قوئان بە وردی بخوێنیتەوە، هەست دەکەیت جولەکە چەندە زەحمەتی موسایان داوە، گاڵتەیان بە خواو بە موساکردوووە، مەرجیان لەسەر داناون، کە جێبەجێش کراوە، وەك خوا دەفەرمووێ پەیمانەکەیان شکاندووە، ئەگەر موسا خیانەتی کردووە، ئیتر ئەم تەوراتە لەکوێ جێی بڕوایە، ئایینی جولەکە چ پەیوەندییەکی بە موساوە هەیە؟ فرۆید لەو بارەیەوە دەڵێ: زۆر لەوە دەچێ کە موسا بە دەست هاورێکانی کوژرابێ، چونکە موسا لە قوتابخانەی ئەخناتوندا پەروەردە بووە، هەردەبێ توند تەبیعەت و توورە بووبێت هەروەك ئەخناتون، موسا زۆر توند بووە بەرامبەر دواکەوتووانی و، ئەوانیش پێیان قبوڵ نەکراوەو کوشتویانە، بەڵام: ئەکەم قورئان پێچەوانەی باسەکانی فرۆیدی دەروونناس ئەوە باس دەکات، زۆر بە وردی باس لە دڵرەقیی جولەکەو فێڵ و حیلەیان دەکات، باسی ماندوبوون و ئارامگریی موسا دەکات بە دەستیانەوە.

دەڵێن دوای موسا سەرکردایەتی کەوتە دەست یەشوع، تەورات دەڵێ: خودا داوی لە یەشوع کرد کە سنووری ئەردەن ببڕێ و هێرش بەرێ، ئەویش (٣١) پاشای کەنعانی لە ناوبردو، هەموو خەڵك و حەیواناتی ناو شاری ئەریحا هەبوو، هەموویانی بە شمشێر کوشتیان و ئاگریان لە شار بەردا، یەشوع هەتا لوبنانی بە شەڕو کوشتار گرت، ئەوەی زیاتر یارمەتی بڵاوبوونەوەی دا، گونجاندنی باری سیاسی بوو، چونکە وڵات پارچە پاچە بوو، دەوڵەتۆکەی بچووك بوون کە لە ژمارە نەدەهاتن، هەموو دەرەبەگ بوون، چونکە کە فیرعەونە میسرییەکان هەکسۆسەکانیان دەرکرد و ڕاویاننان، وڵاتی کەنعانیشان گرت (شام)، هەروا ئەو

ناوچەیان بەبێ ئیدارەو خزمەت گوزاری جێ هێشت، هەریەکە حکومەتێکی بچوکی بۆخۆی دروستکردبوو کە زۆر لاوازبوو، نەیان دەتوانی هیچ چالاکیەکی بەرچاو بنوێنن، بەم جۆرە دەبینی ئەو قەتڵ و عامە، ئەگەر ڕاست بێت، موسا نەی کرد، پەشوع کردی، ئەگەر چیرۆکەکە ڕاست بێ، چونکە لە تەوراتە تێکدراوەکەدا هاتووە، دووەم: موسا وانەی عەقیدەی لە ئەخناتونەوە وەرنەگرتووە، بەڵکو موسا هەر خوا خۆی لە منداڵی و شیرەخۆرییەوە پەروەردەیکرد، ( واصطنعتك لنفسی) (علی عینی)لە سەر برین ڕزگاریکرد، بەدایکی وت بیخە دەریاو وازی لێبێنە، ماڵی فیرعەون گرتیانەوە، لە ماڵی فیرعەون و لەژێر چاودێریی و باوەشی ئاسیە ژنی فیرعەوندا بەخێو بوو، (وقالت امرءة فرعون قرت عین لی ولك لا تقتلوه، ٩ القصص) بنەماڵەی ئاسیە بنەماڵەیەکی ئاینی بوون، دایکی موسا، موسای خستە ناو سندوق و نیلەوە، ئاو بردی بۆ ماڵی فیرعەون، دوایی دایکی بۆ هاتەوەو شیری دایەو ئاسیە سەرپەرشتی بە خێوکردن و گەورەکردنی کرد، لە قورئان و تەوراتدا بە هیچ جۆرێك باسی ئەخناتون نەکراوە، کە هاوڕێ موسا، یان موسا سەرکردەی ئەخناتون بووبێت، شۆڕشی ئەخناتون میسری بوو بۆ بەرژەوەندی میسر بوو، بەلاّم شۆڕشی موسا بۆ ڕزگارکردنی بەنی ئیسرائیل بوو لە ژێر دەسەلاّتی بێبڕواو بتپەرستی میسر، ئەخناتون فیرعەون بوو بڕوای بە خوا هەبوو، بەلاّم شۆڕشی مووسا دژی بێبڕوایی و زۆرداری فیرعەونی میسر بوو، هەربۆیە هەموو سەرچاوەکان لەوەدا هەڵەن کە مووسایان بە هاوەڵی ئەو فیرعەونە ناو بردووە، هەڵەکانی دکتۆر جەمال لەوەدایە کە تەنها لە سەرچاوە گوماناویەکانەوە زانیاری وەردەگرێت و بە ناوی خۆیەوە دایدەڕێژێ و بلاّوی دەکاتەوە، هەتا خەڵکی کەم دوو و سادەو نەشارەزا، وابزانن ئەم هەوڵ و ماندوبوون و لێکدانەوەو لێکۆڵینەوانە هی دکتۆر جەمال خۆیەتی، دکتۆر جەمال لێکۆڵەرێکی حەقانی ڕاستگۆنییە، بە دوای ڕاستیدا ناگەڕێ، بەڵکو تەوراتی تێکدراوو فرۆیدی تێکدەرو ئەحمەد سوسەی نەتەوە پەرستیی عەرەبی، کە هەموو چالاکە مێژووییەکانی بردۆتەوە بۆ خزمەتی مێژووی عەرب و ڕەگەز پەرستی دەکات، لەگەڵ ئەوەی کە زانایەکی بە توانایە،

بەلأم زۆر دژی جولەكەو غەیرە عەرەب قسە دەكات، هەموو شت بۆ بنەچەی عەرەب دەباتەوە، دكتۆر جەمال زۆربەی باسەكانی (ظهور الكورد فی التاریخ) و، باسەكانی پێش ئیسلامی لەكتێبی تەورات و كتێبی (مفصل العرب والیهود في التأریخ) وەرگرتووە، ئەم كتێبە لە ناوو ناوەرۆكدا لێك دەچن، كتێبەكەی بە كوردی كردووەو دایڕشتوەتەوە، دكتۆر ویستویەتی شاكارێكی وەك ئەحمەد سوسەو تەها باقر بنوسێ، سوودی لە هەندێ كتێبی رۆژهەڵاتناسان وەرگرتووەو، خۆی بۆ خۆی جارێكی تر دایڕشتۆتەوە، كەم جار سەرچاوەیەكی هێناوە، ئەویش بە نوقسانی هێناویەتی، ناوی نوسەر و لاپەڕەو چاپ و ساڵ و، تەنانەت هەندێك جار ناوی كتێبەكەشی بە هەڵە هێناوە.

ئەو دەیتوانی شتی جوان بنوسێ، بەلأم نەیكرد، ئەو لە لەلاپەڕە (٣٩٠)و (٣٩١)دا زۆر جوان باسی پەیوەندیی نێوان ئیبراهیم و موحەممەدو مەككەو كەعبە دەكات، قەڵەمی ئەو زۆر لە قەڵەمی تەها حسین و عەقادو هەیكەل بە هێزترو بەبڕشتتر دەبوو، ئەگەر وەك ئەوان ڕاستی بە خەرج بدایە، دیارە دكتۆر نەیویستوە، یان حەزی نەكردووە ئەو لایەنەی زەق و دیار بێت، ئیتر لەبەر هەر هۆیەك كە لە دەروونی خۆیدایە.

## ٩- چیرۆكی غەرانیق

دكتۆر گومان لە زۆر ڕستە دەكات كە لە مێژووی ئیسلام دا نووسراوەو هەیە، ڕاستە مێژووی ئیسلام سەد لە سەد پوخت و پاك نەنووسراوە، هەڵەو پێوەلكان و زیادەڕەوی و باس و خواسی ئەفسانە ئامێزی زۆری تیایە، كە عەقڵ و شەرع قبوڵی ناكات، ئەوەتە خەریكە زۆر لە نووسەران و مێژوونووسانی ئیسلامیی، لێرەو لەوێ رەخنە لەو لایەنانە دەگرن و، لە پوختكردنەوەی شەریعەت و تەفسیرو فەرموودەو مێژووی ئیسلامدان، زۆریان كردوەو توانای چاكیان بە خەرجداوە، تەنانەت تەفسیری هەڵەو نەپێكان بۆ ئایەتەكان كراوە، هەزاران فەرموودەی خراپ بە ناوی پێغەمبەرەوە هەڵبەستراوەو نووسراوەو، لە شەریعەتدا چێنراوەو كاری لەسەر كراوە، كاریگەریی خراپیی بووە، بەلأم ئەمە ناكاتە ئەوەی، كە هەموو

بنەماكانی عەقیدەو شەریعەت و مێژووی ئیسلامیی لابەرین و دووری بخەینەوە و، بە كەیفی خۆمان رەخنە لە خواو پێغەمبەر و قورئان بگرین، فەزلی بۆچوون و بیركردنەوەو زەینی خۆمان و، هەڵەو نەپێكانی هەندێك بدەین بەسەر ئەوانەدا، هەموو شت بخەینە بەرباس و چەكوش كاریی، بڵێین دەبێ قسە لەسەر هەموو دەقەكان و پیرۆزیەكانیش بكەین، دەم لە هیچ نەگێڕینەوە، هیچ خاڵێك نەبێت پیرۆز بێت و پەرێزی لێبكەین، زەینی ئێمە سنووردارە، پەی بە هەموو شت نابات، تەنانەت پێغەمبەریش دەفەرموێ بیر لە خوا بكەنەوە، بیر لە خەلقی خوا مەكەنەوە، وە دەفەرموێ رەحمەت لەوكەسەی قەدری خۆی دەزانێ و دەیناسێت، واتە بە پێی توانای خۆی بیر دەكاتەوە، بەپێی سنووری توانای زانستی خۆی قسەدەكات و پێرادەكێشێ، بنەمای ئایینی وا هەیە ئەستەمە بخرێتە ژێر تاقیگەو چەكوشكاری و نەقاری، ئەستەمە كەسێك هەر بەدوای هەڵەو خاڵی لاوازدا بگەرێت و، بیهێنێ و بیبات و بەرامبەری پێناشرین بكات، دكتۆر جەمال وەك زۆر لە رۆژهەڵاتناسان و ئەوانەی بەرامبەركێی ئیسلام دەكەن، رستەیەك كە لە قورئاندا بوونی نییە، بتپەرستییەك كە موحەممەد هەرگیز نەیوتووەو نەیكردوە، هەموو ژیانی بۆ دژایەتی ئەوە خەریك كردوە، كەسوكاری بۆ ئەوە كردە دوژمنی خۆی. ! دەڵێن موحەممەد داوای بتپەرستیی كردووە، زۆر سەیرە، من لەو بروایەدام دكتۆر جەمالی شارەزاو لێكۆڵەر، بروای بەم شتانە نییە، بەڵام هەر بۆ ئاهی سوێن و، بۆ ئەوەی وەك خەڵك بكات، بۆ كارێك كە خۆی دەزانێ مەبەستی چییە.؟ وتەكانی رۆژهەڵاتناسان دەڵێتەوەو دەڵێ: (بنەماڵەی عەبدولمەناف، لە ناویاندا گەورەكانی مەككە، كە سەرپەرشتی كاروباری ئایینیان دەكردو، خەریكی خزمەتكردنی بتەكان بوون، كە بە خوایان دەزانین و ژمارەیان (٣٦٠) دانە دەبوو، وەك یەغوس و یەعوق و وەدو سواع و نەسرو هوبەل و عوززاو مەنات و لات و نائیلەو هی تر، پەرستن و پیرۆزیی سیان لەو بتانە، هەتا سەردەمی ئیسلامیش هەر بەردەوام بوو، جوبرەئیل وەحی بۆ هێناوەو لە ئایەتەكانی قورئاندا وتراوە: (ئەو سێ بتە، ـ لات و عوزاو مەنات ـ، شەفاعەتیان دروستەو ئەوانە غەرانیقی بڵندو پایە بەرزن)[١].

---

[١] ظهور الكرد فی التاريخ، د. جمال رشيد احمد ل٣٩٥ـ ٣٩٦

غەرانیق یەعنی (مالك الحزین)ی سپی، ئەم گیانداره مانایەکی ئالۆزی هەیە، ئەمە باڵندەیەکی پیرۆزبووە لای میسریە کۆنەکان، هەندێکی تر دەڵێن ناوی باڵندەی عەنقایە، قسە لەم بارەوە زۆرەو هەمووی لە ڕاستییەوە دوورە، ئەمە باڵندەیەکی ئەفسانەییە، باس و خواسی لە ئەفسانە کۆنەکاندا زۆرە.

کورتەی باسەکە ئەوەیە، هەندێ گێڕەرەوە دەڵێن: پێغەمبەر ڕۆژێك سورەتی (ئەلنەجم)ی دەخوێندەوە، کە گەیشتە ئایەتی (أَفَرَأَيْتُمُ اللَّاتَ وَالْعُزَّى * وَمَنَاةَ الثَّالِثَةَ الْأُخْرَى) (النجم، ٩ـ ٢٠)، پاشان گوایە محەممەد پێغەمبەر، لە خۆیەوە لە ناو ئایەتەکاندا ئەم دێڕانەشی بۆ ئایەتەکان زیادکردوەو وتوویەتی: (تلك الغرانيق العلي وان شفاعتهم لترتجي)، ڕۆژهەڵاتناسان لێرەدا هەڵێك و نێچیرێکی چەورو ئامادەیان دەستکەوتووە بۆ هێنان و بردن و قسەو باس، ئەوان لە خۆڕایی ڕستە دروستدەکەن، بێ لێکۆڵینەوە دەقەکان دەهێنن، بەسادەیی و بە زەینی خۆیان وردی دەکەنەوەو، وەك عەرەب دەڵێ تەفکیکی دەکەن، دواتر بە جۆرێکی تر تەرکیبی دەکەنەوە، قسەو باس و بیرۆکەی نەگونجاوی لێدروست دەکەن، چۆنیان بوێت بۆی دادەڕێژن، ئەوان پەیوەست نین بە هیچ بنەماو بیرۆکەو تێگەیشتنێکی ئاینیەوە، هەرچیان دەست بکەوێت، چەندی تێبچێت، ڕاست بێت یان هەڵەو دروستکراو، وێنەو دەقی هەر نوسەرێك بێت، دەیهێنن و مامەڵەی دەقێکی ڕاستەقینە و دروستی لە گەڵ دەکەن، دەڵێن ئەم برگەیە ڕاستەو بوەو ڕویداوە، دەڵێن غەرانیق ئایەتێکی تەواو ڕاستە، ئەنجا ئاماژەکانی گریمانەو ڕەنگەو لەوانەیەی بۆ دەهێننەوە، دەڵێن پێغەمبەر بۆیە ئەو وتەیەی وتووە، هەتا قورەیشییەکان لێی نێزیك ببنەوەو، ئەوەندە دژایەتی خۆی و هاوڕێکانی نەکەن، لێیان نەدەن و دەریان نەکەن و زۆریان بۆ نەهێنن، نەوەك لە ناچاریدا لە ئیسلام پەشیمان ببنەوە، یان بە ئاینەکەیانەوە برۆن و کۆچ بکەن و ناوچەکە جێبهێڵن.!

دەڵێن پێغەمبەر حەزیدەکرد لە قورەیشیە بتپەرستەکان نێزیك بێتەوەو تەنازولیان بۆ بکات، هەر بۆیە مەدح و سەنای بتەکانیانی کرد، هەتا بڕوا بکەن کە موحەممەد لە گەڵ بتپەرستەکان نەرم بووە، لە گەڵ خواپەرستیدا داوای پەرستنی بتەکان

دەكات و، رازیە لەگەڵ خوادا بیپەرستن، گوایە بتەكانیش وەك خوا شتیان بەدەستەو دەتوانن شەفاعەت بكەن، بڕیاریداوە ئیتر لە بتەكان نەخوێنێ، پەشیمان بووەتەوە لە دژایەتیی بتەكان..

بەڵام ئەو قسەو باس و لێكدانەوانە هیچی ڕاست نیە، هەموو زاناو موفەسیرو مێژوو نووسان دژی ئەو قسانە وەستاون و ڕەدیان كردوەتەوە، ئەو دێڕە قسەیە، هی پێغەمبەرو قورئان نییە، قورئان ئایەتەكانی دیارەو ڕوونەو لەبەر چاوە، لەبەر ئەوە دروست نییە و عەقڵ نایبڕێت، كە لە نێوان ئەو هەموو ئایەتە بە دوای یەكەدا، كە باسی خراپەی بتەكان دەكات لە سورەتی نەجم دا، ئایەتێك بێت دژی ئەوان بێت.

لە چیرۆكی غەرانیقدا زۆر كەس لە مێژوونووسانی كۆن، تەنانەت لە موفەسیرەكان و سیرە نووسان كەوتوونەتە هەڵەوە، باسێكی وردە، دەستچێنێكی شارەزایانەو فێڵاویە، تەنانەت هەندێ لە زانا سادە موسوڵمانەكانیشی خەڵەتاندوەو بێ بیركردنەوە خراپیان لێكداوەتەوە، ئەمە یەكەم خاڵ نییە كە نووسەرانی ئیسلامیی بە هەڵەدا بردووەو، دوژمنانی هێناوەتە قسەو دڵخۆشكردن، هەندێ تەفسیرنووس و سیرەنووس و مێژوونووس، لە باسەكەی داود پێغەمبەرو، ڕووداوەكەی یوسف و بەلقیس و، مەریەم و عیسا و زۆری تردا، هەتا دوا پلە كەوتوونەتە هەڵەوە.

دروستكردنی چیرۆكی غەرانیق، لێكدانەوەی خراپ و هەڵەبوو بۆ ئایەتەكانی (وان كادو ليفتنونك) و (الا اذا تمنيا ألقي الشيطان في امنيتة) (وَلَوْلاَ أن ثَبَّتْنَاكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْئاً قَلِيلاً) (الإسراء : ٧٤ )، نازانم موفەسیرو سیرە نووسەكانمان چۆن بڕوادارێك بوون هاتوون ئەم ئایەتانەیان بە هەڵە لێكداوەتەوە، نووسەرانی وەك ئیبن ئیسحاق و تەبەری و ئیبن سەعد، هەرچەند من بڕوا ناكەم ئەو زانایانە هەڵەی وایان لێوەدەركەوتبێت، ڕەنگە لە قۆناغێكدا ئەو ڕستانە بۆ كتێبەكانیان زیاد كرابێت، هەندێ نووسەری سادە كە ئەم ئایەتانەیان بینیوەو ئەو چیرۆكەشیان بیستووە، وتویانە تەواوەو ڕەنگە ئەو ڕوداوو چیرۆكە ڕاست بێت، وتویانە ڕەنگە

ئەو ئایەتانە بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەو باسانە هاتبێت.؟ ئەوان وتویانە ئەوەتە خوا دەفەرموویت: (ولولا ان ثبتناك ) واتە ئەگەر ئێمە فریات نەکەوتینایەو خۆگرو دامەزراومان نەکردیتایە، خەریك بوو پێیان بخەڵەتێیت، (وان کادوا لیفتنونك ) واتە زۆر خەریك بوو بتخەڵەتێنن، یان هەندێ لە مێژوونووسان وتویانە شتەکە روویداوە، هەروەکو کە خوا بۆ یوسف دەفەرموویت (وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِ وَهَمَّ بِهَا لَوْلا أن رَّأى بُرْهَانَ رَبِّهِ كَذَلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ وَالْفَحْشَاءَ) (یوسف : ٢٤ ) یان (وَظَنَّ دَاوُودُ أَنَّمَا فَتَنَّاهُ فَاسْتَغْفَرَ رَبَّهُ) (صد : ٢٤ ) یان (وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَى فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ إِنَّ الَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ) (سوره تی صد : ٢٦ ) مەبەست لەمانە ئەوە نیە کە یوسف لە گەڵ زولەیخا و، داود لە گەڵ ئەوی تر شتێکی نەشیاویان کردبێت، کە لە گەڵ ئاستی پێغەمبەرایەتیدا پێك نەیەتەوە، نەخێر هەرگیز ئەوان خراپەو حەرامێکیان نەکردوە، پێغەمبەران دەستی خوایان لە گەڵ بووە، گەر بتەوێ شت شیبکەیتەوەو لێکیبدەیتەوە، ئەوا بۆ هەر برگەیەك و بۆ هەڵوێستی هەرکەسێك، دەیان گریمانەو بۆچوونت بۆ دێت، دەتوانی تۆماریان بکەیت، بەتایبەت ئەگەر بتەوێ لێکۆڵینەوە لە سەر بەرامبەرەکەت و دژەکەت بکەیت، لەو دوو ئایەتەدا لێکدانەوەی زۆر هەیە، گەر کەسێکی دڵکرمن بۆ شکاندن لێکیبداتەوە.! بەڵام کەسێك پلە و پایەی پێغەمبەران و عیسمەت و پەیوەندیی خواو جوبرەئیل و نێرراوان بزانێ، بەو جۆرە شتەکان لێکناداتەوە، هەر لە روانگەی ئەو دوو ئایەتەوە، ئیبن سعد وئیبن ئیسحاق و تەبەری ئەگەر دروست بێت، دەڵێین کەوتوونەتە هەڵەوە و، خراپیان کردوە، خۆزگە ئەو جۆرە ئەمینداریەیان نەکردایە، ئەوان زانا بوون، حەلاڵ و حەرامی زۆریان نووسیوە، دەیان بەرگیان لەسەر شەرع و تەفسیرو سیرە هەیە، دەبوو هەر پوختەکانیان بنووسیایە، ئەوان هەر بۆ زۆر نووسین ئەو ڕستانەیان تۆمارکردوە، چونکە لەو سەردەمەدا نووسەران شانازیان بەسەر یەکدا دەکردوە بەلاپەڕەی زۆرو بەرگی قەرەباڵغ، لەلایەکی ترەوە وەك لەبەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا باسم کرد، تەبەری و ئیبن ئیسحاق و ئەوانی تر دەڵێن ئێمە شت پاك ناکەینەوەو کاتی ئەوەمان نیە، ئێمە بە ئەمانەت هەرچیمان

بیستووه بۆتانی دەگێڕینەوە و دەینووسینەوە، پاشان خۆتان به دواداچوون و پاك لەمەی شتەکان بکەن، بەتایبەت تەبەری لە پێشەکیەکەیدا زۆر ڕونتر باس لەوە دەکات، دەڵێ مەرج نیە ئەمەی من نووسیومە ڕاست و دروست بێت، من هەر کاری کۆکردنەوەم کردووە، نەمهێشتوە هیچ بفەوتێ، وەك ئەمین بۆم گواستونەتەوە، هەرچی لە گەڵ شەرعدا نەگونجا لایبەرن. ! ئەو مێژوونووسانە چیرۆکەکەیان بە جۆرێك هێناوە، کە کەسی نەزان و سادە، یان ڕۆژهەڵاتناسان و دکتۆر جەمالەکانی دڵ پڕ گومان، کە ئەو چیرۆکە دەخوێننەوە دەڵێن سەد لە سەد ڕاستە، وەك وتم ئەوەش هەیە، ڕەنگە ئەو دێڕانە بۆ نووسینەکانی ئەوان زیاد کرابێت، چونکە زۆربەی دەست نووسەکانی وڵاتانی ئیسلامی، برانە مۆزەخانەکانی ئەوروپاو، ئەوە سەد ساڵێکە بۆمان گەڕاوەتەوە، ئەوان وا لەوێ تەزویرو فرت و فێڵیان لە پەیکەری مرۆڤی کۆندا کردوە، هەتا دژی قورئان بڵێن مرۆڤ خوا دروستی نەکردوە، بەڵکو بەتەتەور لە مەیمونەوە قۆناغ بە قۆناغ هاتە ئەم ئاستەی ئێستە.

مێژوو نووسان ڕوداوێك دەگێڕنەوە، دەبێت ئەو ڕوداوە هۆیەکی هەبێت، هەریەکەیان جۆرە هۆیەکی باس کردوە: (سێ مانگ بوو موسڵمانە کۆچەرەکان لە حەبەشە جێگیر بوون، لەو ماوەیەدا عومەرو حەمزە لە مەککە موسڵمان بوون، ئەوە بووە هۆی بەرزکردنەوەی ورەی موسڵمانەکان و شکستی قورەیشیەکان، بە تایبەت موسڵمانبوونی عومەر بارێکی نوێی هێنایە کایەوە، موسوڵمانەکان کەمێك سەریان بەرزکردەوەو ورەیەکیان بەبەردا هاتەوە، کە کۆچەریەکانی حەبەشە ئەو هەواڵەیان بیست، بە تایبەت کە قورەیشیەکان وازیان لە ئازاردانی موسڵمانانی مەککە هێناوە، لەگێڕانەوەیەکدا دەڵێ: زۆریان ئەوەیان بە هەل زانی و گەڕانەوە ! ! بەڵام گێڕانەوەیەکی تر دەڵێ: هەموویان گەڕانەوە بۆ مەککە، کە گەشتنە ناو مەککە ! ! قورەیش دووبارە گەڕانەوە بۆ ئازاردانی موسڵمانان بە تونتر لە پێشوو، ناچار هەندێکیان دووبارە گەڕانەوە بۆ حەبشە و، هەندێکی تریان لەگەڵ خۆیان برد، بەڵام هەندێکیان نەچوونەوە بۆ حەبەشە، چوونە پاڵ کەسی خزم و

ناسراویان، ئەوانیش پەنایان دان، ئەمە سیاسەتێکی ئەو کاتە بوو کە لە شاری مەککە پەیرەو دەکرا).

مێژوونووسان دەڵێن چی وایکرد لە موسڵمانەکانی حەبەشە، کە دوای سێ مانگ لە پەناهەندەیی بگەڕێنەوە مەککە ..؟ لێرەدا بوو هەندێك نوسەر چیرۆکی غەرانیقیان دروستکرد و، هۆیەکەیان بۆ ئەوە گێڕایەوە، هەندێك دەڵێن موسڵمانبوونی عومەرو حەمزە ترسی خستە دڵی بتپەرستەکان و ماوەیەك وازیان لە ئازاردانی خواپەرستان هێنا، ئەم هەواڵە گەیشتە حەبەشەو وایکرد ژمارەیەکیان بگەڕێنەوە، هەندێکی تر دەڵێن لە حەبەشە هەندێ لە زانا گاورەکان و سەرکردە سوپاییەکان داوایان لە نەجاشی کرد کە واز لەو موسڵمانانە بهێنێ و پەنایان نەدات، چونکە خەریك بوو ئاژاوەی ناوخۆ دژی نەجاشی سەری هەڵدەدا، هەندێکی تر دەڵێن پەنادانی موسڵمانەکان حکومەتی رۆمی زویرکردبوو، داوایکرد نەجاش لابرێ، پاشای نوێ داوایکرد لە موسڵمانەکان ولاتی حەبەشە چۆڵ بکەن، هەیە دەڵێ نەجاشی موسڵمان بووبوو، زانا گاورەکان و سەرکردە سوپاییەکان، شۆرشێکیان دژی نەجاشی کردوو، مۆڵەتی موسڵمانەکانیاندا برۆنەوە، ئەم بۆچوونانە راستیی رووداوەکەیە.

هەندێك دەڵێن هۆی گەرانەوەکە گرنگە، ئەوەش بۆ ئەوە دەگێرنەوە کە موحەممەد زانی قورەیش لێی دورکەوتوونەتەوە و، وازیان لە ئەزیەت و ئازاری هاورێکانی هێناوە، گوایە پێغەمبەر فەرموویەتی خۆزگە هەتا ماوەیەك ئایەتم بۆ نەدەهات و، ئەمانەم لێدور نەدەکەوتەوە، پاشان لە خزمان نێزیکتر بوویەوەو ئەوانیش لێی نێزیکبوونەوە و گوێیان لێدەگرت، قورەیشیەکان پێیان وتبوو: (گەر هەندێکیشی بە خواکانی (بتەکان)ی ئێمە بدەیت ئەوا لەگەڵتدا دەبین)، رۆژێك پێغەمبەر لە یانەی دارنەدوە دانیشتبوو لە نزیك کەعبەو سورەتی (نەجم) ی بۆ دەخوێندنەوە هەتا گەیشتە ئایەتی (أَفَرَأَيْتُمُ اللَّاتَ وَالْعُزَّى * وَمَنَاةَ الثَّالِثَةَ الْأُخْرَى) (النجم: ١٩،٢٠) دوایی شتێکی تێهەڵکێشایە ناو ئایەتەکان کە گوایە وتویەتی (تلك الغرانيق العلا، وان شفاعتهن لترتجى)، واتە ( ئایا نەتان دیوە بتی لات و عوزاو

سێهەمیشـیان بتـی مـەنات) ئەوانـە غـەرانیق و باڵنـدەی عـەنقای بڵنـدو بـەرزن و شەفاعەتی ئەوانیش قبوڵـەو لای خـوا وەرگـیراوە. ! پاشـان بـەردەوام بـوو لەسـەر تەواوکردنی سورەتی نەجم هەتا گەیشتە ئایەتی (٦٢) کـە دەفـەرموویت (فَاسْجُدُوا لِلّهِ وَاعْبُدُوا) ئینجا سوجدەی تێدا دەبرد، ئەوانەش کە لە وێدابوون لە ئیماندارو بـێ بڕوا هەموویان سوجدەیان برد، پاشان قورەیشیەکان ڕەزامەندییان نیشاندا لەسـەر ئەوەی کە پێغەمبەر خوێندی و وتیان: کەواتە بتەکانمان لای خوا شـەفاعەتمان بـۆ دەکەن و ئەوانیش هەن و شتیان بە دەستە، وتیان: ئەگـەر موحەممـەد بەشـێك بـۆ ئێمە و بتەکانمان دابنێ و بەشدارییمان پێبکات، ئێمەش لەگەڵیدا دەبین، گوایە بەو جۆرە جیاوازیی لە نێوان موحەممەدو قورەیش و خواپەرست و بتپەرستدا نـەماو، هەموو لە بەردەم خوادا وەك یەکن، ئیتر گوایە ناکۆکیی لەبیرچوویەوەو هـەموویان تێکەڵ بـوون، ئـەم هەواڵـە گەیشـتە خـاکی حەبەشـە، کۆچـەرییەکان لـە حەبەشـە وتیـان: خـزم و هـاو هۆزیـەکانمان خۆشەویسـترە، لـەم غەریبایەتیـە چـیبکەین. ؟ بابچینەوە بۆ لایان، هەر بۆیـە گەڕانـەوە بـەرەو مەککـە، سـەعاتە ڕێیـەکیان مـابوو بگەنە ناوشار، کاروانێکی هۆزی کەنانـەیان پێگەیشـت و پرسـیاری دەنـگ و باسـی ناوشاریان لێپرسین، ئـەوانیش باسـی خـوای موسـڵمانانیان بـە باشـە کـرد، کەچـی زۆری نەبرد کە ئەمان بەڕێوەبوون، بیسـتیان قـورەیش کەوتونەتـەوە جنێـودان بـە موسـڵمانان و خواکـەیان و لـە نـاو مەککـەدا شـەڕو سـزا دەسـتی پێکردوەتـەوە، کۆچبەران پەشیمان بوون لە هاتنەوەیان، بەڵام تازە لە مەککـە نێزیکبوونەتـەوە و بیری کەسوکاریان لە دەرونیانـدا دەکـوڵا، حەبەشـە دووربـوو، چـوونە نـاو مەککـە، لەوێ بیستیان کە گوایە موحەممەد پەشیمان بووەتەوە لەو ڕستەیەی بـۆ قورئـانی زیاد کردبوو، پـەشیمان بوەتـەوە لەوەی کە ناوی بتەکانی قورەیشی بە باشەو چاکە هێنـاوە، موحەممـەد چـووەتەوە ماڵـەوەو تـا ئێـوارە نەهاتوەتـەوە دەرەوە، جوبرەئیـل هـاتوە بـۆ لای و سـورەتی (نـەجم)ی بـۆ خوێندوەتـەوە، جوبرەئیـل وتویەتی: ئەوە دەڵێی ئەو دوو وشەیەت بۆ زیادکردووە.. ؟ مەبەستی (تلك الغرانيـق العلي، وان شفاعتهن لترتجي)، موحەممەد وتویەتی: (شـتێکم بـە دەمـی خـواوە وت

که بۆی نەناردبووم)، پاشان گوایە بۆ وەڵامی ئەو هەڵە زارەکیە خـوا ئـەم ئایەتـەی بۆنارد (وَإِن كَادُواْ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ الَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ لِتفْتَرِيَ عَلَيْنَـا غَيْـرَهُ وَإِذاً لاَّتَّخَـذُوكَ خَلِيلاً * وَلَوْلاَ أَن ثَبَّتْنَـاكَ لَقَدْ كِدتَّ تَـرْكَنُ إِلَـيْهِمْ شَـيْئاً قَلِـيلاً * إِذاً لَّأَذَقْنَـاكَ ضِـعْفَ الْحَيَاةِ وَضِعْفَ الْمَمَاتِ ثُمَّ لاَ تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِـيراً) (الإسـرا ء :٣١ ـ ٧٥ ) ئـیتر دوای ئەوە ئەکەوێتە رەخنەگرتن لە بتەکان و ئەو عەقڵیەتەی بڕوای بە شتی وا هەیە، کە قورەیش ئەوەی بیست کەوتەوە ئازاردانی موسڵمانەکان.

ئـەم چـیرۆکە هەڵـە ئـامێزە لـە هەنـدێك لـە مێـژوو سـیرەکاندا هەیـە، هەنـدێك تەفسـیریش گواسـتویانەتەوەو ئایەتـەکانیان پـێ ڕێـك خسـتووە، پاشـانیش رۆژهەڵاتناسان لەسەری وەستاون، ئەم چیرۆکە بە ئاشکرا دیارە کە هەڵبەستراوە، پێویست دەکات زۆر لەسەری بووەستین و ئایەتەکانی لێك بدەینـەوە، ئەگـەر ئـەم چیرۆکە راست بێت، ئەوە دەردەخات کە پێغەمبـەران مەعسـوم نـەبوون، جگـە لـە وتەی خوا، وتەی خۆشـیان تێکـەڵ وتـەی خـوا کـردوە، کەواتـە نابێـت بڵـێین نامـە ئاسمانیـەکان و ئاینـە ئاسمانیـەکان، بـەڵکو تێکەڵەیـەکن لـە ئاسمـانی و زەمینـی، کەواتە پێغەمبـەران دەستێوەردانیان لـە بنـەمای ئـاین و گەیانـدنی ئایینەکەیانـدا کردوە، بەڵکو ئارەزووکاریی‌و بەرژەوەندیی خۆیانیان تێدا بەکاربردووە، یان خۆیان بە کەیفی خۆیان کەم و زیادیان بۆکردووە، نازانم ئەو مێژوونووس و زانا ئیسلامیانە چۆن ئەو هەڵانەیان بە سەردا گوزەری کردووە، هەر بۆیە من گومانم وایە ئـەوان بـە خراپە ئەو چیرۆکانەیان باس نەکردوە، ئەوان باسـەکانی مێـژوویان کۆکردوەتـەوە، ویستویانە ئەو جەنگە دەرونیانە کە بەرامبـەر پێغەمبـەر کـراوە، ئـەو هەڵبەسـتن و دەستچێنانەی کە لە مێژوودا کراوە، نەیان هێشتوە بفـەوتێت، تـەنها بـە مەبەسـتی نەفەوتان، ئەوەش ئەمانەت پارێزیە لە نووسیندا.! وا نیە کە ئەو ڕوداوە ڕاسـتبێت و ئـەوان بڕوایـان پێیـی هـەبێت.! ئـیبن ئیسـحاق کاتێـك لێیـان پرسـی لـە بـارەی چـیرۆکی غەرانیقــەوە، بــە بــێ دوودڵیــی و بــە ڕاشــکاویی وتــی: ئــەوە لــە دروستکراوەکانی زەنادقەیە، بەڵام ئەوانەی کە دەیانەوێ بیخەنە سەر موحەممـەد، دەچن سەنەدە ئایەتەکانی بۆ دێنن بە تایبەت (وَإِن كَادُواْ لَيَفْتِنُونَكَ..) هەتا ئایـەتی

(وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّا إِذَا تَمَنَّى أَلْقَى الشَّيْطَانُ فِي أُمْنِيَّتِهِ فَيَنسَخُ اللَّهُ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ ثُمَّ يُحْكِمُ اللَّهُ آيَاتِهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ) * (لِيَجْعَلَ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ فِتْنَةً لِّلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَالْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمْ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ لَفِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ) (الحج : ٥٢، ٥٣ )[١]، زۆریان وشەی (تمنی)ەیان بە وشەی (قرأ) مانا کردوە، هەندێکی تریان بە مانای (ئەگەر ئاواتێکی بوبێت) تەفسیر کردوە[٢]، ئەوەتە ئیبن ئیسحاق ئاوا وەڵام دەداتەوە، ئەو بڕوای بەو ڕوداوە نیە، بەڵکو تەنها دەیگێڕێتەوە کە ئەو فیتنەیەشیان بۆ محەممەد دروستکردبوو، بەڵام ڕۆژهەڵاتناسان تەنها دوای گێڕانەوەکەی کەوتوون، نەك دوای ڕەدەکەی ئیبن ئیسحاق، ئەوان هەر ئیشیان بەو گێڕانەوە هەیە، نووسیویانە کە گوایە پێغەمبەر و هاوڕێکانی ئەوەندە ئەزیەت و ئازاردراون، هەتا گەشتونەتە ئەوەی لێیان بکوژرێ، سکیان بدڕێ و منداڵیان لە باریبرێ و فڕێ بدرێنە بیابان و لەبەر خۆرەتاوی گەرمی هاوین ڕابخرێن و بەردی گەرم بخرێتە سەر پشتیان، داخیان کردون و برژاندونیان، ئەمانە وای لە پێغەمبەر کرد کە مۆڵەتیان بدات بۆ کۆچکردن بۆ حەبەشە، هەر بەوەوە نەوەستان، بەڵکو گەمارۆی ئابووریيان خرایە سەرو ژنیان نەدانێ و لێیان نەدەخواستن و نەیان دەدواندن، بەڵام ئەوان تا دەهات سوورتر دەبوون لەسەر باوەڕەکەیان، نەك وەك چیرۆکی دروستکراوی غەرانیق، لە هەندێ بڕوای خۆیان پەشیمان ببنەوەو بەشی بتەکانیش بدەن لە دەسەڵات و شەفاعەتدا. بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە وتەی هەندێ لە نوسەران دەهێنم:

زانای ناوداری هیندی، مەولانا موحەممەد عەلی دەڵێ: ئەم گێڕانەوەیە لە ناو نووسراوەکانی واقیدی و تەبەریيدا هاتووە و هیچ سێبەرێکی ڕاستی تیانییە، چونکە هەموو هەوڵ و ژیانی پێغەمبەر تا مردنی، دژایەتی بتەکان و ئەو باسانە بووە، واقیدی بەناوبانگە بە وتەو گێڕانەوەی دروستکراو و ئیسرائیلیات، تەبەرییش

---

[١] حياة محمد. محمد حسن هيكل، ص١٦٢.

[٢] السيرة النبوية، ابن اسحاق، ط١، ج١ ص١٤٨، ١٤٨، مصر

دەڵێ: من تاوانبار مەکەن لە گێڕانەوەی چیرۆکەکاندا، چونکە من هەرچیم بیستبێ، بۆم نووسیون و کۆم کردوەتـەوە، هـەتا نەفـەوتێ و خۆتـان قسـەی لەسـەر بکـەن، هیچم لەبیر نەکردووە، هەموو شتم بۆ گواستوونەتەوە، لە فەوتان رزگـارم کـردووە، ئـەوە مەنهـەجێکی پێشـکەوتوە کـە زانایـەکی بـەرزی وەك تەبـەری نـاهێڵێ هـیچ برگەیەك لە مێژووی ئیسلامدا بفەوتێ هەمووی کۆدەکاتەوەو لـە بـەردەم لێکۆڵـەردا مـۆڵی دەکـات، ئـەوان نـەهاتون مەنهـەجێکی تـەحلیلی بـەکار بهێـنن وەك چـۆن فەرمووده دەکیشن، مێژوو، چیرۆك و گێڕانەوەیە، تەبەری و ئیبن ئیسحاق و ئەوانی تـر چـیرۆکەکانیان بـۆ کۆکردوینەتـەوە، کـاریکی مـەزنیان کـردوە، مەنهـەجی هەڵسەنگاندنی فـەرموده بـۆ مێـژوو ناشـێت، زەرەری زۆری لێدەکـەین، ئەوسا تـۆ هەموو مێـژوو فرێـدەدەیت و هیچـت بـۆ نامێنێتـەوە، دەبێـت مێـژوو بـە مەنهـەجی بابەتی مامەڵەی لە گەڵ بکرێت.

محمد کوڕی عومەری واقدی لە ساڵی ( ١٣٠) کۆچی دا لـە شـاری ( مدینـە ) لـە دایك بوە [1] . بەڵام رۆژبەیانی بە هەڵە دەڵێ لـە شـاری ( مەککـە ) لـە دایك بـوە [2] . سەرەتا خـەریکی بازرگانی گەنم بـوە، وەك خـۆی دەیگێڕێتـەوە : لـە مدینـە گـەنمم دەفرۆشت، سەد هەزار درهەمی خەڵکم هێنـا بـوو بـۆ گـەنم، بـەڵام لـە وەجبەیەکـدا هەمویم لە دەست چوو، روم لە عێراق کرد [4] . لە کارێکدا کە لە سـەفەرێکی حـەجی هارونە رەشیدا بۆی کرد، ( دە ) هەزار درهەمی بەخشش دایە، ئـەویش قـەرزەکانی لێ دایەوە و لە چەند حسابێکی تردا گوزەرانی ژیایەوە، لە چـەند چالاکی و هـەڵس وکەوتێکـدا دەرکـەوت کرایـە قـازی بەشـی رۆژهـەڵاتی بغـداد .. هـەر لـەوێش لـە سەردەمی مەئموندا مرد، مردنەکەی رێکەوتی ( ٢٠٧ )ی کۆچی بوو [6] .

[1] فتوح سواد العراق: واقدی ، وەر طێر بۆ فارسی، ملا عبدالعزیز واعظی لا ٧٧

[2] ولآتطیری رەشەخاکی عیراق: مەلا جمیل رۆذبەیانی ، ل١ ، سلیمانی ١٩٧٧ .

[4] تأریخ بغداد: احمد بن علی خطیب بغدادی ، ج٣ص٤ ، قاهرة ، مطبعة السعادة .

[6] فتوح سواد العراق: واقدی ، ص٩٧ .

واقدی خاوەنی زیاتر لە ( ٥٣ ) بەرهـەمی گەورەیـە . لـە حـەدیس و تەفسـیر و ئەدەب و فقه و سیره و فتوحات و مغـازی دا بەرهـەمی هەیـە ..خـەتیبی بەغـدادی دەڵێ : کە واقدی لە بەشی رۆژهەڵات باری کرد بۆ بەشی رۆژئاوا، کتێبەکانی (١٢٠) بار بوو[١] . یان دەڵێن واقدی (٦٠٠) سندوق کتێبـی هـەبوە، لـەو هـەموەی دا تـەنها کەمێکی بە دەستی ئێمە گەیشتوە، کـە ئـەویش بـە زۆری فتوحـات و غەزەواتـە .. وەکو ( فتح منف والاسكندريه ) ( الفتوحـات ) ( فتح ارمينيه ) ( بلاد مـابين النهـرين ) ( فتوح الاسلام ) ( فتـوح الاسـلام لـبلاد العجـم و خراسـان ) ( فتـوح افريقيـه ) ( فتوح الامصار ) ( فتوح البهنساو ) ( فتوح الجزيره ) ( فتوح سواد العراق ) ( فتـوح الشام ) ( فتوح العراق ) و زۆری تر ..

مێژوونوسان و لێکۆڵەرەوان دەڵێن، دوای تەحقیق و بەدواداچون دەرکەوتوە کە ئەم کتێبانە هیچی هی خۆی نیە. بەڵکو بە ناوی خۆیـەوە بـڵاوی کردوەتـەوە. یـان خەڵکانی تر بە ناوی ئەوەوە بڵاویان کردوەتەوە، باسـەکان، نـاوەرۆکی کتێبـەکان، گوماناوین و هەڵەی زۆریان تێدایە، ( فتوح الشام )ەکەی واقدیم خوێنـدەوە، چـاپی ( ١٩٥٤ )ە، بـە دوای هەنـدێ روداوی دا چـووم، لـە روداوە مێژووییەکانـدا، لـە ساڵەکاندا، لە بەشداری فەرماندەکاندا هەڵەی زۆر زۆری تیایـە، کتێبێکـی هەیـە کـە (٣٠ ) هـەزار حدیسـی تیایـە .. هـیچ کـام لەوانـەی فـەرموودەیان کۆکردوەتـەوە، دانەیەکیان لێ وەرنەگرتوە، جگە ( ابـن ماجـە ). زۆر بـە خـراپ وەسـفیان کـردوەو تاوانباریان کـردوە .. بـە هـەمان شـێوە لـە فتوحـات و مغازیەکانیـدا قسـەی زۆری لەسەرە:

ژان سواژە دەڵێ: گێرانەوەی زۆر لە بارەی فتوحاتەکانەوە کە بەناوی واقدیەوە بڵاو کراونەتـەوە، هەڵبەسراوە، بەڵکو ئەو نوسراوانە هی دوای واقیدین[٣] .

فوئـاد سـزگین دەڵـێ : هەنـدێ لـە روداوە گێـڕراوە مێژوییـەکان، کـە بـە نـاوی واقدییەوەیە، جگە لەوانەش کە نوسخە دەست نووسەکانیان هەتا ئێستـەش مـاون

---

[١] تأريخ بغداد: ج٣ص٥ .

[٣] مدخل تأريخ شرق اسلامی: ذان سواذة ، ص٢١٠ ، ترجمة وتحقيق نوش افرين انصاري .

و لەبەر دەستان، یان هەندێ لەوانە بە ناوی واقدیەوە چاپ کراوە، ئەوانە لە ڕۆژگاری دواتردا نووسراون [1]. واتە دوای واقدی نووسراون ..

ئەحمەد کوڕی علی نەجاشی دەڵێ : ( هەموو کتێبەکانی واقدی، نووسراوی ابراهیم کوڕی محمد کوڕی یەحیایە و، واقدی بە ناوی خۆیەوە نقلی کردوە.) [2]

شێخ توسی دەڵێ : ( ان الواقدی سرق مصنفاً لابراهیم بن محمد بن یحی بن اسحاق المدنی المتوفى سنه ١٨٤هجری ..) هەمان قسە لە (الرجال، ص١٢،نجاشی) دا هاتوە، وە لە ( فهرست کتب الشیعه و أسماو المصنفین، ص٣)دا هەمان وتە چەند بارە دەکاتەوە [3].

ئەوە لە لایەك، لە لایەکی ترەوە، ئەوانەی فەرمودەیان کۆکردۆتەوە و، لە زانستەکانی فەرمودەدا شارەزاییان هەیە، گلەیی زۆر لە واقدی دەکەن، کە بەبێ سەرچاوە، ئەو هەموو فەرمودانەی کۆکردۆتەوە بێ ئەوەی ناوی زنجیرەی گێڕانەوەکانی هێنا بێ.

دەستەیەکی تر لە زانایانی فەرمودە، واقدیان بە ( زەعیف ) وەسف کردوە و، بە ( مجروح ) ناویان بردوە، بە قسەی ( زەهەبی ) کە دەڵێ:( واستقر الاجماع على وهن الواقدی) [4] واتە هەمویان واقدیان بە سست باس کردوە لە زانستی فەرمودەدا، واقدیان لەوانەدا ژمارە کردوە کە فەرمودەی لاوازیان گێڕاوەتەوە وەکو:

ئیمامی بوخاری دەڵێ : محمد کوڕی عومەری واقیدی قازی بغداد (متروك الحدیس) ساڵی ٢٠٩ مرد. [5] تێبینی بکە بخاری بە ( متروك الحدیس ) ناوی بردوە.

---

[1] تاريخ التراث العربی، فؤاد سنزطين، ص٢٤٩

[2] كتاب الرجال: احمد بن علي النجاش ، ص٣٧٢ ، تهران - مركز نشر كتاب ، ( بی تا )

[3] فتوح سواد العراق: بروايت محمد بن عمر واقدی ، ترجمة وتحشية: الاستاذ عبدالعزيز واعظی سردشتی ، ص٨٦ ، مقدمة و تصحيح و تعليقات: نادر كريميان - تهران ١٣٧٤ ئيرانی .

[4] ميزان الاعتدال، ج ٢ص١١٠

[5] المجموع في الضعفاء والمتروكين: الامام البخاري ، ص٤٨٤ .

یاقوتی حەمەوی لە ئیمامی بخاریەوە هێناویەتی بەم دەربڕینە ( سکتوا عنـه )[1]
واتە شارەزایانی فەرمودە کە پرسیاریان لێ کراوە لـە بـارەی واقیدیـەوە، بـێدەنگ بون و سقەیان نەداوەتێ ..

ئیمامی نەسائی لە کتێبی (زەعیف والمتروك) دا لە بارەی واقدیـەوە وتویـەتی : محمـد کـوڕی عومــەری واقـدی (مـتروك الحـدیس)ە[16].( المجمـوع مـن الضـعفاء والمتروکین، نسائی)

ئیبن عیمـاد لـە نەسـائیەوە دەگێڕێتـەوە (نەسـائی دەڵـێ : واقـدی فـەرمودەی دروست کردوە )[2]

دار قوتنی لە هەمان سەرچاوەدا دەڵێ : (ئاسەواری لاواز لەو فەرمودانەدا دیارە کە واقدی هێناویەتی)

ئیبن ناصرالدین دەڵێ : ئیمامەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە هـیچ لـە حدیسـەکانی واقدی وەرنەگرن، جگە (ابن ماجه)، (امام زەهەبی) لە (شەزەرات) دا هـەمان قسـە دەکات .

(ئبن عدی) و (یاقوتی حمـوی) و (ئـبن راهویـه) و (دارقـوتنی) و (ئـبن معـین) و (ئەبی حاتەم) و (نسائی)، هەر هەموویان فەرمودەکان کە واقدی ریوایەتی کـردون، بە ( زەعیف ) دایان ناوە ..

خاوەنی (معجم المتبوعات ج٢ ص١٩٠٧) لە قسەی زانایـانی حدیسـەوە دەڵـێ : (وقیل فیه هو کذاب لیس بثقه ولا یکتب حدیثه..)[3]

ئەگەر بچینە سەر بابەتەکانی تـری، وەکـو سـیرە و تفسـیر و ئـەحکام و فقهـو ئەوانی تر، ئەوەندەی تر قسەی لەسەر هەیە .. جا کەسێك زانایـان لێی رازی نـەبن و، سقەیان پـێی نەبێ، یان کەسێك ئەو هەموو فەرمودەیەی گواستبێتەوە، بەبێ لێ

---

[1] معجم الادباء، یاقوت الحموی، ج١٨ ص ٢٢٨
[2] شدرات الدهب، ج١ ص١٨
[3] فتوح سواد العراق، لا٩٠ تصحیح استاد نادر کریمیان

وردبونــەوەو تحقیـق کـردن، دەبـێ چـی کردبێـت لـەناو روداوەکـانی مێـژودا، ژیـان نامەکانی چۆن نوسـیبێتەوە، ئەگـەر ئـەو نەترسـا لـە فەرمودەکـەی کـە پێغەمبـەر دەفەرموێت : (لا تكذبوا عليَّ، فأنه من كذب علـى فلـيج نـار) یـان دەفـەرموێ (مـن تعمد عليَّ كذباً فليتبؤ مقعده من النار)[1] ئەمـە لـە لایـەك .. جگـە لـەوە دوو رای تـر هەیە لە خاڵەکانی سەرەوەدا دیارن :

یـان ئەوەیـە واقـدی ئـەو هـەموو دەسـت نوسـانەی هـی کەسـانی تـر کـە کـۆی کردونەتەوە، بە ناوی خۆیەوە بڵاوی کردونەتەوە ..

یان ئەوەیە کە ئـەم بڵاوکـراوە پـڕ حەشـوەو گومـاناویانـە، دەسـتێکی رەش بـە ناوی واقدیەوە بڵاوی کردونەتەوەو، بۆ مەبەسـتێکی خـراپ خسـتونیەتە پـاڵ نـاوی ئەو بۆ ئەوەی لە پاڵ ئەودا، کە خوێندەوار و خـاوەن کتێبخانەیـەکی گـەورەی نـاو شاری بغدادە، بیان شارێتەوە .. من بۆ ئەمەی دواییان دەچم ..

ئەوەی لێرەدا مەبەستە بیڵێین ئەوەیە :

یەکـەم : بـە دوای ئـەو مغـازی و فتوحاتانـەدا بچـین کـە بـەناوی واقدیـەوە بڵاوکراوەتەوە بزانین هەتا چەندە راستیان تیا دیارە ..!!

دووەم : بزانرێ لە کوێوە ئـەو باسـە گومانیاویانـە خراوەتـە نـاو بەرهەمـەکانی واقدیەوەو کێ کردوونی و، بە چ مەبەستێك کراوە ..!!

لە کتێبی (کوردوستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا) باس لەوە کرا کە هـاتنی سوپای ئیسلام بۆ کوردستان، جگە چەند شەڕێکی کەم کە سوپای فارسی گێڕایـان بە سوپای ئیسلام، نەك کورد، هیچـی وا روی نـەداوە .. شـایەتیش بـۆ ئـەوە، ئـەو هەموو سەرچاوانەیە، کە روداوەکانی لێوە هەڵ گۆزیون، وە هەموویان لەسـەر یـەك ئاستی راسـتی دەڕۆن و یـەك بـاس دەگێڕنـەوە و زۆر لانـادەن .. لـەناو هەمویانـدا تەنها ( واقدی ) باسی کۆمـەڵێك شـەڕی خوێنـاوی نێـوان سـوپای کـورد و سـوپای ئیسـلامی گێڕاوەتـەوە، جـێی سـەیرە و هـەقی تێڕامانـە، بۆچـی تەبـەری و ئـیبن

[1] فتح الباري، رواة البخاري، رقم ١١٠ ج ١ ص ٢٤٤

کەسیر و ئیبن ئەسیر و ئیبن خەلدون و ئیبن ئەعسەم و خزری بەگ و ئەوانی تر .. کە کاکڵەی مێژووی ئیسلامیان نووسیوە، ئەو ڕووداوانەیان باس نەکردووە، بەلاّم واقدی بە تاقی تەنیا هێناویەتی .!

ئەوە بە جۆرێ دەسەلمێ، کە لە ڕووداوەکان و، لە ژیانی سەرکردەکان و ڕاستی هاتنیان بۆ کوردستان و کۆن و تازەیی ئەو شارانەی کە ناوی بردون بکۆڵرێتەوە، ئەگەر دەرچوو، ئەوا ڕاستە، ئەگەر دەرنەچوو، ئەوا ڕووداوەکانیش بە درۆ دەکەونەوە، بۆ نمونە واقدی و مەلا ڕۆوف سلیم و زۆری تر، کە لە واقدیان گێڕاوەتەوە دەڵێن قعقاع و عبداللەی کوڕی عومەری کوڕی خەتاب لە جەنگی کوردستاندا کوژراون .. بەلاّم قعقاع بە مردنی خوایی لە دمشق دەمرێ و، عبداللەش بە مردنی خوایی لە شاری مدینە کۆچ دەکات .. بۆ نزیکەی ( ٢٠ ) صحابە ناوا دەکەوێتە هەڵەوە، جگە لە دەیان شتی تر..

واقدی خۆی ئەو پیاوە کەم سقەیە، کە قسەی زاناکانم لەسەر هێنایەوە نەگبەتیەکەی لەوەدایە لە کاسبی گەنم دا ئیفلاسی کرد و شاری مدینەی جێهێشت و گەیشتە بغداد .. لە بغدادیش مرد، دوای خۆی هەرچی کتێبێك بۆ فێڵ یان بۆ بلاّوکردنەوەی شك و گومان لەناو موسوڵماناندا، یان تاوانبارکردنی کەسێك یان میللەتێك بوو بێت، بە ناوی ئەو داماوەوە بلاّویان کردۆتەوەو، جێشی گرتوە، یەکێك لەو دەیان کتێبانە باسی فەتح کردنی کوردستان دەکات لە لایەن سوپای ئیسلامەوە کە پڕیەتی لە بوختان و تاوان و، دروست کردنی حقد و رق و قین لە دڵی کوردا بەرامبەر ئیسلام، جگە لە کوشت و کوشتار و تالاّنی و وەحشی گەری، کە سوپای ئیسلام لە هیچ غەزا و فتوحاتێکی دا، شتی وای نەکردوە، ئەو کتێبەی واقدی ناوی (فتوح سواد العراق)ە، نازانرێ چۆن کەوتوەتە ناو کتێبخانەی بنەماڵەی ( مەلا صەمەدی مەرگەیی ) .. پاشان هەر لەوێ مامۆستایەك بەناوی ( ملا عبدالعزیزی واعیزی سەردەشتی ) ئەو دەست نووسە عەرەبیە وەردەگێڕێتە فارسی، وە کەسێکی کوردی عێراق بەناوی ( مەلا ڕۆوف سلیم حویزی ) ساڵی ١٩٧٠ بلاّویکردەوە بە ناوی ( کوردستان و ئایینی ئیسلام ) چاپ کراوە.

مامۆستا رۆژبەیانی دەڵێ : کە ئەم سیپارەیەم خوێندەوە، بۆم دەرکەوت ئەمە هەر کتێبەکەی فتوح سواد العراقی لای مەلا صەمەدە، مەلا رۆوف کردویەتی بەهی خۆی .. بەراستی لەم کارە سەرم سوڕ نەما، چونکە زۆر کەس بە دزێتی بەرهەمی خەڵك بوون بە خێوی گەواهی نامەی بەرزی ماجستێر و دکتۆرا .. مەولەوی دەڵێ:

بیگری و بیدزی و، کلکی هەڵپاچی

لە دەست خاوەن ماڵ هەرگیز دەرناچێ

(سیر ولیم مویر)ی رۆژهەڵاتناس لە بارەی ئەو گێرانەوەیەوە کە لە کتێبی واقیدی و سیرەوە لەبارەی غەرانیقەوە هاتوە دەڵێ: (هیچ گومان نییە لە ڕاستی چیرۆکی غەرانیق، چونکە ئەو موسڵمانانەی کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، تەنها سێ مانگ بە سەریاندا تێپەری، کە نەجاشی بە چاکی پەنای دابوون، هیچ پاساوێکی تر نەبوو بۆ گەرانەوەیان جگە هەواڵی رێکەوتنی نێوان موحەممەدو قورەیش، ئەو کاتە موحەممەد کەم و لاوازو بێهێزبوون، هاورێکانی زۆر بێتوانا بوون، کە بتوانن خۆیان لە ئازاردانی قورەیش بپارێزن)[1] ، بەم جۆرە رۆژهەڵاتناسان چیرۆکە هەڵبەستراوەکە دەهێننەوەو دەڵێن راستە و موحەممەد تەنازولی لە عەقیدەکەی کردووە، لە بڕیاری خواکەی لایداوە، دەستی خستوەتە قورئان، دکتۆر جەمالیش دێت قسەی ئەم لاوازانە دەهێنێ و بە ناوی خۆیەوە وەك هەنگوینی لە شاخدا دۆزیبێتەوە، دایدەرێژێتەوە، هەڵەی ئەوان دووبارە دەکاتەوە، ئەمە بەڵگەیەکی پتورکاو و نزمە، خۆی ناگرێ لە بەردەم وردکردنەوەدا. ! دکتۆر جەمال دەڵێ: ئیبن ئیسحاق وای وتووە، بەڵام نەخێر ئیبن ئیسحاق تەنها چیرۆکەکە دەگێرێتەوە و دەڵێ: ئەمە قسەی زەندیق و بێبڕواکانن، دکتۆر جەمال هەر چیرۆکەکە دەهێنێ، وەڵام و رەددەکەی ئیبن ئیسحاق ناهێنێ، دیارە رێك لە رۆژهەڵاتناسەکان وەریگرتووە، یان هەر خۆی قرتاندن لە بابەتە وەرگێراوەکان دەکات و کوێی پێ باش بێ ئەوەندەی دەهێنێ و کاری لەسەر دەکات. ولیەم مویر لە جێیەکی تردا دەڵێ: (ئەو موسڵمانانەی لە حەبەشە گەرانەوە، دوو هۆ هەبوو بۆ گەرانەوەیان:

---

[1] حياة محمد. د. محمد حسن الهيكل، لا ٦٣

یەکەم : دوای کۆچکردنیان بە ماوەیەکی کەم، عومەری کوڕی خەتاب موسڵمان بوو، عومەر موسڵمان بوو بەو هێزو کەسایەتییە بەرزو بەغیرەتەی کە پێش ئیسلام شەڕی پێدەکرد، ئەم کە موسڵمان بوو، خۆی نەشاردەوەو نەچووە پەنای کەس کە بیپارێزێ، بەڵکو ڕۆشت، بە ئاشکراو لەبەر چاوی خەڵکی رایگەیاند کە موسڵمان بووە، لە پێناویشیدا شەڕی کرد، ڕازیش نەبوو بە خۆشاردنەوەی موسڵمانەکان و خۆپەنادانیان لە دۆڵی مەککەو نوێژکردن بە دزیی قورەیشەوە، بەڵکو سوور بوو لە تێکۆشان بەرامبەر بە قورەیش، چووە پاڵ کەعبەو نوێژی دابەست و موسڵمانانیش لەگەڵیدا نوێژیان کرد، لەوێدا قورەیش ڕاچڵەکی، بڕوایانکرد کە ئەو ئازارەی موحەممەدو هاوڕێکانی دەی چەژن، خەریکە دەبێتە شۆڕشێکی ناوخۆیی و دەتەقێتەوەو کەس نازانێ چەند دەخایەنێ و لەکوێ دەئاڵێ، لە ناو هەموو خێڵەکانی قورەیشدا، چەند کەسانێك موسڵمان بوون، ئامادەبوون لە کەسوکاری خۆیان بکوژن، ئەگەر لەسەر بتپەرستی نەبێت، ناچاربوون گەڕان بە دوای شێوازێکی تردا بۆ دژایەتیی موحەممەد، هەتا ئەو ئاستەنگەی لێنەکەوێتەوە، قورەیش لەسەر ئەو شێوازە ڕێکەوتن لەگەڵ موسڵمانانداو هودنەیان بەست و کەسیان توشی ئازار نەکران، ئیتر لەوێوە پەیوەندییان کرد بەوانەی کۆچیانکرد بوو بۆ حەبەشە، داوایان لێکردن بیر لە گەڕانەوە بکەنەوە بۆ مەککە.

دووەم: لەوانەیە کۆچەرییەکان دوودڵ بووبن لە گەڕانەوەدا بۆ مەککە، ئەگەر هۆی دووەم نەهاتایەتە پێش، تەواو عەزمیان جەزمکرد بۆ گەڕانەوە، بە تایبەت لەو کاتەدا لە حەبەشە شۆڕشێك دژی نەجاشی هەڵگیرسا بوو، بە هۆی ئەو سۆزەی کە لەگەڵ موسڵمانەکان هەیبوو، دەوروبەرەکەی تۆمەتیان بۆ دروستکرد، چاکترین ئومێدی موسڵمانان ئەوەبوو، کە خوا نەجاشی سەربخات بەسەر دوژمنەکانیدا، بەڵام نەیاندەتوانی یارمەتیی بدەن، دوای ئەوە کە دەنگ و باس هات کە موحەممەدو قورەیش هودنەیان کردووە، هودنەیەك کە موسڵمانانی ڕزگارکرد لەو ئێش و ئازارانەی کە گیرۆدەیان بوو بوو، سەرپشك کران، یان وازبێنن لە ئاینەکەیان، یان بگەڕێنەوە بۆ لای کەسوکاریان، ئەوان گەڕانەوەیان هەڵبژارد بۆ

مەککە، کە گەیشتنە مەککە، دەبینن قورەیش کۆبوونەتەوە بۆ توندکردنی دژایەتی موحەممەدو هاڕێکانی، هەموو خێڵەکان ڕێکەوتن کە پەیوەندیی بپچڕن لەگەڵ بەنی هاشم، شتیان پێ نەفرۆشن و ژن و ژن خوازییان لەگەڵ نەکەن)[1]، ئەوەیان کردە نووسینێك و هەڵیانواسی بە کەعبەوە، شەڕو ئازاوەی قورەیش گەرم بوو دژی موسڵمانان، ئەوانەی لە حەبەشە گەڕانەوە ڕۆشتنەوە، هەندێکیش لەگەڵیان چوون، قورەیشیەکان هێندە تووڕە بوون و دژایەتییان کردن خەریکبوو نەهێڵن کۆچ بکەن، موحەممەد حەسەن هەیکەل دەڵێ: (ئەو ڕێکەوتن و هودنەیە ڕاست نییە کە ڕۆژهەڵاتناس (مویر) باسی دەکات، کە گوایە ئەوە وای کردوە کۆچەرەکان بگەڕێنەوە، بەڵکو ئەوەی وای لێکردن بگەڕێنەوە، تەنها موسڵمانبوونی عومەر بوو، کە بە گەرم و گوڕیی پاڵپشتیی لێکردن، چیرۆکی غەرانیق، کە گوایە بوە هۆی ڕێکەوتن، هیچ ڕاستییەکی تیا نییە، ئەوانەی کە ئەم دوو ئایەتە (وَإِن كَادُواْ لَيَفْتِنُونَكَ) و (وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّا إِذَا تَمَنَّى أَلْقَى الشَّيْطَانُ فِي أُمْنِيَّتِهِ ) ئەوانەی ئەمانە لە تەفسیرو سیرەکاندا بە هەڵە لێك دەدەنەوەو، بە بەڵگە دەیهێننەوە، زۆر ناتەواوو هەڵەن، کە گوایە دەڵێن ئەم ئایەتانە پشتیوانیی لە چیرۆکەکە دەکات، بۆچوونی ئەمانەش لە بۆچوونە هەڵەکەی (مویر) لاوازترو کەم نرخ ترە) پاشان هەیکەل دەڵێ: (هەر ئەوەندە بەسە کە بڵێین کە خوا دەفەرمووێ: (وَلَوْلاَ أَن ثَبَّتْنَاكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْئاً قَلِيلاً) مەبەست لەوەیە، کە شەیتان هەمیشە هیواو ئاوات دەخاتە دڵی پێغەمبەر، بەشتێك یان لەبەر شتێك، وە ڕەنگە پێغەمبەر شتێکی لە ناخی خۆیدا لێکدابێتەوەو مەیلێکی بۆ دروست بووبێ، بەڵام خوا فریای کەوتووەو دڵی دامەزراندووەو هیچی نەدرکاندووە، ئەگەر شتی وابکرایە خوا هەرگیز قبوڵی نەدەکرد، بەڵگە هێنانەوە بەو ئایەتانە، بە هەڵە تێگەیشتنە، پێغەمبەر هەرگیز یەك تۆسقاڵ لای نەکردۆتەوە بە لای قورەیشدا لە ڕووی عەقیدەوە، یان قورەیش توانیبێتیان موحەممەد بخەڵەتێنن و موحەممەدیش

---

[1] حياة محمد. محمد حسن هيكل، لا ١٦٣

هەندێ وتەی بە ناوی خواوە هەڵبەستبێ و تێکەڵ بە ئایەتەکانی سورەتی (نەجمی) کردبێ، کە خوا نەیفەرموو بێت، ئەم وتانە لەگەڵ عیسمەت و مەعسومیەتی پێغەمبەردا ناگونجێ.. بۆچوونێکی لاواز تر ئەوەیە کە سەرچاوەکان هەریەکە بە جۆرێك ئەم دێرە دروستکراوە دەهێنن، گەر ئایەت بوایە یەك شێواز دەبوو، بۆ نموونە بەم جۆرانە هاتووە: (تلك الغرانيق العلا وان شفاعتهن لترتجى) (الغرنقه العلا وان شفاعتهم ترتجى) (ان شفاعتهن ترتجى) لەمەی دواییدا ناوی غەرانیقی نەبردووە، (وانها لهي الغرانيق العلا) (وانهن لهن الغرانيق العلا، وان شفاعتهن لهي التي ترتجى) ئەمە جگە لەوەی کە چیرۆکەکە لە کتێبەکاندا بە جۆرەها شێوە دەگێڕنەوە، کە لە پێنج شێوە زیاترە، ئەم جۆراو جۆری ڕستە و چیرۆکە دەلیلە کە دروستکراوە، وەك ئیبن ئیسحاق دەڵێ: زەنادیقەکان دروستیان کردووە، مەبەست لێی گومان دروستکردنە لە ڕاستی تەبلیغکردنی موحەممەد لە پەیامەکەی خوادا، دەلیلێکی تر کە دەیبڕێنێتەوە شێوازی سیاقە قورئانیەکەیە لە سورەی (نەجم) دا، ئەو چیرۆکی غەرانیقە هیچ ڕەگ و بنەڕەتییەکی نییە، سیاقە قورئانیەکە دەڵێ: (لَقَدْ رَأَى مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَى * أَفَرَأَيْتُمُ اللَّاتَ وَالْعُزَّى * وَمَنَاةَ الثَّالِثَةَ الْأُخْرَى * أَلَكُمُ الذَّكَرُ وَلَهُ الْأُنثَى * تِلْكَ إِذاً قِسْمَةٌ ضِيزَى * إِنْ هِيَ إِلَّا أَسْمَاء سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَاؤُكُم مَّا أَنزَلَ اللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَمَا تَهْوَى الْأَنفُسُ وَلَقَدْ جَاءهُم مِّن رَّبِّهِمُ الْهُدَى) (النجم : ١٨، ٢٣ )[١]، ئەوەتە سیاقە قورئانیەکە بە ئاشکرا دەفەرموێت کە لات و عوزاو مەنات و هەموو بتەکانی تر ناوانێکن بتپەرستان و باوو باپیرانیان، خۆیان لە خۆیانەوە دایان تاشیوون و ناویان لێناون، خوای گەورە هەرگیز شتی وای دانەبەزاندووە و پێی ڕازی نییە کە ئەم بتانە ئەم ناوانەیان هەبێت) ئەمیە ئەو ئایەتانەی کە دڵکرمێکان بە کەیفی خۆیان و بۆ مەبەستی خۆیان دایان ڕشتوە، کوا لەم ڕستانەدا باس و خواسی غەرانیق هەیەو جێی دەبێتەوە، ئەگەر باسی غەرانیق لەم رستانەدا هەبێ، ئەوا

---

[١] حياة محمد ،محمدحسنين هيكل، لا ١٦٥.

تەناقوص و لارووێری و دژایەتیەك لە وشەكان و ماناكاندا پەیدا دەبێ، ئەوەش لە وتەی خوای گەورەوە دوورە، تەناقوص لە هیچ جێیەكی قورئاندا نییە، نەك لەم سورەتەدا، لە هیچ جێیەكی قورئاندا شتێك نابینی، پیاهەڵدان بە لات و عوزاو مەناتدا بكاتو، لەولاوە بە چوار ئایەت زەمی بكات. ! عەقڵ هەرگیز بڕوای بە شتی وانییەو جێی نابێتەو قبوڵ ناكرێ، مرۆڤیش قسەی واناكات، ئەوە دەردەخات كە چیرۆكە غەرانیق، دروست كراوە، زەندەقەكان دروستیانكردووە [١]، موحەممەد عەبدەش دەڵێ: ناوبردنی عەرەب بۆ بتەكان بە ناوی غەرانیق نە لە شیعریانەوە هاتووەو نە لە وتارو نە لە كەسەوە وەسف كراوە، هەرگیز بە زمانیدا نەهاتووە، بەڵكو وشەی (غرنوق) بە ناوی باڵدارێكی ئاوی رەش، یان سپی هاتووە، یان گەنجێكی سپی جوان، هیچ كامیش لەوانە ناگونجێ لەگەڵ ناوی ئەو خوایانەی كە عەرەب بە تاشین بۆ خۆیان دروستكردووەو وەسفیان كردووە [٢] .

لەلایەكی ترەوە راستیی ژیانی موحەممەد دەریی دەخات كە ئەو چیرۆكە هەڵبەستراوە، ئەو هەرگیز لە منداڵیەوە تا پێغەمبەریی درۆیەك یان لاریەك لە وتەو كرداریدا نەبووە، هەتا بگاتە ئەوەی كە وشەیەكی نارەوا بە ناوی خواوە هەڵبەستێ، ئەو رۆژانە جوبرەئیل دهاتە لای، یان ئایەتی بۆ دەهێنا، یان رۆژانە پێكەوە پیاچوونەوەی لەبەركردنی قورئانی لەگەڵ محەممەددا دەكردو، وەڵامی پرسیارەكانی موحەممەدی دەدایەوە، ئەو هەرگیز درۆیەكی لێ نەبیستراوە، هەر بۆیە پێش پێغەمبەرایەتی ناونرا بوو (ئەمین). هەر كە تەمەنی گەیشتە (٢٥)ساڵیی، لای خەڵك بە راستگۆ ناوی دەرچوو، هەتا رۆژێك قورەیشی لای گردێكدا كۆكردەوەو پرسیاری لێكردن وتی: (ئەگەر بڵێم سوپایەك سوارە لە پشت ئەو كێوەوەیە، هاتوون بۆ سەرتان، بڕوا دەكەن؟ ئەوان وتیان: (بەڵێ، تۆ لای ئێمە تاوانبار نیت، هەرگیز درۆیەكمان لێنەبیستوی) خوای گەورەش وەسفی دەكات

---

[١] السيرة النبوية - أبن اسحاق- ط١ ج١ ص١٤٨ ١٩٨٨مصر.

[٢] حياة محمد، هيكل، ص١٦٦

دەفەرمووێت: (بە ڕاستی تۆ لەسەر خوو و ڕەوشتێکی بەرزیت) کەسێك لای خواو لای خەڵك بەو پلەیە دەستپاك و زمانپاك و ڕاستگۆو ڕەوشتبەرز بێت، کێ بڕوادەکات ئایەتێك بە ناوی خواوە دروست بکات کە خوا نەیفەرمووبێت..؟ یان لەبەر خەڵك کار بکات و لە خەڵك بترسێ، ئەو دەبێ لە خوا بترسێ. شتی وا هەرگیز نەبووەو نەشیاوەو نابێت، پێم سەیرە لێکۆڵەرێکی وەك دکتۆر جەمال لە بەرامبەر کەسایەتیەکی بە هێزی مێژوویی و شۆڕشگێڕو ئیصلاح خوازدا دەوەستێ و چۆك دانەداو ناتوانێ حەق بڵێ.. ئەمە وا دەکات ئێمە بکەوینە گومان لە زانیاریە مێژوویەکانی تری دکتۆر جەمال، دەبێت لێکۆڵینەوە لەسەر بابەتەکانی تری دکتۆر بکرێت، بزانین چۆنی وتوەو لە کوێی هێناون، ئێمە گلەیی لە ڕۆژهەڵاتناسان ناکەین، ئەوان گاورن، بە زۆری بۆ کاری بڵاوکردنەوەی گاوریی و لێکۆڵینەوە لە کۆمەڵگەی ڕۆژهەڵات هاتوون، هەتا دیراسەی باری کۆمەڵایەتیی و دەروونیان بکەن و هەوڵ بدەن چۆن کاریان لەسەر بکەن، لەبیرتانە کاتێك پارەو ژن و دەسەڵات دەخەنە بەردەست محەممەد، بەرامبەر وازهێنان لە ئایینەکەی، ئەو بە بڕوای پتەوەوە دەڵێ: نەك ئەو شتە سادانە، بەڵکو ئەگەر خۆر بخەنە سەر شانی ڕاستم و مانگ بخەنە لای چەپم، بۆ ئەوەی واز لەم ئایینەم بهێنم، وازناهێنم، هەتا سەردەکەوم، یان لەپێناویدا لەناودەچم. ! بە وتەی دکتۆر جەمال، محەممەد ئەم دیاری و ڕەزامەندیانە واز لێدەهێنێ، بەڵام دێت بۆ ڕەزامەندیی قورەیش ئایەتێك بە ناوی خواوە دروست دەکات کە خوا نەیفەرموە..؟ یان دێت خۆی بە درۆدەخاتەوەو، نکوڵی دەخاتە بنەڕەتی دینەکەی، کە چەند ساڵە بانگەوازی بۆ دەکات و، خوا بۆ ئەوەی نەناردووە..؟ یان پشت لە خوا دەکات و ڕوو دەکاتە قورەیش و، خۆی تێکەڵی بتپەرستان دەکات و بە شان و باڵی بتە ڕەق و تەق و بێگیانەکاندا هەڵدەدەت و دەڵێ: شەفاعەتی ئەو بتە بێهەستانەش گیرایەو دروستە؟!

لە بنەڕەتدا ئەمە گیرابونی دوعای پێغەمبەرە، ئەوەتە دوای دەساڵ بەسەر بانگەوازەکەی داو، دوای ئەوەی کە خۆی و هاوڕێکانی تاڵترین سزاو ئازاریان بە

دەست قورەیشەوە چەشت و قوربانی زۆریاندا، خوای گەورە دوعاکەی پێغەمبەری وەرگرت، عومەر و حەمزە موسڵمان بوون، موسڵمانان بەهێزبوون و ئایینیان ئاشکراکردو روویانکردە کەعبەو بازاڕی مەککە، بە ئاشکرا بانگی ئیسلامیان لێداو نوێژیان کرد، دوای ئەوەی ئەم هەواڵە گەیشتە عەرەب و خێڵەکان و حەبەشەو مەدینە و یەمەن و شام و عێراق، هەر یەکە لەلای خۆیەوە هەڵوێستی وەرگرت، هەبوو موسوڵمان بوو، هەبوو گەڕایەوە، هەبوو نەخشەی جەنگی درێژماوەو تاکتیکی نوێی بۆ درێژەپێدان دژی ئاینی خوا داڕێژا..!!.

ئەمە راستیی چیرۆکەکەیە، نەك دروستکردنی غەرانیق، هێنانەوەی وتەیەکی وا چیرۆك ئامێز لەوکەش و هەوایەدا، ئەفسانە و خورافاتەو درۆیەکی دروستکراوە، ئەوانەی ئەم جۆرە بوختان و درۆیانە دەچنن و بڵاوی دەکەنەوە، خۆیان دەزانن جێناگرێ و دەرەوێتەوە، ئەمە هەڵبەستراوی سەردەمی پێغەمبەرو خەلیفەکانی راشیدین و سەردەمی یەکەمی دەرکەوتنی ئیسلام نییە[1]، ئەمە لە سەردەمی ئەمەویەکاندا دروستکراوەو خزێنراوەتە ناو کتێبەکان، مەرج نییە ئیبن ئیسحاق و تەبەری و ئیبن سەعد خۆیان نووسیبێتیان، ئەوسا خەڵك بەدەستنووسی کتێبەکانی ئەوانی دەنووسیەوە، لەو کاتانەدا خراپکاران کتێبەکانی ئەوانیان دوای خۆیان نووسیوەتەوەو، سەدان فەرموودەی دروستکراو و هەواڵی درۆ و چیرۆکی هەڵبەستراوی وەك ئەم چیرۆکی غەرانیقەیان تیاچاندووە، لە حوجرەکاندا بڵاویانکردۆتەوە، موحەممەد هەرگیز پاساوی بۆ بتپەرستیی نەهێناوەتەوەو بەردەوام توندبوو نەرمیی نەدەنواند و شلگیری نیشاننەدەدا، ئەو کاتەی قورەیش چوونە لای ئەبوتالیب و پێشنیاریان کرد کە ماڵ و ژنی دەدەنێ و دەیکەنە پاشای خۆیان، ئەو کاتە زۆرکەم لە خەڵکی مەککە دوای کەوتبوون، ئەو ئازاردانەی قورەیش بۆ هاوڕێکانی بۆ ئەوە بوو لە بانگەوازەکەی و پەیامەککەی پەشیمانیان بکەنەوە، بەڵام موحەممەد و هاوڕێکانی تۆسقاڵێ ماوەیان بۆ نەهێشتنەوەو لێیان

---

[1] حياة محمد، ص١٦٧.

لانەداو توندو ڕەق و بەهێز بوون، مساوەمەیان لەسەر یەك خاڵ نەكرد، ئیبن ئیسحاق كە پرسیاری لێدەكەن لە بارەی چیرۆكی غەرانیق، دەڵێ: درۆو زەندەقەیەو بێبڕواكان دروستیانكردووە، بەڵام دكتۆر جەمال هەر دەڵێ: ئیبن ئیسحاق باسی چیرۆكی غەرانیقی كردووە.

ئەوان لەبەر موسڵمان بوونی عومەر و ئاشكرابوونی بانگەوازەكە هاتنەوە، موسڵمانبوونی عومەر كاریگەرییەكەی وای دروستكرد، قورەیشیەكان داوای هودنەیان كرد، هاتنەوەی كۆچەران و شۆڕش لە حەبەشە و ترسانی تێوەگلانی ئەمان لەو شۆڕشەدا، وای كرد بێنەوە، چونكە شۆڕشەكە پەیوەندیی بەمانەوە هەبوو، كە قوریش زانی كۆچەران هاتوونەتەوەو عومەرو حەمزە موسوڵمان بوون، زیاتر ترسیان لێنیشت، زانیان كاری موحەممەد گەورە و فراوان دەبێت و لە سنوور دەردەچێت، ترسان زیاتر دەنگ و باسی بڕواو لە كۆنترۆڵ و توانای ئەمان دەربچێت، قورەیش كۆبوونەوە.؟ چەند خاڵێكیان نووسی بە دیواری كەعبەوە هەڵیانواسی، بڕیاریاندا ئاڵوگۆڕی كاسبی و ژن و ژنخوازی و تێكەڵییان نەكەن، پاشان كۆبوونەوەو بڕیاریاندا موحەممەد بكوژن[1]، بە ڕاستی ئەبوتالیبی مامی و بنەماڵەی عەبدولموتەلیب بە هەموو توانایان پشتیان گرت، قورەیش بەردەوام سووربوون بەنی هاشم پەشیمان بكەنەوە، بەڵام ئەبوتالیب هەر دەستبەرداری برازاكەی نەبوو، ئەبوجەهل هاتە ماڵی ئەبو تالیب و تاوانی زۆری محەممەدی باسكرد، هەمزە گەرم بوو وتی ئێستە من دەچم موحەممەد دەكوژم و تۆڵەی ئەو هەموو تاوانەی لێدەكەمەوە، بەڵام كە هات.. موسڵمان بوو، قورەیش بە جۆرەها سزاو ئازاری، نەك پێغەمبەر، موسڵمانەكانیان دەداو هەوڵی وازهێنان و هەڵگەڕانەوەیان دەدان لە ئایینەكەیان، لێدان و خەڵەتاندن و ڕزق و ڕۆزیی لێبڕین و لە ناوبردنی بازرگانیی و دەركردنیان لە ماڵەكانیان لەلایەن باوك و دایكیانەوەو تەڵاقدان و جۆرەها سزاكاری قورەیش بوو[2]، ئەوانەی كەسیان نەبوو پشتیان

---

[1] محاضرات في تأرخ العرب-د.صالح احمد العلي-مطبعة المعارف -بغداد-١٩٥٩ ج١ ص٣٥٨.

[2] سيرة ابن هشام ج١ ص٣١٢-٣٤٢. ابن سعد ،ج٣ ص١٧٧

بگرێ، وەك، عەماری كوڕی یاسرو سوهەیبی ڕۆمیی و ئەبو نەهیكە و بیلالی حەبەشی ئەوانە كۆیلە بوون[1]، گەورەكانیان لەسەر چەوو لمی گەرم و داخ، لەبەر خۆری نیوەڕۆی هاوین، سزایان دەدان، ئەوانەی كە بڕوایان دانەمەزرابوو هەڵدەگەڕانەوە، قورئان لە ئایەتی (١٠)ی سورەتی عەنكەبوتدا باسیان دەكات، ئەم شەڕە سەختە لەسەر پێغەمبەرو موسڵمانان كاریگەریی هەبوو، دەبوو پێغەمبەر چارێكی بۆ بدۆزێتەوە، بەڵام بە هیچ شێوەیەك لەسەر حسابی عەقیدە و ئایینەكەی نا، ئەو شەڕە بێسنووورە نەبوایە زۆربەی خەڵكی شاری مەككە دوای محەممەد دەكەوتن، پێغەمبەر بە نهێنی داوای لێكردن كۆچ بكەن بۆ حەبەشە، فەرمووی پاشایەكی دادپەروەری لێیە كەس لای ئەو ستەمی لێناكرێ[2] !

كۆچ بۆ حەبەشە بە دوو قۆناغ بوو، قۆناغی یەكەم (١١)، یا (١٢) پیاو بوون، ژن و پیاو ٤٥ كەس بوون، ئەوانە بە هەواڵەكەی موسڵمان بوونی عومەر گەڕانەوە، دوایی كە قوڕەیش كەوتەوە سزادان، هەندێك لەوانە گەڕانەوە بۆ حەبەشەو هەندێكی تریشیان لەگەڵ خۆیان برد، ئەمە قۆناغی دووەمی كۆچكردنە، ئەم جارەیان حەفتا پیاو بوون جگە ژن و منداڵ[3]، بەڵام ئیبن سەعد دەڵێ: جاری دووەم (٨٣) كەس بوون، هەبوو تەنهاو، هەبوو بە خێزانەوە بوو[4]، هەموو پێكەوە نەبوون، بەڵكو بە بۆلوان و ماوە ماوە، لە هەموو هۆزەكانیان تیابوو[5]، (مونتجومری وات) پێنج هۆی بۆكۆچكردن باس كردووە، هەندێكیان گوماناویەو دەڵێ: هەندێ لە كۆچەران بۆ بازرگانیی چوون، هەندێكی تر لەگەڵ ئەبوبەكر ڕای جیاوازیان هەبوو، پێغەمبەر دووری خستنەوە، ئەو دوو ڕایە وا نییە، بەڵكو كۆچی هەموویان لە ترسی سزاو لە ترسی هەڵگەڕانەوە بوو، ئەگەر زۆریان بۆ بهێنن، ئەوان ڕۆشتن بۆ

---

[1] ابن هشام-ج١ ص٣٢٩.

[2] طبري ج٢ ص٢٢١ ابن هشام ج١ ص٣٤٣.

[3] تأريخ طبري-ج١ ص٣٤٨ . محاضرات في تأريخ العرب-ص٣٦١.

٤ (ابن سعد ج١ ص١٣٦) (ئيبن هشام ج١ ص٣١٥).

[5] محاضرات ص٣٦٩.

جێبەجێکردنی فەرمانی پێغەمبەر. قورئان دەفەرمووێ: تەنها لەبەر چەوسانەوەو پاراستنی ئیمانیان کۆچیان کرد[1]، مێژوونووسان لەسەر ئەوە کۆکن کە هەر لە ترسی چەوسانەوە کۆچیان کرد.

زانیاری تەواو نییە لەسەر ژیان و گوزەران و پێوەندیی کۆچەران لە حەبەشە، بەڵام ئەوە روونە کە نەجاشی پەناگایەکی هێمن و سیاسیی چاکی بۆ رەخساندن، کە کەس ستەمی لێنەدەکردن، رەنگە دواتر هەندێکیان بە بازرگانییەوە خەریك بووبن، رەنگە ئەو سەرقاڵی بازرگانیە وایکردبێ کە پاشتر هەندێکیان لە گەڕانەوە بۆ مەدینە دواکەوتبن. دکتۆر صالح العلی دەڵێ: ئیبن ئیسحاق دەگێڕێتەوەو تەبەری لەوی وەرگرتووە، کە کۆچەران لە حەبەشە بیستویانە خەڵکی مەککە موسڵمان بوون، لەبەر ئەوە گەڕانەوە، بەڵام کە نزیکبوونەوە، زانرا راست نییە، لەو (٣٣) کەسە کە هاتنەوە زۆری گەڕایەوەو هەندێکی تری لەگەڵ خۆی برد بۆ حەبەشە، بەڵام هەندێکی تر چوونە پەنای خەڵکی تر، تابیان پارێزن و لە مەککە مانەوە، لە ساڵی شەشەمی کۆچییدا لە مەدینە، پێغەمبەر (عەمری کوڕی ئومەییە)ی نارد بۆ لای نەجاشی، کە هەرچی ماوە لە موسڵمانەکان بە دوو کەشتیی هێنایانەوە خاکی حیجاز، کە ئەو کاتە پێغەمبەر لە خەیبەر بوو دوای حودەیبیە[2]، ئەم وەجبیە کە گەڕانەوە (١٦) کەس بوون، ئیبن ئیسحاق دەڵێ: حەوتیان لە حەبەشە مردن، ئەوانەش خۆیان هاتنەوە (٣٤)کەس بوون جگە ژن و منداڵ[3]، بە راستی کۆچ بۆ حەبەشە کێشەکەی چارە نەکرد، هەر ئەوە بوو ئەو موسڵمانانە پارێزراو بوون و دوور بوون لە سزاو، لە حەبەشە ئازاد بوون، موسڵمانانی مەککە ئەوەی مابوویەوە سوربوون لەسەر باوەڕەکەیان و لایان نەدا، قورەیشیەکان دوژمنایەتیان توندتر کرد، بەڵکو ئەو سزا بەسۆیە کە لاشەیانی

---

١ ، العنكبوت: ١ ـ ٣ ، البروج: ـ ١٠ ، العنكبوت: ١٠ ، القصص: ٥٧ ، الزمر: ١٠ ، النحل: ١١٠، ٤١ .

[2] طبري ج٢ص٢٢٧-٢٢٩-ابن هشام-ج٣ ص٣١٧-ابن سعد ج٤ ص١٧٩.

[3] محاضرات- ص٣٦٨.

خەڵتانی خوێن دەکرد، زیاتر رقی هەڵدەساندن و، سوور دەبوون لەسەر باوەڕیان و، رق و قینیان لە بتپەرستان هەڵدەسا، خەڵکی هەژاری مەککەو کۆیلەکان سۆزیان بەلای موسڵماناندا دەچوو، ئەوانەی کە لە مەککە بە درندەیی سزایان ئەدان، لە مەیدانی بەدرا لاشەکانیان کەوت، هەر لەو توندیی و سزا سەختەدا عومەرو هەمزە موسڵمان بوون و نرخێکی تریان دا بە بانگەواز، فەتح و سەرکەوتنێکی وابوو، هەواڵی گەیشتە نیوەدوورگە و حەبەشەو یەمەن، ئیبن ئیسحاق دەڵێ: کە قورەیش زانیان و بینیان کە هاوڕێکانی پێغەمبەر جێی ئەمن و ئەمانیان لە حەبەشە دەستکەوتووە و نەجاشی رێزی لێ گرتوون و عومەرو هەمزە موسڵمان بوون و بانگەواز گەیشتووەتە هەموو ماڵ و هەموو خێڵ و هۆزەکان، کۆبوونەوەیان کردو بەڵگەنامەیەکیان نووسی و هۆزەکان مۆریان کرد، کە گەمارۆی بەنی هاشم و بەنی موتەلیب بدەن، ژن و ژنخوازیی و کڕین و فرۆشتن و قسەیان لەگەڵ نەکەن، بە دیواری کەعبەوە هەڵیان واسی[1].

من ناچارم زیاتر لەسەر ئەم باسە بڕۆم، چونکە دیارە ئەم لێکۆڵەرانە نازانن پێغەمبەر چەند توند بووە بۆ ڕاگرتنی باوەڕەکەی و بە هیچی تری نەگۆڕیوەتەوە، تەنانەت هەموو هۆزە قورەیشیەکان بەرامبەری یەکدەگرن، ئەو بە تەنها دەبیاتەوەو هیچ کەمیەك بەرامبەر ئاینەکەی ناکات:

دوای ئەوەی وەحی هات بۆ پێغەمبەرو کەوتە جۆرە وتەیەك، کە لەو ناوەدا باو نەبوو، قسەو کرداری وا، پێچەوانەی عەقیدەو بیروباوەڕو کرداری خەڵك، تا ئەو کاتە لە موحەممەد نەوەشابوویەوە، ئەمە هەڵوێستەیەکی بە سەرکردەکانی قورەیش و، خاوەن بەرژەوەندییە بالاکان و خەڵکی مەککە کرد، دوای ئەوەی لە باوەڕە نوێیەکەی موحەممەد تێگەیشتن، هەستیانکرد ئەمە دژی بتەکانیانە، کە کردبوویانە خواو دەیانپەرست و قوربانییان بۆ دەکرد، بە دەستی خۆیان لە دارو بەرد تاشیبوویان، لە باوو باپیرانیانەوە بۆیان بەجێماوە، لەبەرئەوە، دوای

[1] ابن هشام ج۱ ص۳۷۱ ابن سعدج۱ ص۱۲۵-۱۳۵.

لێکدانـەوەو ڕاگۆڕینـەوەو چـەند دانیشـتنێکی جـدیی، بتپـەرسـتان یـەك كـەوتن كـە دوژمنایەتیی محەممەد بکەن، كە دەیـەوێ واقعـی جاهیلیـان بگۆڕێـت و خواکانیـان ناشیرین بکات و گاڵتە بە ڕاو بۆچوونیان بکات، باس لە خوایەکی تەنهاو کاری مرۆڤ و بوونەوەر دەکات، لەبەرئەوە، کۆمەڵێك كـارو شـێوازیان وەرگـرت بـۆ وەسـتاندنی بانگەوازەکەی و بێـدەنگ کردنـی و دەستبەسـەردا گـرتنی. موحەممـەد تـا هەشـت ساڵ، لای عەبدولموتەلیبی بـاپیری بـوو، جـوان بـەخێوی کـردو پـەروەردەی کـرد، کاتی مردنی، وەسیەتیکرد بـۆ ئـەبوتالیبی کـوڕی کـە کەفالـەتی بکـات و ئاگـاداری بێت، ئەبوتالیب جوانتر لە بـاپیری بـەخێویکرد، کـاری بـۆ دۆزیـەوەو ژنـی بۆهێنـاو بردی بۆ شام، پاشان کە بووە پێغەمبەرو دژی بتەکان وەستا، گـەورەکانی مەککـە چوون بە گژیدا، ئەو پشتی پێغەمبەری گرت و لە جـوانترین شـێوەدا پاراسـتی، بـە مـەرجێ لەگەڵیـدا نـەبوو لـە ڕاو بۆچـوون و یەکتاپەرسـتییدا، بـەرگری لێکـرد لـە ناسکترین کاتێکدا کە ئەبوتالیب خۆشـی لـە خەتـەردا بـووە، قـوڕەیش ناچـاربوون پێیان بە جەرگی خۆیاندا ناو هاتنە لای ئـەبوتالیب، کـە گـەورەی هـەموو لایـەکیان بوو، وتیان: کوڕی براکەت، لە یانەو شوێنی پەرستنماندا ئازارمان دەدات، پێی بڵێ بـا وا نـەکات، ئـەبوتالیب بـە پێغەمبـەری وت: کـوڕانی مامـەت دەڵـێن تـۆ ئازاریـان دەدەیت لە یانەو پەرستگایاندا، واز بێنە لە ئازاردانیان، پێغەمبەر چوو بۆ ناویان و سەری بەرزکردەوە بۆ ئاسمانو وتی: ئەو خۆرە دەبینن؟ وتیـان: بـەڵێ، وتـی: مـن توانام نییە ڕووناکیی ئەوەتان لێبگرمەوە کە ڕووناکیتان نـەداتێ، ئـەبوتالیب وتـی: وەڵڵاهی ئـەم کـوڕی برامـە هـەرگیز درۆ ناکـات، کوڕگـەل بگەڕێنـەوە عـاقڵ بـن..[1] زۆرجـاری تـر قـوڕەیش هەوڵیـدا لـە ڕێی بنەماڵەکەیـەوە پاڵەپەسـتۆ بخاتـە سـەر پێغەمبەر، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون. قوڕەیش ئەوەندەی تـر ئازاریـان دەچەشـت، خەفەت و ئیرەیـی و دەیخـواردن، کـە پێتـەویی ئـەم کـوڕەو پاڵپشـتی ئـەبوتالیبیان دەبینی، جارێکی تریش چوونەوە بۆ لای ئەبوتالیب و، کوڕێکیان بۆ هێنـا بـە نـاوی

---

[1] صحيح السيرة النبوية، ابراهيم العلي ص ٧٨، دار النفائس-١٩٩٨.

(عومارەی کوڕی وەلیدی کوڕی موغیرە) و بە ئەبوتالیبیان وت: (ئەی ئەبوتالیب ئەم کوڕە، عومارە کوڕی وەلیدە، لە ژیرترین و جوانترین لاوانی قورەیشە، وەك فدیەی کوشتن دەتدەینێ، یاریدەت دەدات، بیکە کوڕی خۆت، بەلام کوڕی براکەتمان بدەرێ، کە پێچەوانەی ئاینەکەت و ئایینی باپیرانت کار دەکات، جیاوازیی و ناکۆکیی دەخاتە ناو هۆزەکەت، خەم و هیوامان تێکدەدات، بماندەرێ دەیکوژین، کوڕێك بە کوڕێك.. ئەو ووتی: (وەڵڵاهی خراپترین کارم لەگەڵدا دەکەن، ئایا کوڕەکەتانم دەدەنێ بۆتان بەخێو بکەم، کوڕەکەی خۆمتانم بدەمێ بیکوژن.؟ ئەوە وەڵڵاهی هەرگیز نابێت)[1]، مەردم دۆش دادەمێنێ لە بەرامبەر ئەم هەڵوێستە مەزنەی ئەبوتالیبدا، چارەنووسی خۆی بەستووە بە چارەنووسی موحەممەدی برازای، ئەو گەورەی بەنی هاشمە، بەنی هاشم و بەنی موتەلیبی لە هاوپەیمانیەکدا پێکەوە گرێداوە لەسەر ژیان و مردن بۆ پشتگیری لە پێغەمبەر، موسڵمان و بتپەرستان لەو هاوپەیمانیەدا هاوکارو هاوڕا بوون[2]، ئەنجا خستیە پەنای خۆی، پەنایەکی کراوەی دایە پێغەمبەر کە هیچ دوو دڵیەکی تیا نەمابوویەوە، ئەوە دابێکی مەزن و رەوشتێکی جوان بوو، لە سەردەمی نەفامییدا لە شاری مەککەو دەوروبەری باو بوو، هەر کەس بچوایە پەنای هەر کەس ئیتر پەناهەندەی وەردەگرت و ئازادبوو، هەموو بەرگریەکی لێدەکرا، هەر بۆیە ئەبوتالیب هەردوو بنەماڵەی ئەبوتالیب و بەنی موتەلیبی یەك پێگرت، کە بە هەموو جۆرێك پشتی پێغەمبەر بگرن و بیپارێزن، تەنها ئەبی لەهەب نەهاتە ئەو ریزەو خۆی جیاکردەوە، ئەبوتالیب زۆردڵخۆش بوو بەو یەکگرتنە و باسی فەزڵ و مەزنیی پێغەمبەری بۆ کردن، بۆ بەهێزکردنی یەکیەتی و یەکریزی و یەکرایان، لەخۆشی ئەو یەکیەتیە، هۆنراوەیەکی بەناوبانگی پیاهەڵدان، ئەبوجەهل ویستی پەنای ئەبوتالیب ببڕێ و زەرەر بە موحەممەد بگەیەنێ، بەلام هەمزە بە کەوانەکەی بەری

---

[1] البداية والنهاية- ج٣ ص٤٨.

[2] فقه السيرة النبوية ص١٨٤ منيرالغضبان- مكة المكرمة-١٩٩٦.

گرت و وتی: قسه به موحه‌ممه‌د ده‌لێی، کاتێك من له‌سه‌ر ئاینی ئه‌وم، ئه‌گه‌ر ده‌توانی فه‌رموو بڵێ..؟ به ڕاستی شتێکی سه‌یره که له ناو بتپه‌رستاندا سه‌رۆکێك هه‌یه پاڵپشتی و پارێزگاری له که‌سێك ده‌کات که به سووك سه‌یری بته‌کانیان ده‌کات، تۆمه‌ت له ئایینه‌که‌یان ده‌داو، خه‌ویان تێکده‌دا، ئه‌و بتپه‌رستانه ئاماده‌ن له‌سه‌ر محه‌ممه‌د شه‌ڕ و هه‌را بکه‌ن، به‌رگری لێده‌که‌ن و ده‌یپارێزن هه‌تا موحه‌ممه‌د توشی خراپه نه‌بێت.! له شیعره‌که‌دا ئه‌بوتالیب ده‌ڵێ: هه‌رگیز موحه‌ممه‌د ته‌سلیم ناکه‌م و وازی لێناهێنم، هه‌رگیزاو هه‌رگیز، هه‌تا له پێناویدا تیاده‌چم، په‌نا ده‌به‌ستێ به که‌عبه‌و پیرۆزییه‌کان و سوێند به ماڵی خوا ده‌خوات، که هه‌رگیز موحه‌ممه‌د ته‌سلیم ناکات، ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر ڕووباری خوێن دروست ببێ و، شه‌ڕو هه‌را گه‌رم ببێت له‌گه‌ڵ گه‌وره‌کانی مه‌ککه‌دا. ده‌دا به گوێی گه‌وره‌کانی بنه‌ماڵه‌ی عه‌بدولمه‌نافداو ناویان ده‌بات، که سه‌ریان شۆڕکرد به‌رامبه‌ری، نه‌یانتوانی بێنه ناو هاوپه‌یمانیه‌که‌ی بۆ به‌رگری له موحه‌ممه‌د، ناوی عوتبه‌ی کوڕی ره‌بیعه ده‌بات، که گوێی بۆ نه‌گرتن و ئیره‌یی بردو درۆی کردوو دڵی پیسکردو خۆی بێنرخ کرد[1]، هه‌روه‌ها ناوی ئه‌بوسوفیان و موتعه‌م کوڕی عوده‌ی و، گه‌وره‌کانی به‌نی نه‌وفل ده‌بات و گله‌ییان لێده‌کات، بوونی ئه‌بوتالیب له پاڵ موحه‌ممه‌دی برازایدا، پاڵپشت و سه‌رکه‌وتنێکی مه‌زن بوو، سوودی له‌و دابه خێڵه‌کیه وه‌رگرت و چووه پاڵ و په‌نای مامی و، مامه‌ی بووه پارێزگاری، له هه‌موو خراپه‌یه‌ك پاراستیان، ئازادبوو له جولان و گه‌ڕان و، مافی هه‌موو بیرکردنه‌وه‌و قسه‌و بانگه‌وازێکی هه‌بوو، وه‌لیدی کوڕی موغیره پیرێك بوو، سه‌رکردایه‌تی جه‌نگی له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ردا ده‌کرد، قوره‌یشی کۆکرده‌وه‌و پێی وتن: که کاتی وه‌رزی حه‌ج هات و خه‌ڵك و نوێنه‌رانی عه‌ره‌ب له هه‌موو لاوه هاتن بۆ ئێره بۆ مه‌ککه، هه‌واڵی هاوڕێکه‌تان (محه‌ممه‌د) ده‌بیستن، با ئێمه یه‌ك ڕاو یه‌ك قسه بین، قسه‌ی جۆراوجۆر نه‌که‌ین، یه‌کتری به درۆ نه‌خه‌ینه‌وه، ئه‌نجا وتیان ئه‌ی باوکه عه‌بدلشه‌مس تۆ ڕای خۆت بڵێ... وتی:

---

[1] السيرة النبوية ـ الدكتور علي محمد الصلاح ـ دارالعرفة ـ بيروت ط٤ ٢٠٠٦ ص١٣٢ـ١٣٣.

بەڵکو ئێوە بڵێن، مـن دەبیسـتم. وتیـان دەڵـێین کاهینـە، وتـی: ئـەو کـاهین نییـە، کاهینمان بینیوە، ئەو ورتە ورتی نییە. وتیان: دەڵێین شێتە، وتی: ئەو شێت نییەو شێتمان دیتووە، هیچ شێتیی پێوە دیار نییە، وتیـان: دەڵـێین شـاعیرە، وتـی: جـا ئەو کەی شاعیرە، ئەو دەڵێ: بەڵام شیعر دەزانین چۆنە، ئەو شـاعیر نییـە، وتیـان: دەڵێین ساحیرو جادووگـەرە، وتـی: ئـەو سـاحیر نییـە، سـاحیر و سـیحرەکانیانمان دیوە، ئەو فوو و گرێی نییە، وتیان: ئەی چی بڵێین باوکی عەبدولشـەمس..؟ وتـی: وەڵڵاهی وتەی شیرینە وەك هەنگوینە، رێکوپێکە وەك چنینی درومان پوخت و رێك و جوانـە، هەرچـی ئێـوە وتتـان وانییـە، بـەڵام نـزیکترین قسـە هـەر ئەوەیـە بڵـێین جادووگەرە، جیاوازیی دەخاتە نێوان کورو باوکەوە، پیاوو ژن لەیەکدەکات، کوڕ لە خێڵەکەی دەکات، خوا ئایەتی لە سەر وەلید دابەزاند کە دەڵێ: ئەوانە هیچی نییە، وتەی وەك هەنگوین شیرینە، خـوا دەفـەرموویت: ئێمـەش دەیخەینـە سـەقەر، بـەو جۆرە جەنگی دەروونییان لەگەڵ پێغەمبەر دەکرد، جەنگێکی هەروا سادە و ئاسان نەبوو، بەڵکو بە وردەکاریی و نەخشـە، لەسـەر بنـەمای جـەنگی دەروونیـی ئـەمڕۆ بوو، کاتی قەرەباڵغی حەجیان هەڵبژاردو بە هـەلیان زانـی، زانیـان نـاوی محەممـەد حیجازو شام و عێراق گەیشتوەو سـنووری خێڵـەکانی تێپەڕانـدوە، زانیـان کـە ئـەو هەموو حاجیە، لە هەموو هۆزو ناوچەکانەوە کە دێنە مەککە، هەڵبەت بە تاسوقەوە لە هەواڵی ئەو لاوە ئازایە دەپرسـن، کـە بـە تـەنهاو ئیـبراهیم ئاسـا، بەگـژ هـەموو بتـەکان و عەقیـدەی میللەتانـدا چـوەتەوە، زانیـان ئـەوان بـە وردی دەپرسـن لـە کەسایەتی و زیرەکی و ژیری و هاوڕێو کەس و کاری ئەو کوڕە، هەر بۆیە وتیان بـا هەموو یەك وتەو یەك ڕاو بۆچونمان هەبێت، قسە بکەینو دژی یەك نەبین و، کار لە نوێنەرەکانی حەج بکەین، دیارە وشەکانی قورئان کاریگەری لەسەر دەروون بـووە، وەلید لە گەورەکانی قوڕەیش بوو، کاریگەر بوو بە قورئـان، دانیـاوە بـە بـەهێزیی وشەکانی و شیرینی، بەڵام ئەو جەنگە هیچی نـەکرد، نـەیانتوانی دەنگـی محەممـەد بگرن و گومانی بخەنەسەر کە کاریگەری نەبێت، موحەممـەد ئـەو گـەمارۆ تونـدەی بڕی و خۆی نواند، بە جـوانی خـۆی و باوەڕەکـەی ناسـاندو سـەرکەوتوو بـوو، کـە دەدوا گوێیان بۆشل دەکرد.

ئەبولەهەب و ژنەکەی زرسیکیان دەخستەڕێی پێغەمبەر، ئەبولەهەب لە ناو بازاڕ لە کاتی حەجدا دوای دەکەوت و محەممەدی بە درۆ دەخستەوە، کە خوا سورەتی لەسەر ئەبولەهەب و ژنەکەی دابەزاند، ئەبولەهەب بەردێکی هەڵگرت و چوو بۆ لای، پێغەمبەرو ئەبوبەکر پێکەوەبوون، بە ئەبوبەکری وت: کوا هاوڕێکەت، بیستومە هەجوی کردووم، بە خوا بەم کلۆ بەردە دەمی دەشکێنم، بەڵام خوا نەیهێشت ببینێ، پێغەمبەر دەیفەرموو: لەسەر خوا ئەوەندەم پێکراوە کە بە کەس نەکراوە، سێ شەوو ڕۆژم لەگەڵ بیلالدا بەسەربردووە خواردن نەبووە بیخۆین، ئومەییەی کوڕی خەلەف تفی کرد لە ناوچاوانی پێغەمبەر[1]، کە چووە مەدینە دوژمنی نوێی بۆدروست بوو لە شێوازی جیاوازدا، وەك دووڕوو و جولەکە و فارس و ڕۆم و هاوپەیمانەکانیان، ئەبوسەعیدی خودری دەڵێ: پرسیم ئەی پێغەمبەری خوا کام لە خەڵك زیاتر بەڵاو موسیبەتیان دیووە..؟ فەرمووی پێغەمبەران، دوایی خواری ئەوان، بە گوێرەی پتەوی‌و دەستگرتنی بە ئایینەکەیانەوە[2]، کارێك بەسەر سەحابەکان هات، ڕۆژێك عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف و هاوڕێکانی لە مەککە بە پێغەمبەریان وت: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە کەبتپەرست بووین، زۆر خاوەن ڕێزو قەدر بووین، کە بروامان هێنا نزم و کەم و بێنرخ بووین، فەرمووی: (من داوامکردووە بە لێبوردەیی و شەڕنەکردن لەگەڵ هۆزەکەمان)، بێگومان دەستگرتنەوەو لێبوردەیی و شەڕنەکردن لە مەککە حیکمەتی زۆری تیابوو، پەروەردە و خۆئامادەکردن لە باروڕۆخێکی تایبەتدا، بانگەوازی ئاشتیخوازیانە کار و ئەنجامی زیاتر دەبێت هەتا شەڕ، بۆ دوورکەوتنەوە لەخوێنرشتن و دوژمن دروستکردن، قورئان هانیدەدان کە حەکیمانەتر کاربکەن، نەرمونیان بن، خۆگرین، هەڵنەچن، ڕووخۆش و نەرم بن، بۆ ئەو مەبەستە، خواو پێغەمبەر دەیان چیرۆکی پێغەمبەران و ئوخدودو ئەسحابی کەهف و زیلقەرنەین و

---

[1] الروض الانف ج٢ ص٣٢ـ٤٨.

[2] ابن ماجة، حديث رقم ٤٠٢٣.

زۆری تـری بـۆ دەگێڕانـەوە، بـەڵام بتپەرستـان هـەر لەسـەر لێـدان و کۆبوونـەوەو بڕیاردان بەردەوام بوون، پاشـان هاتنـە سـەر ئـەوەی قسـەی لەگـەڵ بکـەن، بـزانن چیان دەوێ، (رۆژێك کۆبوونەوەو وتیان: کێ شارەزاترە لەجادوگەریی و کـاهینی و شـاعیری، بـا بچێتە لای ئـەو پیـاوەی کـە تەفرەقـەی تێخستووین و کـاری پـەرت کردووین و، ئاینەکەمان ناشـیرین دەکـات، بـا قسـەی لەگـەڵ بکـات و بـزانین چـی دەوێت: وتیان کەس ناناسین جگـە لـە عوتبـەی کـوڕی رەبیعـە، وتیـان تـۆی ئـەی بـاوکی وەلیـد، عوتبـە چـوو بـۆ لای وتـی: ئـەی موحەممـەد تـۆ چـاکتری یـان عەبدولموتەلیب..؟ پێغەمبەر بێدەنگ بوو، وتـی: ئەگـەر تـۆ دەڵێـی ئەوانـە لـە تـۆ باشترن، دەی ئەوان ئەو خوایانەیان دەپەرست کە تۆ ناشیرینیان دەکـەیت، ئەگـەر دەڵێی تۆ لەوان باشـتریت، دەی قسـە بکـە هـەتا قسـەت ببیسـتین، بـە خـوا ئێمـە کەسمان نـەدیوە لـە نـاو گەلەکەمانـدا لـە تـۆ نەگبـەتتر بێـت، ناکۆکیـت کـردە نـاو کۆمەڵەکەمان و کاروبارت پەرت و بڵاوکردین، ئایینەکەمانت ناشـیرین کـرد، لـە نـاو عەرەبدا حەیات بردین و ناشیرینت کردین، هەتا ئەوەیان بۆ دروستبووە کە لـە نـاو قورەیشـدا جادوگـەرێك پەیـدابووە، لـە نـاو قورەیشـدا کاهینێـك هەیـە، بـە خـوا چاوەڕوانی ئەوە دەکـەین، کـە یـەکێك بـانگ هەڵبـدات و لـە ناوخۆمانـدا بەشمشـێر بەربببینە یەکتر، هەتا پێکەوە تیادەچـین، ئـەی پیـاو، ئەگـەر پێویسـتیەکت هەیـە، هەموو پارەکانمان کۆ دەکەینەوەو دەتدەینێ، هەتا لە هەموو قورەیش دەوڵەمەنتر دەبیت، ئەگەر خۆشیی و بەرزییت دەوێ، کام ئافرەتی قورەیش دەڵێی هەڵبـژێرە، دە ئافرەتت لـێ مـارە دەکـەین، پێغەمبـەر فـەرمووی: (لێبوویتـەوە) وتـی: بـەڵێ. پێغەمبەر فەرمووی: (حم * تَنزِيلٌ مِّنَ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ * كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآناً عَرَبِيّاً لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ) (فصلت : ١، ٣) عوتبـە وتـی: رجـات لێدەکـەم جگـە لەمـەت پێنـەبوو..؟ وتـی: نـەخێر، گەڕایـەوە لای قـورەیش، وتیـان: چـیتکرد..؟ وتـی: بەجێمنەهێشت هەتا هەرچی ئێوە وتتان، پێم وت. وتیان: ئەی وەڵامی دایتـەوە..؟ وتی: بەڵێ، لە گێڕانەوەی ئیبن ئیسحاقدا دەڵێ: عوتبە وتی: شـتێکم لێبیسـت، بـە خـوا هـەرگیز شـتی وام لێنەبیسـتبوو، بـە خـوا نـە شـیعر بـوو، نـەجادو بـوو، لـە

کەهەنەش نەدەچوو، ئەی گەلی قورەیش گوێم لێبگرن، ئەو بدەنە دەست مـن، واز لەو پیاوە بهێنن چی دەکـات بـا بیکـات، وازی لێبێـنن، بـە خـوا لـە قسـەکانی ئـەو پیاوەدا هەواڵی مەزنیی دەدا، گەر عەرەب وەریبگرێ ئیتر بەسیەتی و هیچـی تـری ناوێ، گەر سەرکەوێ بەسـەر عەرەبـدا ئـەوا مـوڵکی دەبێتـە موڵکتـان و مـەزنیی و ڕێزی دەبێتە ڕێزی ئێوە، ئێوە لە هەموو کەس زیاتر پێی دڵخۆش دەبن. وتیـان بـە خـوا دیارە، بـە قسـەکانی جـادوی لێکـردوی ئـەی بـاوکی وەلیـد، وتـی: ئـەوە ڕاو بۆچـوونی منــە، ئێــوەش حــەزتان چــۆنە وابکــەن ..)[1] ، دوای ئــەوە دیســـان سەرکردەکانی مەککە زۆریـان ڕۆشـتنەوە بـۆ لای پێغەمبـەر بـۆ ڕێکـەوتن، هەنـدێ پێشنیاریان خستە بەردەم کـە دڵـی نـەرم دەکـرد، یـەکێ ئەگـەر بـەدوای خۆشـیی دنیاوە بێـت، بـەڵام پێغەمبـەر هەڵوێسـتێکی تـری هـەبوو بەرامبـەریان، تـەنازول و مداهەنــەو کــارێکی فــێڵ و سیاسـیانەو خەڵەتانـدن و عــەتف جوڵانــدنی نــەکرد بەرامبـەریان، چـونکە ئـەوە کـاری عەقیدەیـە، هـیچ نەرمیـەکی نـاوێ و شـتی تـر هەڵناگرێ، وەڵامی پێغەمبـەر ئەمـە بـوو: (چـیم داوە لەوانـەی ئـەوان دەیڵـێن، مـن نەهاتووم بۆ ئەوەی کە ئێوە بۆی هـاتوون، مـن داوای مـاڵ و سـامان و شـەرەف و گەورەیی و دەسەڵاتی ئێوە ناکەم، بەڵکو خوا ناردوومی بۆ سەرتان بـە پێغەمبـەر، کتێبێکی ناردۆتە سـەرم، فـەرمانی پێکـردوم کـە مـژدەدەرو ترسـێنەریم بـۆ ئێـوە، منیش نامەکەی خوام پێگەیاندون، ئامۆژگارییم کردوون، ئەگەر لێموەرگرن ئـەوەی کە بۆم هێناون، ئەوە بەشی خۆتان لـە دونیـاو قیامـەت دەسـت دەکـەوێت، ئەگـەر وەری نەگرن و بیدەنەوە بە سەرمدا، ئەوا ئارام دەگرم خوا بیبڕێنێتەوە هـەتا خـوا دادوەری لە نێوان من و ئێوەدا دەکات)[2]، ئەوەیش چـاری نـەبوو پێغەمبـەری نـەرم نەکرد، کە واز لە نامە و عەقیدەکەی بهێنێ، کە بتپەرستان بەرزیی و پتەوی بـڕوا و ئایین و دەروونی موسڵمانەکانیان دی، نائومێـد بـوون، ڕێیـەکی تریـان گرتـە بـەر،

---

[1] السيرة النبوية ابن هاشم ج١ ص٢٩٤.

[2] سيرة ابن هشام ج١ ص٢٩٥.

ئەسوەدی کوڕی عەبدولموتەلیب و وەلیدی کوڕی موغەیرەو ئومەییەی کوڕی خەڵەف و عاصی کوڕی وائیلیان نارد بۆ لای پێغەمبەر، (وتیان: ئەی موحەممەد وەرە ئەوەی تۆ دەیپەرستی، ئێمەش دەیپەرستین، ئەوەی ئێمە دەیپەرستین تۆش بیپەرستە، وەرە با هەردووکمان شەریك بین لە کار و خواپەرستییدا، ئەگەر ئەوەی تۆ دەیپەرستی باشتر بوو لەوەی ئێمە دەیپەرستین، ئەوە ئێمە بەشی خۆمان لێدەسکەوت، ئەگەر ئەوەی ئێمەش باشتربوو لەوەی تۆ، ئەوە تۆش بەشی خۆت لێدەست دەکەویّ)، خوا بۆ ئەم پێشنیازە قورس و گرانە سورەتی (الكافرون)ی دابەزاند، ئەم سورەتە دەریخست کە ڕێی حەق و راستیی یەك ڕێگەیە و لاریی تیانییە، پەرستنی پاك و پوخت هەر بۆ خوا دەکریّ، ڕێی مامناوەند لە عەقیدەدا نییە، نەفامیی نەفامییەو ئیسلام ئیسلامەو براوەتەوە، ناتوانیت هەردوکیان لەیەککاتدا بکەیت و لە یەك دڵدا جێی بکەیتەوە، جیاوازییمان زۆرەو ئایینی خۆتان بۆ خۆتان و ئایینی خۆم بۆخۆم.

کە ئەوەش سەری نەگرت و شکستی هێنا، قورەیشەکان نوێنەری تریان نارد، بە راستی قوریش ئازاو خاوەن دیبلۆماسی و مناوەرەو سەرکەوتووبوون، دەیانویست هەموو ڕێیەك لە پێغەمبەر بگرن، نوێنەری ئەم جارە پێکهاتبوو لە عەبدوڵلای کوڕی ئومەییە و وەلیدی کوڕی موغەیرەو موکرەزی کوڕی حەفص و عەمری کوڕی عەبدوڵلا، کوڕی ئەبی قەیس و عاصی کوڕی عامر، هاتن و پێشنیازێکی تریان پێشکەش کرد، داوایان کرد موحەممەد واز لە هەندیّ جێی قورئان و ئایەت بهێنیّ، ئەوانەی کە تووڕەیان دەکات و زەمی بتەکانیان دەکات لای بیات، خوای گەورەش وەلامێکی پڕاوپڕو یەکلاکەرەوەو براوەی بۆ ناردن (... قَالَ الَّذِينَ لاَ يَرْجُونَ لِقَاءنَا ائْتِ بِقُرْآنٍ غَيْرِ هَـذَا أَوْ بَدِّلْهُ قُلْ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أُبَدِّلَهُ مِن تِلْقَاء نَفْسِي إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ) (يونس : ١٥)

ئەو نوێنەرو وتوێژانە دەریدەخات کە تاچەندە قورەیش چۆکی دانەداوە لە بەردەم خۆگریی و یەکرایی و دانەبەزینی پێغەمبەر بەرامبەر قورەیش، کە واز لە

بەشێك لە بتپەرستیی و زەعامەت و ماڵ و ژن و سەرۆکایەتی خۆیان دەهێنن و، دەیکەنە سەرکردەی دین و دنیایی خۆیان، بە مەرجێك موحەممەد لە گەڵیان یەك بێت و دژی خواکانیان نەبێ و ناوی خۆیان و خوایان نەبات، بەڵام پێغەمبەر (د.خ) دەیگوت: هەردەبێ تەسلیم بـبن و واز لە بتەکان بهێنن، جۆری داواکانیان و کەسەکانیان دەگۆڕیی، بە هەموویانەوە دەگەڕان و دەیانگوت: کێ لە هەموومان داناتر و زاناتر و قسە ڕەوانترە، با ئەوە خۆی بە تەنها بڕوات، بەڵام ئەویش دەهاتەوە دەیگوت: محەممەد قسەیەکی کردوە هەرگیز نەم بیستووە، وازی لێ بهێنن چی دەکات بابیکات.

نوێنەرانی یەکەم و نوێنەرانی دووەم جیاواز بوون، جگە وەلیدی کوڕی موغەیرە کە لە هەردووکیاندا بەشدار بوو، دەیانویست ڕووەکان جیاواز و، تواناکان و عەقڵەکان و دەنگەکان جۆرێ تر بن، بەڵکو یەکێکیان کاریگەرتر بێت. ئەنجا روویان کردە پێغەمبەرو داوایان لێکرد کاری موعجیزەیان بۆ بکات، دەیانویست گومان بۆ ئایینەکەی دروست بکەن، دەیانگوت: ئادەی لەوێدا کانیەکمان بۆ هەڵقوڵێنە، ئادەی باخێکمان لە خورما و ترێ بۆ دروست بکەو رووبار بە ناو دارو درەختەکانیدا بڕوات، با لە ئاسمانەوە شتێك بکەوێتە خوارەوە، با خواو مەلائیکە بێنە پێشوازییمان و بێنە خوارەوە، با خانوو کۆشکێکمان لە زەخرەفە و ئاڵتون بۆ دروست ببێت، ئادەی با پەیژەو پلیکانەیەك هەبێت پێیدا بچینە سەرەوە بزانین ئاسمان کەسی لێیە، با بۆ هەریەکەمان لاپەڕەیەك نامەو پەیام بێتە خوارەوە نووسرابێت لە خواوە بۆ فلان کەس، ئادەی با شاخ بڕوات، زەوی شەق ببات، مردووەکانمان زیندوو ببنەوە، ئەم داوایانە بێبڕواکان لە پێغەمبەرانی پێشوویان کردووە، پێغەمبەر دەیفەرموو: (من بۆ ئەوە نەنێردراوم، بەڵکو من لەلایەنی خواوە بەوە نێرراوم، ئاگادارم کردوون بۆچی ناردومی بۆ لاتان، ئەگەر وەریبگرن ئەوە بەشی باشتان و بەختی باشتان وەرگرتووە لە دنیاو لە قیامەتدا، ئەگەر وەرینەگرن و بیدەنەوە بە سەرمدا، ئارام دەگرم هەتا خواخۆی دادوەرییمان دەکات.

پێغەمبەر هاتەوە بۆماڵەوە، دڵ بە ئازار بوو لەوەی ئەو چی بۆ هێناون و، ئەوان چی لێداوا دەکەن و چۆن بیردەکەنەوە، ئەیانگوت: ئادەی با کێوی سەفا ببێتە ئاڵتون، ئەوسا بڕوات پێدێنین، فەرمووی جا دەیکەن..؟ وتیان: بەڵێ، دوعای کرد، جوبرەئیل هات وتی: خوا سەلامت لێدەکات، دەفەرمووی: گەر دەتەوێ سەفایان بۆ دەکەمە ئاڵتون، بەلام ئەوەی دوای ئەوە کافر ببێت، سزایەکی وای دەدەم، کەس وا سزا نەدرابێت، ئەگەر بشتەوێت دەرگای تەوبەو رەحمەت دەکەمەوە بۆیان، پێغەمبەر داوای تەوبەو رەحمەتی خوای کرد.

سەرکردەکانی قورەیش لەو داوایانە مەبەستیان بڕواکردن نەبوو، بەڵکو بۆ گەرمکردنی جەنگی راگەیاندن بوو دژی بانگەواز و خەڵەفاندن و فێڵکردن، هەتا هۆزەکان دوربکەونەوە، کە قورەیش زانیان لاوازن بەرامبەر موحەممەد و بانگەوازەکەی و هیچیان پێناکرێت، نەزری کوری حارس، تەعبیری لەو لاوازییە دەکرد پێی وتن: ئەی گەلی قورەیش بە خوا کارێکی گرنگتان بۆ دابەزیووە، ئیتر جێی فروفێڵ نەماوە، بیر لەخۆتان بکەنەوە بە خوا کارێکی زۆر مەزنتان بۆ دابەزیوە!! دوای ئەوە قورەیش بڕیاریان دا نەزری کوری حارس و عەقەبەی کوری ئەبو موعیت بنێرن بۆ لای زانا جولەکەکان لە مەدینە، هەتا حەقیقەتی ئەم بانگەوازە بزانن، نەك دوای کەون، بەلام دەیانزانی جولەکە راست نارۆن، چونکە هیچ پێغەمبەرێکیان خۆش ناوێ، نزیکبوونەوەی کۆمەڵی بتپەرستیی لەگەڵ جولەکە گونجاوە بۆ زاڵبوون بەسەر بانگەوازدا، لەگەڵ ئەمەدا زانیاری زۆریان دا بە نوێنەرانی مەککە بۆ لاوازکردنی پێغەمبەر، زاناو ئەحبارەکانی جولەکە وتیان باسی موحەممەدمان بۆ بکە و رەوشت و سیفەتەکانی و هەندێ لەقسەکانی، پاشان وتیان: ئێوە خاوەن تەوراتن، هاتووین هەتا هەواڵی هاورێکەمانمان بدەنێ، ئەحباری جولەکە وتیان: پرسیاری لێ بکەن لە سێ شت، ئەگەر هەواڵیدانێ ئەوە پێغەمبەرەو رەوانە کراوە، گەر نەیزانی، ئەوە ناتوانێ و هیچ نییە، پرسیاری لێ بکەن لە کۆمەڵە لاوێك کە لە سەردەمی کۆندا رۆیشتوون.؟ ئەوانە چی بوون و چیان بەسەرهات..؟ ئەوانە چیرۆکێکی سەرسوڕمانیان بووە. پرسیاری لێ بکەن لە پیاوێکی گەرۆك بۆ رۆژهەلات و رۆژئاوای زەوی چووە، هەواڵی ئەوە چییە..؟

پرسیاری لێ بکەن لە بارەی ڕۆحەوە..؟ ئەگەر وەڵامی دانەوە، ئەوە پێغەمبەرەو دوای بکەون، نوێنەرەکان هاتنەوە، هەواڵەکەیان بۆ قورەیش گێڕایەوە، وتیان بابچین کاری خۆمان لە گەڵ موحەممەددا یەکلابکەینەوە، چوونە لای پێغەمبەر و وتیان: ئەی موحەممەد، پرسیارمان هەیە وەڵامی بدەرەوە، سێ پرسیارەکەیان لێکرد، خوا سورەتی کەهفی بۆ دابەزاندن، کە باس لە ئەصحابی کەهف و زیلقەرنەین و خزرو موساو زۆر باسی تر دەکات. قورەیشییەکان و جولەکە سەریانسوڕما لەو هەموو هەواڵە، دوایی زانیان ئەمانە خۆ خەریککردنی زیادەیەو، هیچ چاری تیا نیە، چونکە هەتا دەهات موسڵمانان لە زۆریی و بە هێزیی و بڵاوبوونەوەدایە، قوریشییەکان کۆبوونەوە و بڕیاریاندا بە ئاشکرا پێغەمبەر بکوژن، کە ئەم هەواڵە گەیشتە ئەبوتالیب، کافرو موسوڵمانی بنەماڵەی عەبدولموتەلیبی کۆکردەوە، چوونە دەوری پێغەمبەر، هەبوو محەممەدی نەدەویست، بەڵام بۆ خێڵایەتیی و حەمیەو خزمایەتی هاتبوو، هەبوو بۆ ئیمان و بڕوا هاتبوو، کە قورەیش زانیان خزمەکانی دەوریان داوە، بڕیاریاندا قسەیان لەگەڵ نەکەن، کڕین و فرۆشتن و ژن و ژنخوازییان لەگەڵ نەکەن، سەردانیان نەکەن و لەگەڵیان دانەنیشن، هەتا پێغەمبەریان دەدەنێ بیکوژن، لاپەڕەیەکیان بۆ ئەمە نووسی، کە هەرگیز لەگەڵ بەنی هاشم ڕێکەوتن نەکەن و ڕەحمیان پێنەکەن، هەتا موحەممەد تەسلیم نەکەن بیکوژن!

بەنی هاشم سێ ساڵ لەو دۆڵەو گەمارۆیەدا مانەوە، زۆر زەحمەت و نەهامەتی و برسێتی و مەراقیان خوارد، کە شەو دادەهات داوای دەکرد پێغەمبەر بچێتە سەر جێگەکەی، هەتا ببینێ کێ دێت دەیەوێت فێڵی لێ بکات، یان نییەتی خراپی هەبێت، کە خەڵك دەخەوتن، دەستی یەکێك لەکوڕانی، یان براکانی، یان کوڕە مامەکانی دەگرت و لەسەر جێگەکەی پێغەمبەر دەیخەواندنو داوای لە پێغەمبەر دەکرد بچێتە سەر جێگەی یەکێکیان بخەوێ[1]، گەمارۆ توند بوو لەسەر سەحابەو بنەماڵەی هاشمو عەبدولموتەلیب، هەتا ناچاربوون گەڵای داریان دەخوارد، دوای

---

[1] فقه السيرة النبويه ، منيرالغضبان ، مكة المكرمة ، ص١٨٠.

سێ ساڵ چەند کەسێکی قورەیش پەیدابوون ویستیان ئەو ڕێکەوتنە بشکێنن، هشام کوڕی عەمری هاشمی چوو بۆ لای زوهەیری کوڕی ئەبوئومەییەی مەخزومی، دایکی ناوی عاتیکە بوو، کچی عەبدولموتەلیب بوو، پێیوت: زوهەیر تۆ ڕازیت خواردن بخۆیت و جل لەبەربکەیت و ژن بهێنی و خاڵوانت ئاوایان بەسەر بێت؟ بەڵام سوێند بە خوا ئەگەر من، خاڵوانی باوکم حەکەمی کوڕی هشام بوایە، تۆ داوات لە من بکردایە، وەك من داوات لێدەکەم، هەرگیز وەڵامم نەدەدایتەوە.؟ دەڵێ: ئەوە چیە ئەی هشام، چی بکەم بڵێ؟ من یەك کەسم، ئەگەر کەسێکی ترم لەگەڵ بوایە ئەوە پەیمانم دەشکاند، وتی: کەسێك شك دەبەم، وتی: کێیە..؟ وتی: من، زوهەیر وتی: سێهەمێك پەیدابکە، چوو بۆ لای موتعەم کوڕی عودەی، پێی وت: ئایا ڕازی دەبیت کە دوو ڕەچەڵەکمان لە بەنی عەبدولمەناف تیابچن و تۆسەیرکەربیت و ڕازی بیت قورەیش وابکات..؟ بە خوا ئەگەر من بمتوانیایە بە پەلە دەچووم و نەمدەهێشت، وتی: باشە ئەی چی بکەم..؟ من یەك کەسم، وتی: دووەمێکیشت هەیە، دەڵێ: کێیە..؟ وتی: من، وتی: سێ هەمێك پەیدابکە.؟ وتی: پەیدام کردووە، وتی: کێیە.؟ وتی: زوهەیری کوڕی بەنی ئومەییە، وتی: چوارەمێك پەیدا بکە، چوو بۆ لای ئەبو بەختەری کوڕی هیشام، ئەویش وتی: پێنجەمێك پەیدا بکە، چووە لای زومعە کوڕی ئەسوەدی کوری موتەلیب .. شەو هەموویان لە بەرزاییەکی دەوری مەککە کۆبوونەوە، قسەیان یەکخست بۆ دڕاندنی لاپەڕەکەی سەر دیواری کەعبە. زوهەیر وتی: من یەکەم کەس دەبم قسە دەکەم، کە ڕۆژبوویەوە خۆی گۆڕی، حەوت جار بە دەوری کەعبەدا تەوافی کرد، ئەنجا ڕوویکردە دارنەدوەو بە خەڵکەکەی وت: ئایا خواردن دەخۆن و جل و بەرگ لەبەر دەکەن و بەنوهاشمیش ئەوەتە تیادەچێ، ئێوەش کڕین و فرۆشتنیان لە گەڵ ناکەن، بە خوا دانانیشم هەتا ئەولاپەڕە ستەمکارە نەدڕێنم، ئەبوجەهل وتی: درۆت کرد، وەڵڵاهی نایدڕێنی، زەمعەی کوڕی ئەسوەد وتی: وەڵڵاهی تۆ درۆت کرد، ئێمە ڕازی نەبووین کاتێك نووسیتن، ئەبو بەختەریش وتی: زمعە ڕاست دەکات، ڕازی نین بەوەی تیانووسراوە، بڕیاریشی لەسەر نادەین، موتعەم کوڕی عودەیش وتی: قسەکانتان ڕاستەو هەرچی پێچەوانەی ئەوەبێ درۆ دەکات، لای خوا خۆمان لەوە

بەری دەکەین کە تیا نووسراوە، هیشام کوری عەمریش هەروەکو ئەوانی وت، ئەبوجەهل وتی: ئەم ئیشە بە شەو کراوەو لە جێیەکی تر راپرسیی لەسەر کراوە، ئەبوتالیب دانیشتووە لە جێیەکی مزگەوتەکەداو هیچ قسە ناکات[1]، موتعەمی کوری عودەی هەڵسا چوو لاپەڕەکە بدڕێنێ، دەبینێ خۆرە هەموو وشەکانی خواردووە، جگە (بسمك اللّهم)، پێشتر پێغەمبەر ئەبوتالیبی مامی ئاگادار کردبوو کە خۆرە نووسینی لاپەڕەکەی خواردووە جگە ناوی خوا، ئەبوتالیبیش چوو بۆ لای سەرگەورەکانی هۆزەکەی، ئەو هەواڵەی دانێ و پێیوتن: موحەممەد وا دەڵێ: ئەگەر درۆی کرد موحەممەدتان دەدەمێ بیکوژن، ئەگەر راستی کرد ئایا ئەوە ناتانگێڕێتەوە هەتا خۆتان بە سەرماندا نەنوێنن..؟ پەیمانی لێوەرگرتن، ئەوانیش قبوڵیان کرد، کە کردیانەوە دەبینن هەر ئەوەیە کە پێغەمبەر وتبووی، لەوێدا موتعەم و هشام وتیان لەو نامە بڕیارە هیچە ستەمکارە بەرین، رێگە نادەین کەس خۆمان و گەورەکانمان سوك و خراپ بکات، خەڵکی تر زۆر دایانە پاڵیان و لە دۆڵەکە هاتنە دەرەوە. دوای موسڵمانبوونی هەمزە، عومەریش موسڵمان بوو کە خاوەن شەکیمەو هەیبەت بوو، کە موسڵمان بوو لەگەڵ هەمزەدا زاڵ بوون بەسەر قورەیشدا، موسڵمانبوونی ئەم دووکەسە مەزنە دوای دەرچوونی موسڵمانان بوو بۆ حەبەشە، موسڵمان بوونیان سەربەرزی بوو بۆ موسڵمانان، داخ و خەفەت و شکستی بوو بۆ بتپەرستان، هاندەرێك بوو بۆ هاورێکانی پێغەمبەر، کە بە ئاشکرا باسی ئایینەکەیان بکەن، (ئیبن مەسعود) دەڵێ: موسڵمانبوونی عومەر فەتحێك بوو، کۆچکردنی سەرکەوتن بوو، ئەمارەتەکەی رەحمەت بوو، ئێمە نوێژمان نەدەکرد لای کەعبەدا، هەتا عومەر موسڵمان بوو، کە موسڵمان بوو شەڕی لەگەڵ قورەیش کرد، هەتا نوێژی لە پاڵ کەعبەدا دەکرد ئێمەش نوێژمان لەگەڵ کرد[2]، لە عەبدوڵای کوری عومەرەوە دەگێڕنەوە: کە عومەر موسڵمان بوو، وتی: کام قورەیشیە جوانتر رووداو دەگێڕێتەوە..؟ پێیانوت: جەمیلی کوری مەعمەری

---

[1] ص١٨٣ـ ١٨٤ السيرة النبوية، الصلابي.

[2] ابن هشام ج١ ص٣٦٥.

جومەحی، هات بۆ لای، عەبدولاّ دەڵێ: منیش دوای کەوتم، وتم بزانم عومەر چی دەکات؟ هەتا گەیشتە لای، پێی وت: ئایا جەمیل دەزانیت من موسڵمان بووم و چوومە سەر ئاینی موحەممەد، وتی: بە خوا هیچی نەوت، هەڵساو جلەکانی عومەری ڕاکێشا، عومەر دوای کەوت، منیش دوای باوکم کەوتم، هەتا لە بەردەم دەرگای کەعبەدا وەستاو، بە هەموو هێزی هاواری کرد: ئەی کۆمەڵی قورەیش، ئەوان لە یانەکەیاندا بوون لە نزیك کەعبە ـ ئایا نازانن عومەری خەتاب بووەتە گاور، وتی: عومەر کە لە دوایەوە بوو وتی: درۆی کرد، بەڵکو موسڵمان بووم و شایەتی دەدەم کە هیچ خوایەك نییە جگە ئەڵلاو، موحەممەدیش بەندەو نێردراوی ئەوە، خەڵکەکە هێرشیان کردە سەری و بووە شەڕیان، هەتا خۆر هاتە ڕاسەریان، عومەر لەهۆش خۆی چوو، لەسەر سەری وەستان، ئەو دەیگوت: چی دەتوانن بیکەن، سوێندی خوارد بە خوا ئەگەر سێ سەد کەس بووینایە، یان بۆمان جێدەهێشتن، یان پێمان جێدەهێشتن، موسڵمانان ڕۆژیان لێبوویەوە، بەڵام وەك ئەو ڕۆژانە نەبوو پێش کۆچکردنیان بۆ حەبەشە، کە نەیاندەتوانی هیچ بکەن، پشتیان بە هەمزەو عومەر دەبەست و نوێژیان لای کەعبەدا دەکرد، کە ئەوسا نەیاندەتوانی بیکەن، لە ماڵی ئەرقەم دەرچوون، بە ئاشکرا باسی خوایاندەکرد هەتا چوونە مزگەوت، قورەیش وازی لەو لێدان و ئازارە درندانەیە هێنا کە پێشتر پێیدەکردن[1]، بارودۆخ لەگەڵ ئەوەی پێش کۆچ گۆڕا، ئەم هەواڵە لە مەککەوە لە ڕێی کەشتیوانی جدەو بازرگانەکانەوە گەیشتە حەبەشە، ئەوان لە تاراوگە، غەریب و دوورە وڵات بوون، مەیلی دڵیان بۆ خاك و کەس و کارو پێغەمبەرو سەحابەکان پەیدابوو، لەم بارودۆخە نوێیەدا گەڕانەوە مەککە[2]، هەموو سەرچاوەکان گەڕانەوەی ئەوانە دەگەڕێننەوە بۆ هۆی موسڵمان بوونی هەمزەو عومەر، بەڵام

---

[1] سبل الهدي والرشاد في سيرة خير العباد: محمد بن يوسف الصالحي، ج٢ ص٤٩٨ تحقيق مصطفي عبدالواحد.

[2] تأملات في سيرة الرسول ـ د. محمد سيدالوكيل ص٥٩، دارالمجتمع ١٩٨٧. الهيجرة في القرآن الكريم ص٣٠٢ أخرمي سامعون جزولي ـ مكتبة الرشد الرياض، ١٩٩٦.

قورەیش بە شێوازی نوێتر بەرەنگاری ئیسلامبوونی هەمزەو عومەر بوویەوە، بە فێڵ و توندیی و تۆقاندن دژی موسڵمانەکان، ئەویش گەمارۆو پەیوەندیی پچڕان بوو، لەسەریان، بارودۆخ توندبوو موسڵمانەکان گەڕانەوە حەبەشە بۆ جاری دووەم، ژمارەیەکی زۆرتریان پێوە نووسا[1]، ئیبن ئیسحاق دەڵێ: بوون بە (٨٣) کەس، ئەگەر عەماری کوڕی یاسر لەگەڵیاندا نەبووبێ، ئەوە (٨٢) کەس بوون، قورەیشیەکان کە دییان سەحابەکان جێیەکی هێمنیان بۆ بووە، نوێنەریان ناردە بۆ حەبەشە کە بیانگێڕنەوە بۆ مەککە، چوونە لای نەجاشی، وتیان بە خوا ئێستا هەموو عەیبەکانیان باس دەکەین و، سەر دەکەوین بە سەر چاك و خراپیاندا، یەکێکیان وتی: هیچ مەڵێ لە بەر خزمایەتی عەیبە. ! وتی: بە خوا لەوێ دەیڵێم، ئەمانە بە عیسا دەڵێن وەك خەڵك بەندەیەو عەبدە، نەجاشی ساڵی هەشتەم یان نۆیەمی کۆچی مرد، پێغەمبەر لە مەدینەوە نوێژی مردووی لەسەرکردو فەرمووی: (مات اليوم رجل صالح فقوموا فصلوا علي أخيكم أصحمة)[2]، لە کۆچەراندا جەعفەری کوڕی مامی پێغەمبەر و عوسمانی زاوای و ڕوقیەی کچی پێغەمبەری تیابوو، کۆچەکەیان لەبەر سزاو ئازار و برسێتی و، لە ترسی فیتنەی هەڵگەڕانەوە و، بۆ سەرخستنی ئایین و بڵاوکردنەوەی، بە خۆیان و ئایینەکەیان، هەڵهاتن بۆ لای خوا، ئەوە بۆ پاراستن و پارێزگاری لە عەقیدەو ئازادی بوو، بۆ بەردان و کردنەوەو ڕزگاری بوو لە چەقبەستویی و، ئازاد کردنی بانگەواز و گەڕان بە دوای جێی هێمن و ئارامدا، بۆ ئەوە حەبەشەیان هەڵبژارد، چونکە نەجاشیی دادپەروەر و صالح بوو، جێی بازرگانی قورەیش بوو، موسڵمانەکان شارەزابوون تیایدا، وڵاتێکی هێمن و ئارام بوو، لەسەر ئایینی ئاسمانی بوون، پابەند بوون بە گاوری، کە نزیکتربوو لە ئیسلام، دەڵێن دایانەکەی پێغەمبەر ئوم ئەیمەن لە بنەڕەتدا حەبەشی بوو.

---

[1] السيرة النبوية، د. الصلابي ـ ص١٩٦ .

[2] صحيح البخاري ـ رقم ٣٨٧٧.

## ١٠ـ ئەو خاڵانەی بە درێژی وەڵامیان نادەینەوە

دکتۆر جەمال کۆمەڵێك هەڵەی تریشی کردوە لەبەر ئەوەی کە لە کتێبخانەی کوردیدا وەڵامی ئەو هەڵانە زۆر دراوەتەوەو من ئیتر کاتتان ناگرم بە وەڵام دانەوەی، هەر تەنها نیشانی دەدەم و بە چەند دێرێك لەسەر وەستان کۆتایی پێدەهێنم، چونکە زۆربەی ئەو وتانە، هەر بۆ وروژاندن و گومان نانەوەیە نەك بۆ وەڵام دانەوەو ڕونکردنەوەو شتێکی تر، واتە هەر پرسیارەو وەڵامیان ناوێ.!

دکتۆر هەر بەرامبەر پێغەمبەری ئیسلام قسەی خراپی نەکردووە، بەڵکو بەرامبەر موساو لوت و ئیبراهیم و، بەرامبەر زەینەب کچی جەحش و خەدیجە و ژنانی پێغەمبەر و زۆری تریش ڕستەی خراپ دادەڕێژێ.

اـ دکتۆر جەمال قسەی ناڕەوا دەکات بەرامبەر زەینەبی کچی جەحش و دەڵێ: "ڕۆژێك پێغەمبەر چوو بۆ ماڵی زەید سەرێکی لێبدات، زەید لە ماڵەوە نەبوو، زەینەبی ژنی بینی، کە کراسێکی جوانی لە بەردابوو، محەممەد دڵی لێی چوو، سێ جار ووتی سوبحانەڵلا لەوەی کە دڵەکان دەگۆڕێ، زەینەب ئەوەی بۆ زەید گێڕایەوە، زەید وتی: تەڵاقی دەدەم بۆ تۆ ئەی پێغەمبەری خودا، لەبەر وازهێنانی زەید لە زەینەبی ژنی، بۆ باوکی تەبەنیی خۆی کە موحەممەدە، محەممەد بۆ پاککردنەوەی هەڵوێستی خۆی، ئەم ئایەتەی بۆ دابەزی (واذ تقول للذي....)، محمد چووە لای بێ مارەکردن و ڕێکەوتن و شایەت و مارەیی"[1]. بۆ زیاتر وەڵامی ئەم برگەیە، بڕوانە ئەم سەرچاوانە. في ظلال القران، سید قطب، ج٥ دارالشروق ط٤ بیروت ١٩٧٧، ص٢٨٢٤ ـ ٢٥ـ٢٦ـ٢٩ سورة المجادلە، ایة ـ ١ـ٤،و ج٥ ، سورة الاحزاب، ص٢٦٥ ـ ٦٨، و ج٦ ،ص٣٦٠٩ ـ ٣٥٠٧

ب ـ دکتۆر جەمال چووە لە کتێبی (الغدیر) ی شیعە بوختانێکی بێ سەرچاوەی شێواوی هێناوە دژی بنەماڵەی ئەبوبەکر و دەڵێ: (لە کتێبی (الغدیر ـ المجلد الخامس ـ ص٢٠٨)دا، عروەی کوڕی زوبەیر، دایکی عروە، ئەسمای کچی

---

[1] ظهور الکرد فی التاریخ، ل ٤١٥

ئەبوبەکری صدیقە، عروە بە عەبدوڵڵای کوڕی عەباس دەڵێ: بۆ لە خوا ناترسی و موتعەکردن کەم ناکەیتەوە، گوایە ئیبن عەباس پێی وتووە: بڕۆ لە دایکت بپرسە کە ئەسمای کچی ئەبوبەکر بووە، عروە کوڕی زوبەیرەو کوڕی موتعەیە)[1]. ئەم ڕستانە هیچی وانیە، لەسەرچاوە سەرەکیەکاندا لەم بارەوە یەك دێڕت دەست ناکەوێت، بەڵام شیعە لە ڕۆژهەڵاتناسان زیاتر تێکدان و شێواندن و دەستێوەردان و هەڵەیان بە ئەنقەست دژی سەحابە کردوە، ئەوان دەیانەوێت حسین کە لە سەرخستنی مێژووی ئیسلامدا هیچ ڕۆڵێکی نەبووە، لە ئیسلامدا یەك وشەو یەك برگە نیە باس لە ویلایەتی فەقیە و ئیمامەت و مەعصومیەت و غەدیر بکات، بەڵام ئەوان دەیکەنە ئەسڵی دین و، موتعەکردن کە حەرامە، دەیکەنە فەرعی دین، هەموو ئاینیان بەو شتە پڕوپوچانەوە شێواندوە، کە لە هیچ برگەیەکی قورئان و سونەت و سیرەو ژیانی خولەفای ڕاشیدین و، هەموو سەردەمی ئەمەوی و نیوەی سەردەمی عەباسیدا، کە بە هەموویەوە دەکاتە ٣٠٠ ساڵ دوای پێغەمبەر، هیچت چنگ ناکەوێت، بەڵام دکتۆر جەمال لێی وەرگرتوون، ئەوان ڕقیان لە بنەماڵەی ئەبوبەکرە، چونکە یەکەم: ئەبوبەکر کرایە یەکەم خەلیفەو عەلی دیاری نەکرا، دووەم: زوبەیری مێردی ئەسما داواکەی حوسەینی وەرنەگرت کە وتی با شۆڕش بکەین و بچین بە گژ یەزید و ئەمەویەکاندا، عروەی کوڕی زوبەیر، کوڕی ئەسمای کچی ئەبوبەکری صدیقە، شیعە دەیکەنە کوڕی موتعەی حەرام، گوایە ئەسمای پاك و پوخت، لەکاری خراپدا ئەوی بووە، کە نهێنی کۆچکردنی پێغەمبەرو ئەبوبەکر، تەنها لای عەلی و ئەسما بوو، عەلی لە جێگەکەیدا خەوت، ئەسمایش دانرا کە مەڕەکانی بە جێپێیەکانیاندا ببات، هەتا نەیان دۆزنەوە، شیرو نانی بۆ دەبردن، عروە کوڕی زوبەیری کوڕی عەوامە، زوبەیر لە پاڵ پێغەمبەردا بە مەردی ژیا، لە هەموو عەزاکاندا بەشدار بوو، یەکێکە لەو دە کەسەی مژدەی بە هەشتیان پێدراوە، کوڕی پووری پێغەمبەرە، واتە دایکی زوبەیر، صەفیەی کچی

---

[1] ظهور الکرد، ل ٤١٦، ٤٢٠.

عەبدولموتەلیبەو، خوشکی عەبدولآی باوکی پێغەمبەرە، پێغەمبەر فەرموویەتی هەموو پێغەمبەرێك حەواری هەبووە، حەواری من زوبەیری کوڕی عەوامە، حەواری واتە پاڵپشت و سەرخەر یان پوخت، دوانزە ساڵان بوو شمشێری هەڵدەگرت، پێغەمەرو خەڵك دەیانگوت: تۆ منداڵی، ئەوە چیە.؟ دەیگوت بەرگری لە پێغەمبەر دەکەم[1].

عەبدولآی کوڕی عەباس، ئامۆزای پێغەمبەر، کە دکتۆر جەمال تاوانباری دەکات بە موتعە کردن، شیعە بە درۆ نووسیوویانە عەبدولآ قسەی بە ئەسماو عروەی کوڕی ئەسما وتووە، دکتۆر بە درۆ دەڵێ گوایە عەبدولآ وتویەتی ئەسما موتعەی کردوەو عروەش کوڕی موتعەیە، ئەوانە هەڵەیەو تاوانەو جێی لێبوردن و ڕوپۆشکردن نیە، عەبدولآ ناودارە بە حیبری ئوممەو فەقیهی سەردەم و پێشەوای تەفسیرو کوڕی مامی پێغەمبەر، سیی مانگ هاوڕێیەتی پێغەمبەری کرد (سیر اعلام النبلاء، ج٣ ص٣٣٢) کە پێغەمبەر وەفاتی کرد، ئەو پانزە ساڵ بوو، پێغەمبەر بەئوم فەزلی دایکی وتبوو: تۆ دووگیانی بە کوڕێك، کە لەدایك بوو، بیهێنە بۆ لام، ئەو دەڵێ: بۆم برد ناوی نا عەبدولآ و ناوچاوی ماچکرد، پێغەمبەر باوەشی پیادەکردو، دەیفەرموو خوایە زانست و تێگەشتن لە ئاین و شیکردنەوەی قورئانی فێربکە، (سنن الترمدی، رقم الحدیث ٣٠٠٤) خەلیفە عومەر پرس و ڕای پێدەکرد، چەند جار هەڵەی ئیمام عەلی ڕاستکردوەتەوە، عەلی سەرسام بووە بە زانستی عەبدولآ، کە فیتنەی خەوارج ڕویدا، ئیبن عەباس چوو بۆ لایان، وتووێژی لە گەڵکردن، زۆر گومانی بۆ ڕەواندنەوە، چەندجار وتوێژو ڕاگۆڕینەوە ڕویداوە، بیست هەزار خەوارجی قەناعەت پێکردو هاتنە ریزی ئیمام عەلی، لە ٦٨ ساڵیدا وەفاتی کرد[2]، ئەسمای کچی ئەبوبەکری صدیق، دایکی عەبدوڵلآی کوڕی زوبەیرە، کچی یەکەم خەلیفە و یەکەم جێنشینی پێغەمبەرە، دایکی خەلیفەی شەشەم عەبدوڵلآی

---

[1] رجال حول الرسول، سعد یوسف، دار الفجر، ٢٠٠٤ القاهرة،ص٨٩.

[2] حلیة الاولیاء، ج١ص٣٢٧، حیاة الصحابة، ج٣ ص٢٦٢. رجال ونساء حول الرسول، سعد یوسف، ص١٥٠

کوڕی زوبێره، خوشکی دایکی موسڵمانان، عائیشەی خێزانی پێغەمبەره، دواهەمین ژنی کۆچکەر بوو کە وەفاتی کرد، دە دوانزه ساڵ لە عائیشە گەورەتر بوو، کە کۆچیکرد بۆ مەککە دووگیان بوو بە عەبدوڵڵای کوڕی، بەشداریی جەنگی یەرموکی کرد لە گەڵ زوبێری مێردی، نازدارترین ڕۆژگارو یادگاری ئەو، ئەو ڕۆژه بوو کە یەکەم خزمەتی بە پێغەمبەری خوا کرد، کە لە سامناکترین ڕۆژەکانی ژیانی پێغەمبەر بوو، هەموو سەرانی قورەیش یەکدەنگ بوون، کە بە هەموویانەوە لەیەك کاتدا پەلاماری پێغەمبەر بدەن و بیکوژن، ئەسما لەو ساتە وەختەدا داوای لێکرابوو کە بەشوانی و بە بەرغەلەکانیەوە بە ڕێی پێغەمبەرو ئەبوبەکری باوکیدا بڕوات، هەتا جێپێکانیان بشێوێنێ و تێکی بدات و ئاسەواری نەهێڵێ، هەتا ئەوان وا نەزانن کە خەڵکانێك بەو ڕێوبانەدا گوزەریان کردوه، ئەسما دەیزانی کە دەبێت ئەوان جێپێکانی پێغەمبەر هەڵگرن و دوای بکەون، وە بە خەڵکی بڵێن دوای جێپێی پێغەمبەر بکەون و لێی لانەدەن، دەیزانی ئەوه بانگەوازەو لە ئاینەوەیە، کە پێ لەسەر جێ پێی ئەو دابنێن و ڕێی ئەو هەڵبگرن و نیشانی خەڵکی بدەن، هەتا هەنگاو بەهەنگاو دوایبکەون، بەڵام ئێستە کارێك بەم سپێردراوه، کە دەبێ جێپێکانیان بشێوێنێ و بیشارێتەوەو، کەس نەزانێ کە ئەمە جێپێی پێغەمبەره، یەکەم نهێنی پێغەمبەر کەوتە سەر شانی و وەك چاوی پاراستی و وەك دڵی خزمەتی پێغەمبەر و ئەبوبەکری باوکی کرد، ئەو شەوەی کە ئەوان دەرچوون، عەلی نەیدەزانی بۆ کوێ چوون، بەڵام ئەو نهێنیە بە ئەسما دراو دەیزانی بۆ کوێ چوون، هەر بۆیە کە تاریك و ڕونی بەیانی داهات، توێشەبەرەیەکی گەورە لە نانی گەرم و خورماو پێخۆری تری کۆکردەوەو کردیە پریاسکەیەکەوەو ویستی بیبەستێ، بەڵام دەمی چارۆکەکە نەدەهاتەوە یەك، شتێك نەبوو پێی ببەستێ، پشتێنەکەی خۆیشی پێی نەدەگەیشتەوه، ئەسما دەڵێ: بەباپیرەمان وت: شتێك نییە پێی ببەستم جگە لە پشتێنەکەم، باوکی وتی: بیکە بە دوو کەرتەوه و بە یەکیانەوه ببەستە، لەبەر ئەوه ئەسما ناونرا خاوەن دوو پشتێن[1]، هێشتا سەرانی بتپەرستی

[1] رواه البخاري باسناد صحيح ج٧ ص١٩٣.

مەککە بە دوایاندا دەرنەچووبون، کە ئەسما نان و شیرو خواردنی پێگەیاندن، هەتا بەشی ڕێی دوورو درێژیان بکات، پاشان ئەسما دەڵێ: کە پێغەمبەر لە مەککە دەرچوو، ئەبوبەکر هەموو پارەکانی لەگەڵ خۆی هەڵگرت، کە پێنج شەش هەزار دەبوو، باپیرم ئەبوقەحافە هات بۆ لام، نابینا بوو، وتی: ئەو کابرا بە گیان و پارەی بەجێی هێشتین و ڕۆی .؟ مەبەستی ئەبوبەکر بوو، وتم: نەخێر، خێری زۆری بۆ بەجێهێشتووین، چووم کۆمەڵێك بەردم لە شوێنێکی ماڵەکەدا کۆکردەوەو پەڕۆیەکم دا بە سەریداو باپیرم هێناو دەستیم خستە سەر پەڕۆکەو وتی: ئا ئەوەی بۆ بەجێهێشتووین، وتی: مادەم ئەوەی جێهێشتووە زۆر باشە[1]. کە ئەسما لای پێغەمبەرو باوکی گەڕایەوە، ئەبوجەهل لە ڕوی ئەسمادا ئەوەی دەخوێندەوە و دەیزانی ئەم دەزانێ بۆ کوێ چوون، چونکە بارێکی قورس لە ڕویدا دیار بوو، ویستی بیخەڵەتێنێ و نهێنی پێبدرکێنێ و شوێنەکەیان دەربخات، بەڵام ئەسما دەیزانی ئەوە لێپرسراویەتیە، تەنها دەیگوت: هیچ نازانم، ئەبوجەهل تورە بوو زللەیەکی لێدا گوارەکەی گوێی پەڕی، هەر چەندە کچێکی منداڵ بوو، بەڵام ژیرو زرت و وریابوو، هەستی دەکرد باوکی هاوڕێی کێیە[2].!!

بڕوانە ئەسماء چۆن کچێك بووە چۆن هەڵوێستێکی بووە، بەڵام دکتۆر جەمال چۆن دەیەوێت سوکی بکات، خۆی دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: کە شوومکرد بە زوبەیر، هیچی نەبوو، جگە ئەسپێك، ئاو و ئالیکم دەداو، دەچووم لە کێڵگەکەی زوبەیر دانم دەهێناو دەمهاڕی و دەمکرد بە هەویر و نانم دەکرد، ئەو ڕێگەیە، یەك لەسەر سێی فرسەخێك دەبوو، ڕۆژێك هاتمەوە دانەتۆوەکە لەسەر سەرم بوو، گەیشتم بە پێغەمبەر، کەسێکی لەگەڵ بوو، بانگیکردم، سواری وڵاخەکەی کردم، ئیتر دوای ئەوە ئەبوبەکر خزمەتکارێکی بۆ ناردم یارمەتیم بدات، ڕزگارم بوو لە بەخێوکردنی ئەسپ و تۆو هاڕین، وەك لە کۆیلەیی ڕزگارم بووبێت وابوو)[3].

---

[1] اخرجه ابن هشام في سيرة ابن هشام باسناد صحيح، ج١، ص٤٨٨.

[2] السيرة النبوية، ابن هشام ج١ ص٤٨٧

[3] رواه المسلم والبخاري ـ اخرجه احمد بسند صحيح، ج٦، ص٣٤٧.

ئـەم ژنـە دەرچـووە و ئـەو كـارە قورسـەی كـردووە و بـە هـەژاریی رازیبـووە، پێغەمبەریش بینیویەتی و دەستخۆشی لێكردووە و یارمەتیی داوە، نەیوتووە ئەوە كاری تۆ نییە بچۆرەوە ماڵەوەو دانیشە. لە ئیبن زوبێرەوە دەگێڕنـەوە كـە ئایـەتی (لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِـي الدِّينِ) (سـورة الممتحنـة : ٨ ) بـۆ ئـەسما هاتە خـوارەوە، كـە دایكـی (قوتەیلـە) دیـاریی بـۆ هێنـابوو، لەبـەر ئـەوەی دایكـی بێبڕوابـوو وەرینـەگرتبوو، ئـەم ئایەتـە بـۆ ئـەوە هاتـە خـوارەوە، قوتەیلـە كچـی عەبدولعزابوو، ئەبوبەكر لەجاهیلیدا تەڵاقی دابوو[1]. جەنگی عەبدوڵای كوڕی زوبەیرو حـەجاج بـە ناوبانگـە، حـەجاج، عەبـدوڵڵای كـوڕی ئـەسمائی گـرت، لـە مەككـە هەڵیواسی، ئەمە دایكی خەفەتبار كرد، ئەو كارە ئەسمای نابینا كرد، دوای مردنـی كوڕەكەی بە چەند شەوێك مرد، ئیمامی زەهەبی دەڵێ: "دواكەس بـوو لـە پیـاوانی كۆچـەر و ژنـانی كۆچـەر كـە مـرد" كـە بـارودۆخی مەدینـە خـراپ بـوو، هەمیشـە خەنجەرێك لە ژێـر سـەرینەكەیدا بـوو[2]، كـە حـەجاج مەككـەی گـەمارۆدا، عەبـدوڵڵا چووە لای دایكی پیری سەد ساڵە و وتی: "دایكـە، خـەڵك لای چـۆڵكردوم، خـەڵكی كەمم لەگـەڵ مـاوە، خـەڵك دەیـەوێ بـە دونیـا بمخەڵـەتێنن، مـن نامـەوێ، رای تـۆ چیە..؟" وتـی: "بـە خـوا كوڕەكـەم خـۆت باشـتر خـۆت دەناسـی، ئەگـەر دەزانـی لەسەر هەقی بەردەوام بە، هاوڕێكانـت لەسـەر ئـەوە كـوژران، رێگـە مـەدە كـوڕانی بـەنی ئومەییـە یـاری بـە گـەردنت بكـەن، ئەگـەر دنیاشـت دەوێ، تـۆ خـراپترین بەنـدەیت، خـۆت لـە نـاو بـردووەو ئەوەشـی لەگەڵتـدا كـوژراوە لـە نـاوت بـردووە" عەبدوڵڵا وتی: بە خوا دایكە هەر ئەوەش رای منە، بەڵام دەترسم خـەڵكی شـام كـە كوشتمیان یاری و شێواندن بەلاشەم بكەن، دایكی وتی: كوڕم مـەڕ دوای سـەربڕین ئازاری كەوڵكردن ناچەژێ، لەسەر بەرچاوڕوونیی خۆت بەردەوامبە و پشت بـە خـوا ببەستە[3]. كە خوا حافیزی لێكردو باوەشی پیاكرد، دەستی كـەوت لـە قەڵغانەكـەی

---

[1] رجال و نساء، ص٤٨٢. نساء حول الرسول ـ ص١٨١.

[2] الطبقات، ابن سعد، ج٨ ص٢٥٣

[3] نساء حول الرسول، ص١٨٤.

وتـــی: ئەمـــە چـــییە عەبـــدوڵڵا . ؟ ئەمـــە شـــتێكیی دەوێ و تـــۆ شـــتێكت دەوێ. ؟ قەڵغانەكەی فڕێداو چووە شەڕ تا كوژرا، حەجاج داوای كـرد، لاشـەكەیان هەڵواسـی و، چـوو بـۆ لای ئـەسماو وتـی: دایكـە .. ئـەمیری موسـڵمانان داوای لێكـردون چ كارێكت هەیە..؟ وتی: من دایكی تۆ نیم، دایكی ئەو قەنارەدراوەم و كارم بـە ئێـوە نییە، بەڵام لە پێغەمبەرم بیستووە كە لە سەقیف درۆزنێك و موبیرێك دەردەكـەوێ درۆزنەكەمان بینی كە (موختار) بوو، بەڵام موبیرەكـە تـۆی. حـەجاج وتـی: بینیـت چیم بە كوڕەكەت كرد، ئەسما وتی: چیت كرد.؟ دونیای عەبدوڵڵای كورمت تێكـدا، ئەویش ئاخیرەتی تۆی تێكدا[1]، شیعە پێیـان ناخۆشـە كـە ئەبوبـەكر ئـەو پلەیـەی هەبوو لای پێغەمبەر، وە ئەسماش ئەو هەڵوێستە مەردانەی نوانـدوە لـە مێـژوودا و پلەو بایەخ بە ئـەسما دراوە، عەبـدوڵڵاو ئـەسما دژی بـەنی ئومەییـە بـوون، دەبـوو شیعە خۆشیان بویستایە، بەڵام مادام كچی ئەبوبەكرە، كە لە عەلی بـە هەڵوێسـتتر و ناودارتر و نزیكتر بووە لە پێغەمبەرەوە، ئەو رقەیان لێی هەیە، شیعە چـییان بـە ئەسماو باوكی ئەسماو كوڕی ئەسما كردوە لە مێژوودا، سەد ئەوەنـدە شـێواندنیان لە مێژووی ژیانی عائیشەدا كردوە، چـونكە كچـی ئەبوبـەكر بـووە. ! كـە دوژمنـانی ئیسلام بۆیان دەركەت بەشێوازی جەنگ و هەرا و ئاگر و ئاسن هیچیان بـۆ ناكرێـت بەرامبەر ئیسلام، كەوتنە هێرشـی ناشـیرینكردن و بوختـان و هەڵبەسـتن و فێـڵ و تەڵەكەی سووك و نزم دژی ژیانی سـەردارانی ئیسـلام، رقێكـی رەشـییان بەرامبـەر ئیسـلام و پێغەمبەرەكـەی رشـتووە، ئەوەشـی دەیڵـێن پشـت بـە سەرچـاوەی بڕواپێكراو نابەستن، بەوەندەی قسە دەهێنن. ! !

ج ـ دكتۆر جەمال دەڵـێ: (ژنهێنـان نـاوخۆیی بـووە، بـەوەی ئیـبراهیم بەفیرعـەنی وتوە سارە خوشكیەتی و لەهەمانكاتدا ژنیەتی، لوت پێغەمبەر پەیوەندیی جنسـیی لەگەڵ دوو كچەكەی خـۆی كـردووە،)[2] ! دكتـۆر دەیـەوێ لـەژێر لێـوەوە بڵـێ، لـەو

---

[1] الطبقات ـ ابن سعد ـ ج٨ ص٢٥٤ . نساء ورجال ـ ص١٨٥.

[2] ظهور الكرد فی التاریخ، ص٤٢٠ و ٤٢١

سەردەمانەدا، پێغەمبەران، خوشك وكچی خۆیان مارەكردوە، ئەم وتە نابەجێیە پێویست بەوەڵامدانەوە ناكات، بەوەندەی دوعای شەڕ لەپەنجەی دكتۆر بكەین! !

د ـ دكتۆر جەمال دوای ئەوە گومان لە ڕەچەڵەكی پێغەمبەردا دروست دەكات، گومان لە باوكی موحەممەد و لە ناوی باوكی موحەممەد و لە ناوی موحەممەد و لە لەدایكبوونی موحەممەددا دروست دەكات، وەك پێشتر وەڵام درایەوە، ئەنجا دێتە سەر خەدیجەی خێزانی و دەڵێ: بە كورتی (خەدیجە كچی مامی قس وەرەقە كوڕی نەوفلە كە وەرگێڕی ئینجیلە، پێشتر شووی بە دوو كەس كردووە، دوایی شووی كرد بە قثم (واتە موحەممەد) كە بیست و پێنج ساڵ بوو، بە ویستی خۆی هێناویەتی، خەدیجە لەو گەورەتر بوو بە (١٥) ساڵ، لەوانەیە تاكە قسە كە بۆچی موحەممەد ژنی تری بەسەر خەدیجەدا نەهێنا هەتا مابوو، لە زانیاریەكانی ئینجیلەوە بووبێ، كە دەڵێ: دەبێ هەر پیاوێك یەك ژن و هەر ژنێك یەك پیاوی هەبێ، لەگەڵ ئەو جیاوازییەی كە لە تەمەندا هەیان بوو، كە موحەممەد ناوی خەدیجەی دەبرد، زۆر جوان و بەڕێز ناوی دەهێنا و باسی دەكرد)[١].

دكتۆر باسی مەزنیی هەستی موحەممەدی كردوە بۆ خەدیجە، كە یەك ژنی بووە، (١٥) ساڵ لە خۆی گەورەتر بووە، خۆشی ویستووە، ژنی تری بەسەردا نەهێناوە هەتا مردووە، خەدیجەش ماڵ و موڵكی خستوەتە بەردەست موحەممەد، دوای وەحیەكە و تێكچونی باری دەروونی پێغەمبەر، خەدیجە ژنێكی وا بووە، دڵی مێردەكەی هێناوەتەوە و ڕاگیریكردووە، بردوویەتی بۆ لای شارەزا دەروونیی و ئایینەكەی ئامۆزای كە وەرەقەبوو، خەدیجە هەر لە بنەماڵەی خۆیدا كێشەی دەرونی محەممەدی چاركرد، هەواڵەكەی نەبردە دەرەوە، دكتۆر ئەم هەڵوێستە وەسف دەكات بۆ ئەوەی شتێكی نهێنی لە ژێردا بشارێتەوە، كە گوایە موحەممەد گوێی لە ئایینی گاور گرتوەو، ڕەنگە لەسەر ئایینی گاور بووبێت و پاشتر لە سەر كێشەیەك لە گاوری لای داوەو ئایینی ئیسلامی دروستكردوە.

---

[١] ظهور الكرد، ل ٤٢٢.

له سەرچاوە سەرەکیە یەکەمەکاندا خەدیجە بە مێردەکەی نالێ ئەو (قس)و گاورە، دەڵێ ئەو زانایەو شارەزای ئایینەکانە، لە هەموو هۆز و گەل و شارێکدا شارەزاو قسەخۆش و هەقایەتزان هەبووە، کە شارەزای چیرۆکە ئایینیەکان بوون و، باس و خواسیان بۆ خەڵك گێڕاوەتەوە، ئەمیش یەکێك بووە لەوانە، هیچ سەرچاوەیەك نییە بڵێ محەممەد گاور بووە و سوودی لە گاور وەرگرتووە، ئەو فەزڵی باپیر و مامی و کەسوکاری زۆر لەسەر بووە، گەر شتێکی بکردایە دەچووە سەر ئایینی ئەوان.

پاشان دکتۆر درێژە بە قسەکانی دەداو دەڵێ: (لەسەر بنەمای ئەو راستیە)، کە گوایە ئەو وتە درۆیانەی کە پێشتر وتنی هەموو ڕاست بووە، پاشان دەڵێ: (خەدیجە موحەممەدی بەشدار کرد لە سامانی خۆی لە بازرگانییەکەیدا کاتێك بەرپرسیاری چوار حوشتری دایە، لە کۆتاییدا سێ ساڵ پێش کۆچکردنی بۆ مەدینە پێی راگەیاند کە بووەتە پێغەمبەر، ئەویش بڕوای پێکرد، ئیتر دوای ئەو ماوەیە خەدیجە وەفاتی کرد، بەڵام دوای مردنی (خەدیجە) بە ماوەیەك، موحەممەد ڕای خۆی بەرامبەر ئافرەت بە ئاشکرا دەرخست (ئەو کاتە تەمەنی پەنجاساڵان بوو)، لە بارەی ڕای ئەوەوە بەرامبەر ئافرەت وتی: (گەلێك سەرکەوتوونابێت کە ئافرەتێك سەرۆکاریان بکات)[1].

لێرەدا دکتۆر کۆمەڵێك هەڵەی مێژوویی دەکات و دەڵێ: خەدیجە پێش کۆچکردنی موحەممەد بۆ مەدینە بە سێ ساڵ موسڵمان بوو، ئەوە هەڵەیە، یەکەم کەس کە موسڵمان بوو خەدیجە بوو، واتە سیانزە ساڵ پێش کۆچی محەممەد بۆ مەدینە نەك سێ ساڵ.!

ژنهێنانی گەورەو بچوك و بێوەژن، لەسەردەمی مەککەو ناوچەکەدا باو بووە، لەو ناوچەیە کچ زۆر زوو باڵق دەبوو، ئەگەر کوڕێك ئافرەتێکی بە دڵ بوایە، بیست ساڵیش لە خۆی گەورەتر بوایە مارەی دەکرد، زۆر جار گەورەکانی مەککە، گەر لە

---

[1] ظهور الكرد، ل ٤٢٢.

دووریش بوایه، بێوەژنێك هەبوایە جوان و خاوەن کەسایەتی و بنەماڵە بوایە، دەیان هێنا، پێشتر زۆرم لەوانە باس کردوە لە ڕەچەڵەکی پێغەمبەردا، ئەوسا گرفتی ژن هێنان و تەلاقدان وەك ئەمڕۆ نەبووە، ئاسانترین مامەڵەبوو، هەرکەسیان بە دڵ بوایە تەمەنی هەرچەن بوایەو چەند منداڵیشی هەبوایە مارەیان دەکرد، وەك ئەمڕۆ نەبووە، کە کەسێك بە ژنێکەوە چل پەنجا ساڵ قەتیس بمێنێ، گەر سەد کێشەشی هەبێت، هیچ دەرەتانێکی نیە خۆی ڕاچڵەکێنێ، یان ژنێك پیاوەکەی بە دڵ نیە، بەڵام لەبەر قسەی ئەم و ئەوو، لە ترسی حەیاچوون وماڵە باوکانی، سیی چل ساڵ زوخاوو مەینەتی و ئاخ و ئۆف دەنۆشێ. ! !

قەدەری خوا وابوو کە خەدیجە لە تەمەندا لە محەممەد گەورەتر بوو، خاوەن ئەزموون بوو، گەر لە پێغەمبەر بچوکتر بوایە، تەحەمولی زەحمەتی وەحی و کار بۆ وەحی و پێشوازیی لەبڕیارەکانی وەحی و گرفتەکانی بەر ڕێی محەممەدی نەدەکرد، هەر بۆیە کە وەحی دابەزی خەدیجە یاریدەدەرێکی زۆر باش بوو بۆ موحەممەد، کە شەوی یەکەمی وەحی موحەممەد هاتەوە، وتی: من شتێکم بەسەر هاتووە، خەدیجە وتی: ئەی کوڕی مامم، دامەزراو بە، خوا هەرگیز خراپەی بۆ تۆ ناوێ، موحەممەد لە خۆی دەترسا، بەڵام خەدیجە هیمەت و توانای وەبەرخستەوە، خەدیجە چاکەکانی موحەممەدی خستە ڕووی ووتی: خوا هەرگیز تۆ سەر شۆڕ ناکات، تۆ سەردانی کەسوکارت دەکەیت، قسەت جوانە، خەفەت بۆ خەڵك دەخۆی، یارمەتیی لاواز و هەژار دەدەیت، مافی هەموو کەس دەدەیت و لەسەر حەق سووریت، موحەممەد بە قسەکانی خەدیجە دامەزراو هێوور بوویەوە، خەدیجە بەوە وازی نەهێنا، ئەو شەوە خەواندی، کە ڕۆژ بویەوە، بۆ ئارامکردنەوەی زیاتری دڵی و یارمەتیدانی مێردە نازدارەکەی، سەردانی کەسێکی شارەزای لە بواری دەروونی و ئایینیەکان پێکرد، بردیە لای وەرەقەی کوڕی نەوفەل کوڕی ئەسەد کوڕی عەبدولعوزا، کوڕی مامی خەدیجە، کەسێك بوو لە سەردەمی نەفامیدا بووبووە مەسیحی و کتێبی عیبرانی و ئنجیلی دەنووسیی،

پیاوێکی پیر بوو نابینا بوو[1]، وەرەقە زانابوو چاوەڕوانی دوا پێغەمبەری دەکرد سەر هەڵبدات، وەرەقە وتەو شیعری هەیە کە چاوەڕوان بوە ئەو پێغەمبەرە لەو ناوچە سەر هەڵبدات[2]، وەرەقە موسولمانبوو پێغەمبەر شایەتی بۆ دابوو بە بەهەشت[3]، ئەویش هەر هەمان قسەکانی خەدیجەی سەلماندو بۆی دوپاتکردەوە، سوێندی بۆ خواردو مژدەی دایە کە نەك شتی خراپت بەسەر نەهاتووە، بەڵکو شتی باشت بەسەر هاتووەو گەورە بوویت، هەر ئەو کەسە (ناموس، جبریل) هاتووە بۆ لای تۆ، کە پێشتر چووە بۆ لای موساو پێغەمبەرانی دیکە، خۆزگەی دەخواست کە ئەو لاو بوایە کاتێك لە شار دەری دەکەن، لە گەڵی بوایەو یارمەتی بدایە، فەرمودەیەك هەیە کە ئەو موسوڵمان بووە، نەك محەممەد لەوی وەرگرتبێت وەك دکتۆر باسی دەکات. ! ! .

خەدیجە لە گەڵ محەممەد نەهات بۆ مەدینە، بەڵکو لە دوای رووخانی گەمارۆی شیوی بەنی تالیب بە شەش مانگ، ئەبوتالیب مرد، پاشان خەدیجە مرد، پێش کۆچکردنی بۆ مەدینە[4].

د ـ پاشان دەڵێ: "لە ناو مەککەدا بە سانایی (زینای پیرۆز) هەبوو، بە تەواوی نەدەزانرا باوکی وەلید کێیە، ئەبو مەنسور، ئەحمەد کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیبی تەبرسی لە بەشی (بەگژاچوونی ئیمام حەسەن لە دانیشتنی معاویە) دا دەڵێ: ئەو زینایە لە سەردەمی ئیسلامدا بەم جۆرە بوو (نیکاحی ستەمکاران ـ

---

[1] البخاری، کتاب بدء الوحی ، رقم: ٣. السیرة النبویة، الصلابی ،ص٧٣

[2] سیرة ابن هشام، ج١ ص١٩١

[3] المستدرك ج٢، ص٦٠٩ ورواه ابو یعلی برقم ٢٠٤٧ مجمع الزوائد، ج٩ ص٤١٦. السیرة النبویة، الصلابی ،ص٨١

[4] الاصابة في تمیز الصحابة، العسقلانی، ج٨ ص٦٢ دارالمكتب العلمیة . سیر اعلام النبلاء، الامام الذهبی ج٢ ص١١٧، مؤسسة الرسالة. نساء حول الرسول ـ محمود مهدي ومصطفي ابو النصر ـ ص٤٤ دار ابن كثیر ـ بیروت ط ١٢ ٢٠٠٥.

بەغایا ـ دوو جۆر بووە، لەوانەیە دایکی عەمری کوڕی عاص لە شێوەی دووەمیان بێت، لە نیکاحی بەغایا)"، ئەو دەڵێ: "چوار کەس چوونەتە سەر جێگەکەی (دایکی عەمر)، کە عاص و ئەبولەهەب و ئومەییەی کوڕی خەلەف و ئەبوسوفیان کوڕی حەرب بوون، هەموویان پاگەندەیان دەکرد کە باوکی عەمرن، بەڵام لکێنرا بە عاصەوە، وتیان بۆچی عاست هەڵبژارد.؟ وتی: چونکە خەرجی بۆ کچەکانم دەکرد و بە خێوی دەکردن، لەوانەیە لە بەشی یەکەم بێت کە دەڵێ: لکێنرا بە عاصەوە، چونکە زیاتر لەو دەچوو، لەم راستییەوە ئیمام حسێن بە عەمری کوڕی عاصی وت ( بەڵام تۆ ئەی عەمری کوڕی عاصی شانی نەفرەت لێکراوی وەجاخ کوێر، تۆ یەکەمجار سەگ بوویت، دایکت ستەمکار بوو، لەسەر جێگەی زۆر کەس لە دایك بوویت و زۆر پیاوی قورەیش دەیانوت کوڕی ئێمەیە) ئەم راستیە لە مێژوودا ئاشکرابوو، دوای ئەوەی عەمر لەگەڵ هەندێ لە صەحابە، کەسێکیان بە ناوی عەبدولڕەحمانی کوڕی مسلم نارد بۆ کوشتنی علی کوڕی ئەبی تالیب، باوکی حسێن لە کوفە)".

سەرەتا تا کۆتایی ئەم چیرۆکە درۆ و هەڵبەستراوە، شیعەکان لەچەند کتێبی خۆیاندا دروستیانکردووە، دەنا لە سەردەمی ئیسلامدا بە هیچ جۆرێك زینای پیرۆز نەبووە، نووسەرێك نەبووە بەناوی ئەحمەدی توسی کە کتێبی نووسیبێت، لە شاری مەککەدا ئەو چەلەحانەی نێوان حەسەن، یان حسێن لەدانیشتنی معاویەدا نەبووە، هەرگیز حسێن نەگەیشتوەتە مەجلیسی معاویە، هەتا ئەو قسەیە بکات، حسێن زۆر بە ئەدەب بووە، هەرگیز زاتی نەکردووە نەفرەت و زیناو وەجاخ کوێر و بوختانی وا بخاتە دوای عەمری کوڕی عاصی خۆشەویستی پێغەمبەر، لە مێژوودا، هەرگیز عەمر دەستی لەکوشتنی عەلی و حسێندا نەبووە، سەیرم لە دکتۆر جەمالی لێکۆڵەر دێت، کە ئەم درۆیەی شیعە دەهێنێ و بە کوردی سوننەی دەفرۆشێت، نازانم ئەمە چ سوودێکی تیایە بۆ مێژووی کورد، شێوازی زانستیی نابینێ لەم باسەدا، هەواڵی ناڕاست و درۆ دەهێنێ لە گاورو جولەکەو شیعەو رۆژهەڵاتناسانەوە و بە کوردی دەفرۆشێتەوە، دوو جار دەڵێ: (لەم راستیەوە بۆمان دەردەکەوێ)

بێئەوەی ڕووداوی وا ڕویدابێ، هەر بەوەدا دەزانیت کە هیچ ڕاستیەك لە وتەكانی دكتۆری درۆزندا نیە، كالآی ئەو تەنها درۆهێنان و درۆ دروستكردن بوە، كاسبیەكی هیچ و بەتاڵ و ڕەنج بەخەسار، پێش مـن، دوو نووسەر، درۆی زۆری ئەویان دەرخست و پوچەڵیانكردەوە. ! !

با ئێمە بزانین عەمر كێیە، شیعە لەسەر چی دژایەتیی دەكەن. ؟

ناوی عەمر كوڕی عاصی كوڕی وائیلی سەهمیە، لە حەبەشە لای نەجاشیی موسڵمان بوو، پاشتر كۆچیكرد بۆ مەدینە، لە مانگی سەفەری ساڵی هەشتی كۆچی، لەگەڵ خالیدی كوڕی وەلید پێكەوە چوون بۆ لای پێغەمبەر، عەمر دەڵێ: یەكەم جار خالید موسڵمان بوو و بەیعەتی دا، پاشان منیش چوومە بەردەمی پێغەمبەرو وتم: من بەیعەتت دەدەمێ خوا لە هەموو گوناهی لەوەو پێشم خۆش ببێت. ؟ پێغەمبەر فەرمووی ئەی عەمر بەیعەت بدە، چونكە ئیسلام بوون، هەموو گوناهی لەوەو پێش پاك دەكاتەوە.[1] پێغەمبەر سوپایەكی كۆكردەوە بە سەركردایەتیی عەمری كوڕی عاص و ناردی بۆ ناوچەی زاتی سەلاسل، سێ سەد سەحابە لە كۆچەران و پشتیوانانی لەگەڵ بوو، پاشتر پێغەمبەر ئەبو عوبەیدەی كوڕی جەراسیی بۆ نارد بۆ یارمەتیی[2]، باشوری شامی پاككردەوە، خەڵكێكی زۆر لەو خێڵانە موسڵمان بوون، عەمر دەڵێ: پێغەمبەر ناردی بە شوێنمداو فەرمووی: جلەكان و چەكەكەت هەڵگرەو وەرە بۆ لام، كە چووم، فەرمووی دەمەوێ بە سوپایەكەوە بتنێرم (واتە بۆ جەنگی زات سەلاسل) كە پێشتر باسكرا، پێغەمبەر فەرمووی: (موسوڵمانترین كەس و بە بڕواترین كەس عەمری كوڕی عاصە)[3] لە جێیەكی تردا فەرموویەتی: (دوو كورەكەی عاص ئیماندارن، عەمرو هیشام) جارێك خەڵكی مەدینە ترسابوون بڵاوەیان لێكردبوو، عەمرو سالم چووبوونە مزگەوت بە

---

[1] مسلم ـ كتاب الایمان ـ رقم ١٢١.

[2] ابن هشام ج٣ ص٢٨٠.

[3] (سلسلة الاحادیث الصحیحة ـ ج١ ص٢٣٨ العدد ١٥٥) (الطبقات ج٤ ص١٩١).

شمشێرەکانیانەوە دانیشتبوون، کە پێغەمبەر چوە مزگەوت و ئەوانی بینی، چووە ناو خەڵکەکە و فەرمووی: خەڵکینە بۆ تۆقاون، بۆ وەك ئەو دوو پیاوە بڕوادارەتان نەکردووە .؟[1] ، عەمر دەڵێ: لەو ڕۆژەوە من و خالید پێکەوە موسڵمان بووین، پێغەمبەر کەسی بە ئێمە نەدەگۆڕیەوە، تەلحە دەگێڕێتەوە کە لە پێغەمبەری بیستووە فەرموویەتی: عەمری کوڕی عاص لە ساڵحەکانی قوڕیشە.[2]

کە پێغەمبەر عەمری کوڕی عاصی نارد بۆ بەحرەین، سێ جار فەرمووی (ڕەحمەتی خوا لە عەمر، وە فەرمووی: عەمر لای خوا خێری زۆری هەیە)[3] ، پێغەمبەر عەمری نارد بۆ بانگکردنی هۆزی جیفرو عباد، موسڵمان بوون، کە پێغەمبەر وەفاتی کرد، ئەبوبەکر، عەمری کوڕی عاصی بە سوپایەکەوە نارد بۆ فەلەستین و ئەبوبەکر سەر پشکیکرد، عەمر نامەیەکی بۆ ئەبوبەکر نووسی: من تیرێکم لە تیرەکانی ئیسلام، دوای خوا، تۆ بوکوێی دەتەقێنی و کام لا توندتر و ترسناکترو چاکترە، بۆ ئەوێم هەڵبدە، لە جەنگی یەرموکدا عەمر لەسەر هێزی دەستە ڕاست بوو، لە گرتنی شامدا بەشداریی کرد، بیسان و تەبەریە و ڕەفەح و قودسیان گرت، کە لە شام بوونەوە، عومەر داوای لێکرد بە سوپاکەیەوە بچێت بۆ میسر، عەریش و فستات و بابیلیون و عسیق و شمس و دمیات و ئەسکەندەریە و، هەموو میسر و بەشێك لە لیبیای گرت، عومەر سەرکردایەتی ئەو ناوچەیەی بەخشیە عەمر، عەمر بووە یەکێك لەنزیکەکانی عومەرو جێی پرس و ڕای، کە عومەر وەفاتی کرد و عوسمان هات و خراپکاران گەمارۆی عوسمانیاندا، عەمر مەدینەی جێهێشت و وتی: بە خوا بە خوا، هەر کەس لەم شارەدا بێ و بیەوێ ئەو پیاوە بکوژێ، خوا سەر شۆڕی دەکات، ئەوەی نەتوانێ یارمەتیی بدات با ڕاکات، لەگەڵ عەبدوڵلاو موحەممەدی کوڕی وخەڵکی تر لەشار دەرچوون و لەگەڵیدا

---

[1] مسند الامام احمد ص٢٠٣ .

[2] سنن الترمذي ـ رقم ٣٨٤٤.

[3] (علي بن ابي طاليب ـ د.الصلابي ـ دارالمعرفة لبنان ص٤٩٩ ـ ٢٠٠٥).

ڕۆشتن[1]، کە عوسمان کوژرا، زۆری بۆ گریاو وتی: "هاوار بۆ عوسمان، سەرەخۆشی لە حەیاو ئایینی دەکەم". عەمر ڕۆیشت هەتا گەیشتە دیمەشق، ئەمەیە چیرۆکی راستیی و پاکی عەمر، نەك ئەو قسانەی کە بە ناویەوە نووسراوەو، بە دەستی شیعە خزێنراوەتە ناو باسەکانی واقیدی و تەبەریەوەو، هەندێ نوسەری پێ خەڵەتاوە، ئەو مەدینەی جێهێشت کە زانی ناتوانێ بەرگری لە عوسمان بکات، لە سەردەمی عەلی کوڕی ئەبی تالیبدا لە شورادا بوو، پاشان چووە پاڵ معاویە بۆ تۆڵەسەندنەوە لە بکوژانی عوسمان[2].

دوای ئەوەی کە شەڕی سەفین لە نێوان علی و معاویە دا ڕوویدا، هەندێ کەوتنە نێوانیان، کە ڕێکەوتن مۆر بکەن، هەردوولا ڕێکەوتن کە یەکی کەسێك دیاریی بکەن وەك حەکەم و ڕێکەوتنەکە مۆر بکەن، چی بەرژەوەندیی موسڵمانانی تیایە بیکەن، معاویە عەمری کوڕی عاسی دیارییکرد و، عەلیش ئەبا موسای ئەشعەری دیاریکرد، لە دومەی جەندەل لە مانگی رەمەزانی ساڵی (٣٧) ك دا ڕێکەوتن مۆر کرا، ئەم دوو کەسایەتیە ناودارەو صەحابیە گرنگە، بەڵگەنامەیەکی مێژوییان مۆرکرد، کە لە بەرژەوەندیی موسڵمانان بوو، هیچ وەلایەکی تیانەبوو بۆ عەلی و معاوییە، زۆر ڕاستگۆیانە و دڵسۆزانە بە وردیی و کارامەیی نووسراو مۆر کراو، هەردووکیان ئیمام عەلی و معاویە لەسەری ڕازیی بوون، ئەم کارە چاکە، دواتر شیعە لە سەردەمی عەباسیەکاندا دەستیان تێخست و، ڕق و تووڕەیی خۆیان ڕشت بەسەر عەمری کوڕی عاصدا، وتیان: ئەگەر عەمر بە سیاسەتی حەکیمانە و وردی، ئەو کێشە گەورەیەی چارە نەکردایە و بمایەتەوە، پاشتر لەبەرژەوەندیی عەلی و شیعەی عەلی دەبوو، شیعەکان گلەیی زۆریش لە ئەبوموسای ئەشعەری دەکەن، کە لاواز بووە و خەڵەتاوە بە سیاسەتی و لێزانی عەمرو، نەیتوانیوە ڕای خۆی فەرز بکات، بەڵام ئەوان دوای ڕێکەوتن، بەڵگەنامەکەیان خستۆتە بەردەستی

---

[1] عمر بن العاص. منير الغضبان ـ ص٤٦٤

[2] (عمر بن عاص ـ الغضبان ـ ص٤٨٩ ـ ٤٩٢).

عەلی و معاویە، ئەوانیش رازی بوون و گەڕاونەتەوە شوێنی خۆیان، خەوارجەکان بەو ڕێکەوتنە رازی نەبوون، شیعەش دواتر لەسەر بنەمای خەوارج دروستبوون، خەوارج بەرەی عەلیان تەواو چۆڵکردو رۆشتن و، بڕیاریاندا عەلی و معاویەو عەمری کوڕی عاص بکوژن، رێکەوتنیان نووسی ولات لەم سیانە پاك بکەنەوە، یان دەبێ ئەو سیانە بکوژن یان خۆیان لە پێناویدا بمرن، شمشێرەکانیان هەڵگرت[1]، ئیبن مەلجەمی موڕادی کە دانرابوو بۆ عەلی، بە چەند کەسێکەوە عەلیان کوشت، بەرك کوڕی عەبدوڵلا کە دانرابوو بۆ کوشتنی معاویە، ئەو شەوەی لە عەلی درا لە معاویە بدرێ، بەڵام پێش گەشتنیان، هەواڵ درایە معاویەو نەتوانرا بکوژرێ، عەمری کوڕی بەکر دانرا بوو هەر لەو شەوەدا عەمری کوڕی عاص بکوژێ، بەڵام چونکە بکوژ تووشی سك ئێشە بوو بوو، نەیتوانی بچێت بۆی، داوای لە کەسێکی تر کرد بوو ئەو کارە بکات، بەڵام بە هەڵە کەسێکی تری کوشتبوو، گیراو نهێنیەکەی ئاشکرا کرد و کوشتیانەوە[2]!

ناشیرینکردنی ئەم کەسە بڕواداره مەزنە لەلایەن شیعەوە بۆمەبەستێك بوو کەوتمان، بەڵام نازانم بەچ هۆیەکەوە دکتۆر جەمال دەکەوێتە ئەو هەڵە زەقەوە، قسەیەکی دروستکراو دەهێنێ، کە نە حسێن هەرگیز لە مەجلیسی معاویەدا دانیشتوە، هەتا دڵی هاتبێ لەعنەت لە عەمر بکات و بە سەگ ناوی بەرێ، وە نە دایکیشی کاری وایکردووە، نە عەمریش وەجاخ کوێرە، چونکە وەك باسم، کرد دوو کوڕی هەبووە جگە لە کچ، بە ناوەکانی عەبدوڵلاو موحەممەد[3].

زوهەری دەڵێ: لە دەرکەوتووترین پیاوانی قوریشە لە ڕاو بۆچووندا[4]، عەمر دەڵێ: بە خوا من لە هەموو کەس بە شەرمتر بووم بەرامبەر پێغەمبەر، هەرگیز

---

[1] تأرخ الطبري - ج ٦ ص٥٩ . علي بن ابي طاليب - الصلابي - ص٧٣٩ .

[2] تأريخ الطبري ج٦ ص٦٥.

[3] عمر بن العاص - الغضبان، ص٤٦٤.

[4] سير اعلام النبلاء - ج٣ ص٥٩.

چاوم لە سەیرکردنی تێری نەدەخوارد[1]، عومەر پێیوت: (نابێ ئەبو عەبدوڵڵا بەسەر زەویدا بڕوات، دەبێ ئەمیر بێت)[2]، عەمر لەو فیتنەی کە رویدا وتی: ئێمە هەر ئەوە دەڵێین کە پیاو چاکەکە وتی: (ئەوە فیتنەیە، دەستمان لێی پارێزراوە با زمانیشمان لێی پارێزراو بێت)[3]، لە سەرەمەرگدا ئاوا وەسفی گیانکێشانی دەکرد (وەکو کێوی فلان، لەسەر قورگم بێت، وەکو لە ناو سکمدا پڕ بێت لە درك، وەکو رۆحم لە کونە دەرزییەوە دەربچێت، وایە )[4]، بەردەوام هەتا گیانی دەرچوو هەر لائیلاهە ئیلەلای دەکرد[5]، شەوی جەژنی قوربان، ساڵی ٤٣ك لەمیسر مرد، تەمەنی سەد ساڵ دەبوو[6].

ئەمەیە ژیان و مردن و جیهادی ئەو ناودارە، بەلام چونکە نەیدایە پاڵ ئیمام عەلی، شیعە ئەو هەموو بەیتو بالۆرەو بوختانەیان بۆ دروست کردووەو، دکتۆر جەمالیش بێ بەدواداچوون نەزانانە زانیارییەکانی هێناوە..

هـ - دکتۆر باسی ژن و مافی ژن دەکات و، دژی ئیسلام و پێغەمبەر چەند ڕستەیەك دەهێنێتەوە، گەلێك وتەی محەممەد بۆ کاتێکی تایبەت و ڕوو بە یەك کەس و بۆ مەبەستێك بووە، کە شەڕی نێوان پاشاکانی فارس بوو ئافرەتێك بووە پاشایان، بتپەرستەکانی حیجاز پێیان خۆش بوو، بەلام ئەو ئافرەتە سەرکەوتوو نەبوو، چەند مانگێك حوکمی کرد، بۆی نەچوو بەرێوە کوشتیان، پێغەمبەر بۆ ئەو دۆخە سیاسیەی ئەو کاتە ئەو وتەیەی فەرموو، نەك بۆ خودی ئافرەت. ! بەلام

[1] مسند الامام احمد - ج٤ ص٢٠٤.

٧١( رجال ونسا ء حول الرسول، سعد يوسف ابو عزيز - ص٣٤٦ دارا لفجر للتراث - القاهرة - ٢٠٠٤)

[3] ( رجال ونسا ء حول الرسول، سعد يوسف، ص٣٤٩)

[4] ابن سعد ج٤ ص٢٦٠.

[5] ابن عساكر ج١٣ ص٢٦٨ - ( رجال ونساء ص٣٥٠.)

[6] سَير أعلام النبلاء - ج٣ ص٧٧.

دکتۆر وای بلاّودەکاتەوە کە گوایە محەممەد مەبەستی وابووە کە ئافرەت بۆ بەڕێوەبردن ناشێت[1].

و ـ دکتۆر جەمال ڕای وایە کە ئافرەت لە ئایینی عیسا دا، ئازادترو مافدراو ترو خۆشگوزەرانترە، ئەو دەڵێ (ئاینی عیسا بیرۆکەی ژنهێنانی بەرزکردەوە بۆ ئاستی خوا و، بەشداری پێکرد لە دروستکردنی دروستکەرەکاندا، بەوەی کە مەسیحی بە هەڵە ئەو بۆ چونەیان بۆ ئاینەکەیان زیادکردوە، کە گوایە مەریەمیش خوایەو دەسەلاّتی خوای هەیە و، عیساش خوایە، واتە خوایەکی سێکوچکە لە زەمین و ئاسماندا دروست بوە، ئایینی عیسا فرەژنی و تەلاّقی حەرامکردووە، ئەوە ئەو نهێنیە بوو کە موحەممەد هەتا خەدیجەی گاور ژنی بوو پابەند بوو پێیەوە و ژنی تری نەهێنا)[2] پاشان دکتۆر جەمال وەسف و سەنای بیرۆکەکەی عیسی دەکات بەرامبەر ئافرەت.

ز ـ دکتۆر هەر بەوە ناوەستێت، وەسف و سەنای داب و نەریتی خێڵەکانی سەردەمی نەفامی پێش ئیسلام دەکات بەرامبەر ئافرەت و، وتەی ناشیرینی زۆر دەهێنێ بەرامبەر پێغەمبەرو ژنەکانی، زەمی ئیسلام دەکات کە بەرامبەر ئافرەت خراپ بووە، تانەو تەشەری زۆر لە پێغەمبەر دەدات، گاڵتە بە ئایەتەکان دەکات و، دەڵێ "خوا خۆی بە ئایەت ڕێگەی بە محەممەد داوە بە کەیفی خۆی ژن بهێنێ، دەڵێ: هەڵوێستی موحەممەد بەرامبەر ژن و ژیانی خێزانیی لەسەر بناغەی جنسیی بووە، فەزڵی عائیشەی داوە بەسەر ئەوانی تردا، لەبەر ئەوەی منداڵ بوەو ئارەزوی جنسی زۆرتر بووە، لەم بارەدا خەڵك وا سەیری محەممەد دەکات کە لای ئەو ژن ئامرازی لەزەت و رابواردنە لە ژیانی دونیادا، هەر لەبەر ئەوە ڕێگە نادات ژن بکوژرێ ئەگەر خیانەتی جێگەی کرد"[3].

---

[1] ظهور الكرد في التاريخ ، ص٤٣٤ ـ ٤٣٥

[2] ظهور الكرد في التاريخ ، ص٤٣٤ ـ ٤٣٥

[3] ظهور الكرد في التاريخ ، ص٤٣٣

ح ـ پاشان دەڵێ: "بەڵام بە ڕاستی لای عەرەبە بتپەرستەکان هەروەك لای گاورەکان، ئافرەت هەستی بە ئازادیی ڕادەربڕین دەکرد، بەڵام باوکی لە منداڵییدا زاوای بۆ کچەکەی دیاریی دەکرد، ئەمە لە قۆناغەکانی سەرەتای چەرخی ئیسلامدا گۆڕا، موحەممەد ڕازی نەبوو کچ بە ئارەزوی خۆی شوو بکات" دکتۆر وا حەز دەکات کە بڵێت سەردەمی نەفام و گاورەکان لە موسڵمانەکان باشتر بوون بۆ ئافرەت، ئازادتر بوون، بەڵام هەمووومان دەزانین و هەموو سەرچاوە سەرەکیەکان لەسەر ئەوە سوورن کە لە سەردەمی نەفامییدا ئافرەت کاڵایەك بوو، خاوەنی خۆی نەبوو، پیاوی واهەبوو بیست و سێ ژنی هەبوو، ئەمی دەردەکردو ئەوی دەهێنا بە بێ ماف پێدانی، بەڵام دکتۆر حەزدەکات هەر بۆ خۆشیی وابڵێت، بۆ ئەم ڕستانە سەرچاوەو کتێبەکان ناهێنێ، بە حەزی خۆی شت دەڵێ، بەڵام کە ئیسلام هات سنووری بۆ ئافرەت دانا، کە دەبێ مارەیی و ماف و ڕای خۆی هەبێ لەسەر شووکردن، بەڵام هەر دوای شەش دێڕ دکتۆر دەڵێ: "لەسەر ئەو بنەمایە ئایینی ئیسلام پێشکەوتنێکی بەرچاوی بە خۆوە بینی لە بەرامبەر ئاییینی جولەکەدا، کە زۆربەی شەریعەتەکانی لەوەوە وەرگرتووە"[1].

گ ـ پاشان دەڵێ: "ئیسلام بڕیاری لێدانی داوە لە ئافرەت، بۆ تۆڵەو سزا جێی خەوتنی لێجیادەکاتەوە، ئەوە دابوو نەریتی سەردەمی نەفامییە لەبنەڕەتدا، موحەممەد نەیتوانی خۆی لەو دابوونەریتە کۆنانە بە تەواوی لابدات و، لەبیری موسڵمانە سەرەتاییەکاندا بیشواتەوە، بەڵام دوایی کە دەوڵەتی ئیسلامیی لەسەر خاکی شارستانیەکانی کۆن جێگیر بوو، لە ژێر ڕۆشنایی یاساکانی ڕۆمانیی و ساسانیی لە سوریاو عێراقدا مەراسیمی ژن و ژنخوازی پێشکەوتنی بەخۆوە بینی، ئیتر لەوێوە گرێبەست و دیاریکردنی مارەیی و مەرجەکانی ژنهێنان دیاریی کرا"[2]، ئەنجا دەڵێ: "ئەوەی کە لە قورئاندا هەیە کە پیاو دوو ئەوەندەی ئافرەت دەبات

[1] ظهور الكرد في التاريخ ، ص ٤٣٥ ـ ٤٣٧.

[2] (ظهور الكرد في التاريخ، ص ٤٣٨ ـ ٤٤٢.

لـه مـیرات، ئـەوە دابـی سـەردەمی نەفامییـە و قورئـانیش دووبـارەی کردۆتـەوە و موحەممەد پێشکەوتنی زیاتری تیاکردووە"[1]،.

ی ـ پاشـان دەڵـێ: "کۆیلـە لـە سـەردەمی نەفامییـدا هـەبوو لـە نیوەدورگـەی عەرەبدا، بەڵام ئیسلام فراوانتری کردوو، کۆیلەیەتی گەیاندە هـەموو وڵاتـانی نێـوان چین و ئیسپانیا، ئەوەی جزیەی نەدایە، یان موسڵمان نەبوایـە دەیـانکردە کۆیلـە، کۆیلە هیچ مافێکی نەبوو لە تەریکەو ماڵ و موڵکی خەڵك"[2].

ك ـ پاشان دەڵێ: "موحەممەد نەرم بوو لەگەڵ ئافرەتدا، بـەڵام خەلیفـەکان بـە پێچـەوانەوە، عومـەر کـوڕی خـەتاب لـە غـەزاکانی عێراقـدا ئـافرەتی زۆری کـوردو فارسی گرت، کە خاوەن زەوق و جوانیی بوون، خۆی دابەشیکردن بەسەر سەربازە سـەرکەوتووەکانیدا، کاریگـەر بـوو بـە جـوانی و بـاڵا و ڕەوشـت جوانیـان، بـەڵام نەیهێشت جلوبەرگی ئافرەتی ئازاد لەبەر بکـەن، بـە سـەرو قاچـی رووت دەچـوونە دەرەوە، بـە داخـەوە هەنـدێکیان لـە شـاری مەککـەو مەدینـە بـەکاردەهێنران بـۆ ڕابواردن"[3].

ل ـ فرەژنی: دوژمنانی ئیسلام بۆیان دەرکەت کە بەشێوازی زانستیی و پێشـتر بە جـەنگ و هـەرا و ئـاگر و ئاسن هیچیان بـۆ ناکرێت بەرامبـەر ئیسـلام، کەوتنـە هێرشـی ناشـیرینکردن و بوختـان و هەڵبەسـتن و فێـڵ و تەڵەکـەی سـووك و نـزم، ڕقێکی ڕەشییان بەرامبەر ئیسلام و پێغەمبەرەکەی ڕشت، ئەوەشی دەیڵێن پشـت بە سەرچاوەی بڕواپێکراو نابەستن، بەوەندەی لەملاولاوە قسە دەهێنن، لـە بـارەی فرەژنیی لە ئیسلامداو فرەژنیی پێغەمبـەر، دەڵـێن فرەژنـی تـەنها هـەر بـۆ ئـارەزو بـازی بـووەو، سەرچـاوەی ئاژاوەیـە و ئـافرەت سـووککردنە، ئـەوان نـازانن، یـان دەزانن، خۆیان گێل دەکەن کە فرەژنیی پێش ئیسلام زۆر زیاتر بڵاوبوەو سـنووری

[1] (ظهور الكرد في التاريخ، ص ٤٤٥ ـ ٤٤٨.

[2] ظهور الكرد، ص ٤٥٠.

[3] ظهور الكرد، ص٤٥١ ـ ٤٥٢.

نـەبووە، پیاوێـك لـە تەمەنیـدا (٣٠_٤٠) ژنـی دەهێنـا، جگـە کـەنیزە و کۆیلـەو دەسکەوتی شەڕ، ئەو باوە لە هەموو گەلەکاندا هەبووە، تەنانـەت خوشـکی خۆیـان مارە دەکرد، وەك فارس و عەرەب و هیند و جولەکە و زەردەشتیی، هەموو جیهان فرەژنیان بە بەربڵاویی هەبووە[1]، عەقاد دەڵێ: هەموو شەریعەتە کۆمەڵایەتییـەکانی پێش ئیسلام بێدەنگ بوون لە باسی مافی ئافرەت و، هیچیان بۆ دیاریی نەکردووەو، هیچ یاسا و ڕێسایەکیان بۆ دیاری نەکردبوو، جگە لەوەی دەڵێ:" ئازادن لە هێنانی ئافرەت بـە کـەیفی خۆتـان بـەبێ سـنوور و دیـارییکردن ژمـارەو، بـاس لـە توانـای بەڕێوەبردنی ماڵ و منداڵ و، ئامادەکردنی شوێن و ژیان ناکـات، بـەڵکو شـەریعەتە مەدەنیە گشتییەکانی پێش ئیسـلام، فرەژنـی بێسـنووری حـەڵاڵ کـردووە[2]، ئـاینی جولەکەش فرەژنیی ڕێگەداوە بەبێ دیاریکردنی ژمـارە، لـە تەوراتـدا هـیچ ئایـەتێك نییە ڕێ لەوە بگرێ، بەڵکو دەڵێ: حەڵاڵە و لە پێغەمبەرانەوە بۆتان ماوەتەوە ! لـە کتێبی پیرۆز (تەورات)دا دەڵێ: داود و سولەیمان لەیەك کاتـدا سـەدان ژنـی ئـازاد و بەندەیان کۆکردبویەوە[3]، لە عهدی قدیم دا لە صحاحی یانزە لە ئینجیل دا لە باسی سولەیماندا هـاتووە (...حـەوت سـەد لـە ئـافرەتی ئـازاد و سـێ سـەد لـە سـەراری هەبووە)[4]، لە (سفر التکوین) دا باسی بێسنووری ژنانی پێغەمبەران دەکات[5].

لە باسی یەعقوب کـوڕی ئیسـحاقدا، تـەورات دەڵێـت: (...پاشـان لـەو شـەوەدا هەستا دوو ژنەکەی و دوو خزمەتکارەکەی و یانزە منداڵەکەی هەڵگرت و ڕۆشـتن و لـە گـەروی یەبوقــەوە پەڕینــەوە)[6]، دوو خزمەتکارەکەشـی هـەر ژنـی بـوون، لـە

---

[1] حقوق الانسان في الاسلام ـ علي عبدالواحد وافي ص١٧٩.

[2] المرأة في القران ـ عباس محمود العقاد ـ ص١١٢.

[3] نساء حول الرسول ـ ص٣١٢.

[4] الكتاب المقدس ـ العهدالقديم ـ الاصحاح الحادي عشر فقرة ٣ص٥٥٢.

[5] العهد القديم ـ سفرالتكوين ـ الاصحاح الثامن والعشرون ـ فقرة ٩.

[6] العهد القديم ـ سفر التكوين ـ الاصحاح الثاني والثلاثون فقرة ٢٢.

فەرموودەی راستدا لە پێغەمبەرەوە دەگێڕنەوە کە باس لە فرەژنیی دەکات لە ئاییِنی جولەکەدا، دەفەرمووی: سولەیمانی کوڕی داود وتی: ئەمشەو دەچمە لای حەفتا لە ژنەکانم و هەریەکە سوارچاکێکی دەبێت کە دەجەنگن لە پێناو خوادا[1].

لە ئینجیلدا هیچ دەقێك نییە فرەژنیی یاساغ کردبێت، بەڵکو لە نامەکانی بۆلسدا باس دەکات کە فرەژنیی ئاساییە، دەڵێ:" پێویستە ئەسقف مێردی یەك ژن بێت" نامەی یەکەمی بۆلس بۆ تیمۆناس دەڵێ نابێ ئەسقف ژن بهێنێ[2]، بەلاّم پێشتر دەیتوانی یەك ژن بهێنێ، پاپا هەبوو زۆر ژنی هەبووە لە کۆندا، عەققاد دەڵێ: (وستر مارك) زانای بڕوا پێکراو لە مێژووی ژنهێناندا دەڵێ: (فرەژنیی بەدانپیانانی کەنیسە، هەتا سەدەی حەڤدەی زاییِنی بەردەوام بووە)، یەکەم کەس مارتن لوسەر، سەرداری ئینجیلەکان، یەکەم کەس بووە بڕیاری فرەژنیی داوە و لە زۆر جێدا باسی لە فرەژنیی کردووە، تەنانەت گاورەکانی هاوچەرخیش لە ئەفەریقا دانیان بە فرەژنییدا ناوە، دکتۆر موستەفا سوباعی لە کتێبی (المرءة بین الفقه والقانون) دا دەڵێ:" گاورەکان لە ئەفەریقیا بڕیاری فرەژنییان داوە، وەك شێوازێك بۆ بلاّوکردنەوەی پەیامی گاور، چونکە لە ئەفەریقیا فرەژنیی بلاّوبوو، چونکە یەکژنیی لای ئەفەریقیەکان ڕێگربوو ببنە گاور، هەر بۆیە فرەژنییان بێسنوور کرد"، لە ساڵی(١٩٤٨)دا کۆنگرەی گەنجان لە میونیخی ئەڵمانیا باس لە گرفتی ژن دەکات کە چەند قاتی پیاوان زۆرترن، چونکە بە هۆی جەنگە جیهانیەکانەوە پیاوی زۆر کوژراوە، لە ئەنجامدا کۆنگرە بڕیاری فرەژنییدا بۆ چارەی ئەو گرفتە[3]، بیریارە ئەوروپییەکان وەسفی یاسای فرەژنییان کردوەو، داوای بەربلاّوکردنیان کرد بۆ ڕزگارکردنی کۆمەڵگە، هەتا هەموو ئافرەتێك مافی شەرعیی خۆی لە دایکایەتی ببینێ.

---

[1] البخاري، ج ٤ ص١٣٥و مسلم ـ رقم ١٦٥٤. نسا ء حول الرسول ـ ص٣١٢ ـ ٣١٣.

[2] تعدد الزوجات ـ عبدالله ناصح علوان ـ ص١٦.

[3] نساء حول الرسول ص٣١٥.

(غوستاف لوبوون) لە كتێبی (شارستانی عەرەب)دا دەڵێ:" بڕوابوون بە فرەژنیی لای ڕۆژهەڵاتیەكان، یاسایەكی چاك و پاكە، بۆ بەرزكردنەوەی ئاستی ڕەوشتیی لە نەتەوەكانداو، زیاتر پەیوەنیی خێزانەكان توندو تۆڵ دەكات و، ڕێز بۆ ئافرەت دەگێڕێتەوە كە ئەو ڕێزە بۆ ئافرەت لە ئەوروپادا نییە و نابینرێ". [1]، عەققاد لە (المرأة في القران)دا رای زۆر لە فەیلەسوفە ئەوروپیەكان دەهێنێ لە بارەی فرەژنییەوە، (دكتۆر لوبون) دەڵێ:" یاساكانی ئەوروپا پاشتر ناچار دەبێ ڕێگە بە فرەژنیی بدات" (ئەهرنفیل) دەڵێ:" فرەژنیی پێویستیە بۆ پارێزگاریكردنی مانەوە بە بەردەوامیی وەچەی مرۆڤایەتی" [2].

لە سەردەمی نەفامیدا فرەژنیی لە هەموو شت بڵاوتر بوو، زۆر بە ئاسانیی ژنیان دەهێنا و لەبەر هیچیش بە ئاسانی وازیان لێدەهێنا، ئەبو داود لە حارسی كوڕی قەیسەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ:" كە موسڵمان بووم، هەشت ژنم هەبوو، ئەوەم بۆ پێغەمبەر باسكرد، فەرمووی چواریان لێهەڵبژێرە [3]، تورمزی لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە دەگێڕێتەوە كە غیلانی كوڕی سەلمەی سەقەفی كە موسڵمان بوو دە ژنی هەبوو، لە سەردەمی نەفامییدا، هەموویان لەگەڵیدا موسڵمان بوون، پێغەمبەر داوای لێكرد چواریان لێ هەڵبژێرێ [4]، بەمەدا دیارە فرەژنیی پێش هاتنی ئیسلام، فراوانترو بێ ماف و یاساو قانون بوو، بەڵام كە ئیسلام هات سنووری بۆ دانا و بڕیاری دانا كە نابێ لە سەرووی چوار ژنەوە هەبێت، واتە ئیسلام سنووری بۆ داناو دیاریی كرد و لە نیوە زیاتر كەمی كردەوە، نەك فرەژنیی داهێنا، وەك ڕۆژهەڵاتناسان و دواكەوتوان باسی دەكەن!!.

قورئان بە ئاشكرا دەفەرموێ:"دەبێ دادپەروەری لە نێوان ژنەكاندا بكەیت، دەنا یەك دانە بهێنە" قورئان فرەژنیی دیاریكردووە، لە زۆر و بێ سنوورو

---

[1] نساء حول الرسول، ص٣٧٥.
[2] المرءة في القران، عباس محمود العقاد) ص٨٢.
[3] ابوداود. ت. رقم ٢٢٤٢ في باب الطلاق .
[4] الترمذي في باب النكاح رقم ١١٢٨٩.

ئارەزووەكاریەوە بۆ چواردانە، هەتا پیاو ئارەزوكاریی لە ژنهێناندا نەكات، ئەویش دادپەروەر بێت لە نێوانیاندا، دەنا ئەگەر دادپەروەر نەبێت ئەو مۆڵەتەشی لێدەسێنێتەوە، ئیسلام بۆچی ئەو مۆڵەتەیدا..؟ چونكە ئیسلام یاسای ژیانی مرۆڤە، یاسایەكی چاكی واقیعی كە لەگەڵ هەست و نەست و ناخ و توانای مرۆڤدا دەگونجێ، لەگەڵ واقع و پێویستییەكانی مرۆڤدا دەستلەملانە و بۆ هەموو سەردەم و هەموو جێ و شوێندا دەگونجێ و مرۆڤ بەرز دەكاتەوە، ئیسلام قورسی و گرانی نییە، تورەو توندرەونیە، مرۆڤی ئاشتیخواز و ئارام و هێمن دروست دەكات، مرۆڤی زیرەك و ورد و وریا كە ئاگاداری خۆی و ژیانی و دەوروبەری بێت، لە هەموو هەنگاوێكیدا قورئان قسەی هەیە، ئافرەتی پشتگوێ نەخستوە و سەرپشكی كردووە، ناخ و دەری پاك و خاوێن دەكات، نایەوێ چاو لە دەرو نەشازو هەڵپەكەر و سووك و سەلیم بێت، دەیەوێ كۆمەڵگەیەكی پاك و پوخت و دوور لە گرێ و گۆڵ دروست بكات، كەس تەماعی لە ماڵ و سامان و شەرەف و ناموسی كەس نەبێت، مرۆڤەكانی سەرپشككردووە و هەموو رێیەكی جوانی بۆ دیارییكردوون، پاریزگاری لە رەوشت و ژیان و مردن و ناخیان كردووە، خوای گەورە بەردەوامیی ژیانی خستۆتە ژنهێنان و شووكردن، ئەمە جگە لەوەی شووكردن وەڵامێكە بۆ داواكاریەكانی ناخ و دەرون و ناوەوە، فرەژنیی مۆڵەت و روخسەیەكە، لە پێش ئیسلامدا هەموو ئایین و باوەرو باسەكان رێیان داوە، هەندێكیان یاسایان بۆ داناوە، هەندێكی تریشیان بێسنوورو یاسا و ماف، هەروا لەگەڵ ئارەزوبازیی مرۆڤدا گونجاندویانە، وەكو مانەویەكانی كۆن و شوعیەكانی دوێنی و ئەوروپیەكانی ئەمرۆ كە دەڵێن سەر و ماڵ و ژن و كچی هەموو كەس، بۆ هەموو كەسە، مرۆڤ ئازادە تیایدا و بێ سنوورە، بەڵام ئیسلام هات لە زۆرییەوە، كە ئاشكرایە هەبووە دەیان ژنی بووەو هێناویەتیە سەر چوار ژن، ئەمە جگە لەوەی عەقد و نیكاح و یاساو مافی بۆ داناوە، هەتا كەس سنوور شكێنی نەكات و ئافرەت نەبێتە كاڵایەك و یاری بە ژنبوونیەوە نەكرێت.

پێش ئیسلام هەموو كەس ژنی زۆر بووە، پێغەمبەرانیش یەكێكن لەو خەڵكەو ئەوانیش ژنیان زۆر بووە، ئیبراهیم وەك لە تەورات و ئینجیلدا هاتووە، سێ ژنی

هەبووە، هاجەر دایکی ئیسماعیل، سارە دایکی ئیسحاق، ژنی سێهەمی قتورە بووە کە شەش منداڵی هەبووە، بـە ناوەکـانی: زمـران، بقشـان، مـدان، مـدیان، بشـباق، شوحا)[1].

یەعقوب چوار ژنی بووە: (لیئە) کە پێنج کوڕی بـووە، (راحیـل) کـە دوو کـوڕی بووە دانا و یوسف، دانا هەر بنیامینە)[2]، (زیلفە) دوو کوڕی بووە، (بەلیهە) کە یەك کوڕی بووە، موسا سێ ژنی بووە: صفورە و (کچـێکی کۆشـی) و (کچـێکی قـینی)، داود نۆ ژنی بووە: میکال و ئەبیجال و ئەخینوعم و ئـەوانی تـر، سـولەیمان حـەوت سەد ژنی بووە.

هـاتنی عیسـا بـۆ تـەواوکردنی شـەریعەتی موسـا بـووە و، بـڕوای بـە هـەموو بڕیارەکانی هەبوو، کە بۆ موسا هاتبوو، ئینجیل دەڵێ:"واگومان مەبەن من هـاتووم ناموسی موساو کاری پێغەمبەران پوچەڵ بکەمەوە، نەهاتووم بۆ لابردنیـان، بـەڵکو بۆ تەواوکردنی ئەوان هاتووم" (ئینجیل متيي ـ الاصـحاح الخـامس، فقـرة ١٧ـ ١٨) کەواتە عیسای مەسیح بڕوای بە فرەژنیی بووە، کە لە ئایینی موسـادا هـاتووە، لـە هەموو ئینجیلدا دەقێك نییە فرەژنیی حەرام بکات، بەڵکو لـە هەنـدێ لـە نامـەکانی بۆلسیدا دەڵێ: کە فرەژنیی رەوایـە و دەکـرێ، پرسـیارێك کـرا لـە بـۆلس: مـەرجی ئەسقف و کاهین و شەماسە چییە..؟ وتـی: (دەبێ بێ لۆمـەو عـەیب بێـت و ژنێکـی هەبێت) هەروەهاش بۆ شەماسەو کەهەنـە هەیـە ژن بهێنـێ، لەبەرئـەوە بـۆ پیـاوی ئایینی مەسیحی هەیە یەك ژنی هەبێ، بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری، ژنـی زۆر نـەهێنێ نەك بە کاری ئایینیدا ڕانەگات، بەڵام جگـە پیـاوانی ئـایینی، گـاوری تـر بـە کـەیفی خۆیان چەند دەهێنن تاوان نییە، لەوەوە تێدەگەین گاورە کۆنـەکان زیـاتر لـە یـەك ژنیان بووە، پاشای فەرەنسا ناپلیۆن پۆناپارت بە ئامادەبوونی پاپا ژنـی دووەمـی

---

[1] (الكتاب المقدس ـ سفر التكوين، الاصحاح السادس عشر، فقرة (١٥) والاصـحاح السـابع عشـر، فقرة (١٥ ـ ٢٠)والاصحاح الخامس عشر، فقرة (١-٢).

[2] سفرالتكوين ـ الاصحاح الثلاثون ـ فقرة ٢١-٢٣-٢٤.

هێناو پاپا نارازی نەبوو، چیرۆکی مارتن لۆسەرو شتی تریش زۆرە، بەمانەدا دیارە پێغەمبەران ژنی زۆریان بووە، ئەوە لە مەبەست و کاری پێغەمبەرایەتیدا نکوڵیی نەبووە، بەڵکو سەیر و سەمەرە و سەرسووڕمان ئەوەیە کە ڕۆژهەڵاتناسان لە گاورو جولەکە و، پیاوەکانیان لە ڕۆژهەڵاتیەکان محەممەد پێغەمبەر تاوانبار دەکەن و ئاگایان لەکتێبەکانی خۆیان نییە، لەگەڵ ئەو دەسکاریی و دەستێوەردانەی کە کردویانە، باسی زۆریی ژنی پێغەمبەرەکانیان دەکات، دوا پێغەمبەر، موحەممەدیش، وەك براکانی لە پێغەمبەران و، هاوڕێکانی لە صەحابەکان، ژنی زۆری هەبوو، هەتا ببێتە نموونەو پێشەوایەکی چاك و بە ئەزموون بۆ خەڵکیی، پێغەمبەر هەتا لە مەککە بوو یەك ژنی هەبوو، بەڵام کە چووە مەدینە، ژنی تری هێنا، بێگومان هەر کەسەو لەبەر هۆیەك ژن دەهێنێ، حیکمەت لە هەڵبژاردنەکەدا لای خۆیەتی، بە گوێرەی سەردەم و نەریتیش دەیگۆڕێت، ژنەکانی پێغەمبەریش بەم جۆرەیە:

١ـ خەدیجەی کچی خویلد: ئەم ئافرەتە ناودارە کە لە هەموو ژنەکان ناودارترە، هۆ و هێنانەکەی جیاوازترە، شارەکەشی جیاوازترە، کاتێك هێنای پێغەمبەر نەبوو، داواکارییەکەو پێشنیازەکە لەلایەن خەدیجەوە بوو، نەك پێغەمبەر، حیکمەتی ئەم ژن هێنانە لەلایەن خواوە بووە، نەك موحەممەد، چونکە پێغەمبەر لەبەر هەژاریی و بێپارەیی بیری لە ژن هێنان نەکردبوویەوە، پێشتر پێغەمبەر خەریکی شوانیی بوو بۆ پەیداکردنی پارە بۆ یارمەتیی ئەبوتالیبی مامی، کە خاوەن خێزان و خەرجیی بوو، پاش ماوەیەك ئەبوتالیب وتی: شوانیەکە دەسکەوتی کەمە، بیستبووی خەدیجە خەڵك دەنێرێ بۆ شام بۆ کاسبی بە کرێ، وتبووی ئەوە باشترەو خێردارترە، ئەبوتالیب داوای لە خەدیجە کرد موحەممەدیش بنێرێ، خەدیجە پێی خۆشبوو، چونکە موحەممەدی بە پاك و دەستپاك و ئەمین ناسیبوو، ئەوە بۆ کاسپیەکەی باشترە، هەندێك دەڵێن موحەممەد خۆی کارەکەی دۆزیبوویەوە و، داوای لە ئەبوتالیبی مامی کردبوو بە خەدیجە بڵێ، موحەممەد چوو بۆ شام و بە قازانجی چاکەوە گەڕایەوە، مەیسەرەی شاگردی خەدیجەی لەگەڵ بوو، خەدیجە

لێی سوربوو موحەممەد لەم حاڵە بێ پارەییەیدا، ئەگەر داوا بکات، هەرچەندە نێوانی تەمەنیان زۆر جیاوازە، رازی دەبێت، مەیسەرە باسی رەوشت و خو و دەستپاکیی و ساغ مامەڵە و نەرم و نیانیی و ژیریی موحەممەدی بۆ خەدیجە کردبوو، کە رەنگە لە کەسەکانی پێش موحەممەددا بۆ ئەو سەفەرە بازرگانیانە نەیدیبێ، هەر بۆیە داوای لە مەیسەرە کرد پێشنیازی بۆ بکات، موحەممەد وتی: من ڕازیم، با پرسی مامم بکەم، مامی بڕوای نەدەکرد خەدیجەیەك کە چەندین ناودار و پارەداری مەککە داوایان کردبوو، وەلامی نەداونەتەوە، ئەی چۆن بە یەك سەفەری موحەممەد، ئەو هەموو مانایەی لێ ئاشکرا بوو، وا خۆی داوای دەستی محەممەد دەکات، ئەمەی بۆ شی نەدەبویەوە، دەزانم محەممەد دەستپاکە، بەلام بڵێی ئەوەندە بەختی بوویێت من نەمزانیبێت. ؟ خۆی چوو بۆ لای خەدیجە، ئەو باسانەی بیینی کە خەدیجە لە بارەی موحەممەدەوە بۆیان گێڕابوویەوە، ئەو لە زووەوە بۆ کەسێکی ئاوا دەگەڕێ، دەیزانی خەڵکی بۆ جوانیەکەی و سامانەکەی داوای دەکەن، بەلام محەممەد.. نیەتی ئەو داوایە بکات و، ئەو تەماعانەشی نیە.!
ئەبوتالیب رازی بوو، قەرەباڵغیەکی بۆ کردو بە شەرعی داوای خەدیجەی کردو مارەکرا، موحەممەد بووە خاوەنی خەدیجەی جوان و ژیر و ناودار و دەوڵەمەند، یان بڵێین خەدیجەی خاوەن کەسایەتی جوان و دەوڵەمەند، بووە خاوەنی پیاوی لاوی جوان و دەستپاك و ژیر و ناسراوو ئەمین، وەك ئەبوتالیب لە وتاری داواکردنەدا وتی:" بەڵێ موحەممەد بێپارەیە، بەلام خاوەن ڕەوشتێکی بەرز و جوان و شیرینە، کە لە پول و پارە و ماڵی دنیا بە نرختره"، خەدیجە ئەو دەسکەوتە مەزنەی دەسکەوت، موحەممەدیش جگە لە سەروەت و سامان، ژنێکی جوان و قەشەنگ و ژیرو بەسەلیقەی دەستکەوت، کەواتە ماڵەکەی خەدیجە پڕبوو لە ژیری و جوانیی و خۆشیی دنیاو هێمنی و دامەزران، تاقانە کوڕە جوانە ژیرە شیرینە قەشەنگە ئەمینەکەی مەککە و قوڕەیش، کەوتە ماڵی خەدیجە، لەم ئاهەنگەدا، چ لە لایەنی خەدیجە و، چ لە لایەنی موحەممەدەوە، زەوق و شەوق و بریقە و ئارەزووکاری گەنجی باسی نەبوو، ئەوەندەی کە باسی دەستپاکیی و

ئەمینیی و ناوداریی و ئەزموون رۆڵی هەبوو، خەدیجە دەیتوانی گەنجترین و بە شەوقترین کوڕی مەککە داوا بکات، کە خاوەن پارە و سامان و موڵك و ماڵ و کەسایەتی بوایە، موحەممەدیش دەیتوانی کچێکی لاوی گەنج و بە شەوقتر لە خەدیجە دەستبخات، لە نێو ناودارانی قوڕەیشدا کە هەموویان موحەممەدیان هێندەی کوڕی خۆیان خۆش دەویست، مامەکان و ئامۆزاکانی موحەممەد دەوڵەمەند و گەورەپیاوانی مەککە بوون، بەڵام با ئێمە لە مەککە گەورەتر و لە دەلاقەیە فراوانتر بڕوانینە ئەو ژنهێنانە، بێگومان کەس نییە بە موحەممەد خۆیشیەوە، بزانێ پاش ماوەیەکی تر موحەممەد دەبێتە پێغەمبەر، هەر خوای گەورە خۆی ئەو هەلەی ڕێکخست، کە محەممەد لای خەدیجە ئیش بکات و، دڵی خەدیجە بۆ محەممەد نەرم ببێت، خوا خۆی ویستی وابوو پێشینەیەکی چاك و پتەو بۆ سەرەتای ژیانی موحەممەد بچنێ، قورسی وەحی و بانگەواز و هێرشی دوژمنەکانی لەسەر کەم بکاتەوە، هەر خوا دەیزانێ ئەم موحەممەدە ناسکە ژیرە دوای چەند ساڵی تر دەبێتە پێغەمبەر و، ڕووی هەموو خەڵکی مەککە دەکەوێتە سەر ماڵی خەدیجە و، لە ڕوویەکی ترەوە ئەو ماڵە هێندەی تر ناودار دەبێت ..
پێشتر خەدیجە دوو شوی کردبوو، منداڵی بووبوو، ئێستا تەمەنی نزیك بە چل ساڵە، بەهاری تەمەن و جوانیی ڕۆیشتبوو، گەر موحەممەد ئارەزووباز بوایە ئەوەی نەدەویست، هەر ئەوە نیشانەیە، کە موحەممەد هەرگیز ژنی بۆ ئارەزووەکانی نەهێناوە، بەڵکو هەر دەستی خوا بووە کە ژنێکی ژیری پارەداری خاوەن ئەزموونی ژیان و ماڵداریی پێببەخشێ، بۆ ئەوەی خەدیجە دەوڵەمەند بوو، پێویستی بە کاسپیی و کاری موحەممەد نەبوو، خاوەن ژیان و تەمەن و ئەزموون و ماڵداریی بوو، هەتا محەممەد خەریك نەکات بە خۆشی ژیان و ڕابواردن، ڕێ لە محەممەد نەگرێ کە خەریکی دونیاو ماڵداری بێت، هەتا بەرگەی زەحمەت و گەرانی باری پێغەمبەرایەتیی و بانگەواز بگرێت، ئەگەر یەکەم ژنی لە تەمەنی عائیشەدا بوایە، هەرگیز بەرگەی ئەو بانگەواز و فیتنەو شەڕ و هەرایەی قوڕەیشی نەدەگرت، بەلام بۆ سەردەمی مەدینە، کە خەدیجە مردبوو، دەوڵەت دروست

بووبوو، ژیان خۆش بوو بوو، پێویستی بە کچێکی لاوی پاك و گەنج و زیرەك و ژیر هەبوو، هەتا ئەزمونەکان و ژیان و فەرموودەکانی لەبەربکات و، وەك قوتابییەك لە تەمەنی قوتابییدا زانستەکان لەو حەکیم و زاناو دانایە فێربیێ و وەرگرێ و وەك خۆی لەبەری بکات و وەك خۆی بیگەیەنێ، ساڵی یەکەمی کۆچیی عائیشەی گواستەوە و ساڵی (١١) کۆچیی پێغەمبەر وەفاتیکرد، بەلاّم عائیشە هەتا ساڵی (٥٦)ی کۆچیی مایەوە، هەتا ئەو هەموو زانست و زانیاری و ئەزموونانەی موحەممەدی مێردی، کە وەك قوتابیەکی زرنگ و زیرەك و وریا لەبەری کردبوو، بە زەین ڕوون و کراوەی بگەیەنێ، واتە عائیشە (٤٥) ساڵ دوای پێغەمبەر ژییا، ئەوەی لەو دە ساڵەی قوتابیی و مامۆستایی و، ژن و مێردییدا وەری گرتبوو، بە ماوەی دە ساڵ لای پێغەمبەر و ناو موسڵمانان و، (٤٥)ساڵ دوای پێغەمبەر، هەر لە گەیاندنیدا بوو، بەلاّم هەرگیز عائیشە ئەو توانا و زەحمەت و مەینەتییەی خەدیجەی نەبوو، باری گران نەبوو وەك خەدیجە، خوا خەدیجەی بۆ ئامادەکرد تاڵ و ترش و شیرینی دوو پیاوی دیبوو، ئەزمونێکی زۆری لا کۆبووبوویەوە، بە تەنها خەریکی بازرگانیی و زەحمەتی قازانج و زەرەر بوو، شارەزای شام و کاروان و کاروان سەراو کەرەستە و کالاّی خراپ و باش و ، جۆرەها خەڵك و جۆرەها فێڵ و جۆرەها بازرگان و ولاّتان و شتومەك بوو، لە هەموو بوارەکانەوە ئەزموونێکی زۆری هەبوو، گەر ژنێکی گەنجی وەك عائیشە بوایە بێ ئەزموون، لە بەردەم وەحی پێغەمبەردا دۆش دادەما و هیچی بۆنەدەکرا و بۆی هەڵنەدەگیرا و شکستی دەخوارد، ڕەنگە هەر ئەقڵی کارو باری وەحی هاتنی نەبڕیایە، بەلاّم خەدیجە ئاسان وەریگرت و تەحەمولی کرد و بەیەکەم وشە وتی ڕاستدەکەیت تۆ پێغەمبەریت، کۆمەڵێك سیفاتی جوانی محەممەدی بیر خستەوە، دوو پێشنیازی زۆر گەورەی بۆ کرد کە هەر لە مەزنان و بە توانایان و خاوەن سەلیقە و ژیریی و بەئەزموون دەوەشێتەوە، موحەممەد کە لە غارەکە هاتەوە تێکچووبوو، وتی: وابزانم شتێکم بەسەر هاتووە.. خەدیجە یەکەم، وتی: تۆشتی خراپت بەسەر نایەت، چونکە چاکە دەکەیت و ڕەحم بەجێدەهێنی و سەر لە خزمەکانت دەدەیت،

ئەمە سوكنايیەك بوو بۆ وریاكردنەوە و هێوركردنـەوەی و دامەزرانـدنی و یارمەتیـدا كە نەڕوخێت، دووەم، وتی: هەڵسە با بچین بۆ لای ئامۆزاكەم، ئەو شارەزایی هەیـە لە ئایینەكاندا، ئەی برد بۆ لای زێوانی بتخانەو بتپەرستەكان، بـەڵكو بـردی بـۆ لای كەسێك كە لە ئایینە ئاسمانییەكاندا شارەزایی هەبوو، لەوێ وەڵامی تـەواوی خـۆی وەرگرت!

ئەوە دەردەخات كە خەدیجە شارەزاو ژیر و بـە سـەلیقە بـووە، كەسـێكی كـەم ئـەزموون و نەشـارەزا نـەبووە، مـن دەڵـێم خـوا وەك محەممـەدی ئامـادەكردبوو، خەدیجەشی ئامادەكردووە، هەتا بەرگـەی ئـەو هـەموو مەینـەتیی و ئـازار و سـزا و هـەردوو قۆنـاغی سـەردەمی مەككـە بگـرێ، قۆنـاغی نهـێنی سـێ سـاڵ و، قۆنـاغی ئاشكرا دە ساڵ بـوو، خەدیجـە سـاڵی (١٠)ی پێغەمبـەریی مـرد لـە شـاری مەككـە، بەڵام عائیشە ساڵی یەكـەمی كۆچـی شـووی پێكـرد و دە سـاڵ لەگـەڵ پێغەمبـەردا مایەوە، ساڵی(٥٦)كۆچیی وەفاتیكرد، خەدیجە دە سـاڵ لـە دوو قۆنـاغی قـورس و گران دا لە گەڵ پێغەمبەر بوو، پێش كۆچ كردن بۆ مەدینە وەفاتی كردو كـاری ئـەو تەواو بوو، پاشـان عائیشـەی لاوی مـارەكرد، كـە ئـەویش دەسـاڵ لـە دوو قۆنـاغی مەدینەو دەوڵەتداریدا لە گەڵ محەممەد بوو، ئەم جارە محەممەد مردو خەزێنەیەك زانیاری شەرعی دابویە عائیشـە كـە دوای ئـەو بیگەیـەنێت، ئەوسـا خەدیجـە كـاری خۆی تەواوكردو ڕۆشت بەڵام ئەمجارە محەممـەد كـاری خـۆی تـەواو كـردو ڕۆشـت، خەدیجە بە خۆی و ماڵ و موڵك و سامان و سەرمایەی دونیای، هێندەی موحەممەد ئازاری چەشت، بەڵكو بوویوویـە جێـی سـوكنا و سـەكینە و پزیشـكی دەروونیـی و لاواندنەوەی پێغەمبەر، هەتا لەژێر بارەگرانەكەیدا نەپسـێ، پێغەمبـەر لـە خەدیجـە قاسم و عەبدوڵڵا و زەینەب و ڕوقیە و ئوم كەلسوم و فاتمەی بـوو، تـەنها ئیـبراهیم لە خەدیجە نەبوو، لە ماریەی قیـبتی بـوو، خەدیجـە لـە (٦١) سـاڵییدا وەفـاتیكرد، پێغەمبەر لە ٦٣ ساڵیداو عائیشە لە ٦٦ ساڵیدا وەفاتی كرد، ئـەم سـیانە هەریەكـە لـەم سـیانە شـێوازێكی هـەبوو جۆریـك كـاری دەكـرد، بـەڵام پێغەمبـەر تەواوكـەرو تێگەیەنەرو پێغەمبەری هەردوكیان بوو، هەتا خەدیجـەی هـەبوو محەممـەد مـاوەی

بیست و پێنج ساڵ، هەموو بەهاری لاوی خۆی لەگەڵ خەدیجەدا بەسەر برد، خەدیجەش هەموو بەهاری تەمەنی لاویی لەگەڵ دوو مێردی تردا پێش پێغەمبەر بەسەر بردبوو، دیارە پێغەمبەر بۆ ئافرەتی پاك و پوخت و ژیر گەڕاوە، هەتا کاروانی دنیای پڕ مەینەت پێکەوە بەڕێ بکەن و ئەو یاریدەی بدات، کە جێی رابواردن و حەوانەوە نییە، بۆ ئارەزووبازیی نەیهێناوە، چونکە ئەو کەسێکی ئارەزووباز نەبووە لە ژیانی لاوییداو، کەس هیچی لێنەدیووە، خوا لە حەوت ئاسمانەوە جوبرەئیل دەنێرێ و دەڵێ: سەلام لە خەدیجە بکە، بڵێ من لەو رازیم، ئایا ئەو لە من رازیە، ئەمە ئەو پەڕی پاك و مەزنییە بۆ خەدیجە بەرزترین دیاریە بۆ خەدیجە.

لە خەدیجە دوو کوڕ و چوار کچی بوو، دوو کوڕەکەی هەر پێش پێغەمبەرایەتیی مردن، بەڵام کچەکانی کۆچیانکرد بۆ مەدینە و موسڵمان بوون، دوو کوڕی مردن، هەروەك چۆن باوك و دایکی مردن، کوڕەکانیهەر بەمنداڵی مردن، هەتا نەبنە فیتنەی خەڵك و، باری ژیانی قورستر نەکەن، دەبوو ئەو یەکلابێتەوە بۆ ئایینەکەی، وەك نوح چەند ئازاری چەشت بەدەست کوڕەکەی و ژنەکەی، هەر لە ژنهێنانی خەدیجە هەموو وەڵامێکی تیایە بۆ رۆژهەڵاتناسان و پیاوەکانیان، پێغەمبەر تا ئەوی بوو بیری لە ژن نەکردبوویەوە و لەگەڵیدا پیر بوو.

٢ـ سۆدەی کچی زەمعە: هەر لەو ساڵەی کە خەدیجەی تیا وەفاتیکرد، ئەبوتاڵیبیش کۆچی دوایی کرد، ئەو ساڵەی ناونا (ساڵی ماتەمینی) پێغەمبەر بێپشت و پەنا و یارمەتیدەر مایەوە، جگە خودا لە ئاسمان، کەسی وای نەمایەوە لە زەمیندا کە غەمەکانی بۆ باس بکاو سوکنایی دڵی بدات، هەر بۆیە بە دوای ئافرەتێکی تری بە ئەزموونی ژیری بڕواداری تردا دەگەڕا، کە هەندێك لە جێگەی خەدیجەی بۆ پڕبکاتەوە، (سۆدە)ی هێنا کە ئافرەتێکی بڕواداری کۆچکەر بوو بێوەژن بوو، کە (سەکرانی کوڕی عەمر) سەحابی مرد، پێغەمبەر ترسا کە سۆدە بگەڕێتەوە ماڵی باوانی کە بێبڕواو دژ بەم ئایینە بوون، ترسا ئەوان سزای بدەن و بیکوژن، یان لە ئایین وەریبگێڕن، ئەو کاتە سۆدە تەمەنی (٥٥) ساڵ بوو، بێوەژن

بوو، بەڵام پێغەمبەر تەمەنی ( ٥١) ساڵ بوو، ئەمە دڵی سۆدەی خۆشکرد و رووی خەڵکیی لێکرایەوە و بووە جێی سەرسوڕمان، سۆدەیەك بڕوادار، یەکێك بوو لە کۆچەران، لەباتی ئەوەی بگەڕێتەوە ماڵی باوکی و سزای بدەن و لە ئایین وەریبگێڕن، وا گەڕایەوە بۆ ماڵی پێغەمبەر و بووە خێزانی سەروەری پێغەمبەران، سۆدە دە ساڵ لە مەدینە لە گەڵ پێغەمبەردا ژیا، لە دوای پێغەمبەریش دوانزە ساڵ ژیا، ساڵی (٢٣)ی کۆچیی وەفاتیکرد و فەرموودەکانی پێغەمبەری دەگێڕایەوە، پێغەمبەر دوای مانگێك لە وەفاتی خەدیجە سۆدەی هێنا، پێشتر لای سەکرانی کوڕی عەمر بوو،یەکێك بوو لە بەنی عامر لە خێڵە ناودارەکانی قوڕەیش، سەکران موسڵمان بوو لەگەڵ ئەو هەموو سزاو ئازارەی کە لە کەسوکاری و، بەتایبەت سوهەیلی برایەوە چەشتی، ناچار کۆچیکرد بۆ حەبەشە لەگەڵ سۆدەی کچە مامیدا، کە لە حەبەشە گەڕانەوە، سەکران مرد، سۆدە بێکەس مایەوە، نەیدەتوانی درێژە بە ژیانی ئیمانداریی خۆی بدات، لە ناو کەسوکارە بێبڕوا بتپەرستەکانیدا، دەبوو کەسێك لە موسڵمانان لای لێ بکردایەتەوە، ئەو تەمەن (٥٥) ساڵ بوو، پێنج ساڵ لەگەڵ پێغەمبەر مایەوە منداڵی نەبوو، چونکە لە تەمەنی نائومێدیدا بوو.

٣ـ عائیشە کچی ئەبوبەکری سدیق: ئەم تاکە ژنە کە بە کچیی هێنای کە ئەو کاتە عائیشە دە ساڵان بوو، پێغەمبەر لە پەنجا ساڵ تێپەڕی کرد بوو، ئەو کاتە ئەگەر دوو کەس هاوڕێ و دۆستی گیانی بەگیانی بوونایە، دابونەریت وابوو کە نەدەبوو کچ و خوشکی یەکتری مارە بکەن، دەیانگوت بۆ یەکتری ناشێن، بەڵام کە پێغەمبەر خەولەی کچی حەکیمی نارد بۆ لای ئەبوبەکر، داوای عائیشەی لێکرد، ئەبوبەکر فەرمووی: ئایا بۆی دەشێت..؟ چونکە کچی برایەتی، کە خەولە هاتەوە بۆ لای پێغەمبەر ئەو پرسیارەی لێکرد، پێغەمبەر فەرمووی: بگەڕێرەوە پێی بڵێ: تۆ برامی لە ئیسلامەوە و منیش براتم،کچەکەت بۆ من دەشێ[1] ، ئەو ژنە بۆ

---

[1] الطبري ـ ج٣ ص١٦٣ . الطبقات الكبري ـ ابن سعد ـ ج٨ ص٥٨ . نساء حول الرسول.ص٢٣٦.

پتەوکردنی پەیوەندیی نێوان خۆی و تاکە هاوڕێی نێزیك و پاڵپشت بـوو، هـەتا بـە ئاسانیی و بێ شەرم و وەخت و ناوەخت دروست بێـت سـەردانی یـەکتری بکـەن و کێشەکان تاوتویێ بکەن، لە مەککە مارەیکرد، دوای مردنی خەدیجە بـە دوو مـانگ، بـەڵام لـە مەدینـە گواستیەوە، پێگەیشـتنی ئـافرەت لـە نیوەدورگـەی گـەرم، زوو دەستی پێدەکرد، بەپێی قسەی ئیبن هیشام و هەنـدێك مێژوونووسـی تـر، تەمـەنی عایشە لە پانزە ساڵ زیاتر بـووە، کـە پێشـتر جـبیری کـوڕی مـتعم کـوڕی عـودەی داوای کردبوو، پێش پێغەمبەر، ئەوە نیشانەیە کە ڕەنگە لە حەڤدە سـاڵ گـەورەتر بوو‌بێـت، بـۆ زانیـاریی زیـاتر، کـە خەولـەی کچـی حـەکیم، ژنـی عوسمـانی کـوڕی مەزعون، ئەو ئەم پێشنیـازەی بۆ پێغەمبەر کـرد دوای مردنـی خەدیجـە، ئایـا ژنێـك دەهێنێت هەتا جێی پێشـوەکەی بـۆ بگرێتـەوە.؟ یـان منداڵێکـە و دەیهێنـێ هـەتا مراعاتی بکا و خۆی بەخێوی بکات. !

عائیشە زۆر ژیـا دوای پێغەمبـەر، لـە سـاڵی،( ٥٨ )کۆچییدا وەفـاتی کـرد، لـە سـەردەمی خەلیفـە معاویـە کـوڕی ئەبوسـوفیان، پێغەمبـەر منـداڵی لێـی نـەبوو[١]، عائیشە زاناترین کەس بوو کە گەورەکان لە هاوڕێیان پرسیاریان لێدەکرد لە بارەی کاروباری ئایینەکەیانەوە، (٤٨) ساڵ دوای وەفاتی پێغەمبەر مایەوە، بۆ گەیانـدنی ئایینەکە و، ئاگادارکردنەوەی ژن و پیاو، بەوەی کـە ڕاسـتەوخۆ شـەوو ڕۆژ لەگـەڵ پێغەمبـەردا بووە و، ئاگاداری زۆر ڕەوشت و سوننەتی پێغەمبەر بـوو، کـە تەنانـەت ئەبوبـەکر و عومـەریش لێـی ئاگـادار نـەبوون، وەك فەقیـە و مێژوونووسـان باسـی دەکـەن، کـە لـە ڕێـی عائیشـەوە، یـەك لەسـەر چـواری ئـەحکامی شـەرعی لـە پێغەمبەرەوە گوازراوەتەوە بۆ میللەتی ئیسلامی، ئاشکرایە کە(٢٢١٠) فـەرموودەی لـە پێغەمبـەرەوە گێڕاوەتـەوە و (١٧٤) فـەرموودەی هـەردوو بوخـاری موسـلیم، لەسەری هاوڕاو یەکن، ئیتر دەبی کام حیکمەت و نهێنی گەورەتر بێت لەوەی کە لە پشـت ئـەم ژنخوازییـە موبارەکـەوە هەیـە، ئـەوەش کـە ڕۆژهەڵاتناسـە گاورەکـان

---

[١] التأريخ الاسلامي ـ ج١ ص٣٥٧.

دەیوروژێنن، کە گوایە موحەممەدێکی پیرو پەککەوتە، کچێکی منداڵی هێناوە، وانییە، عائیشە لە حەقدە ساڵ زیاتر بووە و هەموو خەڵکی مەککە ئەوەیان بە ئاسایی وەرگرتووە، وەك هەموو ڕووداوێکی سروشتیی تر، ئەو کاتە جێی سەرنجی کەس نەبووە، نەبووەتە جێی وتووێژی خەڵك، موحەممەدیان پێ تاوانبار نەکردووە، وەك زۆر قسە و باس و بوختانیان بۆ دروست کردبوو، عائیشە گەر منداڵ بووە ئەی بۆچی پێش موحەممەد (جوبەیری کوڕی موتعیمی کوڕی عودەی) داوای کردبوو، بەڵکو ئەگەر کچێك لەو سەردەمەدا هەتا(١٥) ساڵ شووی نەکردایە بە دواکەوتوویان دادەنا لە شوکردن[1]، ڕۆژهەلاتناسێك کە خۆی سەری لە نیوەدوورگەی عەرەب دابوو، زۆر بە ئینصاف و ڕاستگۆیانە دەڵێ:" عائیشە لەگەڵ تەمەن بچووکییدا، پێگەیشتنێکی خێرا گەشەی دەکرد، وەك ژنانی عەرەب کە هەر ئەوەبوو وای دەکرد کە ئافرەتی عەرەبی نیوەدوورگە، دوای ساڵی بیست دەچوونە سنووری پیریی و لێی دیاریی دەدان". یان دەڵێ:" ئەم ژنهێنانە هەندێك مێژوونووسی بە موحەممەدەوە خەریك کردووە، لە دەلاقەی کۆمەڵگای ئەم ڕۆوە سەیریان کردوە کە ئێمەی تیا دەژین، نەیان توانیوە لەوە تێبگەن کە ژنهێنانی لەو جۆرە، هەتا ئەمرۆش لای ئاسیاوی و ئەفەریقیەکان هەیە و ئاساییە، لە ڕۆژهەلاتی ئەورووپاشدا هەیە"[2]، ئەوە نەزانیە، کەسێك کە ڕووداو لە زەمان و مەکان و کەش و هەوای خۆی ببچڕێ و، بەپێی سەردەم و شوێنێکی زۆر دوور لە ڕووداوەکە بیپێوی، ئەگەر ئەوانە کتێبی مێژوو بخوێننەوە، بە پاکیی و بێ غەل و غەش و زانستییانە، دوور لە هەواو هەوەس، تێدەگەن کە یەکەمجار ئەم پێشنیازە لەلایەن خەولەی کچی حەکیم بوو، ئەگەر ئەو نەیزانیبایە کە عائیشە پێگەشتووەو بۆ شوکردن دەشێ، تۆ بڵێی ئەو هەڵەیەی بۆ پێغەمبەر بەڕەوا بزانیبایە، خەولە شارەزابوو بە ناخ و هەست و نەست و کاروباری پیاو بۆ ژن، ئەوم ڕوومان دایکی

---

[1] نساء حول الرسول، ص٣٣٨.

[2] الرسول، بودلي، ص١٢٩ . نساء النبي - د. بنت الشاطيء - ص٦٧.

عائیشه، گەر بیزانیایە عائیشە زۆر منداڵە و پێنەگەیشتووە، حەزی نەدەکرد و رازی نەدەبوو ئەو ئەرکە قورسە و گرفتە قوڵە بۆ کچەکەی و، لەو لاشەوە بۆ پێغەمبەر دروست بکات، کە هەزار و یەك کێشەی وەحی و موسڵمانان و دژایەتی بێبڕوایان و جولەکە و منافیق و بتپەرستان و دەوروبەری هەبوو، ئەگەر ئوم رومان نەیزانیایە عائیشەی کچی تەواو گەیشتووە، چۆن رازی دەبوو لە بەردەم پێغەمبەردا شەرمەزار بێت، ئەگەر عائیشە کاروباریماڵداریی نەزانێ و، بە کەڵکی ژن و پیاویی نەیەت، دایك لە هەموو کەس زیاتر ئاگاداری عەقڵ و هەست و پێگەیشتنی کچەکەیەتی، هەر ئەوە بوو کە بە ئەبوبەکری وت:"ئەوە عائیشەیە خوا لە رێی جوبێر وخێڵی جوبێر لایدا، پالی پێوەنێ بۆ لای پێغەمبەر، با بڕوات، تووشی خێر و بەرەکەت دەبێت)[1] ، هەروەها گەر زۆر منداڵ بوایە، ئەبوبەکر باسی دەکرد، ئەو هەر تەنها فەرمووی بۆی دەشێ کە ئێمە براین.؟ گەر منداڵ بوایە ئەوەشی دەیگوت.!

٤ـ حەفسە کچی عومەر کوڕی خەتاب: ساڵی( ٣ك) شوویکرد بە پێغەمبەر، ساڵی (٤٥ك) وەفاتیکرد، حەفسە ژنی خەنیس کوڕی حوزافە بوو، کە لە جەنگی بەدردا شەهید بوو، عومەر پێشکەشی کرد بە ئەبوبەکر و عوسمانی هاوڕێی، ئەوانی بە شایەن دەزانی، بەڵام عوزریان هێنایەوەو نەیان ویست، عومەر شکاتی لای پێغەمبەر لێکردن لەسەر ئەوە، پێغەمبەر فەرمووی:" حەفسە شوودەکات بە کەسێك لە عوسمان باشترە، یەکێك شوودەکات بە عوسمان لە حەفسە باشترە)[2] ، پێغەمبەر حەفسەی مارەکرد، هەتا ئەبوبەکر و عوسمان یەکسان بکات لە شەرەفی زاوایەتی و هاوڕێیەتی، بەو جۆرە پاداشتی هەردووکیانی دایەوە و شەرەف و زاوایەتی و خزمایەتیی پێبەخشین، حەفسە لەگەڵ ئەوەی بێوەژن بووە، شێوەی جوانیشی تیا نەبووە، کەس پێی رازی نەبوو، ساڵی(٤٥ك) لە مەدینە مرد.

---

[1] نساء حول الرسول، ص٣٣٩.

[2] نساء حول الرسول ص٣٥٠.

٥ـ زەینەبی کچی خەزیمە: کە بەناوبانگ بوو بە دایکی هەژاران، ساڵی (٤ك) مارەیکردووە ساڵی(٤ك) وەفاتیکرد، کە پێغەمبەر مارەیکرد (٦٠) ساڵ تەمەنی هەبوو، پێشتر ژنی کوڕی مامەی پێغەمبەر بوو (عوبێدەی کوڕی حارسی کوڕی موتەلیب، کە لە بەدردا لە پاڵەوانیەکدا (مبارەزە) شەهید بوو، کەسی نەبوو، کەسیش لەبەر پیریی نەیدەویست، دوو ساڵ لای مایەوە، لە ژیانی پێغەمبەردا وەفاتی کرد، هەندێك دەڵێن دوای هەشت مانگ مرد[1]، بەڵام ئیبن هیشام دەڵێ:"دوای دوو، یان سێ مانگ مرد"[2]، هەرچۆن بێت، ئەم زەینەبە دوای خەدیجە، یەکەم ژنە کە لە سەردەمی پێغەمبەردا وەفات دەکات، ئیتر نازانم دکتۆر لەکوێدا جێگەی ئەم ژنە دەکاتەوە کە بۆ ئارەزووکاری هێنابێتی. لە سەردەمی نەفامییدا پێیان دەوت: دایکی هەژاران، چونکە خواردنی دەدانێ.

٦ـ هیند کچی ئەبی ئومەییەی حوزانە کوڕی موغەیرەی قورەیشی مەخزومیە ناودارە بە (ئوم سەلمە): مانگی شەوالی ساڵی (٤ك) مارەی کرد، ساڵی (٥ك) وەفاتیکرد، ئەم یەکەم ئافرەت بوو کە کۆچیکرد بۆ حەبەشە بۆ پاراستنی ئایینەکەی، ئەو ژنی شەهیدی پاڵەوان عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولئەسەد بوو، کە کوڕی مامی خۆی بوو، کە یەکێك بوو لە ئیماندارە یەکەمەکانی سەرەتای ئیسلام، هیند تەمەنی (٦٥) ساڵ بوو، دوو کوڕو دوو کچی منداڵی هەبوو، بێکەس و سەرپەرشتیار بوو، پێغەمبەر داوایکرد، بۆ ڕێزنان لە مێردە شەهیدەکەیی و سەرپەرشتیی منداڵەکانی، بەڵام هیند پاساوی هێنایەوە و، وتی: پیرم و دایکی هەتیوم و غیرەی زۆرم هەیە، پێغەمبەر فەرمووی:"من بەتەمەنترم، ئەوە گرفت نییە، غیرەکەیشت خوا لای دەبات و هەتیوەکانیشت بۆ لای خوای پێغەمبەر". بەوجۆرە بووە خێزانی پێغەمبەر و، سەرپەرشتیەکی جوانی منداڵەکانی کرد، کە بێباوکیان پێوە دیار نەما، حیکمەتی ئەم ژنە پیرە منداڵ زۆرە، دیارە !!

---

[1] الاصابة في تميز الصحابة ـ ابن حجر ـ ج٤ ص٣١٦.

[2] سيرة ابن هشام ج٢ ص٢١٧.

هیند خوشکی کوڕانی عاتیکەی ئامۆژنی پێغەمبەر بوو، کە عەبدوڵڵا و زوهێدی کوڕانی ئەبی ئومەییە لەوانە، ژنی کوڕی مامی خۆی بوو، کە بە ئەبوسەلما ناوداربوو، مێردەکەی ئەبو سەلمە یەکەم کەس بوو کۆچیکرد بۆ حەبەشە، یەکەمجار بەندیان کرد لە مەککە لای کەسوکاری، دواتر ڕێگەیاندا کۆچ بکات، لە جەنگی ئوحود دا مێردەکەی تیرێکی بەرکەوت، پاشان چاکبوویەوە، دواتر پێغەمبەر ناردی بۆ شەڕی بەنی ئەسەد، کە گەڕایەوە ئەو برینە لێی پیس کرد، ئیتر ژنەکەی سەرپەرشتی منداڵەکانی کرد، کە ناویان (سەلمە و عومەر و ڕوقیە و زەینەب) بوو، کە مێردەکەی مرد، دوعای کردبوو (خوایە پاداشتی ئەم زەحمەتەم بدەیتەوە و، لەو باشتر جێم بۆ بکەیتەوە). ئەم مێردەی کوڕی پوری پێغەمبەرە، بیڕە کچی عەبدولموتەلیبە و دووبارە برای پێغەمبەر بوو لە شیرەوە، ئەبوسەلمە کۆچیکرد بۆ حەبەشە لە ترسی ئایینەکەی، پاشان گەڕایەوە بۆ مەککە، پاشان کۆچیکرد بۆ مەدینە[1]، ئوم سەلمە وتی: بە ئەبوسەلمە، بیستومە هەر ژنێك کە مێردەکەی بمرێ و لە خەڵکی بەهەشت بێ و شوونەکاتەوە، خوا کۆیان دەکاتەوە لە بەهەشتدا، وتی: پەیمانت دەدەمێ دوای من ژن مەهێنە منیش دوای تۆ شوو ناکەم، ئەبوسلەمە وتی: جا بەگوێم دەکەی؟ وتی: بەڵێ. وتی: ئەگەر مردم تۆ شوو بکەرەوە و دەستی بەرزکردەوە و وتی: خوایە دوای من پیاوێکی باشتر بکە بەنسیبی ئوم سەلمە، نە نارەحەتی بکات و نە عەزیەتی بدات، کە مرد، ئوم سەلمە وتی: جا دەبێ کێ لە ئوم سەلمە باشتر بێت، زۆری نەبرد پێغەمبەر هات و لەبەر دەرگا وەستاو داوایکرد.

کە ئەبوسەلمە بریندار بوو، بە ئازارەوە مرد، ئوم سەلمە زۆری خۆش دەویست، کە مرد، هاتە لای پێغەمبەر و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەبو سەلمە مرد.. پێغەمبەر فەرمووی: (بڵێ خوایە لە منیش و لەویش خۆش بەو جێیەکی لەو باشترم بۆ بکەیتەوە)[2]، ئەم ژنهێنانە وەکو خاوەنی منار[1] دەڵێ: بۆ ئارەزوو و

---

[1] سیراعلام النبلاء - ج٢ ص٢٠٢.

[2] مسلم في الجنائز - رقم ٩١٩.

خۆشی نەبوو، بەڵكو هەر بۆ فەزڵ و لەبەر مێردەكەی بوو، ویستی ڕێزی خێزانی شەهیدان ئاوا بگرێ، بۆ دڵنەوایی هۆزی بەنی مەخزم كە بەرێزترین هۆزی قورەیش بوو، بۆ لابردنی رقی هۆزەكەی و نزیككردنەوەی دڵیان بوو، ئوم سەلمە ساڵی( ٦)كۆچیی مرد،( ٣٨)فەرموودەی پێغەمبەری گێڕاوەتەوە، موسلیم و بوخاری لەسەر (١٣) فەرموودەی یەك قسەن، دەستی هەبوو لە بڵاوكردنەوەی فیقه و شەریعەتی ئیسلامدا[٢].

٧ــ زەینەب كچی جەحش: ئەمە كچی ئامۆژنی پێغەمبەر بوو، پێغەمبەر مارەیكرد لە زەیدی كوڕی حاریسە، كە بە زەیدی كوڕی موحەممەد ناوداربوو، چونكە پێغەمبەر ماوەیەكی زۆر بوو لای خۆی هێشتبوویەوە، كردبووی بە كوڕی خۆی و لە ماڵیاندا بوو، تەبەنی واتە بەكوڕكردن، ئەمە باو بوو لە سەردەمی نەفامییدا، وەك كوڕی راستەقینەی لێهات لە هەموو ئیشوكارێكدا، ژن و ژنخوازیی خزمانی بۆ حەرام دەبوو، میراتیشی بەردەكەوت، كە پێغەمبەر داوای زەینەبی كرد بۆ زەید، زەینەب ئازاد بوو، ناودار و دەوڵەمەندبوون، زەید خزمەتكار و هەژاربوو، نەیاندەكرا پێكەوە، چەندجار زەید شكاتی دەكرد لای پێغەمبەرو دەیگوت: با وازی لێبهێنم، پێغەمبەر فەرمووی:"ئارامت بێت خۆت بگرە، بەڵام تا دەهات ناكۆكییان زیادی دەكرد، هەتا پێكەوە نەیانكرا، بەڵام دیاربوو خوا دەیویست ئەو یاساو داب و نەریتی تەبەنی و بەكوڕكردنە لابەرێت و بیسڕێتەوە و نەیهێڵێ، چونكە كوڕ ئەوەیە لە دایك و باوكت بێت، خەڵك لەخۆیەوە و بە قسەی دەماودەم وای دانابوو بەكوڕكردن دەبێتە كوڕی تەواو، بە بڕیارێكی زارەكی و دوو وتە، كەس نابێتە كوڕو برای كەس، چونكە زەید باوك و دایكی خۆی هەیە، موحەممەد باوكی راستەقینەی ئەو نییە، ئیتر دروست نییە بڵێن زەیدی كوڕی موحەممەد، چونكە خوای گەورە لەو ژنانە كوڕێكی نەبەخشیە موحەممەد هەتا گەورەبێ و ببینێ لە ماڵدا دەگەڕێ و ئیش دەكات، قاسم و عەبدوڵڵا و ئیبراهیم، هەر سێ كوڕەكەی پێغەمبەر هەر بە

---

١ تفسير المنار ج٤ ص٣٧٢.

[٢] السيرة النبويه ـ الصلابي ـ ص٥٤٦.

منداڵی مردن، ئیتر ئەم زەیدە لە کوێوە دەبێتە کوڕی موحەممەد، هەر بۆیە خوا داوای لە موحەممەد کرد کە زەینەب، ژنە تەڵاقدراوەکەی زەید، مارە بکات، هەتا ئەو یاسا و ڕێسا و داب و نەریتە نەشیاوە نەفامیە بەتاڵ بێتەوە، خوای گەورە بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشە و دابە نەخوازراوە کۆنەی نەفامیی، ناوی زەید و کێشەکە و چارەسەرەکەی دەخاتە ناو قورئان، پاشان داوا لە موحەممەد دەکات، زەینەب مارە بکات، هەتا لای خەڵك دروست ببێ، کە چۆن بەناو باوك، ژنی تەڵاقدراوی کوڕی خۆی (ئەگەر کوڕە) مارە دەکات، بەو جۆرە خوای گەورە یاسا و دابە کۆنە نەشیاوەکان هەڵدەوەشێنێتەوە، خەڵك تێدەگەیەنێ کە هەرگیز زەید کوڕی موحەممەد نییە، هەرچیش وەك زەیدە، کوڕی خاوەنەکەی نییە، بەڵکو کوڕی ئەو باوك و دایکەیە، کە لە ڕاستییدا ئەویان بووە، ژانیان بۆ بژاردووە و شیریان داوەتێ و ناویان ناوە و گەورەیان کردووە، ڕۆژهەڵاتناسان زۆر شتی ناشیرینیان لە بارەی ئەم ژنەی پێغەمبەرەوە وتووە، بەڵام کەسیان هێندەی دکتۆر جەمالی کورد، حاقدانە و دڵپیسانە و بە ڕق و قین نەیوتووە، پێغەمبەر بە بەدڕەوشت ناودەبات، لە کاتێکدا کە خوای گەورە لە بەرزیی حەوت ئاسمانەوە، لە ڕێی جوبرەئیلەوە، لە قورئانی پیرۆزدا، بە دەیان ئایەت، باس لە نەرم و نیانیی و پاکی و جوانیی ڕەوشتی بەرزی موحەممەد دەکات، دەفەرمووێ: بە ڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشتێکی بەرز و جوان و مەزنییت.. خوای گەورە ڕاست دەفەرموێ، ئەو موخەننەك و دڵپیسانە درۆیان کرد، ئینشائەڵڵا خوای گەورە بەرگری لە پێغەمبەری نازداری خۆی دەکات و، دەدات لە دەست و زمان و قەڵەمی، ئەو دەست و زمان پیس و، مێشك پوت و گەنیوانەی، کە هەتا ئەو ڕادەیە جنێو و بوختان بەرامبەر پێغەمبەر بڵاودەکەنەوە و، دەیانەوێت لە کەسایەتی ئەو مەزنە کەم بکەنەوە، هەر خوا خۆی بەسە بۆیان..

پێغەمبەر داوای لەزەینەب و ماڵی باوکی زەینەب کرد، کە ڕازیبن ئەو کچەیان بدرێتە زەید، دواییش کە ڕێکنەکەوتن، هەر پێغەمبەر خۆی داوایکرد کە تەڵاقی بدات، پاشان خوا لە ئاسمانەوە داوای لە موحەممەد کرد ئەو بێوەژنە مارەبکات و

چاری کێشەکەیان بکات، زەینەب هەتا ساڵی بیستی کۆچیی مایەوە، لە سەردەمی خەلیفە عومەردا وەفاتیکرد، زەینەب لەگەڵ براو خوشکەکانیدا موسڵمان بوو، لەگەڵ (عەبدوڵلا و عەبد و عوبەیدوڵلا و حەمنە)دا ئەمیش ناوی (بەڕڕە) بوو، پێغەمبەر ناوی نا (زەینەب)، هەمیشە زەینەب شانازیی دەکرد و دەیوت: "هەموو ژنەکانی پێغەمبەر لە زەویدا داواکراون و مارەکراون، بەڵام من خوا لە ئاسمانەوە داوای کردووم و مارەی کردوم لە موحەممەد.!! زەینەب ساڵی (٥ك) مارە کرا لە پێغەمبەرو ساڵی (٢٠ك) مرد.

٨ـ ئوم حەبیبە، ڕەملە کچی ئەبوسوفیان: ئەمە ژنی کوڕی پوری پێغەمبەر بوو، کە ناوی عوبەیدوڵلا کوڕی جەحش بوو، لەگەڵ مێردەکەی کۆچیکرد بۆ حەبەشە، بەڵام لەوێ مێردەکەی لە ئیسلام هەڵگەڕایەوە و بووە گاور و لەوێ مرد، ئەمیش لێی جیابوویەوەو لە حەبەشە مایەوە، هەرچەندە باوکی گەورەی قورەیش بوو، بەڵام نەیتوانی بگەڕێتەوە بۆ لای کەسوکاری، ئەگەر دەگەڕێتەوە بۆ مەککە بۆ لای کەس وکاری کە لە دوژمنترین دوژمنانی ئیسلام و پێغەمبەر بوون و بە زۆر دەیگەڕێننەوە بۆ بتپەرستیی، یان سزای سەختی دەدەن، ئەگەر دەشگەڕێتەوە بۆ مەدینە، ئەوا کەس نییە کەفالەتی بکات و بەخێوی بکات، پێغەمبەر بە حاڵ و خەفەتی ئەوی دەزانی، کە چەند خۆگر و بە ئارام بووە و وازی لە کەس وکاری ناوداری هێناوە لە مەککە و، لە حەبەشە وازی لە مێردە هەڵگەڕاوەکەی هێناوە، دەبێ کەسێکی لە ئاستی خۆی و بنەماڵەکەی بۆ پەیدا بکات، نامەی نووسی بۆ نەجاشی پاشای حەبەشە، کە بۆی داوا بکات و بۆی مارە بکات، کە ئوم حەبیبە بەوەی زانی، زۆر دڵخۆش بوو و ڕازی بوو، ئوم حەبیبە لە خاکی حەبەشەوە گوازرایەوە بۆ مەدینە هەتا ببێتە ژنی پێغەمبەر، ئەو کاتە ئوم حەبیبە (٣٧) ساڵ بوو، ساڵی حەوتی کۆچیی شوویکرد بە پێغەمبەر، بەم جۆرە هەوڵیدا هەم پاداشتی خۆگریی و ئارامی بداتەوە، هەم ڕێزێکیش بێت بۆ کەسوکارەکەی، ئوم حەبیبە هەتا سەردەمی معاویەی برای ژیا و ساڵی (٤٤ك) کرد.

٩ـ جویریه کچی حارس کوڕی ئەبی زرار: گەورەی بەنی مستەلیق، ژنی (مسافح کوڕی سەخوان) بوو، کە لە غەزای بەنی مستەلەقدا کوژرا، خەڵکێکی زۆر لە بەنی مستەلەق بە ئەسیر گیران، بەڵام کە جویرە بووە ژنی پێغەمبەر، سەد کەس لە خزمانی جویرە ئازادکران، دوای شەڕەکە حارسی کوڕی زرار باوکی جویرە هات بۆ لای پێغەمبەر لە مەدینە، هەتا فیدیە بۆ جویرەی کچی بدات و بەرەڵای بکات، پێغەمبەر بانگیکرد بۆ ئیسلام و موسڵمانان بوو، ئەم غەزایە یەکێکە لە غەزا پڕخێر و بەرەکەتەکان، کە هۆزێك تیایدا هەمووی موسڵمان بوون، سەرەتا هەموویان ئەسیر بوو بوون، بە داوای پێغەمبەر بەرەڵاکران، پاشان جویریە بووە زانا و فەقیە و لە خواترس، فەرموودەیەکی زۆری لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، بە تایبەت لە بارەی فەرزەکانەوە، زۆر حەزی لە ویرد و زیکر بووە، خۆی دەفەرمووێ: دوای نوێژی بەیانی کە پێغەمبەر جێیهێشتوم لە شوێنی نوێژەکەم زیکرم کردووە، هەتا دوای چێشتەنگا و لای نیوەڕۆ لە جێی خۆم نەجوڵاوم، کە پێغەمبەر گەڕایەوە فەرمووی:"تائێستە لەو حاڵەتەی خۆتدای کە جێمهێشتی، وتی: بەڵێ"

جویرە ساڵی (٥٠ك) مرد، یان دەڵێن ساڵی (٥٦ك) [1]، ساڵی (٦ك) شووی کرد بە پێغەمبەر، باوکی هات بە چەند حوشتر دەیویست بە فیدیە رزگاری بکات، حوشترێکی چاکیانی بۆ خۆی هەڵگرتبوو بێئەوەی کەس بزانێ، کە پێغەمبەر هەواڵی دا کە نیازی چییە و هەواڵی حوشترە چاکەکەیانی پێ ووت، موسڵمان بوو، پێغەمبەر کچەکەی مارەکرد، هەموو موسڵمانەکان هەر یەکە بۆخۆی ئەسیر و سەربازەکانیان رزگارکرد، وتیان: ماڵە خەزورانی پێغەمبەرن نابێ ئەسیر بن، ئەمە تاقیکردنەوەیەکی پێغەمبەر بوو بۆ دەرکەوتنی دڵسۆزی سەحابەکان لای، کە دەسکەوت دابەشکرا، جویریە مێردەکەی کە زۆر دوژمنی موسڵمانان و پێغەمبەر بوو کوژرا " کەوتە دەستی سابتی کوڕی قەیس، نۆ ئواقی لەسەر دانا، جویریە هات بۆلای پێغەمبەر، داوای یارمەتی لێکرد کە ڕزگاری بکات لەو بەستنەوەیە،

[1] طباقات ابن سعد ج٨ ص١٢١ . خليفة بن خياط تأريخ ص٢٣٤.

پێغەمبەر بیریکردەوە لە کچی گەورەی بەنی مستەلق حارسی کوڕی زرار، کە سەردارێکی ڕێگرەکان بوو، خاوەنی هێرشی توندبوو بۆ سەر موسڵمانەکان، پێغەمبەر بەجویرەی وت: منیش ڕازیم. هەر کە هەواڵی مارەکردنەکە بلاوبوویەوە، ئەنجامی ئەو حیکمەتە گەورەیە دەرکەوت، سەحابەکان وتیان: چۆن دەبێ خەزورانی پێغەمبەر بەندە و کۆیلە بن لەبەر دەستی ئێمەدا، هەرچیان لابوو ئازادیان کرد، عائیشە دەڵێ: هەر بە مارەکردنەکە سەد کەس لە خزمانی جویرە ئازاد کران، هیچ ئافرەتێك نەبووە هێندەی جویریە خێری بۆ هۆزەکەی بووبێ[1]، کە هۆزەکەی ئەو چاکەیان بینی لەگەڵیان کرا، موسڵمان بوون و چاك بڕوایان هێنا، بوونە پاڵپشتێکی گەورە بۆ موسڵمانان، کە لەوەو پێش دوژمنێکی سەرسەختی موسڵمانان بوون، ئەوەیە مەبەستی پاکی پێغەمبەرایەتی، لە هێنانی ئەو ژنانەی کە هەریەکە مەبەستێکی مەزنی لە پشتەوە بووە.

١٠ـ صفیەی کچی حەی کوڕی ئەختەب: کچی گەورەی بەنی نەزیرە (بەنی قورەیزە)، پێش پێغەمبەر ژنی کەنانەی کوڕی ئەبی حەقیق بووە، لە گەمارۆی خەیبەردا ئەسیر کرا، لە دەسکەوتەکاندا کەوتە دەست دوحیە، بەڵام پێغەمبەر هەستی ئەوی ناسی، حەزی نەکرد ستەمی لێبکرێت، لەبەر ئەوەی کچی ئەو ناودارە مەزنە بوو، خستیە سەر بەشی خۆی و ئازاد و سەرپشکی کرد، موسوڵمان دەبێت یان دەگەڕێتەوە ناو کەسوکاری، ئەو ئیسلامی هەڵبژارد، پێغەمبەر زۆر وەصف و سەنای کرد و مارەیکرد لەبەر، ڕێزی لێنا، سا بەڵکو جولەکەکان ئەم چاکەیە ببینن و پێی بزانن و موسڵمان بن، بەڵام جولەکە لەکوێ ئەو دەروونە دامەزراوەیان هەیە تێبگەن و ڕابچڵەکن[2]، پێغەمبەر پێی وت: هەڵبژێرە، ئەگەر موسڵمان ببیت ئەوا من دەتخوازم، ئەگەر لەسەر ئایینی جولەکەش بمێنیتەوە، لەوانەیە ئازادت بکەین و بگەڕێرەوە بۆ لای کەسوکارت، وتی: حەزم لە ئیسلام

---

[1] نساء الرسول. ص٣٥٨

[2] التأريخ السلامي ـ محمود شاكر، ج١ ص٣٦١

کردووە و بڕوام پێکردبوو پێش ئەوەی بانگم بکەیت، بمخەرە ناو کاروانەکەتەوە، هیچ بەشێکم بە جولەکەوە نەماوە، نە باوکم ئەوێ نە برا، خواو پێغەمبەرم پێ خۆشترە تا بگەڕێمەوە لای گەلەکەم!

بڕوانە پێغەمبەر چەند ناسك و لەخۆبوردانە ڕەفتاری کردووە، ڕێزی گرتووە و ئازادی کردووە، موسڵمان دەبێ، یان دەچێتەوە لای کەسوکارت.؟ساڵی( ٧ك) شووی بە پێغەمبەر کرد، ساڵی (٥٢ك) وەفاتیکرد، فەرموودەی زۆری لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، لە بەشی دحیەی کەلبی بوو، سەحابەیەك هات وتی: پێغەمبەری خوا، صفیەی کچی حەی گەورەی هۆزەکەیم گرت، دام بە دحیە، ئەو لەبنەماڵەیەکی گەورەیەو دوحیە ناتوانێ ڕێزی بگرێت، هەر بۆ تۆ باشە، پێغەمبەر قسەکەی بەلاوە باش بوو، بە دحیەی فەرموو: یەکێ لەو جاریانە هەڵگرە جگە صفیە، پاشان پێغەمبەر وەریگرت و ڕزگاریکرد. صفیە دەڵێ: خەوێکم دی کە ئیمامی بەیهەقی بە سەنەدی صحیح دەیگێڕێتەوە لە ئیبن عومەرەوە، صفیە دەڵێ: لاچاوم شین بووبوویەوە، پێغەمبەر فەرمووی صفیە، ئەوە چییە لاچاوت شین بووەتەوە؟ وتی: وتومە سەرم لە باوەشی ئیبن حەقیق (مێردە پێشوەکەم) دابوو خەوتبووم، لە خەومدا بینیم مانگێك کەوتە باوەشم، خەوەکەم بۆ ئیبن حەقیق گێڕایەوە، بۆکسێکی کێشا بە لاچاومدا وتی: تەمەننای پاشای یەسریب دەکەیت..؟[1] ئەوە خەوەکە بوو هاتەدی و ڕزگارم بوو لەو مێردە تووڕەو ستەمکارەو، لە ئایینی جولەکەو ئاگری دۆزەخ، بووە ئیماندارێکی پاك و ڕاست، بووە ژنی پێغەمبەر لە دنیاو پاشان لە بەهەشتدا، پێغەمبەر زۆر ڕێزی لێدەگرت، لە پشتی خۆیەوە لەسەر حوشتر سواری دەکرد، پێغەمبەر چۆکی دادا هەتا صفیە قاچ بخاتە سەر ڕانی و سەرکەوێتە سەر حوشترەکە، صفیە ئەوەندە بە ئەدەب و پاك بوو، حەزی نەدەکرد قاچ بخاتە سەر ڕانی پێغەمبەر، بەڵکو ڕانی خستە سەر ڕانی و لەسەر چۆك وەستاو سەرکەوت[2]، صفیە دەڵێ: هەرگیز کەسم نەدیوە ڕەوشتی لە

---

[1] الصراع مع اليهود ـ ج٣ ص١٠٣.

[2] السيرة النبوية، أبي شهبة ج٢ ص٣٨٤.

پێغەمبەر جوانتر بێت، هەروەها صفیە دەڵێ: ڕۆژێك عائیشە و حەفسە وتیان پێم: ئێمە بەڕێزترین لای پێغەمبەر لە تۆ، ئێمە ژنی پێغەمبەرین و کچی مامەکانین (واتە ئەبوبەکر و عومەر)، صفیە دەڵێ: ئەوەم بۆ پێغەمبەر گێڕایەوە، فەرمووی (ئەی بۆ نەتگوت چۆن لە من چاکترن، کە موحەممەد مێردمە هارون برامە و موسا مامەمە) صفیە دەڵێ: کە پێغەمبەر لە نەخۆشی مردنەکەیدا بوو، زۆر ناڕەحەت بوو، هەموو ژنەکانی لەوێ بوون، صفیە وتی: بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا حەزم دەکرد ئەو نەخۆشیەی تۆ بە منەوە بوایە، ژنەکانی تری چاویان لە یەکتری داگرت وەك گاڵتەکردن، پێغەمبەر چاوی لێیان بوو، فەرمووی: چاو لەیەك دادەگرن..؟ وتیان: لەچی..؟ فەرمووی چاو لەو دادەگرن، بە خوا ئەو ڕاست دەکات. صفیە حەزی دەکرد خۆی و باوك و دایکی بکاتە قوربانی پێغەمبەر، حەزی دەکرد خۆی نەخۆش بکەوێ، پێغەمبەر ئازارێکی پێنەگات، پێغەمبەریش حەزی دەکرد صفیە ڕێزی بگیرێ و لەو جێیەدا بێ کە شایستەیەتی، دەیویست بەو ژنهێنانە، ڕق و قینی جولەکە کەمبێتەوە، بەرامبەر پێغەمبەر و ئیسلام و ڕوو لەخێر بکەن.

صەفیە لە مانگی ڕەمەزان، لە سەردەمی معاویەدا ساڵی (٥٢ك) مرد، صفیە خۆی دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە سەردەمی خەلیفە عومەردا جاریەیەکم هەبوو، دەچێت بە عومەر دەڵێ: صفیە حەزی لە ڕۆژی شەممەیە (کە جەژنی جولەکەیە) و سەردانی جولەکەکان دەکات.. عومەر ناردی بە شوێنی صفیەدا و لەوبارەیەوە پرسیاری لێکرد، صفیە وتی: بۆ شەممە نەخێر من حەزی لێناکەم، لەو ڕۆژەوە خوا بۆی گۆڕیوم بە ڕۆژی هەینی، بەڵام بۆ سەردانی جولەکەکان، لەوێ ڕەحم و خزمم هەیە، دەچم سەردانیان دەکەم، عومەر قسەکەی لێوەرگرت، ئەنجا بە جارییەکەی وت: کێ وای لێکردیت ئەو قسەیەم پێبگەیەنیت، وتی: شەیتان.. عومەر پێی وت: بڕۆ ئیتر تۆ ئازادیت، واتە لەسەر ئەو قسە ڕاستەی، لە کۆیلە و جاریەوە کردیە ئازادو، ئیتر دەبێتە خاوەنی خۆی.

١١ـ مەیمونە کچی حارسی هیلالی: خوشکی لوبابەی ژنی عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیبە، واتە خاڵۆژنی عەبدوڵڵای کوڕی عەباسە، هەروەها خاڵۆژنی

خالیدی کوڕی وەلیدە، پێغەمبەر لە مەککە مارەیکرد لە کاتی عەمرەدا لە کۆتایی ساڵی حەوتەمی کۆچیی، ئەمە دوا ژنە کە پێغەمبەر مارەی کرد، پێشتر ناوی (بیرە) بوو، پیغەمبەر ناوی نا مەیمونە، پێشتر لای ئەبی رهەمی کوڕی عەبدولعزای عامری بوو، مرد بوو، کە پێغەمبەر مارەی کرد (٣٧) ساڵ تەمەنی بوو، لە خەلافەتی معاویەدا مرد ساڵی (٥١ك)، کە مێردە پێشوەکەی مەیمونە مرد، لەبەرئەوەی خوشکی ئوم فەزڵ (لوبابە) ژنی عەباس بوو، هەر عەباس بووە وەکیل و کەفیلی، ئەو لە پێغەمبەری مارەکرد، لە زەواجی مەیمونەدا کێشەیەکی فیقهی هەیە، کە فەقیهەکان تیایدا ناکۆکن، دەڵێن: ئایا پێغەمبەر مەیمونەی هێنا تەنها بە عەقدی نکاح، یان عەقدی خستە سەر دوای هەڵوەشانەوەی[1].

١٢- ماریەی قیبتی: ئەم وەك ژنی ئازاد نییە، بەڵکو ئەمە ئەمەتەیە، مقەوقسی میسری ساڵی (٧ك) بە دیاریی ناردی بۆ پێغەمبەر، ئەو و سیرینی خوشکی، پێغەمبەر سیرینی دا بە حەسانی کوڕی سابیت، خۆیشی ماریەی مارەکردو ئیبراهیمی لێبوو، ماریەو سیرین کۆیلە بوون پێغەمبەر ئازادی کردن، ماریە ساڵی (١٦ك) مرد لە سەردەمی خەلیفە عومەردا.

خوا خەدیجەی هێشتەوە هەتا ئەو قۆناغە قورسە گرانەی بە موحەممەد گوزەراند، هەتا پاڵپشت بێت و یاریدەی بدات بۆ قۆناغی نهێنی و ئاشکرای مەککە.

بێگومان زۆرن خەڵك کە هەریەکە لەبەر هۆیەك، یان چەند هۆیەك ژن دەهێنن، لەبەر جوانیی و ئارەزو پارە و سەروەت و سامان و کەسێتیی و حەسەب و نەسەب، یان لەبەر ئایین و رەوشت و ژیرییەك کە کەسێك لە بەرامبەرەکەیدا دەبینێ، ئاشکرایە کە پێغەمبەر جیاکراوەتەوەو رێی پێدراوە کە لە چوار ژن زیاتری هەبێت، پێغەمبەر وەفاتی کرد، نۆ ژن و دوو سورییەی هەبوو، هەموو ژنەکانی مردنیان دواکەوت بۆ دوای خۆی، جگە خەدیجە کە لە مەککە مرد لە ساڵی دەیەمی پێغەمبەرییدا،وە زەینەبەی کچی خوزەیمە، هەموو ژنەکانی پێغەمبە

[1] فقه السيرة النبوية ـ محمد رمضان البوطي ـ ص٢٥٨.

بێوەژن بوون، ژمارەیەکیان (١٥) ساڵ یان (٢٠) ساڵ لە خۆی گەورەتر بوون، جگە لە عائیشە کە کچ بوو، هێنانی هەموو ژنەکانی پێغەمبەر، پەیوەندییان بە ئایینەکەیەوە هەبوو، هیچیان بۆ ڕابواردن و جوانیی و دنیاویستی نەبووە، ژنهێنانی پێغەمبەر شێوازێك بوو بۆ گەیاندنی ئایین و سوننەت و شەریعەت، نەك شەهوەت و ئارەزوو، ژن هێنانی پێغەمبەر دواکەوتبوو گەر بەراوردی بکەین بە کۆمەڵگەی خۆیەوە کە لە دەساڵیەوە کچ شووی دەکرد و لە پانزە ساڵیەوە کوڕ ژنی دەهێنا، لە ماوەی کوڕێنیەکەیدا کارێکی نەشیاوی لێ دیاریی نەداوە، خەدیجە دەیزانی موحەممەد دواکەوتووە لە هاوەڵەکانی، هەر بۆیە ئەو داوای دەستی موحەممەدی کرد بۆ شوکردن نەك موحەممەد.

ئێمە دەبینین کافر و بتپەرست و دووڕووەکان لە تۆمەتەکانیاندا هەرگیز تاوانباریان نەکردووە، بەزۆریی ژنهێنانی، چونکە هەتا قۆناغی مەککە تەواوبوو موحەممەد یەك ژنی هەبوو، کە خەدیجە مرد، موحەممەد تەمەنی گەشتبووە (٥٣) ساڵیی، بەڵام هیچ پیاوێکی مەککەیی نەبووە لە تەمەنی (٥٣) ساڵیدا شەش حەوت ژن زیاتری نەبووبێت، بە مەرجێك خەدیجە پێشتر دوو شووی کردبوو، چەند منداڵی بووبوو، ڕەونەقی ژنی نەمابوو، محەممەدیش هەتا ئەوی هەبوو ژنی تری نەهێنا، پاش ئەویش هەتا ماوەیەك ژنی نەهێنا، ئەنجا بێوەژنێکی هێنا کە زۆر بەتەمەن بوو، پاش ئەو بە دوو ساڵ، ئەنجا عائیشەی هێنا، واتە تەمەنی پێغەمبەر نزیك بە (٥٤) ساڵ بووبوویەوە، ئەوجا عائیشەی کچی ئەبوبەکری هێنا، هەر ژنەی لە گەل و هۆزێك بوون کە لە ناو عەرەبدا ڕێزی زاواو خەزوریی زۆر بوو، گەر سەیر بکەیت دەبینی یەکیان کۆچی کرد بۆ حەبەشە و مێردەکەی لەوێ مرد، یان کۆچی کرد بۆ حەبەشەو مێردەکەی لەوێ لە ئیسلام هەڵگەڕایەوەو بووە گاور، یەکێك کچی گەورەی هۆزەکەی بوو، لائق نییە بکەوێتە ماڵی سەربازێك نەزانێ مراعات و ڕێزی بگرێ، ئەمە جگە لەوەی عائیشە و حەفسە کچی هەردوو وەزیرە ڕاست و چەپەکەی بوو، بۆ پتەوکردنی زیاتری پەیوەندیی بوو، زەینەبی کچی جەحش شۆڕشێك بوو دژی چینایەتی و دابوونەریتی لارو وێرو نەشیاوی کۆن، بەناوی بە

کوڕ کردن و هەڵوەشانەوەی ئەو دابە، ئیتر کامەیە جێی هەواو هەوەس لە ژنەکانی پێغەمبەردا، کە بە مەرجێك پێغەمبەر ئەوەندە کاری بانگەواز و وەحیی و کێشەی بتپەرستەکانی هەبوو کەمتر دەیپەرژایە سەر ژنەکانی، مەبەست لە زۆری ژن، کردنەوەی ڕێگەبوو بۆ موسڵمانەکان هەتا زیاتر لە ژیان و کارو کردەوەی پێغەمبەر و ئایینەکەیان بگەن [1]، ژن هێنانی پێغەمبەر لەبەر ئەم هۆیانە بوو:

١ـ بەرژەوەندی زانستیی: بۆ بڵاوکردنەوەی زانستە شەرعییەکان لە ناو ژناندا، بەوەی پەیوەندیی بە خۆیانەوە هەیە چونکە ژن زیاتر لە نیوەی کۆمەڵە، دەبێ قوتابخانەیەك هەبێ زانستە ژنانەکانی لێوەرگرن، کە ئەویش ئەو ژنانەی پێغەمبەرە، چونکە رۆژانە پێغەمبەر لەگەڵ دەیان سەحابەدا دادەنیشێ و هەموو کاروبارو پرسیارێکی پەیوەندیی بە پیاوەوە هەبێ دەریدەبڕن و تاوتوێی دەکەن، حوکمە ژنانییەکان پێویستی بەو ژنانە هەیە، هەر لە حەیزو نیفاس و پاکبوونەوە،و...هتد.

٢ـ بەرژەوەندییە تەشریعیەکان: بۆ هەڵوەشاندنەوەی داب و نەریتی بە کوڕکردن، کە لەو کاتەدا لە مەککەو ناوچەکەدا باوبوو، دابی برایەتیی کە یەکێك هاوڕێی یەکێك بوایە، نەدەبوو کچ و خوشکی بخوازێ، وەك عائیشەی ئەبوبەکر، ژنەکانی پێغەمبەر زیاد لە سێ هەزار فەرموودەیان گێڕاوەتەوە.

٣ـ بەرژەوەندیی کۆمەڵایەتیی: بۆ پتەوکردنی پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی لە نێوان پێغەمبەر و موسڵمانان و خێڵ و هۆز و بنەماڵە گەورەکان و گاور و جولەکە، بەوەی پێغەمبەر دەبووە زاوایان، کە زاواو خەزوریی لای عەرەبی ئەو کاتە دەبووە پشتگیرو پاڵپشت و گوێیان لێدەگرت.

٤ـ بەرژەوەندیی سیاسیی: بۆ ڕاکێشانی راو پشتگیریی هۆزەکان بۆ لای خۆی، یان بە پشتگیریی خەزوری و زاوایەتیی، یان بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە ناویاندا.

---

[1] زوجات النبي ـ سعيدايوب ـ ص١٢ . تعريف عام بشخصية الرسول ـ محمد رشاد منصور شمس ـ دار المشرق للكتاب ـ ص٢٩.

٥- بەرژەوەندیی مرۆڤایەتیی: پێغەمبەر کاری مرۆڤانەی زۆر دەکرد، کە کەس خۆی لێنەدەدا و باری خۆی قورس نەدەکرد، ئەوەبوو دەچووە ژێر باری مارەکردنی ژنی بێوەژنی پیاو کوژراو و مردو و خاوەن عەیال و منداڵ، بۆ کەفالەتکردن و رزگارکردنیان لە تەنهایی و سەرپەرشتیکردنی منداڵەکانی.

٦ـ بەرژەوەندیی پەروەردەیی: لە رێی خۆیەوە، نموونەیەکی جوانی لە پەروەردە و خۆشگوزەرانیی نێوان ژن و پیاو دەبەخشیە کۆمەڵ، بەوەی کە ژنەکانی جوان بەخێو دەکرد و دەیلاواندنەوە و رێزی خۆیان و کەسوکاریانی دەگرت، نێوان ژنەکانی خۆش دەکرد و جیاوازی نەدەکردن و، وەك یەك لایان دەمایەوە و خەرجیی دەکێشان و ئامۆژگاریی دەکردن.

ئیتر دەبێ دکتۆر جەمال و مامۆستاکانی وەلامیان چی بێ بۆ ئەم هەموو گەورەیی و لوتف و نەجابەتەی لە ژیان و گوزەرانی ئەو نازدارو ناوازەیەدا هەیە؟!!.

## محەممەد لە ماڵی دایە فاتمەدا

هەیکەل دەڵێ:" مامی پێغەمبەر هەژار بوو، منداڵی زۆری بوو، هەستی دەکرد موحەممەد دەتوانێت هۆیەك بێت بۆ پەیداکردنی رزق و رۆزیی، موحەممەد دوای مردنی باوكو دایكو باپیری لە ماڵی ئەبوتالیب گەورە بوو، ئەبوتالیب خاوەن کڵفەت بوو، بەتایبەت دوای جەنگی فوجاری چوار ساڵە کە هەموو خەڵکی مەککەی ناڕەحەتکرد، کە عەبدولموتەلیب هەستیکرد ئەجەلی نێزیك بووەتەوە، وەسیەتی کرد بۆ ئەباتالیبی کوڕی، کە چوار دەوری برازاکەی، موحەممەد کوڕی عەبدوڵلا بگرێ و بیپارێزێ، رەنگە عەبدولموتەلیب مەبەستی لەوە، ئەو دەستە ئەمینە پاکە پڕ سۆزە بێت، کە لە ماڵی ئەبوتالیبدا شاراوەتەوە، کە فاتمەی کچی ئەسەدی کوڕی هشام، کوڕی عەبدولمەنافە خێزانی ئەبوتالیب، فاتمەی نەرم ونیان و سەحابی، کە یەکێك بوو لە کۆچکەرە یەکەمەکان، فاتمە بە ئاشکرا دەیبینی کاتێك کە موحەممەد دێتە سەر سفرە و نان لەگەڵ منداڵەکانیدا دەخوات، بەرەکەت

دەكەوێتە ئەو خواردنە[1] ، فاتمە بە ڕاستیی چاودێریی و گوێدانێكی جیای دەدا بە موحەممەد لە ناو منداڵەكانیدا. مێژوونووسان باس لە دۆخی موحەممەد دەكەن لە ماڵی مامیدا، دەڵێن :"منداڵەكان كە لە خەو هەڵدەسان هەموو چاونوساو و ریپۆقاوی، بەڵام موحەممەد لە ناویاندا بەیانی هەڵدەسا چاوی چەورو كڵاوی پاك"[2].

كە دایە فاتمە مرد، پێغەمبەر نەیهێشت ئەو چاكەیەی لە بیر بچێت، لای سەریەوە دانیشت و فەرمووی: "رەحمەتی خوات لێ بێت دایە گیان، تۆ دوای دایكم خۆت برسی دەكرد، هەتا من تێربم، خۆت بێبەرگ دەكرد هەتا من پۆشاكم تەواو بێت، خۆت لە هەموو خۆشییەك دەگرتەوە، هەتا من تێرو پڕ بم، ئەوەت تەنها لەبەر خواو رۆژی دوایی دەكرد". پاشان داوایكرد سێ جار بیشۆرن، كە ئەو ئاوەیان هێنا كافوری تیابوو بە دەستی خۆی كردی بەسەریدا، پاشان كراسەكەی خۆی داكەند و كردیە بەری، بەسەر ئەودا كفنی لە بوردە كردە بەر، ئەنجا پێغەمبەر بانگی ئوسامەی كوڕی زەید و ئەبا ئەیوبی ئەنسارییی و عومەری كوڕی خەتتاب و غوڵامێكی رەشی بانگكرد گۆڕەكەیان بۆ هەڵكەند، كە گەیشتە ئاستی بەردی ئەلحەد، بە دەستی خۆی بۆی هەڵكەند و بە دەستی خۆی خۆڵەكەی دەردا، كە لێبوویەوە خۆی تیا ڕاكێشاو فەرمووی: (هەر خوایە دەژێنێ و دەمرێنێ، هەر خۆی زیندووە و نامرێ، خوایە خۆشبە لە دایكم، فاتمەی كچی ئەسەد، زمانی پاراوكە بۆ وەڵامدانەوە، ئەم گۆڕەی بۆ فراوان بكە بۆ خاتری پێغەمبەرەكەت و هەموو پێغەمبەرانی پێش من، هەر تۆ خاوەن رەحم و سۆز و میهرەبانییت) چوار جار ئەڵاهوئەكبەری كرد، خۆی و عەباس و ئەبوبەكری صدیق خستیانە ناو لەحدەكە)[3].

---

[1] نساء مبشرات بالجنة ـ ج١ ص٥٩ أحمد خليل صحيح.

[2] حياة محمد ـ محمد حسنين هيكل ـ ص١٢٠. السيرة الحلبية ـ ج١ ص١٨٩. رجال و نساء حول الرسول ـ سعد يوسف ابو عزيز ص٤٤١ـ دار الفجر للتراث ـ القاهرة ـ ٢٠٠٤.

[3] رواه الطبراني في الاوسط بقية رجاله الصحيح.المجمع برقم ١٥٣٩٩.

ئیبن عەباس دەڵێ: کە فاتمەی دایکی عەلی مرد، پێغەمبەر کراسی خۆی لەبەرکرد لەگەڵیا راکشا لە گۆڕەکەیدا، وتیان: نەماندیوە ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە بۆ کەس بکەیت، فەرمووی: (کەس نەبووە دوای ئەبوتالیب، هێندەی ئەم بۆ من چاك بوو بێت، ئەو کراسەی خۆم لەبەرکرد، هەتا بەرگە جوانەکانی بەهەشتی لەبەر بکەن، لە گەڵیدا ڕاکشام، هەتا گۆڕەکەی بۆ ئاسان بێت)[1] .

کە پێغەمبەر تەمەنی چووە نێوان ١٥ـ ٢٠، ساڵان، حەزی کرد باریدەی بێگوزەرانیی مامی بدات، خۆی دەیفەرموو: هیچ پێغەمبەرێك نەبووە شوانی نەکردبێ، موسا لە کاتی شوانیدا بووە پێغەمبەر و، داود لە کاتی شوانیدا بووە پێغەمبەر، منیش بوومە پێغەمبەر، مەڕەکانی خزمەکانم بەکرێ بەخێوکرد..

## محەممەد لە ماڵی خەدیجەدا

ئەبوتالیبیش وای لە برازاکەی دەبینی، کە هۆیەك بێت بۆ پەیداکردنی رزق و ڕۆزیی، ماوەیەك شوان بوو، بەڵام پاشتر بیستی کە خەدیجە خەڵك دەگرێ لە قوڕەیش بۆ بازرگانیی شام، کە کەسایەتیەکی خاوەن بازرگانیی و شەرەف و پارە و سامان بوو، پێشتر دوو شوی کردبوو، پاشانیش زۆر لە گەورەکانی مەککە داوایان کردبوو بیخوازن، خەدیجە گومانی وابوو کە ئەوان تەماعی سامانەکەیان پێی هەیە، بەڵام ئەو هەر لە گەشەکردنی سامانەکەیدا بوو، ئەبوتالیب بیستی کە خەدیجە خەریکی ڕێکخستنی کاروانێکە بۆ شام، موحەممەدی برازای بانگ کرد، کە ئەو کاتە(٢٥) ساڵان بوو، پێی وت: برازاکەم، من پیاوێکم سامانم نییە، زەمانە زۆر زەختمان لێدەکات، بیستومە خەدیجە ئەوانەی گرتووە بەوەندە، بەڵام من بەوە رازی نابم، داوادەکەم بۆت زیاد بکات، دەتەوێ قسەی لەگەڵ بکەم، موحەممەد وتی: چۆن حەز دەکەیت وابکە کە پێتخۆشە، ئەبوتالیب چوو بۆ لای خەدیجە و وتی: دەتوانی موحەممەدیش بە کرێ کارت بۆ بکات، بیستومانە فلانت گرتووە بە دوو ئەوەندە، بەڵام بۆ موحەممەد رازینین بەوە، بەڵکو بە چوار ئەوەندە، خەدیجە

---

[1] قال الهيثم في المجمع ج٩ ص٢٥٧ بقيه رجاله ثقات

وتی: ئەگەر داوات بۆ کەسێکی دووریکردایە کە رقمان لێی بوایە دەمانکرد، ئەی چۆنە داواکەت ئەگەر بۆ خۆشەویستێکی نزیك بێت؟، ئەبوتالیب گەڕایەوە بۆ لای موحەممەد و بۆی گێڕایەوە پێی وت: ئەمە رزقێکە و خوا بۆی ناردووی! موحەممەد لەگەڵ مەیسەرەی غولامی خەدیجە بە بیاباندا قافڵەیان خستەڕێ بەرە و شام، بە رێگەی وادی قوراو مەدیە و ماڵەکانی سەموددا، هەر بەو رێگەیەدا لەگەڵ ئەبوتالیبی مامیدا کاتێك تەمەنی (١٢) ساڵان بوو بۆ باشووری شام چوو، بەو رێگەیەدا یادگاریە کۆنەکانی هاتەوە بیرو یادگاری زۆری تری لا گەڵاڵەبوو، لەسەفەری دووەمیدا باسی زۆری بیست لە پەرستش و بڕوای خەڵکی شام و بازاڕەکانی ناوچەکە، زۆر شتی لە گاورەکان بیست، دوای تەواوکردنی کاروباری بازرگانیەکە و تاوتوێکردنی قازانج، هەستیانکرد هیچ کاروانێکی پێشووتری خەدیجە سوودی وای نەبووە، چونکە ئەمانەت و توانایی و رەوشتی شیرین وساغی مامەڵە، کاڵاکانی ساغکردەوە و هەستی مەیسەرەی بە لای خۆیدا بزواند، کە هاتنەوە نزیك مەککە، مەیسەرە وتی: بچۆ باسەکانت بۆ خەدیجە بگێڕەوە، کە چەند دەستت بەخێر بووە و ئێستە ئەو قازانجە زۆرە لە تۆ دەناسێت، هەر کە لە دوورەوە خەدیجە موحەممەدی لەسەر حوشترەکە بینی پێشوازی لێکرد و بردیەوە ماڵەوە و گوێی بۆ راگرت، کە چۆن برگە شیرینە ئەفسوناویەکانی لە زمانێکی بەلیغەوە بەشارەزایی دایدەرێژێو دەیڵێ، ئەو هەموو سوود و قازانجەی بۆ خەدیجە هێناوە، پاشان مەیسەرەش گەڕایەوە و هەواڵی زیاتری لە بازرگانیەکە و هەڵسوکەوت و ئەمینی و راستگۆیی و رەوشتبەرزیی موحەممەدی گێڕایەوە، ئەمە هەستێکی سەیری لە ئەستی خەدیجەدا دروستکرد، ئەوەی ساڵەهایە بۆی دەگەڕا کە لە هەموو ئەشرافە قورەیشیەکاندا نەیبینیبوو، لە نزیکەوە لە پاڵ خۆیدا لە موحەممە بیستی، هەر لە خۆوە دەنگێك لە دڵیدا و وتی: ئەمە هەلە، تا ئەم گەنجە پاکە پوختەت لە دەستنەچووە، بەرەو رووی بچۆ.. حەزیکرد شوو بکات بەو گەنجەی کە تێر نەدەبوو لەسەیرکردن و گوێگرتن لە وتەکانی، کاری لە قوڵایی دڵی کردبوو، ئەو حەزەی لای خوشکەکەی، یان لای نەفیسەی کچی منیەی هاوڕێی

گێڕایەوە، نەفیسەش پێی باش بوو، بە جۆرێك چوو بۆ لای موحەممەد و پێی وت: ئەوە چی وات: لێدەكات تائێستە ژنت نەهێناوە، موحەممەد وتی: هیچی وام بەدەستەوە نییە. ئەی ئەگەر ئەوانەت بۆ كراو بانگكرایت بۆ جوان و ماڵ و هاوشەرەف و هاو كۆفی خۆت، وەڵامت چ دەبێت؟ وتی: جا ئەوە كێیە..؟ نەفیسە بە وشەیەك وتی: خەدیجە، موحەممەد وتی: جا ئەوە چۆن بۆ من دەگوزەرێ..؟ زانیبووی كە ئەو بۆ زۆر لە ئەشراف قورەیش و دەوڵەمەندەكانی ڕازی نەبووە، نەفیسە وتی: ئەوە بۆ من دابنێ، موحەممەدیش ڕەزامەندیی خۆی ئاشكرا كرد، دوای ئەوەی پرسی ئەبوتالیبی مامی كرد، خەدیجەش خاویی نەكرد، یەكسەر ئەو كاتەی دیاریی كرد كە خۆی و مامەكانی بێن و داواكەیان ببڕێننەوە، مامەی خەدیجە، عەمری كوڕی ئەسەد بوو مارەیكرد. لێرەدا سەرچاوەكان جۆراوجۆرن، هەندێك دەڵێن خوشكی خەدیجە داوای موحەممەدی كرد بۆ خەدیجە، زۆریش دەڵێن مەیسەرە هاتووە، بەڵام بۆ مەیسەرە زیاتر ڕێی تێدەچێت، هاوڕێ و نزیك و ژیر بووە، یان دەڵێن باوكی خەدیجە لە پێش شەڕی فوجاردا مردووە، لەبەرئەوە عەمر مامەی خەدیجە مارەیكرد، بەڵام هەندێك دەڵێن باوكی لە مەجلیسەكەدا بووە ڕازی نەبووە، بەڵام خەدیجە هەر سووربووە، ئەمانە هەموو قسە و باسن و هەواڵەكە دەوڵەمەندتر دەكەن، نەك بیشێوێنن، بەڵكو وردترو قوڵتری دەكەن، لە سەر بیست بەكرە مارەیكرد، موحەممەد زۆر خێرا كەوتە ناو خێزانێك، كە خۆی بۆ ئامادە نەكردبوو، چووە سەر ماڵی خەدیجە و خێرا منداڵیان بوو، بووە باوكی كوڕ و كچ، بووە خاوەنی ژنی ژیر و شیرین و خۆشە ویست و بە سۆز، لە شاری مەككە موحەممەد ناونرابوو ئەمین، خەدیجەش ناونرابوو پاك و خاوێن، زۆر سەیربوو، وەك بڵێی خوای گەورە خەدیجەی بۆ ڕۆژێكی قورس ئامادە دەكرد، هەر وەك چۆن محەممەدی ئامادە دەكرد، خەدیجە بازرگان بوو، كاروانی دەنارد بۆ شام، بازاڕ و دوكان و وڵاخ و خانووی هەبوو، خزمەتكاری هەبوو، ژنێك ئاوا خەریكی كاری پیاوانە بوویێت، دەبێت ژنێكی ژنانەی بە سەلیقە و عەقڵ گەورە و ئارام و خۆگر و دامەزراو بێت، ژن هەیە ناتوانێت منداڵەكانی خۆشی بەخێو بكات، بەڵام خەدیجە

لەبەر ئەوەی بازرگان و ژیر و دامەزرا و بوو، ناودار بوو بە (پاك و خوێن)، واتـە لـە
رووی رەوشتیەوە پاك و دامەزراو بوو، كەس زەرەری لەدەست و زمانی نەكردووە،
هەر بۆیە ئەو نـاوو وەسـف و سـەنایانەیان بـۆ دانـاوە، خەدیجـە پیایـدا دیـارە كـە
خاوەن دڵێكی بەهێزە، كەوتە ژیانێكی تر، هەر لە شاری مەككە دوو كوڕی هـەبوو،
هەر لە مەككە مردن، ئەمە ئازاری ژیانە، موحەممەد و خەدیجـە كەوتنـە نـاو تـاڵ و
شیرینیی ژیانەوە، پێشتر موحەممەد لە ناو غەمی مردنی دایك و باوك و باپیردابوو،
پاشان غەمی زۆر كڵفەتی مامی و كاركردن بۆ سـوككردنی بـاری سەرشـانی مـامی،
پاشان غەمی بیروباوەڕ و ڕەوشتی گەلەكەی، ئەوا غەمی ژیان و ژن و منداڵیشی بۆ
زیاد بوو، موحەممـەد ڕازی بـوو خەدیجـە هـەر خـەریكی ماڵەكـەی و سامانەكەی و
منداڵەكانی بێت، ئەم كاتی فراوانترو زۆرتـری بـۆ ڕەخسـا بـۆ بیركردنـەوە و هیـوای
ژیـان، موحەممـەد كەسێكی دوورو بێئاگـا نـەبووە لـە ژیـان و دونیـاو گـوزەران و
كێشـەكانی، موحەممـەد بـاوك و دایكـی مـردن، ئەمـە گـەورەترین كێشـە و
بیركردنەوەی بۆ دروستكرد، پاشان لەسەر سفرە و كـۆڕ و دیوەخـانی باپیریـدا كـە
گەورەی قورەیش بوو دەژیاو دەهاتوو دەچوو، گەورە بوو، دووجار چووەتە شام و
لەگـەڵ كـاروان و بازرگـانیی و كێشـەكانی غـەریبیی خـەڵك و وڵاتـانی تـردا ژیـاوە،
دەڵێن لە گەڵ زوبێری مامی دا چوە بۆ یەمەن، ( سبل الهدی والرشاد، ج٢ ص١٣٩)
بەرچاوی كراوەتەوە و لە ژین و ژیـان تێگەشـتووە، خـەڵكی مەككـە خۆزگـەیان بـە
موحەممـەد دەخواسـت بـۆ ژنـی جـوان و خـاوەن سـامان و شـەرەف و نەسـەب،
موحەممـەد كـەم قسـە و بێكێشـە بـوو، بـەڵام زۆر بـیری دەكـردەوە و چـاك گـوێی
دەگـرت، موحەممـەد لـە خـەڵكی مەككـە دانـەبڕا، تێكـەڵیان دەبـوو، بەشـداریی
چاككردنەوەی كەعبەی كرد، كە لافـاو روخانـدبووی، وای لـە خەدیجـە دەبـینی كـە
چاكترین ژنە بۆی و هەموو مراعاتێكی دەكات، داخۆ لـە ماڵـەوە لەگـەڵ خەدیجـەدا
باسی چیان كردبێ و چۆن لە بیروباوەڕ و رەوشتی خـەڵكی مەككـە روانیبێتیـان؟!
بێگومان موحەممەد باسی ئەو هەموو بت و دارەی بۆ خەدیجە كـردووە كـە دەبێـت
سوودی بتێك بە دار و بەرد دروست كرابێت، چی دەبێت؟! كە خـەڵك كردوویانەتـە

خـوا، بێگومـان خەدیجـەش کـە ئـەو هـەموو رەوشـتە جـوان و نـەرم و نیانـەی لەموحەممـەدی خۆشەویسـتی دیـوە، ئـەو قسانەشـی لێوەرگرتـووە و بـیری لێکردووەتـەوە و سـەلماندویەتی، بێگومـان خەدیجـە بـە کاروبـاری بازرگانییـەوە سەری قاڵ بووە و حەتمەن موحەممەدیش یارمەتی داوە و سەرپشکی هەندێ کاری بۆکردووە، یارمەتیدەرێکی پـاك بـووە بـۆ هەڵسـوڕاندن و زەحمـەت کەمکردنـەوەی خەدیجـە، رەنگـە موحەممـەد دوای ئـەو سـەفەرەی، جـارانی تـر چـووبێتە شـام و شوێنی تر، ئەم جارە بە کرێکاری نا، بەڵکو وەك خاوەن کاروان و بار و، شتومەکی خەدیجـەی خێزانـی، دوایـیش کـە هاتووەتـەوە، جگـە باسـی قـازانج و زەرەر و کێشەکانی و جۆرو پێویستیەکانی ئەو ناوچانە، باسی جۆری خەڵك و جۆری قسە و باس و داب و نەریت و ئاین و بیروباوەڕی بۆکردووە، خەدیجـەی ژیـر و بازرگـان و خاوەن بیر و هەست و سۆز، چاك گوێی بۆ گرتـووەو وتووێـژیان پێکـەوە کـردووە، جاران جگە باسـی کـاڵا و کـاروان و بازرگـانیی، رەنگـە هیچـی تـر لـە مـەغزی ئـەو بازرگانـەدا نـەبووە، بـەڵام دوای هـاتنی موحەممـەد، بـاس و خـواس و رەوشـتی کۆمەڵگە و بیروباوەڕ و دابونەریتی خـەڵکی، بووەتـە باسـیان و هەسـت و نەسـتی خەدیجـــەی بزاوانـــدووە و کـــاری تێکـــردووە و، وردە وردە لـــە ئاقـــاری تـــەنها سەرگەرمکردن بە بازرگانییەوە لای داوە، چـونکە ئـیتر باسـی بازرگـانیی خەدیجـە نامێنێ، لـەوە گـرنگتر دەعـوە و بانگـەواز و کێشـەکانی کۆمەڵایـەتیی و ئـایینیی و رەوشـتی لـە مـاڵی خەدیجـەدا دەردەکـەوێت، رەنگـە خەدیجـە لـە موحەممـەددا کەسێکی خێرخواز و چاکساز و خـاوەن بیروبـاوەڕی تایبـەت و مـەزنی دیبـێ، ئـیتر وازی لە کاروان و بازرگانی هێنابێ و لـە کێشـە کۆمەڵایـەتیی و ئایینییـەکان حـاڵی بووبێت و خۆی یەکلاکردبێتەوە بـۆ بـە خێـوکردنی مـاڵ و منـداڵ و خزمـەتکردن و یارمەتیدانی موحەممەد، یان کاسبییەکەی دابێتـە کەسـێکی تـر بـۆی بکـات، خـۆی کەش و هەوای سازاندبێ هەتا موحەممەد زیاتر بیربکاتەوە و یەکلا بێتـەوە بـۆ ئـەو چاکسازییەی کە باسی دەکات و بەتەمایە لە کۆمەڵگەدا گۆڕانکاریی بکـات، رەنگـە خەدیجە وتبێتی ئەوا من چـوومەتە ژور پـەنجا سـاڵ، پیـاوی بـاش و منـداڵی پـاکم

هەیـە، سـامانم زۆر و زەبەنـدەو، موڵـك و خـانووم هەیـە، ئـیتر پێویسـت ناكـات بازرگانیی بكەم و سـەری موحەممـەدیش قـاڵ بكـەم و كـات بـەو باسـانەوە بگـرم، رەنگە خۆی یەكلاكردبێتەوە بۆ خزمەتی موحەممەد و منداڵەكانی، لە كوڕ، قاسم و عەبدوڵڵای هـەبوو، لـە كـچ، زەینـەب و روقیـە و ئـوم كەلسـوم و فاتیمـەی هـەبوو، كوڕەكانی بە منداڵیی مردن، هەروەك چۆن خۆی منداڵ بـوو دایك و بـاوكی مـردن، ئەمانـە جۆرەهـا كاریگـەریی لـە نـاخ و دەروون و هەسـتیدا دروسـت كـرد، بـۆ سووككردنی باری ژیانیان، داوای لە خەدیجە كرد كە زەیدی كوڕی حاریسە بكڕێت، بۆ جێبەجێكردنی ئـەركی و مـاڵ و دەرو سـووككردنی كاروباریـان، هـەتا خەدیجـە یەكلا بێتەوە بۆ مێرد و ماڵ و منداڵ، موحەممەدیش یەكلا بێتەوە بۆ بیركردنەوە و وردبوونـەوە و، سـازدانی ئـەو نەخشـە گۆڕانكارییـەی كـە بەتەمایـە لـە كۆمـەڵگادا بیكـات، ئـەوەبوو زەیـدی كـڕی و ئـازادی كـردوو كردیـە كـوڕی خـۆی، بەتەبـەنیی (بـەكوڕكردن)، ئـەو كاتـە ئـافرەت زیندەبەچـاڵ دەكـرا و سـووك سـەیر دەكـرا و ڕسوابوو لە كۆمەڵگادا، بەڵام موحەممەد ڕێـزی دەگـرت و بەهەشـتی دەخسـتە ژێـر پێـی دایـك، زیندەبەچـاڵی حـەرامكرد و نرخـی دایـەوە بـە مـێ، زەینـەبی كچـە گەورەكەی دا بە ئەبی عاصی كوڕی رەبیعی كوڕی عەبد شـەمس، دایكـی خوشـكی خەدیجە بوو، كەسـێكی ڕێكوپێـك و بازرگـانێكی سـەركەوتوو بـوو، شـووكردنەكەی سەركەوتووانە بوو، لە سەردەمی نەفامییدا، ئەم ژن و مێردە زۆر سـەركەوتووبوون هەتا سەردەمی ئیسلام هات، ئەویش كاتێك كە زەینەب ویستی لـە مەككـەوە كـۆچ بكات بۆ مەدینە [1]، روقیەی كچی پێغەمبەریان دا بە عوتبـەی كـوڕی ئـەبی لـەحوب، پێش كۆچ، كە ئایەتی (تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ) (سورة المسد : ١) هاتـە خـوارەوە، ئەبولەهەب وتـی: سـەرم لەسـەرت حـەرام بێـت، ئەگـەر كچـەكەی تـەڵاق نـەدەیت، ئەویش تەڵاقی دا پێش ئەوەی بیگوازێتـەوە، ئـەنجا لەگـەڵ دایكـی و خوشـكەكانی موسڵمان بوون، پاشان عوسمان مارەیكرد، كۆچیانكرد بۆ حەبەشە، خـوا كـوڕێكی

[1] حياة محمد، هيكل، ص٢٧٠

دانیٚ بە ناوی عەبدوڵڵا و چووە شەش ساڵان، کەڵەشێرێك دەنووکی دا لە رووی منداڵەکەو بریندار ی کرد و لێی پیس کرد و بەوە مرد، پاشان کۆچیکرد بۆ مەدینە، پێش جەنگی بەدر نەخۆشکەوت، پێغەمبەر عوسمانی بەسەرەوە جێهێشت، کە ئەو مرد، موسڵمانان لە بەدر بوون[1].

ئوم کەلسوم کچی پێغەمبەر، عوتبە کوڕی ئەبولەهەب، کوڕە مامی مارەی کرد، دواتر وازی لێهێنـاو موسڵمان بوو، دوای پێغەمبەر کۆچیکرد، کە روقیە مرد، پێغەمبەر ئوم کەلسومی دا بە عوسمان، لە شەعبانی ساڵی نۆدا مرد، بەڵام فاتمە کە تا ئەو کاتە منداڵ بوو، دوای ئیسلام شوویکرد بە عەلی.

## محەممەد لە نێوان حەڕاو خەدیجەدا

موحەممەد لەو ماوەیەدا زۆر بیری لەخۆی و لە خەڵك و کۆمەڵگە و دەوروبەر و ئاسمانەکان و کاری دروستبوونیان دەکردەوە، نەیدەویست وەك کاهینەکان بکات، نەشیدەویست وەك وەرەقەی کوڕی نەوفل حەکیم بێت و خەڵك پرسی پێبکات، بەڵکو زۆر کەم ئەوەی لە ناخیدا دەبزوا و دەهات و دەچوو، دەیدرکاند، زۆرتر بیری دەکردەوە و وردتر دەبوویەوە، دابی ئەو کاتەی ناوچەی عەرەب وابوو، بیریار و حەکیمەکانی ماوەیەك لە خەڵك دووردەکەوتنەوە و ساڵی چەند جار پەنایان دەگرت، خۆیان لە زۆرخۆریی دەگرتەوە، کەمخۆریی و تەقەشوفیان دەکردە پیشە، کاتەکانیان بە زوهد و بیرکردنەوە و پاڕانەوە و بەدوای خێر و حیکمەت و نهێنیەکاندا دەگەڕان، موحەممەد لەوەدا زۆر ئارامیی دەست دەکەوت، شیفای لەو تەنیاییەدا دەبینی، تەنهاییەکەی پێخۆش بوو هەتا ناو خەڵك، لەو کارەدا ئیلهام و بەرچاو روونیی و دڵخۆشیی بۆ دەهات، خەریکبوو هۆیەکانی ژیان و وەڵامەکانی ژین و نهێنیەکانی بوونەوەری بۆ دەرکەوت، هەستی دەکرد کە ناکریٚ ژیان بەم هیچیە سەیر بکرێت و بەم توڕەهات و نەفامییەدا بگوزەریٚ، کە ئێستا خەڵکی مەککە و دەوروبەری تیادەژین و بۆی دەمرن، لە باکووری مەککە بە دوو فرسەخ

---

[1] الاصابة ـ ج١٢ ص٢٥٨.

دوور پەنایەك هەبوو زۆر قوڵ نەبوو، ناوی غاری حەڕا بوو کە موحەممەد بە چاکترین جێی دەزانی بۆ خۆپەنادان و بیرکردنەوە و تیامانەوە، کەمێك خواردنی سادەی دەبردوو ساڵانە بە درێژای مانگی رەمەزان لەوێ دەمایەوە، خۆی بەپەرستنەوە و بیرکردنەوە و گەڕان بە دوای راستیی ژیان و مردندا خەریك دەکرد و، لە قرەقرِی شار و هاشوهوشی ژیان دووردەکەوتەوە، لەبەر خۆیەوەو لەگەڵ خۆیدا لە ناو ناخیدا ورتەی دەکرد و باس و خواسەکانی دەهێنا و دەبرد و هەتا ئەوەندە ئارام دەبوو دەحەوایەوە، نەیدەزانی چۆن شەو دێت و رۆژ دەڕواو خواردن و خەوی لە بیر چوووبوویەوە، لە دووی حەق و حەقیقەت وێڵ و سەرگەردان و داما و دەبینرا، دەیزانی ئەوەی کە لە ژیانی خەڵکدا دەگوزەرێ، هیچی حەق و راستیی و دروستیی نییە و هیچ مانایەکی تیانییە، بۆ دۆزینەوەی راستیی، پرسیاری لە هیچ کەسێك لە ڕوهبان و حەکیمان و بیریارانی ئەو کاتە و ئەو ناوچانە نەدەکرد، دەیزانی کە ئەوانیش هیچیان لانییە، وەڵامی پرسیارەکانی ئەم نازانن، ئەم بە وەڵامەکانی کە خۆی دەیدۆزییەوە و تاوتوێی دەکرد دەحەوایەوە، بە دوعاو نزاکانی خۆی زۆر ئارام و دامەزراو و دڵخۆش دەبوو، هەستی دەکرد رِێی لە هەندێ وەڵام دەکەوێ، دەیزانی لە حەق نێزیکتر بووەتەوە و، زۆری نەماوە لە تەواوی حەقیقەت بگات و دەستلەملانی واجب الوجود ببێت، هەر بۆیە هەموو خەڵك و هەموو ئاین و هەموو پەرستشەکانی ئەو کاتەی بە لادەر و تێکچوو دەبینی، هیچ دڵی بەوانە خۆش نەبوو، سەعاتێك لەبەر تیشکی مانگ و جریوەی ئەستێرە و هەسارەکاندا دەمایەوەو دەیدواندن، کە کێ دروستی کردوون.؟ بۆچی دروست بوون..؟ بەوە هێوور دەبوویەوە، کە لە ناخی خۆیدا پرسیاری لەو خەڵکە دەکرد، بۆچی هەموو ماڵێك، هەموو گەرِەکێکی مەککە، بتێکیان بە دەستی خۆیان تاشیووە.؟ بۆچی ناویان ناوە خوا و هوبەل و لات و عوزاو.؟ داوای ژیان و پارێزگاریی و رزق و منداڵ و بارانیان لێدەکەن و.؟ قۆچیان بۆ سەردەبڕن و بە دەوریدا دێن و خۆیان پێوە خەڵەتاندووە.؟ خۆ ئەوانە نە سوودیان هەیە نە زیان.؟ بەڵام ئەی کامەیە حەق لەم بوونەوەرەدا؟، لە ئاسمان و

زەوی و ناخ و زەین و دەروندا؟ ئایا لەو ئەستێرانەدایە کە نوور و ڕۆشنایی پـەخش دەکەن و ئاوو باران دەبارێنن و هەواو سەوزایی دەدەن.؟ نەخێر، ئەو ئەستێرانەش هـــەروەك زەوی مـــردوو و بێگیـــان و بێــئیرادەن. ! نـــاتوانن خۆشـــییەك بهێــنن و ناخۆشـیەك لابـەرن، بـەڵام موحەممـەد دەیزانـی لـە دروسـتکردن و جوڵـەو ژیـانی ئەمانەدا حەق و حەقیقەتێك هەیە، هەندێك بەرچاوی روون دەبوویەوە، کە ڕەمەزان تـەواو دەبـوو، دەگەڕایـەوە بۆماڵـەوە بـۆ لای خەدیجـە، توێشـەبەرەیەك لـە بـیرو بۆچـوون و پرسـیارو هیـوا و شـادیی دەهێنـا، خەدیجـە لـەڕوی موبارەکیـەوە، لـە ناوچەوانی نورینیدا ئەوەی دیدی، شەوق و زەوق و نـووری بـەبێ پرسـیار و وەڵام، لە مێردە خۆشەویستە شیرینە بەرزەکەی وەردەگرت و دەحەوایـەوە، کـە دەیزانـی موحەممەد حەواوەتەوە، هەستی دەکرد، ئەو پیاوەی ئەم، لەو پیاوانـەی نـاو بـازاڕ ناچێت، ئەم نموونەیـەکی بـێ وێنەیـە، خۆشبەختانە چـنگ ئـەم کـەوتووە، دەبـێ خزمـەتی بکـات و بیپـارێزێ و کـەش و هـەوای بـۆ بسـازێنێ، هـەتا دەگاتـە ئـەو حەقیقەتەی کە بەدوایدا وێڵە، هەتا دەستی بـیری لێی گـیر دەبێـت و دەرونـی وەك ئاوێنەی لێدێت . ! ئەنجا موحەممەد خەوی پاك و روونی دەدی، هەرزووش دەهاتـە دی، نـووری حەقیقـەتی بـە ئاشـکرا دەدی، خراپیـی و تێکچـوون و شـپرزی ژیـانی گەلەکەی دەدی، دەیزانی کە تەواو سەریان لێشێواوە، کەوتونەتە ناو هەش و لیتە، ڕێی لاریان گرتووە و بەرە و لە ناوچوون دەچن، رەنگە لە خەویدا ئەوانەی دیبێـت، کە گەلەکەی لە نەفامیی و لەناچووندا ڕۆچوون و دەژین، هیچ خێرێك، هیچ نوورێك، لە هیچ جێیەکیەوە نەماوە، ئەگەر وابڕوات هەر هەموو بەرەو فەوتان دەچن، رەنگە هەر لە خەودا دەستێکی دیبێ، خۆی لەپەنای ئەو دەست و هێزەدا دیبێ، کە بەری ئـەو گەلـە سەرلێشـێواوەیان گرتـووە و، نـاهێڵن لافـاوی نـەمامیی بـەرە و دۆڵـی لەناچوون ڕایان مـاڵێ، رەنگـە هەنـدێ دەنگـی ڕاسـتیی دیبـێ، کـە بـەدەم هـاواری ئەمەوە هاتبن، هەندێ گومڕاشی دیبێ کە گاڵتەیان بە هاوارەکانی ئـەم دەهاتـێ و، ئەو ڕۆچوونە لە خراپەیان پێ باشتر بووبێت، هەتا هاواری موحەممەد، یـان ڕەنگـە خەوی سەیری دیبێ و هـەر بـۆ سـبەینێ وەك مـانگی ڕوون هاتبێتـەدی و، خـەڵکی

شاری مەککە ئەوەیان هەست پێکردبێت، خەوی بە رووداوێکەوە دیوە، بۆ سبەی دوو سبەی دیویەتی وەك خۆی روویداوە، ئەم خەوانە، ئەم رەوشتە جوانە، ئەم لە خەڵك ڕاکردن و خەڵوەت و پەناگا و بیرکردنەوانە، لە بونەوەر ڕامانە، ئەو نازناوی ئەمینەی خەڵکی مەککە لێیان نابوو، ئەو سەردان و بەدەم خەڵکەوە چوون و ئەمانەت لادانان و هەڵسوکەوتە شیرینە، وایکردبوو کە خەڵکی مەککە چاوەڕوانی پاشەڕۆژی گەورەیان لەموحەممەد دەکرد، لە مەککەدا بتپەرستەکان بە ئاشکرا دەیانوت: ئەم بتانە لە خوامان نزیك دەکەنەوە، گاورو جولەکەش دەیانگوت: خوایەك هەیە ئەم بوونەوەرەی دروستکردووە، باسیان لە مەلائیکە و بەهەشت و جەهەنم دەکرد، بەڵام وەك بتپەرستەکان، لەگەڵ خوادا شتی نەشیاوی تریان دەپەرست، خوایان پارچە پارچە کردبوو لە دەسەڵات و عیبادەت و کاروباری دونیادا، موحەممەد تەمەنی بووە چل ساڵان و بەردەوام سەری لە غاری حیرا دەدا، ئیمان و بڕوایەکی پتەوی بە خۆی هەبوو، دیاربوو کە خوا ئەوی پەروەردە کردبوو، بە دڵ رووی کردبووە تاقە رێگەی راست و حەقیقەتی نەمر، بە هەموو گیان و هەست و نەست و رۆحی، رووی لە خوای تاقانەی یەکتا کردبوو، شەوی درێژی بە ئاگایی رۆژ دەکردەوە، رۆژی فراوانی بە رۆژوو و خۆگرتنەوە لە کاری زیادە و قسەی بێ جێگە بەڕێ دەکرد، شەوو رۆژو خەوو خۆراك و هەڵسوکەوتی بووبووە بیرکردنەوەو خواپەرستیی و هەقناسیی، شەش مانگ بەم جۆرە مایەوە، بڕوایەکی بەهێز لە رۆح و گیان و دڵ و دەروونیدا دروست بوو، جار جار شەوان لە غاری حیرا دەهاتە دەرەوە، سەیری شاری مەککە و هەڵسوکەوتی خەڵکەکە و، سەیری رێی کاروانچیان و خەریکبوون بە کاروباری دونیا و ژیانی رۆژانەی دەبینین، دەچوویەوە غارەکە و رووی دڵی دەکردەوە خوا، ئەو دەخەوت، بەڵام دڵی وریاو هەر لەگەڵ خوای خۆیدا بوو، لەو کاتانەدا مەلائیکەیەك دابەزی و لاپەڕەیەکی پێبوو، هاتە بەردەمی و پێیوت: بخوێنە..؟ وتی: نازانم بخوێنم، وایهەستکرد کە مەلائیکەکە بیخنکێنێ، ئەنجا بەریداو وتی: بخوێنە.؟ موحەممەد وتی: ئاخر ناتوانم بخوێنم، ئەمجارە توند بە خۆیەوە گوشیی و بەریداو وتی: بخوێنە.؟ ترسا،

جارێکی تر هەستی دەکرد دەیخنکێنێ، وتی: چی بخوێنم..؟ مەلائیکەکە وتی: (اقرأ باسم ربك الذي خلق، خلق الانسان من علق، اقرأ وربك الاكرم الذي علم بالقلم، علم الانسان مالم يعلم) محەممەدیش بێدووبارە کردنەوە دوای ئەو خوێندی، ئیتر مەلائیکەکە ڕۆیشت، ئەو خوێندنە لە دڵیدا نەخش بوو، بەڵام زۆری نەبرد بەئاگا هاتەوە، ئەوە چی بوو.؟ چی ببینی..؟ ئەوەی بینی دەستلێوەشاندنی جنۆکەیە..؟ سەیری لای ڕاست و چەپی خۆی کرد، هیچی نەدی، ئەوە تارمایی بوو یان ڕاستی.؟ نەختێ مایەوە، ترس تەواو هەموو گیانی و دڵ و دەروونی داگرت، پێش خەوەکە، چەندە ئارام و دامەزراو بوو، پاش خەوەکە هەموو گیانی لە ترس و بیمدا نقوم بوو هاتبووە شۆك و لەرزین، بە پەلە بەدەم تاو لەرزو پەشۆکاویەوە لە کێوەکە هاتە خوار و بە دۆڵەکاندا ملی نا، قاچەکانی جێی خۆی نەدەگرت، نەیدەتوانی ئەوە شیبکاتەوە کە بینی، ئەوە کێ بوو پێی وت بخوێنە، ئەی ئەوە چی بوو کە بۆی خوێندەوە؟ ئەو هیچ خەوێکی نەبووە ڕاست دەرنەچێ، بەڵام هیچیان وەك ئەمە نەبوون، ئەمە خەوو خەیاڵ بوو یان ڕاستی.؟ بڵێی دەستلێوەشاندنی جنۆکە بوبێت.؟ بەڵام وشەو ڕستەکان چەند پاك و دروست و جوانن، دەڵێی نەخشن، زوو لە دڵمدا نەخشی گرت.! ڕەنگە دەستی خێرێك بێت هاتووە لە تاریکی ڕزگارم بکات، ڕستەکانی مژدە بەخش و دامەزرێنەر بوون، بخوێنە..چی بخوێنم، ئەی بۆ باوەشی پیاکردم، وەختبوو سنگم بێنێتەوە یەك و هەناسەم لێ ببڕێ و بمخنکێنێ..؟ بخوێنە بەناوی خوا..کام خوا.. ئەم بتانەی کە گەلەکەم بە سەرلێشێواوی بە دەستی خۆیان دەیتاشن و دروستی دەکەن و کلك و گوێی بۆ دەکەن و پاشتر دەیپەرستن؟!، یان خوا پارچە پارچە و لاوازەکان، کە گاورو جولەکەکان شێواندویانە و خەڵکی پێدەخەڵەتێنن؟! نەخێر، ئەم ڕستە ناسکە پڕپرشتانە باس لەو خوایانە ناکەن، بخوێنە بەناوی ئەو پەروەردگارەی کە دروست دەکات، بڵێی ئەم هەموو شتە، هەر لە من و ئاسمان و زەوی و دەوروبەر ئەو دروستی کردبێت.؟ بەڵێ ئەو خوایەی کە مرۆڤەکانی لە دڵۆپێك ئاوی هەڵواسراو دروستکردووە، بخوێنە بەناوی پەروەردگاری بەڕێز و خاوەن کەرەم، کە

به هۆی قەڵەمەوە خەڵکان فێردەکات، مرۆڤ فێردەکات مادام دەیانەوێ فێربن..

پێغەمبەر خۆی دەفەرمووێ یەکەم شت کە بۆ پێغەمبەران هاتووە لە خەودا بووە هەتا دڵیان ئارام بێت، پاشان وەحی دابەزی، هەمیشە دەڵێ دەستپێکردنی وەحی لە ئاگاییدا بووەو لە ڕۆژی ڕوندا بووە، محەممەد لە ناوەڕاستی کێوەکەدا بەو حاڵ و بارە قورسەیەوە وەستا، گوێی لە دەنگێك بوو بانگی دەکرد، سەری بەرزکردەوە بۆئاسمان، ئەو کەسەی ناو خەیاڵ و خەوو ڕاستیەکەی بینیەوە، ئەوەتە لە شێوەی پیاوێکدا بانگی دەکات، ئەوەندەی تر ترسی لێنیشت و وەستا و سەری دانەواند، نەیوێرا سەری بەرز بکاتەوە، بەڵام دواتر سەری بەرزکردووەوە، دەبینێ مەلائیکەکە پانتایی هەموو ئاسمانی گرتووە، وێنەی ئەو مەلائیکە نورینەی هەرگیز لەبەرچاو ون نەدەبوو، لەو بارەدا ماوەیەك مایەوە، وەك بڵێی خەدیجەش لە ماڵەوە ئاگای لەو هەواڵ و ترس و بیمەی مێردەکەیەتی، کە هێندەی خۆش دەوێ هەموو دڵ و دەروونی گرتووە، بونەتە یەك دڵ و هەست و نەست، بە چپەکانی دڵیشی دەزانێ، جوڵەکانی ڕووی دەخوێندەوە، کەسێکی نارد بە دوای موحەممەددا بۆ حەڕا، بەڵام کە هاتەوە وتی: لەوێ نەماوە، کە وێنەی پارچە نورە مەلائیکەکە لە ئاسمان نەما، ئیتر موحەممەد بەرەو ماڵ هاتبویەوە، سنگی پڕ بووبوو لەو وەحیەی کە بۆی هاتبوو، بەڵام هەڵدەلەرزی، تێکچوونی پێوە دیار بوو، ترس هەموو گیانی گرتبوو، بەو بارەوە هاتەوە ماڵەوە و وتی: دام پۆشن، دام پۆشن، وەك لەرز و تایەکی زۆری هەبێت، دوای کەمێك سەر گەرم بوون، کە هێور بوویەوە، لەرز و تاکەی نەما، سەیرێکی خەدیجەی کرد، وەك بڵێ یارمەتییم بدەو فریام بکەوە، وتی: خەدیجە گیان نازانم چیم بەسەر هاتووە..؟ تۆ بزانی چییە..؟ ئەوەی کە دیبووی بۆی گێڕایەوە، وتی: دەترسێم شتێك دەستی لێوەشاندبم، یان چاوم خەڵەتاندومیی، یان شتێکی ترە... بەڵام خەدیجە دڵسۆزێکی مەزن، خۆشەویستێکی لە رادەبەدەر، کەسێکی هێورو هێمن و لەسەر خۆ، خاوەن دڵێکی گەورە، وتی: مژدەبێ ئەی کوڕی مامم و خۆگربە، بەوەی گیانی خەدیجەی بەدەستە، من ئومێدم هەیە کە تۆ پێغەمبەری ئەم گەلە بیت، بە خوا هەرگیز خوا

سەر شۆڕت ناکات، چونکە تۆ ڕەحم جێبەجێ دەکەیت، قسەی ڕاست دەکەیت، زەحمەت دەکێشی، ڕێزی میوان دەگریت، سووری لەسەر گەیاندنی هەق .. ژن پزیشکی ماڵەوەیە، دەرون هێورکەرە، ئارام بەخشە، گەر پشتی پێوە بدەیت، گەر لە دڵی پیاودابێت، هەرگیز ناهێڵێ خاوەنەکەی بنەوێت، گەر نەیشیویست، بە سزادانی پیاوەکەی خۆشی دەچەژێت .. گیانی موحەممەد ئارام بوو، لە خۆشیدا گریا، سەیرێکی شوکرانە بژێری و بەسۆزی خەدیجەی کرد، ئەنجا هەستیکرد، هەستی کرد، ئەوەی حەڕا پڕی دەکات و، ئەوەی ماڵەوە هێورو دامەزراوو خۆگری دەکات، خەدیجە هەستی کرد دەرون و لاشەی محەممەد ماندووە، داوای کرد چاوێك لێك بنێ و پشویەك بدات، خۆیشی لە پاڵیدا چاودێری دەکردو دەیشێلا، دیار بوو ئەویش حەزی بە خەو دەکرد و خەوت، خەوت، هەر ئەو خەوەبوو کە خەدیجە بە شێلان خەواندی، کە خەبەری بویەوە، ژیانێکی ترو بیرێکی تری دی، ئەو بینین و بیرو هەستە نەبوو کە پێش خەوەکە لە ناخیدا دەبزوا، هەستی کرد بەرچاوی گۆڕاوە، جاران بە دوای حەقیقەتدا وێڵ بوو، ئێستە یەکپارچە بوەتە حەقیقەت، جاران ترس و بیم و بیری جۆراو جۆری هەبوو، ئێستە دامەزراوەو دەزانێ ژیان بۆ دروست بوەو کێ دروستی کردوەوەو بۆ دروستی بوە، دەیزانی کە ئێستە هەموو هێزی بونەوەر لە گەڵێدایەو لە پەنای دایە، ئەوسا چەند دەترسا ئێستە چەند بە هێزە، خۆی ڕاپسکاند هەتا هەستێ بۆ ژیانێکی پڕ گیانێکی بەهێزو دامەزراو، ژیانێك کە بە چاو و دڵ و زەینی ڕوون بەخێو بکرێت، بەڵام ژیانێکی خۆبەختانەی پاك و پوخت، لەبەر خاتری خوا و هەق و مرۆڤایەتی، گەیاندنی نامەی خوا بۆ گوێ و دڵ و عەقڵی خەڵك، بە جوانترین شێوە، هەتا نووری خوا بگەیەنێت، هەرچەندە بێبڕوایان پێیان ناخۆش بێت و بەربەرەکانێی بکەن..

## محەممەد لە ماڵی ژنەکانیدا

سـەید لـە ( في ظـلال القـرآن)دا دەفـەرموێ: خـوای گـەورە بـۆ پێغەمبــەری دیارییکردووە کە هـەتا چـەندە دروسـتە ژنـی هـەبێت، ئـەوەش تایبەتمەندییـە بـۆ پێغەمبــەر، ئەمــەش دوای ئـەوەبوو کـە ئایـەتی دیــارییکردنی فرەژنیــی دابــەزی (فانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ) ئەو کاتە لای پێغەمبەر نـۆ ژن هـەبوو، کـە هەریەکـەیانی بـۆ مەبەسـت و مانایـەکی تاییـەت هێنـابوو، عائیشـە و حەپسە کە کچی دوو هاورێ نێزیکەکەی بـوون، ئەبوبـەکرو عومـەر، ئـوم حەبیبـەی کچی ئەبوسوفیان، ئوم سەلمە و سۆدە کچی زەمعە و زەینەبی کچی خوزەیمە، لەو کۆچەرییانە بوون کە مێردەکانیان لە رێی خوادا لە دەستداو پێغەمبەر بـەوە رێـزی لێنـان، هـیچ لەوانـە خـاوەنی گـەنجی و جـوانی نـەبوون، بـەڵکو هـەر تـەنها لەبـەر رێزلێنان بووە، زەینەبی کچی جەحش لەبەر ئەوە هێنای کە ئەم داوای لێکرد شـوو بکات بەزەید، بەڵام کە نەیانکرا، بۆ پاداشتدانەوەی، خۆی مارەی کرد، ئـەویش بـە داوای خـوا کـە مەبەسـت لێـی هەڵوەشـاندنەوەی داب و نـەریتی بـەکوڕکردن بـوو، پاشان جوەیریە کچی حارس لە بەنی موستەلیق، سەفیە کچی حەی بـنی ئەختـەب کە لە جەنگدا بە سەبایا گیرابوون، پێغەمبەر ئازادیکردن و مارەیکردن بۆ خۆی، بۆ پتـەوکردنی رێـزو پەیوەنـدیی بـەو هۆزانـەوە، ئـەوان دوای شکسـتی هۆزەکـەیان موسڵمان بوون، ئەویش کردنی بە دایکی موسڵمانان، شەرەف و رێزی نێزیکیـی لـە پێغەمبـەریان پێـبڕا، خـوا و پێغەمبـەر و ئاخیرەتیـان هەڵبـژارد، بـەڵام کـە ئایـەتی دیارییکردنی ژن دابەزی، نەدەکرا پێغەمبــەر چواریان هەڵبـژێرێ و پێنجیـان تـەلاق بدات و خەڵکیتر ئەم ژنانـەی پێغەمبــەر مـارە بکەنـەوە، چـونکە خـوای گـەورە بـە ئایەت ئەمانەی بە دایکی موسـڵمانان دانـاوە، ئـیتر چـۆن دەبـێ خـەڵکیتر دایکیـان مارە بکەن، یان سوکایەتییان پێبکرێ، کە ئەمانە رۆژێ لە رۆژان ژنـی پێغەمبــەری ئیسلام بوون، لەبەر ئەوە خوای گەورە پێغەمبەری جوێ کردووەتەوە، بـەڵام داوای لێکردووە لەوە زیاد نەکات و نەیانگۆڕێتەوە بە هی تر، هەتا رێز بێت بۆ ئەو ژنانەی کە خواو پێغەمبـەر و ئاخیرەتیان هەڵبژاردوە، پێغەمبەر لەم جۆرە ژنانەی هەبووە،

ئەوانەی کەخۆی مارەیکردون، لەوەی کە دەستی کەوتووە لـە جەنگدا، لـە کچـانی مامەی، لەکچانی ئامۆژنی، لەکچانی خالّی، لەکچانی خالّۆژنی کە لەگەلّیـدا کۆچـیان کرد، جگە لەوانەی کە کۆچیان نەکرد ئەمە هەر بۆ ڕێز لـەو زەحمـەت و کۆچـەیان، یان لەوانەی خۆیان پێشکەشی پێغەمبەر کردووە بـەبێ مـارەیی، ئەگـەر پێغەمبـەر بیەوێت نیکاحی بکات (ئیتر نازانرێ ئایـا لـەم جـۆرەی بـووە، کـە ئافرەتێـك خـۆی پێشکەش کردبێت، هەبووە خۆی پێشکەش کـردووە، بـەلاّم پێغەمبـەر لـە خـەڵکی تری مـارەکردون) ئەمانـە تایبەتمەنـدیی پێغەمبـەرن، خـوای گـەورە ڕێـزی زیـاتری لێناوە و موراعـاتی تایبـەتی کەسـێتی پێغەمبـەری کـردووە، هەنـدێك شـتی لەسـەر پێغەمبەر فەرزکردووە، تەنانەت لە عیباداتیشدا، بەلاّم بۆ کەسی تـر نـەبووە، بـۆی بووە دەست بگرێ بەو ژنانەی کە هـەتا ئایـەتی سـنوور دیـاریکردن لای بـووە، کـە نەتەلاّقیان بدات و، نە بە ئافرەتی تریش بیانگۆڕێتـەوە، عائیشـە دەفـەرمووێ ئـەو حەرامکردنی ژنهێنـانیترە بـۆ پێغەمبـەر، پـێش مردنـی لابـراو ڕێگـەی پێـدراوە کـێ دەهێنێ ئارەزوویەتی .. بەلاّم هیچی نەهێنا و ژنی تـری مارەنـەکرد، ئەوانـە بوونـە دایکـی موسـڵمانان[1]، ئـەنجا خـوای گـەورە داوا لـە خـەڵکیی و موسـڵمانان دەکـات دەفەرموێ: بۆتان نییە پێغەمبەر ئەزیەت بدەن و بۆتـان نییـە دوای خـۆی ژنـەکانی مارە بکەن بە هیچ شێوەیەك، ئـەوە لای خـوا تـاوانێکی گەورەیـە (الاحـزاب ـ ٥٣)، چونکە ئەوان وەك دایکی بڕواداران وان، بۆ پارێزگاری حورمەتی ئەو بنەماڵەیـە کـە تـەنها بـۆ پێغەمبـەر دانرابـوون، دەگێڕنـەوە هەنـدێ دووڕوو دەیـانگوت چـاوەڕوان دەکەین پێغەمبەر بمرێ و عائیشە مارە بکەن، بەلاّم خوا دەفەرموێ ئەوە تاوانێکی مەزن و گەورەیە، سەید دەفەرموێ (بـۆ هـەر ژنێکـی چـیرۆکێك هەیـە، چـیرۆکێك و هۆیەك، ئەوانە جگە لـە زەینـەبی کچـی جـەحش و جویریـە کچـی حـارس، هیچـیان گەنج نەبوون کە پیاو مەیلی بۆیـان بچـێ لەبـەر جوانیـان، عائیشـە خۆشەویسـترین خێزانی بووە و بە ئاشکرا پێغەمبـەر چـەند جـار باسـی کـردووە، ناشمـەوێ ڕەگـی

[1] في ظلال القران، سييد قطب ـ ج١٥، ص٢٨٧٥ ـ ٢٨٧٦.

مەیل بوون و هێزی ڕاکێشان لە پێغەمبەر دابڕنم و بڵێم ئەو هەرگیز هەست و زەوقی نەبووە، ئەوەتە عائیشە باسی جوەیریەی کچی حارس دەکات، کە گەورەی بەنی موستەلەق بوو، دوای غەزوەی بەنی موستەلەق لە ناوەڕاستی سالّی شەشی کۆچیدا. ئیبن ئیسحاق لەعائیشەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ:" کە پێغەمبەر دەسکەوتەکانی بەنی موستەلەقی دابەش کرد، جویریەی کچی حارس کەوتە ناو بەشەکەی سابتی کوڕی قەیس، ئەویش نووسی بۆ خۆی، ئافرەتێکی جوان و شیرین و بەتام بوو، هەر کەس بیدیایە هەڵی دەگرت بۆ خۆی، هات بۆ لای پێغەمبەر کە یارمەتی بدات لە دابەشکردنەکەدا، عائیشە دەڵێ: بە خوا هەر کە لە بەردەرگای ژوورەکەم دیم، ڕقم لێی بوو، زانیم کە پێغەمبەریش ئەوەی من لێم دی تیا دەبینێ، هاتە لای پێغەمبەرو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من جوەیریەی کچی حارسم، باوکم گەورەی هۆزەکەیەتی، تووشی ئەم بەلایە بووم کە خۆت دەزانی، کەوتوومەتە ناو بەشی سابتی کوڕی قەیسەوە، هاتووم یارمەتیم بدەیت لە نووسین و دابەشکردنەکەدا، پێغەمبەر فەرمووی: ئایا لەوە باشترت دەوێ..؟ وتی: ئەوە کێیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ پێغەمبەر فەرمووی نووسینەکەت! واتە نووسینی ئەوەی کە دەبێتە سەباباو کۆیلەو عەبد! دەتەوێ لەسەرت لابەرم - واتە ئازادت دەکەم - و مارەت دەکەم بۆ خۆم..؟ وتی: ڕازیم. فەرمووی: ئەوە وامکرد. زەینەبی کچی جەحش دوای ئەوەی مارەی کرد لە زەید، کە مەولای پێغەمبەر بوو، بەلام ڕێك نەکەوتن و تەلاقیدا، ئافرەتێکی جوان و ڕووکراوە بوو، ئەوەبوو کە عائیشە هەستی دەکرد کە کێبەرکێی لەگەڵدا بکات، لەبەر ئەوەی کە خزمی پێغەمبەر بوو کچی پووری بوو، لەبەر جوانیی و کراوەییەکەی[1]. سەیید دەفەرموێ: نامەوێ هەوڵ بدەم بەشی هەست ڕاکێشان و حەزلێکردن لە پێغەمبەر دابڕنم کە عائیشە هەستی پێکردووە لە جوەیریەدا، یان ئەو بەشە جوانییەی کە زەینەب پێی ناسرابوو، هیچ پێویست ناکات بۆ شاردنەوە و لەسەر لابردنی ئەو بەشە مرۆڤانەیە

---

[1] في ظلال القران، سيد قطب، ص٢٦١١ سورة الاحزاب ، اية، ٥٣.

لە ژیانی پێغەمبەردا، بوونی ئەو بەش و هەستانە جێی تۆمەتبارکردن نییە، کە هەندێ نوسەری موسڵمان بیەوێ لای بەرێت، کاتێك کە دوژمنان دەیانەوێ پێغەمبەر تاوانبار بکەن، موحەممەد هەڵبژێرراوە هەتا مرۆڤ بێت وەك مرۆڤەکان لە هەست و سۆز و زەین و ئارەزووە مرۆڤایەتییەکاندا، بەڵام مرۆڤێکی بەرز، پاڵنەرەکانی ناخ و دەروونیشی وەك مرۆڤ وابوو، لە ژیانیداو لەگەڵ ژنەکانیدا کە دیارە بۆ هەریەکەیان پاڵنەرێك و هۆیەك بووە بۆ هێنانیان، لە ماڵی خۆیدا ژیاوە لەگەڵ ژنەکانیدا وەك مرۆڤێکی نێرراو لەلایەن خواوە، هەروەك ئەو جۆرەی کە دروستکراو وەك خوا لە باسیدا دەفەرموێ: (سُبْحَانَ رَبِّي هَلْ كُنتُ إِلاَّ بَشَراً رَّسُولاً) (الإسراء : ٩٣) لەگەڵ ژنەکانیدا بە خۆشیی دەژیا و رای دەبواردن لەزەتی لێدەبینین، وەك ئەوان لەزەتیان لێدەبینی، هەروەك عائیشە دەفەرمووی: "کاتێك لەگەڵ ژنەکانیدا تەنها دەبوویەوە، نەرم و ناسکترین کەس بوو، وە بەرێزترین کەس بوو دەم بە خەندە و پێکەنین"، بەڵکو پڕ بە دڵ لەگەڵیان ژیاوە و پێکەوە رایانبواردووە و خۆشیی و شادیان لە یەکتری بینیوە، لە دڵنەرمیی و خۆشەویستیی و سۆز و مامەڵەی جوان، ژیانیان سەرەتا هەر ئەوە بووە وەك ژیانی کەسێکی سادەی خەڵکی مەدینە، بەڵام کە فتوحات فراوان بوو، دەسکەوت زۆر بوو، ژیانی هەموو خەڵکی مەدینە بە ماڵەکانی پێغەمبەریشەوە باش بوو، تەنانەت ژنەکانی داوای چاکترکردنی باری گوزەرانیان لە پێغەمبەر دەکرد، بەڵام خواو پێغەمبەر هەرگیز رازی نەبوون زیاد لە خەڵك پێبهەڵگرن و، وەك پاشاکانی ئەو کاتە دونیا هەر بۆ خۆیان بێت، چونکە ئەمان پیاوی دونیا و قیامەتن، هەر هی ئەم دونیایە نین، سەر پشکیشی کردبوون کە لای من هەر ئەوەندە هەیە، ئەگەر ئارەزوو دەکەن برۆن لای پێغەمبەر لابچن و لە جێیەك تر ژیانێکی ئازادانەتر و خۆشتر بۆ خۆیان هەڵبژێرن، پێغەمبەر نەیویست لە ماڵ و منداڵ و حاڵی هاورێکانی زیاتر پێبهەڵگرێ، ئەم پێشەنگە و خەڵك چاو لەم دەکەن، ژیان لەگەڵ پێغەمبەرداو لە ماڵی پێغەمبەردا ئاوا بووە، ئەوەنەبووە بچنە کونجی قەناعەت و هیچ راو بۆچوونێکیان نەبێ، وەك ماڵی هەر موسڵمانێکی تر خوا پەرستییان کردووە و

خواردوویانه و رایانبواردووه، هەندێکجار شەیتان کاری لێکردوون، هەندێ گومـان و ڕاڕایی و دوودڵیی و داوای زیاتریماڵی دونیای بۆ دروستکردون، بـەڵام پێغەمبـەر هـەر بـە وتوویـژو ڕاگۆرینـەوه و سەرپشـککردنیان بەکـەیف و ئـارەزووی خۆیـان ڕازیکردون، عائیشه کە بچووکترین ژنی بووه، باس لـە خۆشـترین ژیـان دەکـات لـە ماڵی پێغەمبەر و لەگەڵ پێغەمبەردا، ئەوەی عائیشه دەیڵێ، هیچ مـاڵێکی ئـەمڕۆش ناتوانـێ بـە ئاشـکرا ئـاوا ڕای خـۆی بڵـێ و ئازادبێـت لـە وتـنی ڕاسـتییەکاندا، ئـەو شـــەرعی وتـــوه کـــار و کـــردەوە و ســـوننەتی پێغەمبـــەری باســـکردووه، هـــەتا موسڵمانانیش وەك ئەوان بکەن، وانییه کە یەکێك وابزانێ مـاڵی پێغەمبـەر هەمیشـه بـە کڕنـووش و قورئـان خوێنـدن و خۆداپۆشـین و دەرگـا داخراویـدا بـووبن، واتـه ماڵێکی مـردوو و بێگیـان و هـیچ هەسـت و نەسـت و سـۆزو خۆشەویسـتییەکی تیـا نەبووبێ، ئەوەتا عائیشه خۆی دەگێڕێتەوه کە خـۆی خـاوەن دڵێکـی سـەیر بـووه، توانیویـەتی پێغەمبـەر ڕازی بکـات و ئـەویش عائیشـەی ڕازیکـردووه، بـە ئاشـکرا پێغەمبەر دەفـەرمووێ: هـیچ کـەس نییـە لـەم دونیایـەدا هێنـدەی عائیشـه خۆشـم بووێ، عائیشەش حەزی کردووه دڵی پێغەمبەر ڕابگرێ و نـەهێڵێ لـە غـەیری خـۆی بەولاوه دڵی بە لای هیچ کەسێکی تردا بڕوات، تەنانـەت ژنەکانیشـی ئـەوه دەزانـن، سەودە دەڵێ: من شەوەکانی خۆم داوه بـە عائیشـه [1]، واتـه بەشـه شـەوەکەی کـه پێغەمبەر دێته لای سەودە، ئەو داویه بە عائیشه، هەتا زیاتر دڵی پێغەمبەر خـۆش بکات، واته هەر ئەوەندە توانیویەتی چاکە لەگەڵ پێغەمبەردا بکات، کە شەوەکانی خۆی پێ هەدیەکردووه، هەتا لەگـەڵ عائیشـەدا دڵخۆشـتر بـووه، وانییـه کـه بڵێـی شووکردن لە ماڵی پێغەمبەردا هەموو هەست و سۆزێکی مرۆڤ لە ناو دەبـات و دڵـی ژن دەمرێنێ، عائیشه دەگێڕێتەوه کە ڕقی لە جویره هەڵساوه، هەر بەوەندەی کـه دیویێتی ڕوویەکی گـەش و جـوان و شـیرینی بـووه و، ڕەنگـه هـەر بـە بینینـی دڵـی پێغەمبەر ڕاکێشێ بە لای خۆیدا، ئـەو گومانـەی عائیشـه ڕاسـت دەرچـوو، عائیشـه

---

[1] ابن سعد ـ ج٨ ص٥٤.

دووباره رووداوێکی تری وا باس دەکات لەگەڵ (سەفیە)دا، دەڵێ: بە پێغەمبەرم وت: خۆت بپارێزە لە سەفیە ئاواو ئاوایە، واتە: بچوك وکورتە، بەڵام پێغەمبەر فەرمووی بە عائیشە، وشەیەکت وتووە ئەگەر بیکەیتە ئاوی دەریاوە پیسی دەکات، عائیشە ئەم چیرۆکانە بۆ راستیی و پەروەردەکردن دەگێڕێتەوە، بیربکەرەوە و ببینە چۆن پێغەمبەر پەروەردەییانە و ژیرانە مامەڵەی دەکرد لە ماڵەوە، هەتا خێزانەکانیش بیگەیەننە دەرەوە و، هاورێکانیشی بە جیهانی بگەیەنن، ئیمام ئەحمەد لە ئیبن عەباسەوە دەگێڕێتەوە: دەڵێ: زۆر سووربووم لەسەر ئەوەی کە پرسیار لە عومەری کوڕی خەتتاب بکەم لە بارەی ئەو دوو ژنەی پێغەمبەرەوە کە خوا لە بارەیانەوە دەفەرموێ: (إِن تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا) ئەوەندەم پرسیار لێکرد، ئەویش خۆی لێ لادەدا، هەتا رۆژێ بە رێگا دەچووین، عومەر لایدا، منیش لامدا تارەتی گرت، پاشان چوومە لای دەستنوێژی دەگرت، ئاوم کرد بە دەستیداو پێم وت: ئەی ئەمیری بڕواداران، ئەوە کێبوون ئەو دوو ئافرەتەی لە ژنانی پێغەمبەر کە خوا ئەو ئایەتەی لەبارەوە دەفەرمووێ: (إِن تَتُوبَا...)، عومەر فەرمووی: جێی سەرسوڕمانە ئەی ئیبن عەباس (زوهەری دەڵێ: بە خوا پێی ناخۆش بوو پرسیاری لێکرد، بەڵام نەیشاردەوە، وتی:"ئەوە عائیشە و حەپسە بوون، وتی:"ئەنجا دەستیی کرد بەگێڕانەوەی رووداوەکە، وتی: ئێمە کۆمەڵی قورەیش گەلێکین زاڵ بووین بەسەر ئافرەتەکانماندا، بەڵام کە کۆچمان کرد بۆ مەدینە، لەوێ خەڵکێکمان بینی ئافرەتەکانیان زاڵ بوون بەسەر پیاوەکانیاندا، ئافرەتەکانی ئێمەش ئەوەیان لێفێربوون [1]».

ئیبن جەریر و ئیبن ئسحاق دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر لە ماڵی حەپسەدا چووە لای ماریەی دایکی ئیبراهیمی کوڕی، حەپسەش تووڕەبوو ئەو کارەی بە سوکایەتیی زانی، پێغەمبەر پەیمانی دایە کە ماریە لەسەر خۆی حەرام بکات، بۆ ئەوە سوێندی خوارد بەمەرجێ ئەم باسە بشارێتەوە، بەڵام هەواڵیدایە عائیشە،

---

[1] رواه البخاري ومسلم و الترمذي والنسائي من ط ق عن الزهري بهذا النص . في ظلال ـ ص٣٦١٥.

ئەمە ئەو باسەیە کە ئایەتی لەسەر هاتۆتە خوارەوە، سەید قوتب دەفەرمووێ: ئەم گێرانەوەیــە زۆر لەگــەڵ کــەش و هــەوای دەقەکــەدا دەگونجــێ، لەگــەڵ دوای رووداوەکەشدا دەگونجێ ئەو توڕییەی کە بووە هۆی تەلاقدانی ژنەکانی پێغەمبــەر، لەگەڵ وردی و توندی حەساسیەتی باسەکە دەگەنجیّ[1]، ئەمە ئایەتەکانە (يَـا أَيُّهَـا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ وَاللَّـهُ غَفُـورٌ رَّحِـيمٌ) (التحـريم: ١) لەوێدا پێغەمبەر ماریەی لەسەر خۆی حەرام نەکرد بە مانـای حـەرامی شـەرعی، بەڵکو بۆ حەرامکردنی دەروونیی خۆی بوو، ئیتر ئەم عیتاب و رەخنەلێگرتنە هـات، ئەمانە ئەوە دەردەخەن کە ژیانی پێغەمبەر کتێبێکی کراوەیە، بۆ هەموو کەس.

عومــەر دەفــەرمووێ: ئێمــەی قــورەیش زاڵبــووین بەســەر ژنەکانمانـدا، بـەڵام کـە چووینە مەدینە گەلێکمان بینی ژنـەکانیان زاڵ بـوون، ژنـەکانی ئێمـەش لەوانـەوە فێربـوون، رۆژێـك لـە ژنەکـەم تورەبـووم، دەبیـنم وەڵامـم دەداتـەوە، رازی نـەبووم وەڵامم بداتەوە، وتی: بۆ ئەمەت پێناخۆشە..؟ بـەخوا ژنـەکانی پێغەمبــەر وەڵامــی پێغەمبەر دەدەنەوەو، یەکێکیان قسەی لەگەڵ پێغەمبەر نـەکرد لەبەیانیـەوە هـەتا شەو، ئەڵێ رۆشتم چوومە لای حەفسە و پێموت: ئایا وەڵامی پێغەمبــەر دەدەنــەوە و لێی هەڵدەگەڕێنەوە ..؟ وتــی. بـەڵێ، وتم: قسەشــی لەگـەڵ ناکـەن بـەیانی هـەتا شەو؟ وتی: بەڵێ، وتم: بەدبەخت و خەسـارەومەندە ئـەوەی وابکـات، ئایـا ئـەمینن لـەوەی یـەکێکتان وابکـات کـە خـوا غـەزەبی لێبگـرێ و بـە غـەزەب و تـووڕەیی پێغەمبەر تیا بچێت..؟ تۆ وەڵامی پێغەمبەر نەدەیتەوە و هیچـی لـێ داوا نەکـەیت، چیت ویست لە من داوابکە، ئەوە هانت نەدات ئەگەر دراوسێکەت لە تۆ جوانتر بێـت و لای پێغەمبەر خۆشەویستتر بێت لە تۆ، مەبەستی عائیشە بوو.

---

[1] في ظلال ـ ص٣٦١٤. أخرجه احمد ـ والبخاري ج٧ ص١٧٥ ومسلم (٢٤٣٨). والترمذي (٣٨٨٠).

# کتێبخانەی کوردی ئیسلامیی
# هەژارترین کتێبخانە

ماوەیەکە کتێبخانەی کوردی پێشکەوتنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینیووە، لەهەموو لایەن وبابەتەکانەوە کتێبی دانسقەی بۆهاتووە، چ بەنووسین و وەرگێران، چ لێکۆڵینەوەو ئەدەب و هونەر، یان گۆڤارو ڕۆژنامە .. بەتایبەت لەڕوی وەرگێڕانەوە، لەچاکترین کتێبی بیانی لەزمانە جیاجیاکانەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی، بە جۆرێك کە خوێنەر فریای لاپەڕەهەڵدانەوەو ناونیشان بینین ناکەوێت، نەخوازەڵا خوێندنەوەیان.

ئەمەش ئەگەر شتێك نیشان بدات هەر ئەوە دەڵێ کە کورد لەڕووی کولتوورو ڕۆشنبیریەوە هەنگاوی چاکی ناوە، ئەگەرچی هەندێك نایەنرخێنن و بەشپرزی و بارێکی نامۆو شێواوی ڕۆشنبیری لەقەڵەم دەدەن، وای دادەنێن کەهیچ سانسۆرێك لەسەر هەڵبژاردنی بابەتی چاك و بەسوود نیە، گوایە هەموو شت لەباش و خراپ بڵاودەکرێتەوە، وەك کاڵای چینی لێهاتووە کە ئەمڕۆ بازاڕی کوردستانی پڕکردوەو شێواندوەو زەرەرێکی زۆر لەبازاڕو گیرفانی هاووڵاتیان دەدەن، خەڵکیش لەڕوی پێویستیەوە ناچارە بیان کڕێت، ئەوە ڕاستە هەموو گلەییمان لەوبارە هەیە، بابەتی بێسوود و هەندێك جار خراپ و ڕوخێنەر دەخرێتە بازاڕ، بەلاًم ئەمە نابێت بمانخاتە ئەو ئاستەی کە نائومێدبین و سانسۆرێکی وا دابنێین، کە بیرو دەستی نوسەر بگرێت و لەقاڵبی بدات و ئازادییان بکوژێت و نەوێرن هیچ بڵێن. چونکە هەرکەسە بەگوێرەی توانای خۆی دەڵێت و بیردەکاتەوەو دەنووسێت، بابەتێك لای فلاًن هیچ نیە بەلاًم لای نوسەرەکە خۆی شتێکی دانسقەیەو بێوێنەیەو تائیستە نەوتراوە.

دەزگاکانی ئاراس و موکریان و سەردەم و وەزارەتی ڕۆشنبیری و ناوەندی ڕۆشنبیرو ئاراو نارین و نوسینگەی تەفسیرو پرۆژەی تیشك، لە بڵاوترین ئەو دەزگایانەن کە زۆرترین بڵاوکراوەیان بەخۆوە بینیووە، تەنانەت دەزگای وا هەیە کە

بڕیاری دابوو له ساڵی ٢٠٠٨ دا ڕۆژی کتێبێك بڵاوبکاتەوە، ئیتر ناوەرۆکی هەرچیەك بێت و هەرچۆنێك بێت و قەبارەی چەند لاپەڕەبێت، هەر گرنگ ئەوەیە ژمارەی بڵاوکراوەکانی لەوانی تر زۆرتر بێت ..!! ئەم زۆرو بۆرە هەتا چەندە لایەنی سوودو پۆزەتیفی هەیە، بەئاشکرا دیارە کە بێبەرنامەیی و، حیساب نەکردن بۆ پێویستی سەردەم و ڕۆژگارو بازاڕ و زەین و ڕەوشتی کۆمەڵگەی کوردی، تیا لەبەرچاو نەگیراوە و، هەر زۆرکردنی ناونیشان و ژمارەو پڕکردنەوەی کاغەزی سپیە بە بیمانایی، ئەمە جگە لەوەی کە لە ڕووی تەرجەمەوە نەزانین و هەڵەو نائەکادیمیەکی زۆر لە بڵاوکراوەکاندا دەبینی، هەر کەسێك یان هەر دەزگایەك حەزدەکات بڵاوکراوەو کتێبێکی هەبێت، هەتا خەڵك بڵێ ئەمە دەزگایەکی ڕۆشنبیریە، بە تایبەت دەزگا حیزبیەکان و سەنتەری مەسئولەکان، ئیتر ناوەرۆك گرنگ نیە بەوەندەی کەناوی کەسەکە و ناوی دەزگاکەی گرنگە.!!

له بڵاوکراوە ئیسلامیەکانیشدا هەتا ئاستێکی زۆرتر ئەوە دەبینی، بابەتی لاوازو پڕ لەهەڵە و کۆن و پوتوورکاوی سەردەمی شەستەکان و حەفتاکانی سەدەی پێشوو کە باویان نەماوەو، لە ڕووی نووسین و ناوەرۆك و دارشتنەوە بۆ ئەمرۆ ناشێت، ئێستە دەتەکێنرێن و بەرگی نوێ و سەردەمییان لەبەردەکرێن، کۆنێك لە بەرگێکی نوێدا، دەبێت چ ناوێك بۆ ئەم نەرسکاوە دابنێن..؟ جگە لەوەی حیسابی ورد ناکەن بۆ شارەزایی و تێگەیشتنی نووسەر یان وەرگێڕو، گوێنادەنە مانای ئایەت و فەرموودە تەنانەت لە تەفسیرو کتێبەکانیشدا، ماناکردنی ئایەت و حەدیس نەزانانەو بەهەڵە، جگە لەوەی عەیبەیەکە بەنێوچاوی ئەوانەی بەزۆر خۆیان دەکەن بە نووسەرو وەرگێڕو تەفسیرنووس، گوناهو تاوان و بەکەمزانین و بەکەم سەیرکردنی ئەو زانیارانەیە، لەباتی خێروو چاکە کە نووسەرەکە وای بۆ خۆی حیسابکردوە.! ڕەنگە مەلۆی تاوانی خۆی زیادتر بکات.

بەڕاستی هەتا دوای نەوەدەکان، هەژارترین بەشی کتێبخانەی کوردی، بەشی بڵاوکراوە ئیسلامییەکان بووە، بەتایبەت کتێبی تەفسیرو فەرمودەو فیقهو شەریعەت. بەڵام ئەوا وردەوردە خەریکە تەفسیری قورئان و شیکردنەوەی

فەرموودە بەکوردی لێرەولەوێ بەچاپ گەیشتوون، خەڵکی زۆر بەتامەزرۆ پەلاماری دەدەن، هەتا باس و خواسی ئایینەکەیان بەزمانی شیرینی کوردی خۆیان بخوێننەوە، هەرچەند ئەو تەفسیرو فەرمودەو نووسینانە لەڕوی دارشتن و ماناوە لاوازیان پێوە دیارەو نەچونەتە ئاستی پێویست، بەلأم هەموو کارێکی سەرەتا هەروا دەست پێدەکات، هیوام وایە گرنگی زیاتر بە ماناو دارشتنی نووسین و پسپۆری بوارە ئیسلامیەکە بدرێت.

رەنگە ئەمرۆ کتێبخانەی کوردی، هەژارترین کتێبخانە بێت لە ناوچەکەدا، لە رووی ئەوەی کە کەمترین لە سەرچاوە سەرەکییەکانی ئیسلام وەك تەفسیرو فەرموودە و زانستەکانی ئیسلام و مێژوو عەقیدەو فقهو شەریعەتی بەکوردی لەخۆ گرتبێ، هەزاران بەرگ لە سەرچاوە دایکە سەرەکیەکان، لە کتێبخانەی عەرەبیەوە تەرجەمەکراوەتە سەر زمانی فارسی و تورکی و ئوردی، بەلأم ئەوە چەند ساڵێکی کەمە دەستکراوەتە تەرجەمەکردن و نووسینی کتێبی کوردی ئایینی لەهەموو بوارەکانەوە، جێی داخە زۆربەی خاوەنانی ئەو نووسراوانە نە عەرەبیەکی باش دەزانن، نەشارەزای بە کوردی نووسینی پەتی و رێنووسیی ستانداری تەواون، نە لەبارەی هونەری وەرگێڕانەوە شتێکیان خوێندوەتەوەو ئەزمونێکیان هەیە، نە پسپۆڕن لەو بوارەدا کە تیایدا دەنووسن، نەئیشی ئەوانەو هیچی لێنازانن، زۆربەی تەفسیر نووسەکانمان هەرگیز بەو کارە بەناوبانگ نەبوون و زانای ئەو بوارە نەبوون و نەیان خوێندوەو پێشینەیان نەبوەو کاریان بۆ نەکردوە، هەر حەزدەکەن سەریان لە ناو سەراندابێت و شیتێکیان هەبێت، ئێمە تەفسیری زۆرمان هەیە بە کوردی، بەلأم هیچیان نەگەیشتونەتە ئەو ئاستەی کە جەماوەری کوردی بتوانێ شەوقی بۆی هەبێت و پیێی تێربیێت، هەموو لایەنەکانی ژیانی خۆی بە سیماو واتاو گیانی کوردی هاوچەرخانە لێ هەڵبگوزێت و خۆی تێدا ببینێتەوە، تەنانەت تەفسیرێکمان نیە وەك (صەفوە تەفاسیر)ی محمد علی صابونی پوخت و دەوڵەمەند و پڕزانیاریو پڕسەرچاوەو هەموو لایەنێکی گرتبێتەوە، خۆ ئەویش تازە بە تازە نوسیویەتی و لە تەفسیرەکانی تری کۆکردوەتەوە، بەلأم بەڕاستی کورت و پوخت

و پاك و دەوڵەمەندە، ئەوەت هەبێت هیچی ترت ناوێ، ئەوانەی ئێمەش بۆ نایەن وابکەن، (تەفسیری نامی) زیاتر تەفسیرێکی فیقهیی وشکی سۆفیگەرانەیە، تەفسیرەکەی مامۆستا مەلا عوسمان زیاتر تەفسیرێکی حەرەکی و گیانی (ظلال)ە، خەریکبوو تەفسیری خاڵ بگاتە ئاستە زانستییە کوردانەکەی خۆی، شێخ موحەممەدی خاڵ توانای زۆر بوو بەهێزتری بکات و داخوازییەکانی کۆمەڵگەی کوردیی بهێنێتە دی، بەڵام سەرقاڵیی و پاشان مەرگ رێگەی نەدا.

لە کتێبخانەی کوردییدا چەند بەرگێکی گەورە لەسەر شەریعەتی ئیسلام نییە، کە هەموو لایەنەکانی مەزهەبەکان لەخۆ بگرێ و خەڵکی فێری تێگەیشتن لە ئایین بکات و خۆی بۆ خۆی ئایەت و فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ شیبکاتەوە و بە گوێرەی واقیع و سەردەم مەزهەبەکانی بۆ بێتە دەست، هەر بۆیە باسێکی ئەمرۆ، بە مەزەنەی سەردەمی هەزار ساڵ زیاد لێکدراوەتەوە، کە بۆ ئەمرۆ قورس دەبێ و گومان لەلای پەیڕەوان دروست دەکات، لەوەی کە خەڵك دەڵێ: ئەم ئایینە لەوە دەچێ بۆ ئەمرۆ نەشێت ، دووبارە دەبێتە هۆی لاوازکردنیی ئایین و کەمبوونەوەی پەیڕەوانی، یان نەتوانین و بێدەنگ بوون لە ئاست وەڵامدانەوەی ئەو گومانانەی کە بەردەوام وەك مارە تۆپیو دەخرێنە بەردەم موسڵمانان، چونکە خەڵکی هیچیان لەبەردەستدا نییە و ناتوانن کەمترین بەرگریی بکەن ، خۆیان بە شکستخواردو دەبیننەوە، وا بزانم تەنها چەند بەرگەکەی مەرحومی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە (شەریعەتی ئیسلام) لەبەردەستدایە، کە ئەویش دەستی خوێنەر ناگرێ کە لە فیقە و شەریعەتی ئیسلام بە تەواوی حاڵی ببێت، بەڵکو پێی دەڵێ هەر ئەمە مەزهەب و ئایینە و لەمە بەولاوە ناتوانی شتێك بڵێی و شتێك بکەیت، کارەکەی مامۆستای مودەڕیس زۆر گەورەیە و توانایەکی یەکجار مەزنی بە خەرج داوە کە لە ئاستی توانای یەك دەزگادایە، بەڵام بەشێوازو وەرگێڕانێکی کۆنئامێز کراوە کە رەنگە هەر هەندێ مەلا سوودی لێ ببینن .

وەرگێڕانی (فقهو سوننە)ی سەید سابق و ( فقهی ئاسان)ی ئەحمەد عاشوور بۆ کوردی لەلایەن مامۆستایان حەمە ئەمین بەرزنجی و نوری فارسەوە بە پێنج بەرگ،

بۆشایی زۆری لەو لایەنەوە، چ لە رووی شەریعەت و فیقهەوە، چ لەڕوی واقیع بینی سەردەمەوە پڕکردوەتەوە، وەك ئیمام بەننا دەفەرموێ ئەمە کتێبی ئێمەیە، کارێکی زۆر گەورەیە چ بە عەرەبیەکەو چ بە وەرگێڕانە کوردیەکە، بەلاّم ئەوانیش لە گەلّ هەموو باشەکانیاندا کە زمانەکەی کوردیەکی پاراوو پەتیو پوختە، بەلاّم کەمێك ڕەکیکی و وشکی بە تەرجەمەکردنەکەوە دیارە و دەکرێ ناسکتر بکرێن، چونکە ئەمان هەر ڕای یەك مەزهەب و یەك زانایان نەهێناوە لەسەر بابەتێك، بەلّکو زۆر دەولّەمەندن بە ڕاو بۆچوون و فەرمودەو شیکراوەی جۆراو جۆر، یارمەتی خوێنەر دەدەن کە خۆیشی قسەی هەبێت و بیربکاتەوەو ئاسانترین و گونجاوترین ڕا هەلّبژێرێ و پەیرەوی لێبکات. (منهاج الطالبين کە پێنج بەرگە و فقهی ئیمامی شافعیەو فتح القريب - ڕۆژی پرشنگدار) و شتی تریش لە کتێبەکانی عەبدولاّ عەبدولعەزیز هەرتەلیە، کە فقهێکی پاك و زۆر پێشکەوتوترن لە ڕووی ڕێنووس و تەرجەمە پاکەکەیەوە، بەلاّم ئەمیش توند دەستی داگرتووە، ماناکانی قورس داوە بەدەستەوە، هەندێکی تورەو هەندێکی دلّخۆش کردوە، بەلاّم ئەوە شەریعەتێکی پاکە، هەر ئەوەندەیە کە هەندێکیان خۆیان بە مەزهەبێکەوە نابەستنەوە، هەرتەلی دەیتوانی شیوازی دەربڕینەکە ئاسانترو سادەتر بکات، یاساو شەریعەت هەمیشە وشکە، دەبێت ئاسان بنووسرێ و ماناو خۆمالّیبکرێ و پێشکەش بکرێت، لایەنی ڕێنووس و دارشتنەوە هەندێ کەم و کوری هەیە، چاکردن و پوختکردنی زۆر ئاسانە.

موختەسەری موسلیم بەجیا و بوخاری بە جیا (رياض الصالحين) بە کوردی هەیە، تاج بە پێنج بەرگ کراوە بە کوردی، ئەمانە زۆر گرنگن، بەڕاستی نوری فارس کارێکی مەزنی کردوەو توانایەکی گەورەی لەو بوارەدا بەخەرج داوە، بەلاّم لەوانە گرنگتر وەرگێڕانی (صحاح الستە) یان (صحاح التسعە) یان ( صحاح الالبانی) و (فتح الباري) بوو بۆ کوردی، ئەوانە شاکارێکی مەزن دەبوو بۆ دونیاو، زەخیرەیەکی گەورە دەبوو بۆ قیامەت، ئەگەر دەزگایەك سەر پەرشتی بکردایە، چاك و پڕ سوود دەبوو.

بەلای منەوە لە هەموو ئەوانەی کە کراون بە کوردی لە ڕوی فەرموودەوە گرنگتر (اقتران النيرين في مجمع البحرين) لە وەرگێڕانی ماموستا مەلا ڕەشید بەگی بانە، کە بەراستیی جوان کۆکراوەتەوە و پێشکەش کراوە، لە هەموو ڕاوییەکان و پێشەوایانی فەرموودەی هێناوە، بەڵام ئەویش چەند گلەییەکی لەسەرە کە کارەکەی لاواز کردووە، لەبەکاربردنی زۆری وشەی عەرەبی کە کەمتر لە کوردیی دەچێت، دەکرێ یارمەتی بدرێ و کوردیەکی پەتی پوختی بکرێت بەبەردا.

موحەممەد شلّماشی ژیانی پێغەمبەرانی بۆ کردوین بە کوردی، بەڵام هاتووە خەرافیات و ئیسرائیلیات و شتی پروپوچ و لاوازیی زۆری تیا دەستچێن کردووە کە هەندێکی لە کوفرەوە سەردەردەهێنێ، گوناهە موسڵمان بیخوێنێتەوە و بیگێڕێتەوە، ئەمە یەکەم کتێبی کوردییە لەسەر ژیانی پێغەمبەران، لە سەرەتاوە زۆر ڕەواجی هەبوو، چەند جار چاپکرایەوە، بەڵام کارێکی خراپ بوو دەرهەق بە پێغەمبەران ـ سەلامی خوایان لەسەر بێت ـ کرا، بەڵام ئێستە لەو بوارەدا کاری زۆر کراوە، ژیاننامەی پێغەمبەرانی زۆر لە عەرەبییەوە بە کوردی کراوە، خۆزگە کوردێکی شارەزا خۆی ئەوەی دەکرد.

ئێمە نووسراومان لەسەر ژیانی پێغەمبەرمان ﷺ زۆرە بە کوردی، زۆر شت لە بارەی پێغەمبەری ئیسلامەوە نووسراوە، بەڵام کەسێکیان نەیانتوانیوە پێغەمبەرێکمان نیشان بدەن کە بە کوردانە و بۆ خاکی کوردو جەماوەری کورد نووسرابێت، سیرەی پێغەمبەرو خەلیفەکانمان بە کوردی زۆرە، بەڵام یان وەرگێڕانێکە کە ڕێك تەعبیرە عەرەبیەکە بە تەرجەمەی حەرفی وشك و بێتام و سەقەت و دوور لە شێوازی دەربڕینی کوردی و پاراوی زمان و گونجاندنی بە هەست و نەست و واقیعی کوردانە کراوە، یان بۆ کارێکی بازرگانی وەك چۆن لە ژیانی خەلیفەکانی و شتی تردا کراوە، عەرەبیەکە دراوەتە دەستی کەسی نەشارەزا لە زمانی عەرەبی و لە کوردی، نەشارەزا لە هونەری وەرگێڕاندا، هەر ویستوویانە شتێکی پەلەو نەکلۆك پێش خەڵك بخەنە بازارەوە، کە زۆرترین سوودی مادی هەبێت نەك ئاینی، تەنانەت کتێبی پێنجسەد لاپەرەیی بە سێسەد لاپەرە

وەرگێڕراوە، کە دەبوو لە عەرەبییەکە زیاتری بکردایە، کراوەو نەوتراوە ئەمە کورتکراوەتەوە، بەتایبەت وەرگێڕانی کتێبەکانی صەلابی بۆ کوردی، پڕ لەهەڵەو سەقەت و بەدەستی کەسی نەزان و نەشیاوو لەهونەرو بواری وەرگێڕاندا، نەشارەزا لەعەرەبی و لە کوردی، کورتکردنەوەی باسەکانی بێئەوەی باس بکرێت، ئەوە خیانەتی نووسینە، یەکەم: لە ئایینەکەمان، کە مەرجوایە شتی پوخت و پاکی دوور لە تەماعی دوونیایی پێببەخشین، کە بەمەرجێك وەرگێڕو دەزگاکان ئیسلامین ئەوکارانە دەکەن، دووەم: لە مەقامی بەرزی نووسین و وەرگێڕان و ڕونکردنەوە، کە خوای گەورە سوێندی بە وشەو پیت و برگە خواردوەو باسی کردووە، سێهەم: لە کتێبخانەی کوردی، کە پەرتوکی پڕ لە هەڵەو سەقەتی پێشکەش دەکرێت، چوارەم: لە خوێنەری کورد، کە خۆراکی ناجۆرو نەمەیوی دەدرێتێ و، بەهەستێکی ئایینی پارەی پیدەدات، پێنجەم: لە صەلابی، کە بە دڵپاکی مۆڵەتی بە هەموولا داوە وەریانبگێڕن، لەو بڕوایەدام گەر صەلابی بەو یاریکردنە بازرگانیە سەقەتە پڕ لە هەڵە بزانێت، کەبەعەقڵ و بەرهەم و نووسینی ئەو دەکرێت، کە کەسی نەزان و نەشیاو دادەنێن بۆ وەرگێڕانی کتێبی ئەو، تەنها بەمەبەستی منافەسەی تیجاری، دوور لەمەقامی زانست و زانیاری بەخشین و ڕونکردنەوەی ئایینی، قبوڵی ناکات و دەرگای دادگایان لێدەگرێت .. ! !

کتێبی (ژیانی موحەممەد)ی شێخ عەبدولعەزیز پارەزانی توانی تا رادەیەك بگاتە ئەو ئاستە و ڕۆحێکی کوردانە و وەرگێڕانی جوان بکاتە بەری، بەڵام ئەمیش یەکەم: چونکە چاودێری لە بەغداد (الرقابة) (٢٥٠) لاپەڕەیەکیان لێ لابردو نوقسانیان کردبوو، دووەم: وەرگێڕانەکە دارێژراوێکی زیاتر مەلایانەیەو وشەی عەرەبی زۆرە، مامۆستا خۆی تەنها چاپی یەکەمی بینی، تەواو نەبوو بە رەحمەتی خوا چوو، فریا نەکەوت پیاچونەوەی بۆ بکات، رەنگە تا ئەمڕۆ زیاد لە (١٥) جارو، بەچەند جۆر چاپ کرابێت، بەڵام هەمووی هەر بەوێنەی چاپی یەکەم و یەك وشەی هەڵە چاکنەکراوە و گۆڕانکارییەکی تیانەکراوە، سیرەی ئازیزی حەبیب محمد سەعید زۆر وردو جوان و کوردیەکی پەتیە، بەڵام ئەویش تەحقیقی لە یەك

سەرچاوەو زانیاری نەکردوە، ڕێك لە عەرەبیەکەدا چۆنە، بێچاودێری و وردەکاری و بردنەوەی زانیاریەکان بۆ سەرچاوە ئەسڵەکەو تەحقیقکردن تیایدا دانراونەتەوە، ڕێك لە سەرچاوەی دوەم و دەستی دوو وەری گرتووە، بێئەوەی خۆی قسەیەکی هەبێت، ئێمە سیرەیەکی زانستیمان بە کوردی نیە، کە بابەتەکانی شیکردبێتەوەو تەحقیقی ڕاویەکانی کرابێت و قسەو باسی ڕۆژهەلاتناس و دژەکانی هێنابیێ و وەلامی دابنەوە، کە خوێنەری ئەمڕۆ زۆر پێویستی بەوە هەیە، فێربیێ کە خەلکی تریش هەیە، قسەو بوختان و هەلبەستنیان لە ژیاننامەی پێغەمبەردا کردوە، لە ئەمڕۆدا کە عەقلیەت گۆڕاوەو واقیع جۆرێترەو سەردەمەکەی شتی تر دەخوازێ، تۆ هەر ڕستە کۆنەکانی هەزار سالّ لەمەوبەر بهێنی و وەك خۆی تەرجەمەی بکەیت و دایبنێیتەوە، بەڕاستی ئەوە بێخەبەریە لە سەردەمی خۆت، هێشتا ئەوەی پارەزانی بەهێزترو هاوچەرخانە ترە کە سیسالێك لەمەوبەر نوسراوەو، تەنانەت باسی کوردو پێغەمبەرانی پێشووی کوردو زەردەشت و ئاوێستاو ڕۆژهەلاتناس و وەلامدانەوەی ئەورووپیەکان و مناقەشەکردن لە سەر هەندێك لە ڕوداوەکانی سیرەو ڕای خەلکی ترو، زۆر سودی لە باسەکان و سیرەکەی هەیکەل و خەلکی تر وەرگرتوە، کە خەلکی تر قسەی لەسەریان هەیە، تەرجەمەی (گولاوی سەرمۆر)یش تا ئاستێك وەرگێڕانێکی پاك و وردە، بەلام دووبارە ئەمیش هەرچەند لەنێو سەدان سیرەی نووسراو بەعەرەبی خەلاتی یەکەمی وەرگرتووە، بەلام دەولەمەند نییە بە هەموو لایەنەکانی ژیانی پێغەمبەرو بە شێوازێکی هاوچەرخانە دانەڕێژراوە.

سیرەی پێغەمبەری ئیسلام موحەممەد ﷺ روون و ئاشکرایە، هەزاران بەرگ بە هەموو زمانەکانی لەسەر نووسراوە، لە هەموو لایەنەکانییەوە لێکۆلێنەوەی لەسەر کراوە، قورئانیش زۆر لایەنی پشتڕاست کردوەتەوە، بەلام سیرەی موحەممەد ﷺ وەك سیرەی هەر مەزنێکی تر لە جیهاندا، شتی وای بۆ زیادکراوە کە پێغەمبەر ﷺ نەیکردووەو نەیوتووە، رەنگە هەواو ئارەزووی نووسەر وای خواستووە، یان هەر بە مەبەستێکی خۆشەویستی و چاکەوە کردبێتی و بۆی هەلبەستووە، یان بۆ رق و قین و نییەتی خراپ لە ئیسلام و پێغەمبەرەکەی وایکردوە، بەلام ئەم جیا لە

سیرەی مەزنەکانی تری مێژوو، لە قورئاندا زۆر لایەنی باسکراوە و پارێزراوە و وەحی (سروش)ی خوایەتی پشت ئەستوری کردووە، بووەتە بەشێك لە قورئانە پارێزراوە پاکە بێ غەل و غەشەکە، کە دەستی هیچ ئینس و جنێکی نەگەیشتووەتێ، بەشێکی زۆریشی لەلایەن ئایین پارێزان و بڕواپێکراوان لە فەرمودە گێڕەرەوەکان و مێژوونووسە دڵسۆزەکانەوە گێڕراوەتەوە، لەسەر ئەو بناغە پوختە دەبێ سیرەی پێغەمبەر ﷺ دابڕێژرێت و بنووسرێتەوە.

کتێبی (مەولودنامە) کۆنەکە، کە ساڵانە لە مانگی مەولوددا، لە هەموو شار و دێهاتە کوردییەکان لە هەزاران ئاهەنگی گەورەدا دەخوێنرایەوە و فرمێسکی بە رووی زۆر کەسدا دەڕێژا، بەڵام زۆربەی باسەکە لە ژیانی پێغەمبەر و سەرچاوە سەرەکییە ئیسلامییەکانەوە دوورە، کوفری گەورە گەورەی تیایە بەرامبەر خوا و پێغەمبەر و ئیسلام، مەرحومی مامۆستا شێخ موحەممەدی خاڵ کە هەر زوو هەستی بەوە کردبوو (مەولونامەی نەونەسەر)ی لەسەر ئەوە بە چاپ گەیاند، ناردی بۆ هەموو مەلاکان، هەتا ئەوکتێبە پڕ شیعرو هەڵە نەخوێننەوە و دڵی پێغەمبەر بەناوی چاکەو دڵسۆزییەوە ئازار نەدەن، بەڵام مەخابن هەتا ئەمڕۆش ئەو ئەفسانەو خەرافیاتە لای هەندێ مەلاو خەڵك بەلەزەتترەو دەخوێنرێتەوە ! . لەو باسەدا پێغەمبەر وەك عیسا نیشاندراوە، فەلەکان عیسایان لە شێوە مرۆڤیەکەی خۆی نەهێشتۆتەوە، کە مرۆڤێکە و وەك خۆی وەسفی خۆی دەکات، بەڵکو بردوویانەتە ئاستی خوا، لەم مەولودنامەیەشدا پێغەمبەری ئیسلام ﷺ کراوەتە نورێك وەك نوری خوا، کە گۆڕانکاریی لە نەوامیسی کەونیدا دەکات، کراوەتە یەکێك لە سیفەتەکانی خوا، کە ئەوەش ناجۆرە لەگەڵ بنچینەکانی ئیسلام و عەقیدەو سیفەتەکانی مرۆڤ... وایان لە موحەممەد پێغەمبەر ﷺ کردووە، کە گومانی بۆ خەڵك دروستکردووە، باس لەو ناجۆرییە دەکەن، ئەوان نەهاتون سیرەتە پاکەکان بخوێنن، بەڵکو خۆیان بەو خەرافیات و هەڵبەستراوانەوە خەریك کردوە، کە نە ناوی نووسەرەکەی بەسەرەوەیەو نە ژمارەی سپاردن و شوێنی چاپ، تەنها نووسراوە( مەولودنامەی پێغەمبەر، چاپکرا لەسەر ئەرکی عەبدولخالق

محمەد ئەمین عەصری، ساڵی ١٩٨٤) ناوەرۆکەکەی هەموو خەرافاتەو بەشیعری سەجع ڕێکخراوە، بۆ نموونە لە لاپەڕە ٢٥ دا دەڵێ خوا نوری حەزرەتی کردە دە پارچە لە یەکەم عەرش و لە دووەم قەڵەم و لە سێهەم لەوح و لە چوارەم مانگ و لە پینجەم خۆرو لە شەشەم بەهەشت و لە حەوتەم مەلائیکەو لە هەشتەم کورسی و لە نۆهەم ئاوو لە دەهەم جەوهەری نوری مستەفا. ئیتر نازانی ئەمانەی لە کوێوە هێناوەو زۆر لەوان زیاتری هێناوە بێسەرچاوە، پاش ئەوە کۆمەڵێك لە زانایانی کوردوستانی ئێران شەش مەولودنامەیان بە زمانی کوردی لەیەك بەرگدا کۆکردوەتەوەو ناویان ناوە (دیاری کوردەواری لە یادی پێغەمبەری ڕزگاری) کە بریتین لە (مەولودنامەی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، مەولودنامەی شێخ محەممەدی خاڵ، مەولودنامەی شێخ نەسیموو تەختەیی، مەولودنامەی مامۆستا شەمس، مەولودنامەی مەلا محەممەدی شلماشی، مەولودنامەی سەیید عەبدولا ولبەرێ) (دیاری کوردەواری لە یادی پێغەمبەری ڕزگاری، دانراوی کۆمەڵێك لە زانایان، پێداچونەوەی عادل سەعدی، انتشارات کردستان، سنندج، ١٣٨٠ هەتاوی) کە زۆربەی ئەمانە خاڵی نیە لە خەرافات و شتی دوور لە ئیسلام، کە هیچ پەیوەندیەکی بە ئایینەوە نیە.!

چاك وایە بۆ کتێبخانەی کوردی سیرەیەکی پوخت و تەواو بۆ ژیانی پێغەمبەرمان ﷺ بنووسرێتەوە، بەشیکردنەوەیەکی زانستییانەی پاك و تێبینی ورد بڕازێنرێتەوەو، ڕەچاوی باری میانڕەویی و حاڵی قۆناغەکەو دەورو بەرە جۆراوجۆرەکان لە عەقیدە و باوی سەردەم و داب و نەریت و یاساکانی ئەو کاتەدا بکرێ، دەبێت نووسەر ناخی پاك بکاتەوە لەو مەیلەی کە هەیەتی، واتە ئەوەی سۆفییە ژیانێکی سۆفییانەی موحەممەد ﷺ نەنووسێ و، هەرباسی زیکرو تەسبیحات و خاڵی پێغەمبەر ﷺ بکات و هەر ئەو لایەنەی ببینێ و نیشانبدات، یان ئەوەی ئیسلامی سیاسییە، هەر لایەنی حەرەکی و سیاسی و، ئەوەی فیقهیە، هەر لایەنی تەشریعی و فقهیەکان و، ئەوەی زانستییە، ژیانێکی زانستیی و، ئەوەی سەربازیە هەر باسی شەڕ و غەزای بکات و، وادابنێ کە محەممەد هەر خەریکی شەڕو

هەرا بووە، یان پزیشکەکان کتێبێکی پزیشکی طبی‌نبوی و کاسبەکان کتێبێکی قەبە لە ژیانی بازرگانیی موحەممەد ﷺ بنووسن، لەولاشەوە ئەوانەی بیرۆکەی چەپیان هەیە و شیوعین، بڵێن پێغەمبەر لە ژیانیدا بەرگری لە کۆیلەو چینی چەوساوە کردووەو، ڕاستڕەوەکان بڵێن محەمەد زۆر بە بیری ئێمە گونجاوترە، وەك وتارەکەی ئۆباما لە میسر، کە وای دەردەخست لەوسەری ئایینەوە دێتەوەو ئیسلام لە گیرفانی ئەمدایە، یاخود ڕۆژهەڵاتناس‌و مژدەدەرە گاورەکان، بە بیری خۆیان و بۆ بەرگری لە ئایینی خۆیان، ئایینی خەڵك ناشرین نیشان دەدەن و هەر سلبیەکان لە مێژووی ئیسلامدا کۆدەکەنەوە، یان قەشەکان کە بە یاساکانی فەلە لە ئیسلام دەنوارن و، واش بۆ ئیسلام دەپێون و دەنووسن کە گوایە ئایینی تەساموح و ملکەچ و ئاشتیپارێز بووە، کە هەرچی ستەمی لێکردی تۆ ملی بۆ کەچ بکەو گوێمەدەرێ و لە ئایینی ئێمە ـ فەلە ـ نێزیکترە، دەبێت لە نووسینەوەی ژیانی سەروەری پێغەمبەراندا ئەمانە ڕەچاوبکرێ، نووسەر نەیەت لەم جۆرە کەسە بەرتەسکانە زانیاری وەربگرێت، بەڵکو بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە دایکە بنەڕەتە کۆنەکان و، بەعەقڵیەتی سەردەم و بۆ خەڵکی ئەمڕۆ واقیعانە و بە قۆناغ بەندی بینووسێت، تەنانەت ئەم سیرەیەی کە صەلابی نوسیویەتی بۆ محەمەدو ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان وعەلی وحەسەن وحوسەین وزوبەیرو معاویەو ئەمەوی و شتی تریش کە لەپاشدا دەیبینین، هەرچەند زۆر بەهێز هێنراوەو وردەو پڕ زانیاریەو دەوڵەمەندە، گەڕاوەتەوە بۆ سەرچاوە ئەسڵەکان، بەڵام بەعەقڵیەتێکی سەلەفی عەرەبی ڕووت، بۆ دژایەتی شیعەو شوعوبی و هاوشیوەکانیان نووسراوە، مایە بۆ هیچ کەسیکی تر ناهیلێتەوە جگە عەرەب، تەنانەت کە باسی صەلاحەدین دەکات لەبەر کورد و مێژوو نەبووە، بەوەندەی کە صەلاحەدین بەرگری لە قودس کردووەو دژی صەلیبی و بەتایبەتتر دژی شیعە باطنیەکانی میسر بووە، واتە مەبەستی صەلابی و ئەو دەزگا زەبەلاحەی پشتی کە بەلێشاو بۆی خەرج دەکەن، بۆ دژایەتی هێرش و هەجمەی شیعەیە بۆ سەر خاکی عەرەبی، ئەو خوێندنەوەیەکی ئەکادیمی بیلایەن ناکات بۆ مێژووی ئیسلام، بەڵکو ئەو مەبەستە گرنگە جوڵاندویەتی،

یەکلایکردوەتەوە بۆ ئەوەی مێژوویەکی پڕ بەو بیروهەستە بخاتە عەقڵیەتی گەنج و خوێنــدەوارو ڕۆشــنبیری عەرەبیــەوە، کــە خۆیــان و مێــژوویان و دوژمنـــە ســەرەکیەکەیان بناســن و، خۆیــان بــۆ ئــەم شــیعە دوژمنــە کۆنــە سەرســەختە ئامادەبکەن، کە بەرگی نوێی لەبەرکردوە بەسەرۆکایەتی ئـێران، لـە کەنـداوو زۆر ناوچـەی عـەرەبی جێپـێی دانـاوە، ئـەم هەولانـەی صـەلابی ناچـێتە نـاو باسـێکی ئەکادیمی پوخت و بیلایەنی مێژوو، داوادەکـات کـە هـەموو کـۆبن بـۆ بـەرگری لـەو هێرشـە مەزهەبیـە ڕافزیـەی کـە هاتوەتـە نـاو ماڵـەکانتان و ئێـوە خـەوتووبون و ئاگاداری نەبوون. ! !

لـە سـاڵی ( ١٩٢٠ کـە (لیـنین)، سـەرکردەی شۆڕشـی سـووری رووسـیا مـرد.. ناکۆکییەکی توند لەسەر دەسەڵات لـە نێـوان (سـتالین) و (ترۆتسـکی) کـە هـاوڕێی خەبات و گیانی بە گیانی یەك بوون روویدا، کۆتاییەکەی بە سـەرکەوتنی سـتالین و دەرکردنی ترۆتسکی هات، دوای ئـەوە سـتالین رووی کـردە هـەموو دەسـتنووس و بەڵگەنامـەکانی شـۆڕش.. هەرچـی کارێـك کـە ترۆتسـکی بـۆ شۆڕشـی ئۆکتۆبـەری ئەنجامدابوو، ستالین کوژاندیەوە، کتێبی هەموو (دائرة المعارف)ەکـانی سـەرلەنوێ چاپکردەوە و جێدەستە گرنگەکانی ترۆتسکی تێدا شێواندو تێکیـدا، تەنانـەت ئـەو وێنە و تابلۆ زەیتییانەی کە هونەرمەندە شێوەکارەکان بۆ رووداوەکانی شۆڕشـیان کێشابوو و لە مۆزەخانەکانـدا هەڵواسـرابوو، سـتالین بـە فلچـە و بۆیـە دەموچـاوی ترۆتسکی لەو جێیانەی کە دەرکەوتبوو کوژاندییـەوە، تەنانـەت ژمارەیـەکی زۆر لـە وێنـــە فۆتۆگرافییـــە گرنگـــەکانی ئەرشـــیفی هێنـــا و گۆڕانکـــاریی تیـــاکرد .. دەسەڵاتدارەکان ئەگەر بۆ خۆیان و بۆ هاوڕێی دڵسۆزە گیانی بە گیـانی و رەفیقـی دەرب ئاوا بکەن، ئەی دەبێ چی بە مێژوو و دەقە ئیسلامییەکان بکەن کە هەمیشە ڕێگری سەرەکیی بووە لە بەردەم پێشکەوتن و بڵاوبوونەوەی ئەواندا..

لە کتێبە کەلامییە ئیسلامییەکاندا، زۆر باس لە تەجریدو داڕنینی دەروون، واتە ڕوتکـردن و پوختکردنـەوەو پاکردنـەوەی نـاخ و دەرونو، ئـەزموون وەرگـرتن و تێفکرین لە شتەکان و خوێندنەوەی بەرامبەر کراوە، ئەم شتانە لە کتێبە کۆنـەکانی

ئیسلام زۆرو زەبەندەیەو نویٚ نییە، رێیەکی کۆنـە، رِانـان و خوێندنـەوەو ئـەزموون وەرگرتن، لە دایکبووی تێفکرین و وردبوونەوەیـە، بـەڵام پاشـتر ئیسـلامییەکان لـە کـارە زانسـتییەکانیاندا ئـەو ئـەزمون و هەوڵانـەیان لـەبیر چـوویەوە، دوای ئـەوە هونـەری لاسـاییکردنەوە داهـات، عـەقڵکاری و بیرکردنـەوە بەزایـە چـوو، پاشـتر ئەوروپییەکان لەکارە زانستیەکانیاندا سوودیان لەو هەوڵانەی موسـوڵمانەکان بـینی، پاش ئەوان بەچەند سەدە ئەنجا موسڵمانەکان وایاندەزانی رێیەکی زانستیی نوێیەو لەوانیان وەرگرت..

ئەکادیمیەت و زانستبینانەی شتەکان ئاسانە، هەموو کەس دەتوانی وەریبگرێ و فێربیبێ، بەڵام جێبەجێکردنی قورس و گرانـە، خـەڵکی زۆر جیاوازییـان نییـە لـە زانینی یاساکاندا، بەڵام جیاوازییـان لـە جێبەجێکردنیـدا هەیـە، خـۆ پاککردنـەوە و دەروون و ناخ ساغکردنەوەو تێفکرین و تێبینیکردن، ئەزموون وەرگـرتن و رِانـان و دەرهێنانی ماناکان و پێوان بەیاسا زانسـتییەکان، وشـەی ئاسـانن و هـەموو کـەس دەتوانیٚ بیڵێ، بەڵام هەڵگرتنی ئەومانایانە لە رووی زانستییەوە و تێبینیکردنیان و پراکتیزەکردنیان لە نووسین و داهێناندا قورسە..

ئەم شەش لایەنە لە تەفسـیر و سـیرەو سوننە و شـەریعەت و فقهـوو مێـژووی ئیسلام، لە مەزنترین سەرچاوەکانی ئیسلامن، بریا دەزگایەکی گەورە و بـە توانـا و خەڵکانێکی بە ئەزموون و شارەزا لە زمانی عەرەبی و کوردیـدا، پێکـەوە ئەوانـەیان وەردەگێرِا، ئەوسا خەڵکی ناحەز نەیدەتوانی بە کەیفی خۆیان شت لەسـەر ئیسـلام دروست بکەن و هەڵبەستن و بوختان بنووسن!.

ئەم بازارِ هەژارییەی کتێبخانەی کوردی، وایکردووە کە هەرکـەس چـۆنی بـویٚ، ئـاوا دەقـە ئیسـلامییەکان شـیدەکاتەوە و لێـی لادەبـات و پێـوەی دەنـێ و چەواشەکاری دەکات، خەڵکیش، چـونکە سەرچـاوە رِەسـەنە ئیسـلامییەکانیان بـە زمانی پەتی کوردی و، بە شێوازی هاوچەرخانە لەبەردەستدا نییـە، هـەتا تـەحقیق لەو دەستکاریکردنانەدا بکەن و راستیی بزانن، رەنگە هەر بەو شـێوازە هەڵەیـە لـە

ئیسلام حاڵی بن، ئەوسا بە هەڵە لە ئاینەکەیان دەگەن و دڵگرمیێ دەمێننەوە، ئیتر لەوێوە لاوازیی ئاین لە کۆمەڵگادا دروست دەبێت.

نووسەرە کۆنەکانی سەردەمی یەکەمی ئیسلامی هەرچیان بیستووە بێ کێشان و پێوان و بەراورد، هەموویان وەك فەرمانێکی ئاینی و ئەمانەتێك کۆکردۆتەوە و بڵاویانکردووەتەوە و باش و خراپێکی زۆریان مەکۆکردووە، ئەمە وایکردووە رۆشنبیر و گەنجەکان لەو خەرمانە تێکەڵە بێتاقەت بن و بەئاینی بزانن، هەربۆیە لەقوتابخانە ئیسلامییەکان کۆچیان کردو، لەمێرگی رۆژهەڵاتناس و ئەوروپییەکان دەواریان هەڵداو، زانست و زانیاریان لەوان وەرگرت، وایاندەزانی ئەوەی ئەوان وەحییە و زانستی تەواوەو تەعبیر لەراستەقینەی پوخت دەکات، هەربۆیە نەوەیەك لە گەنجانی موسوڵمان لەجیهاندا بەزایە چوون و کەوتنە لاسایی کردنەوەی ڕۆژئاوا.

چاك وایە نووسەری کورد ئەو ئەرکە قورسە گرانە هەستپێبکات، بخوێنێتەوەو بەعەقڵی خۆی بیربکاتەوە و هەڵبسەنگێنێ، هەڵەی رۆژهەڵاتناسان دووبارە نەکەنەوە، ئەوان بەنەزانی تێکەوتبوون، باس لە ئەستێرەیەك دەکەن کە نە دیویانە و نە باوەڕیان پێیەتی، هەرچەند هەندێ رۆژهەڵاتناس لێکۆڵینەوەی دڵسۆزانەی کردووە، بەڵام لەبەر نەبوونی سەرچاوەی تەواو لەبەردەستیدا و کەم وردبینی لە باسەکانیانداو، هەست نەکردن بە نهێنییەکانی زمانی عەرەبی و بەلاغە، ئەو هەلانەیان بۆ دروست بووە، لەلایەکی ترەوە هەندێکیان بڕیاری پێشوەختیان بووەو مەبەستیان بووە دەگە و تانە لە هەندێ لایەنی بنچینەکانی ئیسلام بدەن، زیادەڕەویشیان تێداکردووە، هەقوایە لێکۆڵەرە کوردەکان لەو باسە شێواوانە دووربکەونەوەو بەزەینی خۆیان بیربکەنەوە، ئەوان نەك لە بارەی موحەممەدەوە ﷺ شتی زۆر نارەوایان وتووە، بەڵکو نووسیویانە عیسا لە مێژوودا نەبووە، هەندێکی تریان عیسایان بە شێت ناوزەد کردووە، ئەو نووسینانە بەرهەمی شەڕی نێوان کەنیسە و دەوڵەت بوو لە ئەوروپا، نووسەرانی ئەو کاتە لە دژی کەنیسە قسەیان، نەك بە عیساو مەسیح، بەڵکو بە ئیسلام و موحەممەدیش وتووە، دەتوانم بڵێم ئەوان لەو کاتەدا بەرامبەر ئاینی مەسیحی شێوێندراوو هەژارو خەڵەتێنەرو

تێکدراو، ناهەقیان نەبووە و چاکیان کردووە، بەڵام خەتاکار تووتییەکانی لای خۆمانە لە کوردستان، کە نازانن سەردەمی ڕێنسانس و شەڕی نێوان کەنیسە و زانست چی بووە؟!، دێن، لەم سەروبەندو سەردەم و زەمینە دوورەوە، هەڵەکانی ئەوان دەڵێنەوەو بەبێسود بۆ ئێمەی دەگوازنەوە، ڕۆژهەلاتناسان کە نووسیویانە عیساناوێك لە مێژوودا نەبووە، وتووشیانە موحەممەد ناوێکی نوێترەو ئەو سەرەتا ناوی (قثم) بووە، دکتۆر جەمال کە لێکۆڵەرەوەیەکی ناوداری مێژووی کوردە، بێلێکۆڵینەوە، ئەو وشەیەی ئەوانی نەقڵ کردووە، ئەم شەست ساڵی تەمەنی هەر ناوی محەمەدی بیستوەو باسکردوە، کە پاشتر لە ئەوروپییەکان ئەم وشە نوێیە وەردەگرێت، وایزانیوە یەکەم کەسە ئەم قسە نوێیە بێنێتە کوردستان، خوێنەری کورد ئەم نەقڵکردنە ڕاستەوخۆ بێ لێکدانەوە ناو دەنێ چی..؟ کەم کەس هەیە وەك دکتۆر جەمال توانای دەرهێنانی مەغزای ڕووداوو ناوو ئاسەوارو لێکۆڵینەوەی زانستی هەبێ، نازانم ئەم هەڵانە چۆن کەوتنە ناو زانیارییەکانی و لەبەرچیو بۆکێ ئەمەی کرد..!! بەڕاستی ئەم نەقڵکردنە ساکارانە زانیاریەکانی تری دکتۆر جەمال دەخاتە ژێر پرسیارو دەبێ پیا بچینەوە، ئەو باسانە لە بەرەنجامی شەڕی نێوان کەنیسە و دەوڵەت و ڕۆشنبیران، لە نێوان پیاوانی زانست و پیاوانی ئاینیدا ڕوویدا، ئیسلام لەو شەڕو ناکۆکییە بەدوورەو بەهیچ کلۆجێك دەستی تێیدا نەبووە، کە چەند سەدەیەکی خایاند، کەنیسەی ملهوڕ و ستەمکار، سەدان زانای مەزنی ئەوروپی لەو شەڕەدا کوشت و سووتاندو ونکرد..

لەهیچ کتێبێکدا نەمدیوە نووسەرێکی عەرەب یان کورد بتوانێ خۆیان شتێك لەسەر ئیسلام و قورئان بە تێفکرینی خۆیان بڵێن، هەرچیان وتووە کتومت لە ڕۆژهەلاتناس و مژدەدەرە گاورەکانەوە گواستوویانەتەوە، تەنها زیادەیەك کە هەبووبێ، زانستەکەی ئەوانیان بەڕق و قینێکی زیاترەوەو بەناوی خۆیانەوە نەقڵ کردووە، واتە ئەمان ڕق و بوغزیان زیاترە نەك زانستەکە.

کۆکردنەوەی مێژووی ئیسلام دوای سەدساڵ زیاتر لەقسەی دەماودەم وەرگیراون و نوسراون نەك لەدەقی نوسراوی سەرەتای ئیسلام، ئەوەتە تەبەری دەڵێ من

هەرچیم بیستووە نووسیومە، ڕاست بێ یان هەڵە من لێی بەرپرسیار نیم، ئەگەر دەقێکی ترتان دەست کەوت پێچەوانەی ئەوەی من بوو، ئەوەی من بدەن بە دیوارداو فڕێی بدەن، تێبینی مێژووی مردنی ئەم مێژوونووسانە بکە بزانە چەندە دوای سەرەتای ئیسلام مردون: ئیبن ئیسحاق سالّی ٨٥ی کۆچی مرد، ئیبن هەیسەم سالّی٢٠٧ك مرد، ئیبن خەیات سالّی٢٤٠ك مرد، ئیمامی تەبەری سالّی ٣٠٢ك لە نوسینی تاریخ رسل والملوك بویەوەو سالّی ٣١٠ ك مرد، مەسعودی ٣٤٦ك مرد، ئیبن حوقل سالّی٣٥٠ك مرد، ئیبن نەدیم سالّی ٣٧٨ك مرد، ئیبن مسکەویە سالّی٤٢١ك مرد، موحسین ئەلصابی سالّی ٤٤٨ك مرد، یاقوتی حەمەوی سالّی ٦٢٦ك مرد، ئیبن خەلەکان ٦٨١ك مرد، خەتیبی بەغدادی ٤٦٣ك مرد، ئیبن ئەسیر ٦٣٠ك مرد، ئیبن خەلدون ٨٠٢ك مرد، ئیمامی سەخاوی ٩٠٢ك مرد، بزانە نێوانی سەرەتای ئیسلام و مردنی مێژوونووسانی ئیسلام چەند زۆرە، والەوێ ڕوداوەکانی ئەمڕۆ چەندە ئالّۆزو نەزانراوە، نازانین بنەڕەتی گرفتی هەندێ کێشەی گەرمی ئەمڕۆ چییە..؟ شەرت نیە هەرچی مێژوونووس وتبێتی ڕاست بێت، مەسعودی کە لە تەبەری وردترە دەڵێ کورد لەئەسڵدا لەجنۆکەیەك کە لەگەڵ شاخیەك نزیك دەبنەوە پەیدا دەبن و ڕەچەڵەکی کورد شەیتان و جنۆکەی شاخیە، ئەمە هەرگیز لەقسەی مەسعودی زانا ناچێت، چونکە مەسعودی دەزانێت کەپێکهاتەی جنۆکە و مرۆڤ جیاوازە، وەسفی کورد زۆر دەکات، ئەی دەبێ لەبەرکێ ئەوەی نوسیبێت..؟ من دەڵێم ئەوە بۆ کتێبەکەی مەسعودی زیادکراوە، کاتێك کە کتێبەکە ماوەیەکی زۆر بە دەستنووسی لە ئەوروپا بوو، ئایا دەبێت ئێمە ئەم قسەیە وەربگرین و بە گوێی بکەین و بڵێین ڕاستە..؟

لە گێڕانەوە مێژووییەکاندا باس هەیە ڕاست و دروست و هەیە درۆو هەڵبەستراو، مێژوونووسان نەیانوتوە هەرچیمان نووسیوە سەد دەرسەد تەواوە..!!

کتێبی سیرە و سوننەت و صیحاح و مێژووی ئیسلام سەد ساڵ زیاتر دوای پێغەمبەر نووسراون، دوای ئەوەی کە لە دەوڵەتی ئیسلامییدا پروپاگەندەی سیاسیی و فیتنە دروستبوو، ئیتر گێڕانەوەکان جۆراوجۆری لێهات، هەر یەکە بە

گوێرەی خۆی، بەدڵی خۆی، بەلای خۆیدا کێشی دەکرد، بۆ پاڵپشتی کۆمەڵی خۆی قسەیان دروست دەکرد، ئەمە لە سەردەمی (عەلی و موعاویە) و سەردەمی فیتنەی گەورەی نێوان موسڵمانان، کە هێشتا سەحابەیەکی زۆر لە ژیاندا مابوون، ئەی چی دەکەی لە سەردەمی دوای ئەوان، سەردەمی دوودڵیی و توندوتیژیی و شەڕ و ئاشووبی نێوان برا ئایینییەکان، تەنانەت ناکۆکییە سیاسییەکان هۆ بوون بۆ کۆکردنەوەی فەرمووده، ئەوان هەوڵیاندا فەرمووده دروستکراوەکان لابەرن، زۆر گەڕان و ماندووبوون، سوور بوون لەسەر نووسین و کۆکردنەوە، کێ هەیە هەوڵەکانی ئیمامی (بوخاری) نەبیستبێ، ماندووبوون و برسێتی چەشت هەتا ٦٠٠ هەزار فەرموودەی کۆکردەوە، کە لە زەین و دەمی خەڵکییدا بوون، دواتریش دەرکەوت کە ئەو ئەرکە پیرۆزەی بوخاری کە بە ماندوبوون و زەحمەت و دڵسۆزی دەستیکەوت و زۆر وردەکاری بەکارهێنا هەتا خۆی لە فەرموودەی لاواز و هەڵبەستراو بپارێزێ، دەرکەوت کە تەنها(٤) هەزار فەرمودەی صەحیحە، واتە لە (١٥٠) فەرموودە یەك دانەی تەواو راستە، بەلام (ئەبوداود) کە (٥٠٠) هەزار فەرموودەی کۆکردووەتەوە، (٤٨٠٠) فەرموودەی راستە، هەموو کۆکراوەکانی فەرموودە ئاوا دەرچوون، ئەو فەرموودانەی کە بەو هەموو ماندوبوون و شەوو رۆژە کۆکرایەوە، دوای شەن و کەوکردنیان لای زانایانی فەرموودە لە سەدا پێنجی راست دەرنەچوو، بەڵکو جێی رەخنەو گازندەو قسە لەسەرکردن و بەدواداچوونە لای زانایان، لە کۆتاییدا سەدان چیرۆکی هەڵبەستراوی وەك چیرۆکی (غرانیق) بەدرۆ و هەڵبەستراو دەرچوون، ئەگەر ئەوە حاڵی فەرموودەکانی پێغەمبەر بێت کە زۆر وردەکاری تیاکراوە و خەڵکیی خۆیان پاراستووە لە گێڕانەوەی هەڵە هەتا بەر هەڕەشەکانی فەرموودە نەکەون، ئەی دەڵێی چی بۆ ئەوانەی دواتر نووسراون لە کتێبی سیرە و مێژووی ئیسلام کە خەڵکی گوێی لە وردەکاری نەداوە و هەرچی بیستووەو چۆنی بیستووە وا گێڕاویەتییەوە.

لە راستییدا ناکۆکییە سیاسییەکانی نێوان موسڵمانان کە دوای سەردەمی یەکەم و سەرەتای ئیسلام هاتە ئاراوە، بووە هۆی ناکۆکیی لەسەر زۆر فەرموودە

که پالّپشت بوو بۆ کەسێك، یان دەستەیەك، یـان دژ بـووە بـە دەسـتە و گرۆهێـك، بەکار دەهێنرا و رەواجی پێدەدرا، فەرموودە دوای ئـەو رووداوانـە نووسـرایەوە لـە سەردەمی ئومەوییەکاندا، دوای ئـەوە عومـەری کـوڕی عەبدولعـەزیز بڕیاریـدا کـۆی بکاتەوە، بەلاّم کۆنەکرایەوە تا سەردەمی مەئمون ( ١٩٨ـ٢١٨ك)، لـە دوای ئـەوەی کە فەرموودەی ڕاست لەناو فەرموودەی هەڵبەسراوەکاندا بووە تاڵە موویەکی سپی لـە پێسـتی گایـەکی پێسـت و مـوو رەشـدا، بـە وتـەی (دار قطـني)، هـەر بۆیـە لـە سەرەتای ئیسلامدا فـەرموودە کۆنەکرایـەوە، چـونکە پێغەمبـەر فـەرموویبووی: (لا تَكتُبوا عَنِّي شَيئاً غير القرآن، و مَن كتَبَ شـيئاً غـير القـرآن فليمحـوه)، لـەو ڕۆژەوە فەرموودەکان هەر بەسەر زمانەوە دەوتراو دەگێڕرانەوە، هـەر بۆیـە زیـادو کـەمیان بـۆ کـراوە، گێڕانـەوەکان جیـاواز بـوون و لـە یەکێکـەوە بـۆ یـەکێکی تـر گـۆڕاون، عومەری کوڕی خەتاب لە سەردەمی خەلیفایەتی خۆیدا هەستی کردبـوو کـە دەبـێ فەرموودە بنووسرێ، پرسی بە هاوڕێکانی پێغەمبەر کرد، ئەوان ڕازی بوون، عومەر بۆ ماوەی یەك مانگ نوێژی ئیستیخارەی کـرد، بەیانییـەك هەسـتا و عـەزمی جـەزم کرد و وتـی: (من دەمەوێ سوننەتەکان ـ فەرموودەکان ـ بنووسمەوە، بەلاّم بە خـوا من هەرگیز قورئان بە هیچ شتێك ناگۆڕمەوە) ئیتر وازی لە نووسینەوەکە هێنـا، بـۆ ناوچەکانیشـی نووسـی: (هـەر کـەس شـتێکی لایـە بـا بیکوژێنێتـەوە)، دوای ئـەوە فـەرموودەی نـوێ و هەڵبەسـتراو لـەدایك دەبـوو، دەم بـە دەم دەکـرا، هـەتا لـە سەردەمی مەئموندا هەرچی بە پاك و ڕاست زانرا کۆکرایەوە.

لەگەڵ ئـەوەی کۆکـەرەوانی فـەرموودە زۆر سـوربوون و کۆشـاون و وردەکارییـان بـەکارهێناوە، زاناکـان زۆر هەوڵیـانـدا ڕاسـتییەکان نـاوبنێن، پێشـەوا نـەوەوی لـە شەرحی موسـلیمدا دەڵـێ: (اسـتدرك جماعـة علـى البخـاري و مسـلم أحاديـث أخَـلاًّ بِشـرطهم فيهـا و نزلـت عـن درجـة مـا التزمـاه) ئەوانـەی فـەرموودە کۆدەکەنـەوە میقیاسی فەرموودەکە و سیقەکردن بەوەی کە فەرموودەکە دەگێڕێتـەوە، دەکەنـە بناغەی وەرگرتن و قبوڵکردنی فەرموودەکە، یان وەلانانی، ئەوە پێوانەیەکە نرخـی خـۆی هەیـە، بـەلاّم هـەر ئـەوە بـەس نییـە، ئـەمڕۆ لای ئێمـە چـاکترین پێوانـە کـە

فەرموودەی پێ بپێورێ، یان هەواڵەکانی ژیاننامەی پێغەمبەری پێ بپێورێ هەر ئەوەیە کە لە پێغەمبەرەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: (ئێوە دوای من ناجۆری و رای جیاوازتان بۆ دروست دەبێت، هەر چییان لە بارەی منەوە بۆ هێنان بیدەنە بەر قورئان، هەرچی لەگەڵ قورئاندا تەواو دەرچوو ئەوە هی منە، هەرچی ناجۆر دەرچوو، ئەوە هی من نییە)، ئەوە پێوانەیەکی وردە، لە کۆنەوە پێشەوایانی موسڵمانان کاری پێدەکەن، هەتا ئەمرۆش، ئیبن خەلدون دەڵێ: (من بڕوا ناکەم بە گێڕانەوەی فەرموودەیەك، یان وتەی سەحابییەك کە پێچەوانەی ئاشکرای قورئان بێت، تەنانەت ئەگەر گێڕەرەوەکەشی بڕوامان پێی هەبێت)، وتویانە: (نیشانەی فەرموودەی دروستکراو بە زمانی پێغەمبەرەوە ئەوەیە کە پێچەوانەی قورئان بێت، یان بنەماکانی شەریعەت و عەقڵ قبوڵی نەکات)، ئەمەش هەر وتەی ئیبن خەلدون بوو، هەروەها بنەماکانی رەخنەی زانستیش لە بارەی فەرموودەوە هەر وا دەڵێ.

ناجۆریی و ناکۆکیی نێوان موسڵمانان دوای وەفاتی پێغەمبەر گەیشتە پلەیەك کە زاناکان کەوتنە گومان لە زۆر فەرموودەو کەسە گێڕەوەکەش، کە ئەبو لوئلوئی فەیروزی، غوڵامی موغەیرە خەلیفە عومەری شەهید کرد، دوای ئەوە عوسمان بووە خەلیفە، دوژمنایەتی نێوان بەنی هاشم و بەنی ئومەییە کە پێش ئیسلامیش هەیانبوو، سەرلەنوێ سەری هەڵدایەوە، کە خەلیفە عوسمان شەهید بوو، جەنگی ناوخۆ لە نێوان موسڵماناندا سەریهەڵدا، عائیشەی خێزانی پێغەمبەر دژایەتی عەلی کرد و زۆریش هەبوو پشتی دەگرت و شەڕی خوێناوی لە نێوانیاندا روویدا، پاشان شەڕەکانی ئیمامی عەلی و موعاویە لە باکوری عێراق کە دەیان هەزار کوشتاری لێکەوتەوە، دواتر پەیدابوونی خەواریج و ناکۆکیی و دووبەرەکیی زۆری تر، وای لێهات هەر یەکە بە کەیفی خۆی فەرموودەی دەهێنا و کاری پێدەکرد و بەرامبەری پێ تاوانبار دەکرد و خۆی پێ بەهێز و پاك رادەگرت، گەیشتە ئاستێك ئیمامی عەلی ئینکاریی دەکردو بڕوای بە هیچی تر نەبوو جگە قورئان، هەتا لێوەی دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: (کتێبێکمان لا نییە بۆتانی بخوێنمەوە جگە ئەوەی لە قورئاندا هەیە، هەرچیش لەم کتێبەدا هەبێ لە پێغەمبەرم وەرگرتووە).

خەڵکی هەر لەوەدا نەدەوەستا کە فەرموودە دروست بکات لەبەر ویست و ئارەزوویەکی خۆی کە حەزی دەکرد خەڵکی بۆ بانگ بکات، یان رەفتارێکی بەرز کە خەڵکی بیکەن و خێریان بگات فەرموودەیەکیان بۆ دروست دەکرد، ئەوانەیان دەدایە پاڵ پێغەمبەر، کە دەسەڵات کەوتە دەست بەنی ئومەییە، ئەو فەرموودە دروستکەرانەی کە پەیوەندییان کرد بە بەنی ئومەییەوە، ئەو فەرموودانەیان بە لاواز دادەنا کە لە بارەی گەورەیی و چاکەی عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە هاتبوو، لەولاشەوە هەوادارانی عەلی و ئەهلوبەیتی پێغەمبەر لەو فەرموودانەیان زیاد دەکرد کە وەسفی خۆیانی دەکرد، بە جۆرەها شێواز هەولی بلاوبوونەوەیان دەدا، تەنانەت دژایەتیی ئەوانەشیان دەکرد کە عائیشە لە پێغەمبەرەوە دەیگێڕایەوە، شتێکی خۆش لەو گێڕانەوانەی (ئیبن عەساکر) کە لە ئیبن سەعد ئیسماعیل کوڕی موسەننای ئیسترابادییەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: کە ئەو لە دیمەشق ئامۆژگاریی خەڵکی دەکرد، پیاوێك هەستا پرسیاری لە فەرموودەیەکی پێغەمبەر کرد کە دەفەرمووێ: (أنا مدينة العلم و علي بابها) ئیسماعیل کە هەواداری موعاویە بوو وتی: (بەڵێ، کەس لەو فەرموودەیە نازانێ مەگەر کەسێك لە سەرەتای ئیسلامدا بووبێت، بەڵکو پێغەمبەر دەفەرمووێ: (أنا مدينة العلم، و أبوبكر أساسها و عمر حيطانها، و عثمان سقفها، و علي بابها) بەو هەڵبەستن و بۆ زیادکردنە دانیشتووانی دڵخۆشکرد، هەر بۆیە داوای سەنەدەکەیان لێکرد، بەلام نەیتوانی بیلێ، هەر بەو جۆرە فەرموودە دروست دەکرا بۆ کاری سیاسی و بۆ ئارەزوو خێراو ساتەوەخت، هەر وەکو شیعر بۆیان دەهات، ئەوەند فەرموودەی هەڵبەستراو دروستکرا کە موسڵمانانی شپرز کردبوو، زۆری دژایەتی بوو لەگەڵ ناوەرۆکی قورئاندا، لە سەردەمی ئومەوییەکاندا هەوڵی زۆر لە کاردا بوو بۆ وەستاندنی ئەو پیشە خراپە، بەلام بێ سوود بوو سەرکەوتوو نەبوون، کە دەوڵەتی عەبباسییش هات، مەئمون دوای دووسەد ساڵ بەسەر وەفاتی پێغەمبەردا دوای ئەوەی کە سەدان هەزار فەرموودە دروستکرابوون، یان تێکدرابوون و بە ناوی پێغەمبەرەوە هەڵبەسترابوون، لەو بارودۆخە ئالۆزەدا کۆکەرەوانی فەرموودە دەستیانکرد بە

نووسینەوەی فەرمووده، نووسەرانی سیرەی پێغەمبەر کتێبی خۆیان نووسی و مێژووی ئیسلام و فتوحات و خەلیفەکان و ئەمەوی نووسرایەوە، واقیدی و ئیبن هیشام و مەدائینی و خەڵکی تر لە سەردەمی مەئموندا باسەکانی خۆیان نووسی، نە ئەوان و نە غەیری ئەوان نەیاندەتوانی پێچەوانەی رای خەلیفەی عەبباسی بنووسن، کە دژبوون لەگەڵ دەوڵەتی ئەمەوی و بەنی ئومەییەدا، خۆیان بە بەنی هاشم و ئالوبەیت دادەنا، لەبەر ئەوە نووسەران نەیاندەتوانی وردەکاریی بەکاربهێنن و پێوانە بۆ نووسینەوەی کارەکانیان جێبەجێ بکەن کە پێغەمبەر دایناوبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرموویووی: (هەرچی وتەیەکی من لە گەڵ قورئان ناجۆر بوو، هی من نییە)، گەر ئەو پێوانەیەشیان بەکار ببردایە ئەوا ئەم هەموو چیرۆك و فەرمووده لاواز و رووداوە نەشیاوانە نەدەگەیشتە ئەمرۆی ئێمە، رەخنەی زانستییانەی ئەمرۆ زۆر لەو قیاس و پێوانەیەی کە پێغەمبەر دایناوبوو جیاوازتر نییە، بەڵام رۆژگار ئەوەی دەخواست کە ئەو زانایانە هەندێکی بەسەر یەکدا جێبەجێ بکەن، بەڵام هەندێکی تریان بۆ نەکرا بەسەر لایەکی تردا، زۆر ئاسان دەیانتوانی ئەو پێوانە و شایانەی پێغەمبەر دایناوبوو بەسەر نووسینەوەی فەرمووده و ژیانی پێغەمبەردا بیکەن، بەڵام نەیانکرد، ئەوەش لەبەر هەر هۆیەکی سەردەمەکەیان بوە نازانم، یان دەیانتوانی شتێك کە یەقین و بروایان پێی نەبوایە، یان عەقڵیان نەیگرتایە، نەیانکردایە، ئەوەش هەر دەکراو باشتر دەبوو، قورئان بەڵگەی براوە (الحجة القطعية)یە لەسەر بوونی پێغەمبەر، بەڵام پێغەمبەر بەڵگە نییە لەسەر ئیسپاتی قورئان، بڕوابوون بە خوا لە پێش بڕوابوونەوەیە بە پێغەمبەران، ناتوانین بڕوا بهێنین بە پێغەمبەر هەتا بڕوامان بە خوا نەبێت، نابێ تەنها لە قسەی پێغەمبەرانەوە باوەڕ بە خوا بهێنین.

بەڵام ئەوانەی سیرەی پێغەمبەریان نووسیووە، رایان وابووە کە بە موعجیزەکانی پێغەمبەردا خوایان ناسیووە، کەچی لە ئەمرۆدا هەندێ لەو موعجیزانە دڵ کرمێ دەکەن و ئیمان زیاد ناکەن، بەڵکو دژانی ئیسلام ئەوانەیان بەکارهێناوە بۆ ناشیرینکردنی ئیسلام، گێڕانەوەی هەموو ئەو رووداوانەی کە عەقڵ

قبولّی ناکات ئەستەمە، وا چاکە ئەوەی خەریکی ئەم کارانەیە زۆر وردبێت، وردەکاری زانستیی لەبەرچاو بگرێ بۆ خزمەتی هەق و ئیسلام و مێژووی ژیانی پێغەمبەر، سەردەمی پێغەمبەر، قورەیشییەکان داوایان دەکرد کە خوا موعجیزەیان بۆ بنێرێ لەسەر دەستی پێغەمبەردا، هەتا ببێتە بەڵگە، چەندین ئایەت لەسەر ئەوە هەیە[1]. قورئان گەورەترین موعجیزەی پێغەمبەرە، نەك ئاودەرهێنان لە بەرد، یان دار ببێ بە مار، خوێن بارین، ئێستا عەقڵ و زانست لەوە ترازاوە، خەرافیاتی زۆر لە سەردەمی ئومەوییەکاندا بە ناوی پێغەمبەرەوە دروستکراوە، دکتۆر جەمال دێت ئەم لاواز و هەڵبەستراوانە دێنێ و دەڵێ: "عەقڵ نایگرێت"، یان لە رۆژهەڵاتناسە گاور و فەلەکانەوە زانیاریی هەڵە دێنێ و بەسەر ئیسلامدا ساغی دەکاتەوە، ئەم خۆی بە لێکۆڵەر دادەنێ، دەبوو بگەڕایە و خۆی ئەو شتانەی رەدبکردایەتەوە، بەڵام دیارە لەم دۆخەیاندا هەر نیەتی وابووە و کاری پێی هەبووە !.

موعجیزەی پێغەمبەر ﷺ ( قورئان)ە، عەقڵیی و ئینسانییە، ئینس و جن ناتوانن نموونە لەوە بهێنن، ئەگەر هەموویان یاریدەی یەکتریش بدەن وەك خوا دەفەرموێ، موعجیزەی موحەممەد موعجیزەی قورئانە کە گەورەترین موعجیزەیەکە کە خوا دایبارانـدوە و رێی بە پێغەمبەر داوە بەکاری بهێنێ، موعجیزەیەکە کە عەقڵکارانە حوجەو بەڵگەکانی دیاریکراوە و قەناعەت دروست دەکات، موعجیزەی ماددیی نییە، ئەمرۆ خەڵکی بڕوایان بە شتێك هەیە کە عەقڵ بیسەلمێنێ و قەناعەت بە عەقڵ و دڵ بکات، ئەوەش هەر قورئانە کە موعجیزەی پێغەمبەری نەخوێندەوارە، بەوە دینەکەی سەرکەوتو بڕوای خەڵکی زیادکرد، وە بوو بە هێزی ئیمانیان بۆ گشت سەردەم و بۆ هەموو گەل و هۆزو زمانێك، بڕوا بە خوا پێویستی بە موعجیزەی لاواز نیە، کە لای زەین و بیر و دڵ قورس بێت، هەر بە سەیرکردن و تێرامان لە بوونەوەرو دەورووپشتمان، بوونی خوا دەسەلمێ،

---

[1] بڕوانە ئایەتەکانی (سورەتی ئیسرا ٩٠-٩٣) و (ئەنعام ١٠٩-١١١).

تەنانـەت لـە سـەردەمی پێغەمبەریشـدا دەنگوبـاس نییـە کـە کەسـێك بـە هـۆی موعجیزەیەکەوە ئیمانی هێنابێت، تەنانەت باس هەیە کە ئەوانەی بڕوایـان هێنـابوو بـەهۆی مـوعجیزەی ئیسـراو میعراجـەوە، پاشـتر بێبـاوەڕبوون و لـە ئـایین هەڵگەڕانەوە، وتیان چۆن بە بەشێك لە شەو ئەو هەموو سەفەر و گەشتە بۆ قودس و ئاسمانەکان و لای خوا و بەهەشت و دۆزەخ و پێغەمبەران دەکرێت، لە مزگـەوتی حەرامەوە بۆ مزگەوتی ئەقسـا و ئاسمانـەکان بـە چـی ڕۆیشـت..؟ هـیچ بتپەرسـتێ بڕوای بەو موعجیزەیە نەهێناو بۆیان نەسەلما، بەڵام ساحیرەکانی فیرعەون کە زانـا و لێزانبوون لە کارەکەیاندا، کاتێك دارەکەی موسایان بینی بوو بەمار، وتیـان ئەمـە سیحر نییە و هونەرکاری و فێڵ نییە، بەڵکو هێزێکی ترەو لە فێڵی سیحر بـە دورەو لەلایەنی خواوەیە.

لە سنگ لەتکردنەکەدا کە هەموو سیرە نووسەکانی کۆن و نوێ باسی دەکـەن، خیلافی لەسەرە، موحەممەد شەش ساڵان بووە، بەشـی شـەیتان چـی دەکـات لـەو منداڵـە پاکـە بـێ گوناهـە مەعسـومەدا، کـە ئەگـەر لـە پاشـدا نەشـبێتە پێغەمبـەر، تەنانەت موعجیزەکـەی پێغەمبـەر ﷺ لـە جـەنگی (تـەبوك)دا لەسـەر ئاوەکـە کـە بەشـی تێرخواردنـەوەی نـەدەکردن، بـەڵام کـە پێغەمبـەر ﷺ دەم و چـاوی تێـدا شۆرد، کانییەکە تەقی و فوارەی کرد و بەشی هەزاران سەربازو وڵاخی کرد، زۆر لە ریوایەتـەکان ئـەو موعجیزەیـە بـاس ناکـەن لـەو جەنگـەدا، پـاکترین سـیرە ئـیبن هیشـامە، باسـی ناکـات کـە پـێش موسـلیم و بوخـاری نووسـراوە، موسـلیم باسـی دەکات، ڕەنگە باسی ئەو کانیاوە دروستکراو بێـت، ئـەوەو زۆری تـر پێویسـتی بـە لێکۆڵینەوەی وردو ژیرانە هەیە، (ئـیبن ئیسـحاق) دەگێڕێتـەوە کـە کـانی نەتـەقی، بەڵکو باران باری، ئەم جۆرەها گێڕانەوانە باسەکە گومانـاویی تـر دەکـات لـە ڕووی لێکۆڵینەوەی زانستییەوە، دەتوانی وەری بگـری، یـان وەرینـەگریت، بـاوەڕت لـەق نابێت!.

هەندێك لە ڕۆژهەڵاتناسان لە کاتی توێژینەوە زانستییەکانیاندا کاریگەر بوون و بە شێوەیەکی زانسـتیی باسـەکانیان تـاوتوێ دەکـرد، هـەروەك هەنـدێ نووسـەری

ئیسـلامییش زانسـتییانه کارەکانیـان دەکـرد، بـەڵام نووسـەری تـر هـەبوو لـە ڕۆژهەڵاتناسان و ئیسلامییەکانیش بە گوێی هەوا و ئارەزووی خۆیان کردووە، هـیچ وردەکارییـەکی لێکۆڵینـەوەییان بەخـەرج نـەداوە، گـەر دەروونـی خۆیـان خـاڵی بکردایەتـەوە و بـە ئـارەزووی خۆیانیـان نەکردایـە و شـتێکی جوانیـان پێشـکەش بکردایە، ئەوسا هەم لەسەر خۆیان کاریگەری دەبوو، شتێکی دروستیان پێشـکەش دەکردو لەسەر حوێنەریش کاری دەکرد.

ئاسـان نییـە ڕۆژهەڵاتناسـان لـە توێژینـەوەی ئیسـلامییەکاندا ئـەو هـەموو وردەکاریانە بەکار بهێنن و ئەو هـەموو زیادەنووسـین و هەڵبەسـتنە تێکـەڵ بکـەن، هەرچەند بە لای خۆیانەوە توێژەر بوون و کاری لێکۆڵینەوەی ڕەخنـەییان کـردووە و زانستییانە بۆی چوون، زۆرجار ئەوان کەوتوونەتە هەڵەی زمانەوانییەوە، چـونکە هـەموو نهـێنی و ڕێزمـان و بەلاغـەتی زمـانی عـەرەبییان نـەزانیوە، پاشـان ئـەوان کاریگەرن بە فەلەی ئەوروپاوە، زۆربەیان بە گومانەوە سـەیری ئایینـەکان دەکـەن، ئەوان کەمتر دەتوانن لە حوکمی ژینگەی شوێن و کات دەرچن، لەبەر ئەوە هەم بـە رق و قین دەنووسن، هەم گومان و دەستێوەردان و شـتی خراپـی تێدەکـەن، هـەم ناتوانن حەقیقەتێك هەستپێبکەن و بنووسـن کـە زۆر دووربێـت لـە عـەقڵ و ئـایین و ژینگەی ئەوانەوە، هەر بۆیە لەسەر زانایان و نووسەرانی ئیسلامیی کوردو دەزگـا و ناوەندی ڕۆشنبیرو تەفسیرو ئاراو تیشك پێویستە بەدەستە جەمعی و ڕاگۆڕینـەوە، ئەو بارە قورسە بخەنـە ئەسـتۆی خۆیـان و، بەمەبەسـتەوە هەڵسـن بـە توێژینـەوە لەسـەر ئیسـلام و سـیرە و فـەرموودە، بـە ڕێگـەی لێکۆڵینـەوەی پـاك و پوخـت و خوێندنەوەی ڕەخنەیی زانستیی لەسەر ئـەو بابەتانـە بکـەن کـە گومـانی لەسـەرەو پێویسـتیان بـە ڕوونکردنـەوە و زانیـاریی و وەڵامـی زیـاتر هەیـە، چـونکە ئـەو ڕۆژهەڵاتناسانە هەم گاورن و دژ بە ئاییني ئیسلامن و هەم لە نهێنییـەکانی زمـان و بەلاغـەت و ڕێزمـانی عـەرەبی نـازانن و شـارەزایی ئیسـلام و بنـەماکان و تـەواوی ڕووداوەکان نین، چۆن ئارەزوو بکەن وا دەنووسن!.

بـەم كـارە هـەم هەڵـەی رۆژهەڵاتناسـان راسـت دەبێتـەوە و لار و چـەوتییان دەردەخرێت و گومانەكانیان دەڕەوێتەوە، لە لایـەكی تریشـەوە رەنگـە بـەو زیـادە زانیـاریی و روونكردنەوانـە ڕاو بۆچـوونی بەرامبـەر بـە ئیسـلام بگـۆڕێ و ئـەنجامی چاكی لێبكەوێتەوە.

گەیشتن بەو كارە ئاسان نییە، خۆگریی و ماندوبوون و كاتی دەوێت، توێژینـەوە و ڕێكنووسین و راستكردنەوە و ئازادانـە بیركردنـەوە كـارێكی ترسـناك و سـەختە، بەڵام ئازایانەو هەقانیەتە، ئەگەر سەركەوتوو بێت كاریگەریی باشی دەبێت.

ئێمە لە نووسین و لێكۆڵینەوە و وەڵامدانەوەدا دەبێت شـارەزا و پسـپۆڕبین، زۆر بخوێنینەوە و شارەزای هەموو لایەنـەكان بـین، دەبـێ دوو سـەردەم و كـات جـویێ بكەینـەوە، ئێمـە لـە نووسـیندا دەبـێ سـەردەمی یەكـەمی ئیسـلام هـەتا كـوژرانی خەلیفە عوسمان بە قۆناغێك دابنێین، لە دوای كوژرانی خەلیفە عوسمـان هـەتا ئـەو كاتەی كە دەرگای ئیجتیهاد داخرا قۆناغێكی تر بێت.

لە سەرەتای ئیسلامەوە، تا كوشتنی عوسمان، هیچ جیاوازیی و گۆڕانكارییـەك لـە بـیرورای موسـڵماناندا نـەبووە، نـاكۆك نـەبوون لـە باسـكردن و گێڕانـەوەی رووداوو لەسـەر خەلافـەت و جـەنگی هەڵگـەڕاوەكان و وڵاتگـیری و فتوحـات، بـەڵام دوای عوسمان ناكۆكیی و، زۆر راو بۆچوون و دژایەتیی، رژایە ناو هـەموو مـاڵ و بـازاڕ و كوچەو كۆڵانێك، جەنگی ناوخۆیی روویدا، سەحابە خوێنی سـەحابەی دەڕشـت، لـە نێوان عەلی و موعاویەدا هەزاران سەحابە و تابیعین كوژران، بە ئاشكرا و بە نهێنی دژایـەتیی یـەكتریان دەكـرد، لـە نێـوان عـەلی و عائیشـەدا شـەڕی قـورس روویـدا، ئارەزوو و هەوای سیاسیی رۆڵی خراپ و خەتەرناكی بینی لە ژیانی ئـایینی خەڵكـدا و بە گوێرەی مرۆڤەكان دەگۆڕا، بە ئاشكرا و لە مەیدانی واقیعـدا ئەوانـەت دەدی، لە وتاری خەلیفەكاندا جیاوازیی ئەو دوو سەردەمە دەبـینی، خـۆت وتـاری بەیعـەی ئەبوبەكر ساڵی (١١)ك بخوێنەرەوە، بزانە باسی چی دەكات، پاشان وتاری بەیعەی ئەبو جەعفەری مەنسور لە ساڵی (١٣٦ك) بخوێنەرەوە بزانـە چـۆن دەدوێ و لـە چ وەتەرێك دەدات، جیاوازیی مەزن و فراوان هەیە، لە كەمتر لـە دوو سـەدەدا هـەموو

شت گۆڕا، شووورای نێوان موسڵمانان بوو بە حوکمی رەها، ئەو شۆڕش و کودەتایانە کە بەسەر دەسەڵاتی ئیسلامییدا هات، زەرەری زۆری لە بنەمای ئیسلام و دەوڵەت و بڕیارەکان و سیاسەتی ئیسلامیی دا، زەرەری لە شارستانیەتی ئیسلامییدا، لەو دوو سەدەیەی دوای کوژرانی عوسماندا و هێرشی مەغۆل و سەلاجقە و بوەیهی و مەمالیك زۆر شت گۆڕا، فەترەی یەکەم کە بە کوژرانی عوسمان کۆتایی هات، بناغەی راست و دروستی لەو سەردەمەدا دروستبوو بۆ ژیانی موسڵمانان بە گشتیی، بەڵام دوای ئەوە و دوای سەردەمی یەکەم، لەگەڵ ئەوەی کە پێشکەوتنێکی زانستیی دیاربوو لە سەردەمی ئەمەوییەکاندا بە تایبەتی رۆژانی عەباسییەکان، بەڵام دەستی تێکدان لە بناغە ڕاستەکە دروست بوو، لە جێگەیاندا شتی وا هاتەگۆڕێ کە لەگەڵ پایە و بناغە راستەکە و رۆحە پاکەکەی سەرەتای ئیسلامدا یەکی نەدەگرتەوە، ئەوانەی کە هاتبوونە ناو ئایینەکە و بە رووکەش موسڵمان بووبوون، لە جولەکە و فەلەو شتی تر، ئەوانەی رەواجیان دەدا بەو داهێنانە نوێیانە، خۆیان نەدەپاراست لەوەی فەرموودەی خراپ و نەشیاو و نوێ دانەهێنن، لە کەس نەدەترسان کە بە ناوی پێغەمبەرەوە شتانێك بڵێن کە نەبووە، شتی وایان دەوت بە ناو و بە کردەوەی خەلیفە سەرەتاییەکان، کە ئەوان نەیانوتبوو و نەیانکردبوو، لەگەڵ رەوشتیشیاندا نەدەگونجا و بەوانی نەدەخوارد.

ئێمە ئەمڕۆ ناتوانین پشت بەم ماوەیەی دوایی ببەستین، بەبێ بەراوردکردن و رەخنەگرتن و بەدواداچوونی رووداوەکان.. شتی زۆر نووسراوە کە کاریگەری هەوا و هەوەس و ئارەزووی تیابووە، بە گوێرەی میزاج و کەسێتیی نووسەرەکە نووسراوە، بەڵام دەتوانین پشت ببەستین بەو رووداوانەی سەردەمی پێش خەلیفەی سێیەم، دەتوانین وێنە و نەخشەی ئیسلامی پاك و جێبەجێکردنی تەواویان لێوەرگرین.

ئەو سەردەمە گیانێکی هێندە پاك بووە کە پاڵی بە خەڵکی نیوەدوورگەوە نا، هەتا لە ماوەیەکی چاوەڕواننەکراوو ئەفسوناویدا، عێراق و ئێران و شام و میسر لە

فارس و رۆم بسەنن، فارسی ساسانی بە تەواوی لەناوبرا و مەدائینی پایتەخیان گیرا و یەزدگوردی دوا پاشایان کوژرا، شام و میسر تا مەغریب لە دەسەلاتی رۆم پاککرایەوە و هەتا ماوەیەکی دوور دوورخرایەوە.

ساسانی و رۆم سەدان ساڵ بوو حوکمی عێراق و شام و میسر و وڵاتی مەغریبیان دەکرد، بەڵام لە ماوەی (١٠) ساڵی ئەبوبەکر و عومەردا هەمووی رزگارکرا، سەربازانی ئیسلام بەو یەك دڵی و یەك ڕاو گیانە پاکەوە دەرچوون و دەکۆشان و ئاینە پاکەکەیان بە عێراق و ئێران و شام و باکووری ئەفریقادا بڵاوکردەوە.

دەبێ موسڵمانان وریابن، پێغەمبەری خۆیان خۆشبوێت، خۆشەویستیەکی وەهانا کە هەر لە یادی مەولوود و ئیسرا و میعراج و بەدرو ئەوانی تردا بیرمان بکەوێتەوە، یان لە کاتی کاردانەوەیەکی وەکو ئەوەی دکتۆر جەمال و رۆژنامەکانی دانیمارك و ئەڵمانیدا کە هەوڵی ناشیرینکردنی پێغەمبەر دەدەن.

واتە با کاردانەوەی کاتی و وەرزیمان نەبێت، کە لەلایەن چەند داخ لە دڵێکەوە بسەپێت بەسەرماندا، چاکترین بەرگرییەك لە پێغەمبەرمان، پابەندبوونە بە ئاین و پەیامەکەیەوە، ئەوەیە گوێڕایەڵیی خوا و جێبەجێکردنی فەرمانەکانی و سوننەتەکانی پێغەمبەر کە بۆی جێهێشتووین.

ئەم وتانەی دکتۆر جەمال تەنها خۆی پێ ناشیرین دەبێت، چونکە پێش ئەم نووسینەی، کەس ناخی دکتۆری نەناسیبوو، بایی چەندەو چی تێدایە بەرامبەر محەمەد، هەموو خەڵکی بەڕێزەوە دەیانڕوانیە بابەتەکانی، بەڵام ئێستا خەڵك قسەی بۆ دروست بووە لەسەر نووسراوە پێشوەکانیشی، لە نرخی خۆی و نووسینەکەی کەم دەبێتەوە، لەسەر لاپەڕەی چەند کتێب و ڕۆژنامەو گۆڤارو لە سەر مینبەرەکانەوە ناوی بە خراپە زڕاوە، دکتۆر چ سودێکی لەم بوختان و جنێوو تانە و تەشەرلێدانە لە پێغەمبەر دەستکەوت، یان بەپێچەوانەوە ئەم نووسینانەی دکتۆر جەمال دەبێ چی لە نرخی زانستیی و کەسێتیی ئەو زیاد بکات..؟ سەدان بیریاری ئەورووپی و ناموسڵمان بەرێزەوە باسیان لە محەمەد کردووە، بەڵام ئەگەر دکتۆر جەمال و هەزاران بیریاری ناموسڵمان و ڕۆژهەڵاتناسی ئەورووپی لەسەر

پێغەمبەر بنووسن و بیانەوێ ناشیرینی بکەن، چی لە پێغەمبەرو پەیڕەوانی کەمدەبێتەوە.؟ کە هەمیشە ئەو نوور و ڕووناکی دڵی موسڵمانان بووە و بەخشەری هێزو ورە و وزەو توانایە بۆ دڵی پەیڕەوانی.

## دەوڵەمەندترین سیرە،

## دیارترین کەسایەتی مێژوو

ژیاننامەی موحەممەد، پێغەمبەر ﷺ، بەهێزترین و مەزنترین کارە دوای قورئان، ئەگەر موسڵمانان بیخوێننەوە و لێی تێبگەن و بە گوێی بکەن و وەك ئەو بکەن، شارستانیەت لەسەر ئەو ژیاننامانە دروستدەبێت، قورئانیش ڕاسترین سەرچاوەیە کە بخوێنرێتەوە و لێی تێبگەن و بەگوێی بکەن، یان لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی لەسەر بکرێت، ئەوە دوای ئەوە پەروەردە دەکات و بەردەوام دەبێت هەتا ڕۆژی قیامەت، تا زەوی لە خولانەوەدا بێت، قورئان زۆر گەل و هۆز و وڵات و نیشتمانی بەختەوەر کرد، زۆر دەسەڵات و دەوڵەتی پایەدار کردو تاکە موعجیزەی پێغەمبەرە.

هەموو پێغەمبەران ئایەت و بانگەوازخواز و موژدەدەر و ترسێنەر بوون، بەڵام هەموو وەك یەك نەبوون لە گەیاندنی کارە خواییەکەیاندا کە لە ئەستۆیاندا بووە، یەعقوب و ئیسماعیل سیفەتی شایەتی هەقیان داوە، بەڵام ئیبراهیم و عیسا سیفەتی موژدەدەریان هەبوو، نوح و موسا و هود و شوعەیب سیفەتی ترسێنەرو ترساندنی ئەوانەی کە لە هەق و ڕاستی لایانداببوو بڕوایان پێی نەبوو، یوسف و یونس بانگەوازخوازی خەڵکی بوون بۆ لای خوا، بەڵام موحەممەد پێغەمبەر جیا لە هەموویان هەموو سیفەتەکانی ئەو پێغەمبەرانەی پێش خۆی هەبووە، شایەتی هەق و موژدەدەر و ترسێنەر و بانگەوازخواز بوو بۆ لای خوا، مانگی چواردەی ڕووناکیی بەخش بوو، ژیاننامەی پڕە لەو ڕەوشتە بەرزانە، هەموو سیفەتەکانی تیا کۆ بووە، شەریعەتێکی دەوڵەمەندو تۆکمە و کامڵی هێناوە، بە جۆرێك کە هەتا دونیا کۆتایی پێدێ هیچی ترت ناوێ، هەموو ڕەوشت و نەریتێکی جوانی تیایە، هاتووە هەتا دوا

پلەی رەوشتی جوان تەواو بکات، مێژوو شاهیدە کە بووەتە نموونەیەکی جوان و بەرز، واتە (سیرەیەکی مێژوویی هەیە) واتە سیرەیەکی ڕاستەقینەو واقیعی بووە، پشتی بە خەرافات و ئەفسانە نەبەستووە، هەمووی گێڕانەوە و بەلگەنامەی ڕاستییە، سروشتی مرۆڤ وایە، بڕوای بە کەسێك نییە مێژوو نەیناسیبێ و بنەچە و بنەماو رەگ و ڕیشەو بنەڕەتی نەبێ، سەر بە بنەماڵەیەکی ڕاست و دروست نەبێت، بنەمای ئەوانە زوو دەردەکەوێت، کە خەڵکی مێژوویان بۆ دادەتاشن و، سیرەو رەوشتیان بۆ دروستدەکەن، شیعریان پیا هەڵدەدەن و کەراماتیان بۆ دروست دەکەن و، کەسایەتیان بۆ دەتاشن و خەڵکی پێدەخەڵەتێنن، ڕەنگە ئەوانە بۆ ماوەیەکی کەم دەوام بکەن، بەڵام زۆر زوو دەردەکەون و دەکەونەبەر نەفرینی خەڵك و مێژوو، سیرەی تەواو دەبێ مێژوو بیسەلمێنێ و لێکۆڵەرەوان دەری بخەن و لە شایەنیاندا دەربچێ و شایەتی بۆ بدەن، ئەوسا دەبێتە هێزی سەلمێنراو، دەنا ئەفسانە هیچ دروست ناکات جگە خەو و خەیاڵ!.

پێغەمبەر هەیە هاتووە بۆ بنەماڵەیەك، یان لادێیەك، یان شار و ناوچە و گەل و وڵاتێك، هەموو گەلێك پێغەمبەری بە زمانی خۆی بۆ هاتووە، دەڵێن (١٢٤) یان (١٤٤) هەزار پێغەمبەر لەسەر زەویدا هەڵکەوتووە، ئێمە جگە لەوەی لە بارەی (٢٤) دانەیانەوە چەند لاپەڕەیەکی کەم دەزانین، ئەوانی تر نە ناویان دەزانین نە ناونیشانیان و نە کورتیلە چیرۆکێکی، تەنانەت ئەفسانە و خورافاتێکیش لە بارەیانەوە نەماوە، ئێمە ئەفسانەی زۆرمان لەبەردەستدایە لە رۆستەم و زۆراب و شیرین و فەرهاد و ئەلیازە و ئۆدیسە و کاوە و زوحاك و جەمشید و فەرەیدون و سام و حام، نازانین هی کەی و چ سەردەمانێکن و لە کوێ روویانداوە، هیچ زانایەکی ئەمریکا و ئەوروپا بڕوایان پێیان نییە، مێژووی ڕاست و بەلگەداری ئەوانە لەبەردەستدا نییە، چۆن دەتوانین زەردەشت بکەینە پێشەوا کە نازانین کێیە و لە کوێ بووە و ئایینەکەی چی بووە و چۆن خوای پەرستووە؟، یەك رستە نەماوە لە بنەماو رایەڵەکانی ئایینەکەی، هەرچی هەیە خەڵکیی لە گیرفانی خۆی بە خەیاڵ دەریدێنێ و وادەزانێ دەتوانێ شتێك بکات، ئێمە ئەمڕۆ یەك تاقە بەلگەنامەمان

لەبەردەستدا نییە لە بارەی (زەردەشت) و بنەماڵەکەی و ئایین و زمان و هۆز و عیبادات و بانگەواز و شوێنکەوتووانییەوە، کەس ناتوانێت دەربیخات زمان و رەگەزو ژیان و چۆنیەتی مردنیو گۆڕی لە کوێیە..؟، نەك ئێمە لەم دوورەوە، خەڵکی ورمێ و ئازەربایجانیش نازانن زەردەشت لەکوێدا ژیاوەو لە کوێدا جوڵاوەو لە کام شاخە بیری دەکردەوە و لە کام بنەماڵە ژنی هێناوە و منداڵەکانی و دایك و باوك و ژنی ناویان چی بووە؟، سەر بە کام هۆز بوون و کامەیە گۆڕی هیچکامیان، هەرچی نووسراوە هەموو هەڵبەستراوە و لە راستییەوە دوورە، هەزار ساڵە ئێران و خەڵکەکەی دەیانەوێ شتێك لە مێژوودا لە ئاسەوارەکاندا دەربارەی زەردەشت و (ئاوێستا)و ئایینەکەی بدۆزنەوەو بیکەنە بەڵگەو هەلا، جگە خەرافات و ئەفسانە و هەڵبەسراو هیچی تر نییە، ئەوەی کە هەیە لە بارەی زەردەشت و ئاوێستا و ئایینەکەیەوە، ئەوە ئێران و کوردو ئازەریی نەیاندۆزیوەتەوە، بەڵکو رۆژهەلاتناسە ئەورووپیی و رووسی و ئەمریکی بە خەیاڵ دروستیان کردووە بۆ یارمەتیدانی گەلانی ئێران و ناوچەکە، هەتا بە دوای ئایینە کۆنەکەیاندا بچن و واز لە ئایینی نوێیان بێنن، کە مەزنترین بەربەستە لە بەردەم هێرشی داگیرکاری خاچپەرستەکان و بڵاوبوونەوەیان، ئەوەی رۆژهەلاتناسان لەسەر زەردەشت نووسیویانە، دوای زیاتر لە دوو هەزار ساڵ بەسەر مردنی زەردەشتدا بووە، هیچ نیشانە و بەڵگەنامەیەکیان نییە بۆ ئەو دەیان بابەتەی کە لەسەر زەردەشت نووسیویانە، یان هەر ئەوەیە کە لە شانامە وەریانگرتووە، کە ئەویش و مەسعودیش دوای دوو هەزار ساڵ بەسەر مردنی (زەردەشت)دا ژیانی ئەویان نووسیوەتەوە وەك ئەفسانە نەك بە پشتبەسن بە شتێکی دۆزراوەو بەردەست، چونکە هەموو ئاسەوار و ئاوێستا و بەڵگەنامەکانی زەردەشت لە جەنگی ئێران و یۆناندا فەوتاون، ئەو کاتەی کە ئەسکەندەری مەکدۆنی ساڵی ( ٣٣٢ پ.ز هێرشی هێنایە سەر ئێران و پاشاکەیانی کوشت و وڵاتەکەیانی داگیرکرد، ئاگری بەردایە کۆشکەکانی پاشاکان لە شاری شیراز (ئەستەخر)، هەموو دەستنووس و ئاوێستا و کتێبەکانی سووتاندنو هیچیان نەما، واتە: (٢٣٠٠) ساڵ لەمەوبەر ئاوێستا و دەستنووسەکان و ئاسەوارەکان، کە سەدان

ساڵ بوو هەڵگیرابوو سووتا و فەوتا، دوای پێنج سەد ساڵ بەسەر ئەو رووداوەدا ئەردەشێری بابەکان ساڵی ( ٢٢٦)ز هەوڵیدا دووبارە ئاوێستا لە دەمی خەڵکی وەرگرێ و بینووسێتەوە و لەگەڵ سیاسەتی ساسانیدا بیگونجێنێ، بێگومان ئەوە ئەو ئاوێستایەی زەردەشت نەبوو، بەڵکو کۆکراوەیەکی دەماودەمی دوای هەزار ساڵ بوو بەسەر رووداوەکەدا، کە دیارە نووسین نەبووە وڵات داگیرکراوە، خەڵکی نەیوێراوە بە ئاشکرا بانگەشەی ئاوێستاو زەردەشتی بکات، هیچی وای نەماوە، پاشتر ئەردەشێر ئەوەی کە کۆی کردەوە لەگەڵ رەگەزی فارس و ئێراندا چواندی، هەرچی پەیوەندیی بە کوردو ئازەرەوە بووە لایبردووە، پاشان لەگەڵ سیاسەتی خۆی و دەوڵەتی ساسانییدا گونجاندویەتی و کردوویەتییە ئایینی دەوڵەت، پاشان ئەوەش لەشەڕی پێنجسەد ساڵەی فارس و رۆمدا فەوتا، پاشتریش کە ئیسلام هات و گەلانی ئێران موسڵمان بوون، ئەوەش کە لەو کتێبە دەستکردانە مابوویەوە، ئەوانیش فەوتان و هیچ نەمایەوە، کورد دەڵێ: زەردەشت ماد بووە و کورد بووە، ئازەریی دەڵێن نەخێر لەسەر خاکی ئازەربایجان ژیاوە و لە خۆمانە، فارسیش دەڵێ فارس بووە و کاری بۆ گەلانی ئێران کردووە، ئەفغانییەکانیش لە مێژوویاندا زەردەشتیان بە باکتەری ئەفغانی ناوزەد کردووە، هیندوکۆش و ئۆردوییەکانی پاکستانیش بە ئایینی کۆنی خۆیانیان تۆمار کردووە، بە هەر هەموشیانەوە ناتوانن پێنج لاپەڕەی بەبەڵگە لەسەر ژیان و ئایینی زەردەشت کۆبکەنەوە، جگە لە شتی دروستکراو.

بوزا کۆنترین ئایینە و یەك ملیار خەڵك بڕوایان پێیەتی، دەسەڵاتی بەسەر هیند و پاکستان و ئاسیای ناوەڕاست و ئەفغان و تورکستان و باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیاو یابان و چین و تبت دا هەیە، کە ئایینی براهما هات بوزی کزبوو، کە ئیسلام هات تەواو نەما جگە لە چەند جێگەیەك، هەتا ئێستا مێژوو ناتوانێ نرخی بۆ دابنێ، مێژوونووسێك ناتوانێت وێنەیەکی تەواومان بداتێ، نووسەرێك ناتوانێت وەسفی زروف و بارودۆخ و ژیانی بوزا بکات، کەی و لەکوێ لە دایك بووە، کۆنفۆشیوس لە بوزا کەمتر زانیاری لە بارەیەوە هەیە، جگە هەندێ خەیاڵ و

ئەفسانەی بێ بایەخ هیچی تر نییە، گەلانی سامیی هەزاران پێغەمبەریان بووە، کەس ناوو شوێن و ژیانیان نازانێ، ئێستە ئێمە چی لە بارەی نوح و ئیبراهیم و هود و سالّح و شیث و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و یونسەوە دەزانین کە دلّمان ئاو بدات...؟ هەر ئەوەندە دەزانین کە خوای گەورە لە قورئاندا بۆمانی گێڕاوەتەوە، ئەویش باس لە چەند رەفتارێکی نەشیاوی گەلەکەیان، یان وەلاّم و بانگەوازی پێغەمبەرەکەیان کە ئەویش زۆر کەمە، تەورات و ئینجیلیش هەندێ زانیاری کەم باس دەکەن، بەلاّم بە تێکدان و دەستێوەردان، بۆ نموونە عیسایان کردووە بە کوڕی خوا و مەریەمیش جۆرە خوایەك، ئیبراهیمی کوردیان کردووەتە جولەکە و گاور، دەقە ئایینییەکان تا ئاستی کوفر و زەندەقە تێکداوە، بە جۆرێك کە یەکی بەسەر دوویەوە نەماوە، لەبەر ئەوە کتێبەکانی جوو و فەلە جێی گومانی زانایان و لێکۆلّەرەوانە، خۆشیان بوونەتە پارچە پارچە و هەریەکەیان بە جۆرێك باسی پێغەمبەرەکەی خۆی دەکات، نووسەرانی دائیرەی مەعاریفی بەریتانی دەلّێن: دوای توێژینەوە دەرکەوتووە کە ئەو کتێبانەی دوای موسا بە چەند سەدە کۆکراونەتەوە، ئەوانە گێڕانەوەکانیان جۆراو جۆر و جیاواز و دژ بە یەکە، وەك زانایانی ئەلّمانی لێکۆلّینەوەیان تێدا کردووە، ژیانی عیسا لە ئینجیلدا نووسراوە، زۆربەی گاورەکان بڕوایان بە چوار ئینجیل هەیە، بڕوایان بە ئینجیلی (مندالّ) و ئینجیلی (بەرنابا) نییە، چونکە ئەوانە دەلّێن دوای عیسا پێغەمبەرێکی تر دێت، مێژوو نازانێ ئەم ئینجیلانە لە کێ وەرگیراون، تەنانەت گومانیان هەیە لەو چوار پیاوەی کە گوایە ئەوان کۆیان کردوونەتەوە، ئەگەر گومان لە کەسەکان هەبێ، ئەی چۆن گومان لە راستیی و ناوەڕۆکی ئینجیلەکان ناکرێت، نازانین بە چ زەمانێك نووسراون و کەی نووسراون، تەفسیرکردنی ئینجیلەکان زۆر سەیر و سەمەرەن، هەر کەسە و بەجۆرێك و هەر لێکدانەوەیەك بە شێوازێك چیرۆکەکان دەگێڕێتەوە، کە لەگەلّ یەك یەکناگرنەوە، زۆر دوورن لە یەکتر، جیاوازن لە باسی سەردەم و کۆکردنەوەکان و کەسەکان، هەیە دەلّێ سالّی (٦٠)ز کۆکراونەتەوە، هەیە دەلّێ سالّی (٢٠٠)ز کۆکراونەتەوە، رەخنەگرە ئەمریکییەکان بڕوایەکی دوور و غەریب و

سەیریان لە مەسیح و لە دایکبوون و وەفاتی و ئایین و تثلیث هەیە، رەخنـەگرێکی ئـەمریکی دەڵـێ: "تـەنانـەت بـوونی عیسا خۆیشـی گوماناوییـە و زۆر لـە ئەفسانە دەچێت، ئـەوەی بـاس دەکرێـت هـیچ نییـە جگـە لـە پاشمـاوەی بتپەرسـتی رۆم و یۆنان".

لە گۆڤاری (روبن کورت)دا چەند مانگێك بـەردەوام وتوێـژ و لێکۆڵینـەوە بـووە لەسەر راستی و ناڕاستی هەبوونی عیسا، ئەو گۆڤارە لەشاری شیکاگۆ لـە ئـەمریکا چاپ دەکرا، لەو باسەدا هەموو گەورە زانا و لێکۆڵەرەوان دەدوان، دەیـانگوت ئایـا عیسا هەبووە، یان هەر خـەیاڵی کۆنـەکان و گەلـە کۆنـەکان دروسـتیان کـردووە؟، گاورە جۆراوجۆرەکـان ئەوەنـدە ئەفسانە و خـەیاڵ و وتـەی ناجۆریـان لـە دەوری عیسـا کۆکردبوویـەوە، هـەموو کـەس گومـانی بـۆ دروسـت بوویـوو کـە ئەمـە جگـە چیرۆکێکی خەیاڵ ئامێز، هیچی تر نییە، کەسێکی وا پڕ لە گومـان چـۆن دەتـوانرێ بکرێتە قودوەو ئوسوەو پێشەوا و ڕێنیشاندەر، کە دڵ دامەزراو نییە لەسەر راسـتی ژیان و مردنی، پێشەوا دەبێ کەسایەتی روون بێت، ژیانی تا مردنی دیـار بێـت، لـە رووی مێژووییەوە بسەلمێ، لێڵی و گومان لەسەر ژیان و مردنی نـەبێت، لـە هـەموو مێژووەکاندا و لە چیرۆکی هەموو گەلاندا و لە مێژووی هەزار ساڵ لەمەوبەردا تـەنها ژیانی موحەممەد بە روون و ئاشکرا و بێ گومان و دوودڵیی و غەل و غەش دیـارە، کە خوا ناردبێتی ببێتە ڕچەو شوێنی بکەوین.

دەڵێن بوزا لە سەردەمێکی نـا مـەعلوم لـە دۆڵێکـی نـاو کێوەکـانی هیمالایـا لـە نیپاڵ لە ماڵی (ڕاجە) لە دایك بووە، کەسێکی زیرەك و وردەکار و هەسـتیار بـووە، کە گەورە بوو، ژنـی هێنـا و بـووە بـاوك، ئـیتر وڵاتـی جێهێشـت و چـووە ناوچـەی (بەهار)، لە دارسـتان و لادێکـان دەژیـا هـەتا گەیشـتە (کیـا) و لـە ژێـر درەختێکـدا رووناکیی هەق دەرکەوت و بانگی خەڵکی ئەو ناوچەیەی کـرد بـۆ لای باوەڕەکـەی، تەنها ئەوەندە زانیاریی لەسەر بوزا هەیە، ئیتر چۆن دەشێ بکرێتە پێشەواو، ژیانی

خۆت بدەیتە دەستی، کە نـەزانی چییە و چـۆن بـووە و لـە کـوێ بـووە و کامەیـە بیروباوەڕی؟!.

زەردەشتیش بە هەمان شێوە، هەموو ژیان و بەرنامە و شوێنی لە دایکبوون و پـەیام و قـەبری ونـە، دائیرەی مـەعاریفی بـەریتانی بـۆ سـەدەی بیستەم کـە بـە بڕواترین سەرچاوەیە دەڵێ: "ئەو زەردەشتەی کە لە چـەند بـەیتی شـیعری کـە لـە (گاتا)دا ناوی هاتووە و دەیناسین، ئەو زەردەشتە نییە کە لـە (ئاوێسـتا) نوێکـەدا دەیبینین، ئەو دوو سەرچاوەیە کەمێك لە یەك دەچن، ئـەوانی تـر دژی یـەکن، هـەر چۆن بێت ئەو ئەفسانەیەی کە باس لە ژیانی غەیبی دەکات، هەندێك لایـەنی ژیـانی لە گاتاوە هێناوە، بەڵام ژیانێکی ڕوونی زەردەشتمان ناداتێ، ڕێمـان نیشـان نـادات کە وەك کەسایەتییەکی مێژوویی بیناسین، بە هۆی ئەو ئالۆزییەی کە نووسراوە، لە دایك بوونی دیار نییە، ئەو شایەتیانەی کە باس دەکەن دژی یەکن، ئەو سەردەمەی زەردەشتی تێدا ژیاوە دیـار نییـە، مێژوونووسـە یۆنانیـەکان هـەر یەکـە بـە جۆرێـك باسی دەکەن، کە زۆر جیـاوازن لـە یـەك، تەنانـەت زانایـانی ئـەمڕۆش جیـاوازن لـە دیارییکردنی سەردەمەکەی، لـە کۆتاییـدا نووسـەری دائـیرەی مـەعاریفی بـەریتانی دەڵێ: (ئێمە هیچ نازانین لەسەر زەردەشت و بە تەواوی بێئاگاین).

بە کورتی دەڵێین زەردەشت لە دایك بووە لە ناوچـەی ئازەربایجـان و بانگـەوازی بڵاوکردووەتـەوە لـە بـەڵخ، هشتاسـپی پاشـای ئـەو ناوچـە بـڕوای پێهێنـا و لەسـەر دەستیدا چەند موعجیزەیەك ڕوویـدا، ژنـی هێنـا و منـداڵی بـوو، پاشـان مـرد، ئایـا ئەوەندە زانیاریی بەسە بۆ ئەوەی ئێمە دوای ئەم پیاوە ئەفسـان ئـامێزە بکـەوین، کە هیچ لە ئایین و سەردەم و ژیان و مردن و گۆڕی نازانین؟ دەکرێ بیکەینە چرای ڕێگەمان.

موسا پێغەمبەر لە هـەموو کـەس زیـاتر نـاوی هەیـە، پێـنج کتـێبی تـەورات هەیـە لەسەر ژیانی، (دوای لە دایك بوونی چووە کۆشکی فیرعەون و لەوێ گەورە بوو، کە بووە پیاو چەند جارێك گەلەکەی لە ستەمی فیرعەون ڕزگارکرد، پاشان هـەڵهات بـۆ

(مەدیەن)، لەویّ ژنی هێنا، ماوەیەك مایەوە و چەند ساڵ شوانیی كردو گەڕایەوە میسر، لە ڕێگەدا لە دەشتی سینا وەحی بۆ هات و خوا ناردی بۆ سەر گەلەكەی، فیرعەون ڕێی لێگرتن و خوا چەند ئایەت (بەڵگە)یەكی نیشاندا، پاشان شەوێك بە نهێنی گەلەكەی دەركرد، خوا دەریای بۆ شەق كردن، فیرعەون دوای كەوت و نوقمی دەریا بوو، موسا و گەلەكەی پەڕینەوە و چوونە شام و دژی بێباوەڕەكان جەنگان تا پیربوو و مرد [1]، گەر سەیری (سفر التثنية) سەفەری پێنجەم بكەین، لە ناوەڕۆكدا زۆر دژایەتیی یەكتری تیایە، لە سەفەری پێنجەمدا دەڵێ: "بەندەی خوا موسا بە ئەمری خوا لە خاكی موئاب مرد، كەس نازانێ گۆڕەكەی لە كوێیە، تەمەن ١٢٠ ساڵ بوو، دوای ئەو پێغەمبەر وەك موسا نەهات"، ئەمە دوایی بۆی زیادكراوە، لەو ئایەتانەدا ئەگەر ڕازی بین كە ئایەت بێت، خوا چۆن نازانێ گۆڕی موسا لە كوێیە؟، بەڵكو دوای موسا پێغەمبەری تر هات و جێی ئەوی گرتەوە، ئایا موسا ئەو (١٢٠) ساڵەی چۆن گوزەراند، بۆچی ئێمە شتێكی وای لە بارەوە نازانین؟، ناكرێت كەسێكی هەواڵ ونی ئاوا، بۆ ئەمڕۆ بكرێتە مەشخەڵ و چاوساغ و ڕزگاركەر كە ئێمە شتێكی ئەوتۆ لە بارەیەوە نەزانین.

نزیكترین پێغەمبەر لە سەردەمی ئیسلامەوە عیسایە، بە گوێرەی سەرژمێرییە ئەورووپییەكان ژمارەی گاور لە ژمارەی پەیڕەوانی هەموو ئایینەكانی تر زۆرترە لەسەر زەویدا، كەچی مرۆڤ سەرسام رادەمێنێ كە دەبینێ ژیان و حاڵ و ئەحواڵی عیسا ونە و ڕوون نییە، مێژوو و كات و سەردەم، پەردەیەكی داوە بەسەر ژیانی عیسادا و هیچی وامان لێ ئاشكرا نییە، لەگەڵ ئەوەی سەدان مێژوونووس و نووسەری مەزنی گاور هەیە، ئێمە كەمترین قەبارە لە ژیانی عیسا دەزانین، ئەوانە نەیانتوانیوە مێژوویەكی تەواو بێ كەم و كورتیی عیسامان بۆ بدۆزنەوە، ئێمە ئەمڕۆ چەند قاتی ژیانی عیسا، ژیانی ئەسكەندەری مەكدۆنی (٣٣٢ پ.ز) و كۆرش

---

[1] ـ (الرسالة المحمدية ـ السيد سليمان الندوي ـ ص٤٣ ـ ٦٤ مكتبة دار الفتح، ط١، ط٢ ـ ١٩٥٢- ١٩٦٣ دمشق، ترجمها من الاردية ـ محمد ناظم الندوي،

(٥٢٠ پ.ز) پاشای ئەخمینی و پاشاکانی رۆم و فارس دەزانین کە زۆر پێش ئەو بوون، لەگەڵ ئەوەی ئەورووپای گاور (٣٥٠) دەزگای خوێندنەوە و نووسینەوەی مێژوو و ئەفسانەیان هەیەو ئاسەوارەکان تاوتوێ دەکەن، زۆر باس و خواس و مێژووی ونیان دۆزیوەتەوە، لە مێژووی فیرعەونەکان و سۆمەر و ئور و بابل لە عێراق و شام و ئەفریقا و هیند و چین، بە دوای لێکۆڵینەوەوەن لەسەر ژیانی دروستبوونی گۆی زەوی و گیانداران و دار و درەخت، خەریکە پەی بە نهێنییەکانی ئاسمان و زەوی دەبەن، شتی هەزاران ساڵ لەمەوبەریان ساغکردۆتەوە، کەچی ناتوانن لاپەڕە ونەکانی عیسا پێغەمبەریان بدۆزنەوە و بیخەنە سەر (٣٣) لاپەڕە و بەردەستی گاورەکان و بڵێن ئا ئەمە مێژووی (٣٣) ساڵ ژیانی عیسایە..!!

زانای گاور (رِنیات) زۆر کۆشاو ماندوو بوو کە تەواوی ژیانی عیسا بنووسێتەوە، بەڵام شکستی هێنا، کاروبار و ژیان و هەڵسوکەوتی عیسا پێغەمبەر لە ناخی زەمانەدا بە نهێنی مایەوەو زمانی پێنەکرایەوە.

عیسا لەم دونیایەدا ٣٣ ساڵ ژیا، وەك ئینجیل باسی دەکا، ئەو ئینجیلانەی کە لە بەردەستدان، لەگەڵ ئەو هەموو دەستکاریی و دەستێوەردان و تێئاخنینەی تیاکراوە، تەنها ژیانی سێ ساڵی عیسایان بۆ باس دەکات، ئەویش لە کۆتایی ژیانیدا، ئێستا ئێمە و هەموو گاورانی سەر زەوی هیچ نازانین لە ژیانی عیسا، جگە لەوەی لەدایك بوو، هێنایان بۆ میسر، ئایەتەکانی خوای دی، پاشان لە خەڵك ونبوو، پاشان لە سیی ساڵییدا دەرکەوتەوە، دەستیکرد بە ئامۆژگاریی راوکەر و ماسیگرەکانی لێوارەکانی دەریای ناوەڕاست، هەندێ مێرگی بینی، چەند حەوارییەك دوای کەوتن و لەگەڵ جولەکەکان کۆبووەوە و هەندێك وتوێژیان کرد، دادوەرێکی رۆم بڕیاریدا لە خاچی بدات، دوای سێ رۆژ دەبینین گۆڕەکەی چۆڵ بووە و لاشەکەی تیانەماوە، ئەمە هەموو ژیانی عیسایە لای گاورەکان.. .

ئەی باشە ئەو سیی ساڵە، یان ئەو بیست و پێنج ساڵەی تری ژیانی عیسا چیی لێهات؟، بە چییەوە خەریك بوو؟. لەبەر ئەوە بۆشاییەکی گەورە لە ژیانی ئەودا

هەیە، گەر قورئان دوای شەشسەد ساڵ ئەو زانیاریانەی دەربارەی ژیانی لە دایك بوون و هەندێك شتی نەوتایە، ئێمە هەندێك نهێنی ئەومان هەر نەدەزانی، لەگەڵ ئەوەشدا کەسێك نییە شتێکی وا لە مێژووی ژیانی ئەو بزانێ، گاورەکان دوای سێ ساڵ ژیانی کەم و چەند ئایەتێکی کەم و هەندێك ئامۆژگاریی، پاشان دەڵێن هەڵواسرا و لە خاچ درا و ژیانی پێچرایەوە، مەرجی کەسێك ببێتە پێشەوا و رچەشکێن و سەرقافڵە و چاوی خەڵکیی، ژیانی ببێتە ئوسوەو رائید و هیدایەت، خەڵکیی لەسەر سوننەتی ئەو برۆن و لاسایی کردار و گوفتار و ژیان و حاڵ و ئەحواڵی ئەو بکەنەوە، دەبێ (کامڵ و تەواوو کۆ) بێت، ئەمە سێ سیفاتی کەسی هادی و رێنیشاندەرە کە پێشەوایەتی مەردم بکات بۆ دونیا و قیامەت، گەل و میللەت پێوستیان بە نموونەی لەو جۆرەیە کە ژیانی دیاربێ و رەنگا و رەنگ بێت، هەتا بیکەنە رچەشکێن و دوای بکەون و پەیامەکانی جێبەجێ بکەن و بارودۆخ و ژیانی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئابوورییان لە ئاوێنەکانی ئەوەوە وەربگرن، دین و دونیا و قیامەتی خۆیان بەوەوە ببەستنەوە، دەبێ ژیانی دیاربێ و هەڵسوکەوت و مامەڵەی روون بێ و بکرێتە ئاوێنەی ژیانیان، چونکە مرۆڤ پێویستی بە نموونەی بەرز هەیە هەتا چاوی لێبکەن و پێی هەستنەوەو وەکو ئەو بکەن لە ژیانی رۆژانەیاندا، هەتا پەیوەندیی نێوان تاکەکان و گەلان و هۆزان چاك و توندوتۆڵ بێت، دەبێ نموونە بێت لە خێزاندا، لە بازاڕ و ماڵ و مزگەوتدا، لە سیاسەت و کاروباری سیاسیی و سەربازیی و رێ و رچەی ژیاندا، ئەوەش لە هیچ سەردار و سەرکردە و پێغەمبەرێکدا نییە و مێژوو نەیهێناوە، جگە لە (موحەممەد)، کە لە دایکبوون و ژیانی منداڵیی و گەورەیی و ژنهێنان و ماڵ و حاڵ و وەحی و بانگەواز و خۆشیی و ناخۆشیی و ساتەکانی ژیان و مردنی روونە، لە هەموو چرکەیەکی ژیانیدا نموونە و قسە و کرداری هەیە و، بۆ هەناسەیەك پەکت ناکەوێ.. ئایین گوێڕایەڵی خەڵکە بۆ خالقی خۆی، بە هۆی ئایینەوە دەزانین ئێمە چین و بۆچی هاتووین و دەبێ چی بکەین؟، پێت دەڵێ چی پێویستە بیکەیت، یان یاساغە نەیکەیت؟، ئەوە مافی خوا و خەڵکە لەسەر یەکتر، ئەوانە هەموو لە ژیانی

موحەممەد پێغەمبەری ئیسلامدا هەیە، بە روون و ئاشکرا دیارە و خۆی لە جوانترین شێوەدا جێبەجێی کردووە، ئێمەش دەتوانین وەك ئەو بکەین، کەچی دکتور جەمال دێت وەسف و سەنای ئایینی فەلەو جو دەکاو ڕەخنە لە محەمەدو ئیسلام دەگرێت.

ئایینەکانی مێژوو دوو جۆرن، هەیە ناوی خوا و یادی خوا و خواپەرستی تیانییە، وەك بوزا و ئایینە چینیی و هیندیەکان، ئەرکی ئایینییان نییە، ئایینیش هەیە ناوی خوا هەیە و خوا دەناسن و بڕوایان پێیەتی، بەڵام لە ژیانی پێغەمبەرەکەیان، یان بانگخوازەکەیاندا نییە کە چۆن خوا بپەرستن، ئەوان بڕوایان بە خوا و مەرجەکانی قوربانیی و چەند حوکمێك هەیە، بەڵام خوا پەرستنیان نیە، یان چۆن موسا خوای خۆی خۆشویستووە و پەرستوویەتی، لە ژیاننامەی موسادا ئەوە نییە.

ئینجیلیش ئاوێنەی عیسایە، بەڵام لەم ئینجیلەدا کە ئەمڕۆ لە دونیادا بڵاوە دەڵێ: خوا باوکی عیسایە و عیساش خوایە، ئەم باوکە کوڕی خۆی خۆشدەوێ، مەریەمیش ژنی خوایە، بە هەرسێکیان واتە بە خوا و بە ژنەکەی و کوڕەکەیان، هەرسێکیان خوان، دوانیان لە کۆتاییدا دەمرن، ئەی سێیەم چیی لێدێ و کەی.. ئەمە روون نییە؟، واتە عیسا وێنەیەکی پاکی نییە لە ئینجیلدا، هەتا خەڵکی بیکاتە رچە و پێشەوا و بە گوێی بکەن، ئەگەر عیسا خوایە، ئەی بۆچی مرد؟؟ بۆ راویان ناو باوکی بەرگری لێنەکرد؟ ئەی بۆ دایکی کە ژنی خوایە مرد...؟ ئەوەی لە ئینجیلدا هەیە، تەنها ئاشتییەکی بێتام و سەرکزکردنە لەبەردەم ستەمدا، زانا رۆمەکان ئینجیلیان بە جۆرێك نووسییەوە کە خەڵکیی ملکەچ بکەن لەبەردەم ستەمی هەرقلەکانداو چاو لە ستەمی حاکمەکان بپۆشن، ئەوسا حکومەت ئەو ئایینە ملکەچەی کە خۆی دروستی کردبوو کردە ئایینی دەوڵەت و بەرگریی لێدەکرد، یەکەم پاشای گاور سێ سەدە و نیو دوای عیسا، (٣٠٠) قەشەی کۆکردەوە هەتا حوکم بەسەر کاری مەسیحدا بدەن، ئیتر کاری عیسا بە نهێنی مایەوە و هەتا رۆژی دواییش هەروا دەمێنێتەوە.

بوزاش لەو رۆژەی وازی لە ماڵ و منداڵ هێنا و کۆچی کرد بۆ کێوو دارستانەکانی نیپاڵ و هیمالایا، نەگەڕایەوە، تەنانەت ژن و تاقە منداڵەکەی و کەسوکاری نەبینییەوە، بە مردن رازی بوو، لە دونیا رزگاری بوو، کەسی وا هەڵهاتوو لە ماڵ و منداڵ و خەڵك، چۆن دەبێتە پێشەوا و مامۆستا و رچەشکێنی خەڵکیی و، مەردم بە گوێی بکەن و وەدوی بکەون، ئەو لە خەڵك و قەرباڵغی و کێشەی ژیان رایکرد، ئیتر خەڵکی لاسایی کوێی بکاتەوە، ئەی ئاین بۆ خەڵك و کۆمەڵگا و پێشکەوتنی کۆمەڵگا نییە.؟

ئێمە چی لە ژیانی موسا دەزانین جگە ئەو پێنج سیپارە دەستنوسە نووسراوە و شەرەکەی کە قورئان باسی دەکات، کامەیە کاری دونیا و ژیان و گرفتەکانی ژیان و داواکانی خوا و لە چی دوورکەونەوە و چی بکەن، لەگەڵ ئەوەی موسا ژن و منداڵ و کەسوکاری هەبووە، ژیان و رەچەڵەك و پەیوەندییان کامە بووە، خۆ ئێمە ئەمرۆ دوای هەزارو چوارسەد ساڵ ناوی دەیان پشت و رەچەڵەکی موحەممەد دەزانین، ژنەکان و کوڕ و کچەکان و زاواکان و نەوەکەی دەناسین، وەك چۆن کوڕ و کچ و باوك و دایکی خۆمان دەناسین، من لەم رۆژی زانست و پێشکەوتنەدا تەنها چوار پشتی دایکم و پێنج پشتی باوکم دەزانم، تۆش هەروا، بەلاَم بیست و پێنج پشتی پێغەمبەرم لەم کتێبەدا نووسیوەو هەتا سەردەمی ئیسماعیل و ئیبراهیم دەقی قورئانی و سەرچاوەی ترم لەبەردەست دایە، دەزانین محەممەد چۆن خەوتووە و چۆن خواردوویەتی و خۆی شتووە و خۆی گۆڕیوە و گریاوەو پێکەنیوە، خۆ موساش دایکی بووە، وەك ئینجیل باسی دەکات، براو خوشك و کەسوکاری بووە، بەلاَم مامەڵە و چیرۆکی ژیانیان دیار نییە، لەو چیرۆکانەدا موسا هەمیشە شکاوە و رایکردوەو دادگایی کراوەو گەلەکەی بە گوێیان نەکردوەو گیری بە دەستیانەوە خواردبوو، ئەمە نابێتە نموونە بۆ خەڵك، عیسا ژنی نەهێناوە هەتا دواکەوتووانی بزانن چی بکەن لەگەڵ ژن و منداڵیاندا، دونیا پڕە لە ژن و مێردایەتیی و منداڵ و کەسوکارو هاورێ، ئەم پەیوەندیانە چۆن رێکدەخرێت، گەر خەڵکی وەك عیساو بوزا بکەن، دەبێ لە ماڵ دەرچن و خۆیان بشارنەوە لە

دارستان و تەرکی دونیا بکەن و جێیبهێڵن بۆ خراپکاران، عیساو بوزا بۆ زەمەنێکی دیاریکراو هاتوون، دوای خۆیان ئاین و ژیانیان تەواو شێوێنرا. !

ئەو ژیانە میسالیانە نابنە رچە بۆ خەڵك، دینداریی وا ناکرێت، بەلام کەسێك بۆچوون و فەلسەفەیەکی هەیە وەك سوقرات و ئەفلاتون و ئەرستۆ، پێشکەشی دەکەن، خەڵکی پێی سەرسامن، بەلام سوقرات ناڵێ بە گوێم بکەن و دوام بکەون، دەڵێ ئەمە قسەی منە، دەیخوێنن یان نایخوێنن، بڕوات پێیەتی یان نا، لەسەرت ناکەوێ و من هیچم لە تۆ ناوێ و ئارەزووتە، بەلام ئاین و قسەکردن بە ناوی خواوە وا نییە، ئەرك و واجبات و لێپرسینەوەی هەیە، مێژوو چاکترین شاهیدە کە لە دونیای ئەمڕۆدا کەس نییە ببێتە ئوسوە و پێشەوا، جگە موحەممەد، ئەوەی کە دەبێ بکرێتە نموونە بۆ ژیان دەبێ چوار لایەنی تێدابێت:

* کەسێکی مێژوویی بێت، مێژوو شایەتی بێت و بیناسێنێ و تەواوی ژیانی دەربخات.

* ژیانی گشتگیرو کۆ و دیار بێت، چواردەوری هەموو ژیانی دابێت.

* زنجیرەی ژیانی ئاشکراو بێ گرێ و گۆڵ بێت، هەر لە لەدایك بوون و رەچەڵەکی، هەتا مردن و کارو کردەوەکانی ڕون بێت و شاراوەو ئاڵۆزی نەبێت.

* خۆی کردبێتە کار، واتە بەرنامەی لە ژیانی خۆیدا بە ئاسانی جێبەجێ کردبێت و پراکتیزەی ئەوەی کردبێت کە وتوویەتی و بانگەشەی بۆ کردوو.

## شوێنی سیرەی پێغەمبەر لە مێژوودا

پێشووەکان نکوڵییان نەکرد لە کۆکردنەوە و پاراستن و نووسینەوەی قورئان و فەرموودە و سیرە و مێژووی ئیسلام، هەر لە خەلیفەکانی راشیدین و والی هەرێمەکان، هەتا زاناکان و پێشەوایانی تابیعی، خۆیان بەلێپرسراو زانیووە بۆ تەواوکردنی ئەوەی لە ئەستۆیاندایە، کۆشك و ماڵ و مزگەوتەکانیان کردە شوێنی کۆبوونەوەی زانایان و قسەکردن لەسەر ئەو کارە، لە مزگەوتەکاندا ژوور و حوجرەی تایبەت هەبوو بۆ کۆبوونەوەی زانستی و وانەوتنەوە لەسەر قورئان و فەرموودە و سیرە و مێژووی ئیسلام، عاصم کوڕی عومەر سالی (١٢١) ك مرد،

کوڕەزای قەتادەی سەحابی بوو، بە داواو فەرمانی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز وانەی دەوتەوە لە مزگەوتی دیمەشق.

بەو جۆرە هەزاران بەرگ، بە زۆر زمانی جیهانی، لەسەر هەموو بوارەکان، بەتایبەت فەرموودە و سیرە نووسرا، ئەویش لەبەر گرنگیی باسەکە و خۆشەویستی پێغەمبەری خواو، وەك کارێکی چاك بۆ زەخیرەی قیامەتیان، تەنانەت ئەوانەش کە بڕوایان بە پێغەمبەر نەبوو ژیانیان دەنووسییەوە و وەسف و سەنایان دەکرد، هەر لە ئەورووپی و گاور و ئەمریکی و رووسی و هیندی و بوزی و سیخ و عەرەب و فارس.

گۆڤاری (المقیس) کە لە دیمەشق دەردەچوو، سەدو پەنجا ساڵ لەمەوبەر سەر ژمێرییەکی کردبوو بۆ ئەو سیرانەی کە لەو کاتەدا دەرچوویوون بە ئینگلیزی و بە هەموو زمانەکانی جیهان، سەر ژماردەی (١٣٠٠) کتێبیان کردبوو کە لەسەر ژیانی پێغەمبەر نووسرابوو، هەتا ساڵی (١٩٥٠ز) یەك هەزار کتێبی سیرە تەنها بە زمانی ئوردی نووسرابوو.

(مرجولیوث) مامۆستای زمانی عەرەبی لە زانکۆی ئۆکسفۆرد ساڵی (١٩٠٥) کتێبێکی بە ناوی (موحەممەد) دەرکرد، کردی بەبەشێك لە زنجیرەی کتێبەکەی بەناوی (عظماء الأمم)، لەوێدا وەسف و سەنای پێغەمبەری ئیسلام ناکات، کتێب نییە هێندەی ئەو کتێبە هێرش و رەخنەی بەرامبەر موحەممەد تیابێت، (مرجولیوث) دەیویست هەموو گومانێك و خراپەیەك لەسەر ژیانی موحەممەد بلێت، گومانی لە سەنەدو راوییەکاندا دروستکردوە، هەموو باسەکانی مێژووی ئیسلامیی تێك و گوماناوی کردوە، بەرپەرچی توێژەرەوەکانی داوەتەوە، بەلام لەگەڵ ئەوەدا لە پێشەکییەکەدا دەڵێ: (ئەوانەی لەسەر ژیاننامەی موحەممەد دەنووسن دەیانەوێت شەرەفی ئەو مەجلیس و کۆڕە بۆ خۆیان وەربگرن کە لە بارەی موحەممەدەوە شتیان نووسیووە).

(جون دیون بورث) ساڵی (١٨٧٠ز) کتێبێکی بە ئینگلیزی لەسەر سیرەی پێغەمبەر نووسی بە ناوی (پەشیمانبوونەوەیەك لە موحەممەد و قورئانەوە)، کە

یەکێك ئەم کتێبە دەخوێنێتەوە وادەزانێ بە دڵسۆزیی و ئینسافەوە نووسـراوە، لـە پێشەکی کتێبەکـەدا دەڵـێ: (بێگومـان لـە نـاو رزگارکـەر و شـەرعدانەرو داهێنـانی سوننەتی چاکدا، هیچ کەس نییە هێندەی پێغەمبـەر موحەممـەد ژیـان و کاروبـار و هەڵسوکەوتی بەو فراوانیی و درێژیی و وردەکاریانەوە بە تەواوی دیاربێت).

(ریورند باسووس) ئەنـدامی کۆلێـژی سـێ یەگانـە (تثلیـث) لـە ئۆکسـفۆرد سـاڵی (١٨٧٤ز) وانەیەکی لەسـەر ژیـانی (موحەممـەد و موحەممەدییـەکان) لـە کۆمەڵـەی مەلەکی بەریتانی مەزن وتەوە، پاشان ئەو وتارەی چاپکراو کرا بە کتێب، لە یەکێك لەو وانانەدا دەڵێ: (هەرچـی لـە بـارەی ئایینـەوە دەوتـرێ پڕاوپـڕە لـە نـەفامیی و نەزانیی، بەداخەوە ئەوە لەسەر هەر سێ ئایینەکە ئەگونجێ (بوزی و کۆنفۆشـیوس و زەردەشتی)، خاوەنی ئەو ئایینانە بە پیاوە مێژووییە ئەفسانەییەکان دەناسرێن، چونکە هیچ نازانین لە کارو کردەوە و وەسـف و سـەنایان، زۆر کـەم لـە بانگـەوازو بنـەمای کاریـان دەزانـین، ئەوەنـدەی دەزانـین لەسـەر ژیـانی زەردەشـت و کۆنفۆشیوس زۆر کەمترە لـەوەی کـە لـە بـارەی (صـولون و سـوقراتەوە) دەزانـین، ئەوەی کە لەسەر ژیانی (موسا و بوزا) دەزانین زۆر کەمترە لەوەی.کە لەسەر ژیانی (ئەمبرس و قەیسەری ڕۆم) دەزانین، لە بارەی ژیانی عیسـاوە جگـە شـتێکی کـەم، هیچ نازانین، کێ دەتوانێ پـەردە لادا لەسـەر ئـەو ٣٠ سـیی سـاڵەی کـە سـەرەتا و پێشەکی بوون بۆ ٣ سێ سـاڵەکەی دوایـی تەمـەنی عیسـا، کـە شـتێکی کـەمی لـێ دەزانـین، ئـەو سـێیەکی جیهـانی ورپاکردووەتـەوە کـە خـەواڵوو لـە قەبرسـتاندا نووستبوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەی سەردەمەکەی زۆر لێمان نزیکە، کەچی زۆر کـەمی لەبارەوە دەزانین، زۆربەی لاپەڕەکانی ژیانی ونەو هیچ نازانین، ئـەی چـی دەزانـین لە ژیانی دایکی عیسا، ژیانی لە ماڵەوە لە ناو خێزانی و هاوڕێکانی و حەوارییەکان، چۆن مامەڵەی لەگـەڵ دەکـردن و پەیامـە ڕۆحانیەکـەی دەرکـەوت..؟ خـەڵك چـۆن راچەنین بە بانگەوازەکەی، چەندان و چەندانی تر لە پرسیار گەلێك کە لە ناخمانـدا دەژی و دەمانجولێنێ، کەسـێك نییـە وەڵامـان بداتـەوە هـەتا ڕۆژی دوایـی، بـەڵام ئیسلام هەموو سەرو بەندی دیارە، هـیچ نهێنییـەك و ئاڵۆزییـەك و شـاراوەییەك لـە

مێژوویدا نییە، مێژووی دوور و درێژی بە ئاشکرا لە بەردەم هەموو خەڵکدا هەیە، موسڵمانان هەموو شت لە بارەی پێغەمبەرەکەیانەوە دەزانن، زۆرتر لەوەی لە بارەی (لۆسەر و ملتن) و خەڵکی ترەوە دەزانن، هیچ کەس نیە لە سەر زەوی هێندەی محمد ژیانی دەوڵەمەند بێت، هیچ ئەفسانە و خەیاڵ ئامێزو ناجۆرییەك لە ژیانیدا نییە، هەموو کاروباری محەمەد روونە، وەك رۆژی رووناك، وەك چۆن لە ژێر تیشکی خۆردا هەموو شت دەبینی. ژیانی پێغەمبەر هەزاران بەرگی لەسەر نووسراوە، یەکەم کتێب لەسەر فەرموودە لای ئێمە کتێبی موەتەئی ئیمام مالیکی کوڕی ئەنەس بوو، ئەم کتێبەی بە (٦٠٠) قوتابی خۆی دەوتەوە، کە لە ناویاندا خەلیفە و والی و زانا و فەقیە و ئەدیب و زاهید هەبوون.

(جامع الصحیح)ی ئەبی عەبدوڵلای بوخاری، کاتی خۆی (٦٠) هەزار کەس لە ئەهلی زانست و قوتابی وانەیان لێوەردەگرت، یەکێك لەوانە (ئیمامی فریەری) بوو، ئێمە دەپرسین ئایا شایەن هەیە لەسەر زەوی کە هێندەی ئیسلام زاناکان و سەحابەکانی ئەو وردەکارییەیان لە کۆکردنەوەی سونەو سیرەدا کردبێ و ئەو گرنگییەیان بە قورئان و سوننەت و ژیانی پێغەمبەر و لێکدانەوەی شایەن دابێ؟ ئەوەندە راستییان کۆکردبێتەوە..؟ راستی مێژوویی و زانستی، کەس هەیە هێندەی پەیڕەوانی ئیسلام ئەوەندەیان لە وتەی پێغەمبەرەکەیان لەبەر بووبێت؟ ئەوەندەیان لە ژیاننامەی پێغەمبەرەکەیان پاراستبێ؟، کەس نییە ژیانی کامیل و بێ هەڵە و بێ عەیب وەك ژیاننامەی موحەممەد، کەسایەتی مێژوویی هەیە کە دەیان عەیب و هەڵە و ستەم و دڵڕەقیی لەگەڵ خۆی و کەسوکار و خێزان و دەوربەردا کردووە، سەیرکە سیاسییەکانی ئەمڕۆ چەندە هەڵە و کەم و کورتیی و ستەم و دنیاخۆریی و شتی تریان هەیە، نازانی لە ناو خێزانیان و سامانیان و پەیوەندییە نهێنییەکانیان چی دەگوزەرێ؟، بەڵام موحەممەد ژیانی ماڵ و دەری، نهێنی و ئاشکرای روونە و لەسەر لاپەڕەکان نووسراوە، شەوو رۆژ، ماڵ و مزگەوتی بەدەرەوەیە، هیچ نهێنییەکی ژیانی نییە لاپەڕەکان دەریان نەخستبێ، هەر سوننەت وابووە موسڵمانان بزانن مامەڵەکانی پێغەمبەرەکەیان چۆن بووە بۆ

ئەوەی وا بکەن، هەر لە لە دایك بوونیەوە تا مردنی لای خەڵکی سەردەمی خۆی و خەڵکی شار و لادێ و دۆست و دوژمن و نووسەران و مێژوونووسان تۆمارکراوە، هەر بۆ نموونە کێ لە هەموو پەیوەندییە نهێنی و سیاسییەکانی ناومالّی سەرکردەکانی ئەمڕۆی کورد دەزانێ، کە راگەیاندنیش چەند بەربلاوە، دەیان پرۆتۆکۆلی نهێنییان هەیە لە بازرگانیی و سیخوڕیی و ئەمنیی، دەیان کێشەی خێزانیی و بنەماڵەییان هەیە و شەو و رۆژ ستەم لە ژێردەستە و میللەتەکەیان دەکەن و خۆیان بە تاوانباریش نازانن، رۆژانە چەندین هەواڵ و سەردان و ئەملاولایان دەبینین، بەلام نازانین لە راستیدا چی لە ژێر پەردەیاندا هەیە و چیمان بۆ دەچنن؟، ئاشکرا زۆر جیایە لە نهێنیان، نازانین حەزیان لە چییە و رقیان لە چییە و لە ناو مالّ و خێزانیاندا چۆن رەفتار دەکەن؟ بەلام موحەممەد خۆی دەڵێ کە منداڵ و لاو بووم شوان بووم، نەدار بووم، خوا دەفەرمووێ ئەو هەژار و هەتیو بوو، ئەی کێ دەوێرێ بەم سەرکردانە بڵێ تۆ شوان و هەژار و هەتیو بوویت؟ بەلام بۆ موحەممەد ئەوانە جێی شانازیی بوون، کە محمد لای ئەبو تالیبی مامی بوو، دەیبینی مامی کڵفەتی زۆرە و بێ پارەیە، وتی: دەبمە شوانی شار هەتا یارمەتییت بدەم، پاش ماوەیەك کە زانی شوانییەکە داهاتی باش نییە، وتی با بچمە لای خەدیجە و بازرگانیی شامی بۆ بکەم، کە ژنی هێنا داوای لە مامی کرد کە عەلی بداتێ هەتا بۆی بەخێو بکات و ئەرکی سووکتر بکات، چونکە ئەو بە ژیاندا رانەدەگەیشت، دەزانین باوك و دایك و باپیر و مام و ئامۆزا و زاوا و کچ و کوری ناویان چی بووە، هەژاری و دەوڵەمەندی و گرفت و جەنگەکانیان و بیروڕایان دەزانین.

ئەوا (١٤٢٠) ساڵ بەسەر وەفاتی موحەممەددا تێپەڕیوە، ئێستاش ئێمە هەموو زانیاریەك لە وردو درشتی ژیانی موحەممەد و کەسوکاری دەزانین، بازرگانیی، ژنهێنانی، ئەشکەوتی حەڕا و سەور، بانگەوازی، بەرەنگاری و دەرکردنی لەلایەن خەڵکی تائیفەوە، کۆچکردنی، شەورەوی بۆ ئاسمان، غەزا و جەنگەکانی، مێژوو هیچی ون نەکردووە، رەنگە یەکێك بڵێ بۆچی هەڵگرانی فەرموودە هەموو

فـەرموودەی لاواز و بـەهێزەکانیان لەبـەر کـردووە، هـەر بـەهێز و راسـتەکانیان لەبەرکردایە و لاوازەکانیان لابردایە، گـەر وایـان بکردایـە رەنگـە هەنـدێك بیانوتایـە هەندێ لایەنی ژیانی دیار نییە، وەك ئەمڕۆ بە مەسیح و زەردەشت و کـاوە دەڵـێن، خاوەنـانی فـەرموودە هـەموویان بـۆ پاراسـتووین، بـەڵام بنـەما و رێسـا و یاسـا و شایەنێکیان بۆ دانـاوە دەیکێشـی و جیایدەکەیتـەوە، لـە سـیرەدا هـەموو شـت لـە بـارەی پێغەمبـەرەوە هەیـە، دانیشـتنی هەڵسـانی خـەوی پێکـەنینی بـزە و خواپەرستیی و خواردنی، خۆشۆردنی خواردنەوەی، جـل و بـەرگ لەبـەرکردن و چ رەنگێکی پێخۆشبوە؟، چ بۆنێکی حەز لێبوە؟، شێوەی لاشەی بە جۆرێك وەسـف دەکەن وەك ئەوەی ببیینی، کـۆنترین کتێـب لـەو بـارەوە (الشـمائل)ی تورموزییـە، باسی هەموو شتێکی پێغەمبەر دەکا، ئەم کتێبە کراوە بە چەند بەشەوە و بۆ هـەر شتە بەشێکی داناوە، موستیلەی پەنجەی قژی چی لەبەردەکا و چی لـەپێ دەکـات و چۆن دەڕوات؟، لاوێتی و تێکەیشتنی و چۆن کل دەکات؟، لەبەرکردن، داکەندن، لـەپێکردن، مۆرەکـەی، وتـار خوێنـدنی، تەعزیـەی، سـەردانی نەخۆشـی، ئـادابی مەجلیس، نەعلەکانی، وەسفی شمشێرەکەی، قەڵغانی، عەمامە و سەر شانەکردن و رۆیشـتن و دانیشـتن و راخـەری، پاڵدانـەوەی، شـێوەی خـواردنی، نینـۆککردنی، دەستنوێژ گرتنی و کارەکـانی پـێش خـواردن و دوای خـواردن و پـاك و خـاوێنی و سواربوونی وڵاخ و پەرداخەکەی و چۆن دەخواتەوە و چۆن بـۆن لـە خـۆی دەدات، چۆن قسە دەکـات، شـیعر خوێنـدنی، چـیرۆك و قسـەی خۆشـکردنی، نوێـژی دوای خۆرکەوتنی، لە ماڵدا چی دەکات، رۆژووی، قورئان خوێندنی و گریان و خشوعی و جێی خـەوی و تـەوازوع و قەناعـەت و رەوشـتی، ناوەکـانی و نازناوەکـانی و چـۆن دەچـووە لای ژنـەکانی و تەمـەنی و وەفـاتی و چـی لـێ بـەجێماوەو وەسـیەتی و کەلەشاخگرتنی.

ئەمە لە باس و خواسەکانی پەیوەند بە کەسایەتیی ئەوەوە، بـۆ هـەموو شـتێك فەرموودەی تایبەتی هەیە، لەسەر هەموو قۆناغەکانی ژیانی شتی هەیە، نووسـەران هیچ نەماوە باسی نەکەن و بە شاراوەیی مابێتەوە، لە مـاڵ، لـە نـاو ژن و منـداڵ و

کەسوکار و هاوڕێکانی، پەیوەندیی لەگەڵ خوا و لەگەڵ وەحی و لەگەڵ جوبرەئیل، هەمووی نووسراوە، تەنانەت لەگەڵ خۆی و لە ناخی خۆیدا و هەناسە و بزە و گریان و فرمێسك و شێوەی نووستن و هەڵسان و تورەبوون و رەنگی چاو و پێست و قژی باس کراوە، پیاو لە دەرەوە کەسایەتی و شەهامەتی و پیاوەتی دەردەکەوێ و خۆی دەنوێنێ، کە چووە ماڵ، وەك هەر پیاوێکی تر ماڵیی دەبێتەوە و بە ئاسایی و ساکاریی دەژی.

(فۆڵتێر) دەڵێ: "مرۆڤ هەرگیز لە ناو ماڵی خۆیدا مەزن نییە و لە ماڵەوە پاڵەوانیی دەرناکەوێ، واتە دانیپیانانی خزمان بە کەسێکدا نایکاتە پاڵەوان، ئەوان خۆی و کەسێتی و زۆر لە رەوشت و ناخ و عەیب و عاری دەناسن و دەبینن، بەلام ئەوە موحەممەد ناگرێتەوە، ئەو لە ناخ و دەروونی خۆیدا و لە ماڵ و لە دەر هەر گەورە و مەزن بوو".

(باسورث سمیث) دەڵێ: "ئەوەی کە دەیڵێن لە بارەی مەزنەکانەوە، ئەوە باسی دەرەوەیە، بەلام مرۆڤ هەمیشە لە ماڵەوە بە کەم و کورت دەبینرێن و ئەوە نین کە لە دەرەوە دیارن، بەلام ئەو وتەیە موحەممەد ناگرێتەوە و بۆ ئەو راست دەرناچێت"، واتە: ئەو لە ماڵیشەوە هەر بەرێز و مەزن و خاوەن کەسایەتیی بووە، پاشان قسەی (کبن) دەهێنێتەوە کە دەڵێ: "هیچ پێغەمبەرێك وەك موحەممەد هاوڕێکانی خۆی تاقی نەکردەوە، ئەو پێش ئەوەی بێتە ناو خەڵك، چووە ناو ئەوانەی کە بە تەواوی ناسیوویانە، داوای لە ژنەکەی (خەدیجە)و خزمەتکارەکەی (زەید) و برازاکەی (عەلی) و نزیکترین هاوڕێی (ئەبوبەکر) کرد کە بڕوای پێبێنن کە بووەتە پێغەمبەر، هەر هەموویان بێ سێ و دوو و لێکدانەوە بڕوایان پێهێنا، هەموویان بانگەوازەکەیان بەراست گرت، ژنی کەسێك لە هەموو کەس زیاتر ناخ و دەرونی مێردەکەی دەناسێ و وردەکارییەکانی دەزانێ، لە هەموو کەس زیاتر پەیوەیستە پێوەی و لە پاڵیدا بووە، کەس نییە هێندەی ئەو بیناسێ، کەچی ئەو کەسەی کە یەکەم جار باوەڕی پێهێنا (خەدیجە)ی ژنی بوو، کە پانزە ساڵ لەوەو پێش ژنی بوو، زانیاریی ناخ و دەرەوەی هەبوو، کە وتی من بوومەتە پێغەمبەر

یەکەم کەس بوو کە باوەڕی پێهێناو وتی ڕاست دەکەیت، مەزنترین کەس، بەتایبەت گەر یەك ژنی هەبێ، ڕازی نابێت هەرچی بووە لە نێوان ژن و پیاودا باسی بکات، بەڵام پێغەمبەری خوا لە یەککاتدا نۆ ژنی هەبووە، هەر یەکەیان لە ئاستی بەگوێکردن و پرس و ڕای پێغەمبەردا بوون، هەرچیان دیوە و کردووە بۆ خەڵکیان گێڕاوەتەوە، وەك سوننەت، بەتایبەت لە کاروباری ژن و مێردییدا، ئەوان بە حەڵاڵ و چاکەیان دەزانی کە هەرچیان لە تاریکی شەودا دیووە، لە ڕووناکی ڕۆژدا بیگێڕنەوە، لە مەیدان و مزگەوت و بازاڕدا بۆ موسڵمانان، ئایا دونیا کەسێکی تری لەوە مەزنتر ناسیووە باوەڕی بە خۆی هەبێ کە هەتا ئەو ئاستە نۆ ژن هەموو باس و خواسێکی ناوماڵ و حاڵی بگێڕنەوە، هەتا ئەو ئاستەش پشتی پێیان ببەستێ، نەترسێ لەوەی کە بوختانێك، یان وتی وتییەك و خراپە و سەریەشەیەکی لابەلای بۆ دروست ببێ، ئەو دوورترین کەس بووە لە خراپەوە، ئەمە کە پەیوەندی بە زاتی پێغەمبەرەوە هەبوو، لە ڕەوشت جوانیی و زەین ڕوونی و بیری چاك و دەروونی پاك و نرخ بەرزیی و سنگفراوانی، کتێبی فەرموودەکانی پڕن لەوانە، چاکترین کێب بۆ ئەم باسانە (الشفا)ی قازی عیازی ئەندەلوسیە، ڕۆژهەڵاتناسێکی فەرەنسی بە ناوی (ماسنیون) دەڵێ: " ئەو کتێبە بەسە کە ڕەوشت جوانیی پێغەمبەر بە ئەوروپا بناسێنێ، ئەگەر کتێبی (الشفا)ی قازی عیاز وەربگێڕینە سەر یەکێك لە زمانە ئەوروپییەکان هیچمان ناوێ".

حافیزی ئیبن قیەم لە کتێبی (زادولمەعاد) باس لە سەد ڕەوشتی پێغەمبەر دەکات، هەرچی لە بارەی پێغەمبەرەوە هەیە هێناویەتی، لە هەموو چالاکیی و جموجووڵ و خەوو نووستن و هەڵسوکەوت و نامەناردن و نیکاح و معاشەرەو سەرئاوو دوعاو خەتەنەو ناونانی خەڵك و نوێژوو ڕۆژوو و زەکات و حەج و .... زۆر شتی تر.

موسڵمانانان ئەو وردەکارییانەیان کۆکردووەتەوە و نووسیووە و لەبەرکردووە، زانایانی گێڕانەوە و لێکدانەوەی شەریعەتیش سوننەتی زۆریان کۆکردووەتەوە، هیچ پێغەمبەرو کەسایەتیەك نیە بەم ڕۆژگارەشەوە ئاوا هەواڵ و دەنگوباسی

بزانرێ، لێرەدا کات و ماوە نییە ئەو هەموو خاڵانە تۆماربکرێ، پێغەمبەر مۆڵەتی دابوو و داوای لەوانە کردبوو کە لەمەجلیسیدا دانیشتوون، هەرچیان بیستووە و دیووە، بیگێڕنەوە بۆ ئەوانەی لێرەنین، ئەوانیش بە جوانترین شێوەو ناسکترین شێوازو بەرێزەوە و وەکو خۆی سپاردەکەیان راگەیاندوە، نووسەرانی فەرموودە دەڵێن: حەفتا کەس هەبوون لەسەحابە هیچ کاریان نەبوو جگە هاوڕێیەتی پێغەمبەر و لەبەرکردن و گێڕانەوەی کردار و گوفتارەکانی ئەو، وەك (ئەبوهورەیرە) کە شەو و رۆژ لێی جوێ نەدەبووەوەو لێی ورد دەبوویەوە، تەشبیهات نەبێت وەك شۆفاری حکومەتێك هەمیشە چاودێریی کارو کردەوەو گوفتارەکانی دەکرد، ساتێك چاوی لێکەلا نەدەکرد، ئەو حەفتا کەسە ئەوەندەی کە خوا پێیدابوون لە چاوی روون و دڵی پاك و دەروونی چاك و مێشکی کراوە، بەکاریان دەهێنا بۆ چاودێریی کارو کردەوەو لەبەرکردنی وتەی، دە ساڵ بەردەوام بەدوایەوە بوون لەشارو مزگەوت و دەشت و غەزا و حەج و عەمرە و شتی تر، چاوتروکانێك لێی بێئاگا نەدەبوون، کە فەتحی مەککەی کرد، دە هەزار سەحابەی لەگەڵ بوو، کە چوو بۆ تەبوك لە سەربازگەکەیدا (٣٠) هەزار سەحابە هەبوو، کە حەجی ماڵی خوای کرد (حەجی ماڵئاوایی) (١٠٠) هەزار سەحابەی لەگەڵ بوو، ئەوانە عاشقی خواو قورئان و پێغەمبەرو فەرموودەکانی بوون، هەمیشە چاویان کراوە و گوێیان واڵاو ئامادەبوون هەتا پێغەمبەرەکەیان وەك درەخت بەربدات و بوەرێ و وەریبگرن و بیبەخشنەوە، لەوکارە بەتەمای خێرو چاکە بوون، هەتا خەڵکی لاسایی پێغەمبەرەکەیان بکەنەوە و وەك ئەویکەن و پاداشت وەرگرن، خۆی دەیفەرموو: چیتان لێم بیست بیگەیەنن، ئەوە فەرمان بوو، کەسێك دەوروبەر و ماڵ و هاوڕێکانی ئاوابن و چاودێریی و چاوەڕوانیی لێبکەن یەك وتەی لەدەم بێتەدەر لەبەری بکەن و بیگەیەنن و بە خواپەرستیی بزانن، چۆن یەك هەناسەو وشە و کرداری لە مێژوو وندەبێ، ئەوان بەوکارە بڕوایان وایە دڵسۆزیی خۆیان بۆ خوا و پێغەمبەرو ئایینەکەی دەردەبڕن، بەتەمان بەوکارانە بەهەشت مسۆگەر بکەن و خوا لە خۆیان رازیی بکەن. سەیرە کە دکتۆر جەمال دیرێکی لەو وتە

شیرین و کرداره ڕەنگینانەی پێغەمبەر نەدیوەو نەگواستوەتەوە، نەك هەر ئەوە، بەڵکو دیویەتی و دڵی بەرایی نەهاتووە ئەو جوانانە تۆمار بکات، بەڵکو بوختانی ناشرینکردنی بۆ هەڵدەبەستێت، ئەو ناوی جەمالەی لە ئیسلامەوە وەرگرتووە، هەتا جوان ڕەوشت و جوان وتەو جوان نووسین بێت، بەلاّم ئەوندە بەدئەمەکە، ناشرینترین وتە بۆ پێغەمبەرو ئیسلام دروست دەکات، دەبێ کێ لەوە تاوانبارترو ستەمکارتر بێت کە کافری ولآتان وەسفی پێغەمبەر بکەن، بەلاّم دکتۆرە بەناو ڕۆشنبیرو بەناو موسوڵمانەکەی کورد بڵێ ئەو کوڕی باوکی خۆی نەبوو، زۆڵ بوو، کەسێکی نەخۆش بوو، دوای ئارەزوو هەواو هەوەسی خۆی کەوتبوو.. سوکترین بوختانی بۆ دەکات کە گاورە ناموسوڵمانەکانی ئەمڕۆو نەفامە بتپەرستەکانی سەردەمی پێغەمبەر بۆی نەچوون، خوایە خۆت تۆڵە لەدڵ و دەست و پەنجەی بکەرەوە. ئامین.

پێغەمبەر دوور نەبووە لە هاوڕێکانی، بەڵێ پێش پێغەمبەری دەچووە ئەشکەوتی حەڕا و چەند شەوو ڕۆژ دوور لە خزم و خەڵك دەمایەوە و بیری دەکردەوە، بەلاّم کە بووە پێغەمبەر وازی لە حەڕا و پێخەف و دۆشەك و نووستن هێنا و ناو خەڵکیی هەڵبژارد بۆ گەیاندنی پەیامەکەی، ئەو چل ساڵ تەمەنی پێش پێغەمبەری لە ناو بتپەرستاندا بوە لە شاری مەککە، بە شوانیی و بازرگانیی و کاسبییەوە خەریك بوو، کاری دەکرد بۆ یارمەتیی مامی بە کڵفەت و هەژار و ژیانی خۆی، هەموو ژیانی لەو چل ساڵەدا لەبەرچاوی کافرەکان بوو، ڕەوشت و نەریت و زەینی دیار بوو، گەر هەر نکوڵیەك لە ڕەوشتی ئەودا، عەیبێك لە عەقڵ و لاشەیدا هەبوایە، بتپەرستان دەیاندایەوە لە ڕووی کاتێك کە بانگی ئیسلامیی هەڵدا، بەڵکو پێغەمبەر گومانی لە خۆی و ئایینەکەی نەبوو، هات و، چوو بەگژ هەموو داب و نەریت و ڕەوشتە لارو لەویرو دار و بەرد پەرستەکەیاندا، دژی بت و مەی و زیندەبەچاڵ و کۆیلەکردن و سووخواردن و زەمکردن و سەرۆکە سەرکەشەکانیان شۆڕشی کرد، ئەوان بە هەموویانەوە، ئەم بە تەنها، ئەم سەرکەوت و بە پاکیی لێی هاتەدەر، ئەو نازناوی (ئەمین)ەی کە کافرەکان پێش پێغەمبەریی لێیان نابوو، لە

دوای پێغەمبەرایەتیش نکوڵیان لێینەکرد، خۆیشی پاراستی و دەستبەرداری نەبوو، خوای گەورەش مۆری لێدا (رسول امین)، بەڵکو ئەمانەت و سپاردەی ئایینەکەشی لە ئەستۆگرت و بە ئەمینی گەیاندی، بڕوایان پێی هەبوو کە ڕەوشت جوان و دەم پاك و خۆگرو ئەمانەت پارێزە، کە کۆچی کرد بۆ مەدینە، ئیمامی عەلی لە جێی خۆی دانا هەتا ئەو ئەمانەتانەی کە لای بوو بیداتەوە بە خاوەنەکانی، قورەیش هەموو شتیان بەرامبەر کرد، پەیوەندییان لەگەڵدا پچڕاند، بڕیاریاندا شتیان پێنەفرۆشن، ژنیان نەدەنێ، لە کاتی سوژدەبردنیدا پیسییان کرد بە سەرو ملیدا، منداڵیان فێردەکرد بەردی تێبگرن، چەند جار هەوڵی کوشتنیاندا، ناویان نا جادوگەر و شێت و شاعیر، هەموو شتیان بەرامبەری کرد، بەڵام نەیانتوانی لە رووی رەوشتەوە یەك وشەی درۆی بۆ هەڵبەستن وەك دکتۆر جەمال، پێیان نەوت زۆڵە و کوڕی باوکی خۆی نییە!، چونکە ئەوان باوکیشیان دەناسی و دایك و باپیر و مامەکانی لە بەڕێزترینی خەڵکی قورەیش و مەککە بوون، ڕەوشتی جوانی ئەویان دیبوو، خیانەت و درۆ و بێ پەیمانییان لێنەدیبوو، قورەیش پارەی زۆریان بەختکرد بۆ زەفەرپێبردن و ناشیرینکردن و قسە بۆ هەڵبەستنی، بەڵام ئەو کافرانە هەرگیز وەك جەمالیان پێنەوت، گەورەکانی قورەیش رۆژێك لە نادیەکەیان کۆبوونەوە، باسی پێغەمبەریان کردبوو، نەزری کوڕی حاریس لە ناویان بوو کە پیاوێکی ژیر و دانا و زیرەك بوو، پێی وتن: (گەورەکانی قورەیش، کاری موحەممەد ماندوی کردن، ئێوە دەستەوسانن لەوەی بتوانن شتێك بەرامبەری بکەن، موحەممەد هەمووتان دەیناسن، لە ناو خۆتاندا گەورە بووە، بووەتە پیاو، خۆشەویستترین و راستگۆترینتان بوو، کردبووتانە ئەمینی خۆتان، کە رووی لە پیریی کردو تەمەنی گەشتە ئاستێك، ئەم کارەی خستە بەردەمتان، وتتان جادوگەر و کاهین و شاعیر و شێتە، بەو خوایە گوێم بۆ قسەکانی گرتووە، هیچ لەو سیفەتانەی تیا نەبوو کە ئێوە باستان کرد). ئەو بەناو نەفامانە لەمەککەو لە پاڵ پێغەمبەردا ڕایان وابوو، وتیان نە شێتە نە کاهینە نە شاعیرە نە جادوگەرە، کەچی

جەمالێك كە ئاوی ئەوروپای خواردوەو گەڕاوەتەوە بۆ كوردوستان ئەو درۆو فیشالآنە بەناو لاپەڕەكان و خوێندكارانی دانشگادا بلآو دەكاتەوە ..!

دوژمنترین دوژمنی موحەممەد ئەبوجەهل بوو، رۆژێك پێی وت: ئەی موحەممەد من نالێم تۆ درۆزنی، بەلآم بڕوام بەو شتە نییە كە هێناوتە و بانگی خەڵكیی بۆ دەكەیت، ئەم ئایەتە بۆ ئەبوجەهل دابەزی: (يَقُولُونَ فَإِنَّهُمْ لاَ يُكَذِّبُونَكَ وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللّهِ يَجْحَدُونَ) (الأنعام : ٣٣)، خوا داوای كرد خزمەكانی ئاگادار بكات، محەمەد نەترسا، وەك دكتۆر جەمال لە گەلەكەی هەڵنەهات بۆ ئەوروپا خۆی حەشار بدات و كەمترین هەڵوێستی نەبێت و میللەتەكەی بە دەست بەعسەوە جێبهێڵێ، بەڵكو دەستبەجێ چووە سەر كێوێك و هاواری كرد: ئەی خەڵكی قورەیش، هەموو هاتن و لە خواریەوە كۆبوونەوە، پێیوتن: ئایا بڕوام پێدەكەن گەر بڵێم سوپایەك لەودیو ئەو كێوەوەیە و گەیشتۆتە لاپاڵەكەی؟ وتیان: هەرگیز درۆمان لێنەبیستووی.

كە پێغەمبەر نامەی بۆ هەرقل (گەورەی رۆم) نارد موسوڵمان ببێت، هەرقل داوای كرد لە بازاری قودس عەرەبێك بهێنن با پرسیاری لێ بكەم، لەو كاتەدا ئەبو سوفیان هاتبووە قودس بۆ بازرگانی، گرتیان و بردیان، هەرقل وتی: باسی موحەممەد و دینەكەیم بۆ بكە..؟ ئەو كاتە ئەبو سوفیان موسڵمان نەبوو، دوژمن بوو، شەڕیان لەگەڵ دەكرد، دەیانویست موحەممەد بكوژن، بەلآم با بزانین چۆن وەلآمی هەرقل دەداتەوە!

هەرقل وتی: لەناوتاندا رەچەڵەكی چۆنە؟

ئەبو سوفیان وتی: خاوەن نەسەبی چاكە.

هەرقل وتی: پێش ئەو كەسی تریش دیعایەی پێغەمبەریی كردووە؟

ئەبو سوفیان وتی: نەخێر.

هەرقل وتی: لەناو باپیرانیدا پادشا هەبووە؟

ئەبو سوفیان وتی: نەخێر.

هەرقل وتی: لاوەكان دوای دەكەون، یان ئەشرافەكان؟

ئەبو سوفیان وتی: لاوەکان و بێدەسەلاتەکان.

هەرقل وتی: کەسیان لێ هەڵدەگەڕێتەوە؟

ئەبو سوفیان وتی: نەخێر.

هەرقل وتی: چیتان لێ داوادەکا؟

ئەبو سوفیان وتی: خوای تاك پەرستن و شەریك بۆ خوا دانەنان و واز لە قسەی باپیران هێنان و نوێژکردن و راست وتن و دەستپاکیی و داوێن پاکیی و خزمایەتیی و سەردانی یەکتر.

هەرقل وتی: زیاد دەکەن، یان کەم دەکەن؟

ئەبو سوفیان وتی: زیاد دەکەن.

هەرقل وتی: تاوانبار نییە بە درۆزنیی؟

ئەبو سوفیان وتی: نەخێر.

هەرقل وتی: غەدری کردووە؟

ئەبو سوفیان وتی: نەخێر.[1]

گەر موحەممەد شتێکی بشاردایەتەوە، ئایەتی زەینەبی کچی جەحشی دەشاردەوە، وەك عائیشە دەڵێ: (لو كتم رسول الله ﷺ شيء من القرآن، لكتم هذه الآية) واتە: چیرۆکی زەید کە زەینەب تەلاق دراو پاشان پێغەمبەر مارەی کرد، جەمال بۆ هێندەی ئەم گاورانە ئازا نەبوو کەمێك هەق بۆ ئیسلام و موحەممەد بڵێ، ئەوی بەناو لێکۆڵەر وەك هەق ناڵێت بۆ درۆ دروست دەکات..؟ دەبوو ئەمە وتەی دکتۆر جەمال بوایە نەك ئەم گاورە، لێکۆڵەرە موسوڵمانەکانمان عەیبیان لێدێت بڵێن موسوڵمانین، بۆ ئەوەی لای باباکانیان بیسەلمێنن کە دژی دینەکەیانن، ئەم بوختان و پڕوپوچانە هەڵدەبەستن، بڕوانن ئەم گاورە بە ئینسافە چ حەقێك دەبێژێ، (باسورس سمیث) رۆژهەلاتناسی ئینگلیزی دەڵێ: (ئا لێرەوە خۆر دەبینی کە بەرز و بڵندەو بە تیشکەکەی هەموو شتێك رووناك دەکاتەوەو دەگاتە

[1] (صحیح البخاری ج١، ص٦).

هەموو شت، بێگومان لە بوونەوەردا کەسایەتیی هەبووە هیچ لە بارەیانەوە نازانین و هەرگیز راستییشیان دەرناکەوێت و بە نهێنی دەمێننەوە، بەڵام مێژووی دەرەوەی موحەممەد هەموو شتێکی لەبارەوە دەزانین، هەر لە لە دایکبوونی و پێگەیشتنی، هەتا لاوێتیی، پەیوەندی بە خەڵکەوە، رەوشتی، ناخی، بیرکردنەوەی، گەشەکردنی، دابەزینی وەحی، بانگەوازی، پاش بانگەوازی و راگەیاندنی پەیامەکەی و قورئانەکەیمان لەبەردەستایە، وێنەی نییە لە راستی و خۆپارێزیدا، کەس گومانی نییە لە راستیی، ئەو ئەمڕۆ لای ئێمە نموونەی گیانی سەردەمی خۆیەتی، ئاوێنەی دەوری خۆیەتی، لەوەدا هیچ دەستکارییەك نییە، زۆر لە خۆکردن لە رەوشتیدا نییە، لە کاتی قسەکردنداو دژوەستاندا رەخنەمان لێدەگرێ، بەڵام لێوانلێوە لە بیرۆکەی نوێ و مەزن، لەگەڵ لاوازیی دەرونی مرۆڤدا هەرگیز خۆی بەری ناکات لە کارێك کە کردویەتی، گەورەترین نموونە لەسەر گەورەیی موحەممەد ئەوەیە ئەو هەرگیز نەیوتووە من بەری و بێهەڵە و بێگوناهم).

(جینبین) دەڵێ: (هیچ پێغەمبەرێك نییە لە تاقیکردنەوەی قورس رزگاری بوویێت لە سەرەتای دەستبەکاربوونیەوە جگە موحەممەد، یەکەمجار خۆی لای نزیکەکانی لە هاورێ و خێزانەکەی ناساندو وتی من پێغەمبەرم و نیگام بۆ دێت، لە ناو کەسانێك کە زیاتر لە خۆیان دەیانناسی، پەیامەکەی بە ژنەکەی راگەیاند، بە خزمەتکارەکەی، بە کوڕی مامەکەی، کە لە ماڵی ئەوان دەژیا، پاشان بە هاورێ کۆنەکەی وت، کەسیان تەریقیان نەکردەوە بڵێن وانیە، ئەوان لە یەکەم کەسەکان بون بڕوایان بە پەیامەکەی هێنا، پێغەمبەر موحەممەد، وەك ئەوانەی پێش خۆی نەبوو، ئەم زۆر خۆشەویست بوو لە ناو ئەوانەی کە دەیانناسی)، ئەم نزیکەکانی بڕوایان پێهێنا، بەڵام پێغەمبەرەکانی تر نزیکەکانی دوژمنی بوون، ژنی نوح و کوڕی نوح و ژنی لووت خزمانی زەکەریاو یەحیا بڕوایان بە پێغەمبەرەکەیان نەهێنا، بەڵام موحەممەد لای نزیکترین کەسەکانی ئەوەندە نازدار و شیرین بوو، بڕوایان پێهێنا، هەریەکەشیان لە پێناو ئەو بڕوایەدا تاڵترین ئازاریان چەشت و بەڵایان بەسەردا هات، خەدیجە لەگەڵ موحەممەدی مێردیدا لە دۆڵێکدا تینوێتی و

برسـێتی و تـاڵی ژیانیـان دەچەشـت، دەسـت بەسـەرو گـەمارۆدراو بـون، خـاکی مەککەیان لێهاتەوە یەك و ناچاری کۆچکردن بـون، ئەبوبـەکری لـە گەڵدابوو، جـێ نەبوو خۆیانی تیاحەشار بدەن، بە شەوی تاریك، بە تـرس و لـەرز، چـەم و دۆڵیـان دەبـڕی، دوژمــن بــە دوای جێپێکانیانــدا دەگــەڕا، ئەبوبــەکر مــاڤی هاوڕێیــەتی پێشکەشکرد، پابەند بوو بە وەفاکەیەوە، نەیوت من پارەدارم و خۆم ناخەمـە ئـەو گێژاوو ترس و لەرزەوە، عەلی خەتەرترین کاری کەوتە ئەستۆ، لە جێگەکەی ئـەودا خەوت و پێخەفەکەی پێغەمبەری دا بەسەری خۆیدا، خەریکبوو دوژمنەکان بکوتنـە سەری و بە شمشێر لەت و پەتی بکەن، ئەوان چوزانن ئەوە پێغەمبەر نییـە، بـەڵکو عەلی دەیویست هەروا گومان بخاتە دڵیان کە پێغەمبەرە و نەچن بەدوای ئەودا، تـا ئەوان دوور دەکەونەوە، بە وریاییەوە دانیشتن تا ئەو خەبەری دەبێتەوە، ئەوچـەند سەعاتە خەڵەتاندنی تا پێغەمبەرەکەی دوورکەوتەوە، حیسابی ئەوەشی کردبوو کە ئەگەر لە پێنـاو پێغەمبـەرداو لـە بـاتی ئـەو بـڕوات شـەهیدە، زەیـدی خزمـەتکاری بوویبوویە جێی کوڕ بۆ موحەممەد، کە بـاوکی هـات وتـی: کـوڕم بـا بچینەوە مـاڵی خۆمان، زەیدی ژێر باڵە بەسۆزەکەی پێغەمبەری هەڵبژارد هەتا لای باوك و دایکـی، فەزڵی خزمەتکردن و لای پێغەمبەری دا بەسەر باوکیدا، نەگەڕایەوە ناو هۆزەکەی.

ئەوەیە موحەممەدو هاوڕێیانی، ئەوەش قسەی لێکۆڵەری بەناو موسڵمانی بەناو دکتۆرو لێکۆڵەری کورد، بۆچی جەمال نایەت ئـەم هەسـتە ناسـکانە بنووسـێ هـەتا کورد لاسایی رەفتاری بەرزی نـاودارانی جیهـان بکەنـەوە کـە بـۆ زمانـە ئەورووپییـە گاورەکان وەرگێڕدراوە، ئەو دێت دڵی کورد کرمـێ دەکـا لـە پێغەمبەرەکـەی، گـەر کوردی بوێ شتی باشیان بۆ کۆدەکاتەوەو ڕەوشتی بەرزیان لە نمونە بەرزەکان بـۆ دەگێڕێتەوە.

(هیجنس) لە کتێبەکەیدا (الأعتزاز عن محمد والقرآن) دەڵێ: (دواکەوتوانی عیسا دەبێ بزانن و بیریان بکەوێتەوە کە بانگەوازی موحەممەد لە دەروونـی هاوڕێکانیـدا خۆشەویستیەك و دڵگەرمییەکی دروست کرد، کـە نموونـەی ئـەوە لـە دواکـەوتوانی عیسـادا لـە سـەرەتای بانگـەوازەوە هـەتا ئێسـتاش نیـە، نموونـەی وایـان هـەرگیز

نەبووە، ئەوەی توێژینەوە لەسەر ئەوە بکات و بیەوێ گاورەکان گەرم بکات هیچی دەستناکەوێ، چونکە حەوارییەکان وازیان لە عیسا هێنا کاتێك کە دوژمنەکانی بردیان و هەڵیانواسی، هاوڕێکانی بە گورگانخواردیاندا و سەرشۆڕیان کرد و دایان بەدەست دوژمنەکانیەوە، هەتا شەرابی مردن بچەژێ، بەڵام هاوڕێکانی موحەممەد وایان نەکرد، لە دەوری کۆبوونەوە و سەرسەختانە بەرگریان لێکرد هەتا سەریان خست بەسەر دوژمنەکانیدا. هاوڕێکانی موسا لە تەنگەتاوی جەنگدا بە موسایان وت بڕۆن خۆت و خواکەت بجەنگن ئێمە لەم دورەوە سەیر دەکەین، بەڵام هاوڕێکانی محەمەد بە محەمەدیان وت بڕۆ بجەنگەو ئێمە لە گەڵتتاین.. ! !

جەمال سەیرە، خۆی بە خوێنەر و لێکۆڵەر دەزانێ، هێندەی ئەم فەلەیە هەقناس نییەو ڕاستی لانیە، ئەمە وا دەکات بکەوینە گومان لە نووسینەکانی تریشی، ڕەنگە هەر لە خۆوەو بە ئارەزوو رستەی درۆی ڕیزکردبێ و هەڵەی بۆ کورد هەڵبەستبێ. ! !

نازانم دکتۆر جەمال چ سوودێك بۆ کەسێتیی خۆی لەم قسانە دەبینێ کە پێشوەخت بێ هیچ کێشەیەك بە کوردی دەفرۆشێت و دەیەوێ بە عەرەبی بڕێژێ، قین و تووڕەیی دکتۆر جەمال لە پێغەمبەری سەروەری موسڵمانان هیچ پاساوێکی نییە، گەر کەسێك بە جەمال، یان بە منداڵێکی بڵێ زۆڵێت و لە باوکت ناچیت، ڕەنگە زویر ببێت! !، خۆ ئێمە دکتۆرو بنەماڵەو کاری ئەوروپایان نازانین، ئەمە بۆ دکتۆر جەمال هیچ نییە، چونکە هەر خۆیەتی و ناسراوو پیرۆز و مەزن نییە، لەناو هاوڕێ و وەزیفەکەی خۆشیدا ئەو نرخ و دەنگەی نییە، کەچی دێت بەرامبەر پیرۆزیی موسڵمانان و کورد، وتەی وا سەقەت و دوور لە ڕاستیی و بێ سەرچاوە دەهێنێ، ئەمە هیچ کارێك نییە، پیرەژنێك بە عەوامی خۆی لە برنج بژارکردندا چیلکەو چەوێڵ و داروجانەکان فڕێ دەدات، دکتۆر جەمال لە خەروارێك گەنم پاکەکە فڕێ دەدا و داروجانەکە دێنێ و دەڵێ ئەمە مێژوو دینەکەتانە، ئەمە ژیانی پێغەمبەرەکەتانە، وا دەزانێ کارێکی باشی کردوە، ئەمە کاری مشەخۆرێکە وەك گەنەی بنهەنگڵی دەعباو چوارپێیەك کە خوێنی دەمژێ و دەیەوێ بەسەر خوێنی

ئەوەوە بژی، زۆر کەس لە ناو رۆشنبیرانی کورددا ئەم کارەی دکتۆر جەمال دەکەن بۆ تێکدانی رەوشت و بەها بەرزەکان و پیرۆزیی پێغەمبەر ﷺ، بۆ تێکدانی مێشکی خوێندەوارانی کورد و پێیان دەڵێ: ئەوە پێغەمبەرەکەتانە و ئەوەش پەیامە پیرۆزەکەی..!.

پێم سەیرە دکتۆر جەمال هیچ وشەیەکی جوانی لەسەر پێغەمبەری نازدار و پاك رەفتار و جوان گوفتار نەهێناوە کە گاور و کافرەکان پێی سەرسامن و لە بارەیەوە دەڵێن، هێندەی رۆژهەڵاتناسە فەلەکان ئازانەبووە هەق بڵێ..!!

کە بتپەرستە قورەیشیەکان رۆژی جەنگی ئوحود هێرشیان هێنایە سەر موسڵمانان و ریزەکانیان تێکدان و بڵاوەیان پێکردن، پێغەمبەر هاواری کرد کێ خۆی دەکاتە فیدام. لە ئەنسارەکان حەوت سەحابە هەڵسان و هەموو بەرگریان لێکرد و بەردەوام دەجەنگان هەتا هەر حەوتیان شەهیدبوون، لەو جەنگەدا ژنێك مێرد و دوو کوڕەکەی و براکەی کوژرا بوو، بەڵام کە هاتە ناو مەیدان و پێیان وت ئەوانە کوژراون، ئەو وتی ئەی هەواڵی پێغەمبەر چییە دەڵێن کوژراوە؟ وتیان سەلامەتە، بڕوای نەکرد هەتا گەڕاو دۆزیەوە و چاوی کەوت بە ناوچاوی درەوشاوەو نورینی، ئەنجا ئارام بوو حەوایەوە دڵی خۆش بوو، وتی: "هەموو موسیبەتێك دوای بینینی تۆ هیچ نییە ئەی پێغەمبەری خوا".

ئەوانە بە هەق موسڵمان و ئیماندار بوون، پێغەمبەر و ئایین و سوننەتەکانیان ناسیبوو، گەر ژیاننامەو کەسایەتیی پێغەمبەر هێندە بەرز و مەزن نەبوایە، ژنان و پیاوان ئاوایان بۆ نەدەکرد (قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ).

ئیسلام بڕیاریداوە ژیانی موحەممەد ببێتە نموونەی بەرز و کەماڵ بۆ دواکەوتووانی، هەر بۆیە سەحابەکان تەواوی چیرۆکی ژیان و فەرموودەیان پاراست، نەیانهێشت لەناوبچێ و لە بیر بچێ و بسڕێتەوە، هەموویان نووسیەوە، یەك بازنە و قۆناغی ژیانی سەروەری پێغەمبەران نییە ون بووبێت، ژیانێکی تەواوی بێ نکوڵی بە هەموو حەرەکە و سەکەنە و شەو و رۆژ و خەو و خەیاڵ و خۆراك و رۆشتن و دانیشتن و گریان و پێکەنین و دەرو ناخی، هەمووی نووسراوە، ژیانێکی

پاك و بێگەرد، خوا پەروەردەی كردووە و خۆی دەفەرموویّ: (أدبني ربي فأحسن تأديبي)، خوا دەفەرمویّ (وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ).

جولەكەیەك بە سەحابەیەكی وت: پێغەمبەرەكەتان هەموو شتێكی فێركردوون، تەنانەت كاری قێزەونیش.. سەحابەكە بە شانازییەوە وتی: بەڵێ پێغەمبەرمان هەموو شتێكی فێركردووین، تەنانەت ئەدەبی چوونە سەرئاوو تاراتیش.

ژیانی موحەممەد وەك بازنەیەك وایە، موحەممەد چەقی ئەو بازنەیەیە و سەحابە و تابعین لە پشت ئەو چەقەوە بەدەوریدا چەماونەتەوە و چەند بازنە و هێڵێكی تریشیان دروستكردوە. سەحابەكان وەك پەپوولە بە دەوری پێغەمبەردا دەخولانەوە و وتەیان لێوەردەگرت، كەچی جەمال عەیب و عارو ناتۆرەی ناشیرینی بۆ دروست دەكات دەیەویّ لە ناخی كۆمەڵگەی كوردییدا بیشكێنیّ!

ئیمامی عەلی رۆژێك پرسیاری لە پێغەمبەر كرد و وتی: سوننەتی تۆ چییە؟ پێغەمبەر فەرمووی: (المعرفة رأس مالي، والعقل اصل ديني، والحب أساسي، والشوق مركبي، وذكر الله أنيسي، والثقة كنزي، والحزن رفيقي، والعلم سلاحي، والصبر ردائي، والرضا غنيمتي، والفقر فخري، والزهد حرفتي، واليقين قوتي، والصدق شفيعي، والطاعة حسبي، والجهاد خلقي، وقُرَّةَ عيني في الصلاة).

## گرنگترین سەرچاوەكانی نوسینەوەی سیرە

سەرەتا دەبێت ئەو خاڵانە بڵێین كە نووسەری سیرە دەبێت رەچاوی بكات..

یەكەم: دەبێت شارەزابێت لە زمان و قەواعیدی عەرەبی و بە تەواوی لە باسەكان تێبگات و ماناكانیان دەربهێنیّ و شیبكاتەوە.

دوەم: دەبێت پسپۆرو شارەزابێت لە زمان و قەواعیدو داب و نەریتی ئەو گەلەی كە بابەتەكەی بۆ وەردەگێرێت.

سێیەم: زانستیانە و ئەكادیمی و هاوچەرخانە بێت، بزانێت چۆن سەرچاوەكان وەردەگرێت و بەكاریان دەهێنێت.

چوارەم: هەر كۆكردنەوەو كەڵەكەكردنی زانیاریی نەبێت.

پێنجەم: بە بۆچوونی خۆی (واتە رق و قین و حەزو هەستی) خۆی تێکەڵ نەکات، بەڵکو هەقپەرستانە بنووسێ.

شەشەم: تەقلیدی نەبێت، وەك وەرگێڕێك لاسایی نەکاتەوە، واتە خەڵکی چی نووسی ئەم هەر تەرجەمەو نەقڵ بکات و بێسەرچاوە بە ناوی خۆیەوە بڵاوی بکاتەوەو زانیاری نەبێت کە ئەم بڕگانەی ئەم وەریگرتوون بەهێزو مەقبولن یان کەمتین و لاوازن.

حەوتەم: چاك وایە نووسەر خۆی پاك بکاتەوە لە هەموو راو بۆچوونەکان، خۆی بخوێنێتەوە و شیکاریانە رای خۆی لەسەر باسەکان بڵێ، ئیمامی غەزالی لە نووسینێکیدا دەڵێ: "من خۆم پاککردووەتەوە لە هەموو راو بۆچوونەکان و وتە وتییەکان، من خۆم بیردەکەمەوە و دەڵێم، دوای لاساییکردنەوە ناکەوم و بە عەقڵی کەسیش بیرناکەمەوە و نالێم"، هەق وایە لێکۆڵەر وابێت، لەبەر خەڵك نەڵێت.. ! ! هەوا چۆنی ویست وا نەکات ! .. .

دەبێ ئەو سەرچاوانە چی بن کە سیرە و رێی ژیانی پێغەمبەرمانی لێ هەڵدەگۆزین..؟ ئایا سیرە چۆن کۆکراوەتەوە و نووسراوەتەوە..؟ ئێمە لە چەند خاڵێکەوە باسەکە و مێژووی نووسینەوەی ژیاننامەی پێغەمبەر روونددەکەینەوە، با دکتۆر جەمالیش سەرپەرشتیمان بکات، چونکە نەزانان و دوژمنان لەملایەنەوە کەوتونەتە هەڵەوە:

١- گرنگترین سەرچاوەی ژیاننامەی پێغەمبەر، پوختترین و بڕوادارترین و لە هەمووی راستتر ئەوەیە کە لە قورئان وەردەگیرێ، یەك وشەی هەڵەو زیادە یان لەبیرچوون و نەزانیی لە ئایەتەکانیدا نییە، نە لە لەفز و نە لە مانادا، تەنانەت دوژمنانیش گومانیان لە راستیی قورئان نییە، قورئان هەموو لایەنێکی ژیانی پێغەمبەری دەرخستووە، هەر لە منداڵی و رووداوەکانی پێش پێغەمبەرایەتیی و سەردەمی هەژاریی و بێکەسی و بێ دایك و باوکیی، باسی پاش پێغەمبەرایەتی و دابەزینی وەحی و بانگەوازو، باسی غەزا و جەنگەکان و دوژمنەکانیشی دەکات، باسی کۆچەکانیان و داب و نەریت و خوو رەوشت و ژیری و زەین و رەحم و سۆز

و هەست و نەستی دەكات، تەنانەت باسی دوا ساتەكانی و مردنیشی دەكات بە شێوازێكی بەهێز و سەرنجڕاكێش، هەتا ئێستا مێژوو باسی كەسایەتییەكی نەكردووە چاكتر و پاكتر و راست و دروستتر و كاریگەرترو بە بڕواتر لە سیرەی پێغەمبەر كە قورئان پشتڕاستی دەكاتەوە.

٢- سەرچاوەی دووەم بۆ سیرەی پێغەمبەر ﷺ، سوننەت و فەرموودەكانیەتی كە لە سەدان بەرگی گەورەدا پارێزراون و لە هەموو كتێبخانەكاندا ئامادەیە، لە وتە و كردار و گوفتار و كاروباری پێغەمبەر كە بریتییە لە (٧٠٠) هەزار فەرموودە، بە جۆرەها شێوە و گوزارشت و گێڕانەوە، لە هەموو كارو بارودۆخ و كات و سات و شوێنێكدا باسكراوەو دەتوانرێ ژیاننامەو راو بۆچوون و شێوازەكانی جموجوڵی پێغەمبەری لێ هەڵبگۆزێ، كتێبی (صحاح الستة) كە شەش كەس لە كۆكەرەوە مەزنەكانی وەك (بوخاری و موسلیم و تورمزی و نەسائی و حەنبەلی و...) كۆیانكردووەتەوە و هەموو فەرموودەكانی پێغەمبەریان بە چەند جۆر شێواز و چەند جۆر گێڕانەوە تیایە، زانایان زۆر وردەكارییان تیاكردووە، هەموو لایەنێكیان دیاری كردووە و هەموو شایەتەكانیان ناو بردووەو وایان لێكردووە هەتا چیە و گومانێك لە دڵدا نەمێنێ بۆ لێكۆڵەرەوانی بە ئینساف، یان وردبینێكی بەدگومان، شەش كتێبە پاكە راستەكە (صحاح الستة) هەموویان بە سەنەدەكانیانەوە نووسراوە، كە گەورەترینیان مەسنەدی ئیمام ئەحمەدی كوڕی حەنبەلە، كە لە چەند بەرگی گەورەدایە و هەر بەرگێك (٥٠٠) لاپەڕەیە لە قەبارەی گەورە و بە پیتی ورد، هەر سەحابەیەك چەند گێڕانەوەی هەیە، دیاریكراوە.

٣- سەرچاوەی سێیەم كتێبی غەزاكان، كە جەنگ و غەزاكانی پێغەمبەری تیایە، وەك مەغازی عروەی كوڕی زوبەیر سالّی (٩٤) ك مرد، مەغازی زوهەری سالّی (١٢٤) ك مرد، مەغازیی موسای كوڕی عەقەبە سالّی (١٤١) ك مرد، مەغازیی ئیبن ئیسحاق سالّی (١٥٠) ك مرد، مەغازی زیادی بەكائی سالّی (١٨٢) ك مرد، مەغازیی واقیدیی سالّی (٢٠٧) ك مرد.

٤- سەرچاوەی چوارەم کتێبی مێژووی ئیسلام بە گشتیی کە بە سیرەی پێغەمبەر دەستپێدەکات، لە پاکترین و بڕواپێکراوترینیان و درێژترین و راستتر و روونترینیان (طبقات ـ ابن سعد) و (تأريخ الرسل والملوك ـ طبري) و (تأريخ الصغير وتأريخ الكبير)ی موحەممەد کوڕی ئیسماعیلی بوخاری و (تأريخ ابن حبان) و (تأريخ ابن خيثمة البغدادي) كە ساڵی (٢٩٩) ك مرد.

٥- ئەو کتێبانەی کە لە بارەی رەوشت و موعجیزات و وەسف و سەنای پێغەمبەرەوە دانراون، وەك (دلائل النبوه)ی ئیبن ئیسحاقی حەربی ساڵی (٢٥٥)ك مرد، (دلائل النبوة)ی ئیبن قوتەیبە کە ساڵی (٢٧٦)ك مرد، (دلائل النبوة)ی ئیمام بەیهەقی کە ساڵی ٤٣٠ك مرد، (دلائل النبوة)ی ئیبن نەعیم ئەسفەهانی کە ساڵی (٤٣٠)ك مرد، (دلائل النبوة)ی موستەغفیری کە ساڵی (٤٣٢)ك مرد، (دلائل)ی ئەبی قاسم ئیسماعیلی ئەسفەهانی کە ساڵی (٥٣٥)ك مرد، گەورەترین و ئاسانترینیان کتێبی (خصائص الكُبرى)ی جەلالەدینی سیوتیە کە ساڵی (٩١١)ك مرد.

٦- سەرچاوەی شەشەم کتێبی (الشمائل)ە کە باس لە رەوشتی پێغەمبەر دەکات، هەر لە بەیانی تا ئێوارە و لە شەو تا بەیانی، چیی کردووە لە رەوشت و داب و نەریت و زیکر، بەناوبانگترینی ئەو کتێبانە (كتاب الشمائل)ی حافز تورمزی، (كتاب الشفا في حقوق المصطفى) کە قازی عیاز نووسیویەتی و شەهاب خەفاجی لێکدانەوەی بۆ کردووەو ناوی نا (نسيم الرياض)، (شمائل النبي) کە ئەبی عەباسی موستەغفری نووسی و ساڵی (٤٣٢)ك مرد، (النور الساطع) کە ئیبن مەقەری غەرناتی نووسی و ساڵی (٥٥٣)ك مرد، (سفر السعادة) کە مجەددین فیرۆزئابادی نووسی و ساڵی (٨١٢)ك مرد.

٧- کتێبی (احوال مكة المعظمة والمدينة المنورة) باسی هەموو شتێك دەکات لەو دوو شارەدا، لە دەشت و شوێن و دۆڵ و شاخ و رێ و بان، باسی باری ئابووریی و بەڕێوەبردن دەکات، باسی ئەمیرەکانی ئەو شارانە و رووداوەکانی هەر لە سەردەمی پێغەمبەرەوە هەتا سەردەمی نووسەری کتێبەکە، هەروەها کۆنترین کتێب (اخبار مكة)ی ئەزرەقیە کە ساڵی (٢٢٣) ك مرد، وە (اخبار المدينه)ی

عومەری کوری شوببە کە ساڵی ٢٦٨ك مردوه، پاشان (اخبار مكة)ی فاکری و (اخبار المدينة)ی ئیبن زوبالە.

لەمانەی کە باسمانکرد دەردەکەوێ کە سیرە چ گرنگییەکی هەبووە لە مێژوودا، چ فراوانییەکی داگیر کردووە، هیچ سەردەمێك نکوڵیان نەکردووە لە یارمەتیدان بۆ کۆکردنەوە و پارێزگاریکردن و نووسینەوەی قورئان و فەرموودە و سیرە و مێژووی ئیسلام، سەرەتا قورئان و فەرموودە بە دەقە پیرۆزەکەیان لە لاپەڕەکانی دڵدا دەنووسراو هەڵدەگیرا، پاشان کە زانرا خاوەن دڵە پڕو مەخزە رۆشنەکان وردە وردە دەمرن، وا بە چاك زانرا لە رووپەری لاپەڕەکان و کتێبەکان بنووسرێ و هەڵبگیرێ و لەبەری بگرنەوە هەتا سەردەم و زەمانە بیپارێزێ و سوودی لێ ببینرێ.

کەواتە بە گشتی دەتوانین ژیانی پێغەمبەر و کارو کردەوەکانی و قۆناغەکانی گەشەکردنی سەرەتای ئیسلام، لە سێ سەرچاوەی سەرەکیەوە دەستبخەین:

١- قورئان

٢- کتێبەکانی فەرموودە و سوننەتەکان.

٣- گێڕانەوەکانی مێژوونووسان و بەرهەمەکانیان.

قورئان: پەیامی خوایە کە دایبەزاندوەتە سەر دڵی پێغەمبەر، چ بە لەفز و وتە، چ بە مانا، هەموو ئایەت و دەقەکانی تەواوە، هەموو لایەك دان بە راست و دروستیی و پاکییدا دەهێنن، کەس نەیتوانیوە هەتا بە ئەمڕۆش دەگات، یاریی و دەستکاریی بە ئایەتەکان و ماناکانی بکات، هەرکەس کەمترین هەوڵی بۆ خراپکاری دابێ، زۆری نەخایاندووە هەر زوو بە زوو ئاشکرا بووە و خونسا کراوەتەوە، چونکە خوای گەورە خۆی بڕیاری بەرگریی لێکردن و پاراستنی داوە، بەتایبەت لە ئایەتی: (إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ) (الحجر : ٩ ). قورئان بە یەکجار دانەبەزی، بەڵکو وردە وردە و ئایەت ئایەت، بە تاك و بە کۆ لە ماوەی بیست ساڵێکدا هەمووی تەواو دابەزی.

له هەندێك ئایەتدا باس لە پێغەمبەر و ڕووداوەکانی سەردەمی ئەو دەکات، زۆریش باس لە سەردەمی پێش پێغەمبەرایەتی موحەممەدو سەردەمی پێش ئیسلام و منداڵیی پێغەمبەر و بێ باوك و دایکیی و دۆخی مەککە و ناوچەکە دەکات، پاشان باسی گەورەبوونی موحەممەد و پێغەمبەرایەتی و ڕۆژ بە ڕۆژی وەحی بۆ هاتن و سەردەمی مەککە و مەدینە هەتا مردنی پێغەمبەر زۆر بە وردیی دەکات، باسی بیرۆکەکانی موسڵمانان و هەڵسانەوە و گەشەکردن و پتەوبوونی باوەڕ و بنەماکانی سیاسەتی موسڵمانان لە مەدینە و بەگژاچوونەوەی بێبڕواکان تا کۆچکردنی پێغەمبەر بۆ مەدینە و پاشان جەنگەکانی بەدر و ئوحد و فەتحی مەککە و زۆر کاروباری تر دەکا، هەندێك جاریش باس لە بێبڕواکان و ئەوانەی دژایەتی ئیسلام و پێغەمبەریان کردووە دەکات، باس لە جۆراوجۆریی ڕووداوەکان و کەسەکانیش دەکا، بە کورتی قورئان ڕووناکیەکی تەواو دەخاتە سەر سەردەمی پێغەمبەر و ئەو لەمپەر و گرفت و کێشە جۆراو جۆرانەی کە ڕووبەڕووی پێغەمبەر و موسڵمانان بوونەتەوە، هەندێ جار لە قورئاندا چارەسەرەکانیش دیاریی کراون، وەڵامی پرسیارەکان، لەسەر کێشەکان، یان دیاردەکان، یان وەڵامی ڕۆژانەی خەڵك لە ژیان، دراوەتەوە.

قورئان سەرچاوەی یەکەمە بۆ لێکۆڵینەوە و زانینی پێگەیشتن و گەشەکردنی ئیسلام و ئیمان و بیروباوەڕەکەی، باسی قۆناغبەندی بانگەواز و گیروگرفتەکان دەکات، بەڵام سوودوەرگرتن لە قورئان بۆ نووسینەوە و لێکۆڵینەوە لە مێژووی ژیانی پێغەمبەر و بانگەوازەکەی کارێکی هەروا سەرپێی و سانا نییە، چونکە باسی هەموو ڕووداوەکان و قۆناغەکانی پیارۆشتنی ئیسلامی نەکردووە، باسی هەموو کار و کردەوەکانی پێغەمبەری نەکردووە کە پێی هەستاوە، یان ئەوانە باس نەکردووە کە پەیوەندییان کردووە پێیانەوە، بەڵکو تەنها ناوی چەند کەسێکی ئەو سەردەمەی تیایە، یەکیان بتپەرست بووە کە ئەبولەهەبی مامیەتی، یەکێکیش

ناوی زەیدی کوڕی حاریسە کە پێغەمبەر لە ماڵی خۆیان گەورەی کردووە هەتا پێغەمبەر لە ژیاندا بووە خزمەتی کردووە.

لەوانەیە گەورەترین کۆسپ کە بێتە ڕێمان لە کاتی سوودوەرگرتنی لە قورئان بۆ نووسینەوە و توێژینەوە لە مێژووی ژیانی پێغەمبەر و ئیسلام بەتایبەت لە قۆناغی مەککەدا، زانینی سەردەم و کاتی دابەزینی ئایەتەکان بێت (اسباب نزول)، چونکە زانایانی ئیسلام کە لە هۆی دابەزینی ئایەتەکان کۆڵاونەتەوە، تەنها لە سەر چەند ئایەتێکی دیاریکراو وەستاون، کە بە زۆریی دەستنیشانی حوکمێك، یان ڕووداوێك، یان کەسێکی دیار و ناسراو دەکات، لێکۆڵەرەوانیش لە ناسخ و مەنسوخدا بە زۆریی باسیان لە یەك لە دوای یەکی دابەزینی ئایەتە ناسخ و مەنسوخەکان کردووە، بەتایبەتی لە ئەحکامە قەزاییەکاندا، کە ئەویش چەند ئایەتێکی دیاریکراوە و زۆر کەمە لە قورئاندا، هەرچەند ئەمڕۆ هەندێ ڕای تر دروستبووە لەسەر ناسخ و مەنسوخ.

قورئان باسی لە هەندێ دەزگا و داب و نەریتی سەردەمی نەفامیی دەکات پێش ئیسلام، بەڵام چونکە پێش هاتنی ئیسلام ئەوان نەمابوون و لەناوچوو بون، موفەسیرەکان نەیانتوانیوە بە چاکی وەسفیان بکەن و لەوەدا کەوتوونەتە هەندێ نەپێکان و گرفت و ناکۆکیی، هەروەها زانایان هەندێ گرفتی تریان هەیە لە ڕیزبەندییکردن و یەك لە دوای یەك دابەزینی ئایەتەکان، لە زۆر ئایەتدا قسەی جیاواز هەیە، چونکە تەنانەت سوورەتێکیش بە یەکجار دانەبەزیوە، یان لە سورەتێکدا چەند ئایەتی مەککیی و مەدەنیی تیایە، یان سورەتێك مەککیە، کەچی ئایەتەکانی بە یەکەوە دانەبەزیوە، پاشان لکێنراون بە یەکەوە و پێکەوە کۆکراونەتەوە و پێغەمبەر فەرموویەتی ئەم ئایەتە بخەنە سەر ئەو سورەتە و ئەو جێیە لەو سورەتە، یان هەندێ ڕۆژهەڵاتناس ویستوویانە دیراسەی سەردەمی دابەزینی ئایەتەکان بکەن، بە ناوبانگترینیان (تیو دور نولدەك)ە لە کتێبی (مێژووی قورئان)دا.

ڕۆژهه‌لاتناسی ئینگلیزی (ریشارد بل) دیراسه‌یه‌کی کردووه و قورئانی وه‌رگێڕاوه‌ته سه‌ر زمانی ئینگلیزیی و له ئایه‌ته‌کانی کۆڵیوه‌ته‌وه و ده‌یه‌وێت هۆی دابه‌زینیان (ئه‌سباب نزول) دیاری بکات، به گوێره‌ی مانا و بابه‌ت و شێواز و جۆری گونجاندن، ئه‌م که‌سه تواناییه‌کی زۆری به‌کارهێناوه و ئه‌سباب نزوله‌کانی جێی پرسیاره و ئه‌حکامه‌کانیش کۆتانین.

ڕه‌نگه هه‌ر ئه‌و گرفتانه بێت که له گرنگترین ئه‌و هۆیانه‌ن که وای له مێژوونووسانی ژیانی پێغه‌مبه‌رمان کردووه که به جوانیی و ڕێك و پێك و وه‌ك خۆی سوود له دیراسه‌کردنی قورئان نه‌بینن بۆ نووسینه‌وه‌ی سیره، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی که گرنگترین و مه‌زنترین و چاکترین سه‌رچاوه بۆ ژیانی پێغه‌مبه‌ر و بانگه‌وازه‌که‌ی، قورئانه.

هه‌ندێ له زانایانی فه‌رمووده، به‌تایبه‌تی ڕۆژهه‌لاتناسی وه‌ك (شبرنجر وموير و كايتانی و بوهل) چاری ئه‌وه‌یان کردووه و سودیان له قورئان وه‌رگرتووه له نووسینه‌وه و توێژینه‌وه‌ی ژیانی پێغه‌مبه‌ردا، به‌لام له عه‌ره‌ب و موسڵمانان که‌سی وا نییه جگه له (محمد عزة دروزة) له دوو کتێبه‌که‌یدا (عصر الرسول و بيئته) و (سيرة الرسول)، وه (موحه‌ممه‌د حه‌سه‌نین هه‌یکه‌ل) له (حياة محمد)دا.

فه‌رمووده و سوننه‌ت: سوننه‌تی پێغه‌مبه‌ر بریتییه له‌و وتار و گوفتار و بڕیارانه‌ی که پێغه‌مبه‌ر کردوونی، یان فه‌رموویه‌تی، یان بینیویه‌تی و هیچی له‌باره‌وه نه‌وتووه، ئه‌وانه هه‌موو بوونه‌ته فه‌رمووده و سوننه‌ت بۆ پێغه‌مبه‌ر، ئه‌وانه له قورئان جیاوازن، چونکه قورئان به له‌فز و مه‌عنا له‌لایه‌ن خواوه دابه‌زیوه، به‌لام فه‌رمووده ئه‌زموونی ڕۆژانه‌ی پێغه‌مبه‌ره و وتوویه‌تی، یان کردوویه‌تی، سوننه‌ت له سه‌رده‌می پێغه‌مبه‌ردا نه‌نووسرایه‌وه، گێڕانه‌وه‌یه و پێغه‌مبه‌ر و عومه‌ری کوڕی خه‌تاب ڕازی نه‌بوون که خه‌ڵکی بینووسنه‌وه، کۆنترین هه‌وڵ که به فه‌رمانێکی ڕه‌سمیی و لیژنه‌ی کۆکردنه‌وه و نووسینی بۆ پێکهێنرابێ، هه‌وڵه‌که‌ی عومه‌ری کوڕی عه‌بدولعه‌زیز بوو له کۆتایی سه‌ده‌ی یه‌که‌می کۆچییدا، کۆنترین فه‌رمووده‌ی نووسراو که تا ئه‌مڕۆ مابێته‌وه (موه‌ته‌ئی ئیمام مالیکه) که به

چەندین جۆر گەیشتۆتە دەستمان، گرنگترینیان گێڕانەوەی (سمنون)ە کە (١٧٢٠) فـەرموودەی تیایـە لـە گێڕانەوەکـەی (موحـەممـەدی کـوڕی شـەیبانی) کـە (١١٧٩) فـەرموودەی تیایـە، (٨٢٢) فـەرموودەی لـە گێڕانەوەکـەی (کفنـون)دا و (٤٢٩) فەرموودە لە گێڕانەوەکەی (سیبانی) و ئەوانی تریشدا هەیە، ئەمە جگـە لـە زۆرێـك لە وتەی سەحابە و تابعین و راو بۆچوونی ئیمام مالیك خۆی.

هـەر یەکـە لـە ئـەبو حەنیفـە و ئـەبو یوسـف و موحـەممـەدی کـوڕی حەسـەنی شەیبانی و ئیمامی شافیعی لەناو کتێبەکانیاندا ژمارەیەك فەرموودە دەهێنن، ئەوانە هـەموو کۆکراونەتـەوە و گێڕراونەتـەوە و سـەنەدەکایان دیـاریکراوە و چـاپکراوە، بەڵام ئەوانە هەموو کەمن، هەموو وتـە و فـەرموودە و کردارەکـانی پێغەمبـەر نـین، جێـی تێبینیـە کـە ئـەو نووسـەرانە فـەقیهن و باسـەکانیان لـە بـارەی گرفتـە فیقهیەکانەوەیـە بـە پلـەی یەکـەم، رەنگـە هـەموو لایەنـە فیقهیەکانیشـیان نەگرتبێتەوە، ئەو فەرموودانەی هێناویانن فیقهین و خزمەتی ئـەو زانستە دەکـەن، کەواتە ئەو فەرموودانە هەموو لایەنـەکانی فـەرموودەکان نییـە، جێگـەی پێغەمبـەر وەکو پێشڕەوو سەرقافڵەی موسڵمانانە وەکو خوا دەفەرمووێ: (لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ) (الأحزاب : ٢١ ).

گرنگیـی جێگـەی سـوننەت و فـەرموودەی پێغەمبـەر لـە شـەریعەتی ئیسـلامدا وایکردووە کە جگە فەقیهەکانی ئیسلام، خەڵکی تریش لە بواری خۆیدا گرنگیـی بـە فەرموودە بدات و توێژینەوەی لەسەر بکەن، یان هەندێ کەس هەندێ وتە بلێن بـە ناوی پێغەمبەرەوە کە هەڵبەستراو بێت، بەو جۆرە وردە وردە فەرموودە لە بـواری فیقهـی جیابێتـەوە و بێتـە جێـی گرنگـی زاناکـان، بەتایبـەتی هـەر لـە سـەردەمی دووەمی کۆچییەوە وردەکاری زیاتر لە فەرموودەدا روویدا و پاکلەمە و بەش بەشی تیـاکرا، لاواز و غـەریب و هەڵبەسـتراوو صـەحیح جیاکرایـەوە، زاناکـان توانایـەکی مەزنیان بەختکرد، گرنگی زیاتریان دایە رەخنە رواڵەتیـەکان، نـەك نـاوەڕۆك، واتـە زاناکـان لەسـەر گێڕانـەوە و راوی و سـەنەدەکان وەسـتان، نـەك لەسـەر دەقـی فەرموودەکان، ئـەوە وایکـردووە کـە زۆر لـە فـەرموودە بـە غـەریبیی بمێنێتـەوە و

نەبووە هۆی غەریبەلەکردنی فەرموودە و پاککردنەوەی، کە پاشتر بووە هۆی ئەوەی زۆر فەرموودە بەردەوام جێی قسە و وتوێژبێت لە رووی راستی و تەواوییەوە..!

گرنگترین ئەنجامی فراوانبوونی فەرموودە و جیابوونەوەی لە فیقھ و غەریبەلەنەبوونی و کۆنەکردنەوەی کۆمەڵە فەرموودەی وەکو شەش صەحیحەکەی بوخاری و موسلیم و تورموزی و ئیبن ماجە و ئەبی داود، با موەتەئی ئیمام مالیکیشی بۆ زیاد بکەین، موسلیم و بوخاری جێگەی تایبەتیان هەیە، چونکە زۆر گرنگییان داوە بە وردەکاریی و توندبوون لەوەی خراپی تێنەکەوێت.

ئەو کتێبانەی باسیان لە سیرەی پێغەمبەرو کارو کردەوە و فەرموودە و بڕیارەکانی کردوە، سیاسی بێت یان کۆمەڵایەتیی و ئیداریی و ئابووری، ئەوە ناوکرۆکی مێژووە، ئەو فەرموودانەی کە پەیوەستن بە ژیانی پێغەمبەرەوە زۆر جیاوازییان نییە لەو باسانەی مێژوونووسانی سەردەمی یەکەم هێناویانە.

جێی تێبینیە کە خاوەنانی کتێبی سەحابەکان نەیانتوانیوە دەرچن لە کاریگەیری فەقیهەکان کە گرنگی زیادیان داوە بە گرفتە فیقهیەکان و شێوازی کتێبەکانیان لەسەر ئەو رەوتە کۆنە رێکخستووە، لە کتێبە فەرموودەکان تەنها دەقی فەرموودە و سەنەدەکانیان هێناوە، هیچکامیان کاری شیکاری و شیکردنەوە و تەفسیرکاریان نەکردووە، کتێبەکان هەر کۆمەڵە دەقێکن و هیچی تر، ئەو کارە بۆ فەرموودە ناتەواوە، هەر دەبێ لە سەر ئەو تەرزە ئەو فەرموودانە شیبکرێنەوە و تەفسیر بکرێن و پەیوەندییان بە یەکەوە رێکبخرێت کە ئەوان کردویانە، زۆر زانای کۆن هەندێ شەرح و تەفسیریان بۆ فەرموودە کردوە، بەڵام هەوڵدانێکی تەواو جددییان بۆ دەستخستنی پەیوەندی و کاتی وتن و هۆی وتنی فەرمودە بە پێی رێڕەوی ژیاننامەی پێغەمبەر نەکردوە، هەوڵنەدراوە بزانن لە چ کەش و هەوایەکدا ئەو فەرموودەیەی وتووە، واتە وێنەیەکی بارودۆخی وتنەکە و رێکخستنێکی زەمەنی و سەردەمی دابەزین و پەیوەست بە کاتەکان دەربخرێ، ئەوکاتە گرنگی تەواوی فەرمودە دەردەکەوێت، ئەوە وایکردووە کە زەحمەتێکی

قورسیان لەبەردەم لێکۆڵەرەوانی مێژوودا والآکردووە، چونکە هەوڵی کۆنەکان لە فەرموودەدا کورتکراوەتەوە لە شەرحکردنی هەموو فەرموودەکاندا، بەبێ شیکردنەوە و پەیوەستکردنی بە غەیری خۆیەوە، لەبەر ئەوە هەوڵەکانیان پارچە پارچەیە و مێژوویەکی پێکەوە بەستراوی نییە، هەر بۆیە هەوڵی کۆکردنەوە و نووسینی سوننە و سیرە بەروونی دیارە نوقسان و کەم و کورتی پێوە دیارە.

ئەم گرفتانە لە گرنگترین ئەو هۆکارانەن کە وایکردووە رۆژهەڵاتناسان و نوسەرو خوێنەرانی ژیانی پێغەمبەر کە باسەکان دەخوێننەوە تووشی ناکۆکی و جیاوازیی و نەزانی و ئاڵۆزی ببن و هەندێکجار بیانخاتە هەڵەوە، وەك چۆن دکتۆر جەمال دەڵێ: دوای مردنی عەبدوڵلا بە پێنج ساڵ، پێغەمبەر لە دایك بووە و گومانی خراپ دەوروژێنێ. ئەم گرفتانە لە گرنگترین ئەو هۆکارانەن کە وای لە خوێنەرانی ژیانی پێغەمبەر کردوە ناتوانن سودی تەواوی لێببینن، یان بە هەڵە بابەتەکان لێکدەدەنەوە.

مێژوونووسان: ئەو نووسراوە مێژووییانەی لەسەر ژیانی پێغەمبەر نووسراون کە بە کتێبەکانی (سیرة) ناسراون، گرنگییان داوە بە نووسینەوەی ژیاننامەی پێغەمبەری ئیسلام، ئەم کارو هەوڵە لە دوای ناوەڕاستی سەدەی یەکەمی کۆچییەوە سەری هەڵدا، واتە دوای وەفاتی پێغەمبەر بە (٥٠) ساڵ، یان زیاتر، ئەوانەی بەشداربوون لە نووسینەوە عەرەب و غەیرە عەرەبیشی تیابوو، لە سەرەتاوە بە سادەیی نووسراوە، هەرچەند هەر لایەنێکی کرداریی پێغەمبەریان دەنووسی، ئەویش لەژێر کاریگەریی فیقە و کارە بەڕێوەبردنەکاندا گرنگی دەدا بە لیستی ناوی موسڵمانانی سەرەتا، یان بتپەرستەکانی کە لە غەزاکاندا بەشداربوون، یان باسی هەندێ لە حوکمەکانی پێغەمبەر و رووداوو دادوەرییەکان کراوە، ئەویش بە شێوازێکی زۆر سادە و روون و چیرۆك ئامێز، لە کاتی سەیرکردنی رووداوەکاندا هەندێ سروود و هۆنراوەشیان نووسیوە، بە گشتیی باسەکان پچڕ پچڕ و هیچ پەیوەندییەکی وایان بەیەکەوە نیە، گرنگیان بە سەنەد و شایانێکەوە نەدەدا.

**ئیبان کوڕی عەباس:**

یەکەم کەس کە هەوڵی نووسینەوەی سیرەی دا، ئیبانی کوڕی خەلیفە عوسمانی کوڕی عەفان بوو، ساڵی (٢٠)ی کۆچیی لە دایك بوو، لە سەردەمی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان، خەلیفەی ئەمەویدا ئیبان کرایە والی مەدینە و حەوت ساڵ لەو پۆستەدا مایەوە، هەموو ساڵێك ئەمیرایەتی حەجی لە ئەستۆدابوو، پەیوەندی چاکی لەگەڵ سەحابە و تابعینەکاندا هەبوو، لە خەلافەی وەلیددا وەفاتی کرد، وەکو بوخاری دەیگێڕێتەوە، بەڵام ئیبن سەعد دەڵێ لە سەردەمی یەزیدی دووەمدا وەفاتی کرد، هەندێ فەرموودەی لێدەگێڕنەوە کە نیشانەیە لەسەر ئەوەی کە پلە و پایەی هەبووە لە ناو ئەوانەی فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، حەزی لە سوعبەت و شیعر بووە، تەبەری لە مێژوو و تەفسیرەکەیدا باسی کردووە، مالیك لە موەتەئەکەیدا باسی هێناوە، ئیبن سەعد لە (طبقات)دا ناو بردووە، بەڵام ئیبن ئیسحاق و واقیدی هیچیان لێ نەگێڕاوەتەوە.

**عوروە کوڕی زوبەیر:**

دوای ئیبان دێت، وەك کات، عوروە کوڕی زوبەیر کوڕی عەوام ساڵی (٢٣) کۆچیی لە دایك بووە، ساڵی (٩٤) کۆچیی وەفاتی کردووە، ژیانی لە شاری مەدینە بەسەربردووە، حەزی لە زانست و زانیاریی بوو، چەند هاوڕێیەکی هەبوو لە بازنەی دانیشتنی مزگەوتی مەدینەدا دادەنیشتن و ئالوگۆڕی هەواڵ و ڕووداوەکانیان دەکرد، لە ناویاندا عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان هەبوو پێش ئەوەی ببێ بە خەلیفە، عوروە خۆی لە سیاسەتەوە نەدەگلاند، هەروەك دوو براکەی عەبدوڵڵا و موسعەب، لەبەر ئەوە لای ئەمەوییەکان بەڕێز و خاوەن پایە بوو، حەوت ساڵ لە میسر بوو، پاشان چوو بۆ شام، ئەمە لە سەردەمی عەبدولمەلیك و وەلیددا بوو، یەکێك بوو لە حەوت فەقیهەکەی مەدینە، کە بەناوبانگ بوون لە فەرموودەناسییدا.

عوروە زانیارییەکانی لەسەر مێژووی پێغەمبەر دەنووسی بە شێوەی وەڵام کە عەبدولمەلیك و ئیبن ئەبی هەنیدە نووسەری وەلید پرسیاریان لێدەکرد لە بارەی کۆچ بۆ حەبەشە و کۆچ بۆ مەدینە و غەزای بەدر و فەتحی مەککە و وەفاتی خەدیجە و ژنهێنانی پێغەمبەر لە خوشکی ئەشعەس کوڕی قەیس، ئەویش وەڵامی

دەدايەوە، پاشان نووسینەکانی بە چەند پارچە شیعرێك جوان دەکرد، بەلاّم زۆر گوێی بە پیاوانی گێڕاوە نەدەدا کە بۆیان گێڕاوەتەوە.

**شەرحەبیل کوڕی سەعد:**

شەرحەبیل کە مەولای بەنی خەتمەیە، لە کۆتایی سەردەمی عومەردا لە دایك بووە، ساڵی (١٢٣)ك وەفاتی کرد، دوای ئەوەی کە تەمەنی بووە (١٠٠) ساڵ ئەنجا مرد، سوفیان کوڕی عیینە لە بارەیەوە دەڵێ: "هیچ کەس نەبوو هێندەی ئەو لەبارەی غەزای بەدرەوە بزانێ، بەلاّم تاوانبار کراوە لەو باس و خواس و ئەمانەتەی کە لای بوە"، لەبەر ئەوە ئیبن ئیسحاق و واقیدی لێیان وەرنەگرتووە و نەگێڕاوەتەوە، بەلاّم ئیبن سەعد تەنها یەك فەرموودەی لێگێڕاوەتەوە.

**وەهب کوڕی مونەبیە:**

بەو نووسینانەیدا ناودارە کە لە بارەی گەلان و میللەتەکانی کۆنەوە نووسیویەتی، لەسەر ژیاننامەی پێغەمبەریش هەندێ نووسینی هەیە، ئەو باس لە کۆبوونەوەکانی داری نەدوە و کۆچ و غەزای بەنی خەیسومەی کردووە.

**ئیبن حەزم:**

ناوی عەبدوڵلای کوڕی ئەبوبەکری کوڕی عومەری کوڕی حەزمە، باپیری والی بووە لەسەر نەجران کە پێغەمبەر لە سەردەمی خۆیدا دایناوە، باوکی قازی مەدینە بووە، پاشان بووە والی مەدینە لە سەردەمی سولەیمان کوڕی عەبدولمەلیك و عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا، بەلاّم عەبدوڵلای کوڕی ئەبوبەکر هیچ پلەیەکی فەرمیی وەرنەگرتووە، بەڵکو گرنگیی داوە بە نووسینەوەی فەرموودە و باسی غەزاکان و سەردەمی لاوێتی پێغەمبەر و ساڵەکانی یەکەمی ژیانی و نوێنەرەکانی هۆزەکان بۆ لای پێغەمبەر، چەند هەواڵێکی لە هەڵگەڕانەوەی هۆزە عەرەبیەکان لە سەردەمی ئەبوبەکر و دواڕۆژەکانی عوسمان باسکردووە، چەند نامەیەکی پێغەمبەری باسکردووە بۆ هەندێ لە خەڵکی یەمەن، بۆ عەمری کوڕی حەزم، زۆربەی هەواڵەکانی لە خاڵۆژنی وەرگرتووە کە ناوی (عەمرە) بووە، گرنگیی

نەداوە بە سەنەد و گێڕانەوەكان و كەم باسیان دەكا، بەڵام شیعر دەگێڕێتەوە لە غەزاكاندا.

**عاصم كوڕی عومەری كوڕی قەتادەی زەفەری ئەنصاریە:**

ئەمیش پلەیەكی رەسمیی (فەرمیی) نەبووە، بەڵام چەند جارێك چووەتە كۆشكی پاشایانی ئەمەوی و هەندێ پارە و یارمەتیی وەرگرتووە، لە سەردەمی عومەری كوڕی عەبدولعەزیزدا باسی غەزاكانی بۆ خەڵكی دیمەشق دەكرد، گرنگی دەدایە هەواڵەكانی گەنجی و لاویی پێغەمبەر و سەردەمی قۆناغی مەككە، زۆر گوێی دەدایە ناوی سەنەدەكان، هەواڵەكانی بە هەندێ شیعر دەڕازاندەوە و هەندێك جاریش رای خۆی دەوت.

**زوهەری و قوتابیەكانی:**

زوهەری لە ناودارترین مێژوونووسانی سیرەیە، ناوی موحەممەدی كوڕی موسلیمی زوهەرییە كە ساڵی (٥٠) كۆچیی لە دایك بووە، قورەیشیە و لە هۆزی زوهرەیە، باپیری ئەم لە جەنگی ئوحوددا پێغەمبەری بریندار كرد، بەڵام باوكی زۆر پڕپوو لە ئیبن زوبەیر كە دژی ئەمەویەكان كاری دەكرد، ئەم مێژوونووسە پەیوەندیەكی باشی بە ئەمەویەكانەوە هەبوو، بە نوێنەری نێردرا بۆ لای عەبدولمەلیك و لە دیمەشق نیشتەجێ بوو، ئەمەویەكان مانگانەیەكی دیاریكراویان بۆ دانابوو، بەڵام پاش ماوەیەك پەیوەندیی لەگەڵیان خراپ بوو، گەڕایەوە حیجاز، زوهەری لە بارەی زۆر بابەتەوە نووسیویەتی، ساڵنامەیەكی ژیانی خەلیفەكان و تەمەنیانی نووسیوە، لە بارەی ژیانی پێغەمبەرەوە چاكی نووسیوە، نووسینەكانی ئەم زۆر چاك لە ناو مێژووەكەی تەبەری و ئیبن سەعددا دیارە كە لێیان وەرگرتووە، ئەو زیاتر لەسەر یەك رووداو دەینووسی و ناوی سەنەد و راوی و گێڕەرەوەكانیشی كۆدەكردەوە و یەكی دەخست، پاشان باس و هەواڵ و رووداوەكەی دەنووسی، ئەو وردەكاریی لە سەنەددا نەدەكرد و شیعری دەخستە ناو گێڕانەوەكانی.

زوهەری چەند قوتابییەکی ناوداری هەبوو، هەموویان لە غەیرە عەرەب بوون، گەورەترینیان موسای کوڕی عەقەبەیە کە ساڵی (٥٠) کۆچیی لە دایك بووە، لای ئیبن زوبێرەکان بوو، هیچ پلەیەکی دەسەڵاتی وەرنەگرتبوو لە ئەمەویەکان، هیچ لە کتێبەکانی نەگەیشتۆتە ئێمە جگە چەند پارچەیەك، باسەکانی لەسەر غەزاکان و کۆچەکان نووسیبوو، لە زوهەرییەوە باسەکانی دەگێڕایەوە، ئەبو سەعد زۆر هەواڵی لێوەرگرتووە، بەتایبەتی لە بەرگی سێیەم و چوارەم لە (طبقات)ەکەیدا، لەو وەرگرتنانەدا دەردەکەوێ کە کتێبەکەی لیستی زۆری تیایە لەسەر ناوی کۆچکەران بۆ حەبەشە و ناوی بتپەرستەکان و ناوی ئەوانەی بەیعەتی عەقەبە و جەنگاوەرانی بەدر، گرنگیی داوە بە مێژووی خەلیفەکانی راشیدین و ئەمەوی، گرنگیی باشی داوە بە سەنەد و گێڕەرەوەکان و راویەکان، پاشان باسەکانی بە تێهەڵکێشردنی شیعر رازاندووەتەوە، تەبەری و واقیدی لە باسەکانیاندا پشتیان پێبەستووە.

**ئیبن ئیسحاق:**

جێیەکی تایبەتی هەیە لە ناو مێژوونووسانی سیرەی پێغەمبەردا، لەگەڵ ئەوەی کە ئەوانەی هەتا ئێستا نووسینیان بە ئێمە گەیشتووە لە رێگەی ئیبن هیشام و تەبەرییەوە بووە، ئەو هەتا سەردەمی خۆی لە زۆرترین ئەوانە نووسینی هەبووە کە لەبارەی سیرەی پێغەمبەرەوە نووسیویەتی، سیرە لای ئەو بەشێکە لە مێژووی جیهان و بەردەوام بوونی، تەنانەت ئەو سوودی لە نووسراوەکانی ئەهلی کیتاب وەرگرتووە، لەگەڵ ئەوەی کە سەنەد و راویەکانی ناوبردووە، شیعریشی لە نووسینەکانیدا هێناوە، ئەو شێواز و رێیەی ئەم بەکاری هێناوە، تێکەڵەیەکە لە رێ و رەچەی فەرموودە کۆکەرەوەکان، هەرچی رۆژگاری عەرەبی هەبووبێ گێڕاویەتەوە، سەرەتا ئیبن ئیسحاق مەولایەکی دەستبەسەر بووە لای (یەسار) کە لە ئەسیرەکانی (عەین تەمر) بووە، ئەوانەی کە خالیدی کوڕی وەلید لە عێراقەوە بە گیراوی هێنانی بۆ مەدینە، کوڕی ئەو ناوی موحەممەد بوو، ساڵی (٨٥) کۆچیی لە دایك بوو، گرنگیی دەدا بە فەرموودە، لە باوکیەوە هەواڵی دەگێڕایەوە، پاشان

پەیوەندی کرد بە چەند زانایەکی وەکو عاصم کوڕی عەمر و عەبدوڵلای کوڕی ئەبوبەکر و زوهەریەوە،ساڵی (١١٥) کۆچیی چوو بۆ ئەسکەندەریە و هەندێ باس لە یەزیدی کوڕی ئەبی حەبیبەوە دەبیستێت، پاشان دەچێت بۆ مەدینە و سوفیانی کوڕی عوەینەی بینی، بەڵام هیشامی کوڕی عوروە و مالیکی کوڕی ئەنەس دوژمنایەتیان کرد، ئیتر کۆچی کرد بۆ کوفە و جەزیرە و ڕەی و بەغداد، پەیوەندیی بە ئەمەویەکانەوە نەکرد، کاریگەریش نەبوو بە عەباسیەکان، بەڵام ناوی عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیبی بردووە کە باپیرە گەورەی عەباسیەکان بوو لەناو ئەسیرەکانی بەدردا.

کتێبەکەی ئیبن ئیسحاق لە بارەی سیرەوە سێ بەش بووە، بەم شێوەیە: (دەست پێکردن، بوون بە پێغەمبەر، غەزاکان) هەتا ئێستا ئەم کتێبەمان راستەوخۆ نەدیوە، بەڵام لە گێڕانەوەکانی (ئیبن هیشام)دا باسی لێ هێناوە، هەندێ پارچەی لەو کتێبە گواستووەتەوە، بەڵام مێژووی ئەهلی کیتابی لابردووە، لە ئادەمەوە بۆ ئیبراهیمی باسکردووە، پاشان لە نەوەی ئیسماعیل تەنها باسی باپیرانی پێغەمبەر هاتووە، ئەوانەی لابردووە کە پەیوەندییان بە موحەممەد پێغەمبەرەوە نییە، تەنانەت وەڵامی توندی هەندێ لەو باسانەی داوەتەوە کە ئیبن ئیسحاق هێناویەتی، بەتایبەت لە شیعرەکان، یان ئەو باسانەی کە خەڵکی زویر دەکات، ئازاریان دەدات، بەڵکو ئیبن هیشام زۆر زانیاری بۆ زیادکردووە، زۆری زیاد کردووە لە ئەنساب و لایەنی زمانی، خۆی باسی زیادکردن و لابردنەکانی کردووە، بەڵام (تەبەری) لە مێژووەکەیدا و لە تەفسیرەکەیدا زۆری لە زانیارییەکانی ئیبن ئیسحاق هێناوە کە ئیبن هیشام لای بردوون لە هەواڵ و ڕووداوەکان. (ئەزرەقی) زۆری نووسیوە لەوانەی کە ئیبن هیشام لای بردوون لە باسی مەککەدا، دەتوانین بەشی دەستپێکردنەکەی بکەین بە چوار بەشەوە:

یەکەم: دەست پێدەکات لە دروستبوونی بوونەوەر و سەرهەڵدانی ژیانەوە، هەتا سەردەمی حەزرەتی مەسیح، ئەویش سوودی لە گێڕانەوەکانی (وەهبی کوڕی

منجـو) و (ئـيبن عـەباس) و هەواڵـەکانی گـاور و جولەکـە و دەقـەکانی کتێبـە پیرۆزەکان و عەرەبە بائدەکان و ئەو باسانەی کە لە قورئاندا هاتووە، بینیوە.

دووەم: باسی مێژووی یەمـەن و چیرۆکی ئەسـحابی ئوخـدود و ئەسـحابی فیـل دەکات.

سێیەم: باسی هۆزە عەرەبیەکان و ئەو بتانەی دەیانپەرست دەکات.

چوارەم: ئەم بەشەی داناوە بۆ باسی بـاپیران و بنەماڵـەی پێغەمبـەر و ئـایینی خەڵکی مەککە، لـە بەشـی دەسـتپێکردنندا ئـیبن ئیسحاق زۆر کـەم گـوێی داوە بـە گێڕانەوەی سەنەدەکان و لیستی ناوی موسڵمانە یەکەمـەکان و کۆچـەران و یەکـەم بڕواداران لە ئەنسار و بتپەرستان و ئەوانەی بەیعەتیان دا لە عەقەبەو برایەتیەکـەی شاری مەدینە و بەڵگەنامەکەی (وثیقة)ی پێغەمبەر لە مەدینەدا.

بەشـی سـێیەم باسـی غـەزاکان دەکـات و گرنگیـی باشـیان پێـدەدات و نـاوی سـەنەدەکان و پشتبەسـتنی بـە سەرچـاوەی زوهـەری و عاصـم کـوڕی عومـەر و عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکر دەکات، چەند لیستێك دەهێنێ بـۆ نـاوی بتپەرستەکانی کە لە جەنگی بەدردا بەشدار بوون، لیستی ناوی کوژراو و بریندار و بەنـدکراوەکانی جـەنگی بـەدر و ئوحـود و خەنـدەق و خەیبـەر و موئتـە و تـائیف و کۆچـەران بـۆ حەبەشـەی هێنـاوە، ئـیبن ئیسـحاق چـەند قوتابیـەکی هـەبوو، بـەناوبانگترینیان (بەکائی) بوو کە ئیبن هیشام لە بارەیەوە چەند هەواڵێك دەگێڕێتەوە.

**واقیدی:**

واقیدی و ئیبن ئیسحاق دوو نووسەری تەنهان کە نووسراوەکانیان پارێزراوە لە فەوتان، ناوی واقیدی (موحەممەدی کـوڕی عومـەر)ە، مـەولای ئەسـلەمیەکان بـوو، ساڵی (١٣٠) کۆچیی لە مەدینە لە دایك بـوو، گـوێی لـە گـەورەرین زانـای فـەرمودە دەگـرت و فەرمودەیـەکی زۆری گێڕاوەتـەوە، کەسـێکی شـوێنەوارناس بـووە، ڕێ پیشاندەری (هارونە ڕەشید) بووە لە حەجەکەیدا، ئیتر لەوێوە پەیوەندیی کـرد بـە بەرمەکیەکانەوە و خەلیفەکانی عەباسی ناسی، ڕەشید و مەئمون دایاننا بـە قـازی، کتێبی زۆری هەیە لەسەر فیقه و مێژوو و فەرمووده، باسێکی تێر و تەسەلی لەسەر

مێژووی مەککە و مەدینە و ژیاننامەی پێغەمبەر و ژیانی ژنەکانی و هەتا وەفاتی پێغەمبەر، باسی ئەوس و خەزرەج و خەلیفەکان و جەنگی جەمەل و سەفین و حەسەن و حوسەین و غەزەواتی شام و عێراق و زۆر شت دەکات، سەدان کتێبی هەیە، زۆربەی زۆری مامۆستایانی واقیدی خەڵکی مەدینەن، وەك: زوهەری و مەعمەر و ئەبو مەعشەر و موسای کوڕی عەقەبە، گرنگیی زۆری داوە بە غەزاکان و شێوازێکی تایبەتی هەیە لە نووسین و کۆکردنەوەی هەواڵ و فەرموودەدا، بە وردی باسی ساڵەکانی دەرچوونی پێغەمبەر و گەڕانەوەی لە مەککە دەکات، هەندێ جار رای تایبەتی خۆی هەبووە لە رووداوەکاندا، بە ئاشکرا مەیلی بە لای عەباسیەکاندا دیاری دەکات لە رووداوەکاندا، ناوی (عەباس)ی باپیریانی لە لیستی ئەسیرەکانی بەدر لادەبات، زۆر لە نوسەران بڕوایان بە هەندێ لە گێڕانەوەکانی ئەم نیە رەدیان کردوەتەوەو خراپ باسیان کردووە کە تاکە کەسە کە زۆرترین باس و خواسی لاوازو بێبناغەی هێناوەتە ناو مێژووی ئیسلام[1].

**ئیبن سەعد:**

موحەممەدی کوڕی سەعدساڵی (١٦٨) کۆچیی لە بەسرە لە دایك بووە، ماوەیەك لە مەدینە ژیاوە، دوو کتێبی لەسەر سیرە و (طبقات) نووسیوە، قوتابیەکانی گێڕاویانەتەوە دوای خۆی، ئیبن سەعد لە بەرگی یەکەمی (طبقات)دا باسی باپیرانی پێغەمبەر و منداڵیی و بانگەواز و کۆچی بۆ مەدینە دەکات، پاشان باسی قۆناغی مەدینە و ئیش و کار و نوێنەری هۆزەکان دەکات، لە بەرگی دووەمدا باسی خوو رەوشتی پێغەمبەر دەکات، باسی سەفیرو نوێنەرەکانی پێغەمبەر بۆ پاشایان و گەلان دەکات، باسی نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی دەکات، بۆچوونێکی تایبەتی لەسەر مێژوو هەیە، هەتا ئاستێکی باش بەهێزە، لە مێژووەکەیدا زۆر گوێی داوە بە وردەکارییەکان و ئیدارەکردن و باری کۆمەلایەتیی و ئابووریی و سیاسیی، جەنگەکانیشی فەرامۆش نەکردووە.

---

[1]. (کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا)، ل .

ئیبن سەعد لە باسی باپیرانی پێغەمبەردا پشت بە نووسراوەکانی ئەهلی کیتاب و (کەلبی) دەبەستێ، بەڵام بۆ ژیاننامەی پێغەمبەر بە پلەی یەکەم پشت بە (واقیدیی) دەبەستێ، زانیاری تریش لە ئیبن ئیسحاق و ئەبی مەعشەر و موسای کوڕی عەقەبە وەردەگرێ، ئەم نووسەرە گرنگیی دەدا بە پیاوانی گێڕەرەوە و سەنەد و هەندێ هۆنراوەیش دەهێنێ.

**گێڕانەوەکەی ئیبن نەدیم:**

ئیبن نەدیم باسی کۆمەڵێك نووسەر دەکات کە لە بارەی پێغەمبەرەوە نووسیویانە، ناوی کتێبەکانیشی بردوون، رەنگە گرنگترینیان (عەلی کوڕی موحەممەدی مەدائینی) بێت کە چەند کتێبی نووسیوە لە بارەی پێغەمبەر و دایکە شیریەکانی و بنەماڵەکەیانەوە، باسی هەواڵی دووڕووەکان و ناویان و ئەوانەیان کە ئایەتیان لەبارەوە دابەزیوە، ناوی ئەوانەی ئازاری پێغەمبەر یان گاڵتەیان بە پێغەمبەر و قورئان کردووە، نامەکانی پێغەمبەر بۆ هۆز و میر و پاشایان، نامەی ئەوانیش بۆ پێغەمبەر، باسی ناردنی سریەکان و ئەو نوێنەرانەی سەردانی پێغەمبەریان کردووە، پاشان باسی دوعا و نزا و پاڕانەوەکانی پێغەمبەر و هەواڵی هەڵبەستراوی (ئیفك) لەسەر عائیشە و باسی ژنەکانی پێغەمبەر و کاربەدەستەکانی سەدەقات و ئەو نەهیانەی کە کردوویەتی و پارەکانی و نووسراوەکانی و ئەوانەی سوودیان بۆی هەبووە و مۆرەکەی و وتارەکانی هەمووی بە وردی نووسیوە.

لەو باسەدا ئەوە دەردەکەوێ کە (مەدائینی) گرنگیی چاکی داوە بە لایەنی کۆمەڵایەتیی و بەڕێوەبردن، بەڵام بەداخەوە یەکێك لە کتێبەکانی مەدائینی بە خەتی خۆی، یان لەبەرگرتنەوە بە تەواوی نەماون و پارێزراو نین هەتا راستەخۆ سوودی لێببینین، نووسەران هیچ دەستنیشانێکیان بۆ نەکردووە، ئەو نووسەرانەی کە باسیان لەو بابەتانە کردووە باسی هیچ هۆیەکیان نەکردووە کە بۆچی باسی نەکراوە و سوودیان زۆر لێنەبینیوە و ناویان نییە.

ئیبن نەدیم ناوی چەند دەستنووس و نووسراوێك دەبات کە لەبارەی ژیاننامەی پێغەمبەرەوە نووسراوە، وەك: ١- المغازي للوليد بن مسلم. ٢- صفة النبـي لأبي

البحتري. ٣- المغازي لنجيح المدني. ٤- المغـازي النبــي و سـراياه و ذكـر أزواجـه لأحمد بن الحارث الخزاز. ٥- المغازي لأسماعيل بـن اسـحاق القاضـي. ٦- المغـازي لعبدالملك بن عمرو بن حزم. ٧- المغازي لأبراهيم الحربـي. ٨- المغـازي لعبـدالرزاق الصفاني. ٩- كتاب الوفود للهيثم بن عدي. ١٠ كتاب مزاح النبــي للـذبير بـن بكـار. ١١- كتاب المبدأ والمبعث والمغازي والوفـاة والسـقيفة والـرّدة لأبـان بـن عثمـان بـن يحيى بن ذكرى اللؤلؤى الاحمر البجلي[1].

**گێڕانەوەکانی یاقوتی حەمەوی:**

جگە لەو نووسراوانەی باسمان کرد، یاقوتی حەمەویش ناوی کتـێبی تـر دەبـات کە دیویەتی لەسەر ژیانی پێغەمبەر بەدەستنووسی نووسراوە و بینراوە، وەك:

١- کتێبی تەفسیری ناوەکانی پێغەمبەر (کتاب تفسير أسما ء النبــي)، کتـێبی (سيرة النبــي) کە هەردووکیان نووسراوی ئەحمەدی کوڕی فارسی لغەویە.

٢- (کتــاب مغــازي النبــي) و (کتــاب بنــات النبــي و أزواجهــم) هــەردووکیان نووسراوی ئەحمەدی کوڕی عەبدوڵڵای روقیە.

٣- (کتاب اخبار النبـي و مغازيه و سراياه) نووسراوی ئیسماعیلی کوڕی مجمـع الأخباري.

٤- (کتاب المغازي لعلي بن ابراهيم القمي)[2].

**گێڕانەوەکانی سەخاوی:**

سەخاوی دەگێڕێتەوە کە هەندێ کەس لەسـەر پێغەمبـەریان نووسیوە، وەك: (ئـیبن حــەبیان، ئـیبن فـارس، ئـیبن حـەزم، ئـەبو ئەحمــەد دمیـاز، عەبدولغـەنی بابولسی، قوتبی حەڵەبی، ئەبو عەبدوڵڵای زەهەبی، ئـەبو فـەتح ئـیبن سـەیدولناس

---

[1] محاضرات في تأريخ العرب، ج١، ص٢٣٨- ٢٥١، ط٢، مطبعة المعارف، بغداد ١٩٥٩، الدكور صالح احمد العلي) (فقه السيرة النبوية، د. محمد سعيد رمضان السيوطي، دار الفكر، بيروت، ط٢٦، سنة ٢٠٠٦، ص١٨...

[2] (معجم الادبا ء)، (ج٤، ص٨٤، ١٣٥) (ج٧، ص٤٥) (ج١٢، ص٢١٥) بروانة ( محاضـرات فـی تاريخ العرب. ص٢٥١).

خاوەنی (عیون الأثر) کە بورهانەدینی حەڵەبی تەعلیقی لەسەر نووسیوە لە دوو بەرگدا و ناوی ناوە (نور النبراس)، عەلاء و عەلی کوڕی ئیبراهیمی بەغدادی، زوهەیر عەلی کوڕی مەحمود کازرونی، بەغدادی موصبی تەبەری، قازی عیزەدین کوڕی جەماعە، شەمس برماوی، عەلاء عەلی عوسمانی تورکمانی حەنەفی، ئەبی ئومامە کوڕی نەقاشی، شەمس کوڕی ناسرەدین، بەرگی یەکەمی (الامتاع) کتێبەکەی مەقریزی چاپکراوە دووەمیان دیار نییە، ئیبن دەباس مارانی کە کتێبێکی هەیە بە ناوی (الفوائد المنيرة في جوامع السيرة)، الأبطیش، ئیبن مەرحەل، جەماعیلی حەنبەلی) ئەمانە هەموو کتێبیان لە بارەی پێغەمبەرەوە نوسیوە.

جگە لەوانە سەخاوی ناوی هەندێ نووسەری تری نووسیوە کە شیعر و مەدیح و سیرەی پێغەمبەریان نووسیوە، وەك: (دلائل النبوة، دلائل النبوية، الشمائل النبوية، الأخلاق النبوي، الهدى)[1].

**گێڕانەوەکانی حاجی خەلیفە:**

حاجی خەلیفە ناوی چەند کتێبێکی بردووە لە شەرحی سیرەی ئیبن هیشامدا وەك: (الروض الأنفی)ی سوهەیلی کە ساڵی (٥٨١) کۆچیی مردووە و (کشف اللثام في شرح سيرة ابن هشام)ی بەدرەدین مەحمود کوڕی ئەحمەدی حەنەف کە ساڵی (٨٥٥) کۆچیی مردووە، وە هۆنراوەی مەدح لەلایەن (ئەبو نەسری خەزراوی و قەسری کە ساڵی ٦٦٣ك مردوە، وە عەبدەلعەزیزی دیرینی کە ساڵی ٦٩٥ك مردوە، ئەبو ئیسحاقی ئەنساری تەلمەسانی، فەتحەدین کوڕی دمیاتی ساڵی (٧٠٥) کۆچیی مردووە، کازرۆنی ساڵی (٦٩٤) کۆچیی مردووە، شاهی کە دەڵێن کتێبەکەی فراوانترین کتێبی سیرەیە، حافزی مغلتای، وە هەردوو ئیبن قتلوبنا و حافز عەبدولموئمن دمیاتی کە ساڵی (٧٠٥) کۆچیی مرد، خەلاتی و ئیبن ئەبی تەی کە

[1] الاعلان بالتونيخ لمن ذم التأريخ، السخاوي، ص٨٧-٩٢. محاضرات، ص٢٥١.

ساڵی (٦٣٠) کۆچیی مرد، ئیبن جەماعەی کەنانی کە ساڵی (٧٦٦) کۆچیی مرد، ئەمانە هەموو لە بارەی ژیاننامە و سیرەی پێغەمبەرەوە نووسیویانە[١].

لە سەدەی سێیەمی کۆچییەوە نووسراوە مێژووییەکان دەرکەوتن کە بە گشتی باسی مێژووی گشتیی ئیسلام بوون، ئەگەرچی هەندێ درێژدادڕیشیان دابوویە، لەوانەیە گرنگترینیان مێژووی یەعقوبی و (مروج الذهب)ی مەسعودی و (تأريخ الأمم والملوك)ی موحەممەد کوڕی جریری تەبەری بێت، کە جێیەکی بەنرخ و تایبەتیان هەیە، لەگەڵ ئەوەی کە پارچە پارچەی زۆریان لەملاو لاوە هێناوە، ئەمانە چەند قات زیاتریان هێناوە لەو مێژوونووسانەی کە پێشتر باسمان کردن، ئەمان بە گوێرەی ریزبەندیی رۆژ و ساڵ و کات و سەردەم هێناویانە و ریزبەندیان بۆ کردووە، دەتوانی بە ئاسانی بەراوردی ئەوە بکەیت، پاشانیش هەموو مێژوونووسانی دواتر پشتیان بە تەبەری بەستووە، وەك ئیبن ئەسیر و ئیبن کەسیر و ئیبن خەلدون و زەهەبیی.

**کتێبەکانی ولاتناسان:**

لە کتێبی جوگرافی ناسەکاندا زانیاری زۆر هەیە لەسەر ئەو شوێنانەی کە پەیوەندییان بە سیرەوە هەیە، زۆرجار هەواڵی گرنگیان داوە لەسەر ژیانی پێغەمبەر و کردەوەکانی، گرنگترینی ئەو کتێبانە (مكة و أخبارها و جبالها وأوديتها - لازرقي) و (مكة و أخبارها في الجاهلية والأسلام - للفاكهي) ئەو دوانە چاپکراون و لەبەردەستدان، (ئیبن نەدیم) ناوی هەندێ کتێبی تری لەو لایەنەوە بردووە، بەلام ونن و دیارنین، وەك کتێبی (ئەبی عوبێدە و واقیدی و مەدائنی و ئیبن شوبهە و ئیبن مخراف و بەلخی و ئەبی ئیسحاقی عەتار) ئەوانە لەسەر شاری مەککە نووسیویانە، لەسەر شاری مەدینەش چەند کتێبێك هەیە، وەك کتێبی (زوبێر کوڕی بەکار و ئیبن شوبهە و مەدائینی و ئیبن زوباله و عوبێدوڵڵای کوڕی ئەبی سەعیدی

---

[١] كشف الظنون، ج ١، ص١٠١٢-١٠١٣. بروانة: محاضرات، ص٢٥٢.

وەڕاق)[1] .ئەوانە هیچیان بە چاپ نەگەیشتوون، جگە کتێبی (وفا ء الوفا ء في اخبار دار المصطفى) نووسراوی (سمهودي) کە زانیاریی گرنگیی تیایە کە وەرگیراوە لە نووسەرە سەرەتاییەکانی سەردەمی یەکەم.

زۆربەی ئەو کتێبانەی ناومان بردن ونن و دیارنین و چاپ نەکراون، لە هەموویان باشتر (سیرەی ئیبن هیشام و مێژووی تەبەری و طبقاتي ئیبن سەعد)ە کە باسی هەموو کتێبە مێژووییەکانی سەردەمی یەکەمی تیایە و نووسەرە دواییەکانیش هەموو زانیارییەکانیان لەمانەوە وەرگرتووە کە زۆر ورد و پاك و چاك باسەکانیان دارشتووە.

**توێژینەوەکانی رۆژهەلاتناسان:**

رۆژهەلاتناسە ئەوروپاییەکانیش کتێبی زۆریان لەسەر پێغەمبەر و ژیان و فەرموودەکانی نووسیوە، لە کاتێکدا کە لێکۆڵینەوەیان لە مێژووی ئیسلام کردووە، گەر بە وردی باس لە نووسراوی زۆربەی ئەوروپیە رۆژهەلاتناسەکان بکەیت بە ئاسانی رەگەزپەرستیی و جیاوازیی ئایینی دەبینی کە زاڵ بووە بەسەر نووسینی زۆربەیاندا، ئەویش لە جیاوازیی بیروڕا و رەگەز و جەنگی خاچپەرستانەوە سەرچاوەیان گرتووە، هەست بە لاوازیی زانیارییان و بڕیاردانیان دەکەیت، چونکە کەمتر لە عەرەبی شارەزان بوون سەرچاوەیان کەم دەستکەوتووە، هەندێکیشیان تێدا هەڵکەوتووە کە بە ئینساف بووە، وەسف و سەنای پێغەمبەر و ئیسلامیان کردووە.

لە سەدەی نۆزدەهەمینی زاینییەوە کە موسڵمانان کەوتنە کۆکردنەوە و نووسینەوە و چاپکردنی دەستنووسە عەرەبییە کۆنەکان، رۆژهەلاتناسانیش زیاتر دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لە مێژووی ئیسلام و رۆژهەلات، رێگەی زانستیی نوێیان بۆ ئەو مەبەستە گرتەبەر، چونکە لە رۆژئاوادا ئەم شێوازە توێژینەوە زانستییە نوێیە پلەیەکی بەرزی بڕیبوو، زۆربەیان رۆشنایییەکی زیاتر و

---

[1] بروانة (الفهرست، ابن نديم، ص٨٠، ١٦٨).

نوێتریـان پـەیـداکرد لەسـەر مێـژوو و خوێندنـەوە و هەڵسـەنگاندنی رووداوەکـان، گرنگییاندا بە زۆر لایەنی ژیانی پێغەمبەر کە هەتا ئەو کاتـە نووسـەرە رۆژهەلاتییـە ئیسـلامییەکان گرنگییـان بـەو لایەنانـە نـەدابوو، بـۆی نەچـووبون و نەیانـدەزانی، هەندێك لەوانە کە زۆر شارەزابوون و توانایەکی فراوان و وردبینیـی و بـیری قوڵیـان بوە، شـتی نوێیـان لـە مێـژوی ئیسـلام و ژیـانی پێغەمبـەر بەرهـەمهێناوە و نرخـی چاکیان داوەتـێ، هەرچەند ناتوانرێ بوترێ کە بۆچوونەکانیان سەد دەرسەد تەواوە و پێکاویانە، لە بەناوبانگترین ئەوانەی لەسەر ژیانی پێغەمبەر شتیان نووسـیوە لـە کۆتایی سەدەی نۆزدەداو سـەرەتای سـەدەی بیسـتەمدا (ولیـەم مویـەر، شـبرتجر، جرمە، کاتیانی) ئەمانە رێبازی حەولیاتیان بەکار بردوە، واتە شێوازی یەك لە دوای یەك و سالْ بەسالْی روداوەکانیان نووسیوە، واتە لە لە دایکبوون تا مـردن، ئەمانـە هەموو گێڕانەوە و ریوایەتە زانراوەکانیان هێناوە، واتە بۆ هەر رووداوێك چـی هەیـە کۆیان کردووەتەوە و ئەوسا لێکیانداوەتەوە و خوێندنـەوەیان بـۆ کـردووە، ئـەوجا رای هەموو رۆژهەلاتناسەکانیان هێنـاوە کـە لـەو بـارەوە قسـەیان بـووە، شـیکاری هـەموویان کـردووە و تێبینیـەکانیان دەرهێنـاوە و هەرچـیان بـۆ هـاتووە لـەو بەرئەنجامـە نووسـیویانە، لەبـەر ئـەوە کتێبـەکانیان لـە فـراوانترین کتێبـەکانن کـە هەموو لایەنێکی ژیانی پێغەمبەریان شـیکردووەتەوە و توێژینـەوەیان بـۆ کـردووە، لەگـەڵ ئـەوەی کـە ئـەوە دوا بـاس نییـە و رای هـەموو لایەنـەکانی لەسـەر نییـە و نەگەیشتوونەتە دوا ئەنجام.

دوای جەنگی جیهانیی یەکەم چەند توێژینەوەیەکی تر لەسـەر ژیـانی پێغەمبـەر دەرکەوت، ئەمە جیاکارییەکی تیابوو لەوانەی پێشوو، میانەڕەوانەتر بوون، جێگای رێـزی هـەموو لا بـوو، بـە جـوانیی لایەنـە رۆحیـی و دەروونییـەکانی پێغەمبـەری شـیکردبوویەوە، سـوودی باشـیان لـە قورئـان و تەفسـیرەکانی وەرگرتبـوو، لـە گرنگترینیان توێژینەوەکانی (بوهل) بوو کە کورتی کردبوویەوە لە بابەتێکدا لەسـەر پێغەمبەر و قورئان لە دائـیرەی مـەعاریفی ئیسـلامیدا هەیـە، (تورئەندریـە) کـە لـە کتێبەکەیـدا (محمـد - الرجـل و ایمانـه) کـە دەتـوانرێ بـە جـوانترین کتـێبی

رۆژهه‌لاتناسان بژمێردرێ له‌و بواره‌دا، هه‌روه‌ها (بیل) كه‌ لـه‌ كتێبه‌كه‌یـدا لـه‌ باسـی (مقدمة القرآن)دا بـۆی چـووه‌، ئه‌مـه‌ نوێخوازیـه‌ك و پێشـكه‌وتنێك و ده‌روازه‌یـه‌ك و ئاسۆیه‌كی چاكی له‌ فكری ئیسلامییدا كرده‌وه‌، هه‌روه‌ك چۆن له‌ قورئاندا هاتووه‌ و ده‌رده‌كـــه‌وێ، (مـــونتجمری وات) لـــه‌ كتێبه‌كه‌یـــدا (محمـــد في مكـــة) زۆربـــه‌ی لێكۆڵینه‌وه‌كانی رۆژهه‌لاتناسانی كورت كردووه‌ته‌وه‌ له‌گه‌ڵ زیاده‌یه‌ك له‌ بۆچـوون و بابه‌تـی به‌نرخ كه‌ بۆی دارێژاوه‌.

**لێكۆڵینه‌وه‌ نوێیه‌كان:**

نزیـك بـه‌ نیـو سـه‌ده‌یه‌ لـه‌ دنیـای ئیسـلامییدا ده‌سـتكراوه‌ بـه‌ گرنگییـدان بـه‌ لێكۆڵینه‌وه‌ی شیكاریی و خوێندنه‌وه‌و ورده‌كـاریی له‌سـه‌ر ژیـانی پێغه‌مبـه‌ر، ئه‌مـه‌ وه‌ك به‌شێك له‌ وریابوونه‌وه‌ و راپه‌ڕینی فكریی و نوێخـوازیی و والأبـون لـه‌ جیهـانی ئیسـلامییدا، گـرنگترین ئـه‌و نووسـراوانه‌ كـه‌ سـه‌رقافڵه‌ بـون و بـۆ دوای خۆیـان و شـتێكیان جولأنـد، (حیـاة محمـد) ی بیریـاری گـه‌وره‌ (موحه‌ممـه‌د حه‌سـه‌نین هه‌یكه‌ل)بوو كه‌ به‌ وه‌رگێڕانـی كتـێبی (موحه‌ممـه‌د)ی (درمنجهـیم) بـه‌ شـێوه‌یه‌كی ته‌ڕو پـاراوو سـه‌رنجراكێش نوسـرابوو، سـه‌ره‌تا بـه‌ زنجـیره‌ لـه‌ پاشـكۆی ئـه‌ده‌بی رۆژنامه‌ی (السیاسة)ی قـاهیره‌دا بـڵاوی كـرده‌وه‌، كـه‌ بـینی مـه‌یل و رووی خـه‌ڵكی زۆری له‌سه‌ره‌ و خه‌ڵكی زۆریش داوایان لێكـرد وه‌ك لـه‌ پێشـه‌كی كتێبه‌كه‌یـدا بـاس ده‌كـات، داوایـان لێكـرد بیكـات بـه‌ كتێـب، دوای ده‌سـتكاری بـاش و جـوان، لـه‌ كتێبێكـی بـه‌رگ گـه‌وره‌دا خستیه‌ كتێبخانـه‌ی ئیسـلامییه‌وه‌، هـه‌تا ئێسـتا ره‌نگـه‌ ملیۆنه‌ها ژماره‌ له‌و (٨٠) چـاپه‌ یـه‌ك لـه‌ دوای یه‌كـه‌ی لـێ ده‌رچـوو بێ، چـونكه‌ بـه‌ شێوازێكی زۆر سه‌یر و ته‌ڕ و پاراو نووسراوه‌ و باسكراوه‌، هـه‌وڵی دابـوو كـه‌ بـیر و هۆشی خه‌ڵكی بوروژێنێ، ئه‌و سـه‌ركه‌وتنه‌ مه‌زنـه‌ گـه‌رم و گـوڕیی زۆری بزوانـد بـۆ نووسه‌رانی دوای خۆی، وه‌ك: (ته‌ها حسێن و عه‌باس مه‌حمود عـه‌ققادو غـه‌مراوی) كه‌ هه‌وڵیان به‌ شێوازی نوێ و لێكۆڵینه‌وه‌ ئامێز له‌سه‌ر ژیـانی پێغه‌مبـه‌ر بنووسـن، ئه‌م كاره‌ دانسقه‌یه‌ پاڵی بـه‌ هه‌نـدێ رێكخـراوو بـزاوت و ده‌زگـای گه‌شـه‌پێداندا لـه‌ جیهـانی ئیسـلامییدادا، كـه‌ زات بكـه‌ن لێكۆڵینـه‌وه‌ و توێژینـه‌وه‌ لـه‌ ژیاننامـه‌ی

پێغەمبەردا بکەن و کۆڕ و سیمیناری لەسەر ببەستن، بەوەی کە سەرقافڵە و نموونەی بەرزی موسڵمانانە و پێویستە بکرێتە مەشخەڵ و چاوساغ و چاوی لێبکرێت، لەگەڵ ئەوەی کە باسەکانیان جۆراوجۆرو بە شێوازی جوان و شایستە نیشاندرابوو، بەڵام زۆربەی باسەکانیان هەر بەرگریکردن و وەسف و سەناکردن و مەزن دەرخستن بوو، کەمتر لە نووسینی پێڕی یەکەم (نوسەرە کۆنەکان) دەچوو، ئەوانە کەمتر سوودیان لە قورئان وەرگرتبوو، جگە لە (محمد عزة دروزة) کە قورئانی کردبووە سەرچاوەی بنەڕەتیی بۆ دیراسەکردنی سەردەمی پێغەمبەر و ژیاننامەکەی، زۆر شارەزایانە لێکی هەڵێنجابوون و بەکاری هێنابوو، وەك بنچینەیەك بۆ تەواوکردنی ریوایەتەکان، بە ئەنجامێکی زۆر چاك و سەرکەوتوو کۆتایی بە توێژینەوەکەدا.

ئێمە ئەمرۆ قەبارەیەکی مەزن و بەشێکی یەکجار زۆر لە درێژەی هەواڵ و دەنگوباسی ژیان و رووداوەکانی سەردەمەکانی سەرەتای ئیسلامان لە بەردەمدا هەیە، بۆ رووداوو باسێك، جاری وا هەیە یەك بەرگی تەواو هەواڵمان هەیە، یان توێژەرێك کە دەیەوێ دوای باسێك لە چەرخ و قۆناغێکدا بکەوێت، سەرەتا وادەزانێ هیچ نییە، بەڵام کە دەچێتە کتێبخانەکان نوقمی دەریایەك لە رووداوی جۆراوجۆرو گێڕانەوەو باس و خواس دەبێت، گەر بیەوێت بە دوای خاڵێك، یان دەقێکدا بگەڕێت، وەك گەڕانە بە دوای مرواری و مەرجانی بەنرخ لەنێو زەریایەکی پڕ شەپۆل و گێژەلولی ئەنگوستەچاودا... بڕۆ سەیری تەبەریی و مەسعودیی و یەعقوبیی و ئیبن کەسیرو ئیبن ئەسیرو ئیبن خەلدون و زەهەبیی و ئەبولفیدا و مەقریزی و زۆری تر بکە، بەڵکو رووداوو دەنگ و باسی سەردەمی پێغەمبەرو راشیدین و سەحابەکان، رەوشت و هەڵوێستی پیرۆزو شیرینیان، خوێنەر دەجۆشێنێ و دەهەژێنێ و دەحەپەسێنێ، لاپەڕەکان پڕە لە کاری مەزن و هەست ناسك و نەست بزوێن و لەخۆبوردن و بۆ خوا سوڵحان بۆ خەڵك ژیان، یەك پارچە تاواونەتەوە لە ئایینەکەیاندا، وەك ئەستێرەکانی کەشکەشانن بزیسکە و بروسکە و

پرۆشه و پرشنگ دەدەن و دەجریوێنن، بەو هەستەوە دنیایان لە ستەم و خراپە رزگارکرد، فەتحی دڵەکانیان پێش فەتحی خاك و زەمین کرد. ! !

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە هەرچی نووسراوە روویداوە، یان هەرچی کۆکراوەتەوە بووە، یان هەرچیان بۆ گواستووینەتەوە سەد دەرسەد راستە، چونکە ئەو سەردەمە هەر کاتی کۆکردنەوە و رزگارکردنی هەواڵ و چیرۆك و دەنگ وباس بووە لە فەوتان، دەربازکردن و قۆستنەوە بووە لە دەم و دەست و دەستنووسی ئەم و ئەو، کاتی ئەوەیان نەبووە لێکدانەوە و پێوانەو شەن و کەوی هەواڵەکان بکەن، خۆشیان ئەوانە ناشارنەوەو راستگۆیانە دەیلێن.

ئەمرۆ ئێمە پێویستە خۆپارێزیی بکەین لە وەرگرتنی گێڕانەوەکاندا، چونکە زۆربەی کتێبەکان لە سەردەمی دەوڵەتی ئەمەوی و عەباسییەوە پێمان گەیشتوون کە دوژمنکاریی و ناکۆکیی نێوان موسڵمانان هەبووە و جیاوازیی نێوان عەرەب و عەجەم خەریکبوو پەرەی دەسەند، لەبەر ئەوە کاتێك کە مێژوونووسێك دەیەوێ لەسەر ئەو سەردەمانە بنووسێت ناچارە سەیری ئەو سەرچاوە کۆنانە بکات و هەواڵ هەڵبگۆزێ کە زۆریان موسڵمانی غەیرە عەرەب بوون و مەیلی عەرەب و عەجەم ئەو کاتە ناکۆکیی و جیاوازیی تێکەوتبوو، نووسەر ناچارە ئەو گێڕانەوانە بگوازێتەوە و باسەکەی پێ تەواوو دەوڵەمەند بکات و بگەڕێ بە دوای راستیە مێژووییەکاندا، چونکە مەبەستی مێژوونووسە کۆنە ئیسلامییەکان هەر ئەوە بووە هەواڵ کۆبکەنەوە و هەر چۆنێك بووە بیگەیەننە دوای خۆیان و لە فەوتان بیپارێزن.

لەبەر دووری زۆربەی رووداوەکان لە سەردەمی نووسینەوەی مێژوو، زۆر لە تێکەڵ و پێکەڵ و هەڵە و لەبیرچوون و تێکدانی تیارووداوە، لەبەر ئەوە زۆر پێویستە هەرچی بە دەستمان گەیشتووە، خوێندنەوە و هەڵسەنگاندن و لە بێژنگدانی نوێی بۆ بکەین، من دەتوانم دەیان نموونە بهێنمەوە کە مێژوونووسانی کۆن گێڕاویانەتەوە کە ئێمەش ئەمرۆ دەیگێڕینەوەو بڕوای تەواومان پێی هەیە، بەلام عەقڵ قبوڵی ناکات و وەریناگرێ و، لە گەڵ بنەماکانی ئاینیشدا

یەکناگرێتەوە، کەچی تەواو لە ناوماندا بڵاوەو مێژوونووسانی نوێشمان بڕوایان پێی هێناوە و لە کتێبەکانیاندا بە خەتی گەورە و بە شانازی و بڕواوە گێڕاویانەتەوە و هیچ تێبینیەکیان لەسەری تۆمار نەکردوە، بەڵام ئێمە لە پێناو زیندووکردنەوەی کەلەپووری ئیسلامیماندا پێویستە مێژوومان بخەینە نێو ئازمایش و، لە ژێر کنە و پشکنین و شەن و کەوکردنی و رەخنەی زانستیانەدا جارێکی تر خوێندنەوەیان بۆ بکەین و بینووسینەوە، ئەو لێکۆڵینەوە مێژووییە و گۆڕانکارییە رەخنەییە زۆر پێویستە، نەهێڵین شتی ناڕاست و نەگونجاوو ناشەرعیی و دوور لە عەقیدەی پوخت، کە پێکنەیەتەوە لەگەڵ قورئان و سوننەتدا بچێتە ناو کتێبە مێژووییەکانمانەوە.

کەسێکی وەك (شێخ صادق ئیبراهیم عرجون) هەندێ لێکۆڵینەوەی لەسەر (خالید و عوسمان) کردووە، هەڵەکانی ناساندووە و راستی کردوونەتەوە، (محیەدین خەتیب) بابەتی زۆری نووسیوەو لێکۆڵینەوەی لەسەر کردوون، بەتایبەت کتێبی (العواصم من القواصم)ی قازی (ابي بكر العربي) و (موحەممەد فەتحی عوسمان)و (أضوا ء على التأريخ الاسلامي) و (أضوا ء على التجربة) و کتێبی ( الخلافه والملك) ی ئەبو عەلای مەودودی و (تأريخنا المفترى عليه) یوسف قەرزاوی و کتێبی (حول اعاد كتابة التأريخ الاسلامي)ی دکتۆر عیمادەدین خەلیل، ئەمانە بە وردی لێکۆڵینەوەیان لەسەر مێژووی ئیسلامیی و بەتایبەت هەڵەی مێژوییان لە سەردەمی خولەفای راشیدیندا راست کردووەتەوە، ئێستا زۆر توێژینەوە و ماستەرنامە و نامەی دکتۆرا نووسراون، یان بە دەستەوەن، لەسەر روونکردنەوەی زۆر لایەنی ئاڵۆز لە سەردەمەکانی راشیدین و ئەمەوی و عەباسیی و کتێبخانەی ئیسلامیان پێدەوڵەمەند بووە، هەرچەندە بەداخەوەم کە زۆر لەو ماستەرنامە و نامەی دکتۆراو ئەتروحە جۆراوجۆرانە لە ناونیشاندا گرنگن، بەڵام لە ناواخن و ناوەرۆکدا گرگن و لاوازن، کاری جددییان بۆ نەکراوە و هەر بۆ شەهادە وەرگرتن و ناو دەرخستن و رازاندنەوەیە و هیچی تر، هیچ مەبەستێکی راستکردنەوەی گرفتێکیان لە ئەستۆ نەگرتوە، بەتایبەت دانیشگاکانی کوردستان

کە نە سەرپەرشتیاری باسەکان و لیژنەکە ئەو توانا تایبەتیی و شارەزاییەیان هەیە بتوانن تێبینی و زانیاریی پێویست بدەن بە خوێندکارەکە، وە نە قوتابیەکەش هێندە پسپۆڕو زرنگە بتوانێ چاك بگەڕێ و باش بیربکاتەوە و جوان بنووسێ و نوقات بخاتە سەر حەرف، بەداخەوەم کە زۆر ماستەرنامە و دکتۆرا دراوە، بەلاّم لەسەر شتی پڕو پووچ و هیچ سوودێکیان نەبووە، هەر بۆ پێدانی شەهادەکە بووە بەو کەسە دیارییکراوە کە مەبەستی سیاسیی و هاوڕێیی لە پشتەوە بووە، دەنا پێدانی ماستەرنامە بە کەسێکی نەشارەزا، هەر لەسەر کۆکردنەوەی چەند پارچە شیعرێکی لاوازی بێ کاکڵەی نوێی سەردەمی شاخ کە کەسەکانیان ماون و هیچ گرنگیەکی ئەدەبی و سیاسی و نەتەوەیی نییە و هیچ نرخ و ماناو گرنگیەك لە شیعرەکانیاندا نییە..!!

مێژوونوسە پێشووەکانمان هیچ تاوانیان نییە، ئەوان بە ئاشکرا وتوویانە هاتووین زانیاری کۆبکەینەوە و بیپارێزین لە فەوتان، (تەبەریی) لە مێژووەکەیدا سەرچاوەی هەمەجۆرەی زۆری بەکارهێناوە، ئەو ویستوویەتی خوێنەر لەسەر زۆر لایەن و بابەت ئاشنا بکات، لە زۆر سەرچاوەشی وەرگرتووە و کۆکردووەتەوە، کە زۆربەیان بڕواپێکراویشن، ئەوان زانیویانە کە گومان لە هەندێ هەواڵدا هەیە، بەلاّم هەر نووسیویانە، چونکە ترساون بە گوێ پێنەدانی ئەوان هەندێ زانیاریی و هەواڵ و زانست ون ببێ.

ئیمامی (تەبەریی) لە پێشەکی مێژوەکەیدا خۆی دەڵێ: "هەرچی هەیە لەم کتێبەدا لە هەواڵ و دەنگوباسان کە گێڕاومەتەوە لە پێشینانی خۆمانەوە، رەنگە لای خوێنەر نامۆبێت و وەرینەگرێ، یان گوێگر راچڵەکێنێ، بەلاّم من هەر گواستوومەتەوە بۆیان، واتە چۆن بۆیان هێناوین هەروا بۆتانی دەگێڕمەوە"[١].

---

[١] نحو اعادة تأريخنا الاسلامي، ص ٣٦. المراجع الأولى في تأريخنا، محب الدين خطيب، مجلة الأزهر، عدد ٢٤، ج٢، صفر ١٣٧٢ ه. التأريخ السياسي للدولة العربية، د. عبدالمنعم ماجد. ج١، ص٢١، مكتبة الانجلوا المصرية، قاهرة، ١٩٥٦. حول اعادة كتابة التأريخ الاسلامي، د.عمادالدين خليل، دار الثقافة، ط١، ص٣٢، ١٩٨٦ قطر.

بە راستی نووسەرە کۆنەکانمان سنگیان فراوان بووە کە هەموو شتێکیان بۆ کۆکردووینەتەوە، شتی راست و رەوان، هەروەها شتی ناجۆر و گومانـاوی و بڕوا پێنەکراو کە لەگەڵ عەقیدە و بیری ئیسلامییدا پێکنایەتەوە، ئەمە نیشانەیە لەسەر ئەوەی کە ئەوان ئازادبوون، ئازاو ئەمانەت پارێز بوون و هەستیان وابووە کە هەموو شتەکان کۆبکەنەوە و بیدەن بە گوێی خوێنەریاندا، ئەوان لە کاتی ناجۆر و ناستەنگدا ئەو بەرگە گەورانەیان نووسیوە، کاتێك کە ترس و بیم هەموو دەوروبەری ئەوانی گرتبوو، ئیبن مەسکویە دوو بەرگەکەی (تجارب الأمم)ی لە کاتی دەسەڵاتی تورکە بوەیهییەکانی سەردەمی سێیەمی عەباسیی (٣٣٤-٤٤٧ك) (٩٤٥-١٠٥٥ز) نووسیوە لەو کاتەدا کە بارودۆخ لە بەرژەوەندیی کەس نەبوو، کاروبار ئاڵۆز بوو، (تەبەریی) هیچ دیاردە و هەواڵێکی پاشاکانی ئەو کاتەی وەرنەگرتووە، ترساوە لەوەی پاکی نووسینەوە لەدەست بدات، ئەوان هەموو هەواڵێکیان بەستووەتەوە بەوەی کە گێڕاویانەتەوە و ناویان بردووە، هەتا خوێنەری داهاتوو بە هێزیی و لاوازی هەواڵەکە بزانێت.

ئیبن حەجەر لە کتێبی (لسان المیزان)دا دەڵێ: فەرموودە گێڕەوەکانی پێش ئێمە لە گێڕانەوەکانیاندا پشتیان بە فەرموودەی لاوازو دروستکراوو هەڵبەستراویش بەستووە، لێی بێدەنگ نەبوون، چونکە زانیویانە کە هێنانی سەنەد خۆی لە خۆیدا بڕیارە لەسەر زانینی لاواز و بەهێز و هەڵبەستراوی فەرموودەکە، ئەوان هەموویان نیشانداوە، هەتا پاش خۆیان قسەی لەسەر بکرێت، نووسەرانی نوێ خەزێنەیەکی پڕو بێشوماریان لە زانیاریی و هەواڵ لەبەردەستدایە، ئەمان ناگەڕێن بۆ کۆکردنەوە، بەڵکو هەر هەواڵ دەخەنە بەر خوێنەر هەتا ئامادەبێت بۆ راستکردنەوە و رەخنەکاریی و نیشاندانی رووداوەکان و دووبارە نووسینەوە و خوێندنەوەی مێژووی ئیسلامیی و داڕشتنەوەی بە گوێرەی بەرنامەیەکی وا کە نێزیکتر بێت لە راستی مێژوویی، هەتا خوێنەر تەسلیمی ئەو خەزێنە پڕو بێشومارە نەبێت لە گێڕانەوەی مێژوویی، کتێبەکانی مەحمود شاکیرو موحەممەد حسنین هەیکەل و عەقادو قەرزاوی و مەودودی و عەمادەدین خەلیل و عەلی محەمەد صەلابی زۆری تر هەوڵێکی نوێیە لەو بوارو ڕێیەدا.

ئیبن عەرەبی لە (العواصم من القواصم)دا دەڵێ: (..هەندێ تەفسیرنووس و مێژوونووس و ئەهلی ئەدەب، زۆر لەباسی ئایین و بیدعەیان نەزانیووە، ئێمە نابێ هەرچی ئەوان گێڕاویانەتەوە بە تەواوو ڕاستی بزانین، مەگەر لە پێشەوایانی فەرمووده، چونکە هەندێ لە گێڕەرەوەکان هەبووە فەرموودەیان دروستکردوە بۆ ناشیرینکردنی سەحابە و سەلەف لە پێشینەکان، لە نرخیان کەم دەکەنەوە، هەندێ دەسەڵاتدار یاریدەی بڵاوبوونەوەی ئەو کتێبانەیان دەدا هەتا کردەوەکانیان دیاربێ و چاکیان بۆ بکەن بە خراپە و بەویستی ئەوان بنووسن.. من گوێنادەمە قسەی هەموو مێژوونووسان، چونکە قسەی دروستکراوو هەواڵی درۆی زۆری تیایە.. دەبێ دوورکەوینەوە لەو هەواڵ هێنەرو قسە گێڕەرەوە نزمانە، گەر سەیری ژیانی سەحابیەکان بکەین بۆمان دەردەکەوێت ئەوانە هەموو هەڵبەستراوو گێڕەرەوەکان بە مەبەستەوە دروستیان کردووە هەتا کار لەدڵی مرۆڤە لاوازەکان بکەن)، پاشان ئیبن عەرەبی هەواڵێك دەهێنێ بۆ پشتبەستن بە بەرنامەی ڕەخنەی توند بۆ توێژینەوەی قۆناغێکی گرنگ کە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدین و، بەرگرییەك لە خەلیفە عوسمان دەکات و هەندێ هەواڵی ناڕاست دەهێنێ کە دەڵێن: (بۆیە عوسمان لەو فیتنەیەدا کوژرا، چونکە ستەمی زۆری لەخەڵکی کرد، ئەوەندەی لە عەمماری سەحابە دا هەتا گەدەی تەقاند، قوڵی ئیبن مەسعودی شکاند و قورئانی سووتاند و ئەبو زەڕی دەرکرد، لەوانەبوو کە لە جەنگی نوحودا هەڵهاتن و لە بەیعەی رزواندا ئامادە نەبوون، هەندێ حوکمی گێڕایەوە کە پێغەمبەر لای بردبوو، پێنج یەکی ئەفریقای دا بە مەڕوان، ئەو هورموزانی هاندا خەلیفە عومەر بکوژێ...) بەم جۆرە ئیبن عەرەبی (١٨) خاڵ دەهێنێ کە بۆ خەلیفە عوسمانی بە شەرم و ئیمان دروستکراوە، کە پێغەمبەر و جوبرەئیل شەرمیان لێکردووە، وەڵامی ئەو خاڵانەش دەداتەوە و دەیسەلمێنێ کە هیچی وا نییە و هەڵبەستراوە. هەروەها قەرزاوی لە (تاریخنا المفترى عليه) و مەودودی لە( الخلافة والملك) دا زۆر ڕاستی دەڵێن و هەڵەی مێژوونووسان ڕاست دەکەنەوە.. هەرچەند مەودودی لە هەندێك خاڵدا زۆر دەڕوات و بەرامبەر خەلیفە عوسمان خراپ دەڵێت. !

پاشان ئیبن عەرەبی ناوبژیوان و تەحکیمی نێوان عەلی کوڕی ئەبیتالیب و موعاویەی کوڕی ئەبی سوفیان دەهێنێتەوە کە مێژونووسان هێناویانەو بە "سەخافەت" ناوی دەبات و لە باتی ئەوە شتێکی تر دەهێنێ کە گونجاوە بۆ کەش و هەوای سەحابەکان، رەخنە لەو گێڕانەوانە دەگرێ و دەڵێ ئەوانە هەموو ژەهراوین بە مەبەستی خراپ هێنراون و دروستکراون بۆ ناشیرینکردنی کەسەکان لەسەر حیسابی کەسانی تر، هەروەها دەڵێ: ئەو هەواڵە خراپانە هەموو مێژوونووسە کەم شارەزاکان بۆ نموونە دەڵێن (... کە دەرچوون عێراقیەکان بە (١٠٠) هەزارەوە و شامیەکان بە (٧٠) یان (٩٠) هەزارەوە و لە شوێنی (سەفین) لەسەر رووباری فورات دابەزین، یەکەم رۆژ سێشەممە بوو، کە جەنگان خەڵکی عێراق سەرکەوتن، رۆژی چوارشەممە گەیشتنەوە بە یەك کە حەوت رۆژ لە مانگی سەفەری ساڵی (٣٧)ی کۆچی گوزەرابوو، رۆژی پێنج شەممەو هەینی و شەوی شەممە بەردەوام شەڕ بوو، ئیتر خەڵکی شام قورئانیان بەرزکردەوە و هێنایانە نێوانیان و داوایانکرد رێکبکەون و شەڕ بوەستێنن، بەم جۆرە بڵاوەیان لێکرد و داوایان کرد هەر لایەنێك کەسێك هەڵبژێرێ بۆ دانیشتن و رێککەوتن، هەر بۆیە لە لایەن خەڵکی عێراق و ئیمامی عەلییەوە ئەبو موسای ئەشعەری دانرا، لە لایەن خەڵکی شام و موعاویەوە عەمری کوڕی عاص دانرا، ئەبو موسا کابرایەکی لەخواترس و رۆشنبیر و فەقیە و زانا و شارەزا بوو، کاتی خۆی پێغەمبەر لەگەڵ موعاز ناردی بۆ لای خەڵکی یەمەن، عومەر پێشی خست، وەسف و سەنای کرد کە کەسێکی تێگەیشتووە، کەچی مێژوونووسانی سەردەمی دوای رووداوەکەی سەردەمی ئەمەویەکان، باس لەوە دەکەن کە شارەزا نەبووە و لە نرخی ئەبو موسا کەم دەکەنەوە و دەڵێن پیاوێکی گەمژە و گێل و لاواز و بێهێز و رارا و خەڵەتاو بوو، بەڵام کوڕی عاص بە کەسێکی خاوەن زەین و عەقڵ و زیرەك و شارەزا ناودەبەن و بە نموونە دەیهێننەوە، دوای ئەو قسانە کۆمەڵێك مێژوونووس بە نەزانانە چیرۆکی هیچ و پوچی تر بۆ ئەو باسە هەڵبەستراوە دروست دەکەن[1].

---

[1] العواصم من القواصم، ص ٦١-١١٠.

ئەم گێڕانەوە هەڵانە هەمووی لەلایەن سەبەئیەکانەوە تەنراوە و تاوتوێکراوە و بڵاوکراوەتەوە و ئاگری فیتنەکەی ئەو سەردەمەیان پێ گەرم کردووە، بەو جۆرە کێوێك لە گێڕانەوەی هەڵەیان تەنیوە و دەماودەم بڵاویان کردووەتەوە، لەبەردەم قسە و باسی ناو کۆمەڵگادا هەڵیانڕشتووە، ئیمامی تەبەریی و ئیبن ئەسیر، هەواڵ و دەنگوباسی دروستکراوی زۆریان بۆ گواستووینەتەوە، زۆر لە مێژوونووسانی هاوچەرخیش وەك دکتۆر حەسەن ئیبراهیم حەسەن و موحەممەد خزری بەگ و عەبدولوەهاب نەجار و دکتۆر جەمال ئەحمەد رەشید و موحەممەد شڵماشی ئەو هەواڵانەیان وەك خۆی، یان بە پێوەنانی زیاترەوە بۆ گواستووینەتەوە و یارمەتی تێکدان و ئاڵوگۆڕکردنی راستیەکانیان داوە.

ئیبن محنەف دەڵێ: ئیمامی عەلی رازی نەبوو حوکم بە قورئان بکرێ کە خەڵکی شام پێشنیاریان کردبوو، بەڵام پاشتر رازی بوو ئەویش لە ژێر پاڵەپەستۆی قورئانخوێنەکاندا کە دواتر بوونە خەواریج[1].

ئەو گێڕانەوە زۆر قورس و لە نرخ دابەزاندنە بۆ ئیمامی عەلی، دەبوو هەر بەوەدا بمانزانیایە درۆیە کە ئیبن محنەف گێڕاویەتیەوە کە هەرگیز خۆی بۆ ناگیرێ لە بەردەم بەراوردکاریی و لێکۆڵینەوەی وردو پاکدا، ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵێ: ئەویش لە رێگەی حەبیب کوڕی ئەبی سابیتەوە کە دەڵێ: چوومە لای ئەبا وائیل، یەکێك لە پیاوانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب، وتی: ئێمە لە جەنگی صەفین بووین، کە شەڕ گەرم بوو لەسەر خەڵکی شام، عەمر بە معاویەی وت: قورئان بنێرە بەردەم عەلی و بانگی بکە بۆ رێککەوتن لەسەر قورئان، چونکە ئەو ناتوانێ و دەست نانێ بە رووتەوە، پیاوێك قورئانی هێناو وتی: با لە نێوان ئێمە و ئێوەدا قورئان هەبێت، عەلی وتی: بەڵێ من لە پێشترم بۆ قورئان، (گێڕانەوەکە لەوە درێژترە)، بەڵام قورئانخوێنەکان کە دواتر بوونە خەواریج، شمشێرەکانیان نابوویە سەر شانیان و وتیان: ئەی ئەمیری موسڵمانان بۆ نەچین بۆیان هەتا خوا

---

[1] بروانة تأريخ الطبري، ج٥، ص٦٦٢.

خۆی حوکم بکات لە نێوانماندا[1]، بێگومان عەلی کوڕی ئەبی تالیب رازی بوو بە شەڕوەستان لە صەفیندا، رازی بوو بە تەحکیم، ئەوەی دانا بە سەرکەوتن و گەڕایەوە بۆ کوفە[2].

نەك هەر ئەوە، بەڵکو عەلی رێی گرت لەوەی کە دوو سەحابە لەعنەتیان لە معاویە و خەڵکی شام کرد، فەرمووی با فێری لەعنەتکردن نەبن و دەمتان رانەیەت لەسەر ئەو شتانە، فەرمووی: دوعای خوێن نەڕشتن و سوڵح و رێکەوتن بکەن[3].

دەڵێن گوایە ئیمامی عەلی لە قنوانتدا لەعنەتی کردووە لە معاویە و هاوڕێکانی، دەڵێن معاویەش لەعنەتی کردووە لە عەلی و ئیبن عەباس و حەسەن و حوسەین، ئەوانەش هەر راست نییە، چونکە سەحابە زۆر سووربوون لەسەر رێنماییەکانی پێغەمبەر کە نەهیکردووە لە لەعنەتکردن[4].

ئەوانە هەمووی قسەی ئەبو محنەف لوت کوڕی یەحیای رافیزی محتەریفە کە بڕوا بە گێڕانەوەکانی ناکرێ، چونکە لە جێیەکدا هاتووە کە ئیمامی عەلی نەهی کردووە لە لەعنەتکردن[5].

یان دەیانەوێ ئەبو موسای ئەشعەری بە گێل و لاواز و دەبەنگ لە قەڵەم بدەن، چونکە نوێنەری ئیمامی عەلی بوە، رێکەوتنەکەی ئەنجامدا، ئەوان (شیعەکان) دەڵێن: دەبوایە نەچوایە و نەخەڵەتایە، گوایە ئەمەویەکان خەڵەتاندیان، بەڵام ئەبو موسا کەسێکی مەزن بوو، سەرەتا هەر لە مەککە

---

[1] ( علي بن أبي طالب، دكتور علي محمد الصلابي، لا ٤٧٣ ٢٠٠٥، دار المعرفة، بيروت، ط٣). (مسند امام ا حمد مع الفتح الرباني، ج٨، ص٤٨٣، تحقيق احمد شاكر، ط٣، دار المعارف مصر، ١٣٦٨ه).

[2] دراسة في تأريخ الخلفاء، د.محمد ضيف الله بطاينة، ص٣٨، دار الفرقان، عمان ١٩٩٩.

[3] علي بن أبي طالب، الصلابي، ص ٤٨٥.

[4] البخاري، ج٧، ص٨٤، السلسلة الصحيحة للألباني، رقم: ٣٢٠. سنن ترمذي، ج٢، ص١٨٩. ومسلم ج٤، ص٢٠٠٦.

[5] النهج البلاغة، ص ٣٢٣. أصول مذهب الشيعة، ص٩٣٢.

موسڵمان بووە، کۆچی کرد بۆ حەبەشە و گەڕایەوە لە کاتی جەنگی خەیبەردا، کە پێغەمبەر بینی پێی فەرموون: ئێوە دوو کۆچتان بۆ حسێبە، کۆچتان کرد بۆ لای نەجاشی و کۆچتان کرد بۆ لای من[1].

ئەنەس دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی: (سبەینێ هۆزێك دێتە لاتان ئەوانە دڵیان بۆ ئیسلام نەرمترە لە ئێوە[2]). کە ئایەتی (فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ) (المائدة : ٥٤ ) دابەزی، پێغەمبەر فەرمووی: (ئەوانە هۆزەکەی تۆن ئەبو موسا، پەنجەی بۆ درێژکرد)[3].

جارێك ئەبو موسا نوێژی دەکرد و قورئانی دەخوێند، پێغەمبەر فەرمووی: (ئەوە ئیماندارێکی پاك و گەڕاوەیە بۆ لای خوا، خوا بەشێك لە دەنگخۆشیی بنەماڵەکەی داود پێغەمبەری داوەتی)[4].

پێغەمبەر ئەبو موسای دانا لەسەر ناوچەی زوبەیر و عەدەن، لەگەڵ موعازدا ناردی بۆ یەمەن، عومەر کردیە سەرکردەی ئازادکردنی شارەکانی قوم و قاهان و تستر، کەسێکی بەناوبانگ بوو بە زانست و خواپەرستیی و وەرع و شەرم و دەروون بەرزیی و پاکیی، بە گەورەترین ناوی ناو فەقیهەکانی ئیسلام دادەنرێ، زۆر هاوڕێی پێغەمبەر بووە، شەعبی دەڵێ: یەکێك بووە لە چوار قازیە مەزنەکە، وتی: قازیەکانی ئوممەتی ئیسلام چواربوون، (عومەر، عەلی، زەید، ئەبو موسای ئەشعەری)[5]. والی بوو لەسەر بەسرە و هەموو رۆژهەڵاتی بەسرەی فەتح کرد، زۆرترین نامەی سەربازیی و ئیداریی هەیە لە نێوان عومەر و ئەبو موسادا، نهێنی زۆر لە نامەکاندا هەیە، یەکێك بووە لە مەزنترین والیی عومەر، لە سەردەمی عوسمانیشدا هەر والیی بەسرە بوو، بەیعەتی خەڵکی کوفەی وەرگرت بۆ عەلی، کە

---

[1] مسلم رقم الحديث: ٢٥٠٢.

[2] سير اعلام النبلاء، ج٢، ص٢٨٤، بأسناد صحيح.

[3] سير اعلام النبلاء، ج٤، ص٢٣٨.

[4] مسلم، رقم ٧٩٣. و مجمع الفوائد، ج١، ص٣٥٨.

[5] سير اعلام النبلاء، ج٢، ص٣٨٩. علي بن أبي طالب، د. الصلابي، ص٤٨٩.

فیتنەکـە هەڵگیرسـا ئـەبو موسـا ئامۆژگـاری خـەڵکی کوفـەی کـرد کـە بچـنەوە ماڵەکانیان و خۆیان پەنا بگرن، بەڵام دواتر عەلی عەزلی کرد، چـونکە نەیدەویسـت خـەڵکی وازبهـێنێ[1]، ئەمەیـە وایکردبـوو شـیعەکان شـتی خراپـی بـۆ هەڵبەسـتن، هەڵبژاردنی خەڵکی عێراق لەلایەن عەلییەوە بوو ساڵی ٣٧ ك، چونکە رقی لـە شـەڕ بـوو، بـەڵام هـەوالگێڕەوە شـیعەکان رۆڵـی ئـەبو موسـا ناشـیرین دەکـەن، ئـەمان دەیانویسـت شـەڕ بـەردەوام بوایـە هـەتا نهێنیـەکانیان دەرنەکـەوێ، هـەر بۆیـە هەواڵـەکانیان دەسـتکاری کـردووە و تێکیانـداوە و شـێواندوویانە[2]، هـەر ئـەوەبوو دوای رێکەوتن یەکسەر شیعە و خەواریج و سەبەئیەکان لە سـوپای عـەلی لایانـدا و دواتریش ئیمامی عەلیان کوشت.

عەمری کوڕی عاصیش هەر کەسێکی تـەواو بـوو، لـە حەبەشـە موسـڵمان بـوو، کۆچی کرد بۆ مەدینە، پێغەمبـەر سـوپایەکی بـە سـەرکردایەتی عـەمر رێکخسـت و جـەنگی (ذات السلاسـل) روویـدا و بەشـداری موئتـەی کـرد و پاڵـەوانیی زۆری تیـا نواند.

پێغەمبەر فەرموویەتی: موسـڵمانترین کـەس و بـە ئیمانترینتـان عـەمری کـوڕی عاصە[3]، هـەروەها فەرموویـەتی: (رەحمـەتی خـوا لـە عـەمر) پێغەمبـەر نـاردی بـۆ بەحرەین، پێغەمبەر جارێك فەرمووی: (عەمر لای خوا خێر و چاکەی زۆری هەیە)[4]، پێغەمبەر ناردی بۆ بـانگکردنی کوڕەکـانی جلنـدی بـۆ ئیسـلام و موسـڵمان بـوون، ئەبوبەکر بە سوپایەکەوە ناردی بۆ فەلەسنین، پاشـان فـەتحی شـام[5]، لـە جـەنگی یەرموکـدا سـەرکردەی لای راسـت بـوو، بەشـداریی گـرتنی بیسـان و تەبەریـە و ئەزادینی و غەزە و لود و عەمواس و یافا و قودس و زۆر جێیی تـری کـرد، عومـەر

---

[1] فتح الباري، ج١٣، ص٥٣.

[2] علي بن أبي طالب، د. الصلابي، ص٤٩٤.

[3] سلسلة الأحاديث الصحيحة، ج١، ص٢٣٨.

[4] المعجم الكبير، ج١٨، ص٥، اسناده صحيح.

[5] فتوح الشام، للأوزدي، ص٤٨.

ناردی بۆ میسر و زیاد لە بیست شاری تا تەرابلوس گرت[1]، لە سەردەمی عوسماندا دەسەلاتی باشی هەبوو، پاشتر بەیعەتی دا بە عەلی، بەلام ئەو هەوالانەی واقیدی دەیگێڕێتەوە هەموو لاواز و بێ بناغەیە، تەنانەت کەسایەتییەکی وەکو عەمید محمود شیت خەتاب و عەباس مەحمود عەقاد و خەلکی تریش لەگواستنەوەی ئەو هەواڵە هەلە و لاوازانە رزگاریان نەبووە[2].

ئەو پیاوانە ئەگەر پیاوی بە ئەزموون و بە زەین و حەکیم و دلسۆز نەبوونایە، نەیاندەتوانی ئەو رێکەوتنە مەزنە مێژووییە مۆر بکەن، دوای کوژرانی دەیان هەزار سەحابە و خەلك، پشتی معاویەی گرت بۆ تۆلەسەندنەوە لەو رافزیی و سەبەئیە خائینانەی کە عوسمانیان شەهید کرد.

## مێژووی نوسینەوەو کۆکردنەوەی فەرموودە

سوننە لە رووی زمانەوانییەوە سیرە دەگرێتەوە، چاك بێ، یان خراپ، لە رووی زاراوەی شەرعیەوە ئەو جێماوانە دەگرێتەوە کە لە پێغەمبەری ئیسلام جێماون لە کردار و گوفتار و هەلوێست و بڕیار و راپۆرت.

وتەکانی پێغەمبەر فەرموودەکانیەتی کە لە جۆرەها بۆنە و کاتدا فەرموویەتی.

کرداریش چالاکیی و جموجولەکانیەتی کە بەجێی هێناوە و هاوڕێ و یارەکانی دەماودەم بۆیان گێڕاوینەتەوە و پاشتر نووسراوەتەوە و پێمان گەیشتوون، وەك چۆنێتی دەستنوێژگرتن و نوێژکردن و ئەرکەکانی و حەجکردن و سوننەتەکانی و دادوەرییکردن و سەفەرکردن و جەنگ و ئاشتی کردن و زۆر شتی تر.

بڕیارەکانیشی ئەوانەیە کە ئەو بڕیاری لەسەرداوە کە بکرێت، یان نەکرێت لە کردەوە و وتە کە هاوڕێکانی پێ بێدەنگ کردبێ، یان خۆی وتەیەك یان کردارێکی دیبێ و لێی بێدەنگ بووبێ و نەیفەرموویێ بیکەن، یان مەیکەن، یان بە راستی دانابێ و رازی بووبێ لەسەری، ئەوانەش وەك خۆی کردبێتی وایە، وەك چۆن رازی

[1] سير اعلام النبلاء، ج٣، ص٧٠.

[2] علي بن أبي طالب، د. الصلابي، ص٥٠٠.

بووه لەسەر هەندیّ جەژن و گۆرانیی و یاریکردن و رمبازێن لە مزگەوت و هەرچی تر و هەر شوێنی تر و شتی زۆری تر.

سوننە یەکێکە لە سەرچاوەکانی شەریعەتی ئیسلام، پێویستە کاری پێبکرێت، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ) (النسا ء : ٥٩ ).

سوننە دوای قورئان دێت و شەرحی قورئان دەکات، قورئان بڕاوەتەوە، وەك عەرەب دەڵێ جوملەتەن وە تەفصیلا، بەڵام سوننە وا نییە، سوننەت بەیان و لێکدانەوە و تەفسیر و شەرحی ئەوانە دەکات کە لە قورئاندا هاتووە، وەك چۆنێتی نوێژکردن و ژمارەی رکاتەکانی و دیاریکردنی ئاستی زەکاتدان و چۆنێتی حەجکردن، لە قورئاندا دەڵێ نوێژ بکە و زەکات بدە و حەج بکە و رۆژوو بگرە، بەڵام ناچێتە چۆنێتی کردن و وردەکارییەکانی بە چەند و چۆنێتی، بەڵام فەرموودەکانی پێغەمبەر ئەوانە روون دەکاتەوە، جگە لەوە سوننەت ئەحکامی نوێ زیاد دەکات کە دەقی قورئانی لەسەر نییە، وەك شەفاعەتکردن و حەرامکردنی نیکاحی ژن لەسەر خاڵی و ماموژنی و شتی تر.

لە سەرەتاوە پێغەمبەر رازی نەبوو سوننەت بنووسرێتەوە (لا تكتبوا عني، ومن يكتب عني غير القرآن فليمحوه)[1]، دەترسا تێکەڵ بە قورئان ببێت، هەتا تەواو قورئان لە ناو خەڵکدا بڵاوبوویەوە و بە شەوو بە رۆژ دەیانخوێند و دەیانخوێندەوە و جیایاندەکردەوە لە فەرموودە، ئەوجا پێغەمبەر فەرمانیدا بە نووسینەوەی فەرموودە، عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص دەیگێڕێتەوە کە بە پێغەمبەری وتووە: ئەی پێغەمبەری خوا من شت لە تۆ دەبیستم دەینووسمەوە، فەرمووی بەڵێ، عەبدوڵڵا وتی: لە تووڕەبوون و لە رازی بوونتدا، پێغەمبەر فەرمووی: بەڵێ، من ناڵێم جگە هەق و راستی)[2] واتە هەرچی من دەیڵێم هەق و ڕاستیە.

---

[1] صحيح مسلم.

[2] سنن أبي داود.

چەند کەس لەو سەردەمەدا فەرموودەیان دەنووسییەوە وەك ئیبن عەبباس و عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص و عەبدوڵڵای ئەنساری، بەناوبانگترین دەفتەری راست و دروست ئەوەی عەبدوڵڵای کوڕی عەمر بوو، کە هەزار فەرموودەی تیابوو، بە زمانی خۆی ناوی نا (ئەوەی کە تیایەتی راستەوخۆ لە پێغەمبەرم وەرگرتووە و بیستووە کە کەس نەبووە لە نێوان من و ئەودا)[1].

پێغەمبەر لە سەردەمی خۆیدا نامەی بۆ میر و پاشایان ناردووە، رێکەوتنی نووسیوە لەگەڵ عەرەب و گاورو جولەکەدا، نامەی بۆ ئەمیر و سەرکردەکانی جەنگیی ناردووە و بڕیاری خۆی تیا روونکردۆتەوە، یان بانگی کردوون بۆ ئیسلام[2].

ئەنەسی کوڕی مالیك دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ئێمە لای پێغەمبەر بووین قسەمان لێدەبیست، کە لای هەڵدەساین لەناو خۆماندا دەماننووسییەوە هەتا لەبەرمان دەکرد.

لە سەردەمی سەحابەکاندا غەمی یەکەمیان پاراستنی قورئان بوو، کە لە سەردەمی ئەبوبەکردا نووسرایەوە و کۆکرایەوە، لەسەردەمی عوسماندا چەند نوسخەیەکی لەبەر گیرایەوە و ناردی بۆ ناوچەکان، بەڵام سوور نەبوون لەسەر نووسینەوەی سوننە، چونکە دەترسان ئەگەر خەڵکی خەریکی فەرموودە بن، قورئان لەبیر بچێتەوە، چونکە قورئان سەرچاوەی سەرەکی شەریعەتی ئیسلامە، رای سەحابەکان لەسەر ئەوە یەك بوو کە نابێ داوای فەرموودە بکەن هەتا قورئان نەخوێنێتەوە و هەمووی لەبەر نەکەن، یان زۆربەی، لە عومەری کوڕی خەتابەوە دەگێڕنەوە: بیریکردەوە لە نووسینەوەی فەرموودە، بەڵام وازی لێهێناو وتی: (ویستم فەرموودە بنووسمەوە، لای هەندێ کەس باسمکرد پێش ئێوە شتیان

---

[1] طبقات ابن سعد، ج٧، ص١٨٩.

[2] مجموعة الوثائق السياسية للعهد النبوي. للدكتور محمد حميدالله الحيدرآبادي،القاهرة، ط٢، ١٩٥٨.

نووسیبوو کەوتبوون بەسەریدا و وازیان لە قورئان هێنابوو، من بە خوا هەرگیز واز لە قورئان ناهێنم و نایگۆڕمەوە بە هیچی تر)[1].

لەگەڵ ئەوانەدا دەرکەوتووە کە ئەبوبەکریش شتێکی لە سوننەت نووسیبوویەوە، هەروەها عومەریش، دوای ئەوەی کە دڵیان دامەزرا کە قورئان لەلایەن هەزاران سەحابەوە لەبەرکراوە و پارێزراوە و نووسیانەوە[2].

بەڵام ئەوەی کە بۆچی تەواو هەمووی نەنووسرایەوە و کۆنەکرایەوە، لەبەر زۆر تەقواو خۆپارێزیی و وردەکاریان بوو لەو وتەیەی پێغەمبەر کە فەرمووبووی (فالذي يحدث انما يدخل بين الله وبين عباده)، ئەوان فەرموودەیان نەدەگێڕایەوە هەتا کاتی زۆر پێویست نەبوایە، هەر بۆیە خەلیفە عومەر دەمەقرێی لەگەڵ ئەبو هورەیرە کرد کە زۆر خەریکی فەرموودە دەبوو، باسی دەکرد، کاتێك سەحابە فەرموودەیان دەگێڕایەوە زۆر وردەکارییان دەکرد لە گێڕانەوەکەدا، جارێك خەلیفە عومەر بەرپەرچی گێڕانەوەیەکی ئەبی موسای ئەشعەریی دایەوە، هەتا سەحابەیەکی تر پشتڕاستی کردەوە، وتی: (بەڵام من تۆمەتبارت ناکەم، ترسام خەڵك بە ناوی پێغەمبەرەوە لە خۆیانەوە شت بڵێن)[3].

دوای سەحابەکانیش خەڵك خەریکی نووسینەوەی فەرموودە بوون بە شێوەی لەبەرکردن، هەتا تێکەڵ نەبێ لەگەڵ قورئاندا، پارێزگاری راوی فەرموودەیان دەکرد بە گێڕانەوە، نەك نووسین، چونکە دەیانگوت نووسینەوە بیرکردنەوە لاواز دەکا و وادەکا کار بە فەرموودەکان نەکەن، دەیانگوت (لا تكتبوا فتتكلوا) واتە مەنووسن لەبەری بکەن و جێبەجێی بکەن، دەیانگوت ئەوانەی خەریکی فەرموودەن ئەوانەن کە لە زەین و بیریاندا پاراستوویانە و بووەتە بەشێك لە بیر و

---

[1] طبقات ابن سعد، ج٣، ص٢٠٦.

[2] مسند الأمام احمد بن حنبل. طؤظاري (العربي) كوَيتي، ذمارة (١٩٤)، ذي الحجة ١٣٩٤– كانووني دووةم ١٩٧٥.

[3] الموطأ ـ امام مالك ـ ج٢، ص٩٦٤.. مطبعة عيسى البابي الحلبي بمصر، سنة ١٣٧٠د، الرسالة، الأمام الشافعي، ص ٤٣٥ نفس المطبعة.

کار و هەڵوێستیان، چونکە لەبەرکردن، نەك نووسین، ئەوەیە ڕێگەی تێگەیشتن و کارتێکردن، دەیانگوت: (استعن بحفظ القرآن والحديث للعمل بـه) و (لـيس العلـم مـا جمع ودوّن، ولكن العلم ما حفظ و وعى)، واتە پشت ببەستن بە لەبەرکردنی قورئـان و فەرمودە و کار پێکردنیان، زانست ئەوەنیە کە کۆیکەیتەوەو بینوسیتەوە، بـەڵام زانسـت ئەوەیـە کـە لەبـەری دەکـەیت و لێـی تێدەگـەیت، سـەحابەکان فـەخرو شـانازییان دەکـرد بـە لەبـەرکردنی فـەرموودە و بـە یـەکتریان دەوت (هـەرگیز فەرموودەیـەکم نەنووسـیوەتەوە)، وتەیـەکی جـوان لـە عـامری شـەعبیەوە (١٧-١٠٣ك) دەگێڕنەوە کە دەڵێ: (هەرگیز ڕەشم لە سپیدا نەنووسیوە، فەرموودەیەکم لە پیاوێکەوە نەبیستووە و ویستبێتم جارێکی تر دووبارەی بکاتەوە بۆم) واتـە بـە یەکجار لەبەرمکردووە، ئیمامی ئـەوزاعی (١٥٧ك) مـردووە، ئـەو شـێوازە بـەهێز و پشتڕاست دەکاتەوە و دەڵێ: (زانستی فەرموودە کارێکی پیرۆزە، ئەگەر لـە دەمـی پیاوانیـەوە وەرگیرابـێ و ئـاڵوگۆڕی پێبکـەیت و قسـەی پێبکـەی و بـیری یـەکتری بخەنـەوە چـاکترە، بـەڵام کـە چـووە نـاو کتێـب، نـوور و ڕووناکیەکـەی دەڕوات و دەچێت بۆ غەیری ئەهلی خۆی)، واتـە دەچـێتە مـاڵی هـەموو کـەس و مـەرج نییـە ڕێزی فەرموودە و پیرۆزیی بزانن)[1].

لەگـەڵ ئـەو خۆپارێزییـە لـە نووسـیندا، هەنـدێك دەسـتنووس جێمـاوە، بەناوبانگترینیان (الصحيفة الصحيحة)یە (لاپـەڕە ڕاسـتە) پاکـەکانی (همـام کـوڕی منبـە، ٤٠-١٣١ك) کـە ژمـارەی (١٣٨) فـەرموودەی تیایـە لـە ئـەبوهورەیرەی وەرگرتـووە، یـان دەستنووسـی (الصـحيفة الصـادقة)ی عەبدوڵڵای کـوڕی عـەمری کوڕی عـاص، کـە ئیمـامی ئەحمـەد بـە تـەواوی هـەمووی بـۆ مەسنەدەکەی خـۆی گواستووەتەوە، ئیمامی بوخاریش ژمارەیەکی زۆری لێ گواستووەتەوە.

لە سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا (٩٩- ١٠١ك) فەرمانڕەوابوو، سەرەتای نووسینەوەی دەستنووسەکانە، بـە فـەرمان و بـە فـەرمی دەسـتکرا بـە

[1] جامع بيان العلم وفضله، لأبي عمر يوسف بن عبدالبر، ج١، ص٦٨، طبع مطبعة المنيرية، مصر. اصول الحديث، د.محمد عجاج الخطيب، ج٢، ص١٩٧١، ١٦٧.

نووسینەوەی فەرموودە، (ئەبو شەهابی زوهەری) دەڵێ: (عومەر داوای لێکردین کە سوننە کۆبکەینەوە، ئێمە دەفتەر بە دەفتەرمان نووسیەوە و لەبەرمانگرتەوە و بۆ هەر ناوچەیەك دەفتەرێکمان نارد). ئەم نووسینەوەیە لەبەر دوو هۆ بوو.

یەکەم: بۆ بڵاوبوونەوەی ئیسلام و فراوانبوونی رووبەری و بڵاوبوونەوەی سەحابە و تابعین و دروستکردنی کۆڕە زانستییەکان، عومەر نامەی نووسی بۆ هەموو هەرێمەکان بەتایبەت داوای لە خەڵکی مەدینە کرد: سەیری فەرموودەکانی پێغەمبەر بکەن و بینووسنەوە، من دەترسێم بە مردنی خاوەنان و هەڵگرانی فەرموودە، وانە زانستییەکان بمرن).

دووەم: دەرکەوتنی جۆرە دۆخێکی ناجۆر و ناکۆکی سیاسیی، ئەوەیە کە ئەبو شەهابی زوهەری لە بارەیەوە دەڵێ: (ئەگەر فەرموودە نەبوایە ئەوا لە بیروبۆچوونی رۆژهەڵاتەوە زانستمان بۆ دەهات کە بە دڵمان نەبوو، نەشمان دەناسی، لەبەر ئەوانە نەبوایە مۆڵەتی فەرموودە نووسینەوە نەدەدراو خۆیشم فەرموودەم نەدەنووسی).

دوای ئەوەی زاناکان گوێیاندا بە کۆکردنەوەی فرمووده و وردەکاریان تیاداکرد، پاشان تەحقیق کردن تیایاندا هاتە گۆڕێ، تەنانەت دەگێڕنەوە لە (ئەبی عالیە)وە کە دەڵێ: (ئێمە گوێمان دەگرت لە گێڕانەوەیەك لە سەحابەی پێغەمبەرەوە لە بەسرە، بەوە رازی نەدەبووین هەتا سواری وڵاخ دەبووین و دەچووینە شاری مەدینە و لە دەمی خۆیانەوە دەمانبیست)، ئەوانە تەحقیقیان دەکرد لە گێڕانەوەیەك، بەوە وازیان نەدەهێنا کە ئەو کەسە چاکە و ئەمانەت پارێزە، بەڵکو مەرجیان دەکرد کە چاك فەرمودەکە بپارێزن وەك خۆی هەڵیگرن، زۆر توند بوون لەسەر پرسیارکردن لەڕەوشت و کاری ئەوەی کە فەرمودەکەی دەگێڕایەوە، هەتا پێیان دەوتن باشە ئێوە دەتانەوێت ژن بهێنن ئەم هەموو پرسیارە دەکەن، مەبەست لەوە هەستکردن بوو بە بەرپرسیاریەتیی، تەنانەت دەیانگوت: (فەرموودە ئاینتانە، بزانن لە کێ ئاینەکەتان وەردەگرن).

کە سەردەمی دووەمی کۆچیی هات، نووسراوی نوێ زۆر دەرکەوت، لە زۆر وڵاتانی ئیسلامیەوە فەرمودە نووسرایەوە و رێکخرا، وەك موەتەئی ئەنەسی کوڕی

مالیك له مەدینه (٩٣-١٧٩ك)، بەشەكانی سوفیانی سەوری له كوفه (٩٧-١٦١ك)، عەبدورڕەحمانی كوڕی عەمری ئەوزاعی لە شام (٨٨-١٥٧ك)، عەبدوڵڵای كوڕی موبارەك له خۆراسان (١١٨-١٨١ك) و زۆری تر.

سەدەی سێیەمی كۆچی تێنەپەڕی هەتا هەندێ تۆماری سەربەخۆ لە خزمەتكردنی فەرمووددا دەركەوت، كەڵەپیاوی بە توانای تیاهەڵكەوت لە زانای مەزن و خاوەن توانای فراوان كە هەموو ژیانیان تەرخانكرد بۆ كۆكردنەوەی فەرموودە و گەڕانی ماندوونەناسانە لە پێناو كۆكردنەوە و تەحقیقكردنی فەرمووددا كە ئەوانیش شەش كەسن، شەش دانراوی مەزنیان ئامادە و كۆكردەوە:

١- صحیحی بوخاری: (١٩٢-٢٥٦ك) ئیمامی بوخاری شانزە ساڵ خەریكبوو بە ئامادەكردنی ئەم نووسینە، لەو ماوەدا هەزاران كەسی بڕواپێكراوی دیوە و (٦٠٠) هەزار لێ كۆكردوونەتەوە، لەو ژمارەیە دوای تەحقیقكردن و پشكنین و هەڵسەنگاندن و وردەكاری زۆر (٤٦٠٠) فەرموودەی لێ هەڵبژێرراوە كە تەواو گومان لە صەحیحیان نییە، (٩١٠٠) فەرموودەش بە دووبارە و جیاوازیی گێڕانەوەكان، دەستنیشانكراوە.

٢- صەحیحی موسلیم: (٢٠٤-٢٦١ك) ئەم زانایەش (٣٠٠) هەزار فەرموودەی كۆكردەوە، بەڵام دوای پشكنین و هەڵسەنگاندن و تەحقیقكردن و وردەكاریی (٤) هەزار فەرموودەی تەواو راستیان لێ هەڵبژاردون و (٧٣٠٠) فەرموودەش دووبارەیە بە گێڕانەوەكان له پیاوان و مەتنەكاندا.

٣- سونەنی ئەبوداود: (٢٠٤-٢٧٥ك)، توانیویەتی (٥٠٠) هەزار فەرموودە كۆبكاتەوە، صەحیح و حەسەنی جیاكردووەتەوە، زانایان لەو ژمارەیە دوای پشكنین و تەحقیقكردن (٢٨٠٠) فەرموودەیان گوڵبژێر كردووە.

٤- سونەنی نەسائی: (٢١٥-٣٠٣ك) ئەویش لە پلەی ئەبوداوددایە كە لە هەموویان كەمتر فەرموودەی لاوازی تیایە.

٥- سونەنی تورموزی: (٢٠٩-٢٧٩ك) له هەموو كتێبە فەرموودەكان كۆنترە، كه صەحیح و حەسەن و لاوازی دیاری كردووە و زۆر وردەكاریی بەكارهێناوە.

٦- سونەنی ئیبن ماجە: (٢٠٧-٢٧٣ك)، زاناکان دایاننـاوە کە تایبەتمەندیی ئەم نووسراوە لەوەدایە کە فەرموودەی زۆری لەخۆ گرتووە و پوختەیەکی جوان و پاکی پێشکەش کردووە.

پاشان جەوامیع و مەسانید و سونەن و موستەدرەکات و موستەخرەجات و مەجامیع و فەهارستیان بۆ زیاد کرد. وە لە بواری لێکۆڵینەوە و پشکنینی فەرموودەدا زانستەکانی (جرح و تعدیل و علم تأريخ الرواة وعلم اصول الحديث و علم غريب الحديث... هتد) یان بۆ داهێنا، تەنانەت زاناکانی زانستی فەرموودە وتویانە: (زانستی فەرموودە پەل بلاودەکاتەوە بەسەر زیاتر لە سەد زانستداو پەل و پۆی زۆرتری لێدەبێتەوە، هەریەکەیان زانستێکی سەربەخۆیە، کە ئەگەر گەرۆکێك بەدوای فەرموودەدا هەموو تەمەنی بەخت بکات، ناگاتە کۆتایی).

بە گوێرەی ئەوەی کە سوننەت سەرچاوەی دووەمی ئیسلامە، لەبەر ئەوە زۆر گوێی پێدراوە و بە درێژایی مێژوو کاری بۆ کراوە، چ لە رووی گێڕانەوە، یان کارپێکردن، پێشتر بۆمان دەرکەوت کە هەندێکی لە سەردەمی پێغەمبەردا بە مۆڵەتی خۆی (درودی خوای لەسەر بێت) نووسراوەتەوە، بەلام زۆربەی لە سەردەمی سەحابەکان و تابعیندا و پاشان هەوڵی زانایان بەردەوام بوو لە خزمەتی فەرموودەدا، هەتا زانستێکی زۆرو بەربلاو لە فەرموودە هاتە گۆڕێ، کە هیچ زانستێکی تر هێندە باس و خواس و لێکدانەوە و زانستی فراوانی بەخۆوە نەدیوە، بەلام ئەو هەزاران بەرگە دانراوەی لەسەر فەرموودە، کاری لێکۆڵەرەوانی ئەمڕۆی قورستر کردووە و کێشەیان بۆ دروستبووە، فەرموودە هەیە دەقەکەی راست و دروستە، بەلام سەنەدی گێڕانەوەکەی تەواو نیە، یان هەیانە کە قسە لەسەر دەقی فەرموودەکە هەیە، کەچی کەسی گێڕەرەوە تەواوە، یان لە بواری مامەڵەدا تا ئێستە تێکەڵە لە نێوان ئەوەی پێغەمبەر بە ئیجتهادی خۆی فەرموویەتی یان لە شتی تردا، بۆ نمونە فەرموودەی (احفو الشارب واعفو اللحية)یان (النهي عن تأبير النحل والفصل في الحضومات)، ئایا ئەو بڕیار و فەرموودانە بەستراون بە سەردەم و زەمەن و کات و شوێنەوە، یان بۆ هەمیشەیین، یان دەفەرمووێ: (من كان له أرض

فيلزرعها أو ليمنحها أخاه ولا يكريها) ئايا ئەوە هەر بۆ ئەو سەردەم و کاتەیە، یان تەشریعە بۆ هەموو موسڵمانان و گشتییە..؟

ئێمە لە مەزهەبە جیاوازەکاندا، بەتایبەت کتێبی حەنەفییەکان و شافعی و مالیکیەکان، سەدان باسی دژبەیەك، یان جۆراوجۆرمان هەیە و لە فەرموودەوە دەریانهێناون کە یەکناگرنەوە و ناکۆکن بەرامبەر یەك، بەڵام هیچ کامیشیان پێچەوانەی بنەڕەتی ئایین نین.

بۆ وەستان لەسەر سوننەت، کۆی زانایان لەسەر ئەوەن کە هەردوو صەحیحی (موسلیم و بوخاری) بەسە کە موسڵمانان کاری پێبکەن، بەڵام بە راستی هەر ئەو دوانە هەموو فەرموودە صەحیحەکانی تیانییە، لەوانی تریشدا زۆر هەیە کە لە ئەماندا نییە، ئەو دوانە مەعصوم نین لە هەڵە، نە فەرموودەیان، نە راویەکانیان، زۆر لە زانایانی فەرموودە رەخنەیان لەسەریان هەیە، وەك (دارقطني)، چ لەسەر مەتن و چ لەسەر راویەکانیان، بۆ نموونە (١١٠) فەرموودەی بوخاری رەخنەی لەسەر هەیە، هەروەها لەوەی موسلیمیشدا ئەو رەخنەیە زیارە.

رۆژهەڵاتناسی ئینگلیزی (فنسنك) بڵاوکراوەیەکی بەناوبانگی نووسی بە ناوی (مفتاح الكنوز السنة) وە (محمد فؤاد عبدالباقي) وەریگێراوە بۆ عەرەبی، ئەم کتێبە زۆر گرنگە لە (١٤) ئیمامی فەرموودە و نووسەرانی ئیسلامیی کۆی کردووەتەوە، وەك موسلیم و بوخاری و ئەبوداود و نەسائی و تەرمزی و ئیبن ماجە و مالیك و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و دارقتنی و زەیدی کوڕی عەلی و ئەبوداود و تیالیسی و ئیبن سەعدو ئیبن هیشام و واقیدی.

رەشید رەزا لە پێشەکی وەرگێڕانەکەیدا دەڵێ: (ئەگەر کتێبی وەك ئەو مفتاحەم لەبەردەستدا بوایە بۆ فەرموودە، بەسم بوو بۆ ئەوە زیاتر لە نیوەی تەمەنم کە بەختمکرد لە گەڕان و پێداچوونەوە بە ناو کتێبەکاندا)، بریا شتێکی لەو جۆرە بە هاوبەشی چەند دەزگایەکی وەك تیشك و رۆشنبیرو تەفسیر وەردەگێڕرا بۆ کوردی..!!

دوای ئەم، کۆمەڵێك رۆژهەڵاتناسی تر نووسراوێکی زۆر گرنگیان دانا بە ناوی (المعجم المفهرس لالفاظ الحديث النبوي) کە هەموو فەرموودەکانی پێغەمبەری تیایە

و هەموو کتێبەکانی سوننەت کە بڕوا پێکراون، تیا هاتووە و بە گوێرەی پیتی ئەبجەدیی ڕێکیخستووە، کارئاسانیی زۆری تیاکراوە، چ فەرموودەیەکت دەوێ زۆر بە ئاسان دەیدۆزیتەوە و سەرچاوەکەش دیاریی دەکات و بە هەموو لەفز و گێڕانەوەکانیش هێناویانە، ئەمە کارێکی زۆر مەزنە، خۆزگە ئەمەش بە هاوبەشی وەردەگێڕرایە سەر کوردی.

هەر چۆن بێت ئەهلی سوننە خوا چاکی بۆ کردوون خزمەتی سوننەیان بە دڵ کردووە و خەزێنەیەکی گەورەیان بۆ جێهێشتووین کە خۆی لە هەزاران بەرگدا بینیوەتەوە.

ئەمڕۆ ئێمە پێویستمان بە فەرموودەیەکی ڕاستی هاوچەرخانەیە کە لە هەموو کۆکراوەکان ئامادەکرابێت، نەك هەر موسلیم و بوخاری، با دوورکەوینەوە لەو فەرموودانەی لە صەحیحەکاندا هەیە و سەلماوە لە پێغەمبەرەوە نییە، یان لە ئەسناد و مەتندا سەلامەت نین، یان خراپ باسی پێغەمبەر و ئەسڵ و فەرعی ئیسلام دەکەن، یان تیانییە، وەکو فەرموودەی سیحری پێغەمبەر و فەرموودەی مێشەکەی ناو پەرداخە ئاوەکە و فەرموودەی شەیتان و لعق الاصابیع و حب الوطن من الایمان و شتی زۆری تر.

کارێکی چاك دەبوو بۆ کوردو کتێبخانەی کوردی ئەگەر:

یەکەم: هەموو بەرگەکانی موسلیم و بوخاری و تورموزی و نەسائی و ئیبن ماجە و ئەبوداود وەربگێڕرایەتە سەر زمانی کوردیی بە پوختی و پەتی و سادەیەکی ئاسان.

دووەم: لێکدانەوەیەکی پوخت ساکاری ئەو فەرموودانە بکرایە بە سوود وەرگرتن لە شەرحە گەورەکانی کە بە عەرەبی هەیە.

سێیەم: یەك کتێبی چەند بەرگیی لە صەحیحەکانی ئەو کتێبانە ڕێکبخرێ و وەربگێڕدرێ و بەش بەش بکرێ و بە پێی بابەت و پیتی ئەبجەدیی دابڕێژرێ بە زانسیانە و هاوچەرخانە بە کەمێك شەرحی ئاسانەوە، کە رای دروست وئاسانی لەسەر هەبێت، شەرحێکی درێژتر کە هەموو ئیجتهادەکانی لەخۆگرتبێ، یان ژمارە

دابنرێ بۆ فەرموودە کە ئەمڕۆ زۆر گرنگە وەك بۆ هەندێ صەحیح بە عەرەبی کراوە بۆ ئاسانکاریی و سوودی زیاتر وەرگرتن و بۆ گەڕانەوە، بەڵام بە هیچ جۆرێك ئەو فەرموودانەی تیا نەبێت کە گومانی لەسەرە، یان لە سەنەد و مەتنـدا ناتەواوییان هەیە، لە هەموو رووییەکەوە ئەمە پێویستیەکی گەورەی کتێبخانەی کوردیە کە ئیتر کورد لە کتێبە عەرەبیەکاندا بە دوای فەرموودەدا نەگەڕێ، ئەمە بە توانای تەنها کەسێك ناکرێت، پێویستی بە دەستە و لیژنەیەکی شارەزا و لێوەشاوەیە لە مەزنە زاناکانی فەرموودە پێکهاتبن کە بەداخەوە کورد لەو جۆرەمان نییە، هەروەك موفەسیری چاك و سیرە داڕێژەری چاك و فەرموودە کۆکەرەوەی چاك و موجتەهیدمان نییە و زۆر دوریشە هەتا ماوەیەکی دورتر هەڵبکەوێ، کاك ناسرێکمان تیا هەڵکەوت، بەڵام ئەوەندەی خۆی بە کاری سیاسی لاوازەوە خەریك کرد هیچی لەو خەزێنە مەزنە نەداینێ کەوەك دیاری و ئیلهامێك پێی بەخشرابوو، لەو هێڵە لاوازەشەوە تیا چوو..!! بەڵام دەتوانین سوود لە زاناکانی تری فەرموودە و شارەزایانی ئەو بوارە و پسپۆری تر ببینین لە گەلانی دراوسێ و موسڵمان، دەبێت دەسمایەی چاکی بۆ دابین بکرێ، فەرموودە ئەو رەحمەتە دەهێنێ بە زیادەوە، چونکە:

یەکەم: وتەی پێغەمبەری نازدارمانە.

دوەم: سەرچاوەی دووەمی تەشریع و ئیسلامە دوای قورئان، هەتا بە ئاسانکراویی لە بەردەست خوێنەراندا، لە ماڵ و دەزگاکاندا هەبێ و رەفتاری جوان و پوختی پێغەمبەر و شێوازەکانی مامەڵەکردن و ژیانداری دروستی لێوەربگیرێ.

من وادەزانم ئەگەر کارمەندانی پرۆژەی تیشك و ناوەندی رۆشنبیرو نوسینگەی تەفسیرو ناوەندی ئارا هاوبەشانە و لە خۆبوردانە ئەو ئەرکە پیرۆزە گرنگە بگرنە ئەستۆیان و نەخشە و ماوە دابنێن و دابەشی کارەکان بکەن و دەستبەکار بن، لە ماوەی ساڵێکدا بە زۆر ئامانج دەگەن..!

سوننەت لە هەموو سەردەمەکاندا سوودی چاکی گەیاندووە و خەڵکانی زۆری بە خۆوە سەرقاڵ کردووە، لە پێناوی کۆکردنەوە و نووسینەوە و شەرحکردنیدا توانای زۆری بۆ بەختکراوە، بەڵام کورد تا ئێستا کارێکی جددیی و پێویستی لە ئاست مەزنیی و کاریگەری فەرموودە بۆ نەکردووە، کورد وەك پێویست سوودی لە فەرموودە نەبینیوە، هەرچی کراوە لە عەرەبیەکەوە بووە، هەر وەك کاری کوردانەو زانستانە بۆ سیرە نەکراوە.

مێژوونووسان و لێکۆڵەرەوان و نووسەرانی جیهان شایەتن کە ئیسلام سیرەی پێغەمبەر موحەممەدی ﷺ پاراستووە، لە مێژووی ژیانی موحەممەد و ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان و عەلیدا، واتە لە مێژووی سەرەتای ئیسلامدا یەك خاڵ نییە ون و شاراوە بێت، هەرچی حەرەکە و سەکەنە و جمووجوڵ و ژیانی ئەو پێنجە هەیە، روون و ئاشکرایە و وەك مانگی چواردە دیارەو ئامادەیە، وەك سپاردەو ئەمانەتێك کە لە دەست ئەمیندا بێت، پاك و پوخت بە هەموو وردەکارییەکانیانەوە پارێزراوە و نووسراوە و هەیە، دەستی لەناوچوون نەیتوانیوە بیفەوتێنێ، گەر یەك دێڕ دروستکرابێ، دەرخراوە کە ئەو خاڵە نەگونجاوە و فلان کەس لە فلان حاڵەتدا بۆ فلان مەبەست دروستی کردووە، یان بە دەمی فلان سەحابەوە دروستکراوە، ئەو وردەکاریانەی مێژووی ئیسلام سەیرەو جێی تێڕامان و سەرسوڕمانی لێکۆڵەرەوانە، راویی فەرموودەکان و موحەدیسین و پیاوانی نووسینەوەی سەجەرەو ژیاننامەی پێغەمبەر، زۆر وردەکارانە فەرموودەو ژیان و کردارو گوفتاری پێغەمبەریان نووسیوە بۆ دوای خۆیان، کە ئەو خەزێنە پڕ گەوهەرە پوختە مێژووییە تەواو بوو، ئەنجا زانایانی دوای ئەوان ژیانی ئەو مێژوونووس و نەسەب پارێزو فەرموودە کۆکەرەوانەیان نووسیوە، ئێستا ژیانی پێغەمبەرو چوار خەلیفەکەی دوای ئەو و هەموو سەحابەو یارو یاوەران و تابیعین و تابیعی تابیعین، لە سەدان بەرگ کتێبدا بە ژمارەو لیستی تەواو و ساڵ و مانگ و رۆژ، زۆرجاریش بەشە رۆژەکان و شەوەکان بە نووسراوی هەیە، بۆ یەك تاکە فەرموودە، یان کردارێکی پێغەمبەر، یان خەلیفە و سەحابەکان، چەند کەس لە چەند جۆری لە ماناد‌ا یەك و لە گێڕانەوە

جیاوازو دەم بە دەم بە ناوو ناونیشان براوەتە سەر پێغەمبەر، یان سەحابەکان، گەر گومانێك لە ناو گێڕەرەوەکاندا هەبێت، دەستنیشان کراوە و ڕووداوەکە بە ڕاست (صحیح)، یان لاواز (ضعیف)، یان پەسەند (مقبول)، یان ناجۆر (مخالف) لەگەڵ قورئان و کاری پێغەمبەر و سەحابەدا دیاریکراوە، واتە زانایان ناوی ئەو ڕاوییانەیان نووسیوە بە ناوو نەسەب و شوێنی لە دایکبوون و ڕەوشت و داب و نەریتیان، بە جۆرێك کە هەموو لایەنێکی ژیانی ئەو کۆکەرەوانەیان نووسیوەو بووەتە زانستێکی تەواوو سەربەخۆ بە ناوی (علم أسماء الرجال)، واتە: زانسی ناوی ئەوانەی کە فەرمووده و باس و ڕووداوەکانیان گێڕاوەتەوە.

زانای ئەڵمانی (سبرنکر) ساڵی ( ١٨٥٤ز) لەدیوانی مەعاریف لە بەنگلادێش فەرمانبەر بووە، ئەمیندارى نهێنی کۆمەڵەی ئاسیا بوە، ئەم زانایە ساڵی (١٨٥٦ز) کتێبەکانی واقیدی و ئەوانەی باسی غەزاکان دەکەن وەرگێڕاو بڵاوی کردەوە، پاشان کتێبی (الاصابة في تميز الصحابة)ی ئیبن حەجەری عەسقەلانی وەرگێڕاو بڵاوی کردەوە و دەڵێ: من یەکەم کەسم لە ئەوروپا کە ژیان و فەرمودەی پێغەمبەر موحەممەدم وەرگێڕاوە، پشتم بە سەرچاوە سەرەکییەکانی سەرەتای ئیسلام بەستووە"، ئەم کەسە لە نووسینەکەیدا دژی موحەممەد شتی زۆری وتووە، بەڵام لە پێشەکی (الأصابة)دا لە تەرجەمە ئینگلیزییەکەدا دەڵێ: "هیچ گەلێکی پێشوو لە کۆن و نوێ نییە کە لە زانستی ناوی پیاوانیدا ئەوەندەی موسڵمانەکانی هێنابێت، بەڕاستی زانستێکی مەزن و قورس و گرانە و باس لە ژیانی (٥٠٠) هەزار پیاو دەکات بە ژیان و مردنیانەوە".

لە دوا ژیانی پێغەمبەردا، لە حەجیماڵئاواییدا (١٠٠) هەزار سەحابەی لەگەڵ بوو، لەمانە ناوی (١٠) هەزار سەحابە هاتووە، بە ژیان و مێژوویانەوە، ئەگەر دوو کەس شتێکی لەسەر پێغەمبەر لەبەر بووبێ، ناوو ژیان و کاروباریان نوسراوە، ئەوسا ئەو وتەیەیان لەو دوو کابرایە وەرگرتووە.

پێغەمبەر ساڵی (١١ك) وەفاتی کرد، کۆمەڵێکی زۆر لە هاوڕێکانی مانەوە هەتا ساڵی (٤٠ك)، وردە وردە ئەوانەی شتیان لەسەر پێغەمبەر لەبەر بوو، دەمردن: بڕوانە ناوی دواهەمین صەحابەی کۆچکردوو:

١- ئەبو ئیمامە لە شام ساڵی ( ٨٦)ك مرد.

٢- عەبدوڵڵای کوڕی حارسی کوڕی جوزئی لە میسر ساڵی ( ٨٦)ك مرد.

٣- عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی وەفا ساڵی ( ٨٧)ك لە کوفە مرد.

٤- سائیب کوڕی زەید لە مەدینە ساڵی ( ٩١)ك مرد.

٥- ئەنەسی کوڕی مالیك لە بەسرە ساڵی ( ٩٣)ك مرد.

ئەنەس دوا سەحابە بوو کە مرد و (١٠) ساڵ خزمەتکاری پێغەمبەر بوو.

بەڵام تابیعین کە قوتابی سەحابە بوون، مێژووی ئەم چینە لە ساڵی یەکەمی کۆچییەوە دەست پێدەکات، هەیانە لە سەردەمی پێغەمبەردا لە دایك بووە، بەڵام شەرەفی بینینی پێغەمبەری نازداری بە نسیب نەبووە، یان لە سەردەمی پێغەمبەردا بووە، بەڵام لە کەم تەمەنی بەختی نەبووە بە هاوڕێیەتی پێغەمبەر بگات، وەك عەبدوڕڕەحمانی کوڕی مالیك کە ساڵی (٣)ك لە دایك بووە، یان قەیسی کوڕی ئەبی حازم ساڵی (٤)ك لە دایك بووە، سەعدی کوڕی موسەیەب ساڵی (١٤)ك لە دایك بوو، ئەمانە لە پلەی دووەمی دوای سەحابەدا دێن لە گەیاندنی ئیسلام و بڵاوکردنەوەیدا. مەبەستم لەم وردەکاریانە ئەوەیە بڵێم زۆر سەیرە دکتۆر جەمال نەهاتوە لەم خەزێنە پڕزانیاریە ڕاستیەکان بدۆزێتەوەو باسی بکات گەر گومانی بوە ! ئەو هەر تەنها ئەو هەواڵانەی هێناوە کە زاناکان وتویانە لاوازەو بناغەی نیەو سەرچاوە پاکەکان پشت گوێیان خستوە، بەڵام بۆ دەرونە نەخۆشەکەی ئەو ئالودەتر بوە. ! !

ئیبن سەعد لە (طبقات)دا ناوی (١٣٩) کەس لە تابیعینی چینی یەکەمی بردووە کە لە شاری مەدینە بوون و سەحابەکانیان بینیوەو وتەو باس و خواسیان لێبیستوون، پاشان گێڕاویانەتەوە بە ناوی ئەوانەوە، هەروەها ناوی (١٢٩) کەس لە تابیعینی چینی دووەمیی بردووە کە سەحابەکانی تریان بە گشتیی بینیوەو وتەو باسیان لێگێڕاونەتەوە، بەڵام چینی سێیەم لە تابیعین ئەوانە بوون کە بەختیان بووە سەحابە ببینن، واتە سەحابەیەك، یان چەند سەحابەیەك ببینن، ژمارەی چینی سێیەم (٨٧) کەس بووە، ژمارەی هەموو تابیعییەکان (٣٥٥) دانەیە

لـه یـەك شـاردا (مەدینـە) كـە شـاری پێغەمبـەرە، هـەر بـەو جـۆرە پێوانـە و سەرژمێرییان كردووە، ئەوانەی كە لە سەحابەیان وەرگرتووە لە شـارەكانی تـریش كە سەحابەی تێدا بلاّوبوو، لە مەككە و تائیف و مەدائین (بەغدا) و بەسرە و كوفـە و دیمەشق و یەمەن و میسر، ئەوانەی تەنها غـەمیان بلاّوكردنـەوەی ئـایینی خـوا و وتە و ژیاننامەی پێغەمبەر بوە.

ببیـنن مێژوونووسـان و نووسـەران چـۆن تۆمـاری فـەرموودە و نـاوی راوی و گێڕاوە و سەحابەكانیان كردوە هەتا دەگاتـەوە بـە پێغەمبـەر، ئەمـەش نـاوی ئـەو سەحابانەیە كە چەندە فەرموودەی پێغەمبەریان لەبەر بووە:

١- ئەبو هورەیرە، (٥٣٧٤) فـەرموودەی گێڕاوەتـەوە و سـالّی (٥٩)ك وەفـاتی كردووە.

٢- عەبـدوللاّی كـوڕی عـەبباس، (٢٦٦٠) فـەرموودەی گێڕاوەتـەوە و سـالّی (٦٨)ك وەفاتی كردووە.

٣- عائیشـەی خێزانـی پێغەمبـەر، (٢٢١٠) فـەرموودەی گێڕاوەتـەوە و سـالّی (٥٨)ك وەفاتی كردووە.

٤- عەبدوللاّی كوڕی عومەر، (١٦٣٠) فەرموودەی گێڕاوەتـەوە و سـالّی (٧٣)ك وەفاتی كردووە.

٥- جابری كوڕی عەبـدوللاّ، (١٥٦٠) فـەرموودەی گێڕاوەتـەوە و سالّی (٧٨)ك وەفاتی كردووە.

٦- ئەنەسی كـوڕی مالیـك، (١٢٨٦) فـەرموودەی گێڕاوەتـەوە و سالّی (٩٣)ك وەفاتی كردووە.

٧- ئەبو سەعیدی خـودری، (١١٧٠) فـەرموودەی گێڕاوەتـەوە و سـالّی (٧٤)ك وەفاتی كردووە.

سوننەت و فەرموودەكانی پێغەمبەری ئازیز پشتی بەم سەحابە ماندونەناسـانە بەستووە بۆ گواستنەوەی وتەكانی پێغەمبەر بۆ خـەلّكی، ئەمـە فـەزلّ و گەورەییـە بۆ ئەو كەسایەتییانە لە كۆكردن و هەلّگرتن و پارێزگارییكردن و گواستنەوەی وتەو

پەیامی پێغەمبەر، ئەگەر سەیری وەفاتی ئەم سەحابانە بکەیت، هەست دەکەیت کە خوای گەورە ئەجەل و مردنی دوور خستوونەتەوە و تەمەنیانی درێژ کردوونەتەوە و مۆڵەتی زیاتری پێداون، هەتا زۆرترین کەس ببینن و وتەو فەرموودەکان بۆ فراوانترین ڕووبەری خەڵك بگێڕنەوە، ئەوسا زانست و زانیاریی هەر ئەوە بووە، ئەوان گەورەترین توانای خۆیان بەختکرد هەتا بە جوانیی پاسەوانی ئەو باخچە گوڵزارەی ژیان و فەرموودە بکەن، تەنانەت بەشداریی زیاتریان نەدەکرد لە کاری تردا هەتا هیچ تێکەڵ بە زەینیان نەبێت و فەرموودەکان بە پاکیی بمێننەوە و وەك خۆی بیگەیەنن، ئەو سەردەمە زانست هەر ئەوەندە فراوان بوو، مەزنترین کاریان کرد و بەرزترین فەلسەفەی ژیانیان گەیاند و پاکترین پەیامیان پەخشکرد بۆ مرۆی دوای خۆیان، ئەوکاتە پایەی زانست لەو هەرێمەدا هەر ئەوەندە برەوی کردبوو، پاشتر ئەم هەموو لق و پۆیەی زانست جیابوویەوە، شەرەف ئەو کاتە ئەوە بوو کەسێك سەحابە بوایە و بە خزمەت پێغەمبەر بگەیشتایە، پاشان ئەو کەسەی زۆرترین فەرموودەی پێغەمبەری لەبەر بوایە.

ئەو هەزاران سەحابەیە کاری خۆیان کرد بۆ ئەم ئایینە، هەندێك گیانی خۆیان بەخشی، یەکێك چیرۆکێکی گەیاند و سەدانیش قورئان و فەرموودەیان لە سنگدا بوو پەخشیان دەکرد، واتە ئەوەی بە چاوی خۆیان دیبویان، یان بە گوێی خۆیان بیستبوویان، یان تیایدا ژیابوون، ئاگاداربوون لە کاروباری ئایین و پێغەمبەرو قورئان و فەرموودە و شەریعەت، وەك خۆی فەرموبووی (بَلِّغوا عَنِّي) یان ( بلغوا عني ولو ايه) یان (ليبلغ الشاهد الغائب)، ماڵ و منداڵ و براو هاوڕێ و خزمانیان لێ فێردەکرد، ئەوە هەمو غەمی شەوو رۆژیان بوو، چینی یەکەم هەموو راستییەکان تێگەیشتبون، ژیانی پێغەمبەریان دەزانی، هەموو جێیەکیان کردبووە قوتابخانە بۆ گەیاندن و فێربوون، وشە بە وشە و هەنگاو بە هەنگاوی کار و کردەوەی پێغەمبەریان دەگەیاند، تابیعینەکانیش وشە بە وشەیان لەبەردەکرد و وەك خۆی و بە ناوی ئەو کەسانەی کە لێیان وەرگرتبوو دەیانگێڕایەوە، خۆی فەرموبووی: (هەرچی وتە بە ناوی منەوە هەڵبەستێ، با شوێنی خۆی لە جەهەنمدا ببینێ)،

ئەوەش لە ترسی هەڵەکردن، یان لەبیرچوون، کاتێك عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود دەیوت: "پێغەمبەر دەفەرمووێت"، رادەچڵەکی و شۆك دایدەگرت و دەیوت (ئاوا)، یان (لەو شێوە)، یان (نزیك لەوە)، خەڵکی ئەو کاتە دڵیان پاك و ساف بووە و بیریان تیژ بووە، بە کاری هیچ و لاوەکییەوە خۆیان خەریك نەدەکرد، وەك ئەمڕۆ نەبوون کە خەڵکی نازانێ نیوەڕۆ چی خواردووە، کەسی وا بووە هەزاران بەیت شیعری لەبەر بووە، یان کتێبێکی لەبەر بووە، هەزاران کەس هەموو قورئانیان لەبەر بووە، هەرکەسە هێزی لە شتێکدا هەیە، ئەگەر بتەوێ بەکاری بهێنی بەهێز دەبێت، ئەوان بڕیاریاندابوو فەرموودە لەبەر بکەن و بیگەیەنن، وەك خێرو پاداشتێك بۆ گەیاندنی ئاینی، خۆیان دەڵێن کە فەرموودەیەکیان دەگێڕایەوە گوێمان دەگرت و دەمودەست لەبەرمان دەکردو دەمانوتەوە، وەك چۆن منداڵێك سورەتی فاتیحە لەبەر دەکا، ئەوانەی بە فەرموودەوە خەریك دەبوون، هەزاران، یان سەدان هەزاریان لەبەر دەکرد، پاشان ئەوەی بیستبوویان دەیاننووسییەوە، هەر کەسێك فەرموودەی زۆری لەبەر بوو‌بێت زۆر رێزی لێدەگیراو لە ناو خەڵکییدا بەناوبانگ بوو، بۆیان دەنواری، لاپەڕەکانیان دەشاردەوە، هەتا نەڵێن ئەمانە فەرموودەکەیان لە لاپەڕەدا نووسیوە و لە سنگیاندا نییە.

رۆژهەڵاتناسان، ئەوانەیان کە کاریان بۆ بڵاوکردنەوەی گاوریی دەکرد، لە پێشەنگیانەوە (سێر ولیەم میوّر) و (غولدزیهید) ویستیان گومان بخەنە دڵی خەڵکی لە گێڕانەوەی فەرموودە، دەیانگوت گوایا نووسینەوەی فەرموودە دوای وەفاتی پێغەمبەر دەستی پێکرد بە (٩٠) ساڵ، بەڵام ئەو وتەیە گوماناویەو بۆ کەسانی وەك دکتۆر جەمالی وتوە، ئەوەی کە لە پێشەوە باسمکرد راستییەکەیە و ئەمان بۆ گومان دروستکردن بۆ دکتۆرو ئەوان وا دەنووسن، ئەوەی وای لە سەحابە کرد کە فەرموودە نەنووسنەوە سێ شت بوو:

١- پێغەمبەر رێگەی نەدا لە سەرەتاوە فەرموودە بنووسن، هەتا خەڵکی بە قورئانەوە خەریك بن و ئەو دوانە تێکەڵ نەبن، کە قورئان تەواو لەبەرکرا و ناسرا، ئەنجا مۆڵەتی دا بە سەحابە هەتا ئەوە بنووسنەوە کە لێی دەبیستن، لەگەڵ ئەوەدا سەحابە ئیحتیاتی زۆریان دەکرد.

٢- سەحابە دەترسان نووسینەوە زەرەر لە لەبەرکردنیان بدات، نووسینەوە وا بکات ئیتر لەبەری نەکەن، وایان لێهات لە کاتی پێویستیدا بگەڕێنەوە بۆ لاپەڕەکان وەك ئەمڕۆ کتێبخانە شتی لە بیری خوێنەر بردۆتەوە، هەتا نووسین زۆر بێت لەبەرکردن کەم دەبێتەوە، دواتر وای لێ دەهات، کە هەرکەس فەرموودەی نووسراوی لابێت بە زانا بناسرێ.

٣- عەرەب لای وابوو کە هەر کەس خوو بداتە نووسینەوە، ئەوە تەمەڵە و تواناو مەوهیبەی نییە، دەیانگوت هەرچی ئەوەی لەبەریەتی بینووسێتەوە، ئەوە واتە کارەکەی و ئەمرەکەی دەشارێتەوە.

لە فەرموودە کۆکەرەوەکانیان بیستووە وتویانە: لەبەرکردن لە سنگدا پارێزراوترە لە نووسینەوە لە دێڕدا، چونکە ئەوەی لە لاپەڕەدا دەنووسرێ هی تۆ نییە، بۆی هەیە بۆی زیاد بکرێ و کەم بکرێ و تێکبدرێ و گۆڕانکاریی تیا بکرێ، بەڵام ئەوەی لە کەسێکەوە وەریبگری کە لەبەری بێت، بە هەموو رێکی و وردەکارییەکییەوە لەبەری بکات، هەڵەی تێناکەوێ و دەستکاریی ناکرێت و خەسڵەتەکانی ون ناکات.

ئەو رۆژهەڵاتناسانەی وادەزانن کتێبی (الموطأ)ی ئیمام مالیك و (مالیکی کوڕی ئەنەس) هەردوو ئیمامەکە لە یەك سەردەمدا بوون، بەڵام یەکەمیان ساڵی ( ١٧٩) ك مردووە، دووەمیان ساڵی (٩٣ك) مردووە، وا دەزانن سەدەی دووەم سەرەتای فەرموودە نووسینەوە و مێژووی نووسینەوەی سیرە و سوننەت بووە، بەڵام ئەوە هەڵەیەو هەرگیز وانییە، بەڵکو زۆر پێش ئەوە ئەو کردارە روویداوە.

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، خەلیفەی ئەمەوی کە ساڵی (١٠١)ك مرد، زانایەکی سروشت ناسك بوو، یەکەمجار بووە ئەمیری مەدینە، پاشان ساڵی (٩٩)ك بووە خەلیفەی ئەمەوی، بڕیاری بۆ قازی (ئەبی بەکری کوڕی موحەممەد، ئیبن عومەر کوڕی حەزم) دەرکرد کە پێشەوا بوو لە فەرموودەدا، داوای لێکرد سوننەت و سیرە و هەواڵەکان بنووسێتەوە، ترسی ئەوەی هەبوو وردە وردە زانستە پاکەکان لەناو بچێت، (ئەبوبەکر کوڕی حەزم) هەستا بەو کارە، فەرموودە و هەواڵ

و سوننەت و سیرەی خستە سەر لاپەڕە و نووسین، ئەنجا ناردی بۆ داری خەلافە (دیمەشق)، ئەوانیش چەند نوسخەیان لەبەرگرتەوە و ناردیان بۆ هەرێم و شارەکانی ئەو کاتە[1].

ئەبوبەکر قازی مەدینە بوو، لەبەر ئەوە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز داوای لێکرد ئەو کارە بکات، چونکە ئەو پیاوە زانایەکی مەزن بوو، هەروەها خالۆژنی کە ناوی (عەمریە) بووە، یەکێك بووە لە گەورە قوتابییەکان، فەرموودەکانی لە عائیشەی دایکی ئیمانداران بیستووە، هەمووی لە لا پارێزراو بوو، عومەری کوڕی عەبدولعەزیز داوای لێکرد کە ئەوانەی خالۆژنیشی هەمووی بنووسێتەوە و بیپارێزێ.

لە هەق لانادەین گەر بڵێین نووسینەوەی سوننەت و فەرموودە هەر لە سەردەمی پێغەمبەرەوە دەستپێکرد، لە (صەحیحی بوخاری)دا هاتووە کە پێغەمبەر داوای کرد کە خوتبەی ڕۆژی فەتحی مەککە بنووسنەوە، ئەویش لەبەر پرسیارێکی کابرایەکی یەمەنی کە ناوی (ئەباشاه) بوو، جگە لەوە پێغەمبەر نامەی نووسراوی نارد بۆ پاشایان، داوای کردبوو موسڵمان ببن، نامەکەی بۆ مقەوقیسی پاشای میسر هەتا ئێستەش پارێزراوە و لە کەنیسەی میسردا هەڵواسراوە، ئەوە راسترین نموونەی پارێزراوە، ئەبو هورەیرە وتی: کەس نییە هێندەی من فەرموودەی لەبەر بێ و ئەوەندەی من گێڕانەوەی لابێت، جگە عەبدوڵڵای کوڕی عەمر و کوڕی عاص، چونکە ئەو هەرچی لە پێغەمبەر بیستبێ دەینووسی، من نایینووسم. لە سوننەنی ئەبی داود و مەسنەدی ئیمام ئەحمەددا هاتووە کە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص وتی: من هەرچی لە پێغەمبەرەوە ببیستم دەینووسم و دەمەوێ لەبەری بکەم. قورەیش وتیان نابێ وا بکەیت، وتیان تۆ دەنووسی و پێغەمبەری خوا لە توڕەبوون و ئارامیدا وتە دەفەرمووێ، منیش لە نووسینەوە وەستام، هەتا ئەم باسەم بۆ پێغەمبەر گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی:

---

[1] مختصر جامع بيان العلم ـ حافظ ابن عبدالبر ـ ص ١٣٨ مصر.

(بنووسە، بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، هیچ وتەیەکم لێ دەرناچێ جگە لە هەق و راستی) پەنجەی بۆ دەم و زوبانی موبارەکی راکێشا[1] .

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص لاپەڕەکانی خۆی و دەفتەرەکەی ناونابوو (الصادقة)[2] ، عەبدوڵڵا دەیوت: (دوو شت ژیانیان لا خۆشەویست کردووم، یەکێکیان ئەم دەفتەری (الصادقة)یە، هیچم تیا نەنووسیوە جگە ئەوانەی کە بە گوێی خۆم لە پێغەمبەرم بیستووە)، موجاهید دەڵێ: (دەفتەرێکم لای عەبدوڵڵای کوڕی عەمر بینی، پرسیم: ئەمە چییە...؟ وتی: ئەمە (الصادقە)یە، ئەوەی تیایە کە لە پێغەمبەرم بیستووە، لەوەدا هیچ کەس لە نێوان من و پێغەمبەردا نەبوو)[3] .

لە پوختەی صەحیحی بوخاریدا هاتووە کە پێغەمبەر دوای کۆچکردنی بۆ شاری مەدینە داوای کرد کە ژمارەی موسڵمانەکانی بۆ سەرژمێر بکەن، ژمارەکەی (١٥٠٠) کەس بوو، داوای کرد حوکمی زەکات بەر کێ دەکەوێ و چۆن دابەش دەبێت بۆی بنووسن، ئەوانەیان لە دوو لاپەڕەدا بۆ نووسی، چەند نوسخەی لەبەر گرتەوە و ناردی بۆ ناوچەکانی سەر بە مەدینە لەو کاتەدا، نوسخە ئەسڵەکەی لە ماڵی ئەبوبەکر پارێزرا[4] .

لە لای فەرمانبەرانی زەکات چەند نامەیەك هەبوو باسی حوکمی دابەشکردن و وەرگرتنی زەکاتی تیابوو، لای عەلی لاپەڕەیەك هەبوو، نزیك بە شمشێرەکەی دایناوبوو، چەند فەرموودەیەکی تیابوو دەربارەی حوکمەکان، خەڵکی دەیبینی و لێیان دەپرسی[5] .

---

[1] (مسند الامام أحمد ج٢ ـ ص ١٦٢ ـ ١٩٢). (سنن أبي داود ج٢ ـ ص٢٢). (جامع البيان العلم ج١ ـ ص٧١).

[2] طبقات ابن سعد ـ ج٢ ـ ص١٢٥.

[3] طبقات ابن سعد ـ ج٢ ـ ص١٢٥.

[4] دارالقطني ـ كتاب الزكاة ـ ص٢٠٩.

[5] صحيح البخاري، ج٢ ـ ص ١٠٨٤ ـ ١٠٢٠

لـە ڕێکـەوتنی حودەیبیـەدا لـە نێـوان موسـڵمانان و بتپەرسـتانی قوڕەیشـدا پێغەمبـەر داوای لـە عـەلی کـرد نووسـراوی ڕێکەوتنەکـە بنووسـێ بـە دوو نوسـخە، نوسخەیەکی دا بە بتپەرستان و نوسخەیەکی لای پێغەمبەر مایەوە[1] .

کـە پێغەمبـەر عومـەری کـوڕی حـەزمی کـردە والـی یەمـەن و نـاردی، چـەند حوکمێکی نووسـراوی دایـە لـە بـارەی فـەرزەکان و خێـر و قـەرزەوە[2] ، عەبـدوڵڵای کوڕی حەکیم نامەیەکی لە پێغەمبەر پێگەیی لە بارەی حـوکمی گیانـداری مـردوو[3] .

کە وائیلـی کـوڕی حەجـەر ویسـتی بگەڕێتـەوە بـۆ ناوچـەی خـۆی لـە حـەزرەمۆت، پێغەمبەر نووسراوێکی دایە کە ئەحکامی نوێژ و ڕۆژوو و سوو و عارەق و شتی تری تیابوو[4] .

عومەری کوڕی خەتاب پرسیاری لە سەحابەکان کرد، کێ فەرموودەیـەکی لایـە لەسەر بەشی ژن لە قەرزی مێردەکەی (دية)، زوحاکی کوڕی ئەبو سـوفیان هەسـتا و وتی: بەڵێ نووسراوێکمان لایە ئەوە ڕوون دەکاتەوە[5] .

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لە خەلافەتی ئەمەوی خۆیـدا نووسـراوێکی نـارد بـۆ مەدینـە پرسـیاری کـرد لـە بـارەی نووسـراوێکی پێغەمبـەرەوە لـە بـارەی حـوکمی سەدەقات، نوسخەکەیان لای بنەماڵەی عەمری کوڕی حەزم دۆزییەوە[6] .

خەلیفەی ئەمەوی مەروان هەستا و وتارێکیدا، باسی حورمەتی شاری مەککـە و ڕێزی ئـەو شـارەی کـرد، ڕافیعـی کـوڕی خـەدیج بـە دەنگێکـی بـەرز کـە خەڵکەکـە گوێیـان لێـی بـوو، وتـی: شـاری مەدینـەش حورمـەتی هەیـە و پێغەمبـەر یاسـاغی

---

[1] ابن سعد في المغازي ـ ص٧١.

[2] كنز العمال، ج٣ ـ ص١٨٦

[3] المعجم الصغير للطبراني ـ ص٢١٧.

[4] الطبراني الصغير ـ ص٢٤٢.

[5] الدار قطني ـ ج٢ ـ ص٤٨٥.

[6] الدارقطني ـ ٤٥١.

کردووه که بیّ ریّزی تیا بکریّ، ئەوەتا لە لای ئیّمە نووسراوە لە (ئەدیم خولانی) گەر ویستت بیخویّنەرەوە، مەروان بانگی کرد: بەڵیّ ئەویشمان بیستووە [1] .

زوحاکی کوڕی قەیس نووسراویّکی نارد بۆ نوعمانی کوڕی بەشیر و پرسیاری دەربارەی ئەو سورەتە لیّکرد کە پیّغەمبەر لە نویّژی هەینیدا دەیخویّند جگە سورەتی (الجمعة)، ئەویش بە نامەیەك وەڵامی دایەوە کە پیّغەمبەر سورەتی (هل أتاك) شی دەخویّند [2] .

لەم باسانەدا بۆمان دەردەکەویّت کە سەحابە گەورەکان ویستوویانە سوننەت و ئەحکامەکان تۆمار بکەن و لای خۆیان بە دەستنووسیی هەبیّ و دەقەکان ون نەبن، هەروەها بۆمان دەرکەوت کە زۆر هەوڵیان داوە و کردووشیانە، ئەبوبەکر لە ماوەی خەلافەتی خۆیدا ئەحکام و سوننەتەکانی لە دەفتەریّکدا کۆدەکردەوە، بەلاّم پاشتر ناچاربوو بیسریّتەوە. عومەریش لە ماوەی خەلافەتی خۆیدا بڕیاریدا کە سوننەتەکان کۆبکاتەوە، بەلاّم دوایی وازی هیّنا و نەیکرد، پیّشتر باسمانکرد کە عەبدوڵلاّی کوڕی عەمری کوڕی عاص بە داوای پیّغەمبەر ئەوەی کە لەوی بیستبوو لە دەفتەریّکدا کۆیکردەوە، خەڵکی دەهاتن بۆ لای هەتا نیشانیان بدات و ببینن [3] ، عەبدوڵلاّی کوڕی عەباس تۆماریّکی هیّنا کە فەتواکانی عەلی کوڕی ئەبو تالیبی تیّدابوو، ئەمە لە پیّشەکی صەحیحی موسلیم دا هاتوە، وە لە گیّڕانەوەکانی عەبدوڵلاّی کوڕی عەباسدا باسی چەند کوراسەیەك دەکات کە شتی تیا نوسرابوو، کۆمەڵیّك لە خەڵکی تائیف هاتن بە کوراسەیەکەوە کە دەقەکەی ئاوایە (بکراسة منها ليردوها عنه) [4] .

---

[1] مسند الامام احمد بن حنبل ـ ج٤ ـ ص١٤١.

[2] (صحيح المسلم).

[3] سنن الترمذي ـ ص٥٨٦.

[4] العلل للترمذي ـ ص٦٩١.

سەعیدی کوڕی جوبەیر لە گێڕانەوەکانی عەبدوڵڵای کوڕی عەباسدا دەنووسیّ[1]، دەفتەرەکەی عەبدوڵڵای کوڕی عەمر کە ناودار بـوو بـە (الصـادقة) لای کوڕەزاکـەی بوو کە ناوی (عەمرو کوڕی شوعەیب) بـوو[2]، کۆکـەرەوانی فـەرمووده و سـوننەت، گێڕانەوەکانی عەمری کوڕی شـوعەیبیان بـە لاواز دەزانـی، چـونکە فـەرمووده لـەو دەفتەرە دەگێڕێتەوە، چونکە دەبوو خۆی لەبەر بیوتایە و بیگێڕایەتەوە، (وەهـبی تابیعی) گێڕانەوەکانی (جابری کوڕی عەبدوڵڵا)ی کۆدەکردەوە کە لای (ئیسماعیلی کوڕی عەبدولکـەریم) بـوو، ئەوانـەیان بـە لاواز دەزانـی، چـونکە لـەوی وەرگرتبـوو، خۆی لەبەر نەیدەوت[3]، (سولەیمانی کوڕی سەمرەی کوڕی جوندوب) دەگێڕێتەوە و دەڵیّ: "باوکم دەفتەرێکی هەبوو فەرموودەی تیـابوو، کوڕەکەشـی هـەمان هـەواڵی پێشوو دەگێڕێتەوە"[4].

(هومامی کوڕی منبه) هەندیّ ریوایەتی ئـەبو هـورەیرەی کۆکردبوویـەوە، ئـەبو هورەیرە لە هەموو سەحابەکان زیاتر گێڕانەوەی هەیە، لە هەموویان چاکتر بـوو لـە لەبەرکردندا، لەبەر ئەوە دەفتەرەکەی لەلای کۆکەرەوانی فەرموودە بـە (دەفتـەری هومـام) ناسـراوە، هـەروەها ئەحمـەدی کـوڕی حەنبـەلیش لـە بەشـی دووەمـی مەسنەدەکەیدا باسی کردووە و لێی وەرگرتـووە[5]، هـەروەها بەشـیری کـوڕی نهیـك گێڕانەوەکانی خۆی لە ئەبو هـورەیرەوە وەرگرتـووە و نووسـیویەتی کـە بـۆ خـۆی خوێندووەتەوە[6]، (ابن حجر) لە (فتح الباري)دا وتویەتی کە ئەبو هورەیرە پیـاوێکی هێنایە ماڵی خۆیان، کۆمەڵێك لاپەڕەی نیشاندا و وتی: ئەمانـە گێڕانـەوەکانی منـە، ئەوەی کە ئەو باسەی گێڕایەوە وتی: ئەو گێڕانەوانە بە دەست خۆی نەنووسراوە[7].

---

[1] الدارمي - ص٦٩

[2] سنن الترمذي - ص٦١ و ص١١٣.

[3] تهذيب التهذيب - ابن حجر - ج١ - ص٣١٦.

[4] تهذيب التهذيب - ج٤ - ص ١٩٨.

[5] مسند الامام احمد بن حنبل - ص٣١٢-٣١٨ - ط١.

[6] كتاب العلل - الترمذي - ص٦٩١. والدارمي - ص٦٨. السنن الكبرى - البيهقي - ١٠: ٢٨١.

[7] فتح الباري - ج١ - ص١٨٤

ئەنەسی کوڕی مالیك کە بەناوبانگە بە زۆریی گێڕانەوەی، بە منداڵەکانی دەگوت: ئەی منداڵەکانم زانست بنووسن و بە نووسین بینووسنەوە[1]، لە سەلماوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی عەباسم بینی ئەوانەی وەردەگرت لە (ئەبا رافع) خادمی پێغەمبەر کە کردویەتی یان گوتویەتی[2]، واقیدیی کە لە پێشینەکانە و سیرەی پێغەمبەری نووسیوە، دەڵێ: لای عەبدوڵڵای کوڕی عەباس ئەو نووسراوەم نووسی کە پێغەمبەر ناردبووی بۆ مونزیری کوڕی ساوی، گەورەی عومان لەگەڵ نووسراوی تردا[3]، لە مێژووی تەبەریدا هاتووە کە عورووەی کوڕی زوبەیر هەموو ئەوانەی کە لە غەزای بەدردا هاتبوو رووییدابوو بە درێژیی بۆ عەبدولمەلیکی خەلیفەی ئەمەوی نووسیبووی[4].

سەعیدی کوڕی جوبەیری تابیعی دەڵێ: هەرچی شەو لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمر و عەبدوڵڵای کوڕی عەباس دەمبیست دەمنووسیەوە، کە ڕۆژ دەبوویەوە جارێکی تر بە روونی و پاکیی دەمنووسیەوە[5]. عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود کتێبێکی دەرهێنا و وتی: بە خوا ئەم کتێبە دەستی ئیبن مەسعود نووسیویەتی[6]. سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: ئێمە کە لە هەندێ بۆچووندا جیاواز دەبووین، ئەوەمان دەنووسی، پاشان دەهاتین بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عەمر و نیشانیمان دەدا و پاشان ئەوەی نووسیبوومان دەمانشاردەوە، ئەگەر پێی بزانیایە، ئەوە دەبوویە هۆی جیابوونەوە و زویربوونی لێمان، واتە: ئیتر رازی نەدەبوو لە مەجلیسیدا ئامادەبووینایە. ئەسوەدی تابیعی دەڵێ: من و عەلقەمە رێمان کەوت لە نووسراوێك و هێنامان بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عەمر، ئەویش

---

[1] الدارمي ـ ص٦٨.

[2] طبقات ابن سعد، ٢١٢: ١٢٣.

[3] زاد المعاد ـ ج٢ ـ ص٥٧.

[4] تأريخ الطبري ـ ص.١٢٨٥

[5] الدارمي ـ ص٦٩.

[6] جامع بيان العلم ـ لأبن عبدالبر ـ ص١٧.

کوژاندیەوە[1]. زەیدی کوڕی سابیت کە یەکێکە لە نووسەرانی وەحی، نەیدەویست شتی تر بنووسێ جگە قورئان، مەروان ویستی فێڵی لێبکات و داینێ لەبەر دەستی خۆیدا و دانیشت، لە پشتی پەردەوە هەرچی دەبیست دەینووسی، موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانیش هەمان شتی پێکرد و زۆر قسەی بۆ کرد، بەڵام زەیدی کوڕی سابیت زۆر داوای کرد بیکوژێننەوە، هەتا کوژاندیانەوە[2].

ئەمە هەمووی زانیاریی بوو لەسەر ئەوەی کە لە سەردەمی پێغەمبەر و خەلیفەکان و سەحابە، سەردەمی بێ زانیاریی و نووسین نەبووە، وەك هەندێك لە رۆژهەڵاتناسان و گومانکەران پاگەندەی بۆ دەکەن، ئەمەم بۆیە هێنا هەتا بەرچاوی خوێنەر روونبێت کە هەر لە سەردەمی پێغەمبەر و خەلیفەکانی سەرەتای ئەمەویەکانەوە، لە دەیان کەس و کۆمەڵ و دەیان لاوە خەریکی نووسینەوەی قورئان و فەرموودە و سیرە و مێژوو بوون، هەر سەردەمێك بە شێوازی جیاوازی خۆی خەریك بون و زۆریان ئاگایان لەوانی تر نەبووە، جگە لەوەی سەدان کەس لە سەحابە و تابیعین جگە لەسەر کاغەز و پێستە و شتی تر، لەسەر پانتاییەکانی پەڕەی سنگ و دڵ و مێشکیان نووسیبوویان، واتە سەرەتا رووپەڕی دڵ و مێشك رچە شکێن بوون، پاشان خاوەن قەڵەمە دارو پەڕو کاغەز و پێستەکان لەوانیان وەرگرتووە، ئەم باسەمان درێژ کردەوە هەتا بەرچاو روون بن لە بارودۆخی لەبەرکردن و نووسینی بابەتە ئیسلامییەکان لەو سەردەمەدا.

سەحابەکان بە دەستی خۆیان فەرموودەیان دەنووسییەوە و پێغەمبەریش لە ژیاندا بوو، ئاگادار بوو، پاشان ئەوانەیان جێهێشت بۆ دوای خۆیان، تابیعیەکان هەوڵی سەحابەکانیان دەنووسییەوە و کۆدەکردەوە، زەحمەتی زۆریان کێشا و توانای فرەیان بەختکردو بەخەرجدا، گەڕان و سەفەری دووریان کرد، زۆریاندا لە دەرگای زانایان و هەڵگرانی فەرموودە، بۆ یەك تاکە فەرموودە کە دەیانوت لە فلان

---

[1] جامع بيان العلم - ص٣٢.

[2] مسند امام احمد - ج٥ ص ١٨٢.

دێ و شــار، لای فــلان کەســە، ڕێــی دوورو خەتــەرو مانــدووبوونیان دەبــڕی، بەناوبانگترینیان موحەممەدی کوڕی شـەهابی زوهـەری و هیشـامی کـوڕی عـروەی کوڕی زوبەیرو قەیسی کوڕی ئەبی حازم و عـەتای کـوڕی ئـەبی ڕەبـاح و سـەعیدی کوڕی جوبەیرو ئەبو زەنادو زۆری تر بوون، زانایانی تابعین بە سەدان کەس بـوون، وڵاتانیان بڕی، شار و دێ و شاخ و دەشت و بیابانی زۆریان پەیکرد، خۆیان بەست و توندوتۆڵ کردەوەو بۆی ڕێکەوتن، بە دوای سەحابەکاندا دەگەڕان، قوتابییەکانی ئەوانیش درێژەیان بە خـەباتی ئەوانـدا لـە کۆکردنـەوەی فـەرموودە و سـیرە، ئـەم خەزێنە و عەمبارە پڕ لە گەوهەرە مەزنەیان بۆ مرۆڤایەتیی کـۆکردەوە، کـە پـڕ لـە زانسـت و ڕەوشـت و مامەڵـە و وتـەی شـیرینە، ڕەنگـە سـەدان میلیـان بـە دوای پەیداکردنی یەك فـەرموودەدا بڕیبێـت، موحەممـەدی کـوڕی شـەهابی زوهـەری کـە ئیمـامی فـەرموودە و سـیرە و ژیـانی سـەحابە و تابعینـە، هەرچـی بیسـتبێ کـە پەیوەندیی بە پێغەمبەرەوە هەبێ نووسیویەتی، تەنانەت ئەبو زەفاد لـە بارەیـەوە دەڵـێ: (ئێمـە تـەنیا فـەرموودەی حـەڵاڵ و حـەراممان دەنووسـی، بـەڵام زوهـەری هەموو بابەتێکی دەنووسی[1]، تاوسی کـوڕی کیـاس دەڵـێ: (مـن و زوهـەری هـاوڕێ بووین، خەریکی پەیداکردنی زانست بووین، مـن وتم جگـە سـوننەت هـیچ نانووسـم، هەرچی پەیوەندیی بە پێغەمبەرەوە هەبوو دەینووسم، زوهەری وتـی: من ئەوەش و ئەوەشـی پەیوەنـدیی بـە سـەحابەوە هـەبێ دەینووسـم، چـونکە ئـەوەش هـەر لـە سوننەتە، وتم: ئەوە لە سوننەت نییە، من ئەوە نانووسـم، بـەڵام زوهـەری نووسـی، ئەو بردیەوە و من زەرەرم کرد)[2]، ئەو باسانە دڵـۆپێکن لـە دەریایـەك، هەنـدێك لـە تابعییەکان خەریکبوون بە نووسینەوەی فەرموودە و هەواڵـەوە، زوهـەریش یـەکێك بوو لەوانە، ئەوەی کە زوهەری نووسـیویەتی بـە تـەنها، توانایـەك بـوو لـە تەمـەن، دەفتەرەکانی زوهەری بە کۆڵێ بارگیر نەبوایـە هەڵنـەدەگیرا، دوای کـوژرانی وەلیـد

---

[1] جامع بيان العلم، ص٣٧.

[2] طبقات ابن سعد، ٢/٢: ١٣٥.

ئەو سیپارەیە لە خەزێنەکەیدا بوو، زوهەری سالّی (٥٠)ی کۆچیی لە دایك بوو، سالّی (١٢٤)ی کۆچیی وەفاتی کرد، نەسەب و رەگەزی قورەیشییە، هەموو تەمەن و توانای لە کۆکردنەوەی گێڕانەوەکاندا بەختکرد، لە نووسینەوەی ژیانی پێغەمبەر و فەرموودەکان و بانگەوازدا، مێژوونووسان دەڵێن: لە مەدینە بە مالّی ئەنسارەکاندا دەگەڕا، لە هەموو ماڵێکدا دەمایەوە و پرسیاری لێدەکردن لە فەرمووده و ژیانی پێغەمبەرو بانگەوازی، هەرکەسیانی دەبینی لە ژن و لە پیاوو پیرو گەنج، لە ورد و درشتی دەپرسی. لە سەردەمی زوهەریدا هەندێ سەحابە مابوون، سەدان قوتابیش سوودیان لە زوهەری بینی، هیچ کارێکیان نەبوو جگە لە کۆکردنەوەی فەرمووده و وتە و ژیانی سەحابە و فێرکردنی خەڵکان لە سوننەت و بانگەواز، هەموو تەمەنیان تەرخانکرد بۆ ئەو کارە.

گەورەترین هەڵە قسەی ئەو نووسەر و رۆژهەڵاتناسانەیە کە دەڵێن نووسینەوەی فەرمووده و قورئان و سیره و مێژووی ئیسلام دوای سەد سالّ لە وەفاتی پێغەمبەر بووە، هەڵەی دووەمیان، هەڵە تێگەیشتنە لە دیاریکردنی سەردەمی تابعیندا، کە دەڵێن لە سەردەمی تابعیندا نووسراوە، وا دەزانن تابعین دوای مردنی هەموو سەحابەکان هاتوون، بەلاّم هەندێك سەحابە هەتا دوا سالّی سەدەی یەکەمی کۆچی مابوون، لەوەوە دەڵێن: نووسینەوە لە سەردەمی تابعینەوە دەستیپێکرد، ئەوە هەمووی هەڵەیە، تابعین ئەوانەن کە پێغەمبەریان نەدیوە، یان لە دوا سەردەمی پێغەمبەردا لە دایك بوون، نەیان بینی، بەلاّم زۆربەی سەحابەکانیان دیوە و لێیان وەرگرتون، کەمترین دیارییکردنی تابعیەك کە دوای وەفاتی پێغەمبەر لە دایك بوو مانگی رەبیعی یەکەمی سالّی (١١) کۆچیی بوو، بەلاّم کاری تابعین و سەردەمی تابعین دوای مانگی رەبیعی یەکەمی سالّی (١١)ی کۆچیی دەستیپێکرد و لە سەردەمی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی و ئەو سەد هەزار سەحابەیەدا ژیاون و گەورەبوون و دەیانبینین و دەیانپرسی و لێیان دەبیستن و هەموو شت تێدەگەیشتن، واتە کە تابیعین هاتن، تەنها پێغەمبەریان نەدی، دەنا هەموو سەحابەکان لە مالّ و حالّ و بازاڕ و تێکۆشان و مزگەوتدا

بوون، ئەوان وادەزانن تابعین دوای مردنی دوا سەحابە دێت، هەڵەیەکی زەقە، وا نییە.

کۆکردنەوەی فەرموودەو ئەحکام و هەواڵ و رووداوەکان و نووسینەوەیان بە سێ قۆناغدا تێپەری:

قۆناغی یەکەم: ئەوە بوو کە پیاوەکان چییان لابوو، لە زانیاریی، نووسییان.

قۆناغی دووەم: خەڵکی هەر هەرێمێك لە ناوچەی خۆیدا، چی لای زاناکانی ئەو ناوچانە بووە، لە پەڕاوی تایبەتدا نووسییان.

قۆناغی سێیەم: کۆکردنەوە و نووسینەوەی هەموو زانستەکانی ئایینی ئیسلام لە هەموو ناوچەکان و هەرێمەکان لە بەرگی گەورەدا، ئەوەیە کە ئەمڕۆ لە بەردەستی ئێمەدایە.

قۆناغی یەکەم دوای وەفاتی پێغەمبەر بوو هەتا ساڵی (١٠٠)ی کۆچیی بوە.

قۆناغی دووەم لە ساڵی (١٠٠ – ١٥٠)ی کۆچیی بوە.

قۆناغی سێیەم لە ساڵی (١٥٠ – ٣٠٠)ی کۆچیی بوە.

لە قۆناغی یەکەمدا سەحابە گەورەکانی وەك ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی و عائیشە و زەید و هەموویان لەگەڵ گەورە تابعینەکاندا بەشدار بوون.

لە قۆناغی دووەمدا تابعییە بچووکەکان و ئەوانەی دوای تابعین هاتن بەشدار بوون.

لە قۆناغی سێیەمدا سەردەمی فەرموودەناسین و کۆکەرەوە مەزنەکان و پێشەوایانی سوننەی وەك پێشەوا موحەممەدی کوڕی ئیسماعیل بوخاری (ئیمامی بوخاری) و (موسلیم) خاوەنی (جامع الصحیح) و تورمـوزی و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بوو.

ئەوەی لە قۆناغی یەکەمدا کۆکرایەوە، لە قۆناغی دووەمدا لە بەرگ و کتێبدا نووسرایەوە، ئەوەی لە قۆناغی دووەمدا کرابوو بە کتێب و بەرگی گەورە، لە قۆناغی سێیەمدا رێکخراو پاك و پوخت کرا و بەش بەش کرا.

قۆناغی سێیەم بریتییە لەوەی کە ئەمڕۆ ئێمە لەبەردەستماندایە بە بەرگ و چاپی جۆراوجۆرو شەرح و تەعلیق و تەحقیق و تەعقیبی جیاواز و جوان، بە

جۆرەهـا بـاب و بـەش و لیسـت و ژمـارە بۆدانـان و لـق و پـۆ دروسـتکردن لـە زانستەکانی فەرموودەدا، ئەمانـە چـاپکراو بڵاوکرایـەوە بـە دەیـان هـەزار لاپـەڕەی کەشـخەو نەخشـەو نـەخش و نیگـار و چـاپی ڕەنگـاو ڕەنـگ، کـە بـە گـرنگترین و گەورەترین خەزێنە زانستییەکانی مرۆڤ و مێژوو ئەژمار دەکرێـت، بـەڵکو لـە هـەموو شارسـتانییە جۆراوجۆرەکـانی مێـژوودا وێنـەی نییـە بـە شارسـتانی ئـەورووپای نوێشەوە، بەتایبەت لە ڕووی زانستیی و ڕاستی و ڕونی سەنەدو پاکیی گێڕانـەوەی مێژوییەوە نییە ئەوەندە پوخـت و بڕواپێکراوبێـت، بـە ئەمانەتـەوە گوازراوەتـەوە، کەمترین هەڵە و ناجۆریی تێکەوتوە کە مامۆستای لێکۆڵـەر دکتـۆر جـەمال هـاتووە لـە خـەرواریك پەڕەیـەك و، لـە سـەدان هـەزار بـەرگ دە دوانـزە خـاڵی لاوازی کۆکردووەتـەوە و بـە هەنـدێ بوختـان و تانـەو هەڵبەسـتراوەوە ڕووپۆشـیکردوەو نیشانی داوەو دەیەوێ پێغەمبەرو ئایینی ئیسلامی پێناشیرین بکات، کە بە مەرجێ خۆی نەچووە بەرگە فەرموودە و سیرەکان بهێنێ و تاوتوێی بکات، بـەڵکو هەرچـی هەیە و نییە کورت و کەسەر لە ڕۆژهەلاتناسە گەورەکانی وەرگرتووە و بـە دەسـت بـڵاوی بـەناوی خۆیـەوە بـە ئێمـەی کـوردی بـە تـالآن دەفرۆشێتەوە، ئـەو هێنـدە دەروون ئاڵۆزە، تەنانەت نایەت وتەکانی ڕۆژهەلاتناسەکان وەك خـۆی بگوازێتـەوە، ئەوان زیاتر ئینساف بە خەرج دەدەن، بەڵکو بۆیەیـەکی تـری ڕسـتەکان دەکـات و موغریزانەترو بە مەبەستی زیاتر وشەکان دەخراپێنێ و دەیدات بە ناوچاوی کـوردە موسڵمانەکانداو دەڵێ ئەوە ئەو پێغەمبەرو ئیسلامەتانە کـە لـە هـەموو شـت زیـاتر خۆشـتان دەوێ و پابەنـدن پێـوەی، دەڵـێ ئـەوە ئـەو مێژووەیـە کـە هەمیشـە دەیخوێننەوە و دەروونی کوردانی پێپاراو دەدەن، ئەوە موحەممـەد و ئەبوبـەکر و عومەر و عائیشـە و فاتیمەیـە، کـە لـە هـەموو شـت بـە پیرۆزتـری دەزانـن و کـوڕو کیـژانی بەسـتەزمانی کوردیـان پێـوە نـاو دەنـێن! !، بـەڵام دکتـۆر جـەمال هـیچ شارستانیەتێکی نەدیوە لە مێژوودا بەرفراوانترو دەوڵەمەنـدتر بێـت لـە شارسـتانیی ئیسلامی، هیچ ژیارێکی لە مێژوودا نەدیوە هێندەی ژیاری ئیسـلامیی پایـەدارو پـڕ زانست و تەمەن درێـژ و دەوڵەمەنـد و ڕوون کـە هـەموو شـتێکی بێشـاردنەوە دیـار بێت، هیچ شتێکی ئیسلام نییە ئاڵۆز و پێچ و پەنای تیابێت، هەر لـە باسـی خـوا و

ژیاننامـەی پێغەمبـەر لـە منداڵییـەوە تـا مـردن و بنـەماکانی ئیسـلام و فـەرز و نەهییـەکانی روون و ئاشـکراو بێگـرێ و گـۆڵ بـە دەرەوەیـە، بـانگ و سـەلای موحەممەد شەو و رۆژ بە ئاشکرا لە دەنگۆکانەوە دێت، ئیسلام پێچ و پەناکانی ناو کەنیسـە و دێرەکـان نییـە، رۆژهەڵاتناسـان و چـەپ و ناڕاسـتەکانی لای خۆمـان و خۆفرۆشەکانی داگیرکـەران نییـە، هەرچـی هەیـە و نییـە لەسـەر رووپـەڕی سـەدان بەرگ نەخشاوە و ئامادەیە بۆ هەموو رەخنەیەك..

لـە کوردوسـتان شـەیتان پـەرسـت هەیـە شـەرم دەکـەن لـە سـەر تەلـەفزیون بەشـانازیەوە بڵـێن بـەڵێ ئێمـە شـەیتان دەپەرسـتین..! تەنانـەت عەلمانیـە بێباوەڕەکان بۆ ئەوەی لە ناو کوردا نامۆ نەبن، سود لە قورئان و مـەلاو مزگـەوت و ئاهەنگە ئیسلامیەکان دەبینن بۆ پەردەپۆشکردن و خۆشارنەوەی خۆیان، تەنانەت کۆمەڵـەی لیـنین و مارکسـی کـە تـا لەشـاخ بـون بەیاننامـەیان بلاّودەکـردەوەو دەیانگوت : ئێمە نەوەی مارکسین هـیچ دینێك ناپەرستین، بـەلاّم بـەم دواییـە کـە هاتنە ناو جادەو مەیدان وشارەکان یەکـەم شـت کـە خۆیانـان پێپـەردەپۆش کـرد ئیسلام و قورئان بوو، ئیسـلام هـەرگیز لـە مێـژودا ئـەو تـەریقی و خـۆ بـە کـەمی و حەشاردانەیان نەبوە.

کە ئیسلام هات، لە ماوەی (٢٥) ساڵدا شارستانیەتی پرستەمی فـارس و رۆمـی تاوانـدەوە، بـەلاّم دەسـتکاری دەسـت نـوس و ئاسـەواری فـارس و رۆم و فیرعەونـەکانی نـەکرد، وەك کەلـەپورێکی پاشمـاوەی شارسـتانیەکان و مێـژووی میللەتان پاراستی و هەتا ئەمرۆ ماون.

شێخ شبلی راستی فەرمووە کە دەڵێ: "گەلانی تـری جگـە موسـڵمانان، ئەگـەر بیانـەوێ راپـەڕین و هەڵسـانەوە بکـەن، دێـن وتـەی پیـاوە گـەورەکان و رووداوە گرنگـەکانیان کۆدەکەنـەوە و خۆیـانی پێگـەرم دەکەنـەوە، بـەلاّم سـەردەمەکە تێپـەڕیوەو زانیاریـان لـە بەردەسـتدا نیـەو نـاتوانن تـەواوی رووداوو سـاڵ و کەسایەتییەکان و مێژووی فەوتاویان دیاریی بکـەن، لەبـەر ئـەوە هیچـی وایـان بـۆ دەستناکەوێ و ناکرێت..!!، ناچـار هـەر کەسـە بـە کـەیف و هـەواو ئـارەزوو و

پێوانەی زەینی خۆیان لەسەری دەنووسن، پاشتر کەسێکی تر دێت ئەفسانە و پڕوپووچەکانی ئەوان لادەبات و راستییە مێژووییەکەی دەهێڵێتەوە، کە ئەویش هەر ناکاتە هیچ، زۆربەی گەلە ئەوروپییەکان باسی گەل و نەتەوە کۆنەکان و ئاین و مەزهەب و کەسایەتیە تێپەڕیوەکانیان کردووە، بەلاّم هەموو کەل و کول و کۆمەو نوقسانە و دڵ ئاو نادات، هەر بۆ نمونە با دور نەڕۆین ئەوەی دکتۆر جەمال خەریکیەتی لە مێژوی کوردا، هەر کات لە هەر پارچەیەکی کوردوستان کە شۆڕش دروست دەبوو، خەڵکیان بە باسی ئەیرەقیب و کاوەو زوحاك و کەیخەسرەوو فەرەیدون و رۆستەم وزۆراب و نەورۆزو زەردەشت و شتی تر گەرم دەکرد، بەلاّم ئەگەر لە هەر بازاڕی هەر شارێکی هەر پارچەیەکی کوردوستان لە سەدان کەس بپرسی کاوەو زوحاك و رۆستەم و زۆراب و کەیخەسرەوو فەرەیدون و نەورۆز و زەردەشت کێن و هی چ سەردەم و زەمان و حکومەتێك بون و چیان بۆ کورد کردوە..؟ بڕواناکەم هیچ کەسێك هەبێت وەلاّمێکی مانا بەخش و پڕزانیاریت بداتێ، یان هیچ نەبێت پێنج دێڕ زانیاری بە کاکڵە بدات بە دەستەوە..!!

بەلاّم مێژوی ئیسلام وانیە، هەموو گێڕانەوە و هەواڵ و ژیاننامەی محەمەدو سەرەتای ئیسلام سەر هەڵدانی موسوڵمانانیان نووسیوەتەوەو، مێژوی کوردیشیان لە ناو مێژوی خۆیاندا پاراستوەو هەر ئەوە بە مێژوی ڕاستەقینەی کورد دادەنرێ کە موسوڵمانەکان نوسیویانەو پاراستویانە، هەموو مێژوی ئیسلام و گەلانی موسوڵمان و مێژوی فەرمودەو سیرەیان لە سەدان بەرگدا نوسیوەو فەلسەفەی مێژوو و بنەما و رێسا و زمان و رێ و شوێنی ورد و بەهێزیان داناوە کە هەموو جار بۆی بگەڕێنەوە و باسەکانیان پێبپێون. هەر رووداوێك، یان هەواڵێك، یان زانیارییەك کە بیگێڕنەوە دەبێ دەم بە دەم و کەس بە کەس بیبرێتەوە سەر تابعییەکە و سەحابەکە و سەرچاوەی یەکەم، هەتا بزانن ئەو کەسەی هەواڵەکەی گواستووەتەوە (ثقة) بڕواپێکراوە، دەیبەنەوە سەر ئەو کەسەی کە خۆی لە رووداوەکەدا بووە، یان بینیویەتی، هەتا سەردەمەکە لە رووداوەکە دوور بکەوێتەوە، دەبێت کەسەکان و سەرچاوەکان ناو ببرێن و روون بن.

ئەو گێڕەرەوانە لە ئەمانەت پاراستنی گێڕانەوەدا عادل بون، شارەزاییان لە فیقه و راستبێژیی و، هەواڵ هەڵگرتن بە چاکیی، گێڕانەوەیان بە پاکیی، وەکو خۆی بێ کەم و زیاد و پێوەنان هەبوە، گەر دەرکەوت لە کەسێکدا، یان لە هەواڵێکدا گومانێك هەیە، بەدواداچوونی تیادەکرێ بەپێی ئەو بنەماو یاساو رێسایانەی کە دانراوە.

ئەو کارە ئەرکە، بەڵکو لە قورسترین ئەرکەکانە، لەگەڵ ئەمەشدا سەدان لە مێژونوس و فەرموود گێڕەرەوەکان یەکلابوونەتەوە بۆ ئەو کارە، توێژینەوە و لێکۆڵینەوەیان کردوە لەو دەستنوسە کۆکراوانەدا، هەموو تەمەنیان لەوەدا بەختکردوە، گەڕان و هەڵبژاردن و کۆکردنەوە و نووسین، دەیان وڵات و سەدان شارو دێ گەڕاون لەو پێناوەدا، ئەمە لە سەردەمێکدا کە رێگەو کاروان و هاتوچۆ خەتەرو قورس بوو، لە غەزا و جیهادی دوژمنان قورستر بوە، پاداشتیشیان لە پاداشی شەهید گەورەترە.

پاشان زانستێکی سەربەخۆ داهات لە زانستە ئیسلامییەکاندا، دواتر ناویان نا (أسماء الرجال)، ئەوە کارئاسانییەك بوو بۆ ئەوانەی کە دواتر دێن، کە بووەستن لەسەر سەدان هەزار ناو کە فەرموودە یان هەواڵیان گێڕاوەتەوە، یان زانا و کۆکەرەوەو گێڕەرەوەی هەواڵ و فەرموودە و شتی تر بوون.

ئەمە پەیوەندیی گێڕاوە و گێڕەر و هەڵگرانیەتی، لەولاشەوە زانستی رەخنەی فەرموودەو سیرەو مێژوو هەیە، کە چەند یاسا و بناغەو پایەیەکی پتەوی وردی هەیە بەکاری دەهێنن بۆ رەخنەگرتن لە گێڕانەوەکان و جیاکردنەوەی راستەکان لە خراپەکان و دەستکاریی کراوە هەڵبەستراوەکان، کامە دەبێ وەرگیرێ و کاری لەسەر بکرێ، کامەش پێویست ناکات، زانایانی سوننە گەڕاون هەتا بتوانن شتەکان بخەنەوە سەر راستەو، چەند شێوازێکی کار لە سەرکردنیان بۆ دانان، ئەو کارەیان بە راستی جێی رێز و دەتخۆشی ئیسلام و موسڵمانانە، بۆ نمونە لە ناو ئەوانەی کە گێڕانەوەکانیان هەڵگرتبوو پیاوانێك هەبوو لە دەسەڵاتدا بوون و خەڵکی لە زەبرو توندییان دەترسان، بەڵام نووسەرانی فەرموودە ئەوانەیان دادەبەزاندنە ئاستی

کەسێکی ئاسایی ئەنجا قسەیان لەگەڵ دەکردن، ئەوەی پێیان بوو لە ئەمانەت لێیان وەردەگرتن، هیچ ترسیان لە دەسەڵاتیان نەبوو، (وەکیع) یەکێك بوو لە کۆکەرەوانی فەرموودە، باوکی لێپرسراوی بەیتولمال بوو، ئەگەر لە باوکییەوە شتێکی بگێڕایەتەوە، دەیلکاند بە گێڕانەوەی کەسێکی ترەوە، بەڵام ئەگەر باوکی بلکاندایە بە گێڕانەوەیەکی جیاوازەوە، وەکیع لەو وەرگرتنە دەوەستا هەتا گێڕانەوەیەکی تر دەهات، کێ شتی وا وردی کردووە لە غەیری ئیسلامدا، شتێکی سەیرتر، کابرایەك هەزار دیناری هێنابوو بۆ ئیمام موعازی کوڕی موعاز بۆ ئەوەی لە کتێبەکەیدا شتی خراپ لەسەر کەسێك باس نەکات کە ناوی بردبوو، بەڵکو بێدەنگ بێت لەئاستی، ئەو بە توندی ڕەتیکردەوە و وتی من هەق ناشارمەوە[1].

کەس بووە وەك ئەوانە ئیحتیات بکات لە وەرگرتنی ئەمانەت و راسپاردە و زانستدا..؟ لە وتنی هەق و راستیدا ڕێك دەوەستان و لێیان لا نەدەدا، هەر بۆیە لەو ڕۆژەوە هەموو گێڕەرەوەکان و گێڕانەوەکانی سوننەت پارێزراون، هەروەك چۆن ئەمڕۆ دەبینین پاك و پوخت لەبەردەستماندایە و هەموو یاسا و ڕێسا و بنەمایەکی ڕەخنە ئامێزیان بۆ دانراوە و کێشان و پێوەری تایبەتییان بۆ دامەزراندووە و هەموو فەرموودەیەکیان پێ پێواوە، ئەو کەسانەشیان کێشاوە، ئەگەر زۆر بڕوادار نەبووبێ ماڵەکەیان داوەتەوە بە ملیداو لە کتێبەکاندا باس کراوە، فەرموودەی راست و دروست و بەهێز و لاواز و هەڵبەستراو جیاکراوەتەوە.

---

[1] تهذيب التهذيب، ج۲، ص۲۱۳.

## مێژووی دژایەتی پێغەمبەر محەممەد بتپەرستەکانی مەککە

پێغەمبەر ﷺ زۆر توند بووە بۆ ڕاگرتنی باوەڕەکەی و بە هیچی تری نەگۆڕیوەتەوە، تەنانەت هەموو هۆزە قورەیشیەکان بەرامبەری یەکدەگرن، ئەو بە تەنها دەبیاتەوەو هیچ کەمیەك بەرامبەر ئاینەکەی ناکات:

دوای ئەوەی وەحی هات بۆ پێغەمبەرو کەوتە جۆرە وتەیەك، کە لەو ناوەدا باو نەبوو، قسەو کرداری وا، پێچەوانەی عەقیدەو بیروباوەڕو کرداری خەڵك، تا ئەو کاتە لە موحەممەد نەوەشابوویەوە، ئەمە هەڵوێستەیەکی بە سەرکردەکانی قورەیش و، خاوەن بەرژەوەندییە بالاکان و خەڵکی مەککە کرد، دوای ئەوەی لە باوەڕە نوێیەکەی موحەممەد تێگەیشتن، هەستیانکرد ئەمە دژی بتەکانیانە، کە کردبوویانە خواو دەیانپەرست و قوربانییان بۆ دەکرد، بە دەستی خۆیان لە دارو بەرد تاشیبوویان، لە باوو باپیرانیانەوە بۆیان بەجێماوە، لەبەرئەوە، دوای لێکدانەوەو ڕاگۆڕینەوەو چەند دانیشتنێکی جدیی، بتپەرستان یەك کەوتن کە دوژمنایەتیی محەممەد بکەن، کە دەیەوێ واقعی جاهیلیان بگۆڕێت و خواکانیان ناشیرین بکات و گاڵتە بە ڕاو بۆچوونیان بکات، باس لە خوایەکی تەنهاو کاری مرۆڤ و بوونەوەر دەکات، لەبەرئەوە، کۆمەڵێك کارو شێوازیان وەرگرت بۆ وەستاندنی بانگەوازەکەی و بێدەنگ کردنی و دەستبەسەردا گرتنی. موحەممەد تا هەشت ساڵ، لای عەبدولموتەلیبی باپیری بوو، جوان بەخێوی کردو پەروەردەی کرد، کاتی مردنی، وەسیەتیکرد بۆ ئەبوتالیبی کوڕی کە کەفالەتی بکات و ئاگاداری بێت، ئەبوتالیب جوانتر لە باپیری بەخێویکرد، کاری بۆ دۆزیەوەو ژنی بۆهێناو بردی بۆ شام، پاشان کە بووە پێغەمبەرو دژی بتەکان وەستا، گەورەکانی مەککە چوون بە گژیدا، ئەو پشتی پێغەمبەری گرت و لە جوانترین شێوەدا پاراستی، بە مەرجێ لەگەڵیدا نەبوو لە ڕاو بۆچوون و یەکتاپەرستییدا، بەرگری لێکرد لە ناسکترین کاتێکدا کە ئەبوتالیب خۆشی لە خەتەردا بووە، قورەیش ناچاربوون پێیان بە جەرگی خۆیاندا ناو هاتنە لای ئەبوتالیب، کە گەورەی هەموو لایەکیان

بوو، وتیان: کوڕی براکەت، لە یانەو شوێنی پەرستنماندا ئازارمان دەدات، پێی بڵێ با وا نەکات، ئەبوتالیب بە پێغەمبەری وت: کوڕانی مامەت دەڵێن تۆ ئازاریان دەدەیت لە یانەو پەرستگایاندا، واز بێنە لە ئازاردانیان، پێغەمبەر چوو بۆ ناویان و سەری بەرزکردەوە بۆ ئاسمانو وتی: ئەو خۆرە دەبینن؟ وتیان: بەڵێ، وتی: من توانام نییە ڕووناکیی ئەوەتان لێبگرمەوە کە ڕووناکیتان نەداتێ، ئەبوتالیب وتی: وەڵلاهی ئەم کوڕی برامە هەرگیز درۆ ناکات، کورگەل بگەڕێنەوە عاقڵ بن..[1]

زۆرجاری تر قورەیش هەوڵیدا لە ڕێی بنەماڵەکەیەوە پاڵەپەستۆ بخاتە سەر پێغەمبەر، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون. قورەیش ئەوەندەی تر ئازاریان دەچەشت، خەفەت و ئیرەیی و دەیخواردن، کە پتەویی ئەم کوڕەو پاڵپشتی ئەبوتالیبیان دەبینی، جارێکی تریش چوونەوە بۆ لای ئەبوتالیب و، کوڕێکیان بۆ هێنا بە ناوی (عومارەی کوڕی وەلیدی کوڕی موغیرە) و بە ئەبوتالیبیان وت: (ئەی ئەبوتالیب ئەم کوڕە، عومارە کوڕی وەلیدە، لە ژیرترین و جوانترین لاوانی قورەیشە، وەك فدیەی کوشتن دەتدەینێ، یاریدەت دەدات، بیکە کوڕی خۆت، بەڵام کوڕی براکەتمان بدەرێ، کە پێچەوانەی ئایینەکەت و ئاییني باپیرانت کار دەکات، جیاوازیی و ناکۆکیی دەخاتە ناو هۆزەکەت، خەم و هیوامان تێکدەدات، بماندەرێ دەیکوژین، کوڕێك بە کوڕێك.. ئەو ووتی: (وەڵلاهی خراپترین کارم لەگەڵدا دەکەن، ئایا کوڕەکەتانم دەدەنێ بۆتان بەخێو بکەم، کوڕەکەی خۆمتانم بدەمێ بیکوژن.؟ ئەوە وەڵلاهی هەرگیز نابێت)[2]، مەردم دۆش دادەمێنێ لە بەرامبەر ئەم هەڵوێستە مەزنەی ئەبوتالیبدا، چارەنووسی خۆی بەستووە بە چارەنووسی موحەممەدی برازای، ئەو گەورەی بەنی هاشمە، بەنی هاشم و بەنی موتەلیبی لە هاوپەیمانیەکدا پێکەوە گرێداوە لەسەر ژیان و مردن بۆ پشتگیری لە پێغەمبەر، موسڵمان و بتپەرستان لەو هاوپەیمانیەدا هاوکارو هاوڕا بوون[3]، ئەنجا خستیە پەنای خۆی،

---

[1] صحیح السیرة النبویة، ابراهیم العلي ص ٧٨، دار النفائس-١٩٩٨.

[2] البدایة والنهایة- ج٣ ص٤٨.

[3] فقه السیرة النبویة ص١٨٤ منیرالغضبان- مكة المكرمة-١٩٩٦.

پەنایەکی کراوەی دایە پێغەمبەر کە هیچ دوو دڵیەکی تیا نەمابوویەوە، ئەوە دابێکی مەزن و رەوشتێکی جوان بوو، لە سەردەمی نەفامییدا لە شاری مەککەو دەوروبەری باو بوو، هەر کەس بچوایە پەنای هەر کەس ئیتر پەناهەندەی وەردەگرت و ئازادبوو، هەموو بەرگریەکی لێدەکرا، هەر بۆیە ئەبوتالیب هەردوو بنەماڵەی ئەبوتالیب و بەنی موتەلیبی یەك پێگرت، کە بە هەموو جۆرێك پشتی پێغەمبەر بگرن و بیپارێزن، تەنها ئەبی لەهەب نەهاتە ئەو ریزەو خۆی جیاکردەوە، ئەبوتالیب زۆردڵخۆش بوو بەو یەکگرتنە و باسی فەزڵ و مەزنیی پێغەمبەری بۆ کردن، بۆ بەهێزکردنی یەکیەتی و یەکریزی و یەکرایان، لەخۆشی ئەو یەکیەتیە، هۆنراوەیەکی بەناوبانگی پیاهەڵدان، بتپەرستەکانی مەککە پێش جولەکە لە مەدینە، رەخنەی توندیان لە پێغەمبەر و ئیسلام دەگرت، چونکە وەك چۆن جولەکە دەیزانی بە هاتنی ئیسلام ئایینی موسا نامێنێ، بتپەرستەکانی مەککەش دەیانزانی بە هاتنی موحەممەد باوی بتپەرستیی و زێواندارییی و سەرپەرشتیاریی کەعبەیان نامێنێ و دەسەلاتی سەرانی قورەیش دەکەوێتە خەتەرەوە، لە مەککە سەرەتا بە رەخنە و بوختان و سووکایەتیی پێکردن دەستیان پێکرد، پاشانیش بە سزا و گەمارۆی ئابووریی و پەیوەندیی پچرین و دەرکردن و نان برین و راوەدونان کۆتاییان پێهێنا، بتپەرستان ناکۆك نەبوون لەگەڵ پێغەمبەردا لەوەدا کە خوای گەورە ئەوانیش و هەموو شتی دروستکردووە، ئەوان بتپەرستییان لە دەرو دراوسێکانەوە بۆ گوێزرابوویەوە، دەنا لە سەرەتادا لەسەر ئایینی حەنەفیە و پاکی ئیبراهیم بوون، بەڵام دواتر بتپەرستییەکەیان ئەوەندە توند گرت کە خوایان لە بیرچوویەوە، کە موحەممەد هات و بووە پێغەمبەر ﷺ، ئەوەندە توند بەرەنگاری بوونەوە کە بە هیچ پێغەمبەرێك نەکرابێ لە مێژوودا، دەیانگوت خوا هاورێی جنۆکەیە، بە هەردووکیانەوە مەلائیکەیان لێ لە دایکبووە، مەلائیکە کچی خوایە، گاڵتەیان بە زیندووبوونەوە و رۆژی دوایی و بەهەشت و جەهەنم دەهات، دەیانگوت ژیان هەر ئەم دونیایەیە و تەواو، دەیانپرسی دەی ئەگەر هەیە ئادەی باووباپیرانمان زیندوو بکەنەوە؟!، کە ئێسقان رزا چۆن زیندوو دەکرێتەوە؟، قورئانیش لەو پرسیارانەدا زۆر ورد و بە بەڵگە

وەڵامی تێر و تەسەلی دەدانەوە، دەیانگوت دونیا و ئەستێرەکان و هەروا بەبێ حیکمەت دروستبوون، ژیان گاڵتە و گەپە، پاشان دەیانوت: کەسایەتیی موحەممەد بۆ پێغەمبەرایەتی ناشێ، ئەو بێ کەس و هەژارە، نابێ پێغەمبەر مرۆڤ بێ، نابێ نان بخوا و بگەڕێ بە بازاڕدا، دەبوو مەلائیکە بوایە، یان مەلائیکەیەکی لەگەڵدا بوایە، چۆن دەبێ بخوا و بخەوێ و بگەڕێ، دەبوو پێغەمبەر پارەی زۆر بوایە، ناودارێك بوایە و گەورەبوایە لە ناوماندا، با وەلید، یان عروە بوایە ئەوسا بڕوامان پێدەکرد، دەیانوت: موحەممەد شێتە، کاهینە، شاعیرە، ساحیر و جادوگەرە، بە درۆزنی تاوانباریان دەکرد، بەڵام ئەوان موحەممەدیان بە درۆزن نەدەزانی بەڵکو ئایینەکەیان بە درۆ دەزانی، دەیانوت: موحەممەد لە کابرایەکی ئەعجەمی فێر بووە کە لە ناو قورەیشیەکاندا بووە لە نزیك سەفا کەلوپەلی دەفرۆشت، دەیانوت بۆچی قورئان بە یەکجار نایەتە خوارەوە، دوای ئەوەی کە تەواو ماندوو بوون لە تاوانبارکردن و قسە پێوتن، ئەنجا بە کردەوە کەوتنە لێدان و بەرەنگاربوونەوەی، سەرەتا دەیانویست ئەبوتالیبی مامی لێ دووربخەنەوە و پشتی نەگرێت، بەڵام ئەو چارەنووسی پێغەمبەری بەستبوو بە خۆیەوە، لەبەر ئەوە پەنایدابوو، پەنادان لە سەردەمی نەفامیدا دابێکی جوان بوو، موسڵمانەکان زۆر سوودیان لێدەبینی، پاشان زۆر بۆ ئەبوتالیب دەهێنن ئەو هەر واز لە محەمەد ناهێنێ و پەنا دەباتە بەر کەعبە و پیرۆزییەکانی، سوێند دەخوات بە بت و کەعبە کە موحەممەد تەسلیم ناکات ئەگەر لافاوی خوێن هەڵسێت و جەنگی ناو قورەیش توندبێت، وەك لە شیعرەکەیدا دەڵێ:

كزبتم و بيت الله نبذي محمداً   ولما نطاعن دونه و نناضل

ونسلمه حتى نصدع حوله   ونذهل عن أبنائنا والحلائل[1]

ئەبوجەهل ویستی پەنای ئەبوتالیب ببڕێ و زەرەر بە موحەممەد بگەیەنێ، بەڵام هەمزە بە کەوانەکەی بەری گرت و وتی: قسە بە موحەممەد دەڵێی، کاتێك

---

[1] السيرة النبوية، الصلابي، ص ١٣٢.

من لەسەر ئایینی ئەوم، ئەگەر دەتوانی فەرموو بڵێ..؟ بە ڕاستی شتێکی سەیرە کە لە ناو بتپەرستاندا سەرۆکێك هەیە پاڵپشتی و پارێزگاری لە کەسێك دەکات کە بە سووك سەیری بتەکانیان دەکات، تۆمەت لە ئایینەکەیان دەداو، خەویان تێکدەدا، ئەو بتپەرستانە ئامادەن لەسەر محەممەد شەڕ و هەرا بکەن، بەرگری لێدەکەن و دەیپارێزن هەتا موحەممەد توشی خراپە نەبێت.! لە شیعرەکەدا ئەبوتالیب دەڵێ: هەرگیز موحەممەد تەسلیم ناکەم و وازی لێناهێنم، هەرگیزاو هەرگیز، هەتا لە پێناویدا تیادەچم، پەنا دەبەستێ بە کەعبەو پیرۆزییەکان و سوێند بە ماڵی خوا دەخوات، کە هەرگیز موحەممەد تەسلیم ناکات، تەنانەت ئەگەر ڕوبارێ خوێن دروست ببێ و، شەڕو هەرا گەرم ببێت لەگەڵ گەورەکانی مەککەدا. دەدا بە گوێی گەورەکانی بنەماڵەی عەبدولمەنافداو ناویان دەبات، کە سەریان شۆڕکرد بەرامبەری، نەیانتوانی بێنە ناو هاوپەیمانیەکەی بۆ بەرگری لە موحەممەد، ناوی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە دەبات، کە گوێی بۆ نەگرتن و ئیرەیی بردو درۆی کردوو دڵی پیسکردو خۆی بێنرخ کرد[1]، هەروەها ناوی ئەبوسوفیان و موتعەم کوڕی عودەی و، گەورەکانی بەنی نەوفل دەبات و گلەییان لێدەکات، بوونی ئەبوتالیب لە پاڵ موحەممەدی برازایدا، پاڵپشت و سەرکەوتنێکی مەزن بوو، سوودی لەو دابە خێڵەکیە وەرگرت و چووە پاڵ و پەنای مامی و، مامەی بووە پارێزگاری، لە هەموو خراپەیەك پاراستیان، ئازادبوو لە جوڵان و گەڕان و، مافی هەموو بیرکردنەوەو قسەو بانگەوازێکی هەبوو، ئەنجا قوڕەیشییەکان جەنگی پەلاماردان و ناشیرینکردنیان دژی موحەممەد و بانگەوازەکەی ڕاگەیاند، لیژنەیەك دروستکرا، وەلیدی کوڕی موغیرە دانرا بە سەرپەرشتیکردنی ئەو جەنگە، ئەویش دەستەیەکی لە هەموولایەنەکان دروستکرد، داوای لێکردن با هەموو خەڵك یەك رایان هەبێ لەسەر ناشیرینکردنی موحەممەد، کۆبکردنەوە و پێیوتن: بە رای ئێوە

---

[1] السيرة النبوية ـ الدكتور علي محمد الصلاح ـ دارالعرفة ـ بيروت ط٤ ٢٠٠٦ ص١٢٢ـ١٢٣.

پێی بڵێین چی..؟ یەکێك وتی: با ناشیرینی بکەین و بڵێین کاهینە، وەلید وتی: کامەیە کاهین، ئەو کەی کاهینیی کردووە؟ یەکێك وتی: با بڵێین شێتە.. وتی: جا کێ بڕوا دەکات موحەممەد شێت بێت. یەکێ وتی: با بڵێین شاعیرە، وەلید وتی: ئێمە دەزانین شیعر چۆنە، ئەمە لە شیعر ناچێت، یەکێ وتی: با بڵێین ساحیرە، وەلید وتی: نەخێر، ئەم وشانە هیچی لە موحەممەددا نییە، وتیان: ئەی چی بڵێین: وەلید وتی: وەڵڵاهی وتەکانی شیرینە وەك لە پوختەی هەنگوینەوە کۆکرابێتەوە، ئێوە ناتوانن هیچ بڵێن، هەرچی بڵێین وانییە، ئێوە هەرچی بڵێن لە بارەیەوە خەڵکی دەزانن وانییە، بەڵام باشترین وشە ئەوەیە کە بڵێین ساحیرە، ئەگەر خەڵکی وتی کوا ساحیرە، بڵێین ئەوە نییە جیاوازیی دەخاتە نێوان کوڕ و باوك و براکان و ژن و مێرد و کوڕ و هۆزەکەی[1].

ئەگەر دکتۆر جەمالیش لەو دانیشتنەدا بوایە و بیوتایە با بڵێین موحەممەد ناوی قثم کوڕی عەبدوللاتە، وەلید دەیوت: ئەوە تۆ خەڵکی کام وڵاتی؟، قثم کوڕی عەبدوللاتت لە کوێوە هێنا!؟ ئەگەر دکتۆر جەمال بیوتایە با بڵێین پێنج ساڵ دوای مردنی باوکی لە دایك بووە، واتە کوڕی باوکی خۆی نییە، وەلید دەیوت: ئەم قسانە منداڵانەیە و ئێمە هەموو موحەممەد و باوکی و ڕەچەڵەکی و دایکی دەناسین، هەرگیز کەس بڕوا ناکات بەم بوختانانە، تۆ بڕۆ لە سەردەمی خۆت و لەناو گەلی خۆتدا ئەو درۆیانە دروست بکە، بزانە کەسی وەك خۆت ساویلکە هەیە بڕوات پێبکات.؟ ئەگەر دکتۆر جەمال وتی: کاکە وەلید با بڵێین ئەم پیاوە سیی ژنی هێناوە، وەلید دەیوت: ئەمەت لە قوتووی چ عەتارێکدا هێناوە؟، کەی ئەوەندە ژنی هەیە، جا ژن زۆریی کەی عەیبەیە لەم سەردەمەی ئێمەدا، کەسمان نییە لە موحەممەد زیاتر ژنمان نەهێنابێ، وەلید دوو کۆیلە بانگ دەکات بە پاڵ

---

[1] السير والمغازي لأبن اسحاق، ص ١٥٠. تهذيب السيرة، ج١، ص٦٤.

دکتور جەمال بکەنە دەرەوەو پێی دەڵێ: تۆ یەك وشە بڵێ وەك ئەم هاوڕێیانەم، نەك ئەم هەموو راووڕێوی و درۆو دەلەسە بیسەرو بەرە !!.

بەوانەدا دیارە کە جەنگەکە زۆر ورد و نەخشە دارێـژراو و حیسابیی بووە، هەموو کات و سات و قۆناغێکیان بۆ دیاری کردووە.

لە سەرچاوەیەکی تردا بەم جۆرە هاتوە: وەلیدی کوڕی موغیرە پیرێك بوو، سەرکردایەتی جەنگی لەگەڵ پێغەمبەردا دەکرد، قورەیشی کۆکردەوەو پێی وتن: کە کاتی وەرزی حەج هات و خەڵك و نوێنەرانی عەرەب لە هەموو لاوە هاتن بۆ ئێرە بۆ مەککە، هەواڵی هاوڕێکەتان (محەممەد) دەبیستن، با ئێمە یەك ڕاو یەك قسە بین، قسەی جۆراوجۆر نەکەین، یەکتری بە درۆ نەخەینەوە، ئەنجا وتیان ئەی باوکە عەبدلشەمس تۆ ڕای خۆت بڵێ... وتی: بەڵکو ئێوە بڵێن، من دەبیستم. وتیان دەڵێین کاهینە، وتی: ئەو کاهین نییە، کاهینمان بینیوە، ئەو ورتە ورتی نییە. وتیان: دەڵێین شێتە، وتی: ئەو شێت نییەو شێتمان دیتووە، هیچ شێتیی پێوە دیار نییە، وتیان: دەڵێین شاعیرە، وتی: جا ئەو کەی شاعیرە، ئەو دەڵێ: بەلام شیعر دەزانین چۆنە، ئەو شاعیر نییە، وتیان: دەڵێین ساحیرو جادووگەرە، وتی: ئەو ساحیر نییە، ساحیر و سیحرەکانیانمان دیوە، ئەو فوو و گرێی نییە، وتیان: ئەی چی بڵێین باوکی عەبدولشەمس..؟ وتی: وەڵڵاهی وتەی شیرینە وەك هەنگوینە، ڕێکوپێکە وەك چنینی درومان پوخت و ڕێك و جوانە، هەرچی ئێوە وتتان وانییە، بەلام نزیکترین قسە هەر ئەوەیە بڵێن جادووگەرە، جیاوازیی دەخاتە نێوان کوڕو باوکەوە، پیاوو ژن لەیەکدەکات، کوڕ لە خێڵەکەی دەکات، خوا ئایەتی لە سەر وەلید دابەزاند کە دەڵێ: ئەوانە هیچی نییە، وتەی وەك هەنگوین شیرینە، خوا دەفەرموویت: ئێمەش ئەو دەیخەینە سەقەر، بەو جۆرە جەنگی دەروونییان لەگەڵ پێغەمبەر دەکرد، جەنگێکی هەروا سادە و ئاسان نەبوو، بەڵکو بە وردەکاریی و نەخشە، لەسەر بنەمای جەنگی دەروونیی ئەمڕۆ بوو، کاتی قەرەباڵغی حەجیان هەڵبژاردبو بە هەڵیان زانی، زانیان ناوی محەممەد حیجازو شام و عێراق گەیشتوەو سنووری خێڵەکانی تێپەڕاندوە، زانیان کە ئەو هەموو حاجیە،

له هەموو هۆزو ناوچەکانەوە کە دێنە مەککە، هەڵبەت بە تاسوقەوە لە هەواڵی ئەو لاوە ئازایە دەپرسن، کە بە تەنهاو ئیبراهیم ئاسا، بەگژ هەموو بتەکان و عەقیدەی میللەتاندا چوەتەوە، زانیان ئەوان بە وردی دەپرسن لە کەسایەتی و زیرەکی و ژیری و هاوڕێو کەس و کاری ئەو کوڕە، هەر بۆیە وتیان با هەموو یەك وتەو یەك ڕاو بۆچونمان هەبێت، قسە بکەینو دژی یەك نەبین و، کار لە نوێنەرەکانی حەج بکەین، دیارە وشەکانی قورئان کاریگەری لەسەر دەروون بووە، وەلید لە گەورەکانی قوڕەیش بوو، کاریگەر بوو بە قورئان، دانیناوە بە بەهێزیی وشەکانی و شیرینی، بەلام ئەو جەنگە هیچی نەکرد، نەیانتوانی دەنگی محەممەد بگرن و گومانی بخەنەسەر کە کاریگەری نەبێت، موحەممەد ئەو گەمارۆ توندەی بڕی و خۆی نواند، بە جوانی خۆی و باوەڕەکەی ناساندو سەرکەوتوو بوو، کە دەدوا گوێیان بۆشل دەکرد.

قوڕەیشیەکان وتبوویان موحەممەد شێت بووە، ئەوەندەیان باس کردبوو کە شێتە، کەسێك بە ناوی (زەمادی ئەزدی) کە خەریکی دوعا و چاوبەست خوێندن و شێت چاککردنەوەی ئەوانە بووە کە شەیتان و جنۆکە دەستیان لێ وەشاندبوون، جارێك وتی: ئەگەر ئەو پیاوەم (محەمەد) بینی کە ئێوە باسی دەکەن کارێکی بۆ دەکەم لەوانەیە خوا شیفای لەسەر دەستمدا بدات، ڕۆژێك موحەممەدی بینی پێیوت: ئەی موحەممەد دەتوانم لەو گرفتە و دەستلێوەشاندنە رزگارت بکەم، خەڵکی زۆر لە سەر دەستمدا شیفا دراون..!! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ان الحمد لله نحمده و نستعینه، من یهده الله فلا مضل له، ومن یضلل فلا هادي له، اشهد ان لا اله الا الله وحده لا شریك له، وان محمداً عبده ورسوله اما بعد) زەمادی وتی: ئادەی ئەو وشانەم بۆ دووبارە بکەرەوە، پێغەمبەر سێ جار بۆی وتەوە، زەمادی وتی: قسەی زۆری کاهین و شاعیر و ساحیرم بیستووە، بەلام وتەی وام هەرگیز نەبیستووە، بە راستی ئەم وشانە گەیشتووەتە قولایی ناوەڕاستی دەریا، یان

ئەوپەڕی، پاشان وتی: دەستت بێنە با بەیعەتت پێبدەم لەسەر ئیسلام، پێغەمبەر بەیعەتی لێوەرگرت و فەرمووی ئەمە بۆ گەلەکەشت، وتی: بۆ گەلەکەشم[1].

جارێك ئەبوجەهل وتی: ئەگەر موحەممەدتان بینی سوجدەی برد پێم بڵێن، با پێبنێم بەسەر ملیدا هەتا دەموچاوی دەچەقێ بە خۆڵدا، ڕۆژێك موحەممەد لای کەعبەدا سوجدەی دەبرد، ئەبوجەهل دەڵێ: سەیری ئەو ریابازە بکەن، ئادەی یەکێ بچێ لە فلان جێ هەندێ ریخ و شیاکە بهێنێ، کە هێنایان لە سووجدەدا کردیان بە سەروملیدا و پێی پێکەنین، ڕۆژێکی تر هەندێك لە بتپەرستەکان چواردەوریاندا و پێیانوت: تۆی قسەی ئاوا و ئاوا بە خواکانمان دەڵێی..؟ پێغەمبەر فەرمووی: بەڵێ منم ئەوانە دەڵێم، یەکێك پەلاماریدا و یەخەی گرت، بەڵام ئەبوبەکر فریای کەوت، وتی: کەسێك دەکوژن کە دەڵێ ئەڵڵا خوامە؟

نەك هەر بتپەرستانی قورەیش، دووڕووەکان و دراوسێکانی مەدینە و جولەکە و فارس و ڕۆم و هاوپەیمانەکانیان، دژایەتییان دەکرد و قسەیان بۆ هەڵدەبەست، خۆی دەیفەرموو: هیچ کەس هێندەی من لەبەر خوا نەترسێنراوە و ئازارنەدراوە، شەو و ڕۆژی سی کەس هاتوونەتە لام، هەر یەکە بۆ شتێك، من و بیلال چێشت نەبوو بیخۆین جگە شتێکی کەم، ئەمە جگە لە هاوڕێکانی کە چ دەردی سەری و مەینەتیەکیان پێکراوە و جێمان نییە باسیان بکەین.

ئەبولەهەب و ئوم جەمیلەی ژنی لە دەشت دڕك و زریسکیان یان بە کۆڵ دەهێنا و دەیانخستە بەر ڕێگەکەی و پیساییان دەخستە بەر دەرگای، لە کاتی حەجدا کە خەڵکی دەرەوە دەهاتنە مەککە، ئەبولەهەب لە بازاڕدا دوای موحەممەد دەکەوت و قسەکانی بە درۆ دەخستەوە، هەتا لە کۆتاییدا ویستیان بیکوژن، کە خوا سورەتی لەسەر ئەبولەهەب و ژنەکەی دابەزاند، ئەبولەهەب بەردێکی هەڵگرت و چوو بۆ لای، پێغەمبەرو ئەبوبەکر پێکەوەبوون، بە ئەبوبەکری وت: کوا هاوڕێکەت، بیستومە هەجوی کردووم، بە خوا بەم کلۆ بەردە دەمی دەشکێنم،

---

[1] السيرة النبوية. الصلابي ل ١٣٥.

بەڵام خوا نەیهێشت بیبینێ، پێغەمبەر دەیفەرموو: لەسەر خوا ئەوەندەم پێکراوە کە بە کەس نەکراوە، سی شەوو رۆژم لەگەڵ بیلالدا بەسەربردووە خواردن نەبووە بیخۆین، ئومەییەی کوڕی خەلەف تفی کرد لە ناوچاوانی پێغەمبەر[1]، کە چووە مەدینە دوژمنی نوێی بۆدروست بوو لە شێوازی جیاوازدا، وەك دووڕوو و جولەکە و فارس و رۆم و هاوپەیمانەکانیان، ئەبوسەعیدی خودری دەڵێ: پرسیم ئەی پێغەمبەری خوا کام لە خەڵك زیاتر بەڵاو موسیبەتیان دیووە..؟ فەرمووی پێغەمبەران، دوایی خواری ئەوان، بە گوێرەی پتەویو دەستگرتنی بە ئایینەکەیانەوە[2]، کارێك بەسەر سەحابەکان هات، رۆژێك عەبدورەحمانی کوڕی عەوف و هاوڕێکانی لە مەککە بە پێغەمبەریان وت: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە کەبتپەرست بووین، زۆر خاوەن رێزو قەدر بووین، کە بڕوامان هێنا نزم و کەم و بێنرخ بووین، فەرمووی: (من داوامکردووە بە لێبوردەیی و شەڕنەکردن لەگەڵ هۆزەکەمان)، بێگومان دەستگرتنەوەو لێبوردەیی و شەڕنەکردن لە مەککە حیکمەتی زۆری تیابوو، پەروەردە و خۆئامادەکردن لە بارودۆخێکی تایبەتدا، بانگەوازی ئاشتیخوازیانە کار و ئەنجامی زیاتر دەبێت هەتا شەڕ، بۆ دوورکەوتنەوە لەخوێنرشتن و دوژمن دروستکردن، قورئان هانیدەدان کە حەکیمانەتر کاربکەن، نەرمونیان بن، خۆگرین، هەڵنەچن، رووخۆش و نەرم بن، بۆ ئەو مەبەستە، خواو پێغەمبەر دەیان چیرۆکی پێغەمبەران و ئوخدودو ئەسحابی کەهف و زیلقەرنەین و زۆری تری بۆ دەگێڕانەوە، بەڵام بتپەرستان هەر لەسەر لێدان و کۆبوونەوەو بڕیاردان بەردەوام بوون، پاشان هاتنە سەر ئەوەی قسەی لەگەڵ بکەن، بزانن چیان دەوێ، (رۆژێك کۆبوونەوەو وتیان: کێ شارەزاترە لەجادوگەریی و کاهینی و شاعیری، با بچێتە لای ئەو پیاوەی کە تەفرەقەی تێخستووین و کاری پەرت کردووین و، ئایینەکەمان ناشیرین دەکات، با قسەی لەگەڵ بکات و بزانین چی

---

[1] الروض الانف ج٢ ص٣٢-٤٨.

[2] ابن ماجة، حديث رقم ٤٠٢٣.

دەوێت: وتیان کەس ناناسین جگە لە عوتبەی کوڕی رەبیعە، وتیان تۆی ئەی باوکی وەلید، عوتبە چوو بۆ لای وتی: ئەی موحەممەد تۆ چاکتری یان عەبدولموتەلیب..؟ پێغەمبەر بێدەنگ بوو، وتی: ئەگەر تۆ دەڵێی ئەوانە لە تۆ باشترن، دەی ئەوان ئەو خوایانەیان دەپەرست کە تۆ ناشیرینیان دەکەیت، ئەگەر دەڵێی تۆ لەوان باشتریت، دەی قسە بکە هەتا قسەت ببیستین، بە خوا ئێمە کەسمان نەدیوە لە ناو گەلەکەماندا لە تۆ نەگبەتتر بێت، ناکۆکیت کردە ناو کۆمەڵەکەمان و کاروبارت پەرت و بڵاوکردین، ئایینەکەمانت ناشیرین کرد، لە ناو عەرەبدا حەیات بردین و ناشیرینت کردین، هەتا ئەوەیان بۆ دروستبووە کە لە ناو قورەیشدا جادوگەرێك پەیدابووە، لە ناو قورەیشدا کاهینێك هەیە، بە خوا چاوەڕوانی ئەوە دەکەین، کە یەکێك بانگ هەڵبدات و لە ناوخۆماندا بەشمشێر بەربینە یەکتر، هەتا پێکەوە تیادەچین، ئەی پیاو، ئەگەر پێویستیەکت هەیە، هەموو پارەکانمان کۆ دەکەینەوەو دەتدەینێ، هەتا لە هەموو قورەیش دەوڵەمەنتر دەبیت، ئەگەر خۆشیی و بەرزییت دەوێ، کام ئافرەتی قورەیش دەڵێی هەڵبژێرە، دە ئافرەتت لێ مارە دەکەین، پێغەمبەر فەرمووی: (لێبوویتەوە) وتی: بەڵێ. پێغەمبەر فەرمووی: (حم * تَنزِيلٌ مِّنَ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ * كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآناً عَرَبِيّاً لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ) (فصلت : ١، ٣) عوتبە وتی: رجات لێدەکەم جگە لەمەت پێنەبوو..؟ وتی: نەخێر، گەڕایەوە لای قورەیش، وتیان: چیتکرد..؟ وتی: بەجێمنەهێشت هەتا هەرچی ئێوە وتتان، پێم وت. وتیان: ئەی وەڵامی دایتەوە..؟ وتی: بەڵێ، لە گێڕانەوەی ئیبن ئیسحاقدا دەڵێ: عوتبە وتی: شتێکم لێبیست، بە خوا هەرگیز شتی وام لێنەبیستبوو، بە خوا نە شیعر بوو، نەجادو بوو، لە کەهەنەش نەدەچوو، ئەی گەلی قورەیش گوێم لێبگرن، ئەو بدەنە دەست من، واز لەو پیاوە بهێنن چی دەکات با بیکات، وازی لێبێنن، بە خوا لە قسەکانی ئەو پیاوەدا هەواڵی مەزنیی دەدا، گەر عەرەب وەریبگرێ ئیتر بەسیەتی و هیچی تری ناوێ، گەر سەرکەوێ بەسەر عەرەبدا ئەوا موڵکی دەبێتە موڵکتان و مەزنیی و رێزی دەبێتە رێزی ئێوە، ئێوە لە هەموو کەس زیاتر پێی دڵخۆش دەبن. وتیان بە

خـوا دیـاره، بـه قسـه‌کانی جـادوی لێکـردوی ئـه‌ی بـاوکی وه‌لیـد، وتـی: ئـه‌وه ڕاو بۆچـوونی منـه، ئێـوه‌ش حـه‌زتان چـۆنه وابکـه‌ن ..)[1] ، دوای ئـه‌وه دیسـان سه‌رکرده‌کانی مه‌ککه زۆریـان ڕۆشـتنه‌وه بـۆ لای پێغه‌مبـه‌ر بـۆ ڕێکـه‌وتن، هه‌ندێ پێشنیاریان خسته به‌رده‌م که دڵـی نـه‌رم ده‌کـرد، یـه‌کێ ئه‌گـه‌ر بـه‌دوای خۆشـیی دنیاوه بێـت، بـه‌ڵام پێغه‌مبـه‌ر هه‌ڵوێسـتێکی تـری هـه‌بوو به‌رامبـه‌ریان، تـه‌نازول و مداهه‌نـه‌و کـارێکی فـێڵ و سیاسـیانه‌و خه‌ڵه‌تانـدن و عـه‌تف جوڵانـدنی نـه‌کرد به‌رامبـه‌ریان، چـونکه ئـه‌وه کـاری عه‌قیده‌یـه، هـیچ نه‌رمیـه‌کی نـاوێ و شـتی تـر هه‌ڵناگرێ، وه‌ڵامی پێغه‌مبـه‌ر ئه‌مـه بـوو: (چـیم داوه له‌وانـه‌ی ئـه‌وان ده‌یڵـێن، مـن نه‌هاتووم بۆ ئه‌وه‌ی که ئێوه بۆی هـاتوون، مـن داوای مـاڵ و سـامان و شـه‌ره‌ف و گه‌وره‌یی و ده‌سه‌ڵاتی ئێوه ناکه‌م، به‌ڵکو خوا ناردوومی بۆ سه‌رتان بـه پێغه‌مبـه‌ر، کتێبێکی ناردۆته سـه‌رم، فـه‌رمانی پێکـردوم کـه مـژده‌ده‌رو ترسـێنه‌ربم بـۆ ئێـوه، منیش نامه‌که‌ی خوام پێگه‌یاندون، ئامۆژگارییم کردوون، ئه‌گه‌ر لێموه‌رگرن ئـه‌وه‌ی که بۆم هێناون، ئه‌وه به‌شی خۆتان لـه دونیـاو قیامـه‌ت ده‌سـت ده‌کـه‌وێت، ئه‌گـه‌ر وه‌ری نه‌گرن و بیده‌نه‌وه به سه‌رمدا، ئه‌وا ئارام ده‌گرم خوا بیبڕێنێته‌وه هـه‌تا خـوا دادوه‌ری له نێوان من و ئێوه‌دا ده‌کات)[2]، ئه‌وه‌یش چـاری نـه‌بوو پێغه‌مبـه‌ری نـه‌رم نه‌کرد، که واز له نامه و عه‌قیده‌که‌ی بهێنێ، که بتپه‌رستان به‌رزیی و پته‌وی بـڕوا و ئایین و ده‌روونی موسـڵمانه‌کانیان دی، نائومێـد بـوون، ڕێیـه‌کی تریـان گرتـه بـه‌ر، ئه‌سـوه‌دی کـوڕی عه‌بدولموتـه‌لیب و وه‌لیـدی کـوڕی موغـه‌یره‌و ئومه‌ییـه‌ی کـوڕی خه‌ڵه‌ف و عاصی کوڕی وائیلیان نارد بۆ لای پێغه‌مبـه‌ر، (وتیـان: ئـه‌ی موحه‌ممـه‌د وه‌ره ئـه‌وه‌ی تـۆ ده‌یپه‌رسـتی، ئێمـه‌ش ده‌یپه‌رسـتین، ئـه‌وه‌ی ئێمـه ده‌یپه‌رسـتین تۆش بیپه‌رسته، وه‌ره با هه‌ردووکمان شه‌ریك بین له کـار و خواپه‌رسـتییدا، ئه‌گـه‌ر ئه‌وه‌ی تۆ ده‌یپه‌رستی باشـتر بـوو لـه‌وه‌ی ئێمـه ده‌یپه‌رسـتین، ئـه‌وه ئێمـه به‌شـی

---

[1] السيرة النبوية ابن هاشم ج١ ص٢٩٤.

[2] سيرة ابن هشام ج١ ص٢٩٥.

خۆمان لێدەسکەوت، ئەگەر ئەوەی ئێمەش باشتربوو لەوەی تۆ، ئەوە تۆش بەشی خۆت لێدەست دەکەوێ))، خوا بۆ ئەم پێشنیازە قورس و گرانە سورەتی (الکافرون)ی دابەزاند، ئەم سورەتە دەریخست کە ڕێی حەق و راستیی یەك رێگەیە و لاریی تیانییە، پەرستنی پاك و پوخت هەر بۆ خوا دەکرێ، رێی مامناوەند لە عەقیدەدا نییە، نەفامیی نەفامییەو ئیسلام ئیسلامەو بڕاوەتەوە، ناتوانیت هەردوکیان لەیەککاتدا بکەیت و لە یەك دڵدا جێی بکەیتەوە، جیاوازییمان زۆرەو ئایینی خۆتان بۆ خۆتان و ئاییني خۆم بۆخۆم.

کە ئەوەش سەری نەگرت و شکستی هێنا، قورەیشەکان نوێنەری تریان نارد، بە راستی قوریش ئازاو خاوەن دیبلۆماسی و مناوەرەو سەرکەوتووبوون، دەیانویست هەموو ڕێیەك لە پێغەمبەر بگرن، نوێنەری ئەم جارە پێکهاتبوو لە عەبدوڵلای کوڕی ئومەییە و وەلیدی کوڕی موغەیرەو موکرەزی کوڕی حەفص و عەمری کوڕی عەبدوڵلا، کوڕی ئەبی قەیس و عاصی کوڕی عامر، هاتن و پێشنیازێکی تریان پێشکەش کرد، داوایان کرد موحەممەد واز لە هەندێ جێی قورئان و ئایەت بهێنێ، ئەوانەی کە تورەیان دەکات و زەمی بتەکانیان دەکات لای بیات، خوای گەورەش وەلامێکی پڕاوپڕو یەکلاکەرەوەو بڕاوەی بۆ ناردن (... قَالَ الَّذِينَ لاَ يَرْجُونَ لِقَاءنَا ائْتِ بِقُرْآنٍ غَيْرِ هَـذَا أَوْ بَدِّلْهُ قُلْ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أُبَدِّلَهُ مِن تِلْقَاء نَفْسِي إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ) (یونس : ١٥ )

ئەو نوێنەرو وتوێژانە دەریدەخات کە تاچەندە قورەیش چۆکی دانەداوە لە بەردەم خۆگریی و یەکرایی و دانەبەزینی پێغەمبەر بەرامبەر قورەیش، کە واز لە بەشێك لە بتپەرستیی و زەعامەت و ماڵ و ژن و سەرۆکایەتی خۆیان دەهێنن و، دەیکەنە سەرکردەی دین و دنیایی خۆیان، بە مەرجێك موحەممەد لە گەڵیان یەك بێت و دژی خواکانیان نەبێ و ناوی خۆیان و خوایان نەبات، بەلام پێغەمبەر (د.خ) دەیگوت: هەردەبێ تەسلیم بن و واز لە بتەکان بهێنن، جۆری داواکانیان و کەسەکانیان دەگۆڕیی، بە هەموویانەوە دەگەڕان و دەیانگوت: کێ لە هەموومان

داناتر و زاناتر و قسه‌ ڕه‌وانتره‌، یا ئه‌وه‌ خۆی به‌ ته‌نها بڕوات، به‌ڵام ئه‌ویش ده‌هاته‌وه‌ ده‌یگوت: محه‌ممه‌د قسه‌یه‌کی کردوه‌ هه‌رگیز نه‌م بیستووه‌، وازی لێ بهێنن چی ده‌کات بابیکات.

نوێنه‌رانی یه‌که‌م و نوێنه‌رانی دووه‌م جیاواز بوون، جگه‌ وه‌لیدی کوڕی موغه‌یره‌ که‌ له‌ هه‌ردووکیاندا به‌شدار بوو، ده‌یانویست ڕووه‌کان جیاواز و، تواناکان و عه‌قڵه‌کان و ده‌نگه‌کان جۆرێ تر بن، به‌ڵکو یه‌کێکیان کاریگه‌رتر بێت. ئه‌نجا ڕوویان کرده‌ پێغه‌مبه‌رو داوایان لێکرد کاری موعجیزه‌یان بۆ بکات، ده‌یانویست گومان بۆ ئایینه‌که‌ی دروست بکه‌ن، ده‌یانگوت: ئاده‌ی له‌وێدا کانیه‌کمان بۆ هه‌ڵقوڵێنه‌، ئاده‌ی باخێکمان له‌ خورما و ترێ بۆ دروست بکه‌و ڕووبار به‌ ناو دارو دره‌خته‌کانیدا بڕوات، یا له‌ ئاسمانه‌وه‌ شتێك بکه‌وێته‌ خواره‌وه‌، یا خواو مه‌لائیکه‌ بێنه‌ پێشوازییمان و بێنه‌ خواره‌وه‌، یا خانوو کۆشکێکمان له‌ زه‌خره‌فه‌ و ئاڵتون بۆ دروست ببێت، ئاده‌ی یا په‌یژه‌و پلیکانه‌یه‌ك هه‌بێت پێیدا بچینه‌ سه‌ره‌وه‌ بزانین ئاسمان که‌سی لێیه‌، یا بۆ هه‌ریه‌که‌مان لاپه‌ڕه‌یه‌ك نامه‌و په‌یام بێته‌ خواره‌وه‌ نووسرابێت له‌ خواوه‌ بۆ فلان که‌س، ئاده‌ی یا شاخ بڕوات، زه‌وی شه‌ق ببات، مردووه‌کانمان زیندوو ببنه‌وه‌، ئه‌م داوایانه‌ بێبڕواکان له‌ پێغه‌مبه‌رانی پێشوویان کردووه‌، پێغه‌مبه‌ر ده‌یفه‌رموو: (من بۆ ئه‌وه‌ نه‌نێردراوم، به‌ڵکو من له‌لایه‌نی خواوه‌ به‌وه‌ نێرراوم، ئاگادارم کردوون بۆچی ناردومی بۆ لاتان، ئه‌گه‌ر وه‌ریبگرن ئه‌وه‌ به‌شی باشتان و به‌ختی باشتان وه‌رگرتووه‌ له‌ دنیاو له‌ قیامه‌تدا، ئه‌گه‌ر وه‌رینه‌گرن و بیده‌نه‌وه‌ به‌ سه‌رمدا، ئارام ده‌گرم هه‌تا خواخۆی دادوه‌رییمان ده‌کات.

پێغه‌مبه‌ر هاته‌وه‌ بۆ ماڵه‌وه‌، دڵ به‌ ئازار بوو له‌وه‌ی ئه‌و چی بۆ هێناون و، ئه‌وان چی لێداوا ده‌که‌ن و چۆن بیرده‌که‌نه‌وه‌، ئه‌یانگوت: ئاده‌ی یا کێوی سه‌فا ببێته‌ ئاڵتون، ئه‌وسا بڕوات پێدێنین، فه‌رمووی جا ده‌یکه‌ن..؟ وتیان: به‌ڵێ، دوعای کرد، جوبره‌ئیل هات وتی: خوا سه‌لامت لێده‌کات، ده‌فه‌رمووی: گه‌ر ده‌ته‌وێ سه‌فایان بۆ ده‌که‌مه‌ ئاڵتون، به‌ڵام ئه‌وه‌ی دوای ئه‌وه‌ کافر ببێت، سزایه‌کی وای

دەدەم، کەس وا سزا نەدرابێت، ئەگەر بشتەوێت دەرگای تەوبەو رەحمەت دەکەمەوە بۆیان، پێغەمبەر داوای تەوبەو رەحمەتی خوای کرد.

سەرکردەکانی قورەیش لەو داوایانە مەبەستیان بڕواکردن نەبوو، بەڵکو بۆ گەرمکردنی جەنگی راگەیاندن بوو دژی بانگەواز و خڵەفاندن و فێڵکردن، هەتا هۆزەکان دووربکەونەوە، کە قورەیش زانیان لاوازن بەرامبەر موحەممەد و بانگەوازەکەی و هیچیان پێناکرێت، نەزری کوڕی حارس، تەعبیری لەو لاوازییە دەکرد پێی وتن: ئەی گەلی قورەیش بە خوا کارێکی گرنگتان بۆ دابەزیووە، ئیتر جێی فروفێڵ نەماوە، بیر لەخۆتان بکەنەوە بە خوا کارێکی زۆر مەزنتان بۆ دابەزیوە ! ! دوای ئەوە قورەیش بڕیاریان دا نەزری کوڕی حارس و عەقەبەی کوڕی ئەبو موعیت بنێرن بۆ لای زانا جولەکەکان لە مەدینە، هەتا حەقیقەتی ئەم بانگەوازە بزانن، نەك دوای کەون، بەلام دەیانزانی جولەکە ڕاست نارۆن، چونکە هیچ پێغەمبەرێکیان خۆش ناوێ، نزیکبوونەوەی کۆمەڵی بتپەرستیی لەگەڵ جولەکە گونجاوە بۆ زاڵبوون بەسەر بانگەوازدا، لەگەڵ ئەمەدا زانیاری زۆریان دا بە نوێنەرانی مەککە بۆ لاوازکردنی پێغەمبەر، زاناو ئەحبارەکانی جولەکە وتیان باسی موحەممەدمان بۆ بکە و رەوشت و سیفەتەکانی و هەندێ لەقسەکانی، پاشان وتیان: ئێوە خاوەن تەوراتن، هاتووین هەتا هەواڵی هاوڕێکەمانمان بدەنێ، ئەحباری جولەکە وتیان: پرسیاری لێ بکەن لە سێ شت، ئەگەر هەواڵیدانێ ئەوە پێغەمبەرەو رەوانە کراوە، گەر نەیزانی، ئەوە ناتوانێ و هیچ نییە، پرسیاری لێ بکەن لە کۆمەڵە لاوێك کە لە سەردەمی کۆندا ڕۆیشتوون.؟ ئەوانە چی بوون و چیان بەسەرهات..؟ ئەوانە چیرۆکێکی سەرسوڕمانیان بووە. پرسیاری لێ بکەن لە پیاوێکی گەڕۆك بۆ ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای زەوی چووە، هەواڵی ئەوە چییە..؟ پرسیاری لێ بکەن لە بارەی ڕۆحەوە..؟ ئەگەر وەلامی دانەوە، ئەوە پێغەمبەرەو دوای بکەون، نوێنەرەکان هاتنەوە، هەواڵەکەیان بۆ قورەیش گێڕایەوە، وتیان بابچین کاری خۆمان لە گەڵ موحەممەدا یەکلابکەینەوە، چوونە لای پێغەمبەر و

وتیان: ئەی موحەممەد، پرسیارمان هەیە وەڵامی بدەرەوە، سێ پرسیارەکەیان لێکرد، خوا سورەتی کەهفی بۆ دابەزاندن، کە باس لە ئەصحابی کەهف و زیلقەرنەین و خزرو موساو زۆر باسی تر دەکات. قورەیشییەکان و جولەکە سەریانسوڕما لەو هەموو هەواڵە، دوایی زانیان ئەمانە خۆ خەریککردنی زیادەیەو، هیچ چاری تیا نیە، چونکە هەتا دەهات موسڵمانان لە زۆریی و بە هێزیی و بڵاوبوونەوەدایە، قوریشییەکان کۆبوونەوە و بڕیاریاندا بە ئاشکرا پێغەمبەر بکوژن، کە ئەم هەواڵە گەیشتە ئەبوتالیب، کافرو موسوڵمانی بنەماڵەی عەبدولموتەلیبی کۆکردەوە، چوونە دەوری پێغەمبەر، ئەوانە هەبوو کۆبونەوە، هەبوو محەممەدی نەدەویست، بەڵام بۆ خێڵایەتیی و حەمیەو خزمایەتی هاتبوو، هەبوو بۆ ئیمان و بڕوا هاتبوو، کە قورەیش زانیان خزمەکانی دەوریان داوە، بڕیاریاندا قسەیان لەگەڵ نەکەن، کڕین و فرۆشتن و ژن و ژنخوازییان لەگەڵ نەکەن، سەردانیان نەکەن و لەگەڵیان دانەنیشن، هەتا پێغەمبەریان دەدەنێ بیکوژن، لاپەڕەیەکیان بۆ ئەمە نووسی، کە هەرگیز لەگەڵ بەنی هاشم ڕێکەوتن نەکەن و ڕەحمیان پێنەکەن، هەتا موحەممەد تەسلیم نەکەن بیکوژن!

بەنی هاشم سێ ساڵ لەو دۆڵەو گەمارۆیەدا مانەوە، زۆر زەحمەت و نەهامەتی و برسێتی و مەراقیان خوارد، کە شەو دادەهات داوای دەکرد پێغەمبەر بچێتە سەر جێگەکەی، هەتا ببینێ کێ دێت دەیەوێت فێڵی لێ بکات، یان نییەتی خراپی هەبێت، کە خەڵك دەخەوتن، دەستی یەکێك لەکوڕانی، یان براکانی، یان کوڕە مامەکانی دەگرت و لەسەر جێگەکەی پێغەمبەر دەیخەواندو داوای لە پێغەمبەر دەکرد بچێتە سەر جێگەی یەکێکیان بخەوێ[1]، گەمارۆ توند بوو لەسەر سەحابەو بنەماڵەی هاشمو عەبدولموتەلیب، هەتا ناچاربوون گەڵای داریان دەخوارد، دوای سێ ساڵ چەند کەسێکی قورەیش پەیدابوون ویستیان ئەو ڕێکەوتنە بشکێنن،

---

[1] فقه السيرة النبويه ، منيرالغضبان ، مكة المكرمة ، ص١٨٠.

هشام كوڕی عەمری هاشمی چوو بۆ لای زوهەیری كوڕی ئەبوئومەییەی مەخزومی، دایكی ناوی عاتیكە بوو، كچی عەبدولموتەلیب بوو، پێیوت: زوهەیر تۆ ڕازیت خواردن بخۆیت و جل لەبەربكەیت و ژن بهێنی و خاڵوانت ئاوایان بەسەر بێت؟ بەڵام سوێند بە خوا ئەگەر من، خاڵوانی باوكم حەكەمی كوڕی هشام بوایە، تۆ داوات لە من بكردایە، وەك من داوات لێدەكەم، هەرگیز وەڵامم نەدەدایتەوە.؟ دەڵێ: ئەوە چیە ئەی هشام، چی بكەم بڵێ؟ من یەك كەسم، ئەگەر كەسێكی ترم لەگەڵ بوایە ئەوە پەیمانم دەشكاند، وتی: كەسێك شك دەبەم، وتی: كێیە..؟ وتی: من، زوهەیر وتی: سێهەمێك پەیدابكە، چوو بۆ لای موتعەم كوڕی عودەی، پێی وت: ئایا ڕازی دەبیت كە دوو ڕەچەڵەكمان لە بەنی عەبدولمەناف تیابچن و تۆسەیركەربیت و ڕازی بیت قوڕەیش وابكات..؟ بە خوا ئەگەر من بمتوانیایە بە پەلە دەچووم و نەمدەهێشت، وتی: باشە ئەی چی بكەم..؟ من یەك كەسم، وتی: دووەمێكیشت هەیە، دەڵێ: كێیە..؟ وتی: من، وتی: سێ هەمێك پەیدابكە.؟ وتی: پەیدام كردووە، وتی: كێیە.؟ وتی: زوهەیری كوڕی بەنی ئومەییە، وتی: چوارەمێك پەیدا بكە، چوو بۆ لای ئەبو بەختەری كوڕی هیشام، ئەویش وتی: پێنجەمێك پەیدا بكە، چووە لای زومعە كوڕی ئەسوەدی كوڕی موتەلیب .. شەو هەموویان لە بەرزاییەكی دەوری مەككە كۆبوونەوە، قسەیان یەكخست بۆ دڕاندنی لاپەڕەكەی سەر دیواری كەعبە. زوهەیر وتی: من یەكەم كەس دەبم قسە دەكەم، كە ڕۆژبوویەوە خۆی گۆڕی، حەوت جار بە دەوری كەعبەدا تەواف كرد، ئەنجا ڕوویكردە دارنەدوەو بە خەڵكەكەی وت: ئایا خواردن دەخۆن و جل و بەرگ لەبەر دەكەن و بەنوهاشمیش ئەوەتە تیادەچێ، نێوەش كڕین و فرۆشتنیان لە گەڵ ناكەن، بە خوا دانانیشم هەتا ئەولاپەڕە ستەمكارە نەدڕێنم، ئەبوجەهل وتی: درۆت كرد، وەڵڵاهی نایدڕێنی، زەمعەی كوڕی ئەسوەد وتی: وەڵڵاهی تۆ درۆت كرد، ئێمە ڕازی نەبووین كاتێك نووسیتن، ئەبو بەختەریش وتی: زمعە ڕاست دەكات، ڕازی نین بەوەی تیانووسراوە، بڕیاریشی لەسەر نادەین، موتعەم كوڕی عودەیش وتی: قسەكانتان ڕاستەو هەرچی پێچەوانەی ئەوەبێ درۆ دەكات، لای خوا خۆمان لەوە

بەری دەکەین کە تیا نووسراوە، هیشام کوڕی عەمریش هەروەکو ئەوانی وت، ئەبوجەهل وتی: ئەم ئیشە بە شەو کراوەو لە جێیەکی تر راپرسیی لەسەر کراوە، ئەبوتالیب دانیشتووە لە جێیەکی مزگەوتەکەداو هیچ قسە ناکات[1]، موتعەمی کوڕی عودەی هەڵسا چوو لاپەڕەکە بدڕێنێ، دەبینێ خۆرە هەموو وشەکانی خواردووە، جگە (بسمك اللّهم)، پێشتر پێغەمبەر ئەبوتالیبی مامی ئاگادار کردبوو کە خۆرە نووسینی لاپەڕەکەی خواردووە جگە ناوی خوا، ئەبوتالیبیش چوو بۆ لای سەرگەورەکانی هۆزەکەی، ئەو هەواڵەی دانێ و پێیوتن: موحەممەد وا دەڵێ: ئەگەر درۆی کرد موحەممەدتان دەدەمێ بیکوژن، ئەگەر راستی کرد ئایا ئەوە ناتانگێڕێتەوە هەتا خۆتان بە سەرماندا نەنوێنن..؟ پەیمانی لێوەرگرتن، ئەوانیش قبوڵیان کرد، کە کردیانەوە دەبینن هەر ئەوەیە کە پێغەمبەر وتبووی، لەوێدا موتعەم و هشام وتیان لەو نامە بڕیارە هیچە ستەمکارە بەرین، رێگە نادەین کەس خۆمان و گەورەکانمان سوك و خراپ بکات، خەڵکی تر زۆر دایانە پاڵیان و لە دۆڵەکە هاتنە دەرەوە. دوای موسڵمانبوونی هەمزە، عومەریش موسڵمان بوو کە خاوەن شەکیمەو هەیبەت بوو، کە موسڵمان بوو لەگەڵ هەمزەدا زاڵ بوون بەسەر قوڕەیشدا، موسڵمانبوونی ئەم دووکەسە مەزنە دوای دەرچوونی موسڵمانان بوو بۆ حەبەشە، موسڵمان بوونیان سەربەرزی بوو بۆ موسڵمانان، داخ و خەفەت و شکستی بوو بۆ بتپەرستان، هاندەرێك بوو بۆ هاوڕێکانی پێغەمبەر، کە بە ئاشکرا باسی ئایینەکەیان بکەن، (ئیبن مەسعود) دەڵێ: موسڵمانبوونی عومەر فەتحێك بوو، کۆچکردنی سەرکەوتن بوو، ئەمارەتەکەی رەحمەت بوو، ئێمە نوێژمان نەدەکرد لای کەعبەدا، هەتا عومەر موسڵمان بوو، کە موسڵمان بوو شەڕی لەگەڵ قوڕەیش کرد، هەتا نوێژی لە پاڵ کەعبەدا دەکرد ئێمەش نوێژمان لەگەڵ کرد[2]، لە عەبدولای کوڕی عومەرەوە دەگێڕنەوە: کە عومەر موسڵمان بوو، وتی: کام

---

[1] ص١٨٣ـ ١٨٤ السيرة النبوية، الصلابي.

[2] ابن هشام ج١ ص٣٦٥.

قورەیشـیە جـوانتر رووداو دەگێڕێتـەوە..؟ پێیـانوت: جـەمیلی کـوڕی مەعمــەری جومەحی، هات بۆ لای، عەبدولاّ دەڵێ: منـیش دوای کـەوتم، وتم بـزانم عومـەر چـی دەکات؟ هەتا گەیشتە لای، پێی وت: ئایا جـەمیل دەزانیـت مـن موسـڵمان بـووم و چوومە سـەر ئـاییني موحەممـەد، وتـی: بـە خـوا هیچـی نـەوت، هەڵسـاو جلـەکانی عومەری ڕاکێشا، عومەر دوای کەوت، منیش دوای بـاوکم کـەوتم، هـەتا لـە بـەردەم دەرگای کەعبەدا وەستاو، بە هەموو هێـزی هـاواری کـرد: ئـەی کۆمـەڵی قـورەیش، ئەوان لە یانەکەیاندا بوون لـە نزیـك کەعبـە ـ ئایـا نـازانن عومـەری خـەتاب بووەتـە گاور، وتی: عومـەر کە لە دوایـەوە بـوو وتـی: درۆی کـرد، بـەڵکو موسـڵمان بـووم و شایەتی دەدەم کە هیچ خوایەك نییە جگە ئەڵلاو، موحەممەدیش بەندەو نێـردراوی ئەوە، خەڵکەکە هێرشیان کردە سەری و بووە شەڕیان، هەتا خۆر هاتە ڕاسـەریان، عومەر لەهۆش خۆی چوو، لەسـەر سـەری وەسـتان، ئـەو دەیگـوت: چـی دەتـوانن بیکـەن، سـوێندی خـوارد بـە خـوا ئەگـەر سـێ سـەد کـەس بووینایـە، یـان بۆمـان جێدەهێشتن، یان پێمان جێدەهێشتن، موسـڵمانان ڕۆژیـان لێبوویـەوە، بـەلاّم وەك ئەو ڕۆژانە نەبوو پـێش کۆچـکردنیان بـۆ حەبەشـە، کـە نەیانـدەتوانی هـیچ بکـەن، پشتیان بە هـەمزەو عومـەر دەبەسـت و نوێـژیان لای کەعبـەدا دەکـرد، کـە ئەوسـا نەیاندەتوانی بیکەن، لە ماڵی ئەرقـەم دەرچـوون، بـە ئاشـکرا باسـی خوایانـدەکرد هەتا چوونە مزگەوت، قورەیش وازی لەو لێدان و ئازارە درندانەیە هێنـا کـە پێشـتر پێیدەکردن[1]، بارودۆخ لەگەڵ ئەوەی پێش کۆچ گۆڕا، ئەم هەواڵـە لـە مەککـەوە لـە ڕێی کەشتیوانی جدەو بازرگانەکانەوە گەیشتە حەبەشە، ئەوان لە تاراوگە، غـەریب و دوورە وڵات بوون، مەیلی دڵیان بۆ خاك و کـەس و کـارو پێغەمبـەرو سـەحابەکان

---

[1] سبل الهدي والرشاد في سيرة خير العباد: محمد بن يوسف الصالحي، ج٢ ص٤٩٨ تحقيق مصطفي عبدالواحد.

پەیدابوو، لەم بارودۆخە نوێیەدا گەڕانەوە مەککە[1]، هەموو سەرچاوەکان گەڕانەوەی ئەوانە دەگەڕێننەوە بۆ هۆی موسڵمان بوونی هەمزەو عومەر، بەڵام قورەیش بە شێوازی نوێتر بەرەنگاری ئیسلامبوونی هەمزەو عومەر بوویەوە، بە فێڵ و توندیی و تۆقاندن دژی موسڵمانەکان، ئەویش گەمارۆو پەیوەندیی پچڕان بوو، لەسەریان، بارودۆخ توندبوو موسڵمانەکان گەڕانەوە حەبەشە بۆ جاری دووەم، ژمارەیەکی زۆرتریان پێوە نووسا[2]، ئیبن ئیسحاق دەڵێ: بوون بە (٨٣) کەس، ئەگەر عەماری کوڕی یاسر لەگەڵیاندا نەبووبێ، ئەوە (٨٢) کەس بوون، قورەیشیەکان کە دییان سەحابەکان جێیەکی هێمنیان بۆ بووە، نوێنەریان ناردە بۆ حەبەشە کە بیانگێڕنەوە بۆ مەککە، چوونە لای نەجاشی، وتیان بە خوا ئێستا هەموو عەیبەکانیان باس دەکەین و، سەر دەکەوین بە سەر چاك و خراپیاندا، یەکێکیان وتی: هیچ مەڵێ لە بەر خزمایەتی عەیبە.! وتی: بە خوا لەوێ دەیڵێم، ئەمانە بە عیسا دەڵێن وەك خەڵك بەندەیەو عەبدە، نەجاشی ساڵی هەشتەم یان نۆیەمی کۆچی مرد، پێغەمبەر لە مەدینەوە نوێژی مردووی لەسەرکردو فەرمووی: (مات اليوم رجل صالح فقوموا فصلوا علي أخيكم أصحمة)[3]، لە کۆچەراندا جەعفەری کوڕی مامی پێغەمبەر و عوسمانی زاوای و روقیەی کچی پێغەمبەری تیابوو، کۆچەکەیان لەبەر سزاو ئازار و برسێتی و، لە ترسی فیتنەی هەڵگەڕانەوە و، بۆ سەرخستنی ئاین و بڵاوکردنەوەی، بە خۆیان و ئایینەکەیان، هەڵهاتن بۆ لای خوا، ئەوە بۆ پاراستن و پارێزگاری لە عەقیدەو ئازادی بوو، بۆ بەردان و کردنەوەو رزگاری بوو لە چەقبەستویی و، ئازاد کردنی بانگەواز و گەڕان بە دوای جێی هێمن و ئارامدا، بۆ ئەوە حەبەشەیان هەڵبژارد، چونکە نەجاشیی دادپەروەر

---

[1] تأملات في سيرة الرسول - د. محمد سيدالوكيل ص٥٩، دارالمجتمع ١٩٨٧. الهجرة في القرآن الكريم ص٣٠٢ أخرمي سامعون جزولي - مكتبة الرشد الرياض، ١٩٩٦.

[2] السيرة النبوية، د. الصلابي - ص١٩٦ .

[3] صحيح البخاري - رقم ٣٨٧٧.

و صالح بوو، جێی بازرگانی قورەیش بوو، موسڵمانەکان شارەزابوون تیایدا، ولاتێکی هێمن و ئارام بوو، لەسەر ئایینی ئاسمانی بوون، پابەند بوون بە گاوری، کە نزیکتربوو لە ئیسلام، دەڵێن دایانەکەی پێغەمبەر ئوم ئەیمەن لە بنەڕەتدا حەبەشی بوو.

## محەممەدو جولەکەکانی مەدینە

کە پێغەمبەر موحەممەد ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە و مزگەوتی (قوباء)یان دروستکرد، عەبدوڵلای کوڕی سەلام زانای جولەکەکانی مەدینە، وتی دەچم سێ پرسیاری لێدەکەم، ئەگەر زانی، ئەوە پێغەمبەرە، چوو بۆ مزگەوت و هەرسێ پرسیارەکەی لێکرد، پێغەمبەر هەرسێکی وەلامدایەوە، عەبدوڵلاش وتی شایەتی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری خوایت، بەلام وتی: جولەکە بوختانکەرن، ئەگەر بزانن موسڵمان بووم خێرا درۆ و بوختانم بۆ هەڵدەبەستن، بەلام ئەگەر تۆ بچیت و لە بارەی منەوە پرسیار لەوان بکەیت، بزانە چی دەڵێن، ئەوسا بڵێ موسڵمان بووە، بزانە وەلامیان چییە..؟ پێغەمبەر چووە لایان و پرسیاری لە جولەکەکان کرد: عەبدوڵلای کوڕی سەلام چۆن پیاوێکە؟ هەموو وتیان: زاناترینمانە و کوڕی زاناترینمانە، باشترینمانە و کوڕی باشترینمانە... پاشان پێغەمبەر فەرمووی: ئەی دەڵێن چی ئەگەر عەبدوڵلا موسڵمان بووبێت..؟ وتیان: پەنا بەخوا لەو کارە ئەگەر شتی وا بکات، پاشان عەبدوڵلا هاتە لایان و شایەتومانی هێنا، وتیان: وەڵلا خراپترینمانە و کوڕی خراپترینمانە، کەوتنە لێخوێندنی[1].

لە دابەزینی ئایەتی (لَيْسُواْ سَوَاء مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ آيَاتِ اللّهِ آنَاء اللَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ * يُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَأُوْلَـئِكَ مِنَ الصَّالِحِينَ * وَمَا يَفْعَلُواْ مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوْهُ وَاللّهُ عَلِيمٌ بِالْمُتَّقِينَ)(آل عمران :١١٣- ١١٥ ) ئەبو حەسەنی واحیدی

---

[1] البخاري، كتاب الأنبياء، باب خلق آدم، رقم: ٣٣٢٩ صحيح البخاري، محمد بن اسماعيل البخاري، دار الفكر، ١٩٩١ز.

دەڵێت: ئیبن عەباس و موقاتیل وتوویانە: کە عەبدوڵڵای کوڕی سەلام و سەعلەبەی کوڕی سەعید و ئەسیدی کوڕی سەعید و ئەسید کوڕی عوبێد و ئەوانەی کە لە جولەکە موسڵمان بوون، زانا و ئەحبارەکانی جولەکە وتیان: ئەوانەی کە لە ئێمە موسڵمان بوون لە خەڵکە خراپەکانمان بوون، ئەگەر لە باشەکانمان بوونایە هەرگیز ئایینی باب و باپیری خۆیان جێنەدەهێشت[1].

دوای ئەوە جولەکە کە زانیان ئیسلام لەسەریان مایەی مەترسییە، کەوتنە فیتنە نانەوەو بوختان و ئاژاوەگێران، بۆ نموونە کە موسڵمانەکان تازە هاتبوونە ناو مەدینە، جولەکە بڵاویانکردبوویەوە و وتبوویان دوعامان کردووە و جادومان لێکردوون کە هەرگیز کوڕیان نەبێت، بەڵام پاش ماوەیەك، لە کۆچکەران عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر کە کوڕی ئەسمای کچی ئەبوبەکر بوو لە دایك بوو، بۆ پیرۆزیی هێنایان بۆ لای پێغەمبەر، ئەویش خورمای تەڕکرد و کردیە دەمیەوە و ناوی نا عەبدوڵڵا، ئەمە یەکەم کوڕبوو لە ئیسلامدا کە لە مەدینە لە دایك بوو، دوایش حەوت ساڵان بوو کە زوبێری باوکی هات و بەیعەتی بە پێغەمبەردا و عەبدوڵڵاش بە حەوت ساڵان بەیعەتی دایە پێغەمبەر، ئەمە یەکەم منداڵ و لە دایکبوو بوو لە ئیسلامدا کە بەیعەتیدا، چونکە جولەکە وتبوویان بە جادو گرتوومانن و دوعامان لێکردوون کوڕیان نەبێت، سەحابەکان ترسابوون، کە عەبدوڵڵا لە دایك بوو، سەحابەکان دڵخۆشبوون و تەکبیر (ألله أکبر)یان کرد[2].

صەفیەی کچی حەی کوڕی ئەختەب، زانای جولەکە، کە دواتر صەفیە بووە خێزانی پێغەمبەر و دایکی موسڵمانان، دەڵێ: من خۆشەویسترین منداڵ بووم لای باوکم و ئەبی یاسری مامم، هەر جارێك لە ناو منداڵاندا بیانبینیمایە تەنها منیان بانگ دەکرد و دەیانکردمە باوەش، کە پێغەمبەر هاتە مەدینەو لە مزگەوتی قوبا

---

[1] اسباب النزول، ابوالحسن الواحدي النيسابوري، سورة آل عمران، ص٦٦، دار الكتب العلمية، بيروت، لبنان ٢٠٠٠م.

[2] المستدرك، للحاكم، كتاب معرفة الصحابة، ٣، ٥٤٨. المستدرك على الصحيحين ، الأمام ابي عبدالله الحاكم النيسابوري، مكتب المطبوعات الاسلامية، ١٩٧٠.

مایەوە، باوکم و مامم (کە زانای جولەکە بوون) چوون بۆ لای پێغەمبەر و نەهاتنەوە تا خۆرئاوابوون، کە هاتنەوە بە خاویو تەمەڵ و بێتاقەت دیار بوون، صەفیە دەڵێ: چووم بۆ لایان، بەلاّم بەخوا وەك جاران لایان نەکردەوە بەلامدا ئەوەندەیان خەفەت هەبوو، گوێم لێبوو مامم بە باوکمی وت: ئەوە ئەو بوو؟ باوکم وتی: ئەریّ وەڵلا بە خوا خۆی بوو. مامم وتی: تەواو ناسیت و دەیسەلمێنی؟ باوکم وتی: بەڵێ.. مامم وتی: ئەی هیچ ماوە لە ناختدا بەرامبەری..؟ باوکم وتی: ئەریّ وەڵلا دوژمنایەتییەکەی لە دڵمدا ماوە هەتا بمێنم[1].

بەم جۆرە جولەکە بە گوێرەی تەوراتەکەیان تەواو پێغەمبەریان ناسیوە، بەلاّم هەر بڕیاریان داوە دوژمنایەتیی ئەوو موسڵمانان بکەن هەتا بمێنن، جۆرەها شێوازی پیس و بوختان و تانەو درۆ دروستکردنیان بەکاردەهێنا، وەك ئەم وتانەی دکتۆر جەمال بۆ لەت و پەتکردنی ریزی موسڵمانان و نەهێشتنی رەگی خۆشەویستیی و دوبەرەکی نانەوە.

هەر لە سەردەمی پێغەمبەردا جولەکە لە نێوان ئەوس و خەزرەجدا فیتنەیەکیان گێڕا بۆ دووبارەکردنەوەی ناکۆکیی ئەو دوو هۆزە، لەو کاتەدا کە دەستیان دایە شیر و تیر و دەمەقرێ، پێغەمبەر فریاکەوت و خوای گەورەش ئایەتی دابەزاند.

جارێك ئەبوبەکر چووە دانیشتنێکی جولەکەو داوای لێکردن موسڵمان بن، زاناکانی جولەکە وتیان ئێمە چۆن دوای خوایەکی فەقیر دەکەوین، ئەو لە ئێمە هەژارترە، ئەوە نییە داوای قەرزمان لێدەکات، کەواتە لەو دەوڵەمەندترین، مەبەستیان ئایەتی: (مَّن ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضاً حَسَناً...) بوو، ئەبوبەکر تووڕەبوو، دەموچاوی فیخاسی زانایانی خوێناوی کرد.

---

[1] السيرة النبوية، ابن هشام، ج١، ص٥١٨. السيرة النبوية، د.علي محمد الصلابي، دار المعرفة، بيروت، ص٣٢٤ ، سال ٢٠٠٦.

جولەکە دەیانگوت بەخوا نە بڕوا بە عیسا دەهێنین و نە بەوەی کە بڕوای بە عیسا هەیە، جولەکە جۆرەها شێوازی دژایەتییان بەکاردەهێنا، گاڵتەیان بە پێغەمبەر دەکرد لە لای خۆیدا، لە کاتی وتارخوێندندا گاڵتەیان پێدەکرد، کە سەلامیان لێدەکرد دەیانگوت (سام علیك)، واتە: مردنت لێبێت، پێغەمبەریش دەیفەرموو: (وعلیکم) واتە: بۆ ئێوەش.

یارمەتی دووڕووەکانیشیان دەدا، کە پێغەمبەر هاتە مەدینە تا ماوەی شانزە مانگ ڕووی دەکردە قودس بۆ نوێژ کردن، حەزیدەکرد کەعبە لە نێوان خۆی و قودسدا بێت، هەتا ئایەت هات و فەرمووی تەنها ڕوو بکەرە کەعبە، جولەکە لەوەدا کەوتنە قسە دروستکردن و فیتنەنانەوە، قورئان زۆر خوڕەوشت و دابی ناشیرینی جولەکە و دووڕووەکان باس دەکات، ژیاننامەی پێغەمبەر و قورئان و سوننەت زۆر زۆری لەو ڕەوشتە نەشازە جۆراوجۆرانە دەگێڕێتەوە لە دووڕوویی و خەڵەتاندن و گاڵتەکردنو سوودوەرنەگرتن لە ئایینی خۆیان و ڕق و قین و ئیرەیی و بەخیلی بردن و ڕاستیی شاردنەوەو فێڵ و خۆ بە شت زانین و خۆدەرخستن و هاوەڵ بۆ خوا پەیداکردن، لە چەندین جێدا قورئان بە وردی باسی دوژمنایەتییکردنی جولەکە بۆ پێغەمبەران و پیاوچاکان و لاسایی کوێرانە و شاردنەوەی زانیاریی و تێکدانی زانیاریی و خۆگێلکردن و خۆلادان لە هەق و ڕاستیی و خۆگلاندن لە حەرام و دوویەرەکیی نانەوە و جیاوازیی دروستکردن و بەرتیل خواردن و درۆکردن، ئەمانە هەموو پیشەی بەردەوامی جولەکەبووە لە مێژوودا[1].

## سیرەو ڕۆژهەڵاتناسان

کە بەراورد دەکەی قورئان و فەرمودە چەند جوان باسی عیسا و مەریەم دەکات، شان و شکۆیان زۆر مەزن و بەرز دەکاتەوە بە جۆرێك نەجاشیی و قەشەکانی حەبەشە دەهێنێتە گریان و بیرکردنەوە، تەنانەت قورئان باس دەکات کە پێغەمبەر و موسڵمانان لە شەڕی فارس و ڕۆمدا بێدەنگ نەبوون، بەڵکو بە

---

[1] الصراع مع الیهود، د. محمد ابوفارس، ج۱، ص۱۰۲، دار الفرقان، ۱۹۹۰.

دوعاو نزا پشتی گاور (رۆم) یان دەگرت، ئەبوبەکر گرەوی سەد حوشتری لەسەر کرد، بەلاّم قورئان بۆ جولەکە وا نالّێت و بە خراپ باسیان دەکات، لەسەر هەندێك هەلّوێستی خراپیان کە دژی مرۆڤایەتیی ئەنجامیانداوە، وەکو ئایەتی: (أَشَدَّ النَّاسِ عَدَاوَةً لِّلَّذِينَ آمَنُواْ الْيَهُودَ) (المائدة : ٨٢ )، هەروەها شەڕی خوێناوی نێوان موسلّمان و جولەکە لە (بەنی قورەیزە و بەنو قەینوقاع و خەیبەر) بە ناوبانگە، کاتێ گاورەکانی حەبەشە بوونە پەناگە و لانە بۆ موسلّمانە کۆچکردووەکان، جولەکەی مەدینە لەگەلّ بتپەرستەکان یەکیانگرتبوو، پلانیان دژی موسلّمانان دادەڕێژا، قورئان باسی عیسا دەکات هەر لە نەنك و باپیریەوە هەتا مندالّیی دایکی و پێغەمبەری خالّوانی (زەکەریا و یەحیا) و ئیمانداریی دایکی لە مندالّیدا و کەراماتی و پاشان دووگیانی مەریەم و لە دایکبوونی عیسا و هێنانی بۆ قودس و بوونە پێغەمبەری و دەعوەو بانگەوازی هەتا راونانی و خۆشاردنەوەی، بەلاّم گاورەکان ئەو ئایەتانەیان لە تەورات و ئینجیلدا لابرد کە ناوی پێغەمبەری ئیسلام و مژدەپێدانی تیایە، دان نانێن بە پێغەمبەرایەتی موحەممەددا ﷺ.

یەکەم نامەی رۆژئاوا دژی ئیسلام تەفسیرکردنی قورئان بوو بەلاتینی لە سەدەی دوانزەهەمینی زاییندا لە لایەن پیێر (ڤندابیل)ەوە، لەو تەفسیرەیدا خراپ بە ئیسلام دەکات، پاش ئەویش بە درێژایی سەدەکان دژایەتی ئیسلامیان دەکرد، بەلاّم هەیانبوو باشی دەوت، یان هاتونەتە ناو موسلّمانان هەتا لە ئاینەکەیان حالّی ببن و وەریانبگێڕن و بیانکەن بە گاور، ئیمپریالیزمە ئەورووپییەکان بۆ داگیرکردنی ولاّتانی ئیسلامیی سوودی زۆریان لە ئاینی گاور بینی بۆ دژایەتی ئیسلام، گەنجە گاورەکانیان هاندەدا بۆ خۆفیداکردن و هێرشبردنە سەر ولاّتی ئیسلامی، هەمیشە ئیمپریالیستەکان بە گیانی گاوریی هێرشیان دەهێنا، بەلاّم لە سەدەی هەژدەدا (بیل) لە کتێبەکەیدا (قورئان لە روانگەیەکی مێژوویییەوە) بۆ هێورکردنەوەی ناکۆکی بەو ئەنجامە گەشتبوو دەلّێ: "جیاوازییەکی ئەوتۆ نییە لە نێوان قورئان و یاسای گاورەکاندا لە رووی رەوشت و باسە کۆمەلاّیەتییەکانەوە"، سالّی ( ١٨٣١) زاینی (رینوو فرانسیسك میشیل) کتێبی (چیرۆکی موحەممەد)ی نووسی، وەك

ڕۆژهەلاتناسێك زۆر بە ویژدانەوە باسی ژیانی موحەممەد دەكات، نووسەری فەرەنسی (ئیمل دەرمنجم) لە كتێبەكەیدا (ژیانی موحەممەد) دەڵێ: "هۆی شەڕی نێوان موسڵمان و گاورەكان چاك تێنەگەیشتن بوو لە یەكتر، بەلام گاور دەستپێشخەر بوون لەو جیاوازییە توندە خوێناوییەدا، وتیان: موحەممەد دزە، حەزی لە ئارەزووبازییە، جادوگەرە، سەرۆكی چەتەكانە و ڕێگرە، تووڕەیە، موسڵمانان وەحشن و قورئان هەڵبەستراوی نزمەكانە، ئەوانە هیچی وانییە..!!".

یەكێكی تر لە نووسەرە ئەوروپییەكان كە ناوی (ئەنوسان)ە دەڵێ: "موحەممەد دژی گاورەكانە"، بەلام زۆری تری وەك (دبرجلی و لرینان و كونت بو لنڤلیە و شول و كوستان دبرسقال و دوزی و سبرنجرویا و تلمی سانتیلیر و دگاستری و كارلیل) بە زۆریی ستایشی ئیسلام و پێغەمبەریان كردووە و هەقناسانە ڕاستیان وتووە.

ساڵی (١٨٢٢) نووسەری ئەوروپی (فۆستەر) نووسیویەتی: "بەردەوام هەتا ئەمڕۆ ئیسلام جەنگاوەری ئازا و خوێنگەرمی ماوە.." ساڵی (١٨٧٦) (دروتی) نووسەری ئەوروپی، لە باسی موحەممەد پێغەمبەردا زۆر خراپ دابەزیوەتە سەر ئیسلام.

ئەگەر كەسێكی وەك دكتۆر جەمال بیەوێ هەر بە دوای ئەو كەسانەدا بگەڕێ كە خراپیان بە ئیسلام و پێغەمبەرەكەی وتووە و ڕەگەزپەرستانە شتیان وروژاندووە، ئەوە دەستی دەكەوێت، بەلام هیچ كەمناكاتەوە لە گەورەیی و مەزنی موحەممەد لە دڵی كوردو پەیڕەوانیدا، بۆچی ئەو نایەت وەك ڕۆژهەلاتناسی مەزن (كارلیل) لە كتێبەكەیدا بە ناوی (الأبطال) باسی موحەممەد بكات!، یەك بەشی تایبەتی لەو كتێبەیدا داناوە بۆ باسی بەرزیی و مەزنیی و نەخشە پیرۆزە خواییەكەی موحەممەد كە لە ڕێی وەحییەوە پێی بەخشراوە، جگە لەو (موبر و ئەرفنج و سبرنجر و فەیل....) كە زانا و ڕۆژهەلاتناسن، وێنەی ڕاستی موحەممەدیان بە جوانی كێشاوە...

ئەمرۆ رەخنە شتێكی باوە، دەتوانریٚ لە هەموو روویەكەوە رەخنە بگیریٚ لە هەر باسێك كە شایەنی بێت، بەلاّم بە مەرجێك ردخنەگر ئادابی رەخنە و شێواز و توانای بەسەر رەخنەگرتندا بشكێت، لە كۆندا رەخنە باو نەبووە، كتێب بۆ پیرۆزیی دەنووسرا، وەك عیبادەت و ئاین دەنووسرا، نووسەری كۆن حەزیدەكرد شتێكی لەسەر قورئان، یان فەرموودە، یان سیرەی پێغەمبەر هەبیٚ، حەزی دەكرد ستایشی سەحابەكان بكات، حەزی دەكرد لەسەر غەزاكان شتێك بۆ خوا و خوێندنەوە و سوودی موسلّمانان بنووسیٚ، گوێی لەوە نەبوو ئەمە لەگەلّ ئیسلام و قورئان و فەرموودە و سیرەدا یەكدەگرێتەوە، یان نا؟!، هەرچیان ببیستایە كۆیان دەكردەوە، ئێستا ئەوانە بوونەتە سەرچاوە بۆ ئەمرۆ، هەر بەو قسە كۆكراوانە كە بەبیٚ شایەن و ترازویەك نووسراوە موسلّمانان تۆمەتبار دەكەن و سووكایەتیی بە ئیسلام و دروشمەكانی دەكەن، كتێبی سیرە و فەرموودە و مێژووی ئیسلام ئاوا كۆكراوەتەوە، بەلاّم كە ئەم رێگەیە داهات، كێشانە دانرا بۆ پێوانی رووداوو فەرموودەكان، دەبینین زۆر لە باس و خواس و گێرانەوەكان راست دەرنەچوون، قەید دانرا لەسەر نووسراو كە بە رەخنەی زانستییانە نووسینەكان دەپارێزن لە هەلّە، وەك چۆن مرۆڤ خۆی لە هەلّە دەپارێزیٚ، زۆر رستەی ناجۆر لەسەر پێغەمبەر نووسراوە، هەر لە لەدایك بوونییەوە هەتا وەفاتی، بەتایبەت لەسەر كەرامات و موعجیزەكانی، كتێبە كۆنەكانی سەردەمی یەكەم كەمتر باسی خەوارق و كەراماتی تیایە كە دوورن لە عەقلّەوە، بۆ نموونە (سیرەی ئیبن هیشام) كە كۆنترین سیرەی ناسراوە تا ئەمرۆ، هیچ لەو رووداوانەی تیا نییە كە (ئەبولفیدا) لە مێژووەكەیدا سالّی (٧٠٠ك) هێناویەتی، یان (قازی عیاز) لە كتێبی (ئەلشفا) دا باسیكردووە، هەر بەو جۆرەش كراوە لە فەرموودەكاندا، یەكێكیان چیرۆكێكی هێناوە، ئەوەی تر هەر نەچووە بەلایدا، یان هەندێكی تر بە لاوازی داناوە، لەبەر ئەوانە لەسەر توێژەر پێویستە زۆر وریا بێت، زانستیانە بنووسێت، پێوەرو شایەنێك بۆ خۆی دابنیٚ و بابەتەكانی لەسەر بپێویٚ و بكێشیٚ، ئەوەی ناكۆكی لەسەر هەیەو ئەوەی كۆكن

لەسەری دیاریی بکات، هەروەها لاموبالاتانە، یان موغریزانە نەچێت بەسەریاندا، بەڵکو بەدواداچوون و شەن و کەویان بکات.

سەرکردە و نووسەری ئینگلیزی (جلوب پاشا) کە هەتا ساڵی ١٩٥٦ سەرکردەی سوپای ئەردەن بوو، دەڵێ: (کێشەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی حەوتەمی زایینی)، واتە سەردەمی فتوحاتی ئیسلامی.. خراپترین کۆنگرەکانی کەنیسەی رۆژئاوا ئەوەبوو کە ساڵی (١٩٧٨) لە کۆلۆرادۆی ئەمریکا بەسرا بۆ بەمەسیحیکردنی موسڵمانەکان، دەڵێ: (ئیسلام تاکە ئایینە کە سەرچاوە بنەڕەتیەکانی ناگونجێ لەگەڵ مەسیحییدا، یاساکانی ئیسلام زیاترینی ئەو یاسایانەن کە باری کۆمەڵایەتیی و سیاسیی پێکەوە گونجاندووە.. ئیسلام بزاوتێکی ئایینی دوژمن بە مەسیحییە، ناوەڕۆکەکەی لە سەرووی توانای مرۆڤەوەیە، لەبەر ئەوە دەبێ سەدان دەزگا و بنکە بە چواردەوری هەموو دنیادا دابمەزرێنین بە یارمەتی گاورەکان و هەموو تواناکانمان یەکبخەین بەرامبەر بە ئیسلام، بۆ لێتێگەیشتن و تێکەڵبونیان و خەڵەتاندنیان، پاشان دزەکردنە ناویانەوە بە شێوەیەکی پاك و زیرەکانە)، تەنانەت بەڕێوەبەرایەتی بڕیارانی ستراتیژی عەلمانیەکانی رۆژئاوا هەمان رایان هەیە و رایانگەیاندووە: (کە ئیسلام دوژمنە و جێی ئیمپراتۆریەتی شەڕی شیوعی گرتووەتەوە کە هاوپەیمانی باکووری ئەتڵەسی (حلف الشمال الأطلسي) بەریگرتبوو، ئیسلام ئەو هێزەیە کە نایەوێ بێتە ناو عەلمەنەوە و لەناو شارستانی رۆژئاوادا بتوێتەوە و دوای ناکەوێ).

لە گۆڤاری (کاروباری دەوڵەتان)ی بەریتانی، لە ینایر١٩٩٠دا هاتووە، دەڵێ: (لە رۆژئاوا زۆر کەس هەستیکردووە کە دەبێ ئەو هەڕەشەیە بدۆزینەوە کە جێی هەڕەشەکانی سۆڤیەتی لەناوچوو دەگرێتەوە، ئەوەتە ئیسلام ئامادەیە و لەبەردەستدایە، ئیسلام تێدەکۆشێ دژایەتی عەلمانیی بکات، ئەو کاریگەریی لەسەر بڕوادارانی زۆر بەهێزە، ئیسلام ئەمڕۆ زۆر بەهێزترە لە ئیسلامی سەد ساڵ لەمەوبەر، لەناو ئەو رۆشنبیرانەی باشووردا بڵاوەیکردوە کە دەکەوێتە بەردەم

هەڕەشە و پەلامارەکانی نوێی رۆژئاوا، ئەوەش لەبەر یەك هۆ، لەبەر ئەوەی کە ئیسلام تاکە چاوکراوەیە کە توانای هەیە ببێتە هەڕەشەی تەواو و راستەقینە دژی کۆمەڵگەی رۆژئاوا).

(ریتشارد نیکسۆن) بڕیاری ستراتیژیی ئەمریکی و سەرۆکی پێشووی ئەو وڵاتە لە کتێبەکەیدا بە ناوی (الفرضية السانحة) دەڵێ: (دوژمنایەتی ئیسلامیەکان کارێکە زیاتر بڵاوە و ناشیرینترین وێنەی هەیە لای زۆربەی ئەمریکیەکان، زۆر لە ئەمریکیەکان وا بیردەکەنەوە کە موسڵمانەکان گەلانی ناشارستانی و خوێنڕێژ و تێنەگەیشتوون، وا گومان دەبەن کە شمشێرەکەی موحەممەد و دواکەوتوانی هۆ بووە بۆ بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە ئاسیا و ئەفریقادا، تەنانەت ئەورووپاش، لەبەر ئەوە زۆرێك لە ئەمریکیەکان وەك دوژمن سەیری موسڵمانەکان دەکەن، هیچ وێنەیەك لە بیر و هەستی ئەمریکیەکاندا نییە ناشیرینتربێت لە وێنەی جیهانی ئیسلامی)[1] لەبەر ئەوە پرۆژەی دوژمنایەتی رۆژئاوا بۆ ئیسلام، ئەو هەڵوێستەی لە زۆربەی دەزگا و بەڕێوەبەرایەتی و دامەزراوەکانی دروستکردنی بڕیاردا لە رۆژئاوا راگەیاندووە، ئەمە خەیاڵێك نییە کە عەقڵیەتی موئامەرەچێتی دروستی کردبێت، بەڵکو گرفتێکی کۆنە کە بەرهەمی کارو کردەوەی ئەو بزاوتە توندڕەوە سروشت رەقانەیە کە بە ناوی ئیسلامەوە کار دەکەن، یان ئەو رژێمە سەرسەختە ستەمکار و چەوسێنەرە عەرەبی و ئیسلامیانەیە کە لە جیهانی ئیسلامیدا حوکم دەکەن و دژی مافی مرۆڤ کاردەکەن، یان ئەو پێکپڕژانە توندەی نێوان ئیمپریالیسی رۆژئاوا و جیهانی ئیسلامیی بوو، کە ئەوان هاتبوون خاکی موسڵمانەکانیان داگیرکردبوو، خێرو بێریان دەبردو خەڵکەکەشیان سەرشۆڕ دەکرد، ئەوانیش ناچار بون بەرگری لە خۆیان و خاکیان بکەن.

---

[1] صورة الاسلام فی التراث الغربی. د. سابیت. ترجمة: م. ثابت عيد. القاهرة . ١٩٩٩ المقدمة: محمد عمارة ل ٣ـ٥

کەواتە ئێمە لەبەردەم هەڵوێستەیەکی کۆنی ڕۆژئاواداین کە لە عەقڵ و شعور و ناخیانـدا ڕەگـی داکوتـاوە و لـە ڕۆشـنبیری ئـایینی و ئـەدەبی و مێـژوویی و سیاسـییەکانیادا بەرجەسـتە بـووە، تەنانـەت لـە فۆلکلـۆرو داب و نەریتیانـدا چەسپیوە، کە ئەوەش بوعدی ئابووریی و سەربازیی هەیە.

ئەوان ئەو ڕق و دوژمنایەتیە دەگێڕنەوە:

* بۆ دەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی ئیسلام کـە زۆر لـە گـەلی مەسـیحی موسـڵمان کرد.

*بۆ فتوحاتە ئیسلامییەکان کـە ڕۆژهـەڵاتی لـە چـنگی ئیمپریاتۆریـەتی گـاوری ڕۆمی بێزەنتی ڕزگارکرد، کە زیاتر لە (دە) سەدە بوو بە دەسیانەوە بوو، هـەر لـە ئەسکەندەری مەکدۆنیەوە ٣٥٦-٣٢٤ پ.ز، هەتا هەرقلی ڕۆم ٦١٠-٦٤١ ز.

* بـۆ سوارچـاکە ئیسـلامیەکان کـە ئیمپریالیسـتی داگیرکـاری خاچپەرسـتی هەڵکەند کە دوو سەدە بوو ناوچـەکەیان بەدەسـتەوە بـوو سـاڵانی (١٠٩٦-١٢٩١ز) بە تایبەت هەوڵەکانی سەلاحەدینی کورد.

* بۆ بزاوتی ڕزگاریخوازی ئیسلامیی و عەرەبیی کە تەواوی خـۆری ئیمپریـالیزم و ڕۆژئاوای داگیرکاری لەسەر خاکی ئیسلامی ئاواکرد لە سەدەی نۆزدەو بیستدا.

* ترسـی ڕۆژئـاوا لـەم بێداربوونـەوە و ڕاپەڕینـە ئیسـلامیە هاوچـەرخە کـە هەوڵـدەدات بـۆ ژیاندنـەوەی گیـان و وزەی ئیسـلامەتی لـە نـاخی موسـوڵمانان و ڕزگارکردنی خاك و سامانی جیهانی ئیسلامیی لە چنگی چاوچنۆکیی ڕۆژئاوا.

ئەمانەیە هۆی ڕەگ و ڕیشە و قوڵی هەڵوێستی ڕۆژئاوا دژی ئیسلام.

بەداخەوە هەتا ئێستا لەگـەڵ ئـەوەی کـە زانـا و دانـا و سیاسـەتمەدارانی زۆرو زەبەندی ڕۆژئاوا هەیـە کـە دەڵـێ دەبـێ لـە ئیسـلام تێبگـەین و مامەڵـەی ژیرانـەی لەگەڵ بکەین، بەڵام مەخابن دەزگایەکی دامەزراوەیان نییە کە بەو کـارە هەسـتێ و بیەوێ بە ئازادی و ئینساف و دادپـەروەریی لـە ئیسـلام تێبگـا و هەڵوێسـتی چـاك بەرامبـەر کێشـە ئیسـلامییەکان بنـوێنن، بـەڵکو هـەر هـەموو دەزگـا سیاسـیی و

لێکۆڵینەوە ستراتیژیی و دامەزراوەکانی بڕیار یەك بیروڕاو هەڵوێستیان بەرامبەر ئیسلام و موسڵمانان و کێشە ئیسلامییەکان هەیە.

کاری ڕۆژئاواییەکان سەیرە، هەموو پشتگیریی و سەرسوڕمان و ڕێزیان بۆ سەلمان روشدی و تەسلیمە نەسرین دەربڕیوە، یەکەمیان لە چیرۆکەکەیدا (ئایات شەیتانیە)دا نەفامانە پێغەمبەری بە سەگ گونجاندووە، دووەمیش داوادەکات کارکردن بە قورئان وازلێبهێنرێ، بەم دوانە و دەیانی تری وەك دکتۆر جەمال و مەریوان و عەبدولخالق مەعروف و فوئادی مەجید میسری و زۆری تر، هەتا دوا پلە سووکایەتیان بەرامبەر بە خوا و قورئان و پێغەمبەر و ئیسلام کردووە و لەلایەن ڕۆژئاواوە پشتگیریی و کارئاسانیی و یارمەتیدان و پەناهەندەی سیاسیی و هاندانیان بۆ کراوە، بەڵام ڕۆژئاواییەك نییە ئەو سوکایەتیە بەرامبەر بە موسا و مەسیح و سێگانە خواکەیان لە عیسا و خوا و مەریەم بکەن، وەك ئەوەی بە موحەممەد دەکرێت..

بە ڕاستی لە ڕۆژئاوادا دوو شەپۆلی بیر و هۆشیاریی هەیە:

یەکەم: سووکایەتی بە ئیسلام و پیرۆزیەکانی، ترسانی ڕۆژئاوا لە ئیسلام و بەستنەوەی بە توندڕەوە، مەبەستیانە بگەڕێن بە شوێن هەڵە و عەیب و عاری موسڵماناندا و زلی بکەن و تیشکی بخەنە سەر و خەڵکی پێبترسێنن، هەرچی ناشیرین و توندو پیسە بیبەستنەوە بە ئیسلامەوە.

دووەم: دان نانێن بە هەڵەکانی ڕابردوی خۆیانداو دەڵێن ئەوانە کەسانێك بوون و مێژوویەکیان دروستکردو ڕۆشتن و تەواو، ئەوان تەواوی مێژووی کۆن و ڕابردوو لەبیر دەبەنەوە، بەڵکو دەیانەوێ و داوا دەکەن وتوویژی ئایینەکان دروست ببێ، لەوانە (هیوکومر، کینج)، بەڵام ئەمانەی دوایی هەر قسەیە و نەیانتوانیوە یەك خاڵی سەر زەوی بگۆڕن..

زۆر سەیرە، ئێمە ڕێزی زۆر بۆ ڕۆژئاواییەکان دادەنێن و بە گەورە و مەزن باسیان دەکەین، ئەوانیش ڕێزی زۆری بێ پایان بۆ ئەوانە دادەنێن کە وتەی

ناشیرین بەرامبەر خوا و پێغەمبەر و ئیسلام دەڵێن و هەموو پاڵپشتیەکیان بۆ دەکەن. جیاوازیی یەکجار زۆرە لە نێوان ئەم دوو ڕێزگرتنەدا! !

(کینج) دەڵێ: (ئاشتی جیهان ڕوونادات، هەتا ئاشتی نێوان ئایینەکان ڕوونەدات)، (شیمیل) داوا لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیی و ڕۆژئاواییەکان دەکات کە ناکۆکیەکانی نێوانیان واز لێبهێنن و لاپەڕەی نوێ هەڵبدەنەوە.

(هیو کومر) داوا لە هەردوو شارستانیەتی ئیسلامیی و ڕۆژئاوا دەکات کە هەرچی چاکە و جوانە و بەسوودە لە یەکتری وەربیگرن، (هیوکومر) زانایەکی بە ئینساف و چاکە بەرامبەر ئیسلام و شارستانیەتەکەی، لەگەڵ خاوەنانی بیرۆکەی (چەقی ئەورووپا)دا نییە کە ڕایان وایە کەوا ئەورووپا چەقی جیهانە و گوایە شارستانیەتی مرۆڤایەتی لە یۆنان و ئەسیناوە سەرچاوەی گرتووە، لەگەڵ ئەوەدا نییە کە فەزڵی شارستانیەتەکان بدەن بەسەر یەکتردا، ڕۆژئاوا دەڵێن لە ئیسلامدا داهێنان نییە و سەرچاوەی هەموو زانستەکانی ئیسلام دەبەنەوە بۆ ڕەگی زانستی ئەورووپا.

(هانس کینج) دەڵێ وتوێژکردن لەگەڵ بەرامبەر، ئەو مانایە نادات کە واز لەوە بهێنی کە بڕوات پێی هەیە، (هوبرت هیوکومر) کە لەسەر ئایینی مەسیحیە، بە جۆرێك سەیری ئیسلام دەکات ڕێز و گەورەیی دەداتێ و دان بە شارستانیەتی ئیسلامدا دەنێت، بڕوای وایە کە نەبوونی خۆشەویستیی لای هەندێ لە ڕۆژهەڵاتناسان بۆ ڕۆژهەڵاتیە ئیسلامیەکان وایلێکردوون کە هیچ ڕاستیی و حەقیقەت نەبینن لە ئیسلامدا جگە ڕوانین بە چاوی عەیب و عار و خراپە دۆزینەوە، ئەگەر خۆشەویستیی چاو کوێر بکات لە ئاستی خراپەدا، ئەو کاتە چاکەکانیشی دەبینێ، واتە خۆشەویستیی تەنها پەردە نادات بەسەر خراپەکاندا، بەڵکو چاکەکانیش دەدۆزێتەوە، (هیوکومر) وا دەبینێ کە مرۆڤایەتیی هەموو یەك بنەماڵەن، دەبێ تاکەکانی بە خۆشی و ئاشتی بژین، واز لە ڕق و توندیی و دوژمنایەتیی بهێنن، پێکەوەژیان لە نێوان ئایینەکان و خەڵکە جۆراوجۆرەکانیدا بە چاکترین شێواز بەڕێوەبەرن بۆ لەناوبردنی ڕق و دوژمنکاریی و ڕەگەزپەرستیی.

ساڵی (١١٤٣) زاین بۆ یەکەم جار قورئـان بـە لاتـینی لـە ئـەورووپا وەرگێـڕدرا، لەلایەن (روبەرت کیتۆنی)، پاشتر کەسێکی خـەڵکی (بـازل) لـە سویسـرا بـە نـاوی (یوحەننا ئەبورین) ساڵی (١٥٤٢) هەوڵیدا قورئـان وەرگێڕێتـە سـەر زمـانی لاتـینی، بەڵام شارەوانی بازل ڕێگەی چاپکردنی نەدا، هـەتا (مـارتین لۆسـەر) دامەزرێنـەری کەنیسەی پرۆتستانتی چاکسازییەکانی خۆی ڕاگەیاند و داوای کرد ئەو کتێبە چاپ بکرێ، چونکە بە بڕوای ئەو هیچ کارێك ئەوەنـدەی ئـەوە موحەممـەد و حکومـەتی تـورك بێـزار ناکـات و زەرەریـان لێنـادات کـە قورئـان لـەناو مەسـیحیەکاندا وەربگێـڕدرێ، ئەوسـا دەردەکـەوێت کـە قورئـان چـەندە رقـاوی و ناشـیرین و نەفرەتلێکراوە و پڕە لە درۆ و ئەفسانە و خورافات، ئەم کارانەی ئەورووپا بـە زۆری لە دژی هێرشـەکانی عوسمانیـەکان بـوو بـۆ ناوەڕاسـتی ئـەورووپا. (مـارتن لۆسـەر) دەیویسـت بـەو کـارە دڵـی گـاورە شـکاوو رووخاوەکـان کۆبکاتـەوە و بەرامبـەر دەسـەڵاتی عوسمانیـەکان چـەکدار و ورەبـەرزیان بکـات، پاشـان دەڵـێ: "دوای دەرکەوتنی راستی تورکەکان، لەسەر قەشەکان پێویستە کە لەبـەردەم گەلـدا وتـار بدەن لە بارەی کارە خراپەکانی موحەممەد، هەتا رق و قینی گاورەکان زیاتر بکەن بەرامبەر تورکەکان، بڕوایـان بـە مەسـیحیەت بـەهێزتر بێـت و تونـدتر شـەڕبکەن و سەروماڵیان بەخت بکەن"[١].

سەرکردەکانی کەنیسە لە (نیکیا) سـاڵی (٣٢٥)ز بڕیاریانـدا کـە مەسـیح کـوڕی خوایە، باوك و کوڕ یەك شتن، بڕیاردرا هەرکەس گومانی لەوە هەبێت لە کەنیسـەی کاسـۆلیکی دوور دەخرێتـەوە و دووچـاری رق و قـین و خـەشمی خـوا دەبێـت، ویسـتیان ئـەوەش بەسـەر موحەممـەد پێغەمبـەری ئیسـلامدا بسـەپێنن، ئـەوان ئیسلامیان ناو نا (جۆگەلەی زەندەقە) و هەموو وشەیەکی ناشیرینیان پیا هەڵدەدا، گاور پاگەندەی وا دەکەن کە ئەو موحەممەدەی کـە موسـڵمانەکان بـە پێغەمبـەری دەزانن، هەر خەریکی ژنهێنان و کاری نزمیی و لار و وێـر بـووە، بـەو جـۆرە درۆ و

---

[١] صورة الاسلام فی التراث الغربی. د. سابیت. ترجمة: م. ثابت عید. ل١٠ـ٢٠.

خراپەی بۆ هەڵدەبەستن و بەناو ئەوروپادا بڵاوی دەکەنەوە، ئەوان قسەکانیان بۆ هاندان و خراپ حاڵیکردنی گاورەکانی ئەوروپا دەوت، کەچی خەڵکی رۆژهەڵاتی و بەناو موسڵمانی وەك دکتۆر جەمال دەچن ئەو رستە خراپانەی ئەوان دەگوازنەوە و بەناوی خۆیانەوە بە کۆمەڵگای کوردی و ئیسلامیی دەفرۆشنەوە.

گاورەکان دەڵێن موحەممەد سەرەتا کاردینالێکی کاسۆلیکیی بوو، کەنیسە لەبیری کردبوو لە هەڵبژاردنی پاپادا، ئەویش بۆ تۆڵەسەندن لە کەنیسە هەڵسا بە دروستکردنی کۆمەڵێك مولحید و لادەر لە رۆژهەڵاتدا، ئەوروپای گاور لە سەدەکانی ناوەڕاستدا موحەممەدیان بە هەڵگەڕاوەی گەورە لە گاوریەتی دەزانی، تاوانی هەڵگەڕانەوەی نیوەی خەڵکی سەر زەوی لە ئەستۆدایە کە لە گاور هەڵیگێڕانەوە.

(دانتی) لە داستانی(کۆمیدیای ئیلاهی)دا دەڵێ: (موحەممەد و عەلی لە بەشی هەشتەمی چاڵی نۆهەمی دۆزەخدان)، لە داستانی (رۆلاند)دا لە گۆرانی رۆلاند بە فەرەنسی کە ساڵی (١١٠٠) زایینی نوسراوە، ناوی "بتەکانی ئیسلام کە دەیپەرستن" بەم جۆرە ناو بردووە وەك: (ئەپولێن، تیرڤاجانت، ماحومیت (موحەممەد)، پاشان ئەڵمانیەکان ئەفسانەی ئەو بتانەیان ساڵی (١١٧٠)ز کردە رۆمان، وەك رۆمانێکی خاچپەرستی. باس لە موسڵمانەکان و راکردنی گاورەکان دەکا، پاشان (ئۆتۆ فەرایسنجی) رۆمانی رۆلاندی بە درۆ خستەوە و نووسی کە موسڵمانەکان هەرگیز بتپەرست نین و ساڵی (١١٥٨) زایینی نووسی: "بەڵکو موحەممەد بتەکانی شکاند".

(ئەرنۆلد لیوبیکی) لە مێژووەکەیدا باسی موسڵمانەکان دەکات، بە دەستەی شەیتان ناویان دەبات و دەڵێ: "هێرشی خاچپەرستان بۆ سەر موسڵمانەکان پێویسیەکی گەورەیە"، بەڵام لە بیری چووە لەو مێژووەدا باسی چیرۆکی (جیرهارد و ئەشتراسبورج)ی کردووە کە ساڵی (١١٧٥)ز بە داوای (بارباروسا) چوو بۆ وتووێژ لەگەڵ سەلاحەدینی سوڵتانی میسر و شام، جیرهارد باسی موسڵمانەکان دەکات کە بڕوایان بە خودا هەیە و رێزی مەسیح دەگرن و وەك پێغەمبەرێکی پیرۆز باسی

دەکەن و خوای گەورە بە لاشە و ڕۆح بەرزیکردەوە بۆ ئاسمان، بە پێچەوانەی ئێمەوە بڕوایان بە عیسا هەیە[1].

لە داستانی (ڕۆلاند)دا هاتووە: (ئیسلام سێ بت دەپەرستن، موحەممەدو ئەبوللو و تیرفاجانت) ئەمە قسەی گاورەکانە و دەیانەوێ ئیسلامی یەکتاپەرست بە نووسینی هەڵبەستراو وەك گاورەکان نیشان بدەن کە سێ بت و یەگانە دەپەرستن (خوا و عیسا و مەریەم).

گوایە موسڵمانەکان موحەممەد دەپەرستن، وەك چۆن گاورەکان عیسا دەپەرستن، پاشان دەڵێن موسڵمانەکان لە پاڵ خوادا ڤینۆسیش دەپەرستن کە خوای خۆشەویستی ڕۆمانەکانە، گوایە ڕۆژی هەینی کە لای موسڵمانەکان پیرۆزە و کردوویانەتە پشوو، ئەوە هەر ڕۆژی ڤینۆسی ئەورووپییە ڕۆمانەکانە کە چاکترین ڕۆژی هەفتەیە.

لە ئەورووپا باسی جەنگی (بلاط الشهداء) کە ناوی ڕووداوێکی جەنگی تورو بواتیە و ساڵی (٧٣٢)ز ڕوویداوەو لە قوتابخانەکاندا دەخوێنرێ و لە بەرنامەی خوێندندایە وەك سەرکەوتنێکی ئەورووپا بەسەر موسڵمانەکاندا دایانناوە، بەڵام ئەو جەنگە لە ڕاستیدا هیچ نەبوو، شتێکی ئاسایی بوو، جەنگێکی سراتیژیی گرنگ نەبوو کە ناوچەیەك، یان گرفتێك یەکلابکاتەوە، بەڵام لای ئەورووپاییەکان کراوەتە پاڵەوانیی.

لەدەستچوونی قودس لە جەنگی خاچپەرستاندا، کە سەلاحەددینی کورد و هاورێکانی خاچپەرستەکانیان شکاند و ڕاویان نان و شام و فەلەستین و قودسیان لە گاور پاکردەوە، ڕۆژئاوا ئەوە باس ناکەن، بەڵام دێن باسی (ئەمیر ئۆپچی) دەکەن بە ناوی (فارسێکی ناوازە) و ڕزگارکەری ڕۆژئاوا و گاور، کە گوایە وانەیەکی چاك و شایستەی تورکە عوسمانییە موسڵمانەکانی داداوە و نەیهێشت لە سنووریان بترازێن، لە قوتابخانەکاندا وایان لە نەوەی نوێی ئەورووپا و خوێندکاران

---

[1] صورة الاسلام في التراث الغربي. د. سابيت. ترجمة: م. ثابت عيد. ل ٢٣-٢٩.

گەیاندووە کە موسڵمانەکان هەمیشە بە شەڕ و ئاگر و ئاسن بڵاوبوونەتەوە.

(جیرهارد کونسلمان) پسپۆڕی کاروباری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و رۆژنامەنووسی ئەڵمانی دەڵێ: (موسڵمانەکان عەقڵیان کەمە، خەڵکی رۆژهەڵاتیی هەمیشە لاوازن لە عەقڵدارییدا)، (شول لاتور)ی رۆژهەڵاتناسی ئەڵمانیی دەڵێ: (کۆمەڵگەی ئیسلامیی هەستێکی گەرم و گوڕیان هەیە، بەڵام ناتوانی تەعبیری لێ بکەیت کە ئەو هەستە چییە..؟) هەندێکی تر دەڵێن: (موسڵمانەکان هەستی لەناوبردنی خودی خۆیان لەناخدا هەیە)، هەروەها دەڵێن: (خەونی نیشتمانی گەورەی ئیسلام تێکچوو و نەهاتەدی)، ئەوان ترسێکیان لە ناخی خۆیاندا بەرامبەر بە ئیسلام چاندووە و وا دەزانن رۆژێك دادێ ئەم ئیسلامە گەورە و بەهێز و دەسەڵاتدار دەبێ و دنیا دەگرێ و جارێکی تر دەسەڵاتی ئەوان لەناو دەباتەوە، وادەزانن ئەوان لەبەردەم هەڕەشەی لەناوبردندان لە ئایندەدا بە دەست ئیسلامەوە، ئەمە ترسە و خۆیان بۆ خۆیانیان دروستکردووە، ئەم ترسە وای لێکردوون دەیانەوێ خۆیان بخەڵەتێنن و پاساوو ورە بە بەر خۆیاندا و مەسیحیەتی جیهانیدا بێننەوە و بڵێن نەخێر وانییە، موسڵمان و رۆژهەڵاتیی زەین و بەخت و توانایان لاوازە و ناتوانن هەڵسنەوە و پێشەوایەتیی، نەك جیهان، خۆشیان بکەن، دوای گیرانی قوستەنتینەی پایتەختی رۆمای ئەورووپای گاور لە ساڵی ١٤٥٣ زایینیدا لەلایەن موسڵمانەکانەوە و پاشان گەمارۆیان لەسەر (ڤیەننا) توندکرد، (مارتن لۆسەر) (١٤٨٢ -- ١٥٤٦) نووسی کە: (پاپا دوژمنی ناوەوەیە و موسڵمانان دوژمنی دەرەوەن، داوایکرد دوعا لە تورکە موسڵمانەکان بکەن)، لەگەڵ ئەوانەدا (لایبنیتس) ساڵی (١٧١٠)، (لیسینج) ساڵی ١٨٧٨، (رویکری) ساڵی ١٨٥٠، گۆتە ساڵی ١٨٣٠ز لە ئەدەبی ئەڵمانییدا شتی باش و ناسکیان لەسەر ئیسلام وتووە [1].

---

[1] صورة الاسلام فی التراث الغربی. ل٤٣ ـ ٥٨.

ئەورووپاییـەکان دژایـەتی موسـڵمان و پێغەمبـەریان لـە ئـەدەبیاتی زمانـە جیاوازەکانی ئـەورووپادا تاوانووەتـەوە وەك باسـکرا، هـەروەها (ولفـرام) لـە رۆمانـە سەلیبیەکەیدا بە ناوی (فیلیهام) کە ساڵی ۱۲۱۰ز بڵاوکراوەتەوە، موسڵمانەکان بـە شـەیتان و شـەڕانیی و بچـووك و خزمـەتکار نـاوبردووە، گاورەکـانی بـە ئەشـراف ناوبردووە.

هەموو بیریار و فەیلەسوفەکانی ئەورووپا جگـە کـەمێکیان، دەسـتیان هەیـە لـە هێرشکردن و دژایەتیی و تاوانبارکردنی ئیسلام و گـەرمکردنی شـەڕ و هێـرش دژی ئیسلام.

(تۆماس ئەکوینی) شتی چاکی هەیە لەسەر لێکۆڵینەوە عەقڵانیەکەی ئەرستۆی ئیسلام ئیبن روشد (۱۱۲٦–۱۱۹۸)، بەڵام بۆ هەڵسەنگاندن و پێوانـەکردنی ئیسـلام و پێغەمبەرەکـەی، ئـەویش وەك خـەڵکی سـەردەمی خـۆی هێرشـیکردووە، لـە کتێبەکەیدا (الشامل في الرّد على الكفرة)دا زۆر وەسف و سەنای گاورەکانی کـردووە و هێرشی سەختیشی کردووەتـە سـەر ئیسـلام و دەڵـێ: "ماحومیـت (موحەممـەد) گەلانی سەر زەویی تێکداوە و خەڵەتاندونی، ناوی موحەممەد لە تەورات و ئینجیلدا نەهاتووە و هیچ پێغەمبـەرێکی تـر مـژدەی هـاتنی نـەداوە"، پاشـان موحەممـەدی تاوانبار کردووە بە تێکدانی هەموو دەقەکانی تەورات و ئینجیل بە هێنانی ئەفسـانە و خورافات، دەڵێ: (کەس بڕوا ناهێنێ بە پەیامی موحەممەد، جگـە دڕنـدەکان کـە لە بیابانەکاندا دەژین).

زانای لاهوتی (نیکۆلاس کۆسی) (۱٤۰۰ – ۱٤٦٤)ز کە فەیلەسـوفێکی رووسـی و سیاسەتمەدارێکی سەر بە کەنیسە بوو، کتێبێکی بە ناوی (نظرات في القرآن) نووسی و بە دیاریی ناردی بۆ پاپا پیوسی دووەم.

پاشـان بـە بۆنـەی فـەتحی قوسـەنتینەوە لـە لایـەن عوسمانیەکانـەوە سـاڵی (۱٤٥۳)ز، کتێبێکی تری نووسی بە ناوی (السلام بين الأديان) کە بابـەتێکی جوانـە و دەڵـێ: (هـەموو ئایینـە ئاسمانیـەکان خـودا دەناسـێنن و نـاکۆکیی و نـاجۆریی لادەبەن، چاکوایە هەموویان کۆببنەوە و قسە بکەن و خوا لـەوان گـەورەترە، خـوا

زۆر لەوە گەورەرە کە یەك ئایین باسی بکات و وەسف و سەنای ئەو بکات، هەر ئایینێك شتێکی نوێی هێناوە کە لەوی پێشتردا نەبووە، هەموویان راستن و هەق دەپەرستن، بەڵام، چونکە شارەزاییمان نییە لە قورئان و موحەممەدەکەیدا و هەر نووسراوە تێکدراوەکانی ئەورووپامان خوێندووەتەوە کە چاکیان نەپێکاوە لەسەر قورئان و ئیسلام و موحەممەد، لەبەر ئەوە بە هەڵە لەوان تێگەیشتووین).

سی ساڵ لەمەوبەر کۆنگرەیەکی کەنەسی گیرا، لە کۆتاییدا بەڵگەنامەیەکیان بڵاوکردەوە کە تیایدا دەستنیشانی قسەیەکی (جریجوری حەوتەم) دەکات کە نۆسەد ساڵ لەمەوبەر بۆ پادشای مۆریتانی ناردووە، تیایدا باسی پەیوەندییەکانی کەنیسە بە ئایینی غەیرە گاورەکانەوە دەکات و دەڵێ: (لەگەڵ ئەوەی کە لە سەدەکانی پێشوودا هەرچی روویداوە لە دوژمنایەتیی و ناکۆکیی نێوان موسڵمان و گاور، کۆنگرەی کەنەسی پیرۆز ئامۆژگاریی هەموو لایەك دەکات کە لانەکەینەوە بۆ رابردوو، بەڵکو بە دڵسۆزانە هەوڵبدەین هەتا بگەینە ئەنجامێك و لە یەکتر تێبگەین و یارمەتیی یەکتری بدەین و یەکتر بپارێزین و هاوکاربین بۆ باشکردنی باری کۆمەڵایەتیی و دادپەروەریی و ئابووریی و داب و نەریت و رەوشتی باش، لە کۆتاییدا کە کۆتایی نییە ئێمە یارمەتیی ئاشتیی و ئازادیی خەڵك بدەین)[1].

دوای تەواوبوونی جەنگی جیهانیی دووەم هەتا ساڵی (١٩٨٩) و رووخانی سەربازگەی رۆژهەڵات (شیوعی)، لە بەرامبەر ئیمپراتۆریەتی گاوری ئەمریکا و ئەورووپا کە جەنگێکی درێژخایەن و پڕ کارەسات بوو، ئیتر رۆژئاوا ناچاربوون دوژمنێکی وەهمیی دروستبکەن و خۆیانی بۆ ئامادە بکەن، کە ئەویش ئیسلام و موسڵمانان بوو، ئیسلامیان لە خومەینی و سەدام و قاعیدەو توندڕەوەکاندا دەبینی، بەڵام هەر زوو بۆیان دەرکەوت کە سەدام و خومەینی دوو ئیسلامی تەزویرن و کار بۆ خۆیان و بیروبۆچوونی خۆیان دەکەن و قاعیدەش دەرکەوتەیەکە لە رق و قین و توندی، لە ئەنجامی کارێك، یان چەند هەڵەیەکی

---

[1] صورة الاسلام في التراث الغربي. د. سابيت. ترجمة: م. ثابت عيد.ل ٣٢-٣٧.

ئەوروپا و ئەمریکای گاور دروستبوون و بە نەمانی ئەو داگیرکارییانە ئەویش نامێنێ، هەر بۆیە رووی نەزەریان کردە ئەو بێدارییە ئیسلامییە چالاکە بەربلاوەی کە زۆر ورد و کاراو کاریگەر و خێرا هەوڵدەات و جەماوەرێکی یەکجار زۆری لە سیاسەتمەدار و رۆشنبیر و بیریار و زانا و فەقیە و خوێندکارانی زانکۆ و خەڵکی سادەی تر لە دەور کۆبووەتەوە و ئامادە دەکرێت بۆ رۆژێك کە هەتا ئێستا دیاریی نەکراوە، هەر بۆیە رۆژئاوا لە جێگەی سۆڤیەتی لەناوچوو، ئەو بێدارییەیان وەك وەهمێك بە دوژمنی ئایندەی خۆیان داناوەو لە هەوڵی دۆزینەوەی کار و نەخشەدان، زۆر کەس لە خەڵکی کەنیسە و سیاسەتمەدار و زاناکان دوژمنایەتیی دەکەن، زۆریش لە بیرمەندان و دانایانی ئەوروپا و ئەمریکا دەڵێن با هەمان گرفتی شیوعیەکان دروست نەکەین، مامەڵەیەکی ژیرانە لە ئاشتی و گفتوگۆی شارستانیەکان و ئایینەکان لەگەڵ ئەم رەوتە نوێیە رۆشنبیرە ئاشتیخوازە میانڕەوە بکەین و دنیایەکی پڕ لە خۆشیی و شادیی بۆ خەڵکانی هەموو ئایینەکان دەستەبەر بکرێت.

(صامۆئیل هانتیجتون) کە بەڕێوەبەری پەیمانگەی مەزن بۆ لێکۆڵینەوە ستراتیجییەکان لە دانیشگای هارفارد بوو لە ساڵی (١٩٩٣) لە لێدانی شارستانیەتەکاندا دەڵێ: "لێدانی سەربازی ئایندە لە نێوان شارستانیەتەکاندا روودەدات، بەتایبەتی شارستانیەتی ئیسلامیی و شارستانیەتی رۆژئاوادا".

رۆژئاوا هەرگیز ماندو نابێت لە دژایەتی ئیسلامدا، ئەوان زۆرترین خەرجی بەخت دەکەن دژی ئیسلام و بیرو باوەڕەکانی ترو خەڵککردنە گاورو نەصرانی، دیاردەی کردنە نەصرانی، دیاردەیەکە دوای عیسا پەیدا بوو، شائول (پولس) لە سەدەی یەکەمی زاینـدا گەشەی پێداو ئاینەکەیان گۆڕی و تێکەڵکرد بە زانستەکانی ئەغریقی و هیندی و فارسی، هەتا لە گەڵ گەلەکان و سەردەمەکاندا بگونجێ، بە گاور کردن ساڵی ١٩٩٠ زیاد لە ١٦٤ ملیار دۆلاری بۆ خەرج کرا، ساڵی ١٩٩٢ زیاتر لە ١٨١ ملیار دۆلار خەرجی بوە، کە ١٥١ ملیاریان یارمەتی خێرخوازان بوە، ئێستە ژمارەی گاور زیاد لە ١٧٢ ١ ملیارێك و سەدو حەفتاو دوو ملیون کەس

دەبن لە جیهاندا، کە٢٤،٥٨٠ ڕێکخراو یارمەتیان دەدات لە ڕاپەڕاندنی کارەکانیاندا، کە٢٠،٧٠٠ یان بە ناوی خێرخوازیەوەو، ٣٨٨٠ یان بە ناوی فریاگوزاریەوە خەریکن،٩٨،٧٢٠ پەیمانگایان هەیە کە ژمارەی کادیرە پێشکەوتوەکانیان٢٧٣٧٧٠ هەزارەو ساڵانە ٢٢١٠٠ جۆر کتێب بە جۆرەها زمان بلاْودەکەنەوە،٢٢٧٠ گۆڤارو و بلاْوکراوەیان هەیە کە ملیۆنەها ژمارەی لێبلاْو دەکەنەوە،١٩٠٠ ڕادیۆو کەناڵی ئاسمانیان هەیە، ئەم توانا زەبەلاحە بەخت دەکەن و کەمترین بەرهەمیان هەیە، کە زۆربەی هەرە زۆریان بۆ بەرژەوەندیەکی کاتی و تیکەیەك نان و پارەو سامان دەبنە گاور، هەر کە ئەو یارمەتیە نەما واز دەهێنن[1].

ئەو هەڵەو دەستێوەردانە زۆرەی کە لە ئاینی مەسیحی ئەوروپادا کرا، کەنیسە بووبویە دەزگایەکی ستەمکارو چەوسێنەرو داپڵۆسەرو پول و پارەو سامانی خەڵکیان بە تاڵان دەبرد، کەنیسەی لەبەرچاوی زۆربەی خەڵك بە تایبەت نوسەرو ڕۆشنبیرو سیاسەتمەداران خست، ئەمانیش وەك تۆڵە قوتابخانەیەکی فکری نوێیان دروستکرد، مەبەستیان چاکردنی باری ئاین بوو کە بە ئیصلاحی ئایینی ناسراوە، ئەو بیرۆکەیە کۆتایی سەدەی نۆزدە گەیشتە ناوچە ئیسلامیەکان، ئەوان ئاینی مەسیحی و کەنیسەیان خستە ژێر پرسیارەوە، هەر بەو شێوەش ئەمانەی لای خۆمان، هەموو دەق و پیرۆزییەکانی ئاینی ئیسلامیان خستە ژێر شیکردنەوەو توێژینەوەو پرسیارەوە، ئەمە بارێك بوو کە هەندێ ناوی ناوە نەخۆشی، چاکردنی ئاین بۆ ئاینی تێکچوو دەسکاری کراو دەبێت، دەنا ئاینی چاك و پاك و دامەزراو کە لە لایەن خواوە هاتبێ، چ پێویست بە دەسکاریکردن و پاکردنەوەو چاکردن دەکات، ئەو کاتە زانست وای لێهاتبوو، مادییەکان دەیانگوت هەرچی نەبینی نابێت باوەڕی پێبکەیت، مەبەستیان بوو باسە غەیبیەکان بەزانستی مادی بپێون، هەرچی بۆ ترازوەکەیان لارسەنگ بوو نەدەهاتەوەو نەیدەکێشاو دەرنەدەچوو عەقڵیان

---

[1](طوظاری ضرا رووناکی، ذمارة ١٢، شةعبان ١٤٣٠ك، ئابی ٢٠٠٩ ئةويش لة طؤظاری الدعوةی سعودی وةرطرتوة)

نەیدەبڕی ڕەدیاندەکردەوە، ئیتر بەو کارە دەیان وت ئێمەش دوای چاکسازی و پێشکەوتن و ڕاپەڕینی ئەوروپا کەوتوین، یەکەم کاری ئەمانەی لای خۆمان لە ژیانی پێغەمبەرەوە دەستیان پێکرد، گوایە گەرەکیانە ژیاننامەکە شیبکەنەوەو بە زانستی نوێ بیپێون، هەرچی لە کێشانی زانست دەرنەچوو لایبەرن. یەکەم کار (حیاه محمد)ی محمد حسن هەیکەل بوو ساڵی ١٩٣٢ز کە بەزۆری لە (حیاه محمد) ی (ئیمل درمنجم)ی ڕۆژهەلاتناسی گاوری فەرەنسی وەریگرتبوو، شێخی ئەزهەرو محەمەد فەرید وجدی پیرۆزباییان لەو هەوڵەی هەیکەل کرد، کە یەکەم کەس بوو زانستیانە خوێندنەوەی بۆ ژیانی پێغەمبەر کردو لەو بارە چەق بەستوەی دەرهێناو ڕزگاری کرد، محەمەد فرید وجدیش زنجیرە بابەتێکی زانستی لە سەر سیرە نوسی، بەلاّم دەستەیەك مەلاو زانای وەك سەعید ڕەمەزان بوتی دژی ئەو ڕێبازە نوێیە وەستان و دەیانگوت مەبەست لەو لێکۆلّینەوەو خوێندنەوانە ڕەفزکردنی زۆر لایەنی سیرەیە وەك غەیبیات و موعجیزەو وەحی، داگیرکاری بەریتانیا بۆ سەر میسر ئەوکاتە پشتگیریان لەو ڕێبازەکردو بە هەلیانزانی هەلّیسوڕێنن بۆ دژایەتی پێغەمبەر، هەندێ ڕۆشنبیرو خاوەن قەلّەمیان پێخەلّەتا وەك چۆن ئەمڕۆ لە کوردوستان تازە بە تازە دوای بەسەر چونی ئەو هەوڵە، هەندێ نوسەری وەك دکتور جەمال جوینەوەی وتەکانی دوای سەدەیەکی ئەوان دەکەنەوە، بەلاّم نەك وەك هەیکەل بە ئینساف و زانستانە، هەمیشە کورد لە هەوڵە زانستی و پێشکەوتنەکاندا درەنگ خەبەری بوەتەوە، بەریتانیا بەوکارە دەیویست جیاوازی بخاتە نێوان خەڵك و ئاینەکەیان، بەلاّم بە پێچەوانەوە ئەو کارە یارمەتی بێداری ئیسلامی‌دا، بۆ بلاّوبونەوەو زیاتر زانستی کردنی باسەکانی ئیسلام و دەرهێنانی لەو چەق بەستوە کۆنەی، کە بەرەتاکەی ئیمام بەنناو برایان هەولّیان بۆ دەدا، ئەوی بەڕاست نەزان بوو، بە نەفامی و بە تەشەنوج دوای ئەم قوتابخانەیە کەوت، بە هەڵە برگەکانیان بەکار دەهێنا، نە توانیان لە حەقیقەتی ئاینەکەیان حالّی بن و بمێنن، نە توانیان دوای وریابونەوە زانستە نوێیەکەی ئەوروپا بکەون..!!.

سیره نوسین، هەر ڕستە ڕیزکردن‌و کۆکردنـەوەی هـەواڵی شـەڕو هـەرای کـۆن‌و بەسەرچـوو تێپـەڕبوو نییـە، بـەڵکو مەبەسـت ناسـاندنی ڕاسـتی ئیسـلامە لـە خوێندنـەوەی ژیاننامـەی پێغەمبـەردا کـە ئیسـلام‌و ئیمـانی لـە ژیـانی خۆیـدا تاواندبوویـەوەو بەرجەسـتەی کردبـوو، بووبوویـە نموونەیـەکی زینـدوو بـەرز بـۆ شوێنکەوتووانی، کە ڕێچکەی ئەو بگرن‌و وەك ئەو لە ئیسلام بگەن‌و کاری پێبکەن‌و رەفتاریان ببێتە قورئان‌و قورئانێك بن بەڕێوە برۆن.

سـیره نووسـین، نووسـینی زۆرتـرین هـەواڵی ڕاسـت دروسـت‌و بێغـەل‌و غـەش‌و بێگومانە لە ژیانی پێغەمبەر ﷺدا، لە عەقیدەو ئەحکام‌و ئـەخلاق، چـونکە ژیـانی ئەو وێنەیەکی بەرجەستەی ئیسلامەو ئاوێنەیەکی ڕوونی ئـاینی خوایـە، هـەتا ئـەو وێنـە جوانـە لای هـەواداران‌و زانایـان‌و بـانگخوازان ئامادەبێـت، چـونکە ژیـانی ئـەو گشتگیرە هەموو لایەنـەکانی ئیسـلامی لـە خۆیـدا کۆکردووەتـەوە، پـڕە لـە لایـەنی مرۆڤایەتیی‌و کۆمەڵایەتیی‌و کەسایەتییەکی ئازادو کاریگەرو ئازا لە کۆمەڵگادا.

نووسـینەوەی سـیره لـە سـەرەتاوە بـووە چـەقێك بـۆ نووسـینەوەی ژیـانی پێغەمبـەر ﷺو پاشـان نووسـینەوەی مێـژووی ئیسـلام، مێژوونووسـان سـەرەتا سیرەیان نووسیی، پاشان درێژیان کردەوە بۆ زنجیرەی باسەکانی مێژوو، تەنانـەت نووسینی سیرە بووە هۆی پاراستنی زۆر ڕووداوی سەردەمی نەفامیی‌و پاراستنی لـە فەوتان، کەواتە سیرەی پێغەمبەر ﷺ چەقێکی پێکهێناوە کە بە دەوریدا مێـژووی پـێش و پـاش دەخولێتـەوە، بزاوتـی نووسـینەوەی مێـژووی ئیسـلام، کـاری لـە ڕووداوەکانی نیوەدوورگەو جیهان کردووە.

هونەری ڕوداوی مێژووی نووسـین لای عـەرەب‌و موسـڵمانان، وەك بەرنامەیـەکی زانسـتیی ورد هـەبووە بـۆ چـاودێریی ڕووداوەکـان‌و جیاکردنـەوەی باشـەکان لـە خراپەکان، بە جۆرێك کە لای کەسی تر نەبووە، مێژوویان پێدەنووسـییەوە، ئەگـەر سیرە نەبوایە کە پێویستییەکی ئاینی بوو، دەبوو بنوسرێ و خەڵکی لەبەرچـاویان بێوو وەك ئەو بکەن، چونکە سیرەو سوننە کلیلی یەکەمن بۆ تێگەیشتن لە قورئان، جـوانترین نموونەشـە بـۆ چـۆنیەتیی جێبـەجێکردن‌و کـارپێکردنی، ئـەو بەرنامـە

زانستییە بناغەیەکە بۆ جەرح و تەعدیلی زانستی فەرموودە، سەرەتا داهات بۆ خزمەتی سوننەت و فەرموودە، کە سیرە بناغەیەکە بۆ ئەو، پاشان بووە بەرنامەو لە بێژنگدان بۆ خزمەتی مێژوو بە گشتی و، جیاکردنەوەی راستییەکان لە بەتاڵ و خراپەکان، کە پێوەی لکابوو، لەوەوە دەردەکەوێت کە نووسینەوەی سیرەی پێغەمبەر ﷺ دەرگایەکی فراوان و گرنگ بوو، کە لێیەوە موسڵمانان چوون بۆ نووسینەوەی مێژوو بە گشتی، ئەو بەرنامەیەی کە دانرابوو بۆ رێکخستن و پاککردنەوەی هەواڵ و رووداوەکان، مێژووشی پێپاککرایەوەو سەرچاوەکانی پێ پاراست لەو خراپانەی کە پێوەی نووسابوو، یا چووبووە ناوی.

## قۆناغەکانی نووسینەوەی سیرە

نووسینەوەی سیرەی پێغەمبەر ﷺ بە گوێرەی کات بە پلەی دووەم دێ، چونکە نووسینەوەی فەرموودەو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ پێش سیرە نووسرایەوە، ئەوە بوو سوننەت و فەرموودە دەست بە نووسینەوەی کرا بە داوای پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی دڵنارام بوو، کە سەحابەکان ئاگادارن لە جیاوازکردنیی گەورە لە نێوان دارشتن و شێوازو بەلاغەی قورئان و فەرموودەو تێکەڵیان نەدەکرد، لێیان تێك نەدەچوو، بەڵام نووسینەوەی ژیانی پێغەمبەر ﷺ و قۆناغەکانی بە گشتی دوای نووسینەوەی فەرموودە دەست پێکرا، هەرچەند سەحابەکان گرنگییان پێدەدا بە گێڕانەوەی سیرەو غەزاکانی پێغەمبەر ﷺ بە زارەکی، رەنگە یەکەم کەس کە سیرەی نووسیبێتەوە عوروە کوری زوبێر (٩٢ك مرد) بووبێ، پاشان ئیبان کوری عوسمان کە (١٠٥ك مرد)، پاشان وەهب کوری منبە (١١٠ك مرد)، پاشان شەرحەبیل کوری سەعد (١٢٣ك مرد) پاشان ئیبن شەهاب زوهەری کە (١٢٤ك مرد)، ئەمانە یەکەم کەس بوون گرنگییان دا بە نووسینەوەی سیرە، یەکەم کاری زانستیان تیا کردو هەنگاوی یەکەم بوون بۆ نووسینەوەی مێژووی ئیسلام، ئەمە جگە لەوەی کە زۆر لە لایەنەکانی سیرە لە قورئاندا بڵاوەو هەیەو خوا باسی کردووە، پاشان لە ناو کتێبە سوننەکاندا هەیە، کە باس لە وتەو کردەوەکانی پێغەمبەر ﷺ دەکات، بە تایبەت لە رووی تەشریعەوە، بەڵام هەموو ئەوانەی ئەو

کەسانە نووسییان تیاچووەو لەگەڵ رۆژگاردا فەوتاوەو هیچیان وەك دەستنوس و دەسخەتێکی تەواو نەگەشتووەتە دەست ئێمەو هیچیان نەماوە، جگە هەندێ پارچەی پرش و بڵاو لەمو لەو کە هەندێکیان لە مێژووەکەی تەبەریدا ناویان هاتووە، یان دەڵێن هەندێ پارچەی نووسراوەکەی وەهب کوڕی منبە پارێزراوە لە شاری هایدلبرج لە ئەڵمانیا[1]، بەڵام چینی دوای ئەوان کە هەموو نووسراوەکانی ئەوانیان گواستووەتەوە، نووسینەکانیان پارێزراوە، لە پێشەنگیاندا موحەممەد کوڕی ئیسحاق (١٥٢ك مرد) لێکۆڵەرەکان دەڵێن ئەوەی موحەممەدی کوڕی ئیسحاق نووسیویەتی لە بڕوا پێکراوترین نووسینە لەسەر سیرە.

هەرچەند کتێبی غەزاکان بە ئێمە نەگەشتووە، بەڵام ئەبا موحەممەد عەبدولمەلیك ناسراو بە (ئیبن هیشام) دوای ئەو هات و کتێبەکەی ئەوی بە پوختەو پاككراوی بۆ گواستینەوە کە هێشتا (٥٠) ساڵ بەسەر نووسینەکەی ئیبن ئیسحاقدا تێنەپەڕیبوو.

## سیرەی پێغەمبەر ﷺ
## لەبەر رۆشنایی رێبازە نوێکانی نووسینەوەی مێژوو

لە سەدەی نۆزدەوە رێبازی زۆرو جۆراوجۆر دەرکەوت لە نووسینەوەی مێژوودا، ئەوە لە پاڵ رێگەی بابەتی، کە ناسراوە بە رێبازی زانستی، دواتر ناونرا رێبازی خودی، فرۆید بە گەورەترین بانگخواز دادەنرێ بۆی، پێشەوای ئەو مەزهەبانە گوێیان لەوە نییە کە مێژوونووس رای خۆی، یان لایەنی فکریی و سیاسیی و ئاینیی خۆی تێکەڵ بکات لە شیکردنەوەو باسکردنی بابەتەکاندا، بەڵکو ئەوە بە پێویستی مێژوونووس دەزانێ کە ناکرێ هەر وەسفو سەنای هەواڵەکان بکەن و رووداوەکان کۆکەنەوە، بەڵکو دەبێ قسەی خۆشیان لەسەری بکەن. ئیتر کاری خوێندنەوەو لێدەرهێنان و دەرئەنجام و حوکمدان دوای ئەوە دێت، کە ئێمە

---

[1] فقه السيرة النبوية، د. محمد سعيد رمضان البوطي، دار الفكر، بيروت، ط٢٦، سنة ٢٠٠٦، ص١٨.

رازی بووین ئەوە لە پێغەمبەرەوەیە ﷺ، ئەوە پەیوەندیی بە مێژووەوە نییە، ئەوە کارێکی زانستییەو لە ناخی خۆیدا سەربەخۆیەو بە پێی بنەمای تر کاری لەسەر دەکرێ، لەویا ئارەزووکاریو بۆچوونی ترو مەبەستی تر کاری لەسەر دەکات، وەك (ولیەم جیمس) دەڵێ: "ئیرادەی بڕوا بوون" کار لەسەر ئەو دەقە دەکات.

ڕەمەزان بوتی دەڵێ ئەو ڕێبازە وا لە نووسینەوەی مێژوو دەکات کە ببێتە کارێکی هونەری رووتو بێمانا، وا دەکات کە هەموو رووداوە مێژووییەکان هەڵبووەشێتەوەو پیرۆزییەکەی ون بکات، لەوێوە هەواو ئارەزوکاری تێکەڵ بە مێژوو دەبێو دەفەوتێو دەشکێو دادگایی رووداوەکان دەکرێو ستەمیان لێدەکرێ[1].

ئەم قوتابخانەیە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی داگیرکاریی بەریتانیا بۆ سەر میسر، ئەوکاتە میسر بڵندگۆی جیهانی ئیسلامی بوو، خەڵکی گوێیان لێدەگرتو رووبیان تێدەکرد، بەڵام بەریتانیا هەوڵیدا ئەو روگە زانستییە بشێوێنێ، ویستی پەیوەندی خەڵك بە ئەزهەرەوە ببڕێو دەسەلاتی نەمێنێ، پاشان ویستی دزە بکاتە ناو مەڵبەندی سەرۆکایەتی ئەزهەرو هەوڵ بدات رووی بکاتە خۆی، هەتا مەرامەکانی بۆ جوان بکاتو پاساوی بۆ بهێنێتەوەو کەشو هەوای داگیرکاری بۆ بگونجێنێ[2].

هەوڵی دەدا ئەو خاڵە لاوازانە بدۆزێتەوە لە ناو نەتەوەی ئیسلامدا کە پێوەی دەناڵێنێ و ناکۆك و دواکەوتوو و پارچە پارچە بوون، لەولاشەوە ئەورووپا پێشکەوتوو بوو لە رووی فکریو زانستی و شارستانییەوە، خەڵکی چاویان لەو رۆژە بوو لە دواکەوتوویی رزگاریان ببێ و، لەگەڵ خەڵکی تر لە کاروانی پێشکەوتنو شارستانی و زانستیدا پێش بکەون، ئا لەوێوە داگیرکار بۆشی

---

[1] فقه السیرة النبویة، سعید رمضان بوطي، ص۲۱.

[2] (مذکرات اللورد کوورمر)، (الاتجاهات الوطنیة في الادب الحدیث. للدکتور محمد محمد حسین.)

دۆزیەوەو فێڵ‌و کاری خۆی کرد، دزەی کردە ناو سنگی هەندێ لە سەرکردە فکرییەکانی میسر کە هەیانبوو دەیگوت پێویستە دوای رۆژئاوا بکەوین لە خێرو شەڕیدا، چونکە خێرو هەموو خێر لە رۆژئاواوەیەو، شەڕو هەموو شەڕ لە رۆژهەڵاتەوەیە، دەیانگوت: دەبێ لەم کۆتەو ئەوەی بووەتە هۆی کۆتکردنیان رزگار ببین، دەیانگوت: کاتێ ئەوروپا رزگاربوون کە ئاینیان سەرشۆڕکرد تا بە پێوەری زانست بپێورێ‌و لە ژووری ئازمایشگادا عەمەلیاتی بۆ بکرێ، دەیانگوت: ئاین شتێکەو زانست شتێکی ترەو ناکرێ کۆبکرێنەوە، مەگەر یەکەم ملکەچ بکەن بۆ دووەم، ئاین ملکەچ بکەن بۆ زانست، ئەگەر جیهانی ئیسلامیش دەیەوێ رزگاری ببێ دەبێ هەمان رێ بگرێتەبەر، دەبێ لێرە وا لە ئیسلام تێبگەن، وەك چۆن ئەوروپا لەوێ لە گاوری تێگەیشت، ئەوەش نابێ هەتا فیکری ئیسلامی رزگار نەکەن لەو هەموو غەیبییانەی کە لە ناخیا هەیەو بۆتە خۆرەو ناهێڵێ ملکەچ بێ بۆ زانستی نوێ.

بەڵام هەر زوو ئەو کارە بوو، بەریشی دا، ئەوانەی کە ڕوکەشی شارستانی رۆژئاوا خەڵەتاندنی، چوون بە دوایدا، ئەوانەی کە حەقیقەتی بڕوا بەخوا لە دڵیاندا نەگیرسا بوو، هەر زوو داوایان کرد کە ئەوروپا راست دەکەن، با ئێمەش خۆمان رزگار بکەین لەو غەیبیاتەی کە زانستی نوێ نایسەلمێنێ‌و پەیی پێ نابات، چوونە ژێر بارەکەو زۆر کاریان بۆ کرد، لەوانە سیرەیان بەو رێبازە پێواوو خستیانە ژێر ئازمایش‌و عەمەلیات و تاقیکردنەوە.

پاش ئەوە هەندێ کتێب دەرکەوت لەسەر سیرە، بە ترازووەکانیان، سەنەدو بنەماو مەرجەکانی فەرموودەزانییان گۆڕی بە رێبازی بەرهەمهێنانی خودی‌و میزانی رازیبوونی دەروون و بەرنامەیەك کە هیچ برگەیەك نایگرێتەوە، هەرچی لەگەڵ تواناو راهاتنی مرۆڤدا یەك نەگرێتەوەو بچێتە لایەنی موعجیزات‌و خەرافیات رەفزیان کرد، سیفەتی عەبقەری و پاڵەوانیان دا بە پێغەمبەر ﷺ، واتە محەممەد ئەو توانایەی لە توانای زەینی خۆیەوە دەستکەوتووە، نەك لە وەحی و خواوە، سەعید رەمەزان بوتی کتێبی (حیاه محمد)ی حەسەن هەیکەل بەو لایەنە دەزانێ و

دەڵـێ هەیکـەل وتوویـەتی: مـن نەمویسـتووە سـیرەیەکی تەقلیـدی بنووسمـەوە، چـونکە مـن ئـەوە بـە بـاش دەزانم کـە بـە ڕێـی زانسـی بینووسمـەوە، بابەتـەکانی موحەممەد فرید وجدی کە لە (نور الاسلام)دا بڵاوی کردەوە بە ناونیشانی (السـیرە المحمدیه تحت ضوء العلم والفلسفه) [1]، تیایدا دەڵێ: خوێنـەران تێبینیـان کـردووە کە من لە سیرە نووسینەوەدا هەموو جار ناگەڕێمەوە بـۆ ئیعجـاز، مـادام دەتـوانین پشت ببەستین بە هۆکارە ئاساییەکان، نوسراوە زۆرەکانی ڕۆژهەلاتناسان لـە کـارو نووسینە مێژووییەکان کە خۆیان بە زەینی خۆیان شییان کردوەتەوەو بۆی چوون، ئـەوان موحەممـەدیان لا گـەورە بـوەو بـە پـیرۆزی دەزانـن‌و پیـا هەڵـدەدەن، نـەك قورئان‌و ئاینەکەی.! گویَ بە سەنەدو راوی و گێڕانـەوەکان نـادەن، دواکـەوتووانی ئەو قوتابخانەیە هەرچی بە لایانەوە باش نەبێ نایانەوێ، بە دڵی خۆیان دەنووسن‌و شـییدەکەنەوەو هەڵدەسـەنگێنن، بـە پاڵپشـتی زانسـتی نـوێ و بـە کـەیفی خۆیـان وەردەگرن، یان بەرپەرچ دەدەنەوە، ئەوان بڕوا بە ڕوداوی تەیرەلئەبابیل‌و ئیسـراو میعـراج‌و یارمـەتی مەلائیکـە لـە غـەزاکان ناکـەن، دەڵـێن ئـەویان ئاوڵـە بـوەو، یارمەتیەکەش خەو بووە، یـان.... سـیرە نوسـین بـەو جـۆرە فێڵێکـی خەتـەرناکـە، هەندێ موسڵمانی لاوازی پێدەخەڵەتێنن، یان تـەفسیرێکی مادی و ئابوری دەکـەن و دەڵێن: شۆڕشی محەممەد ڕاپەڕینی لاواز بـووە دژی دەرەبـەگ، دژی خراپـی بـاری ئـابوری، ئـەو هۆکـارە هانیـدان بـۆ شـۆڕش بەسـەر ئاغـاو گەورەکانیانـدا، ئەمـە تەفسیرێکی خەتەرناکە، ئەم وتانە هەندێ کەسی لاوازی پێدەخەڵەتێ، ئەوان نازانن ئیسـلام سەرچـاوەی سـەرەکی ئـەو شـۆڕش‌و هەڵسـانەوانە بـوە، هـەر دەڵـێن ئـەو موعجیزانە ناگونجێ لەگەڵ سوننەتە سروشـتیەکاندا، عـەقڵ وەری نـاگرێ، زانسـتی نوێ قبوڵی ناکات.. هەرگیز ئاین ناکرێ بـە زانسـت بپێـورێ.. لەگـەڵ ئـەوەدا نـیم سـیرە و قورئـان و ئـاین بـە زانسـت بپێـوین، ئـەوان لەسـەرووی زانسـتەوەن و سەرچاوەی زانستن، واتە هەرچـی زانسـت قبـوڵی کـات بڵـێین باشـەو هەرچـی ئـەو

[1] فقه السیرة، ص٢٣.

نەبێتیواو بەو نەپێورا وەرینەگرین و بلێین نییە، بەڵام دەڵێم با خوێندنەوە بۆ سیرە بکرێو لاوازیو زیادەکانی لێلابرێو ئەوەی سەوابت نییە لە ئایینـدا نوێگـەری تیـا بکرێ بە گوێرەی سەردەم و زەمانە رێکبخرێتو ئامادە بکرێ.

ئەم زانستە نوێیە هەندێ بە هەڵە لێی حاڵی بوونو بە نەزانی مامەڵـەی لەگـەڵ دەکـەنو پێـی دەخەڵـەتێن، ئەمـە هـەر بوارێکـەو خـەڵکی دەیگـوزەرێنێ، پاشـان دەزانێ ئیسـلام دژی زانسـت نییـە بـەڵکو بەشـێکی سـەرەکییە لـە خـۆی، ئیسـلام زانست دروسـت دەکـاتو تـۆوی دەتـەقێنێو عـەقڵ دروسـت دەکـاتو دەیپـرژێنێو دەیچەسپێنێ، زانستی نوێ ئاستی خۆی دەدۆزێتەوە، لەگەڵ ئەوانـەدا ئێمـە دەبـێ بـە دوای رووداوەکانـدا بچـین، هۆکـاری رووداوەکـان بدۆزینـەوەو خوێندنـەوەی بـۆ بکەینو سوود لە ئەزموونەکان وەربگرین، دەبێ بـزانین بۆچـی لـە ئوحـددا شـکان، هەڵیسەنگێنین و رەخنە لەو حاڵەتە بگرین، پێغەمبەر ئەنجامی ئوحدو بەدری قبوڵ بـوە، ناسـك مامەڵـەی لـە گـەڵ سـەرکەوتن و شکسـتدا کـردوە، ئـەوە هونـەری سـەرکردەوە، بـزانین پێغەمبـەر ﷺ چ شـێوازێکی ناسـکی بـەکارهێناوە، ئێمـەش سوودجی لێببینـین، وەك ئـەو بکـەین لـە قۆناغبەنـدی بانگـەوازو گوێڕایـەڵی خـواو قورئان مامەڵەکانیدا، حسنین هەیکەل لە پێشەکی ژیانی موحەممەددا دەڵـێ: "مـن ئەوەی کتـێبی سیرەو فـەرموودە هێناویانـە وەری نـاگرم، وا بـە بـاش دەزانم ئـەم باسەم لە رێی زانستەوە بکەم"[١]، ئەمە وتەیەکی راستە چونکە زۆر باسـی سیرە هەڵەیە و پێغەمبەر ﷺ پێی هەڵنەساوە، زۆربەی فەرموودەکان لاوازو بێبنەرەتنو دەستی خراپی تێکەوتووە.

بەداخـەوەم سـەعید رەمـەزان بـوتی خـراپ وتـەکانی حسـەنین هەیکـەلی لێکداوەتـەوە، تەشـەنوجێکی بەرامبـەر پەیـداکردوە، ئـەو بەرگرییـەی هەیکـەل لـە پێغەمبەر ﷺ و ئیسلام و وەحیو موعجیزە دەیکـات، هـەرگیز لـە (فقـه السـیرە)دا

[١] حياة محمد، محمد حسنين هيكل، ط١٣، مكتبة النهضة، ١٩٦٨، ص١٨-٢٠.

بوتی بۆی نەچووە، ئەم هەوڵی داوە فیقهێکی سیرە بنووسیێ، هەیکەل هـەوڵی داوە سیرەیەکی زانستیانەی سەردەمانەو پـڕ مانـاو کاکڵـە بنووسـێ، بـوتی لـە خۆیـەوە بەگژ ڕۆژهەڵاتناساندا چوەتەوە، بەڵام هەیکەل بە چاوکراوانە و لە زانستەوە توندتر بەگژ ئەو ڕۆژهەڵاتناس‌و خراپکارانە دەچێتەوە کە ڕەخنە لە قورئـان‌و موحەممـەدو ئیسلام دەگرن، ئەم بە لێکۆڵینەوە هەڵیان دەوەشێنێتەوە، بەرگرییـەکی بێوێنـەی سەردەمانەیە لە سەدەی نۆزدەدا، هەیکەل (٨٠) جار چاپی کردووەتەوە، ڕەمەزان بوتی (٣٠) جار چاپی کردووەتەوە، (فقه السیرەی بوتی) ١٩٦٥ نووسراوە، (حیـاە محمدی هەیکەل) ١٩٣٥ نووسراوە.

هەیکەل دەڵێ: بۆم دەرکەوتووە کە ڕاسـتترین‌و پـاکترین سەرچـاوە بـۆ سـیرە قورئـانی کەریمـە، کـە باسـی هـەموو ڕوداوەکـانی ژیـانی پێغەمبـەری ﷺ تیایـە، چرایەکە بۆ لێکۆڵەر لەسەر ژیانی پێغەمبەر ﷺ بنووسێ، پاشان سەرچاوە کتێبـە سوننەتەکانە، پاشتر کتێبـە سـیرە جـۆراو جۆرەکانـە، ویسـتم لەسـەر هـەموو ئـەو ئایەتانـە بووەسـتم کـە پەیوەنـدیی بـە ژیـانی پێغەمبـەرەوە ﷺ هەیـە، دوای وردبوونەوە وتم: پێویستە هۆی هاتنە خوارەوەکانیـان بـزانم‌و لەسـەریان بوەسـتم، کاتەکانیان‌و هۆکانیـان، بـەڵام زۆر هەوڵمـداو تـەواو موەفـەق نـەبووم، زۆر تەفسـیر باسی کردووەو زۆریش گوێی نەداوەتێ، ناچابووم زۆر جار پشتم بە زانـا بـەرزەکان دەبەسـت‌و پـرس‌و ڕام پێـدەکردن‌و لـە کتێبخانـەکانیان سـودم وەردەگـرت، وەك هەموو سەرچاوەکانی سیرەی (محمد مصطفى المراغي)، سـودم لـە سـەدان کتـێبی سـیرەو نووسـەرانی نـوێ‌و ڕۆژهەڵاتناسـان وەرگـرت، ناچـاربووم وەڵامـی ئـەو ڕۆژهەڵاتناسە ڕەگەزپەرستـە بـێ عەقڵانـە بدەمـەوە کـە دەیانـەوێ سـوکایەتی بـە پێغەمبەر ﷺ بکەن، دەمتوانی چـەندین بـەرگ لەسـەر موحەممـەد بنوسم، بـەڵام ویستم پاکی بکەم‌و ئەو تێکەڵەو ئیسرائیلیاتانەی لێپاك بکەمەوە کە تێکەڵی بـووەو بـە شـێوەیەکی زانسـتی بینووسمـەوە، (في منـزل الـوحي) (هکـذا خلقـت) (الايمـان والمعرفة) (عثمان) (فاروق عمر) (ئەبوبەکر)و زۆری تر بە شـێوەی زانسـتی‌و ڕوون‌و جوان نوسرابون، ئەوەی موحەممەد فرید وجـدی، ئەوانـەی ڕۆژهەڵاتناسـان لەسـەر

سیره کـه ئـەوانیش هـەوڵی خۆیـان تیـا بـه خەرجـدابوو، ئـەوان بـه شـان وبـاڵی پێغەمبەردا ﷺ هەڵیان دا، زیاتر باسی رەوشتو کەسایەتیو بەتوانایی ئەویان کردوه، دوور له باسی وەحیو کاریگەریی وەحی لـه ژیانی ئـەودا، کـه ئـەوه لـه بەرژەوەندییان نەبووه، ئیتر لەوێوه خاوەنانی قوتابخانه نوێکان به کەیفی خۆیان هەرچی له ژیانی پێغەمبەردا ﷺ دڵیان نەیگرت لایان بردو ئەوەی لەگەڵ عەقڵو زانستیان پێك نایەتەوه بڕوایان پێینەکرد، بـەلام نـازانن کـه محەممـەد ﷺ کاتێـك پەیدابوو، خۆی به پێغەمبەر ﷺ ناساند به جیهان، که لـه لایـەن خـواوه هـاتووەو مژدەی بەهەشتو جەهەنەمو قیامەت دەداتو دەڵێ: "دوا پێغەمبەرم لـه زنجـیرەی پێغەمبەران"، وه فەرمووی: "من مرۆڤمو هـەموو هەستێکی مرۆڤایـەتیم تیایـه لـه خواردنو خەوتنو بیرکردنەوەو ماندوبوونو هەواو هەوەس، بـەڵام خـوا بـه وەحـی بـەرزی کردوومەتـەوه. موحەممـەد خـۆی بـه زەعـیمو سیاسـییو سـەرکردەی نیشـتمانیو زانـاو خـاوەن فکـرەو مەزهـەبی تایبـەتو موصـلیحی کۆمەڵایـەتی نەناساندووه" [1]. ئەمانه وتەی هەیکەله، چ خراپەیەك له نوسینانەدا هەیه که بـوتی وا دژایەتی دەکات. من ڕەخنەم لەسەر سیرەکەی بوتی و هەیکەل هەیه، لـه جـێی خۆیدا ڕەخنەم لەوەی هەیکەل ڕون دەکەمەوه بەڵام هەموی ڕەد ناکەمەوه.!

نووسەرو بیریاری ئیسلامی ئەنوەر جوندی له کۆنگرەی سیرەدا هەنـدێ خـاڵی لەسەر نوسراوەکان لەسەر سـیره وتـووه بـەم جـۆره: "نوسـەرانی ئـەم سـەردەمه کۆمەڵێك کتێبیان لەسەر سیره نووسیوه که کاریگەریی چـاکی بـووه بـۆ ناسـاندنی پێغەمبەرﷺو کاریگەری بووه لەسەر دڵو دەروونـی موسـڵمانانو خووڕەوشـتیان، بەڵام به تەواوی کارێکی تەواو نییەو نەیانتوانیوه به سروشتی خۆی ڕێزەوی سـیره بگـرن لـه تێگەیشـتنی ئیسـلامەوه، ڕێـزی تـەواویان بـۆ وەحـیو پێغەمبەرایـەتیو غەیبـەکانو مـوعجیزات دانـەناوه، کـه ئەمـەش لاوازیـی و کـەم سـەلیقەیه لای ئـەو لێکۆڵەرانه که هاتوون لاسایی بەرنامـەو پرۆگرامـی ڕۆژئاواییـەکانیان کردووەتـەوه،

---

[1] حياة محمد، محمد حسنين هيكل، ط١٣، مكتبة النهضة، ١٩٦٨، ص١٨-٢٠

کـارێکی روکەشـی خەڵەتێنــەرەو لــە پشــتیەوە هــەواو ئــارەزوو جیــاوازی نێــوان ئایینەکانو خۆ بەزلزانینی رۆژئاواو تەماعیان لە خاکی ئیسلامیو زاڵبوونـە بەسـەر بیرو مێژووی ئیسلامی دای تیا دەبینیـنن، رۆژئـاوا دەیـەوێ رۆحو گیـانی نەتـەوەی ئیسلامی نوێ نەبێتەوەو کۆمەڵگەیەکی یەکگرتووی ئیسلامی دروست نەبێت[1].

ئەمانە هاتوون هەڵەکانی رۆژهەڵاتناسانیان دوبارە کردووەتـەوەو بیروبۆچـوونی هەڵەی ئەوانیان سەلماندووە کە ئەوان لە بنەڕەتدا بڕوایان بە ئیسلام نییـە، نـە بـە ئیسلام کە دوا ئاینـە، نـە بـە پێغەمبـەر ﷺ موحەممـەد کـە خاتەمـە، بڕوایـان بـە وەحی نییە، جیاوازی ناکەن لە نێوان خوایەتیی الله و پێغەمبەرێتی محەممەددا.

ئـەم نوسـینانە دوو پاڵنــەر لــە پشــتیەوە بـون، هۆکـاری نزیـك و راسـتەوخۆ دەرکەوتنی بزووتنەوەی تەبشیریی گاوریی بەربلاوبوو لە قاهیرە، لە رێی دانیشگای ئەمریکی ساڵی ١٩٣٢دامەزراو، بەگاوربوونی هەندێ قوتـابی موسـڵمان کـە ئـەوەش بەشێك بوو لەو تەوەژمە گەورەیـەی کـە رۆژئـاوا پێـی هەسـتان دوای ئـەوەی پـارە زۆرەکەی ڤاتیکـان کـە لای حکومـەتی ئیتالیـا حجـز بـوو بـەرەڵلا کـرا. کارەسـاتی جەنگی جیهانی دووەم لە ناخی خەڵکداو وای لێهات خەڵك بگەڕێنەوە بۆ ئایین هەتا ئاسـۆیەکی نوێیـان لێبکریتـەوەو لـە مـەراقی جـەنگ رزگـار بـن و دەورنیـان هێـور بێتەوە، حزبـی ئـەحراری دەسـتوری میسـری حـەزی وابـوو بـۆ راکێشـانی هەسـتی نیشتمانپەروەران دەستی کردە بانگەشە بۆ رۆژئاواو ئەو کتێبانـەیان کـۆدەکردەوە کـە دەیکـەن بـە هـەراو نـاکۆکی دەنێنـەوەو دژایـەتی نـاوکرۆکی ئیسـلام دەکـەنو هەسـتی موسـڵمانانی دەوروژانـد، بـە تایبـەت کتێبەکـەی (الشـعر الجـاهلی)ی تـەها حسێنو (الاسلام واصـول الحکـم)ی عـەلی عەبدولڕەزاقو ئـەو کتێبانـەی کـە زیـاتر هەسـتبزوێن وەك کتـێبی (حیـاە محمـد)ی دکتـۆر هەیکـەل، ئـەو هەڵوێسـتەی کـە

---

[1] سبل الهدى والرشاد في سيرة خير العباد، الامام محمد بن يوسف الصالحي الشامي، متوفى سنة ٩٤٢ ج١ ص١٧، تحقيق الشيخ عادل احمد عبدالموجود، الشيخ علي محمد معوضي، دار الكتب العلمية، بيروت، ط٢، ٢٠٠٧.

جەنگی جیهانی دووەم دروستی کرد لە ڕێکەوتنی بەلشەفییەکانو سەرمایەدارەکان لە دژی نازییدا، ئەوەی کە دەهاتە ناو وڵاتی ئیسلامی لە پاگەندەی شیوعییەکانو ڕۆژئاوا بۆ ناشیرینکردن و دژایەتیکردنی مارکسییەت کە دەیانەویست پاڵەوانی کۆمەڵی دروست بکەن، لەوێوە دەستکرا بە ناساندنی پاڵەوانە ئیسلامییەکانو ناساندنیان وەك عەبقەری، ئەوانە لە ڕۆژنامەکاندا بڵاودەکرایەوە، وەك کتێبی (حیاه محمد)ی هەیکەل کە لە مولحەقی ڕۆژنامەی (السیاسه) ساڵی (١٩٣٢)بڵاوی کردەوە، کە کورتکراوەی کتێبی (ئیمیل در منجم) بوو لە ژێر ئەم ناونیشانەدا (حیاه محمد ـ تألیف إمیل در منجم ـ تلخیص وتقدیم محمد حسین هیکل) پاشان چەند بەشێك لە کتێبەکەی تەها حسین (علی هامش السیره) لە چەند ژمارەیەکی گۆڤاری (الرساله)ی ساڵی (١٩٣٣) بە پێنوسی تەها حسێن بڵاوکرایەوە، پاشان چەند بەشێك لە (عبقریه محمد)ی عەققاد ساڵی (١٩٤٢) لە ژمارەیەکی ساڵانەی (الرساله) کە تایبەت بوو بە کۆچی پێغەمبەر بڵاوکرایەوە، دوای ئەوەی جەنگی جیهانی دووەم دوو ساڵ بوو تاوی سەندبوو، ئەو سێ کتێبە ناسراوە هاوچەرخ و لیبراڵی و عەلمانییانە نووسراوە، ئەوانە هێرشی گەورە بوون بۆ سەر ئیسلام، ڕۆژنامەی (السیاسه) پاگەندەی زۆری بۆ دەکرد وای دەزانی ئەوانە دژی ئیسلام دەنوسن وەك (هەیکەل، تەها حسێن، عەلی عەبدوڕڕەزاق، موحەممەد عەبدوڵڵا عەنان)، عەباس مەحمود عەققاد ساڵی (١٩٣٥) لە ڕۆژنامەی (روز الیوسف)ەوە هێرشێکی توندی کردە سەر کتێبە ئیسلامییەکان و بە دەرکەوتەیەکی خەتەرناکی وەسف کردو وتی: ئەو کتێبانە دژایەتییەکە بۆ کێشەی نیشتمانی، دەنگو باس هەبوو کە هەیکەل قازانجێکی بێشوماری دەستکەوتبوو لە کتێبی (حیاه محمد)، وای لێهات نووسین لەسەر ئیسلام بە نرخو ڕێز بوو لای نووسەران، وەك چۆن ئەمڕۆ ڕۆژنامەی هەواڵ و لە کوردوستان مەیدانێکی کراوەیە بۆ نووسین و هێرش کردنە سەر ئیسلام و ئیسلامیەکان و بۆ هەموو بابەتێکیش لوقمەیەکی چاك دەدەن، بەلام ئەوەی خەتەر بوو دکتۆر هەیکەلو عەلی عەبدوڕڕەزاق هەڵوێستێکی خەتەرناکیان وەگرت لە مەجلیسی شیوخی میسریدا کە دژی نوسینەکانی تەها حسێن ساز

کرابوو، ئەمان بەرگرییان لێکرد، هەرچەند کتێبەکانی (حیاە محمد)ی هەیکەل و (علی هامش السیرە)ی تەها حسین و، عەبقەریەکانی عەقاد، ویژدانی گەلی موسڵمانی دەجوڵاندو زۆر سەریان سوڕمابوو لە هەڵوێستی ئەو نوسەرانە، بەڵام ئەو نوسەرانە مەبەستیان لەو بابەتانە ئەوەبوو:

* بۆ بەرەنگاری ئەو ژیانەوەو وریابوونەوە ئیسلامییە کە ئیسلامی دەناساند وەك بەرنامەی ژیانو ڕێکخەری کۆمەڵگە بزوێنەری لاوان بەرەو ئیسلام، ئەو نووسەرانە کە جێی ڕێزی سیاسیەکان بوون، مەبەستیان بوو ڕوی خەڵك و لاوان لابدەن لەو وریابونەوە ئیسلامیە و، ڕویان بکەنە عەلمانیو لیبراڵی وەك بەدیلێك بۆ ئیسلام، هەتا گەمارۆی ئەو بزاڤە ئیسلامیە نوێیە بدەن کە موحەممەد عەبدەو ڕەشید ڕەزاو دواتر حەسەن بەنناو سەید قوتب و ئیخوان پێشەوایەتیان دەکردو دەیان جوڵاندو تەغزیەی ئیمان و زانستیان دەکردن.

* فەرزکردنی تێگەیشتنی ڕۆژئاوا لە سیرەو مێژووی ئیسلامی، کە بڕوایان بە غەیبییاتو وەحیو موعجیزات نەبوو.

بەڵام هەر زوو نیەتو مەبەستی ئەو نووسەرە لیبراڵیانە دەرکەوتو خەڵك زانی کە بەرنامەی نووسینەکەیان ئیسلامی نییە، بەڵکو لاساییکردنەوەی ڕۆژهەڵاتناسانو ڕۆژئاواپەرستانە، هەتا وای لێهات خەڵکی بە ئاشکرا دەیانگوت: کە سێ کتێبە گەورەکە کە زۆر جێی ڕێزی خەڵك بوو (حیاە محمد، علی هامش السیرە، عبقریە محمد) بەرهەمێکی ڕۆژئاوایە لەسەر بەرنامەو قوتابخانەو شێوازی ڕۆژئاوا نووسراوەو، تووشی هەڵەیەکی زۆر بوونەتەوەو، بە نیەتی پاکەوە کەوتونەتە ناو تێگەیشتنەکانی کەنیسەو مادییەکان، زۆر دورن لە تێگەیشتنی ئیسلامییەوە.

نووسەرانی ئیسلامی زۆر هەوڵیان دا ئەو بۆشاییە پڕبکەنەوەو وریابوونەوەیەکیان دروست کرد، هەتا ڕزگاربن لەو قۆناغە کە نوێنەرایەتی ڕۆژئاوایان تیادەکرد لە مێژووی ئیسلامو سیرەدا، کە تەئویلاتیان بۆ موعجیزاتو ئیعجاز دەهێنایەوە، هەڵەی هەیکەل لەوەدا بوو نەهات بەو زیرەکی و عەبقەریەو

توانا لە رادەبەدەرەی خۆی سیرە بنووسیٚ، نەهات بە رۆحێکی عەرەبیی ئیسلامیی و رۆشنبیریە بەرزەکەی سیرە بووسیٚ، بەڵکو هات رێکوپێك (حیاە محمد)ەکەی (أمیل درمنجی) وەرگێرا کە کاسولیکێکی فەرەنسی بوو، بە پێی بڕواو ئاینی عیسایی و گاوری خۆی سیرەی پێغەمبەری ﷺ ئیسلامی نووسی بوو، کە ئەو هەرگیز ناتوانیٚ لە بڕوای گاوری دەرچیٚو لە زۆر لایەنەوە کەوتبوە هەڵەوە، چونکە توانای نەبوو موحەممەد بناسیٚ، وەك قورئان باسی دەکات، ئەو دەیویست ئاینەکان بکاتە یەك و، یەکیەتی ئاینەکان دروست بکات، شتی وا ناگونجیٚو گومڕاییە، هەرگیز ناتوانریٚ ئیسلام و گاوری و جولەکە تێکەڵ بکریٚت و بکرێتە یەك ئاین، ئیسلام لادەبەیت ئەو تێکەڵە ناو دەنیٚی چی..؟

مامۆستا عەققاد وەك رۆژئاواییەك کارەکانی خۆی دەکردو موحەممەدی ناونابوو عەبقەری، رۆژئاواییەکان زۆر پێشتر ئەو گێمەو کارەو بوارەیان بڕیبوو، چاکترو زیرەکانەترو وردترو وریاتر کردبوویان، دکتۆر تەها حسێن بیٚ تەریقی کتێبەکەی (علی هامش السیرە)ی لە کتێبی (جیل لومتیر) وەرگرتبوو، کە ناوی (علی هامش الکتب القدیمە) بوو، پڕ بوو لە ئەفسانەی یۆنانو گاورو جولەکەو ئیسرائیلیات.

هەڵەکانی قوتابخانەی رۆژئاوا لە بواری سیرەدا بەم جۆرە بەش دەکەین:

یەکەم: چاودێریکردنی پرۆگرامو بەرنامەو لێکۆڵینەوەکانی کتێبە ئیستشراقییەکان:

ئەو سیٚ کتێبە گەورەیە لە باسی سیرەدا بە شێوازێکی رۆژئاوایی ئیستشراقی نووسراوە، دکتۆر هەیکەل سەرسامە بە ناوەرۆکی کتێبی (ئیمیل در منجم)و باس نزیکی ناکۆکی نێوان ئیسلامو گاور دەکات، هەیکەلیش دوای کەوتووە لە راکانیاو ملکەچی هەندیٚ بۆچوونو بەرنامەو رای رۆژهەلاتناسان بووەتەوە، وەك موعجیزاتو ئیسراو میعراج، هەرچەند هەیکەل زۆر جوان وەسفو سەنای پێغەمبەری ﷺ کردووە، بەلاّم ئینکاریکردن لە موعجیزاتو غەیبیات لە کارەکانی کەم دەکاتەوە، ئینکاری دابەزینی فریشتە لە بەدرداو تەیرەلئەبابیلو سنگ

لەتكردن‌و ئیسرا، هەرچەند دەڵێ: رەنگە ئیسرا بەخەو بووبێت، هەموو ملکەچیە بۆ بەرنامەو قوتابخانەی رۆژئاواییەکان‌و خۆی دەڵێ: من ملکەچم بە ئەو پرۆگرامە مەنهەجییە نوێ زانستییەی رۆژئاواو بەسوودە، دەڵێ: ئیسرا گەشتی خەوە، مەلائیکەی بەدر دەعمی مەعنەوی بووە نەك یارمەتی مادی، (يُثَبِّتُ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ وَيُضِلُّ اللّهُ الظَّالِمِينَ وَيَفْعَلُ اللّهُ مَا يَشَاءُ) (إبراهيم : ٢٧ )، دەڵێ تەیرەلئەبابیل نەخۆشیی ئاوڵەبوە، سنگلەتکردن شتێکی مەعنەوییە، پێکگەیشتنی جوبرەئیل‌و پێغەمبەر ﷺ لە ئەشکەوتی حیرادا رەنگە خەو بووبێت، زانایانی سیرە دەڵێن هەیکەل بەوە مێژوو خاڵی دەکاتەوە لە راستیە غەیبی‌و موعجیزەکان، هەمووی کورت دەکاتەوە کە موحەممەد یەك موعجیزەی بووە کە قورئانە، چونکە موعجیزەو خەوارقەکان لەگەڵ زانستدا پێکنایەنەوە، موعجیزەو خەوارق نەوامیسی خواین، هەر خوا خۆی دەتوانێ بەکاریان بهێنێ، هەرکات ویستی [1].

شێخ موحەممەد زەهران دەڵێ: "دکتۆر هەیکەل، ئینکارییەکانی وا شیدەکاتەوە کە هەموو موعجیزەکانی پێغەمبەر ﷺ جگە قورئان، پێچەوانەی سوننەتی خوایەو دەڵێ: ئەو موعجیزانە هەموو گێرانەوەی دروستکراوە، کە دروستکەرەکەی مەبەستی بووە، یان پێغەمبەرمان ﷺ وەك موساو عیسا نیشان بدات، یان گومان دروست بکات لە راستیی ئایەتی: (.. وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلاً) (الأحزاب : ٦٢ )، دکتۆر هەیکەل وێنەی گریان و حەزینی‌و خەفەتی بۆ مردنی ئیبراهیمی کوڕی وا شیدەکاتەوە، کە ناکرێ پێغەمبەر ﷺ منداڵەکەی خستبێتە باوەشی‌و ئەوەندە بۆی گریابێ‌و فرمێسکی رشتبێ و چاوی سوورو هەڵتۆقیو بووبێ‌و، زمانی باسی غەم‌و خەفەت‌و نارەحەتی کردبێ، هەیکەل دەڵێ چونکە ئەو پێغەمبەرە ﷺ، نابێ وا صەدمە بیگرێ‌و ئەو دەبێ هەر بۆ خوا فرمێسك برێژێ، ئەو دەزانێ کە خوا هەرچی بیەوێ دەیکات، ئیبراهیمی کوڕی زۆر نازی، چونکە

---

[1] مقدمة سبل، ص٢١.

خوا فەرموویەتی: (مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أحدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيماً) (الأحزاب :٤٠)، واتە ئەو کوڕی بۆ نامێنێت، پێشتر دوو کوڕی تری مردبوو، بە ئیمان و رازی بە قەدەری خوا قبوڵی کردن، بۆ بۆ ئەمەیان وای کرد" هەیکەل گومانی وایە کە پێغەمبەر وای نەکردوە بۆ ئەو مەرگە، ئەوە بۆی هەڵبەستراوە.

دکتۆر هەیکەل ئەوەی لە ئیمی در منجم وەرگرتووە، هەیکەل رای ئیمیل در منجمی بە راست زانیوە کە گوایە پێغەمبەر ﷺ کاریگەر بووە بە خاوەن کتێبە ئاسمانییەکانی نیوەدورگە، یان ئەو کاتەی کە چوو بۆ شام، یان ئەو کاتەی کە هەندێ سەحابەی نارد و کۆچیانکرد بۆ حەبەشەی گاور، هەیکەل بێئەوەی بە خۆی بزانێ کەوتووەتە دوای وتەکانی ئەو رۆژهەلاتناسەو وتەکانی ئەوی وەك خۆی گواستووەتەوە، کە زۆر هەوڵی داوە بڵێ بۆیە موحەممەد هاوڕێکانی نارد بۆ حەبەشە، چونکە حەبەشیەکان گاور بوون، دکتۆر حسین هراوی بۆ ئەو مەبەستە پرسیار لە هەیکەل دەکات: ئایا راستە کە کۆچ بۆ حەبەشە لەبەر ئەوە بووە کە گاور بوون، دەڵێ در منجم وەك هەموو رۆژهەڵاتناسان چیرۆکەکەی بە تێکدراوی گێڕاوەتەوەو لە راستی لایداوە، راستی هەر ئەوەبووە کە پاشای حەبەشە دادپەروەر بووە نەگ گاور، پێغەمبەر ﷺ تەنها دەڵێ: (لأن فيها ملكاً لا يظلم عنده أحد، وهي أرض صدق).

در منجم یاری بە ئایەتەکان کردووە، بە تایبەت ئایەتی: (فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ مِّمَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ فَاسْأَلِ الَّذِينَ يَقْرَؤُونَ الْكِتَابَ مِن قَبْلِكَ) (یونس: ٩٤)، در منجم دەیەوێ بڵێ: کە قورئان داوای لە پێغەمبەر ﷺ کردووە کە پرسیار لە خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان بکات، واتە: خوا رازی بووە کە ئیسلام ئایین بێ لە پاڵ مانەوەی پاشماوەی ئایینە ئاسمانییەکانی پێش خۆیدا، واتە یەکیەتییەکی ئاینی تێکەڵ، ئەمە یاریکردنە بە ئایەت، کەی ئایین وای وتووە، لە دەیان شوێن لە قورئان ئایەت هەیە کە ئەوان بە بەسەرچوون و، خوا رازی نییە لە پاڵ ئیسلامدا گاورو جولەکەو بتپەرستی هەبێ، دەبێ ئەوان بچنە سەر ئیسلام، ئەوە یاریکردنە

بە ئایەتەکان بۆ خزمەتی مەبەستی خۆی، بۆ هەواو ئارەزوی خۆی بەکاری دێنیٚ، هەیکەلیش وەك خۆی بیٚ تەعلیق و قسە ئەو وتانەی ئەو دادەبەزێنیٚ.

دووەم: بروانەکردن بە موعجیزەو لێکدانەوەی بە جۆرێکی ترو رازیکردنی رۆژئاواییەکان، بە ناوی بەرزڕاگرتن و سەیرکردنی عەقلٚ بۆ شتەکان.

ئەم دەرکەوتەیەکە بە تەواوی روونە، لە کتێبەکانی هەیکەلو تەها حسێن و عەققاددا، لە کتێبەکانی (حیاه محمد، علی هامش السیره، عبقریات)وە رەگێکی درێژکراوەی هەیە لە کتێبەکانی شێخ موحەممەد عەبدەو فریدو وجدی و شێخ مستەفا سەبری کە (شێخولئیسلام)ی دەوڵەتی عوسمانی بوو هێرشی کردە سەریان، لە کتێبە گەورەکەیدا بە ناوی (موقف العلم والعالم من رب العالمین).

ئەو سیٚ کتێبە بە ناوی مەنهەجی زانستیی رۆژئاواوە ئەو کارەیان کرد، نیازیانە لەو رێیەوە کار لە مێژووی ئیسلام و بە تایبەت سیرەی پێغەمبەر ﷺ بکەن، کە لاپەڕەی ناسکن و لە توانایاندا هەیە هەستی باوەڕو ئیسلام لە دڵی لاوانی ئیسلامدا زیندوو بکەنەوەو بیان جولێنن، هەر بۆیە دەیانەویٚ هەوڵە ژەهراوییەکانیان بخەنەکارو، بە شێوازی زانستی هاوچەرخ و بریقەدار سیرەو موحەممەد بپچڕن لە خواو، موعجیزات لە فتوحات، ئەوە هێنانەدیی مەبەستێکی رۆژئاوایە کە نەخشەیان وایە دەوری مێژووی ئیسلام و سیرە بدەن و، لە نرخی پێغەمبەر ﷺ و کەسایەتیە فیداکارییە پاڵەوانییە ئیسلامییەکان کەم بکەنەوەو، بیانگونجێنن بە پاڵەوانە رۆژئاواییەکان لە رووی ماددی و کاری دنیاییەوە بڵێن ئەو توانایەیان لە خۆیانەوە بوە نەك لە ئیمان و خواوە، ئەو لێکۆڵینەوانە بە راستی کاریگەرن لە سەر موسوڵمانی لاواز، بڕواو هیواو ورە لە دڵی هەڵگرانی ئیسلامدا کەم و، پەیوەندی خوا بە پێغەمبەرەوە کز دەکەن، ئەم شێوازە کە ناونراوە زانستی و نوسەرە ناودارەکان دایان هێناوە، وەك جانجاك رۆسۆو فولتێرو مونتسکیوو ئەرستۆو ئەوانی تر، هەوڵێکە بۆ بێنرخ کردنی رووداوو سیرەی پێغەمبەر ﷺ بە ناوی عەقلانییەت و داهێنان و گوێنەدانە موعجیزات و لایەنە شاراوە غەیبییەکان، کە پەیوەندییان بە عەقیدەو خۆپارێزیەوە هەیە.

هەیكـەل سەرسـامە بـەو شـێوازە زانسـتییە نوێیـە رۆژئاواییـەو، باسـی لایەنـە چاكەكانی دەكات، هەیكەل ئەم شێوازە لە خەڵكەوە فێـر بـووە، بـەڵام ئـەوە رێـی قورئانو زانا موسـڵمانە پێشـووەكانە، هەنـدێك زانـا دەڵـێن: دەبـێ یەكـەمجار خـوا بناسی، هەنـدێك دەڵێن: یەكـەمجار گومانكردنـە، پاشـان دەبـێ بگـەڕێیت و هـەوڵ بدەیت بۆ زانینو دۆزینەوە، ئیمام غەزالی ئەم رێیەی گرتووەتەبەر، دەڵێ: من خۆم روتكرد لە هەموو راو بۆچوونو پیرۆزییەك، خۆم لێدورخستەوە، پاشان گەڕام خۆم بۆ خۆم بە ڕێی گومان خوام دۆزییەوە، رێی خـۆ رووتكـردن لـە ئیسـلامدا رێیـەكی كۆنە، رێی ئەزموونو خوێندنەوە هەر رێی كۆنـە دوای ئـەوەی كـە بـە هـۆی كێشـە ناوخۆیی و سیاسییەكانەوە لە جیهانی ئیسلامیدا پشتگوێ خرانو لە بیرچـوونەوەو كاری پێنەكرا، خەڵك رووی كردە لاسـاییكردنەوەو وازی لـە عـەقڵكاری هێنـا، ئـیتر غەربو رۆژئاوا ئالآكەیان بەرز كردەوەو پاگەندەیان بۆ كرد، لە بـەرگێكی تـرداو بـە شـێوازێكی جـوانتر كاریـان پێكـردو سـوودیان لێبـینی، ئەوسـا ئێمـە گەڕاینـەوەو لەوانمان وەرگرت و كارمان پێكرد. (بابەتەكەی فەلسەفە، رامان)

موسـوڵمانان ئـەوەیان زانـی، بـەڵام كاریـان پێنـەكردو هـەقی خۆیـان نەدایـە، روویان لە دونیا كردو شتی زۆریان لە دەست چـوو، ئـەو لێكۆڵینـەوانـەی هەیكـەل و ڕۆژئاواییەكان رەنگە بە نیەتی پاك كرابێ، بەڵام رووتە لە بـڕواو باسـی خـوا، تـەنها بە ناوی زانستەوەیە، بڕوایـان بـە موعجیزەكـانی پێغەمبـەر ﷺ نییـە، تـەنها هـەر قورئان بە موعجیزە دەزانن، هەیكەلو فەرید وجدی دەڵێن هیچ هـەواڵێك بـە راسـت نازانین ئەگەر زانست قبوڵی نەكات، لەبەر ئەوە لە نوسـینەوەی سـیرەدا گـرنگترین لایەنی لادەبەن كە موعجیزەو وەحیو غەیبییات دەگرێتەوە.

هەیكەلو تـەها حسـێن زۆر نـاوی زانسـتو مەنهـەجی زانسـتی دەبـەن، ئـەوان مەبەستیان زانستی تەجریبی نییە، كە لە كارخانەو لەسەر بنەمای لولـەك دەكـرێ، بەڵكو مەبەستیان زانسـتی فەلسـەفەی مـاددی یـە كـە تەلمودییـەكان پێشكەشـیان دەكـردو لـە رۆژئـاوا بڵاوبوویـەوە، دوای زاڵبـوون بەسـەر فەلسـەفەی میسـالیو

مەسیحی داخراودا، کە بە فەلسەفەی تەنویر ناوبان دەبرد، ئینکاریی لایەنی رۆحییو مەعنەویی مرۆڤ دەکات، وەك گیاندارو ولاخی قسەکەر سەیری دەکات، کە ملکەچی شەهوەتو ئارەزوە وەك مارکسو فرۆید بۆی دەچن، پاش ئەوە کاریگەری لەسەر زانستی کۆمەڵناسیو رەوشتو پەروەردەو ئەدەبو سیاسەت کرد، کە بە راستی ئەوە هەرگیز نابێتە زانستو نرخی نییە، ئەو باوەڕە بێنرخە، زۆر زوو دەکەوێ و چۆك دادەدات لە بەردەم گۆڕانکارییەکانداو، زۆر زوو لاوازی زانستی تەجریبی دەردەکەوێت بۆ هەرشتێك وتت (چۆن)..؟ لێکۆڵینەوە مادديەکان لاوازن کاتێك زانستە مرۆڤایەتییەکان دەردەکەون و ئاشکرا دەبن.

ئەو لێکۆڵینەوانە بە داخەوە ملکەچن بۆ دوو بۆچوونی ژەهراوی، کە لە دەروونو زەینی نووسەرە رۆژئاواییەکاندا ئەوانەی پاگەندە بۆ رۆژئاوا دەکەن گەلاڵە بووە:

ا- بۆچوونی (کێشانی ئاین بە زانست) ئەمە لای ئیسلام رەفزە، چونکە جیاوازی زۆرە لە نێوان ئیسلامو مەسیحیدا، دین بە زانست هەرگیز ناپێورێ.

ب- رزگارکردنی بیری ئیسلامیی لە هەرچی نەبینراوو غەیب بێت و، لە پێوانەی زانستدا دەرنەچێ، هەر لەوێشەوە دەیانەوێ سیرەی پێغەمبەر ﷺو مێژووی ئیسلام ملکەچ بکەنو بیخەنە ژێر پرسیارو باسەکانیانەوە، وەحیو موعجیزاتو غەیبیاتەکانی لابەرنو ئەو سەنەدو راوی و بنەمای فەرموودانە رەفز بکەنو، بڵێن ئەو سیرەو فەرموودانە دواتر سەحابەکان بە میزاجو بۆچوونی خۆیان دایانڕشتووەو دروستیان کردووە، تەها حسێن سەر بە مەزهەبی زانستی کۆمەڵناسییە، عەققاد سەر بە مەزهەبی زانستی دەروونییە، هەیکەل سەر مەزهەبی (تێنو برونتێر)ە، کە مەزهەبێکە لەسەر بنەمای زانسیتی دروست نەبووە، بەڵکو لەسەر بنەمای (گومانو ئارەزووی دەرون) دروست بووە، هەرچی ئارەزوویان بوو یان گومانیان لێی بوو بەرپەرچی دەدەنەوە، بە تایبەت ئەوانەی کە لە عادەت دەردەچن، وەك: غەیبو موعجیزە لە سیرەدا.

سێهەم: ئینکاری ئەوانەی پەیامی موحەممەد دەیدات:

دکتـۆر زەکـی موبـارەك لـە کتـێبی (النثـر الفـني)دا دەڵـێ: عەرەبـەکان لـە سـەردەمی نەفامیـدا ڕاپـەڕینێکی زانسـتیو ئـەدەبیو سیاسـیو کۆمەڵایـەتیو فەلسەفییان بووە، ئیسلامیش سەر بەو ڕاپەڕینەیە، بەرهەم و تاجو پۆپـەی ئـەوە. تەها حسێن دەڵێ ناکری کەسێکی وەك محەممەد نەتەوەیەکی تەواو لە بۆشاییەوە بهێنـێ و بیگوازێتـەوە بـۆ بـون و دروست بـون، لـە تاریکیـەوە بـۆ ڕوونـاکی و لـە بەندایەتیەوە بۆ ئازادیەکی زاڵ و سەرکەوتوو، ئـەوە هـەرگیز ناکرێـت هـەتا پێشـتر ئامادە نەکرابێت، ئەوسا تاکە مرۆڤێك هات گەلێکی کۆو یەکگرتوی دروست کرد، لە چەندین هۆزی دوورو جیاواز، عـەقڵ و زانسـت و بۆچـوون و ئـەدەب و ڕەوشـتیانی یەك خست و، دەسەڵات و ئەزمونەکانی خۆی لە ماوەیەکی کەمدا زاڵکرد بەسەر زۆر ناوچە لە ئاسیاو ئەفەریقاو ئەوروپا، کە ئەوە بە کەس ناکرێت ئەگـەر پێغەمبـەریش بێت، چونکە پێغەمبەر هەبووە شکستی خواردوە، چونکە گەلەکەیان پێشتر ئامادە نـەکرابوون بـۆ ڕاپـەڕین و هەسـتانەوە. ئـەوە ئـەوە بۆچـونێکی ژەهراویـە کـە ڕۆژهەڵاتناسە ڕۆژئاواییـە گاورەکـان کردیانـە نـاو لێکۆڵینـەوەکانیان، کـە لـەبارەی ئیسلامەوە نوسیویانە، دەیانەوێ بڵێن هەڵسانەوەی عەرەب هی هێزی خواو قورئان و ئیسلام و توانای ڕەفتـارجوانی و زەیـن ڕونـی پێغەمبـەر نـەبوە، بـەڵکو هـی ئـەو زانست و ئەدەب و ئەزمونـە بـوو کـە پێشـتر لای عـەرەب گەڵاڵـە بووبـوو کـاری بـۆ کرابوو، بەڵام پێغەمبەر هەر ئەوەندەی کرد، ئەو تواناو هەوڵانەی یەکخست و ڕێکـی خست و کۆیکردنەوە و لە دەوری خـۆی داینـان و خسـتنیە کـارو دونیـای پێگـرتن، دکتۆر محەممەد ئەحمەد غەمراوی دەڵێ: مێژووی زانست لای عەرەب دوای ئیسـلام ئاشکرایە، هەروەك چۆن بەرەنگاربونەوەی عەرەب دژی پێغەمبەر ئاشـکرایەو بـاس کراوە، بەڵام خەڵك هەر ئینکاری دەکات و یەکێکیتر درۆ بـۆ مێـژوو دروسـتدەکات، ئەوەی بڵێ قورئان وتەی محەممەدە، قسەیەك دەکات کە ڕاست نیە و ڕێك نیە، نـە لە مەنتیق و نە لە بیرو بۆچوندا، عەرەب پێشتر خاوەن ئەدەب بـوە شـتێکی هەیـە لە شیعر، هەموو نەتەوەیـەك ئـەوەی بـوە، بـەڵام پەرتـەوازەو نـاکۆك و دژبەیـەك و داڕوخاو بوون، لە زەین و داب و نەرێت و بتپەرستیدا، خاوەن نەهزەو هەڵسانەوەو

ڕاپەڕین نەبووە، هەرگیز گەلێکی نەفام و داڕوخاو ناتوانێ هەڵسێتەوەو دونیا بە عیلم و زانست و مەعریفە بگرێ وەك زۆر مێژوو نووس و ڕۆژهەلاَتناس باسی دەکەن. دکتۆر زەکی موبارەك پێغەمبەر بە عیلم وزانستی ڕوت دەپێوێ، ئەو وێنەیەی بۆ دەکات وەك چۆن ڕۆژهەلاَتناسان بۆیان کێشاوە، دەلێێن ناکرێ گەلێك لە سیانزە ساڵدا ئەو دەسەلاَتە دروست بکات، ئەوان نیازیانە دژایەتیی خواو غەیبو موعجیزەبکەن و ئەو هێزانە لە سیره محەممەدو مێژوو ئیسلام دابڕنن..

چوارەم: زیندووکردنەوەی ئەفسانە لە ژیانی پێغەمبەرداﷺ:

دکتۆر تەها حسێن لە بابەتێکدا لە کتێبی (الاسلام والغرب) کە ساڵی (١٩٤٦) لە پاریس دەرچوو دەڵێ: هەوڵمداوە هەندێ ئەفسانە بگێڕمەوە کە پەیوەندیی بە کاتی دەرکەوتنی پێغەمبەرەوە ﷺ هەیە، پاشان چیرۆکی لەدایکبوون و منداڵییەکەیم گێڕاوەتەوە، ئەنجا ئەو زنجیرەیەم بلاَوکردەوە بە ناوی وەرگرتنێك لە نووسینەکانی (جیل لومیتر) بە ناوی (علی هامش السیره) بلاَوم کردەوە، دەبێ دان بەوەدا بنێین کە ئەو دوو کتێبە فەرەنسییە بووە دوو بڵێسەی گڕداری گەورە، یەکیان هی جیل لومیتر بوون بە ناوی (علی هامش السیره القدیمه) دووەمیان بە ناوی (حیاه محمد)ی ئەمیل در منجم، بەلاَم کتێبی جیل لومیتر دوای ئەوەی زۆر پێوەی خەریك بووم، ئەم پرسیارەم لە دڵی خۆمدا دانا:

ئایا دەکرێ ئەم کتێبە دووبارە بکەمەوە بەم شێوازە تازەیەو بەم پاڵەوانییەی کە لە مێژووی ئیسلامدا هەیە، یان خۆم لادەم لەوە.؟ ئایا زمانی عەرەبی بۆ ئەوە دەشێ ئەو مێژووە پڕ کاریگەرییەیان بۆ زیندوو بکەمەوە.؟ تەها لە بارەی کتێبی (علی هامش السیره)وە دەڵێ: ئەو کتێبە لە کاری خەیاڵە، تیایدا پشتم بە ناوەڕۆکی ئەفسانەکان بەستووە، ئازادییەکی زۆرم بە دەروونم داوە کە خۆم ڕووداوەکان بە کەیفی خۆم شیبکەمەوەو، ئەو چوارچێوەیەی خۆم دامهێناوە وا دایبڕێژم، لەگەڵ پارێزگاری لە سروشتە کۆنەکەی کتێبەکە خۆی.

بەو جۆرە تەها حسێن لە یەکەم کۆنگرەی گفتوگۆی نێوان مەسیحیو ئیسلامدا قسە بۆ ڕۆژهەلاَتناسەکان دەکات، کتێبەکەی دادەنرێ بە هەنگاوێك لەو ڕێیەدا،

تـەها نیازیـەتی ئایینـەكان تێكـەڵ بكـات لـە یـەك كتێبـدا، ئـەو داهێنـانێكی زۆر خراپدەكات، نیازیەتی ئەفسانە پتوركاوەكـانی ئـەدەبی عـەرەبی زینـدوو بكاتـەوە، ئەمـە وتـەكانی تـەها حسـێن خۆیـەتی دەریخسـتووە دوای سـاڵانێكی زۆر لـە بلاوبونەوەی كتێبی (علی هامش السیرە) ئەو خـۆی دەڵـێ مـن نیـازم كۆكردنـەوەی ئەفسانەیە، دەڵێ دەمەوێ لەوێوە سیرەی پێغەمبەر بناسێنم، واتە ناشـرینی بكـەم و نزمی بكەم هەتا خەڵك لەبەرچاوی بكەوێو پشتی پێنەبەستێ و كـای پێنـەكات، ئەی دەبێ هەڵوێستی لێكۆڵەران چیبێت لەسـەر ئـەو كـارەی..؟ حەسـەن هەیكـەلی هاورێی رێگەی لە بارەیەوە دەڵێ: "داوای لێبوردن دەكەم لە تەها ئەگەر نـاكۆك بم لـەو بـیرو رایـەی كـە بـۆ ژیـانی پێغەمبـەر ﷺو سـەردەمەكەی دەریخسـتوەو دایرشتوە، ناكرێ سیرە بەكاربهێنی بۆ باسێكی ئەدەبی ئەفسانەیی، هەیكەل دەڵێ ئەو ئەفسـانە ئیسـرائیلیاتانەی كـە لـە كـاتی لـەدایكبوونی پێغەمبـەردا ﷺ باسـی هەیە، ئەوە هەمووی دوای پێغەمبەر ﷺ دروستكراون، (تەها بە هەڵە هێناویـەتیو باسی دەكات)، هەیكەل دەڵێ: بە رای من چاك نییـە ژیـانی پێغەمبـەر ﷺ بكرێتـە مادەیـەكو باسێكی ئـەدەبی ئەفسـانەیی، بـەڵكو ئـەوە چـاكترە مێـژوو و چـیرۆكە راستەقینەكانی پێغەمبەر ﷺ بكرێتە ماددەیەكی ئەدەبی، چونكە پێغەمبەر ﷺو ژیانیو چەرخەكەی كە تیایدا ژیاوە، پەیوەنـدیی بـە ژیـانی ملیۆنـەها موسڵمانەوە هەیە، بووەتە رەگی ژیانیانو كاریگەری لەسەریان هەیە، دەزانم ئەو ئیسرائیلیاتانە مەبەستیانە فەسادو خراپەو نەزانینو تێكدان بخەنە عەقڵو دڵـی چـینە رەشـۆكییە نەخوێندەوارە عەوامەكانەوە، گومان بۆ خوێنـدەوارو شـارەزایانیش دروسـت بكـات بەرامبەر ئیسـلامو پێغەمبەرەكـەی، چـونكە هـەر ئەوەیـە مەبەسـتی ئەفسـانە، كـە دروستكراوە بۆ ئایینەكانی تر، ئەو كارەی تەها دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی دەنگو هـاواری چـاكخوازو بـانگخوازو موصـلیحە دینییـەكان لـە هـەموو سـەردەمێكدا بـۆ پاككردنەوەی عەقیدە لەو ئەفسانەو پروپوچ و خەرافیانە.

گومان نییە كـە وتـەكانی هەیكـەل تاوانبـاركردنی تـەها حسـێنە لـەو بۆچـوونو لادانـەی كـە بـە تاوانبـاری دەیكـات، بەرپرسـیارێتیەكی خەتەرناكـە و دەبـێ

بەرپەرچیبدەینەوە، تەها دەیەوێت دووبارە ئەفسانەو پڕوپوچ زیندوو بکاتەوە، کە بە مەرجێ بیریارانی ئیسلامی هەوڵی زۆریانداوە هەتا هەموو سیرەی پێغەمبەریان لەوانە پاککردووەتەوە، بەلام تەها دێت دەیگێڕێتەوەو کەش و هەوایەکی ناساز و دیاریکراو دروست دەکات، کە ببێتە هۆی تێکدانی عەقڵ و شعوری نەخوێندەوارو عەوام و رەشەخەڵکەکەو، گومان دروستکردن بۆ رۆشنبیران و خوێندەواران بەرامبەر ئیسلام و پێغەمبەرەکەی ﷺ.

ئەو راستیەی هەیکەل دەریخستووە، ئیستاش بەردەوام زۆر کەس بەسەریدا دەڕۆن و نایزانن، ئێستەش زۆر لەوانەی کە نووسراوەکانی ئەو دەخوێننەوەو ئاگاداری ژیان و گۆڕانکاریی ئەون، دەبینین کە ئەوە خراپترین گۆڕانکارییە کە بەسەر ئەودا هاتووە بۆ خەڵەتاندنی خەڵک و دروستکردنی گومان بۆیان، ئەوە هەرگیز کاری بیریارو بیرمەند و ئەدیب و رۆشنبیر نیە، هەندێك گێل وا دەزانن کە تەها حسێن گەڕاوەتەوە بۆ ئیسلام و لەو روانگەیەوە ژیانی پێغەمبەری ﷺ نووسیوە، ئەوە راست نییە، بەڵکو کاری ئەو گەڕانەوەیەکی فێڵاویە، شێوازێکی خەتەرناکی گرتووەتەبەر، ئەو دەیەوێ خوێنەران بخەڵەتێنێ هەتا لە ئیسلام و پێغەمبەر ﷺ بدات، ئەو داماوە نوری رۆشنایی نەبوە هەتا خەزێنە پڕ خێرو بەرەکەت و پڕ سەرچاوەکان ببینێ، کە چۆن محەممەد ژیاننامەو سیرەیەکی پاك و پوخت و کاریگەری هەیە، دوورە لە خەرافیات و ئەفسانە..

تەها لە نوسینەکانیدا درۆی کردوەو خۆی بە دڵسۆز نیشانداوە، بەلأم کاتێك چوە بۆ پاریس، لەوێ لای باباکانی راستی وتووە، دەڵێ: من ژیاننامەیەکی محەممەدم نوسیوە، هەرچی ئەفسانەی عەرەبی و ئیغرقی و هیندی پڕوپوچ هەیە لە دەوری لەدایکبونی ژیاننامەی محەممەد کۆم کردوەتەوە، هەتا خەڵکی هەر بەو ئەفسانەیە محەممەد ببینێ..!.

هەیکەل دەڵێ: تەها حسێن، ئەو کەسەی کە سەری کەچ نەکرد بۆ غەیری دادگای رەخنەو عەقڵ، گۆڕرا بۆ کەسێك کە هەوڵی زیندووکردنەوەی ئەفسانەی دەدا، ئەوە قسەی زۆر هەڵدەگرێ، لەبەر ئەوە تەها حسێن شکستی هێنا لە

گەیاندنی مەبەستەکانی، کە لە ڕێی عەقڵو لێکۆڵینەوەی زانستییەوە کاری دەکرد، ئەو پەنای بردە بەر ئەفسانەو کۆیدەکردەوەو پێشکەش بە گەلەکەی دەکردو دەرخواردی دەدان، کە هەمووی وەهمو خەیاڵو تێکدانی عەقڵ و بیرو زەینی خەڵك بوو.

موحەممەد نایف لە لێکۆڵینەوەکەیدا لەسەر سیرە دەڵێ: کتێبی (علی هامش السیرە)ی تەها لە ڕاستیدا هەق بوو بنوسرایە (علی هامش الشعر الجاهلی ومتمم لە) زۆر لە ئیسلام دەداو قسەی لەسەر دەکاتو لەف و دەورانی بۆ دەهێنێتەوە، ڕونترین تاوان کە تێبینی دەکرێ ئەوەیە کە تەها مێژووی ئیسلامی تێکەڵ بە ئەفسانەی گاورو جولەکەو قەشەکانی میسرو شامو خەیبەرو گاوری یەمەن کردووە، هەروەها زۆر پشتی بەستووە بە ئەفسانەی یۆنانو ڕۆمان، ئەوانەی هەموو بە شەیتەنەتێکی زۆلانە تێکەڵو پێکەڵ کردووەو لە گەڵ سیرەی پێغەمبەردا ﷺ شێلاویەتی و، دەیەوێ کەشو هەوایەکی کاریگەرو تێکەڵ و تێکچوو دروست بکات، ئیسلامی پاکی تێکەڵ بە سەردەمی نەفامی کردوە، خوێنەر وا دەزانێ ڕوداوەکانی نەفامی هەر لە سەردەمی پێغەمبەردا ڕوی داوەو پێغەمبەر لێی بێدەنگ بوەو سەحابەکان قبوڵیان بوە، تێکەڵەیەك لە ئەفسانەو خەرافاتی پڕوپووچی شیلاوە بە سیرەی پوخت و، مادەیەکی ئەدەبی سێهەمی تری لیچنگخستوە کە کەس نایناسێتەوە، گرنگی داوە بە ئەفسانەی جولەکەو چیرۆکی (مخیرقی) جولەکەیان بۆ دەگێڕێتەوە.

لە کتێبەکەیدا فەرموودەی هەڵبەستراو دەهێنێتەوە، لە هەمان کاتدا بەرپەرچی فەرموودەی ڕاست و صەحیح دەداتەوە، چونکە پێچەوانەی بیروبۆچوون و هەواو ئارەزوی ئەو بووە، پشت دەبەستێ بەو ئیسرائیلیانەی کە لە مێژووی تەبەریدا هاتووە، ژمارەیەکی یەکجار زۆر ئەفسانە دەهێنێتەوە، بەتایبەت لە چیرۆکی هەڵکەندنی بیری زەمزەمدا لەسەر دەستی عەبدولموتەلیب، زیادەڕەوی دەکات لە چیرۆکی لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ، لەگەڵ ئەوەی کە تەنها یەك فەرموودە ساغ بووەتەوە کە صەحیحە، هەواڵی دروستکراو دەهێنێ لە چیرۆکی

زەینـەبی کچـی جـەحش، هەنـدێ مـوعجیزە وێنـە دەکـات کـە لـە پێغەمبـەر ﷺ روویداوە، کاتێك کە شیرەخۆرە بووە لای حەلیمەی سەعدیەو، لـە کـاتی رۆیشـتنی پێغەمبەر ﷺ لە بازرگانییەکەی خەدیجە بۆ شام، بەشێکی زۆری داناوە بۆ باسـی شەیتان، گرنگیـی زۆرتـری پێـداوە، وێنـەی کۆنگرەیـەکی شـەیتانیی کێشـاوە، کـە ئیبلـیس بـۆ شـەیتانەکانی تـری دەگێـڕێ، وێنەیـەکی شـەیتان دەکێشـێ کـە لـە ناکۆکییەکـەی قورەیشـدا ئامـادە دەبـێ، کـە لەسـەر بەردەرەشـەکە دەکەوێتـە نێوانیان، وێنـەی شـەیتان لـە شێوەی شـێخێکی نەجدیـدا تـابلۆ دەکـات کـە دێتـە ناویان، ئەو لاپەڕانەی کە دایناوە بۆ ژیانی پێغەمبەر ﷺ، لێوان لێـوی کـردووە لـە هەڵە، هەر بۆ خۆشیو لـەزەت و ڕابـواردن و گاڵتـەکردن دەیانهێنێتـەوە، خـراپترین بوختانی ئەوەیە کە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ عاشقی زەینـەب بـووە، کاتێـك ئـەو ژنـی زەید بوە، بوختانێکی گەورە دروست دەکات، مەگەر دکتـۆر جـەمال لـەو خـراپتری وتبێت..!.

هەر چەند تەها حسێن لە پێشەکییەکەیدا دەڵێ گرنگـی داوە بـە دروسـتکردنی فەرموودە، نازانم چۆن ئەو ئازادیەی بە خـۆی داوەو حـەڵاڵی کـردووە، ئـەو هـەموو کارەکـانی بـۆ ئارەزوویـەکی دیـاریکراوو روون بـووە، ئـەو دەیـەوێ لـە ڕێـی ئـەو چیرۆکانەوە فیتنەو ناکۆکی و تێکدانو لادانو هەڵگەڕانـەوە بکاتـە نـاو باسـەکان و سـەر لـە خوێنـەران بشـێوێنێ، تـەها حسـەین سـەرکەوتوو نـەبوو لـەوەی لە ڕێـی نووسـینێکی رەخنـە ئـامێزی ئەدەبییـەوە مەبەسـتەکانی بگەیـەنێ و کـاری خـۆی بکـات، زۆر زوو خوێندنـەوە بـۆ هەڵـەکانی کـراو ڕونکرایـەوەو ناسـێنراو پرۆژەکـەی پوچەڵکرایەوە، دەیان کەس لە سەری نوسـی، تەنانـەت هەیکـەل و عەبـدوڕڕەزاقی هاوڕێی، ئەو هـەموو درۆو بوختـان و ئەفسـانەو دەسـتێوەردانەیان پـێ قبوڵنـەکراو بەرنگاری بونەوە.!

(غـازی تەوبـە) لـە لێکۆڵینەوەکەیـدا کـە لەسـەر تـەها حسـێن و (علـی هـامش السیرە) کردوویەتی، دەڵێ: "تەها حسێن خۆی داناوە بـە پێشـەوای ئەفسـانەکانی یۆنان، سیرەی لە ئاسـتی ئـەلیازەو ئۆدیسـە دانـاوە، کـە ئەفسـانەیەکی زۆر کـۆنی

یۆنانییە"، ئەو داوا لە نووسەران دەکات کە باس لە ئەفسانەو خەرافات بکەن، وەك چۆن ئەورووپیەکان باس لە ئەفسانەو خەرافاتەکانی یۆنان دەکەن، ئەو پاشتر کە دەزانیّ هەڵەی کردو شکستی خوارد، دەڵیّ من مەبەستمە مەیلی خەڵك رابکێشم بۆ سادەیی‌و گێلیەتی‌و خەڵەتاندن‌و خۆشی، دەمەویّ لەزەت بدەمە هەست‌و خەیاڵی خوێنەر، بەڵام ئایا ئەم دوو کارە بۆ دوو کۆمەڵگەی جیاواز وەك یەکن..؟ نەخەیر زۆر دوورن، ( ئیلیازەو ئۆدیسە لە کۆمەڵگەی یۆنانییداو، سیرەی محەممەد لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا)؟، ئەو دوو مێژووەو ئەو دوو کۆمەڵگە دوو هەزار ساڵ لە یەك دوورن، ئایا سیرە رۆژێك لە رۆژئاوا بۆ خۆشی‌و کات بەسەربردن‌و لەزەتی چیرۆك وەك شەوچەرە خوێندراوەتەوە.؟ نەخەیر، هەرگیز ئەوەی تەها حسەین بۆی چوە روی نەداوە، بەڵکو سیرە رچەو رێنیشاندەرو وانەی بەسوود بووە، موسڵمانان بۆ خۆدروستکردن‌و هەستانەوە، لاسایی گوتارو کردارو رێ‌و شوێن هەڵگرتن‌و دامەزراندنی زەین و هەست و دەرون و دروستکردنی کۆمەڵگایەکی وریاو چاوکراوە نوسیویانەتەوە، نەك لە باتی شەوچەرەو کات بەسەربردن و فاڵگرتنەوە بۆ خۆشی خوێنرابێتەوە، خەڵکی دەیخوێننەوە بۆ ئەوەی وەك ئەو بکەن.

مستەفا صادق الرافعی ناوی (علی هامش السیرە) دەبات و وەسفیدەکات بە (سوکایەتی ئاشکرا)، لە رۆژنامەی (الشهاب)ی جەزائیریدا کە لە زولقەعدەی ١٣٥٢ك ریّکەوتی ١٩٣٤ز لە بابەتێکدا لە ژێر ناونیشانی فێڵ‌و تەڵەکەکانی تەها حسێن، دەڵێ: "کتێبێکی داناوە ناوی ناوە (علی هامش السیرە) واتە لە پەراوێزی ژیاننامەی پێغەمبەرەوە ﷺ، پڕی کردووە لە ئەفسانە و بتپەرستی یۆنانی، سیرەی ئاخنیوە بە خەرافات‌و ئەفسانەی خەیاڵئامێز، تەنیویەتی ناساندویەتی بە باس و خواسی پڕو پووچ، هەتا لای خوێنەر ئەو خەیاڵە دروست ببیّ کە سیرەش هیچ نییە جگە کۆمەڵێك ئەفسانەو دەستچنی داڵغەو خەیاڵ، ژەهرو فێڵی تێکەڵ کردووەو سوکایەتیی پێکردووە، دکتۆر تەها قسەی زۆر بەرامبەر ئیسلام دەکات، ئەمیش وەك دکتۆر جەمال گویّ بە هەستی موسڵمانان نادات‌و دەڵێ: ئەوان بە قسە موسڵمانن‌و ئیسلامیان لا گەورەیە، بە گوێی ناکەن‌و هەر بۆ سنگ

دەرپەڕاندنە، دکتۆر زەکی موبارەك لە گۆڤاری (البلاغ)ی یەنایەری ١٩٣٤دا دەڵێ: "من ئامۆژگاریی خوێنەرانی خۆم دەکەم کتێبی (علی هامش السیرە) بە چاوی کراوەوە بخوێننەوە، لایەنی شاراوەی زۆری تیایەو بە نهێنی عەقڵتان کۆیلە دەکات، تەها لە ژێر لێدان لە شیعری جاهیلیدا، بە شێوازێکی فێڵ ئامێز مەبەستە خراپەکانی ژێر بەژێر دەڵێ و دەگەیەنێ".

هەیکەل لە لێکۆڵینەوەکەی لەسەر (علی هامش السیرە)دا بۆ ج٢ لە مولحەقی ڕۆژنامەی السیاسە، ١٩٣٧/١٢/٢٥دا دەڵێ: "جولەکە دەستێکی بڵاویان هەیە لە ئیسرائیلیات خستنە ناو مێژووی ئیسلامو سیرەوە"، بە راستی من لە کاتی خوێندنەوەی بەشی دووەمی (علی هامش السیرە)دا وانازانم سیرە دەخوێنم، بەڵکو وا هەست دەکەم کتێبی ئەفسانە ئامێزی یۆنانی دەخوێنم، بەشی (نادي الشیاطین) دکتۆر تەها تەواو چووەتە ناو ئەدەبی ئەفسانەوە، لە هەموو بەشەکان زیاتر ڕۆچووەو تەواو خۆی کردووەتە شوێنکەوتەی تێکەیشتنەکانی ئیسرائیلیات، لە باتی جولەکە قسەی کردووەو رای ئەوانی وتووە، لە زۆر باسو خواسدا خراپ تێکەوتوە بە تایبەت لە هەڵوێستی عەبدوڵڵای کوڕی سەبەئدا لە کتێبی (الفتنە الکبری)دا.

پێنجەم: جیاوازیی گەورە هەیە لە نێوان پێغەمبەرایەتیی‌و عەبقەرایەتیدا.

جیاوازینەکردن لە نێوان پێغەمبەرایەتی‌و عەبقەرایەتیدا، خەتەرناکترین کارە کە نووسەرە هاوچەرخەکان بۆ سیرەیان کردوە، پێویست ناکات بە پێغەمبەر بوترێ عەبقەری، ئەو پاڵپشتە بە وەحی، خوا دەفەرموێ محەممەد لە ئارەزوو زەینی خۆیەوە هیچی نەوتوە هەرچی وتوە وەحی خوا بوە.. دروست نیە بە ئەبوبەکرو عومەریش بڵێی ئەوان عەبقەری بون، کە لە کتێبەکانی عەباس مەحمود عەققادی کوردو، کتێبی (البطولـة) ی عەبدوڕڕەحمان عەزام و، کتێبی (بطل الحریـة) ی عەبدوڕڕەحمان شرقاویدا واوتراوە، ئەوانە هەموو کوێرکردنو بەرچاوگرتنی موسڵمانە، گوایە شارەزایی ئەوان پەیوەندییان بە وەحیو پەروەردەی خواییەوە نییە، کە بە مەرجێ ئەوان پێش ئیسلام کەسی ئاسایی بوون، ئیسلام پەروەردەی کردن، هەموو دەزانین عومەر پێش ئیسلام چی بوو، کچی خۆی زیندەبەچاڵ

دەکرد، ئەبوبەکر نە شاعیر بوو نە حەکیم، بەڵام کە هاتنە پاڵ پێغەمبەرو پەروەردەی کردن، ناویان چوە ریزی پێغەمبەرو بونە دوو پێشەوای مێژوو و، سەدان کتێبیان بە هەموو زمانەکانی جیهان لە سەر نوسرا، عەبقەری کەمکردنەوەی کەسایەتیی پێغەمبەرو هاورێکانیەتی ﷺ، ریزی خواییان لەسەر لادەبات، عەبقەری وشەیەکە فکری رۆژئاوا دایهێناوە، ماوەیەك دەمەقرێ و قسەو باسی لەسەر دروست بوو، ساڵی ١٩٣٥ کە ئەو شەڕە قسەیە لە ئەوروپاوە گەشتە گۆڤارە عەرەبییەکان، گفتوگۆی زۆر لە نێوان موحەممەد فرید وجدیو دکتۆر ئەمیر بقتەر روویدا.

ئەو وتووێژە کاری لە عەققاد کردو لە بیری خۆیدا داینا کە بیکاتە ناونیشان بۆ پێغەمبەر ﷺ، دوای ساڵی ١٩٤٢ کارپێکردو عەبقەریە محمد ی نوسی، پاشان عبقریە ابوبکرو عمرو عوسمان و عەلی و فاتمەو زۆری تری نوسی، ئەو بیردۆزە لە بنەڕەتدا بۆ ناونانی کەسی زیرەكو داهێنەرو پلەبەرز لە زانست و بواری هونەرو مۆسیقاو وێنە بەکار دەبرا، بۆ کەسایەتیی چاکەخوازو موصلیحو خاوەن پەیامو پیاوچاكو پێغەمبەر بەکار نەدەبرا.

دکتۆر ئەمیر بقتەر باسەکەی کورت کردەوە، عەبقەری تەنها بۆ زیرەك بەکار هێنا، چونکە لە بۆماوەیی (ویراسە)وە دێت و دەستکەوت نیە و بە هەوڵ دەست ناکەوێ، دائیرەی مەعاریف وەسفێکی عەبقەریی کردووە دەڵێ: زمانی زانستی هەموو شتەکانە، بە دوا پلەو ژمارەی زیرەکی ناو دەبرێ، هەموو ئاستێکی تێپەڕاندبێ، ئەمیر بقتەر عەبقەری کورتدەکاتەوە لە زیرەکیدا، بەڵام فرید وجدی وا دەبینێ کە ئەوە بەخشینەو خوا دەیبەخشێتە کەسێکی زیرەك کە لەسەر زمان، یان لەسەر دەستیاندا، کۆمەڵێك کار دەکرێ کە عەقڵی مرۆڤ دۆش دادەمێنێ بیکات.

لەوانەیە ئەوە ئەو مانایە بێت کە عەققاد هەڵبژاردووەو وەسفی پێغەمبەری ﷺ پێدەکات، بەڵام کەس لە رۆژئاوادا پێغەمبەرانی عیساو موسای خۆیانیان پێ وەسف نەکردووە. لە هەموو روویەکەوە کۆمەڵگەی ئیسلامو بنەمای ئیسلام جیایە

لەو پێوانانەی کە ئەوان شتی خۆیانی پێدەپێون، خـوا هەرچـەند توانـاو لێـزانینو شارەزایی بداتە مرۆڤ و ناوی بنێی عەبقەری، هـەر ناگاتـە ئاسـتی پێغەمبـەریی کـە وەحیی پاڵپشتییەتیو عەلیم سەرچاوەی زانستیو تواناییەتی، هەرچـەند نـاکۆکیو رای جیـاواز هـەبێ لـە نێـوان نووسـەرانو لێکۆڵـەرەوان، لـە تێگەیشـتن لـە وشـەی عەبقەری، هیچ کەس لە رۆژهەڵاتو رۆژئاوا نـاتوانێ پێغەمبـەر ﷺ بخاتـە نـاو ئـەو بازنـە، بـەڵام عـەباس مـەحمود عـەققاد بـازی بەسـەر دوو هاورێکەیـدا (هەیکـەلو تەها)دا هەڵدا، دە ساڵ بەسەر ئەواندا بازیدا، پێغەمبەرو ئەبوبەکرو عومەرو ئەوانی تـری ناونـا عەبقـەری، ئـەو وشـەیەی بـۆ بـەکارهێنان، دکتـۆر موحەممـەد ئەحمـەد غـەمراوی دەڵـێ: دەبـێ بـە حـەزەرەوە وشـەکانی عـەققاد بخـوێنی، چـونکە ئـەو رۆشنبیریی‌و شارەزایی لە رۆژئاوا وەرگرتووەو بە هەنـدێ دەسـکاریەوە بـە ئێمـەی دەفرۆشـێتەوە، ئێمـە نابێـت هەرچـی رۆژهەڵاتناسـان نووسـیبێتیان وەریبگـرین، تەنانەت بیردۆزو بۆچوونەکانیشیان، مەرج نییە لەگـەڵ قورئانـدا پێکبێنـەوەو پێـی رازی بێ، عەققاد بۆچوونی (فریزەر) بە راست دەزانێ لە گەشەکردنی ئایینـدا، ئـەو رای وایە کـە ئـایین ئەرزیـەو زەمینیـە، لـە زەویـەوە سەرچـاوەی گرتـوەو گەشـەی کـردووەو بـەو ئاسـتەی ئیسـلام گەیشـت، پەیوەنـدیی بـە ئاسمانـەوە نییـە، بـە قۆناغبەندی پێشکەوتو گەشەی کردو گەشتە ئەو ئاستە، عەققادیش هەر رای وایە کـە ئیسـلام زەمینییـەو لـە بندەسـت خۆمانـدا سـەری هەڵـدا، بـە پێشـکەوتنو گەشەکردن گەشتە ئـەو ئاستە باشـە، لای عـەققاد ئیسلام لـە هـەموو ئایینـەکان گەشـەکردوترو پێشـکەوتووترەو دوا کۆتـایی و چـاکترینیانە، هـەر لـەو روانگـەوە دەیـەوێ بلـێ موحەممـەد عەبقـەری بـووە، خـۆی بـە توانـاو شـارەزایی و هـەوڵ و لێزانین و عەبقەریەتی خۆی، بە شارەزابون لـە ئـەزموونی پێشـووەکان و بـە بـیری خۆی گەیشتە ئەو رایەو ئەم ئیسلامەی دانا، واتە محەممەد، پێغەمبەر ﷺو نێرراو نییـە، بـەپێی واتـای ئـایینی کـە لـە ئایینەکانـدا باسـی دەکـات، دەڵـێ قورئـانیش کتێبێکە لە زنجیرەیەك کتێبی عەبقەرییەکانی ئیسلامو یەکەمیان نییە.. کەسێك کە عەبقەری موحەممەدو ئەبوبەکرو عومەر دەخوێنێتەوە، بەو هەستە شاراوە دەگات،

کە هەرسێکیان هەر عەبقەری بوون، یەك ئاستن، خۆیان بەو توانایە گەیشتوون جیاوازنین، موحەممەد لەوان جیاوازتر نییە، هەروەك ئەوانەی موحەممەد ناودەنێن پاڵەوان، وا دێتە خەیاڵی کە ئەویش لە ریزی پاڵەوانە مێژووییەکانی تردایە، وەك کۆرش و ئەسکەندەری مەقدۆنی و هەرقل و کیسراکان و هیتلەو جیڤارا، بە ئازایەتییو غیرەتی خۆی بەو پلە گەیشتووە، لە ریزی پێغەمبەران جیایە، کە لەلای خواوە نێرراونو پاڵپشتی کراونو فریشتەی وەحییان بۆ هاتووە، بەلأم ئەو وتە وانیە، پێغەمبەریتی، بەرزترو جیاوازترە لە پاڵەوانو عەبقەری، چەندین پاڵەوانو عەبقەری لە ئیسلامدا هەڵکەوتوون، خۆیان بە دواکەوتووی محەممەد زانیوە، تواناو زانستیان لەوەوە هەڵگوزیوە، دانیان بە پێغەمبەری ئەودا ناوە.

غازی تەوبە دەڵێ: عەققاد کتێبە عەبقەرییەکانی، بۆ بەرگری لە مەزنی مرۆڤ و بیرو باوەڕی تاك نووسی، ئەو خەتەرە چی بوو کە هەڕەشەی لە باوەڕی دیموکراتی عەققاد کرد ئەوانە بنوسێ، عەققاد هەستی دەکرد سێ خەتەری فاشیو شیوعیو هەڵسانەوەی ئیسلام لە ئارادایە، دەبێ دژیان بوەستێتەوە، بۆ بەرەنگاریی فاشی کتێبی (هتلر فی المیزان) ی نووسی، بۆ بەرنگاری شیوعیەت دوو کتێبی (الشیوعیه والانسانیه)و (افیون الشعوب) ی نووسی، بەلأم بۆ بەرنگاربونەوەی شەپۆلی بەربلاوی بێداری ئیسلام، دەبێت چەکی خونساکردنەوەی کەسایەتیەکانی ئیسلام بە کار بهێنێ، هەر بۆیە کتێبی عەبقەرییەکانی محەممەدو ئەبوبەکرو عومەرو ئەوانی تری نوسی، هەتا کاریگەری تاکەکەس لەسەر مێژوو وەك جوڵێنەر بوروژێنێو، کاری ئیمانو باوەڕی کۆمەڵگە لەو روانگەوە ناشیرین بکات، گومان بخاتە سەر رۆڵی عەقیدەو پەروەردە لە رێنیشاندانی کەسەکان، مەزن مەزنە بە فیترەی خۆی، عەبقەری عەبقەرییە هەر لە سەرەتای بونیەوە، عەققاد کاریگەرییەکانی بۆماوەو پێکهاتەی لاشەو جومگەکانی عەسەبی، بە خاڵی یەکەم دادەنێ لە رێنیشاندانی کەسێکدا، بەلأم عەقیدەو پەروەردەی ئیسلامی لە پلەی دووەمدا دادەنێ، ئەگەر کاریگەرییان هەبێ لە دروستکردنی کەسایەتیی مرۆڤەکاندا.

لەوەدا عەققاد کاریگەرە بە هەندێ قوتابخانەی ئەوروپی، کە تاکەکەس بە پیرۆز دەزانێو، زۆربەی ڕووداوەکانی مێژوو لە دوو ڕوگەیەی کاریگەرەوە شیدەکاتەوە، عەققاد باسی قوتابخانەی (لومبروزو) دەکات کە دەڵێ عەبقەری پەیوەندیی بە پێکهاتەی لاشەی مرۆڤەوە هەیە، لەوێوە عەققاد کەسایەتییە ئیسلامییەکان دەباتەوە بۆ ئەو ڕاو بۆچونەو، کاریگەری عەقیدەو پەروەردەی ئیسلامیان لێدوور دەخاتەوە کە کاریگەری هەبووبێ لەسەریان، ئەو باس لەوە دەکات کە سەرکەوتنەکانی پێغەمبەر ﷺ پەیوەندی بە خۆیەوەو توانـاو کەسایەتیی خۆیەوە بووە، نەك وەعدو پەیمانی خوایی و یارمەتی مەلائیکەو وەنەوزدانی موسڵمانانو بارانبارین بۆ لابردنی خەوەنوچکەکانیانو، ئەو ڕەشەبایەی کە دەواری کافرو بتپەرستانی شێواندو، ترس خستنە ناو دڵی کافران بە هیچ دەزانێ، کەسایەتیی پێغەمبەر ﷺ گرنگ و کاریگەر بووە، بەڵام دەستی خوای گەورە هاندەرو یارمەتیدەرو عەزمو بڕوا دروستکەرو ورەبەرزکەرەوەی سەرەکی بووە، ئەو ناڵێ ئیسلام ئەو کەسایەتییەی بۆ پێغەمبەر موحەممەد ﷺ دروستکرد، ئەو نازانێ ئیسلام و ئیمان باوەڕی بە محەممەد داو عەزم و جەزمی بۆ دامەزراند، عەققاد ئەوانەی لە بیرچووبوو، هاتبوو لە تایەکی ترازودا جیاوازی نێوان سەرکردایەتیی پێغەمبەر ﷺو ناپلیۆنی دەکرد لە ڕووی ماددیو عەسکەرییەوە، نەهاتبوو بڵێ جەنگەکانی پێغەمبەر ﷺ پاكو خالص بۆ خواو بڵاوکردنەوەی ئیسلام بووە، بۆ تەماعو دەسەڵاتو وڵاتگیری نەبووە، عەبقەرییەتی سەربازی پێغەمبەری وەك هی خەڵك وەسف کردووە، باسی ئەو جیاوازیە قوڵەی نەکردووە لە نێوانیاندا، نازانێ بڵێ ئەو پێغەمبەر بووە، خوا پاڵپشتی بووە، پەیمانی پێداوە سەری بخات، ئەو لە خەڵکی دونیایی جیاوازە، تەنانەت لە ئەبوبەکرو عومەریش جیاوازتر بووە، ئەو عەبقەرییەی عەققاد بۆ پێغەمبەر باسی دەکات جیاوازو لاوازو نوقسانە، باسی کاریگەریی ئاینی ناکات لەسەر کەسێتیی موحەممەد ﷺ، وەك چۆن عائیشە دەفەرمووێ: (کان خلقه القرآن)، بەڵێ مرۆڤ بوە، بەلأم تواناو یارمەتی خوا بۆی، لە سروشتی مرۆڤایەتی بەرزتر بووە، وەك قورئان دەفەرمووێ:

(قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ) (الأنعام : ١٦٢). عەققاد باس لەوە دەكات كە موسڵمانان لەبەر ئەوە دەبوونە موسڵمان، چونكە سەرسام بوون بە كەسایەتیی پێغەمبەر ﷺ، لەبەر ڕەوشتبەرزیی ئەوو پاكو پوختی ڕەفتارو دەروونی بووە، ئەوە ڕاستە، بەڵام ئەوان نەدەبوونە عەبدو بەندەی محەممەد، كڕنووشیان بۆ ئەو نەدەبرد. ! بەڵكو بۆ لای ئیسلام دەهاتن، دەیانزانی ئیسلام زەین و ڕەوشت و ناخ و دەرونی ئەوی بەرزكردوەتەوە، دەنا بۆچی پێش پێغەمبەرایەتی ﷺ دوای محەممەد نەكەوتن، عەققاد جەنگێكی قورسی درێژماوە لە دژی مەزهەبی تەفسیری ماددی بۆ مێژوو دەكات، كە ماركسو شیوعییەكان پاگەندەیان بۆ دەكرد، بەڵام بە داخەوە ملكەچی مەزهەبی نەفسی ماددی بوو بوو، كە داننانێ بە كاریگەری ئایین لەسەر دڵو دەروونو بڕوای محەممەد، بڕوای بە مەزنی ئیسلام نییە لە دڵی سەحابەكاندا، باش تێنەگەیشتووە لە مانای پێغەمبەری، ئەوە نابینێ لە ژیانی محەممەددا ﷺ، چونكە ئەو لەسەر مەزهەبی ڕۆژئاوا كەسایەتییە مێژووییەكانی ناسیوە، ئاگاداری كاریگەری دەستی خواو پێغەمبەرایەتیو غەیبو موعجیزە نییە.

شەشەم: گۆڕانكارییەكی نوێ: تەفسیری ماددی بۆ سیرەی پێغەمبەر

هەندێك دەیانەوێ سیرەی پێغەمبەر ملكەچ پێبكەن بۆ تەفسیری ماركسی، وەك ئەوەی عەبدوڕڕەحمان شەرقاوی نووسیویەتی بە ناوی (محمد رسول الحرية)، شێخ موحەممەد ئەبو زەهرە لە وەسفی ئەو كارەدا دەڵێ: ئەو كتێبە ڕووگەیەكی دوور لە ئایینی هەیە، تەفسیرێكی تری هێناوە لە لێكۆڵینەوەكەیدا، ئەو موحەممەدی وا نەناسیوە كە پێغەمبەرێكە وەحی بۆ هاتووە، بەڵكو وا باسی دەكات كە ئەو كەسایەتییەكی كۆمەڵایەتیی بووەو بیروڕای كۆمەڵایەتیی هەبووە، شەرقاوی بە كەیفی خۆی تەفسیری كردووە، ئەو پێغەمبەر لە وەحیو پاڵپشتی خوا دادەبڕێ، دەڵێ هەرچی تواناو سەركەوتنو هەڵوێستو بەرنامەو جیهادی محەممەد هەیە، لە زەین و سەلیقەو كەسایەتیی خۆیەوە بووە، نەك لە وەحییەوە كە لەلایەن خواوە پێی درابێ، دەڵێ: ئایەتی (قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ) (الكهف:١١٠) دەلیلە لەسەر

ئەوەو، رایدەگەیەنێ کە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێی گەیشتووە لە مەبدەئو بەرنامەو هەوڵ‌و تێکۆشان، ئەوە لە مرۆڤیەکەی‌و کەسایەتییە مرۆڤانەکەیەوە دەرچووە، نەك لە پێغەمبەرییەکەیەوە، بەڵام خوا بەم جۆرە دەفەرمووێ: (قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ) (الكهف: ١١٠) ئەو ئەم بەشە دەبڕێ لە ئایەتەکە، دەیەوێ وەحی‌و پاڵپشتی خوا ببڕێ لە ژیانی موحەممەددا، ئەو باس ناکات کە ئاسمان قسەی بۆ کردووەو دواندوویەتی‌و بەرنامەی بۆ ناردووەو جوبرەئیلی بۆ هاتووەو بە ئاشکرا قسەیان کردووە، ئەو دەڵێ: وەحی خەو بووە، ئەوە پێچەوانەی ڕای هەموو موسڵمانانە کە دەڵێن: جوبرەئیل خۆی دابەزیوەو قسەی لەگەڵی کردووە بە ئاشکراو بە بەرچاوەوە، نەك بە خەو، هەرکات شەرقاوی لە باسەکەیدا ئایەت دەهێنێ، وا دەیهێنێ کە ئەوە قسەی پێغەمبەرەو لە بیری ئەوەوە هەڵقوڵاوە، نەك وتەی خوا، بیرۆکەی لابردنی تەبەنی (بەکوڕکردن) دەباتەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، نەك بۆ خوا، دەڵێ بۆچوونی خۆی بووە نەك قورئان، لابردنی عارەق و حەرامکردنی، ڕای موحەممەد خۆی بووە، نەك قورئان، چیرۆکە قورئانییەکان دەباتەوە بۆ ئەزموونی پێغەمبەر ﷺ، بەلام موحەممەد نەگەراوە بە نیوە دورگەدا، شارەزایی لەو چیرۆك‌و هەواڵانە نەبووە، ئەو تەنها دووجار لە حیجاز دەرچووە، جارێك (١٢) ساڵ بوو، جارێك (٢٥) ساڵ بووە، بۆ کاسبی و چاوکراوەیی چوە، نەك پرس‌و ڕای ئاینی‌و شارەزابوون لە دونیاو لە مێژوو، شەرقاوی هەرگیز لەو کتێبەیدا ناڵێ کە قورئان هی خوایەو لەلایەن ئەوەوە دابەزیوە، زۆرکەم ئایەت دەهێنێ، گەر ئایەتێکیش بهێنێ دەڵێ: هەمهەمەی دەروونیی موحەممەد خۆیەتی، ناوی قورئان ناهێنێ، هەمیشە دەڵێ وشەکان هی خۆیەتی، یان کەسێك پێی وتووە، بەڵام هەر زوو ئەو هەوڵە ئاشکرا بوو، نوسینی قوتابخانەی ئەصالەو رەسەنایەتی دەرکەوت کە دژی ئەو شێوازە فەلسەفیە ماددیە بوو، کە تێگەیشتنیان لەسەر بنەڕەتی قورئانی تەواوە، ئەو کتێبانە دەرکەوتن کە بە پێنووسی حەسەن بەناو موحەممەد غەزالی‌و سەعید رەمەزان بوتی‌و ئەبو حەسەنی نەدەوی‌و زۆری تر، زۆر زانایانەو شارەزایانەو بە حیکمەتەوە

بـە گـژ بۆچـوونەکانی ئـەو نووسـەرە لادەرە ئیسـلامیانەدا چـوونەوە، مـوعجیزەو وەحی خوایی‌و غەیبیاتیان هێنایەوە ناو سیرەو، راستیەکانی ئایینیان دەرخست.

قوتابخانـەی رەسـەنایەتی "سـیرە راسـتەکەی" گێڕایـەوە بـۆ راسـتەڕێ‌و ژیاننامەکـەو هـەموو هەڵـەکانی ئـەوانیان ڕەددایـەوەو راسـتکردەوە کـە لـە بـارەی سیرەوە نووسرابوو، بەردەوام خەریکن ئەو هەڵانە راست دەکەنـەوە، ئەمانـەی لای خۆمان دەیلێینەوە.

ئەو قوتابخانە تێکدەرە خراپکارانـە هـیچ خزمـەتێك ناکـات وە کاریگـەری نیـە، جگە بۆ سەر کەسێکی نـەخۆش‌و لاواز، بـەڵام ژیانـە راسـتە دامـەزراوە پاکەکـە کـە قورئان لە زۆر ئایەتدا پاڵپشتی دەکات، هەر بە پیرۆزی‌و گەورەیی دەمێنێتەوەو لـە دوا رۆژدا شتی زیاتر لەسـەر سـیرە دەبیسـترێ لـە کۆنگرەو سـیمینارو نووسـین و کاری تر.

# سەرچاوەکان


- القران الكريم
- التأريخ الاسلامي، محمود شاكر، المكتب الاسلامي بيروت ١٩٩١.
- تأريخ اليعقوبي ـ احمد يعقوب بن جعفر بن وهب المعروف باليعقوبي ـ تحقيق عبدالايد مهنا ـ مؤسسة الاعلمي للمطبوعات ـ بيروت ١٩٩٣.
- تأريخ ابن الوردي ـ زين الدين عمر بن مظفر الشهيد بابن الوردي. توفى سنة ٧٤٩ ه ـ دار المكتبة العلمية ـ بيروت ـ ١٩٩٦.
- تأريخ ابي الفدا ء ـ الملك المؤيد عمادالدين ابي الفدا ء شاهنشاه بن ايوب. توفى سنة ٧٣٢ك ـ بيروت، دار الكتب العلمية ط١، ١٩٩٧.
- البداية والنهاية، عماد الدين ابو الفداء ابن كثير، بيروت ١٩٨٥
- تاريخ ابن خلدون، عبدالرحمن ابن خلدون، ٧٣٢ ـ ٨٠٨ك ،دار الفكر، بيروت ٢٠٠٢م
- تاريخ الرسل والملوك، محمد بن جرير الطبرى، دار المعارف ١٩٦٢
- الكامل فى التاريخ، عزالدين الجزري ابن اثير، دار صادر، بيروت ١٩٦٧
- اخبار مكة وما جاء بها من الاثار،ابو الوليد احمد بن محمد الازرقى، دار الثقافة، مكة، ١٩٧٨
- المدينة النبوية، فجر الاسلام والعصر الراشدى، الرواية الصحيحة، محمد محمد حسن الشراب، دار القلم ، دمشق ١٩٩٤
- محاضرات في تأريخ العرب، الدكتور صالح احمد العلي، ط٢، مطبعة المعارف، بغداد، ١٩٥٩.
- تأريخ بغداد : احمد بن على خطيب بغدادى ، قاهرة ، مطبعة السعادة، ١٩٨٨.
- التأريخ السياسي للدولة العربية، د. عبدالمنعم ماجد، مكتبة الانجلوا المصرية، قاهرة، ١٩٥٦،

- انساب الاشراف=احمد بن يحى البلادرى، دار المعارف ،مصر، ١٩٧٥
- منهج البحث التاريخى، الدكتور حسن عثمان، ط٦، دار المعارف، القاهرة،١٩٨٧
- حول اعادة كتابة التأريخ الاسلامي، د.عمادالدين خليل، دار الثقافة، ط١، ١٩٨٦
- الهيجرة في القرآن الكريم ،أخرمي سامعون جزولي ـ مكتبة الرشد الرياض، ١٩٩٦.
- دراسة في تأريخ الخلفاء، د.محمد ضيف الله بطانية، دار الفرقان، عمان ١٩٩٩.
- دلائل النبوة، ابو بكر احمد البيهقى، بيروت، ١٩٨٥
- حياة محمد، محمد حسنين هيكل، ط١٣، مكتبة النهضة، ١٩٦٨.
- سبل الهدى والرشاد في سيرة خير العباد، الامام محمد بن يوسف الصالحي الشامي، متوفى سنة ٩٤٢ ، تحقيق الشيخ عادل احمد عبدالموجود، الشيخ علي محمد معوضي، دار الكتب العلمية، بيروت، ط٢، ٢٠٠٧.
- السيرة النبوية الصحيحة، محاولة لتطبيق قواعد المحدثين فى نقد روايات السيرة النبوية، د. اكرم ضياء العمرى،ط٥، ٢٠٠٥
- صحيح السيرة النبوية، حسب الوقائع والاحداث اقتصر فيه مؤلفه على الاحاديث الصحيحة، ابراهيم العلى، دار النفائس، ط٧ ،الاردن، عمان،٢٠٠٤
- دراسة فى السيرة، عماد الدين خليل، نشر مؤسسة الرسالة، بيروت ١٩٨٤
- دراسة تحليلية لشخصية الرسول محمد، يوسف بن عبدالبرّ، مصر، ١٩٩٤.
- تعريف عام بشخصية الرسول، محمد رشاد منصور شمس، دمشق، المشرف للكتب
- صحيح السيرة النبوية، ابراهيم العلي، دار النفائس–١٩٩٨.

- فقه السيرة النبوية، د. محمد سعيد رمضان السيو طي، دار الفكر، بيروت، ط٢٦، سنة ٢٠٠٦،
- فقه السيرة، محمد الغزالى، نشر دار القلم، دمشق ١٩٨٧
- فقه السيرة النبوية، منيرالغضبان- مكة المكرمة-١٩٩٦.
- السيرة النبوية، د.علي محمد الصلابي، دار المعرفة، بيروت ، ٢٠٠٦.
- السيرة النبوية، دروس وعبر،الدكتور مصطفى السباعى، دار البراق ،ط٤، دمشق ٢٠٠٢
- السيرة النبوية ـ ابن هشام ـ مطبعة المصطفى، مصر ١٩٥٥.
- سيرة الرسول، محمد عزة دروزة، ط٢ القاهرة ١٩٦٥
- السيرة النبوية، محمد ابو فارس، دراسة تحليلية، دار الفرقان، عمان ١٩٩٧.
- السيرة النبوية – أبن اسحاق- ط١ ،مصر ١٩٨٨.
- تأملات في سيرة الرسول ـ د. محمد سيدالوكيل، دارالمجتمع ١٩٨٧.
- دفاع عن محمد، ضد المنتقصين من قدره، د. عبد الرحمن بدوى، ترجمة كمال جاد الله، الدار العالمية للكتب والنشر،
- المستشرقون والسيرة النبوية، الدكتور عمادالدين خليل، دار ابن كثير، دمشق، ٢٠٠٥
- الهجرة في القرآن الكريم، أخرمي سامعون جزولي ـ مكتبة الرشد الرياض، ١٩٩٦.
- المقاصد النبوية في الأسماء والتسمية، ميسون احمد راجم، ط١، المشرق للكتب، دمشق ٢٠٠٧
- محمد ـ محمد رضا ـ دار الكتاب الحديث ـ القاهرة ٢٠٠٤.
- الرسالة المحمدية ـ السيد سليمان الندوي ـ مكتبة دار الفتح، ط٢ ، ١٩٦٣ دمشق، ترجمها من الاردية ـ محمد ناظم الندوي، مدير جامعة العباسية

(بهارلبور ـ هاشمان) و محاضرة ألقاها سليمان الندوي في جامعة مدينة مدراس بالهند سنة، ١٣٤٤

- رجال ونساء حول الرسول، سعد يوسف ابو عزيز ـ دار الفجر للتراث ـ القاهرة ـ ٢٠٠
- علي بن أبي طالب، دكتور علي محمد الصلابي، دار المعرفة، ط٣ بيروت ٢٠٠٥.
- مسند امام ا حمد مع الفتح الرباني، تحقيق احمد شاكر، ط٣، دار المعارف مصر، ١٣٦٨ه.
- مجموعة الوثائق السياسية للعهد النبوي. للدكتور محمد حميدالله الحيدرآبادي،القاهرة، ط٢، ١٩٥٨.
- فيض القدير شرح المجتمع الصغير من أحاديث البشير للسيوط، للعلامة عبدالرؤف المناوي، المكتبة الجارية الكبرى.
- سير اعلام النبلا ء ـ الامام شمس الدين محمد الذهبي ، طبع بأشراف ابن محمود شاكر ـ دار احيا ء التراث العربي ـ ط١ بيروت ٢٠٠٦
- سير اعلام النبلا ء ـ الأمام ابي عبدالله محمد بن احمد الذهبي ـ توفي سنة ٧٤٨ك، دار المعرفة، بيروت ، ط١ ٢٠٠٧
- الأصابة في تميز الصحابة ـ امام ابن حجر العسقلاني، دار المعرفة ـ بيروت ٢٠٠٤.
- اسد الغابة في فرقة الصحابة ـ ابن اثير ، دار المعرفة بيروت ٢٠٠٧.
- قراءة حول مصير النبى موسى. المحامى بديع السيوفى ـ ٢١،ط١ ، دمشق ٢٠٠٥
- العقيدة الاسلاميةو اسسها، عبدالرحمن حسن حنبكة الميدانى، دمشق، دار القلم، ط٥، ١٩٨٨
- تفسيرالقران العظيم، عماد الدين ابن كثير، بيروت، ١٩٨٦

- انبياء فى القران تركوا اثارا، د. هدى حسن الطويل، دارالمعرفة ،ط١، بيروت، ٢٠٠٦
- الموطأ ـ امام مالك ـ مطبعة عيسى البابي الحلبـي بمصر، سنة ١٣٧٠هـ،
- جامع بيان العلم وفضله، لأبي عمر يوسف بن عبدالبر، طبع مطبعة المنيرية، مصر.
- صحيح البخاري، محمد بن اسماعيل البخاري، دار الفكر، ١٩٩١ز.
- اسباب النزول، ابوالحسن الواحدي النيسابوري، دار الكتب العلمية، بيروت، لبنان ٢٠٠٠م.
- المستدرك على الصحيحين ، الأمام ابي عبدالله الحاكم النيسابوري، مكتب المطبوعات الاسلامية، ١٩٧٠.
- الصراع مع اليهود، د. محمد ابوفارس، دار الفرقان، ١٩٩٠.
- ظهور الكرد في التأريخ، دراسة شاملة عن خلفية الامة الكردية و مهدها ،دكتۆر جەمال رەشید ئەحمەد، هەولێر، چاپخانەی پەروەردە، دەزگای ئاراس ٢٠٠٥
- صورة الاسلام فى التراث الغربى. د. سابيت. ترجمة: م. ثابت عيد. القاهرة ١٩٩٩ .
- الكتاب المقدس ـ سفر التكوين، الاصحاح السادس عشر، فقرة (١٥) والاصحاح السابع عشر، فقرة (١٥ ـ ٢٠)والاصحاح الخامس عشر، فقرة ١–٢
- دیاری کوردەواری لە یادی پێغەمبەری رزگاری، دانراوی کۆمەڵێك لە زانایان، پێداچونەوەی عادل سەعدی، انتشارات کردستان، سنندج، ١٣٨٠ هەتاوی)
- کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا، حسن محمود حمه کریم، چاپی چوارەم، چاپخانەی نووسەر سلیمانی ٢٠٠٥

- كابانی كوردی ، حسن محمود حمه كەریم، چاپی سێهەم، چاپخانەی تیشك ، سليمانی ١٩٩٨
- ئایینی كورد، حسن محمود، چاپی سێهەم ، چاپخانەی تیشك سليمانی، ١٩٩٨
- فەرهەنگی شیرین ـ فاضل نظام الدين ، كوردی عەرەبی، چاپی چوارەم، سلێمانی، ٢٠٠٤
- ولاتگیری رەشەخاكی عێراق : مەلا جمیل رۆژبەیانی ، سلێمانی ١٩٧٧ .
- فتوح سواد العراق، بروايت محمد بن عمر واقدى ، ترجمة وتحشية : الاستاذ عبدالعزيز واعظى سردشتى ، مقدمة و تصحيح و تعليقات : نادر كريميان – تهران ١٣٧٤ ئيران .
- گۆڤاری (العربي) كوەيتی، ژمارە (١٩٤)، ذي الحجة ١٣٩٤– كانوونی دووەم ١٩٧٥.
- مجلة الحوار، عدد ٤٧، تموز ٢٠٠٦.
- گۆڤاری ڕامان، ژمارە ٣٩، ئەیلول ساڵی ١٩٩٩، لا ٢٠٩، دەوڵەتی میتانی ١٥٩٥ـ ١١٦٢پ.ز ،كاریگەری ئاینی كورد لەسەر شۆڕشی ئەخناتون، حەسەن مەحمود حەمە كەریم

# ناوەڕۆك

## بڵاوکراوەکانی پرۆژەی (تیشك)

| ژ | ناوی کتێب | نووسەر |
|---|---|---|
| ١ | بەئیسلامکردنی کورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە؟ | ن: فازل قەرەداغی |
| ٢ | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەکارییەکانی مەریوان هەڵەبجەیی لە کتێبی (سێکس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر کەمال دەروێش |
| ٣ | ئاشتینامە، وەلامێك بۆ (خوێننامە)ی زەردەشتی | ن: ئامینە صدیق |
| ٤ | فەتواکەی مەلای خەتێ، ئەفسانەی مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٥ | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئا: ئارام عەلی سەعید |
| ٦ | بەرەو بەختیاری ئافرەت (بەرگی یەکەم) | جەمال حەبیبوللا (بێدار) |
| ٧ | ئازادیی رادەربرین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٨ | بەجیهانیکردن، دیدێکی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید<br>و: حەمەکەریم عەبدوللا |
| ٩ | کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ١٠ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت (بەرگی دووەم) | ن: جەمال حەبیبوللا |

| | | |
|---|---|---|
| | | (بێدار) |
| ١١ | مێژووی دێرینی کوردستان (کتێبی سێیەم) | ن: فازل قەرەداغی |
| ١٢ | سەدەیەك تەمەنی نووری، ماموستا عەبدولکەریمی مودەڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە | ئا: عەبدولدائیم مەعروف هەورامانی |
| ١٣ | دەولەتی خیلافەت، بوژاندنەوەی کۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیکرام کەریم |
| ١٤ | لە سەرگوزشتەکانی ژیان، ئەدەبی گاڵتەوگەپ، روداوی مێژوویی، بیرەوەریی | ن: شێخ موحەممەد خاڵ |
| ١٥ | پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان رامانو سەرنجو پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |
| ١٦ | بیستو سێ ساڵ سەروەریی | ن: ئەحمەد حاجی رەشید دکتۆر صەباح بەرزنجی پێشەکی بۆ نووسیوە |
| ١٧ | قورئان وەحی ئاسمانە، نەك رەنگدانەوەی سەردەمی خۆی | ن: بەکر حەمەصدیق |
| ١٨ | ئیسلامو سیاسەت، لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلامو سیاسەت | ن: ئارام قادر |
| ١٩ | سوپای ئەیوبیان لە سەردەمی سەلاحەددیندا پێکهاتنی، رێکخستنی، چەکەکانی، هێزی دەریایی و شەڕو جەنگە گرنگەکانی | ن: پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن و: عوسمان عەلی قادر |
| ٢٠ | پوختەیەك دەربارەی رۆژوو | ن: عەبدوڕەحمان نەجمەدین |

| | | |
|---|---|---|
| ٢١ | ڕۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەکان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا | ن: د. کـــاوە فـــەرەج سەعدون |
| ٢٢ | یەکـەمین دەستووری نووسـراو لە جـیهانـدا، بـەڵــگەنامەیەکی گـــرنگی سـەردەمـــی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) | ن: موحەممەد حەمیدوڵڵا<br>و: شوان هەورامی |
| ٢٣ | ئیسلامناسیی یان ئیسلامنەناسیی، وەڵامێك بۆ کتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس | ن: ئیکرام کەریم |
| ٢٤ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت (بەرگی سێیەم) | ن: جـــەمال حـــەبیبوڵڵا (بێدار) |
| ٢٥ | ئیشکردن نەك تەمەڵی | عەبدولعەزیز پارەزانی |
| ٢٦ | دوورگەی بیناسازان، چیرۆکێکی پەروەردەییە بۆ گەورەو بچووکی ئەم نەوە نوێیە | نووســـــــــینی: د. عەبدولحەمیــد ئەحمـــەد ئەبو سلێمان<br>وەرگێڕانی: ئامینە صدیق عەبدولعەزیز |
| ٢٧ | زمانی گەردەلوول، خەونی شنەبا<br>کۆمەڵـە دیدارێکـە لەسـەر شـیعر، فەرهـەنگ، زمـــان، تەســـەووف، ڕۆژهەڵاتناســـی، ژن، ڕەخنەی ئەدەبی، ڕووناکبیر و دەسەڵات | فەرهاد شاکەلی |
| ٢٨ | هەڵەبجـــە ١٨٨٩ ـ ١٩٣٠، لێکۆڵینەوەیـەکی مێژوویی سیاسییە | ن: عادل صدیق |
| ٢٩ | بەرگری لە قورئان دژی ڕەخنەگرانی | ن: عەبـــــــدوڕڕەحمان بەدەوی<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |

| | | |
|---|---|---|
| ٣٠ | فەرموودە هاوبەشەکانی بوخاری و موسلیم | ئامادەکردن و وەرگێڕانی: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| ٣١ | مەلا ئیدریسی بەدلیسی، رۆڵی لە یەکخستنی میرنشینە کوردییەکاندا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٣٢ | شێخ مەحمودی حەفید (١٩٢٢ — ١٩٢٥) | ن: ئومێد حەمەئەمین |
| ٣٣ | ئیسلام لەبەردەم دورپیاندا | ن: لیوبو لدڤایس<br>و: عەبدول حسێن |
| ٣٤ | رامیاری لە ئیسلامدا | ن: ئەحمەد کاکە مەحمود |
| ٣٥ | وەڵامی پرسیارەکان، رەواندنەوەی کۆمەڵێك گومان سەبارەت بە ڕاستییەکانی ئیسلام | ن: دکتۆر کەریم ئەحمەد |
| ٣٦ | مرۆڤ و پەیامداری | ن: قانع خورشید |
| ٣٧ | سەید قوتب، لە هاتنەدنیاوە تا شەهیدبوون | ن: د. سەلاح عەبدولفەتاح ئەلخالیدی<br>و: تارق نەجیب رەشید |
| ٣٨ | عوسمانی کوڕی عەففان، کەسایەتی و سەردەمەکەی | ن عەلی موحەممەد سەللابی<br>و: حەمید موحەممەد عەبدوڵڵا |
| ٣٩ | خوانی رووح، توێژینەوەیەکە دەربارەی گەورەیی و پیرۆزیی نوێژ | ن: مەلا ئەحمەدی شەریعە |
| ٤٠ | ئەلفبێی لاتینی.. زمانی ستاندارد | ئامادەکردنی: رەوشت محەمەد |
| ٤١ | بنەماکانی فیقهی ئیسلامیی(بەرگی یەکەم) | نووسینی: د. صباح بەرزنجی |

| | | |
|---|---|---|
| ٤٢ | پوختەیەك دەربارەی راگەیاندن و راگەیاندنی ئیسلامیی | ن: ئەحمەد ئیبراهیم وەرتی |
| ٤٣ | دەروازەیەك بۆ زانستەكانی قورئان | ن: ئیكرام كەریم |
| ٤٤ | بیرەوەرییەكان دەبنە گرنگ، دیمانەی مامۆستای دێرین ئەحمەد سەعید | ئا: ئەحمەد حسین ئەحمەد |
| ٤٥ | گەنجینەكانی دوورگەی بیناسازان | ن: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبوسلێمان<br>و: بوشرا صدیق عەبدولعەزیز |
| ٤٦ | فری فری قەل فری | نووسینی: مەلا موحەممەدی جەلی كۆیی (مەلای گەورە)<br>قانع خورشید پێشەكی بۆ نووسیوەو رێكیخستووەتەوەو پەراوێزی بۆ داناوە |
| ٤٧ | كـۆچ<br>كۆمەڵە چیرۆكێكی واقیعیی كۆمەڵایەتییە | نووسینی:یوسف حاج ئەحمەد<br>وەرگێرانی: كاوە محەمەد شارباژێری |
| ٤٨ | پەروەردەی منداڵان لە ئیسلام دا (بەرگی یەكەم) | نووسینی:<br>د. عەبدوڵڵا ناصح عەلوان<br>وەرگێرانی:ناصح ئیبراهیم سازانی |

| | | |
|---|---|---|
| ٤٩ | ئیمام حەسەن بەننا<br>١٩٠٦ - ١٩٤٩ | نووسینی: مصطفی محمد الطحان<br>وەرگێرانی:محمد عبدول رحیم |
| ٥٠ | مێژووی کوردەکانی جەزیرە ٤٤٧-٦٥٦ ك | نووسینی: ئومێد بەهرامی نیا<br>وەرگێرانی: عبدالرحیم معرفتی |
| ٥١ | ئایا خوا کچی هەیە ؟<br>وەلامێك بۆ کتێبی (کچانی خوا) | نووسینی: ڕوقیە صدیق عبدالعزیز |
| ٥٢ | گەشتی قیامەت | نووسینی: ناصح ئیبراهیم سازانی |
| ٥٣ | بیری نوسوولیی ئیسلامی (لەنێوان خوێندنەوەو نەخوێندەواریدا | فاضل قەرەداغی |
| ٥٤ | دەروازەیەك لەمەڕ کێشەی ڕۆچوون<br>هۆکار.. کاریگەریتی .. چارەسەر | ئامادەکردنی : یاسین ئەحمەد زەنگەنە |
| ٥٥ | ئاین لە فیکری مەسعود محەمەد دا | نووسینی: عومەر عەلی غفور |
| ٥٦ | ئیسلام لە نێوان نەزانی عالمەکانی و بێ توانایی نەوەکانی | نووسینی: جەمال حەبیبولا |

| | | |
|---|---|---|
| ٥٧ | تاك و حكومەت لە شەريعەتی ئيسلامدا | نووسينی: دكتور عبدالكريم زيدان وەرگێرانی:هێمن رێنوار |
| ٥٨ | جوگرافيای ئاو و هەوا | نووسينی: د.عەلی ئەحمەد غانم وەرگێرانی : گۆران رەشيد ئيمامی |
| ٥٩ | كۆزارا | نووسينی: حمە رەشيد نادر هەورامی |
| ٦٠ | رۆژمێری تيشك | ئامادەكردنی : ئيكرام كەريم |
| ٦١ | سەردەمی خيلافەتی راشيدە | نووسينی: دكتۆر ئەكرەم زيائولعومەيری وەرگێرانی : ئيحسان بورهانەدين |
| ٦٢ | دۆزی كورد | ئامادەكردنی: ئارام عەلی سەعيد |
| ٦٣ | پەروەردەی مندالآن لە ئيسلام دا (بەرگی دووەم) | نووسينی: د. عەبدوللا ناصح عەلوان وەرگێرانی:ناصح ئيبراهيم سازانی |
| ٦٤ | ديموكراسی بە بێ حيجاب | نووسينی: مەروە قاوقچی |

| | | |
|---|---|---|
| | | وەرگێرانی: محەمەد حەمە میرزا- حسن محموود حمە کریم |
| ٦٥ | توند و تیژی دژی ئافرەت | ن: ئیدریس ژاڵەیی |
| ٦٦ | مێژووی ئیسلام – بوختانی بە دەمەوە دەکرێ | نووسینی: یوسف قرضاوی<br>وەرگێڕانی: ئیکرام کەریم |
| ٦٧ | قادیانی | ئیکرام کەریم |
| ٦٨ | دیفاعێك لە خوێندن لە حوجرەکانی کوردوستاندا | ن: محەمەد عەلی قەرەداغی |
| ٦٩ | پەیوەندی نێوان ئایین و ئەدەب | نووسینی: عەلی صالح میران |

خوا لە وەسفی محەمەددا فەرموویەتی: (تۆ بە راستی خاوەن رەوشتێکی بەرزو مەزنی)، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (من خوا ئەدەبی داداوم بە ئەدەبێکی جوان)، بەڵام بەناو دکتۆرێکی بە ناو موسڵمانی ئەمڕۆی کۆمەڵگەی کوردی زۆر خراپ بەرامبەری دەڵێ! نازانم ئەم هەموو بوختان هەڵبەستن و شێواندنانەی مێژوو لە پای چی؟!، ئایا ئەم موحەممەدە جگە چاکە چی بۆ کورد هێناوە، لە بتپەرسی رزگاری کرد بۆ خواپەرستیی، لە دەست فارس و رۆم رزگاری کرد ، کردیە **حاکمی وڵاتی خۆی ، کە هەزار و سەد ساڵ بوو لێی زەوتکرابوو، زەینی براکوژی و خۆخۆری تیا مراند ، فێری داب و نەریتی جوان و خۆشەویستی و رەفتار شیرینی و ژیانی شارستانیانەو خوێندەواری کرد، کە لەوەوپێش فارس و رۆم بە زۆری قامچی و باج و پیتاك کۆڵیان کوتابوو، نەیاندەهێشت بیر لە خوای و لە خۆی بکاتەوە، کرابووە خۆراکی شەڕی هەزار ساڵەی نێوان خۆیان.**

www.tishkbooks.com

نەخشەسازیی بەرگ: فازڵ قەرەداغی